ئۆرهان پاموک

هەڵگری خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیات – ٢٠٠٦

# من ناوم سوورە

بەکر شوانی

لە تورکییەوە وەری گێڕاوە



وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ. "البقرة: ٧٢"

وَمَا يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ. "فاطر: ١٩"

وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ. "البقرة: ١١٥"

ناوی کتێب: من ناوم سوورە – ڕۆمان

نووسینی: ئۆرهان پاموک

وەرگێڕانی لە تورکییەوە: بەکر شوانی

بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٨٣١

دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم

بەرگ: مریەم موتەقییان

چاپی یەکەم، ٢٠٠٨

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٩١١ی ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

# ئۆرهان پاموک

له ساڵی ١٩٥٢ له ئەستەنبوڵ لەدایک بووە. له خێزانێکی هاوشێوەی خێزانەکانی ناو ڕۆمانەکانی "جەودەت بەگ و کوڕەکانی" و "کتێبی ڕەش"، له نیشانتاشی، که بەشەشارێکی دەوڵەمەند و بەڕۆژئاوایی بووی ئەستەنبوڵە، پێ گەیشتووە. وەک خۆیشی له کتێبی ئۆتۆبیۆگرافی ئەستەمبوڵدا باسی کردووە، له منداڵییەوە تا تەمەنی ٢٢ ساڵی خووی داوەتە نیگارکێشان و پێی وابووە له داهاتوودا دەبێت بەنیگارکێش. قۆناغی ئامادەیی له قوتابخانەی Robert Collegeی ئەمەریکایی له ئەستەنبوڵ خوێندووە. دوای سێ ساڵ خوێندنی نیگارکێشی و بیناسازی له زانکۆی تەکنۆلۆژی ئەستەنبوڵ، تێ دەگات ناتوانێ ببێت به بیناساز و نیگارکێش، بۆیە دەست له خوێندن هەڵدەگرێت. له زانکۆی ئەستەنبوڵ دەست دەکات به خوێندنی ڕۆژنامەگەری. پاموک له تەمەنی بیست و سێ ساڵییەوە بڕیار دەدات ببێت به ڕۆماننووس، دەست له هەموو شتێکی تر هەڵدەگرێت، خۆی دەخزێنێتە سووچی ماڵەوە و دەست دەداتە نووسین.

ڕۆمانی یەکەمی، "جەودەت بەگ و کوڕەکانی"، له ساڵی ١٩٨٢دا بڵاوکرایەوە. ئەم ڕۆمانە خەڵاتی ئۆرهان کەمال و خەڵاتی ڕۆمانی ڕۆژنامەی میللیەتی وەرگرت. ساڵی دواتر، پاموک ڕۆمانی "ماڵی کپ"ی خستە بازاڕەوە. ئەم ڕۆمانە، پاش وەرگێڕانی بۆ زمانی فەڕەنسی، ساڵی ١٩٩١ خەڵاتی Découverte Europ éene ی پێبەخشرا. ڕۆمانی "قەڵای سپی"، که چیرۆکی ناکۆکی و دۆستایەتی نێوان کۆیلەیەکی ڤینیسیایی و زانایەکی عوسمانی دەگێڕێتەوە و نووسەر له ساڵی ١٩٨٥دا به چاپی گەیاندووە، پاش ئەوەی له ساڵی ١٩٩٠دا بۆ زمانی ئینگلیزی و چەند زمانێکی تری ڕۆژئاوایی وەرگێڕدرا، یەکەم ڕۆمان بوو ناوبانگی پاموکی گەیاندە ئاستی نێودەوڵەتی. له ساڵی ١٩٨٥دا خۆی و هاوسەرەکەی چوونە وڵاتە



یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ماوەی سێ ساڵ له زانکۆی کۆڵۆمبیا له نیویۆرک وەک "زانای میوان" کاری کرد. لەوێ بەشێکی زۆری ڕۆمانی "کتێبی ڕەش"ی نووسییەوە. نووسەر لەو ڕۆمانەدا، له میانەی پارێزەرێکەوە، که بەدوای هاوسەرە ونبووەکەیدا دەگەڕێت، باسی کوچەکانی ئەستەنبوڵ، ڕابردووی شار، پێکهاتە و ڕایەڵەکانیمان بۆ دەگێڕێتەوە. "کتێبی ڕەش" له ساڵی ١٩٩٠دا له تورکیا بڵاوکرایەوە و دوای وەرگێڕانی بۆ زمانی فەڕەنسی، خەڵاتی Prix France Culture ی وەرگرت. "کتێبی ڕەش"، ئەزموونێکە باس و خواسی زۆری هەڵگرتووە و ناوبانگی پاموکی زیاتر به تورکیا و به جیهاندا بڵاوکردەوە.

"ژیانی نوێ" ڕۆمانێکی تری پاموکە و بەسەرهاتی فێرخوازێکی زانکۆ دەگێڕێتەوە که کەوتووەتە ژێر کاریگەریی کتێبێکی جادووئامێزەوە. ئەم ڕۆمانە ساڵی ١٩٩٤ بڵاوکراوەیەوە و ژمارەیەکی پێوانەیی له فرۆشتندا تۆمار کرد. نووسەر له ساڵی ١٩٩٨دا ڕۆمانی "من ناوم سوورە"ی بڵاکردەوە. ئەم ڕۆمانە، که چیرۆکی نیگارکێشانی عوسمانی و ئێرانی و جیهانی دەرەوەی ڕۆژئاوامان بۆ دەگێڕێتەوە، له ساڵی ٢٠٠٢دا له فەرەنسا خەڵاتی Meilleur Livre étranger، له ئیتاڵیا خەڵاتی Grinzane Cavour و له ساڵی ٢٠٠٣دا له ئیرلەندا خەڵاتی Internationl Impac - Dublin ی وەرگرت.

پاموک له ناوەڕاستی ساڵەکانی نەوەدی سەدەی ڕابردووەوە دەستی دایە وتارنووسین له بوارەکانی مافی مرۆڤ و ئازادیی بیر و ڕا دەربڕیندا و کەوتە ڕەخنەگرتن له دەوڵەتی تورکیا، بەڵام خۆی زۆر به سیاسەتەوە سەرقاڵ نەکرد. گوڵبژێرێکی له وتارە ئەدەبی و کولتوورییەکانی بۆ ڕۆژنامە و گۆڤارە ناوخۆیی و دەرەکییەکان کۆکردەوە و له ساڵی ١٩٩٩دا له دوو توێی کتێبێکدا بەناوی "ڕەنگەکانی تر" به چاپی گەیاند.

له ساڵی ٢٠٠٢دا ڕۆمانی "بەفر"ی بڵاوکردەوە، که خۆی "به یەکەمین و دوایین ڕۆمانی سیاسی" دادەنێت. نووسەر بەم ڕۆمانە، که ڕووداوەکانی له شاری قارس دەقەومێن و ئیسلامی سیاسی، سوپا، لایست و توندوتیژی و ناکۆکییەکانی نێوان نەتەوەپەرستانی کورد و تورک دەخاتە بەرچاوان،

شێوازێکی نوێی نووسینی ڕۆمانی سیاسیی تاقی کردەوە. ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز لە ساڵی ٢٠٠٤دا ڕۆمانی "بەفر"ی خستە ڕیزی باشترین ١٠ کتێبی ساڵەوە لەسەر ئاستی جیهان. "ئەستەنبوڵ" کتێبێکی تری ئۆرهان پاموکە و لە ساڵی ٢٠٠٣دا چاپکراوە. نووسەر لەو کتێبەدا، بیرەوەرییەکانی خۆی تا تەمەنی ٢٢ ساڵی دەگێڕێتەوە. ئەو کتێبە شیعر ئامێزەی نووسەر بەوێنەی ئەلبومی تایبەتی نووسەر و وێنەی نیگارکێشانی بیانی و ناوخۆیی ڕازێندراوەتەوە و پۆڵێن کردنی کارێکی دژوارە.

"مۆزەخانەی پاکژی" نوێترین ڕۆمانی پاموکە و لە هاوینی ٢٠٠٨دا کەوتە بازاڕەوە مانگێک دوای بڵاوبوونەوەی بە زمانی تورکی، وەرگێڕدرایە سەر ٣٠ زمانی زیندووی جیهانی. "مۆزەخانەی پاکژی" یەکەم کاری نووسەرە لەدوای وەرگرتنی خەڵاتی ئەدەبیاتی نۆبڵ و سەرانسەر بۆ ئەڤین و ڕۆمانسییەت تەرخان کراوە.

بە زمانی کوردی و بە کوردستانەوە، بەرهەمەکانی ئۆرهان پاموک بە زیاتر لە ٥٠ زمان لە ١٠٠ و هێندە وڵاتی جیهاندا دەخوێندرێنەوە. پاموک لە ساڵی ٢٠٠٥دا خەڵاتی ئاشتی کۆبەندی وەشانخانەکانی ئەڵمانیای وەرگرت و ئەم خەڵاتە بە دیارترین خەڵاتی بواری کولتووری ئەڵمانیا دادەنرێت و لە ساڵی ١٩٥٠وە دابەش دەکرێت. خەڵاتی Le Prix Médicis étranger، کە ساڵانە لە فەڕەنسا بە باشترین ڕۆمانی بیانی دەبەخشرێت، لە ساڵی ٢٠٠٥دا بە ڕۆمانی "بەفر" ڕەوا بیندرا. نووسەر لە هەمان ساڵدا خەڵاتی Richarda Huch ی وەرگرت، کە لە شاری دارمشتادتی ئەڵمانیا هەر سێ ساڵ جارێک بە "کەسایەتی خاوەن بیری ئازاد و هەڵوێستی بوێرانە" دەبەخشرێت. گۆڤاری Time لە ساڵی ٢٠٠٦دا ئۆرهان پاموکی وەک یەکێک لە ١٠٠ کەسایەتی کاریگەری ساڵ هەڵبژارد. ڕۆمانی "بەفر" لە هەمان ساڵدا خەڵاتی Le Prix Méditerranée étrangerی پێبەخشرا. پاموک ئەندامی شانازیی (American Academy of Arts and Lettes)ی ئەمەریکی و ئەندامی شانازیی ئەکادیمیای زانستی مرۆیی چینە. نووسەر لە ساڵی ٢٠٠٦دا خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیاتی وەرگرت و بوو بەدووەم لاوترین کەس لە مێژووی وەرگرتنی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵدا.

# پێڕست

# 1

## من مردووم

ئێستا من مردوویێکم، تەرمێکم لە بنی بیرێکدا. لەمێژە دوا هەناسەم داوە و زۆر دەمێکە دڵم ڕاوەستاوە، بەڵام جگە لە بکوژە نامەردەکەم، کەسی تر نازانێت چیم بەسەر هاتووە. ئەو دزێوی چەپەڵە، بۆ دڵنیابوون لە مردنم، گوێی بە هەناسەمەوە نا، هەستی بۆ لێدانی دڵم ڕاگرت. پاشان شەقێکی لە قەبرغەم هەڵدا، بۆ قەراغ بیرەکە بەکێشی کردم، هەڵی گرتم و فڕێی دامە خوارەوە. کەللەی سەرم، کە پێشتر بە بەرد شکاندبووی، لە کەوتنە خوارەوەمدا بۆ ناو بیرەکە، پارچە پارچە بوو. سەروچاوم، تەوێڵم و گۆناکانم پلیشانەوە و فەوتان. ئێسکەکانم شکان و دەمم پڕ بوو لە خوێن.

ئەوە بوو بەچوار ڕۆژ نەگەڕاومەتەوە بۆ ماڵ: ژن و منداڵەکانم بۆم دەگەڕێن. کچەکەم هێندە گریاوە، تیاچووە و سەیری دەرگای باخچە دەکات؛ هەموویان چاویان لە ڕێ و لە دەرگا بڕیوە.

ئایا بەڕاستی چاویان لە دەرگا بڕیوە؟ ئەوەشیان نازانم. لەوانەشە ڕاهاتبن، ئای چ خراپە. چونکە مرۆڤ کاتێک لێرەیە، هەست دەکات ئەو ژیانەی لەدوای خۆی جێی هێشتووە، وەک ڕابردوو بەردەوامە و دەگوزەرێت. پێش ئەوەی لەدایک بم، ڕۆژگارێکی بێ سنوورم لە پشتەوە بوو. دوای مردنیشم، سەردەمانێکی نەبڕاوە و لە فەوتان نەهاتوو. کاتێک لە ژیاندا بووم، هەستم بەوانە نەدەکرد؛ بەتیشکی نێوان ئەو دوو چاخە تاریکەدا گوزەرەم دەکرد و دەژیام.

من بەختەوەر بووم. دەگوترا من بەختەوەر بووم؛ ئێستا تێ دەگەم: باشترین



زەڕکارییەکانی نیگارخانەی سوڵتانمان دەستکردی من بوون و هیچ زەڕکارێکی تر نەبوو بتوانێت بەوەستاییی خۆی شان لە شانم بدات. بەو کارانەی لە دەرەوە ئەنجامم دەدان، مانگانە نۆسەد ئاکچەم دەست دەکەوت. بێگومان ئەمانەن وام لێ دەکەن مردنی خۆم لەکن سەختتر بێت.

تەنیا نەخش و زەڕکاریم دەکرد؛ لێواری پەڕەکانم دەخەملاند. لە چوارچێوەی ڕەنگیندا، گەڵای ڕەنگاوڕەنگ، چڵی دار، گوڵ، گولیلک، مەل، پەڵە هەوری هاوشێوەی نەریتی چینی، گەڵای سەر بەیەکداکردوو، دارستانی ڕەنگین و کارمامزە خۆحەشارداوەکانی ناویان، کەشتیی شەڕ، پادشایان، دار، کۆشک و سەرا، ئەسپ و ڕاوچییانم دەکێشا... لە ڕابردوودا، جاروبار لە قاپدا نیگارم دەکێشا؛ هەندێک جاریش لە پشتی ئاوێنەیەک، لە کەوچکێکدا. ناوبەناویش لە بنمیچی کۆشکێکی قەراغ تەنگەی بوسفۆر، بڕێک جاریش لەسەر سندووقێک... لەم ساڵانەی دواییشدا تەنیا لەسەر پەڕەکانی کتێب کارم دەکرد، چونکە سوڵتانمان پارە و پوڵێکی زۆری بە کتێبی نەخش و نیگاردار دەدا. نامەوێت بڵێم کاتێک لەگەڵ مردن ڕووبەڕوو بوومەوە، تێ گەیشتم دراو لە ژیاندا هیچ بایەخێکی نییە؛ مرۆڤ ئەو کاتەی تەنانەت لە ژیانیشدا نییە، بە گرینگیی پارە دەزانێت.

دەزانم ئێستا لەم ڕەوشەدا دەنگم دەبیستن و لەم پەرجووە دەڕوانن و بەمجۆرە بیر دەکەنەوە: واز بێنە لەوەی لە ژیاندا چەند پارە و پوولت دەست کەوتووە. باسی ئەو شتانەمان بۆ بکە کە لەوێ دەیانبینیت. لەدوای مردن چی هەیە، ڕۆحت لە کوێیە، بەهەشت و دۆزەخ چۆنن و لەوێندەرێ چی دەبینیت؟ مردن چۆنە، ئازارت هەیە؟ مافی خۆتانە. دەزانم کاتێک لە ژیاندان، زۆر پەرۆشی ئەوەن بزانن لەولا چی ڕوودەدات. تەنیا لە سۆنگەی ئەم پەرۆشییەوە بەسەرهاتی کەسێکیان گێڕاوەتەوە کە لە شەڕگە خوێناوییەکان بەناو تەرمەکاندا گەڕاوە... یارۆ دەڵێت بەڵکو لەناو شەڕوانە بریندارەکان کەسێکم لێ هەڵکەوێت لە نێوان مردن و ژیاندا بێت و نهێنییەکانی دنیای ئەودیوم بۆ ڕوون بکاتەوە. سەربازەکانی تەیموری لەنگ بە دوژمنی دەزانن و بە شمشێر دوولەتی دەکەن. ئەویش وای زانیوە مرۆڤ لەو دنیادا دەکرێت بە دوولەتەوە.

شتی وا بوونی نییە. تەنانەت دەتوانم بڵێم ئەو ڕۆحانەی لە دنیادا دەکرێن بە دوولەتەوە، لێرە یەک دەگرنەوە. بەڵام بە پێچەوانەی لافی گاورانی بێ ئاین و زەندیقەکان و کفربازانی یاوەری ئیبلیس، لە خوا بەزیاد بێت، دنیای ئەودیو هەیە. قسەکردنم لەوێوە لەگەڵ ئێوە، بەڵگەی ئەوەیە. مردم، بەڵام وەک دەبینن لەناو نەچووم. لەلایەکی دی، ناچارم بڵێم نەمتوانی ئەو کۆشکە لە زێڕ و زیو بنیاتنراوانەی ڕووباریان بەژێردا دەڕوات، داری گەڵا پان و پڕ لە میوە و شۆخانی دەست بۆنەبراوی باسکراوی ناو قورئانی پیرۆز ببینم. ئەمە بەمەرجێک زۆر باش لەبیرمە چەند بە کەیفەوە نیگاری ئەو حۆرییە چاو گەورانەی بەهەشتم دەکێشا کە لە سوورەتی "الواقعة"دا باسیان کراوە. ئەوانەی ناو قورئانی پیرۆزیش نا، بگرە نەمتوانیوە ئەو چوار ڕووباری شیر و شەراب و ئاوی شیرین و هەنگوینەش ببینم کە "إبن العربي" بەخەیاڵێکی فراوان و بەشیرینی باسیان دەکات. لەبەرئەوەی نامەوێت ڕووی ئەو خەڵکە مافدارە زۆرەی بە ئومێد و خەیاڵاتی دنیای ئەودیوەوە دەژین، بەرەو بێ باوەڕی وەرگێڕم، پێویستە دەستبەجێ ڕوونی بکەمەوە هەموو ئەمانە پێوەندییان بەدۆخی تایبەتی خۆمەوە هەیە: هەر باوەڕمەندێک تۆزقاڵێک زانیاریی لەبارەی ژیانی دوای مردنەوە هەبێت، حاڵی دەبێت کەوا بینینی ڕووبارەکانی بەهەشت بۆ کەسێکی نائاسوودەی وەک من کارێکی دژوارە.

بەکورتی: من، ئەو کەسەی لەناو دەستەی نیگارکێشان و وەستایاندا بە زەریف ئەفەندی دەناسرا، مردووم, بەڵام بەخاک نەسپێردراوم. بۆیە ڕۆحم نەیتوانیوە بەتەواوی لە جەستەم جیا بێتەوە. چارەنووسم بەهەشت، دۆزەخ یان هەر شوێنێکی تر بێت، ڕۆحم، بۆ ئەوەی بتوانێت لەو شوێنانە نزیک بێتەوە، پێویستە لە جەستەی قرێژم بێتە دەرێ. ئەم ڕەوشە نائاساییەم، کە هەڵبەتە کەسانی تریش تێی کەوتوون، ئازارێکی ترسناک بە ڕۆحم دەگەیەنێت. باکم لە لەتوپەتبوونی کەللەی سەرم و لە ڕزینی جەستەی تێکشاو و برینداری تا نیوە چەقیو لە ئاوی ساردی وەک سەهۆڵاودا نییە، بگرە هەست بە ئازاری بەسۆی ڕۆحم دەکەم لە کاتێکدا پەلەقاژەیەتی بۆ دەرچوون لە جەستەم. ڕێک دەڵێی سەرانسەری دنیا خزێنراوەتە جێیەکی ناو هەناومەوە و ڕۆحم خەریکە قەڵس دەبێت و جێی پێ تەنگ دەبێت.



دەتوانم ئەم هەستی تەنگبوونە تەنیا لەگەڵ ئەو هەستی دڵفراوانییە سەرسوڕهێنە بەراورد بکەم کە لەو ساتە بێ وێنەیەی مردندا هەستم پێ کرد. گەرچی کاتێک بەو بەرد پیاکێشانە چاوەڕواننەکراوەی کەناری سەری شکاندم، دەستبەجێ من حاڵی بووم ئەو نامەردە دەیەوێت بمکوژێت، بەڵام نەمتوانی بڕوا بکەم لە دەستی بێت بمکوژێت. ڕەنگە تژەبووبم لە هیوا و ئاوات، بەڵام لە بەسەربردنی ژیانی بێ ڕەنگی نێوان نیگارخانە و ماڵەکەمدا هیچ هەستم بەمە نەکردبوو. بە قامک و نینۆک و بە ددانەکانیشم، کە نووکی پەنجەکانم پێ دەگەستن، سەوداسەرانە خۆم بە ژیانەوە هەڵواسی. با لەوە زیاتر بێزارتان نەکەم بە باسی ئازاری ئەو گورزانەی تر وا بەر سەرم کەوتن.

کاتێک بەحەسرەتەوە تێ گەیشتم وا دەمرم، هەستێکی دڵفراوانیی باوەڕ پێنەکراو هەناومی تەنی. بەدەم ئەو هەستی دڵفراوانییەوە ساتی پەڕینەوەم تێ پەڕاند: گەیشتنم بۆ ئەملا، نەرم و ئارام بوو، کتومت وەک ئەوەی چۆن مرۆڤ لە خەونیدا خۆی بە نووستوویی دەبینێت. دوا شتێک بینیم، پێڵاوە بەفراوی و قوڕاوییەکانی بکوژە نامەردەکەم بوو. چەشنی ئەوەی بنووم، چاوەکانم لێک نا و بە پەڕینەوەیەکی شیرین گەیشتمە ئێرە.

ئێستا گازندەی من لەوە نییە بڵێم ددانەکانم وەک دەنکە نۆک ڕژاونەتە ناو دەمی پڕ لە خوێنم، یان ڕووخسارم تا ڕادەی نەناسینەوە پلیشێندراوەتەوە، یاخۆ خزێنراومەتە بنی بیرێکەوە و تیایدا ماوم؛ بگرە نیگەرانی ئەوەم وا بزانرێت هێشتا دەژیم. بیرکردنەوەی ئەوانەی منیان خۆش دەوێت لەوەی من هێشتا لە گۆشەیەکی ئەستەنبوڵ سەرقاڵی کارێکی تووڕەهاتم، یاخۆ پێشبینیکردنی ئەوەی دوای ژنێکی تر کەوتبم، ڕۆحی هەڵوەدام بەتەواوی ئازار دەدات. با هەرچی زووترە تەرمەکەم بدۆزنەوە، نوێژم لەسەر بخوێنن و ئیدی بەخاکم بسپێرن. لەوەش گرینگتر، با بکوژەکەم بدۆزرێتەوە. دەمەوێت بزانن تا ئەو نامەردە نەدۆزرێتەوە، ئەگەر لە شاهانەترین گۆڕستانیشدا بمنێژن، لە گۆڕەکەمدا نیگەران دەبم، گینگڵ دەدەم و چاوەڕێ دەبم. هەمووتان تووشی بێ باوەڕی دەکەم. ئەو کوڕی قەحپەیەی بکوژم بدۆزنەوە بۆ ئەوەی منیش دانە بەدانەی ئەو شتانەتان بۆ بگێڕمەوە کە لە دنیای

ئەمدیودا بینیومن. بەڵام دوای دۆزینەوەی بکوژەکەم، پێویستە بە ئامێری مەنگەنە ئەشکەنجەی بدەن و هەشت نۆ ئێسکی، نەمازە ئێسکەکانی سنگی، هێدی هێدی بقرنجێنن و بشکێنن. دواتریش بە شیشی ئەشکەنجەدەرانی دروستکراو بۆ ئەو جۆرە کارانە، پێستی سەری کون کون بکەن، زیرەی لێ هەڵسێنن و قژە قرێژ و چەورەکەی تەڵ تەڵ هەڵکێشن.

ئەو بکوژەی بەتۆپەڵ نەفرەتی لێ دەکەم و بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو منی کوشت، کێیە؟ لە خەمی ئەمانەدا بن. لەوانەیە بڵێن جا دنیا پڕە لە پیاوکوژی پڕوپووچ و نامەرد، ها ئەمەیە، ها ئەوی ترە؟ کەوابوو لە ئێستاوە هۆشیارتان دەکەمەوە: نەخشەیەکی چەپەڵ لەدژی ئاین و نەریت و شێوازی تێڕوانینمان بۆ دنیا لە پشت مردنمەوە هەیە. چاوتان بکەنەوە و بزانن دوژمنانی ئیسلام و نەیارانی ئەو ژیانەی ئێوە باوەڕتان پێی هەیە و دەیگوزەرێنن، بۆچی منیان کوشت و لەبەرچی ڕۆژێک دەتوانن ئێوەش بکوژن؟ دانە بەدانەی قسەکانی مەلای گەورە، مەلا نەسرەدینی ئەرزەڕوومی کەوا من بەدەم فرمێسک ڕشتنەوە گوێم بۆ ڕادەگرتن، وا خەریکە بەدی دێن و دەبن بەڕاستی. با پێتان بێژم، ئەو بەڵایانەی بەسەرماندا هاتووە، تەنانەت ئەگەر بکرێن بە چیرۆک و لە کتێبێکیشدا بنووسرێنەوە، ئەوا دەستڕەنگترین نیگارکێشانیش ناتوانن نیگاری بۆ بکێشن. ئەو کتێبە، هێزی وەلەرزهێنی خۆی، کتومت وەک قورئانی پیرۆز –با بەهەڵە لێک نەدرێتەوە، دووربێت– لە پێکهاتەی هەرگیز دەستنەدراو بۆ کێشانی نیگار سەرچاوە دەگرێت. گومانم هەیە لەوەی توانیبێتتان لەم قسەیەم تێ بگەن.

بڕوانن، من کاتی شاگردیشم لە ڕاستیی بنی قولاییەکان و لە دەنگی لە ئەملاولاوە هاتوو دەترسام، بەڵام بایەخم نەدەدایێ و گاڵتەم بەو جۆرە شتانە دەهات. بنی ئەم بیرە گەنیوە بوو بە کۆتاییم. دەشێت ئەمە لە ئێوەش بقەومێت؛ هەر چاوێکتان بکەن بەچوار. ئێستا جگە لە ئومێدەواربوونم بەوەی بەباشی بڕزێم و بە بۆنی بۆگەنمەوە بمدۆزنەوە، هیچی ترم لە دەست نایەت. هەروەها جگە لە خەیاڵ لێدان لەو ئەشکەنجانەی لە ئەگەری دۆزینەوەی بکوژی پڕوپووچمدا، لەسەر دەستی کەسێکی خێرخواز دەیچێژێت.



# 2

## من ناوم قەرەیە

دوای دوازە ساڵ، وەک ئەوەی بەدەم خەوەوە ڕێ بکەم، خۆم کرد بە ئەستەنبوڵدا، ئەو شارەی تیایدا هاتبوومە دنیاوە و پێ گەیشتبووم. دەڵێن ئەوانەی دەمرن، خاک بەکێشیان دەکات، منیش مردن بەکێشی کردبووم. سەرەتا، کاتێک خۆم بە شاردا کرد، وام زانی تەنیا مردن هەیە، کەچی دواتر ڕووبەڕووی ئەڤین بوومەوە. بەڵام ئەو کاتە، هەروەک چۆن لە سەرەتای گەڕانەوەمدا بۆ ئەستەبوڵ، بیرەوەرییەکانی شارم لەبیر نەمابوو، ئەڤینیش شتێکی دوور و لەبیرکراوی لەو بابەتە بوو. دوازدە ساڵ لەمەوبەر لە ئەستەنبوڵ کەوتبوومە داوی ئەڤینی کچەی تەمەن بچووکی میمکم.

تەنیا چوار ساڵ دوای جێ هێشتنی ئەستەنبوڵ، کاتێک لە بیابانە بێکۆتایی و چیا بە بەفر داپۆشراو و شارە خەمگینەکانی وڵاتی عەجەمدا نامەم دەبرد و دەهێنا و باجم کۆ دەکردەوە، هەستم دەکرد هێدی هێدی ڕووخساری دڵداریی منداڵیی لە ئەستەنبوڵ جێ هێڵدراوم لەبیر دەچێتەوە. دڵەڕاوکێم پێ کەوت و هەوڵی زۆرم دا ڕووخساری بێنمەوە یادی خۆم، بەڵام ئەوەش تێ گەیشتم ئەو ڕووخسارەی مرۆڤ نەیبینێت، چەندیشی خۆش بوێت، لەبەرەوە هەر لەبیری دەکات. لە ساڵی شەشەمی ئەو ساڵانەی لە ڕۆژهەڵات بە کاری نووسیاری و ڕێبواری لە خزمەت پاشاکاندا(*)

(*) پاشا: ناسناوی فەرمیی سەرکردە و پلەدارە سەربازییەکانی سەردەمی عوسمانی بووە و لەم ڕۆمانەشدا هەر بەهەمان واتا بەکارهێنراوە. ئێستاش زیاتر هەر بۆ سەرکردەکانی سوپا بەکار دەهێنرێت، بەڵام بەشێوەیەکی نافەرمی. – وەرگێڕ –

بەسەرم بردن، ئیدی دەمزانی ئەو ڕووخسارەی دەیهێنمە بەرچاوی خۆم، ڕووی ئەڤیندارەکەی ئەستەنبوڵم نییە. دەمزانی ئەو ڕووخسارەی لەساڵی شەشەمدا بە هەڵە هاتبووەوە یادم، لە ساڵی هەشتەمدا لەبیرم کردووە و سەرلەنوێ وەک شتێکی تەواو جیاواز هاتووەتەوە یادم. دوای دوزادە ساڵ، کاتێک لە تەمەنی سی و شەش ساڵیمدا بۆ شارەکەم گەڕامەوە، بەدەم ئازارچێشتنەوە بۆم ڕوون بووەوە هەیهوو فرە لەمێژە ڕووخساری دڵدارەکەم لەبیر چووەتەوە.

زۆرینەی دۆست و خزم و ناسیاوانی گەڕەک لەو دوازدە ساڵەدا مردبوون. چووم بۆ ئەو گۆڕستانەی دەڕوانێت بەسەر کەنداوی زێڕیندا، دوعام بۆ دایکم و مامەکانم، ئەوانەی کاتی نەبوونی من لێرە مردبوون، خوێند. بۆنی خاکە قوڕاوییەکە تێکەڵ بە بیرەوەرییەکانم بوو. کەسێک گۆزەیەکی لە قەراغ گۆڕی دایکم شکاندبوو. نازانم لەبەرچی بوو، سەیری پارچە شکاوەکانی گۆزەکەم کرد و دامە پڕمەی گریان. نەمدەزانی بۆچی دەگریم. بۆ مردووەکان، یان بۆ ئەوەی دوای ئەو هەموو ساڵە هێشتا بەشێوەیەکی سەیر لە سەرەتای ژیانی خۆمدام، یاخۆ تەواو بە پێچەوانەوە هەستم کردبوو گەیشتوومەتە کۆتاییی کاروانی ژیان؟ نەرمە بەفرێک دەستی بە بارین کردبوو. خۆم بەتەواوی لەبیر کردبوو و کەوتبوومە ناو خەیاڵ و سەیری تاک و تەرای کلووە بەفرەکانم دەکرد و دەمبینی بە ئێرە و ئەوێدا بڵاو دەبوونەوە. هێشتا تازە لە پێچ و پەناکانی ژیانی خۆمدا نقوم بووبووم، بینیم وا سەگێکی ڕەش لە گۆشەیەکی تاریکی گۆڕستانەکەوە تێم دەڕوانێت.

فرمێسکەکانم وەستانەوە. لووتم سڕی. کاتێک بینیم سەگە ڕەشەکە بە نیشانەی دۆستایەتی کلکی بۆ لەقاندم، لە گۆڕستانەکە دەرچووم. دواتر خانوویەکم بەکرێ گرت و لە گەڕەک نیشتەجێ بووم. سەردەمی زوو خزمێکی باوکم لەو خانووەدا ژیابوو. ژنی خاوەن ماڵەکە، منی بە کوڕێکی خۆی چوواند کە سەربازەکانی سەفەوی لە شەڕ کوشتبوویان. بڕیار بوو ماڵەکەم بۆ پاک بکاتەوە و خواردنم بۆ چێ بکات.

وەک ئەوەی لە ئەستەنبوڵ نا، بگرە بەشێوەیەکی کاتی لە شارێکی عەرەبیی ئەوپەڕی دنیا نیشتەجێ بووبم و پەرۆشی ئەوە بم بزانم شار شوێنێکی چۆنە، چوومە کوچە و کۆڵانان. دوور و درێژ و تێر بەدڵی خۆم گەڕام. ئەرێ کۆڵانەکان تەنگ





بووبوونەوە، یاخۆ من پێم وا بوو؟ لە هەندێک شوێن لەو کۆڵانە تەنگەبەرانەی سەری خانووەکانیان لە هەردوولاوە لە یەکتر نزیک بووبوونەوە، بۆ ئەوەی خۆم بە ئەسپە بارهەڵگرەکاندا نەکێشم، ناچار بووم بەپاڵ دیوار و دەرگاکاندا بڕۆم. ئایا ژمارەی دەوڵەمەندان زیادی کردبوو، یاخۆ وا دەهاتە بەرچاوی من؟ گالیسکەیەکی ڕازاوە و ورشەدارم بینی، لە قەڵایەک دەچوو بەدوای چەند ئەسپێکی لەخۆبایی و سەرکێشەوە و نە لە عەرەبستان و نە لە عەجەمدا وێنەی نەبوو. لای چەمبەرلیتاش، بڕێک دەرۆزەکەری بێ شەرم و شڕپۆشم بینی لەو بۆنە گەنیوەی لە بازاڕی مریشک فرۆشانەوە دەهات، سەریان بە یەکدا کردبوو. یەکێکیان کوێر بوو، سەیری بەفرەکەی دەکرد و پێ دەکەنی.

ئەگەر بگوترایە ئەستەنبوڵ لە ڕابردوودا هەژارتر و بچووکتر و بەختەوەرتر بووە، لەوانەیە بڕوام نەکردایە، بەڵام دڵم وای دەگوت، چونکە ماڵی خۆشەویستی لە دوای خۆم بەجێ هێشتووم هێشتا لەناو داری ئیخلاموور(*) و شابەڕوودا لە شوێنی خۆی بوو. لە دەرگاوە پرسیارم کرد، بەڵام ئیدی کەسێکی تر لەوێ دادەنیشت. دایکی دڵدارەکەم، واتا پوورم، مردبوو و زاواکەمان و کچەکەی باریان کردبوو. بەقسەی زەلامەکانی بەر دەگا، ئەو کەسانەی هەرگیز تێ ناگەن لە دۆخێکی وادا چەند دژوارانە دڵ و خەیاڵی مرۆڤ دەشکێنن، بڕێک دەرد و بەڵاش بەسەر زاوام و کچەکەیدا هاتبوون. با ئێستا ئەو شتانەتان بۆ نەگێڕمەوە، بەڵام با پێتان بێژم ئەو باخچە کۆنەی چلوورەی بەقەد پەنجە تووتەم درێژ بە لق و چڵی دار ئیخلاموورەکانیدا شۆڕ بووبووەوە و من ڕۆژە گەرم و پڕ لە سەوزایی و هەتاوییەکانی هاوینیم بیر کەوتەوە، لەبەر خەم و بەفر و بێ خزمەتی، مردنی دەهێنایەوە بیری مرۆڤ.

من خۆم لە ڕێی نامەیەکەوە، کە زاوام بۆ تەورێز بۆی ناردبووم، ئاگادار بووم لە بەشێک لەو کارەستانەی بەسەر کەسوکارمدا هاتبوون. لەو نامەیەدا، زاوام منی بۆ

---

(*) ئیخلاموور: بەعەرەبی: زەیزەفوون و بەفارسی: نمدار. جۆرێکی داری تەمەن درێژە و بەزۆری لە نیوەی باکوری گۆی زەوی و لە ئەوروپا دەڕوێت و بۆ بەرهەمهێنانی داوودەرمان کەڵکی لێ وەردەگیرێت. – وەرگێڕ –

ئەستەنبولّ بانگ کردبوو، نووسیبووی کتێبێکی نهێنی بۆ سوڵتانمان ئامادە دەکات و داوای لێ کردبووم هاوکاریی بکەم. گەیشتبووەوە گوێی زاوام من سەردەمانێک لە تەورێز کتێبم بۆ پاشاکانی عوسمانی و والییەکان و تکاکارانی ئەستەنبولّ ئامادە کردووە. ئەوەی لە تەورێز دەمکرد، بریتی بوو لە: پێشەکی پارەم لەو تکاکارانەی ڕاسپاردەی کتێبیان دەدا، وەردەگرت و پاشان ئەو نیگارکێش و خۆشنووسانەم دەدۆزییەوە کە گازندەیان لە شەڕ و سەربازەکانی عوسمانی دەکرد و هێشتا شاریان جێ نەهێشتبوو و ڕوویان لە قەزوین و شارەکانی تری عەجەم نەکردبوو. من پەڕەی کتێبەکانم بەو وەستا مەزنانەی بەدەست بێ بازاڕی و گرینگی پێ نەدانەوە ناڵەیان دەهات بە نووسینەوە و نەخشاندن و بەرگ تێگرتن دەدا و دواتر بۆ ئەستەنبولّم دەناردەوە. زاوام لە تافی لاویمدا منی فێری نەخش و نیگار و ئەڤین و جوانیی کتێب کردبوو و ئەگەر ئەو بەهرەیەم نەبووایە، هەرگیز نەمدەتوانی خۆم لە قەرەی ئەو جۆرە کارانە بدەم.

لەو کۆڵانەی سەردەمانێک زاوام لێی دانیشتبوو، لەو گۆشەیەی ڕووەو بازاڕ دەکرێتەوە، دووکانێکی سەرتاشی هەبوو. سەرتاشەکە هێشتا لە دووکانی خۆی، لەناو هەمان ئاوێنە و گوێزان و مەسینە و تەلی سابووندا بوو. نیگامان یەکانگیر بوو، بەڵام نەمزانی داخۆ منی ناسییەوە یان نا. کاتێک بینیم ئەو قاپی سەرشۆرینەی ئاوی گەرمی تێ دەکرد و بەزنجیر بەبنمیچی دووکانەوە هەڵی دەواسی، هێشتا ئەمبەر و ئەوبەر دەکات و وەک جاران هەمان کەوانە دەکێشێت، دڵم گەشایەوە. هەندێک لەو کوچە و کۆڵانانەی لە تافی لاویمدا پێیاندا ڕۆیشتبووم، لە ماوەی دوازدە ساڵاندا سووتابوون و بووبوون بە خۆڵەمێش و فەوتابوون. بووبوون بە شوێنی سووتاوی و وارگەی سەگی ڕێبڕ و شێتانی فریشکبەری منداڵان. لە شوێنی هەندێکیشان باڵەخانەی خەڵکانی دەوڵەمەند بنیات نرابوون و کەسانی وەک منی لە دوورەوەهاتوویان سەرسام دەکرد. پەنجەرەی هەندێک لەوانە گرانترین شووشەی ڕەنگینی ڤینیسایی تێ گیرابوو. چەندین خانووی دوو نهۆمی دەوڵەمەندانم بینی شانشین بە دیوارە بەرزەکانیانەوە هەڵواسرابوون و کاتی نەبوونی من لە ئەستەنبولّ بنیات نرابوون.



وەک زۆربەی شارەکانی تر، لە ئەستەنبوڵیش پارە هەر هیچ بەهایەکی نەمابوو. ئەو سەردەمەی من ڕووم لە ڕۆژهەڵات کرد، نانەواخانەکان بە ئاکچەیەک نانێکی گەورەی چوارسەد درهەمییان دەدا. ئێستا بەهەمان پارە نیوەی ئەو نانەیان دەدا و سەرباری ئەوەش تامی نانەکە بەهیچ جۆرێک سەردەمی منداڵیی بیری مرۆڤ نەدەخستەوە. ئەگەر دایکی خوا لێخۆشبووم بیبینیایە پێویستە بۆ دوازدە هێلکە سێ ئاکچە بژمێردرێت، دەیگوت با بەرلەوەی مریشکەکان لەخۆ بایی بن و جیقنەمان پێدا بکەن، بۆ زێدێکی تر هەڵبێین. بەڵام دەمزانی ئەم پارە بێ نرخە بەگشت لایەکدا تەشەنەی کردووە. دەگوترا ئەو کەشتییە بازرگانییانەی لە فلاندەرستان و ڤینیسیاوە دێن، پڕن لە سندووقی ئەو پارە قەڵبانە. جاران لە سکەخانە، لە سەد درهەمی زیوین پێنجسەد ئاکچە دروست دەکرا، بەڵام ئێستا بەهۆی شەڕی لە بڕانەوە نەهاتووی دژ بە سەفەوییەکان، لە هەمان سەد درهەم، هەشتسەد ئاکچە دروست دەکرێت. یەنیچەرەکان بینیبوویان ئەو ئاکچانەی وەری دەگرن، کاتێک دەکەوێتە ئاوی کەنداوی زێڕینەوە، وەک ئەو دەنکە فاسۆلیا وشکانەی کە لە لەنگەرگای سەوزەوە دەکەوێتە دەریاوە و سەر ئاو دەکەوێت، یاخی بووبوون و جۆری ئەوەی قەڵای دوژمن بێت، کۆشکی سوڵتانمانیان ئابلۆقە دابوو.

مەلایەک هەبوو بەناوی نوسرەت لە مزگەوتی بایەزید وتاری دەخوێند و وای بڵاو کردبووەوە سەیدە و لە ڕەچەڵەکی حەزرەتی محەمەدە. ئەم مەلایە لەو بێڕەوشتی و گرانی و تاوانکاری و تالانکردنەدا ناوبانگی دەرکردبوو و ناسناوی ئەرزەڕوومی بەسەردا سەپابوو. ئەو، هۆکاری گشت ئەو کارەساتانەی بەدرێژاییی دە ساڵی ڕابردوو ئەستەنبوڵی گرتبووەوە، ئاگرکەوتنەوەی گەڕەکانی باخچەقاپی و قازانجیلار، ئەو پەتایەی لە هەر هاتنێکیدا بۆ شار دەیان هەزار کەسی دەکوشت، بەدەستنەهێنانی ئەنجام لە شەڕی دژ بە سەفەوییەکان سەرباری ئەو گشت قوربانیدانە، یاخیبوونی کرستییانەکانی ڕۆژئاوا و گرتنەوەی قەڵا بچووکەکانی عوسمانیی دەگەڕاندەوە بۆ لادان لە ڕێی حەزرەتی محەمەد، دوورکەوتنەوە لە فەرموودەکانی قورئانی پیرۆز، نەرمی نواندن لە بەرامبەر کرستییانەکان و فرۆشتنی شەراب بە ئازادی و سازژەنین لە تەکیەکاندا.

ئەو ترشیاتفرۆشەی بەجۆشەوە باسی مەلای ئەرزەڕوومی دەکرد و ئەو هەولانەی دەدامێ، گوتی پارەی قەڵبی تەشەنەکردوو لە بازاڕ، دووکانە نوێیەکان، فلۆرینی[*] وێنەی شێر لەسەر ئەو ئاکچانەی تا دێت زیویان کەم دەکات، کتومت وەک ئەو چەرکەز و ئاباز و مینگەری و بۆشناق و گورجی و ئەرمەنییانەی کۆڵانەکانیان پڕ کردووە، پاڵیان بە مرۆڤەوە ناوە بەرەو بەدڕەوشتییەکی مسۆگەر کە گەڕانەوە لێی کارێکی دژوارە. بەقسەی ئەو، بێڕەوشتان و گوناهکاران لە چایخانەکان دادەنیشن و تا بەیانی دووزمانی و بوختان دەکەن. سەرڕووتانی بێ ڕەچەڵەک، سەرشێتانی ئەفیونکێش و پاشماوەی قەلەندەران، گوایە ئەمە ڕێگای خوایە، تا بەیانی لە تەکیەکان بەدەم مۆسیقاوە سەما دەکەن و شیش بە ئێرە و ئەوێی خۆیاندا دەکەن. دوای ئەنجامدانی هەموو جۆرێکی بەدڕەوشتی، هەم سواری یەکتر دەبن و هەم منداڵانی بچووک.

نازانم دەنگی شیرینی عوودێکم بیست و دوای کەوتم، یاخۆ ئەو جەنجاڵییەی ئەقڵم، کە من بە بیرەوەری و خواستەکانی خۆمم دەزانی، لەبەر ژەهری ترشیاتفرۆشەکە زیاتر خۆی بۆ ڕانەگیرا و ڕێی دەرچوونی پێشان دام. ئەو شتەی من دەیزانم ئەمەیە: ئەگەر شارێکتان خۆش بوێت و زۆر تیایدا بسوڕێنەوە، نەک هەر بە ڕۆحتان، بگرە بە جەستەشتان هەر لە خۆتانەوە ئاشنای گەڕەک و کۆڵانەکانی دەبن و لە ساتێکی مەلوولدا و گاڤێک بەفر بەخەمگینی دەبارێت، لاقەکانتان لە خۆیانەوە دەتانبەنە سەر ئەو گردەی خۆتان حەزی لێ دەکەن.

بەوجۆرە بازاڕی ناڵبەندانم جێ هێشت و لە تەنیشت مزگەوتی سولەیمانییەوە سەری ئەو بەفرەم دەکرد کەوا بەسەر کەنداوی زێڕیندا دەباری: ئەو سەربانانەی ڕوویان لە باکور بوو و قوبەکانیان با دەیگرتەوە، لە ئێستاوە بەفر دای پۆشیبوون. چارۆکەکانی کەشتییەکی ڕوو لە شار بەدەم داگرتنیانەوە دەلەرینەوە و سڵاویان لە من دەکرد و وەک ڕووی ئاوی کەنداو لە هەمان ڕەنگی خۆڵەمێشییی تەمدا نقوم بوون. دار سنەوبەر و چنارەکان، دیمەنی سەربانەکان، دڵتەنگیی ڕۆژئاوابوون، دەنگی

---

(*) فلۆرین: جۆرێک بووە لە پارەی کانزاییی زێڕین و یەکەم جار سەدەی یازدەمی کۆچی لە شاری فلۆرەنسای ئیتاڵیا لە سکە دراوە و بەناوی ئەو شارەوە ناونراوە. – وەرگێڕ –



ناوەوەی گەڕەکەکانی لای خوارەوە، هاوار و قیڕەی فرۆشیارانی گەڕۆک و قیژەی منداڵانی ناو حەوشی مزگەوتەکان لەناو سەرمدا یەکیان گرت و بەشێوەیەکی دوور لە سەرسوڕمان پێیان دەگوتم لەمەودا لەم شارەدا نەبێت، ناتوانی لە هیچ شوێنێکی تردا ژیان بگوزەرێنیت. بۆ تاوێک پێم وابوو ڕووخساری لە چەندین ساڵ لەمەوبەرەوە لەبیرکردووی ئەڤیندارەکەم دەخوازێت بێتەوە بەرچاوم.

لە بەرزاییەکە هاتمە خوارەوە و خۆم کرد بەناو ئاپۆڕەی خەڵکدا. دوای بانگی ئێوارە لە دووکانێکی جگەرفرۆش گەدەی خۆم پڕ کرد. بەوردی گوێم بۆ قسەکانی کابرای خاوەنی دووکانە چۆڵەکە ڕاگرت. یارۆ وەک ئەوەی پشیلە بەخێو بکات، بەبەزەییەوە چاودێریی پارووەکانی دەکردم. بەو سروش و ناوونیشان هەڵدانەی لەوەم وەرگرت، دوای تاریک داهاتنی کۆڵانەکان بەباشی، چوومە کۆڵانێکی تەنگی پشت بازاڕی دیلفرۆشان و لەوێ چایخانەکەم دیتەوە.

ناو چایخانەکە پڕ و گەرم بوو. ئەو چیرۆکبێژەی زۆر جاران لە شێوەی ئەوم لە تەورێز و شارەکانی عەجەم بینیبوو و لەوێ چیرۆکبێژ نا، پەردەداریان پێ دەگوترا، لە بەرزییەکی دواوەی تەنیشت ئاگردانەکە دانیشتبوو. بەتەنیا نیگارێک، نیگاری سەگێکی کردبووەوە و هەڵی واسیبوو. نیگارەکە بەپەلە، بەڵام زۆر هونەرمەندانە لەسەر کاغەزێکی ئەستوور کێشرابوو. ناوبەناو ئاماژەی بۆ سەگی ناو نیگارەکە دەکرد و لە زمانی ئەوەوە چیرۆکی دەگێڕایەوە.

# 3

## من سەگم

وەک ئێوەش دەبینن، کەڵبەکانم هێندە تیژ و درێژن بەزۆر لە دەممدا جێیان دەبێتەوە. دەزانم ئەمە دیمەنێکی ترسناکم پێ دەبەخشێت، بەڵام چێژی لێ وەردەگرم. جارێک قەسابێک لە گەورەیی کەڵبەکانمی ڕوانی و گوتی:

"کوڕە خۆ ئەمە سەگ نییە، بەرازە."

گازێکی وەهام لێ گرت تا بە نووکی کەڵبەکانم، لەو شوێنەی کۆتایی بە گۆشتی چەوری دێت، هەستم بە ڕەقیی ئێسکەکانی ڕانی کرد. بەلای سەگەوە هیچ شتێک هێندەی ئەوە بەچێژ نییە بەڕق و تووڕەبوونێکی هەڵقوڵاو لە ناخەوە کەڵبەکانی لە گۆشتی دوژمنێکی بەرباد بچەقێنێت. کاتێک هەلێکی وەهام بۆ دەڕەخسێت و قوربانیی گەستن حەلاڵکردووم بێ ئەقڵانە بەپێشمدا تێ دەپەڕێت، لە خۆشیاندا بەرچاوم ڕەش دەبێت، کەڵبەکانم چەشنی ئەوەی ئازاریان هەبێت، جیرەیان دێت و بێ ئەوەی بەخۆم بزانم، دەست دەکەم بە دەرکردنی نرکەنرکێکی وا لە گەروومەوە تەنانەت ئێوەمانانیش دەترسێنێت.

من سەگێکم و ئێوەش لەبەرئەوەی ئافرێندراوی هێندەی من شیاو نین، دەڵێن ئەرێ سەگ دەتوانێت بدوێت؟ بەڵام لەلایەکی ترەوە، وا دەردەکەوێت باوەڕتان بەو چیرۆکانە هەبێت کە مردووان قسەی تێدا دەکەن و پاڵەوانەکانی ناوی وشەگەلێک بەکار دێنن کە خۆشیان واتایان نازانن. سەگەل دەدوێن، بەڵام تەنیا بۆ کەسانێ بزانن گوێیان لێ بگرن.



هەبوو، نەبوو، سەردەمانێک مەلایەکی دنیانەدیو هەبوو لە شارێکی دوورەدەستەوە هاتبووە یەکێک لە مزگەوتە گەورەکانی پایەتەخت، دەی با بڵێین مزگەوتی بایەزید. لەوانەیە پێویست بێ ناوی بەنهێنی بمێنێتەوە، با بۆ نموونە بەمەلا خوسرەت ناوی ببەین. بەڵام ئیدی چ درۆیەکی تر بکرێت، ئەم مەلایە کابرایەکی لاسار و سەروشک بوو. بەڵام هێندەی تۆو لە سەریدا کەم بوو، بێچاوێنی بێت، ئەوەندەش زمانی بەهێز هەبوو. گشت ڕۆژێکی هەینی دەستەی نوێژکەرانی بەشێوەیەک جۆش دەدا تا ڕادەی ئەوەی هەندێکیان چاویان وشک دەبوو، لە هۆش خۆیان دەچوون و دەبوورانەوە. لە ڕێی خوا با بەهەڵە لێک نەدرێتەوە؛ ئەو هەرگیز وەک مەلایانی تری زماندرێژ نەدەگریا؛ بگرە تەواو بەپێچەوانەوە، کاتێک هەموان دەگریان، ئەو تەنانەت برژانگیشی نەدەبزواند و شێوازی قسەکردنیشی وەک ئەوەی بیەوێت لۆمە و سەرزەنشتی جڤات بکات، هێزی زیاتری پێ دەبەخشی. سەرجەم پاسەوانانی پارێزەری ئاسایشی شار و پاسەوانی کۆشکی سوڵتان و حەلوافرۆشان و ئاپۆڕەی پێخاوسان و ژمارەیەکی زۆری مەلای جۆری خۆی، لە سۆنگەی حەز و ئارەزوویانەوە بۆ لۆمە و سەرزەنشت، بووبوون بە بەندە و کۆیلەی ئەو کابرایە. ئێ، خۆ ئەویش سەگ نەبوو، مرۆڤێک بوو شیری خاوی خواردبوو. لە بەردەم ئەو ئاپۆڕە سەوداسەرەدا خۆی بەباشی لەبیر دەچێت و کاتێک دەبینێت ترساندنیش بارتەقای گریاندنی جڤات چێژی هەیە و بۆی ڕوون دەبێتەوە نان لەم کارەدایە، بەتەواوی جڵەو لە دەست دەدات و دەگاتە ئەو ئاستەی بڵێ:

تاکە هۆکاری گرانی و پەتا و دۆڕانەکان لەبیرکردنی ئیسلامی سەردەمی حەزرەتی محەمەد و لەخشتەبردن و باوەڕهێنانمانە بەناوی ئیسلامەوە بە کتێب و درۆی تر. کوا لە ڕۆژگاری حەزرەتی محەمەددا مەولود خوێندن هەبووە؟ چما چلە گرتن بۆ مردووان و بەخشینەوەی حەلوا و پاروو لە پێناوی ڕۆحیاندا هەبووە؟ ئەرێ لە سەردەمی حەزرەتی محەمەد خوێندنی قورئانی پیرۆز وەک گۆرانی بەمەقامەوە هەبووە؟ بۆچ کەس هەبووە بەسەر منارە بکەوێت و بڵێت بزانم دەنگم چەند خۆشە و عەرەبییەکەم تا چ ڕادەیەک لە عەرەب دەچێت، لووتبەرزیی نواندبێت و وەک ژنان بە قوون بادانەوە بانگی دابێت؟ ئێستا خەڵکی دەچنە گۆڕستان و دەپاڕێنەوە، هانا بۆ مردووان دەبەن. دەچنە سەر گۆڕەکان و وەک بتپەرستان بەرد دەپەرستن. پارچە

پەرۆ بە کێلەکانەوە دەبەستن و نەزر دەگرنەوە. چما لە دەورانی حەزرەتی محەمەددا پەیڕەوانی تەریقەت هەبوون تا ئەم ڕێیانە پێشانی خەڵکی بدەن؟ شێخی ڕێ پێشاندەری پەیڕەوانی تەریقەت، "إبن العربي"، لەبەرئەوەی سوێندی خواردووە فیرعەون بە باوەڕەوە مردووە، گوناهبار بووە. هەموو پەیڕەوانی تەریقەت، خەڵوەتپەرستان، قەلەندەران، ئەوانەی بەدەم ژەنینی سازەوە قورئانی پیرۆز دەخوێنن و لەگەڵ منداڵانی قووندەردا سەما دەکەن و دەڵێن پێکەوە دوعا دەکەین، هەر هەموویان کافرن. پێویستە تەکیەکان بڕووخێنرێن، بناخەکانیان حەوت گەز هەڵبکەنرێت و خۆڵ و گڵی دەرهێنراویان بڕژێنرێتە دەریاوە تا بتوانرێت لە شوێنەکانیان نوێژ بخوێنرێت.

ئەم مەلا خوسرەتە هارتر بووە و لیک بە دەمیدا هاتووەتە خوارێ و گوتوویەتی ئەی گەلی باوەڕمەندان، قاوەخواردنەوە حەرامە. حەزرەتی پێغەمبەرمان لەبەرئەوەی زانیویەتی قاوە مرۆڤ گێژ دەکات و گەدە کون دەکات و دەبێتە هۆی پشتئێشە و نەزۆکی و تێ گەیشتووە گەمەی ئیبلیسە، نەیخواردووەتەوە. گوتوویەتی قاوەخانەکانی ئێستا شوێنی ئەهلی کەیف و سەفا و دەوڵەمەندانی ئالوودەی زەوقە و ئەمانە لە پاڵ یەکتر دادەنشین و هەموو جۆرە بێ ئابڕووییەک دەکەن. بۆیە بەر لە تەکیەکان، پێویستە قاوەخانەکان دابخرێن. چما هەژاران پارەی قاوە خواردنەوەیان هەس؟ دەچنە قاوەخانەکان و کەیف و سەفای خۆیان لە قاوەدا دەبیننەوە و سەری پەتەکە هێندە شل دەکەن و لەوێ گوێ بۆ قسە و باسی سەگی خوێڕی ڕادەگرن و وا دەزانن ڕاستە. مەلا خوسرەت ئەمە دەڵێت: "ئەوەی جنێو بە من و ئاینەکەمان بدات، سەگە."

به دەستووری ئێوە، دەمەوێت وەڵامی دوایین قسەی ئەم مەلا ئەفەندییە بدەمەوە. هەڵبەتە بەلای بەڕێزتانەوە ئاشکرایە دەستە و تاقمی حاجی، خۆجە، مەلا و پێشنوێژان ئێمەی سەگەلیان هیچ خۆش ناوێت. بەبۆچوونی من، بابەتەکە پێوەندیی بەوەوە هەیە کەوا جارێک حەزرەتی محەمەد چەمکی کەوای بەر خۆی دڕیبوو بۆ ئەوەی ئەو پشیلەیەی لەسەری نووستبوو، بێدار نەبێتەوە. مەبەست لەم قسەیە ئەوەیە بیر بخرێتەوە ئەو زەرافەتەی پێشانی پشیلە دراوە، پێشانی ئێمە نەدراوە و بگوترێت



لەبەر شەڕی لەمێژینەی ئێمە لەدژی ئەو ئافرێندراوەی گەمژەترین ئادەمیزادیش بە بێ وەفاییی ئەو دەزانێت، نێردراوی خوا دوژمنایەتیی لەگەڵ سەگەلدا هەبووە. نەبردنە ژوورەوەمان بۆ مزگەوت بەبیانووی ئەوەی دەبینە هۆی شکاندنی دەستنوێژ و ئەو تێ هەڵدانەی سەدان ساڵە بە گسکە دەسک درێژەکانی دەستی مجێورەکان دەیخۆین، ئەنجامی ئەو وێناکردنە هەڵەیەیە و بەنیازی خراپ کراوە.

دەخوازم سوورەتی "الكهف"تان بیر بخەمەوە کە جوانترین سوورەتی قورئانی پیرۆزە. نەک لەبەرئەوەی مەبەستم بێت لەم قاوەخانە جوانە کەسانی بێ کتێبی قورئانی پیرۆز نەخوێن هەبن، بگرە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بیریان بخەینەوە: ئەم سوورەتە بەسەرهاتی حەوت گەنج دەگێڕێتەوە کە لە گوزەراندنی ژیان لەناو بتپەرستان بێزار دەبن و دەچنە ئەشکەوتێکەوە و دەنوون. خوا مۆرێک لە گوێی هەریەکەیان دەدات و ماوەی سێسەد و نۆ ساڵ دەیانخەوێنێت. دوای ئەوەی بێدار دەبنەوە و یەکێک لە حەوت گەنجەکان دەچێتە ناو خەڵکەوە و سەیر دەکات ئەو سکەیەی پێیەتی، سەرف نابێت، گەنجەکان حاڵی دەبن لەو نێوانەدا ئەوەندە ساڵ تێ پەڕیوە و زۆر سەریان سوڕدەمێنێت. ئەم سوورەتە باسی پەیوەستبوونی ئادەمیزاد بە خوا، پەرجووەکانی، تێپەڕبوونی کات و شیرینیی خەوێکی قوڵ دەگێڕێتەوە. هەرچەندە حەدم نییە، بەڵام دەمەوێت بیرتان بخەمەوە لە ئایەتی هەژدەیەمی ئەم سوورەتەدا باسی سەگی بەر دەروازەی ئەشکەوتی شوێنی خەوتنی ئەو حەوت گەنجە کراوە. بێگومان هەموو کەسێک ناوی لە قورئانی پیرۆزدا هاتبێت، بۆی هەیە شانازیی پێوە بکات. منیش وەک سەگێک شانازی بەم سوورەتەوە دەکەم و دەڵێم، خوا یار و یاوەر بێت، ئەقڵ دەخاتەوە سەری ئەو ئەرزەڕوومییانەی کە دوژمنانی خۆیان بە سەگی خوێڕی ناو دەبەن.

کەواتە ڕەگ و ڕیشەی ئەم دوژمنایەتیکردنەی دژ بە سەگەل بۆچی دەگەڕێتەوە؟ بۆچی سەگ بە گڵاو دەزانن و کاتێک دێتە ماڵەکانتانەوە، کون و کەلەبەر دەشۆن و هەموو شتێک بسمیل دەکەن؟ بۆچی ئەوەی دەستمان پێوە دەدات، دەستنوێژی دەشکێت؟ بۆچی ئەگەر لۆی پۆشاکتان بە ئاستەم بەر تووکی تەڕی سەگێک بکەوێت، لە خۆتانی دەکەنەوە و وەک پیرەژنی هار حەوت جارانی دەشۆن؟ تەنیا مسگەران

دەتوانن ئەو درۆیە ئاشکرا بکەن کە دەڵێت ئەگەر سەگ مەنجەڵێکی لێستەوە، ئەوا دەبێت یان فڕێ بدرێت، یاخۆ سپی بکرێتەوە. لەوانەیە پشیلەش.

دوای ئەوەی مرۆڤ دەستی لە گوند و چۆڵەوانی و کۆچبەری هەڵگرت و لە شار گیرسایەوە، سەگی شوانان لە گوند مانەوە و ئەو کاتە ئیدی ئێمەی سەگەل گلاو بووین. پێش ئیسلام، مانگێک لە دوازدە مانگەی ساڵ بۆ سەگەل بوو. کەچی ئێستا سەگ بە مایەی نەگبەتی دادەنرێت. نامەوێت بەم کاتی ئێوارەیە ئێوەی دۆستانم، ئێوەی خوازیاری فێربوونی کەمێک دەرز بە دەردەکانی خۆم خەمگین بکەم. هۆی تووڕەبوونم ئەوەیە مەلا ئەفەندیی ئێمە بەخراپە باسی قاوەخانەکانمان دەکات.

باشە ئەگەر بڵێم باوکی خوسرەتی ئەرزەڕوومی نەناسراوە، ئێوە چی دەفەرموون؟ بە منیشیان گوتووە تۆ چ سەگێکیت و لەبەرئەوەی خاوەنەکەت چیرۆکبێژە و نیگارێکی لە قاوەخانە هەڵواسیوە و چیرۆک دەگێڕێتەوە، تۆ بۆ ئەوەی پاسی بکەیت، چغە، لەدژی مەلا ئەفەندی زمان درێژی دەکەیت. دووربێت، زماندرێژی ناکەم. من قاوەخانەکانی خۆمانم زۆر خۆش دەوێت. ئەرێ دەزانن هۆی دڵگرانیم لەبەر ئەوە نییە گوایە لەسەر کاغەزێکی هەرزانبەها نیگارم کێشراوە، یان بەهۆی ئەوەی سەگم، بگرە داخی ئەوە دەچێژم ناتوانم لەگەڵ ئێوەدا دانیشم و وەک مرۆڤ قاوە بخۆمەوە. ئێمە لەپێناو قاوە و قاوەخانەکانماندا دەمرین... بەڵام ئەمە چییە... بڕوانە، وەستام لە قاوەجۆشەکە قاوەم بۆ تێ دەکات. مەڵێن: ئەرێ هەرگیز بووە نیگار قاوە بخواتەوە؟ مەڵێن: بڕوانن، بڕوانن، سەگ فڕەفڕ قاوە دەخواتەوە.

ئۆی، زۆر خۆش بوو، هەناومی گەرم کردەوە، بەرچاومی ڕۆشن کردەوە، بیری ئاوەڵا کردم و سەرنج بدەن چیم بەئەقڵدا هات: ئایا دەزانن دۆقی ڤینیسیا جگە لە چەندین تۆپی قوماشی ئاوریشمین و پۆشاکی چینیی بە گولیلکی شین خەملێندراو، چی تری وەک دیاری بۆ نوورحەیات سوڵتانی کچی حەزرەتی سوڵتانمان ناردووە؟ دەڵە سەگێکی نازداری فەرەنگیی(*) تووک لە ئاوریشم و تووکی سەگی لە ئاویش نەرمتر. ئەو دەڵە سەگە لەبەر نازداری پۆشاکی سووری ئاوریشمینی لەبەر کراوە.

---

(*) فەرەنگ: لەم وڵاتانەی لای خۆمان لە ڕابردوودا بە ئەوروپایی گوتراوە: فەرەنگ. نووسەریش ئەم ناوەی لەم ڕۆمانەدا بۆ هەمان مەبەست بەکار هێناوە. – وەرگێڕ –



یەکێک لە برادەرانمان بۆی پێوە ناوە، بۆیە دەیزانم: بێ جلەکانی، تەنانەت جووتبوونیشی پێ ناکرێت. ئاشکرایە لەو وڵاتی فەرەنگستانە هەموو سەگەل جلی لەوجۆرە دەپۆشن. دەڵێن گوایە لەوێ ژنە فەرەنگێکی زۆر خانەدان، نازانم سەگێکی ڕووت یان هەرامەی سەگەکەی بینیووە، گوتوویەتی: "ئای ئاژەڵی ڕووت و قووت" و کەوتووە و بووراوەتەوە.

وەک دەگوترێت، لە فەرەنگی وڵاتی گاوران هەر سەگێک خاوەنی خۆی هەیە. سەگی بەستەزمان زنجیر لە ملن و چەشنی پەرێشانترین کۆیلە دانە بەدانە بە زنجیرکراوی بە کۆڵانەکاندا دەگەڕێندرێن. ئەو پیاوانە دواتر سەگەکان دەبەنەوە ماڵی خۆیان و تەنانەت دەیانبەنە ناو پێخەوەکانی خۆیشیانەوە. تۆ واز لەوە بێنە سەگێگ بۆن بە سەگێکی ترەوە دەکات و لێی دەپەڕێت، بەڵام لەوێ دوو سەگ ناتوانن پێکەوە بگەڕێن. کاتێک سەگەلی زنجیرکراو بەو ڕەوشە پەرێشانەی خۆیانەوە لە کۆڵانەکاندا تووشی یەکدی دەبن، بە چاوی خەمگینەوە لە دوورەوە سەیری یەکتر دەکەن، هەر ئەوەندە و بەس. ئەوە ناچێتە ئەقڵی گاورانەوە کە ئێمەی سەگەل بەکۆمەڵ و بەسەربەستی بە کۆڵانەکانی ئەستەنبوڵدا دەسوڕێینەوە، خاوەن و ئەفەندیمان نییە، لە کاتی پێویستدا ڕێ دەبڕین و بە ئارەزووی دڵی خۆمان لە گۆشەیەکی گەرمدا کۆ دەبینەوە، لە سێبەر پاڵ دەکەوین و سەرخەوی شیرین دەشکێنین، لەکوێ بمانەوێت دەڕین و هەرکەسیشمان بوێت دەیگەزین. وەنەبێت بیرم لەوەش نەکردبێتەوە تۆ بڵێی لەم سۆنگەیەوە بێت موریدانی ئەرزەڕوومی دژی ئەوە بن خەڵک لە کۆڵانەکانی ئەستەنبوڵ بەمەبەستی خێر بەدەم دوعاکردنەوە گۆشت بۆ سەگەل باوێژن و وەقف بۆ ئەو مەبەستە دابمەزرێنن؟ ئەگەر نیازی ئەمانە لە دوژمنایەتیکردنی سەگ زیاتر، گاورستانی بێت، ئەوا با بەبیری بێنمەوە کە دوژمنایەتیکردنی میللەتی سەگ خۆی لە خۆیدا ئەوپەڕی گاورستانییە. چاوەڕێ دەکەین کاتێک برادەرانی جەلاد ئەو هیچ لەباردانەبووانە هەڵدەواسن و ئومێدەوارم ئەو ڕۆژە زۆر دوور نەبێت، وەک ئەوەی هەندێک جار بۆ پەند دەیکەن، بانگی ئێمەمانانیش بکەن تا پارچەی گۆشتیان بخۆین.

لە کۆتاییدا دەمەوێت ئەم بەسەرهاتە بگێڕمەوە: خاوەنی پێشووم مرۆڤێکی فرە دادپەروەر بوو. شەوان کاتێک بۆ تاڵانی دەردەچووین، ئەرکی خۆمان دابەش دەکرد:

کاتێک من دەستم بەوەڕین دەکرد، ئەو قوڕگی یارۆی دەبڕی و بەوجۆرە لەبەر وەڕینی من قیڕەی کابرا نەدەبیسترا. لە بەرامبەر ئەوەشدا، ئەو تاوانبارانەی بەسزای دەگەیاندن، پارچە پارچە دەکرد و دەیکوڵاند و دەیدا بە من و منیش دەمخوارد. من حەزم لە گۆشتی خاو نییە. ئومێدەوارم ئیدی جەلادی مەلای ئەرزەڕوومی بیر لەوە بکاتەوە من گۆشتی ئەو چەپەڵە بە خاوی ناخۆم و گەدەی خۆمی پێ تێک نادەم.



# 4

## دواجار پێم دەڵێن بکوژ

تەنانەت تۆزقاڵێکیش پێش ئەوەی ئەو بودەڵەیە بکوژم، پێم بگوترایە من کەسێک دەکوژم، هەرگیز بڕوام نەدەکرد. بۆیە ئەو شتەی من کردوومە، هەندێک جار وەک گالیۆنێکی(*) بیانی لە ئاسۆدا ون دەبێت و تا دەچێت بچووک دەبێتەوە. جاروباریش وا هەست دەکەم هیچ تاوانێکم ئەنجام نەدابێت. چوار ڕۆژ بەسەر کوشتنی زەریفی ڕەبەنی برامدا تێ پەڕی کە بە ناڕەزای دڵ کوشتم و ئێستا کەمێک لەگەڵ دۆخەکەدا ڕاهاتووم.

هەوڵی زۆرم دا بێ ئەوەی پیاوکوشتنی تێ بکەوێت، ئەو بەڵایەی بۆم هاتبووە پێش، چارەسەر بکەم، بەڵام دەستبەجێش حاڵی بووم هیچ ڕێیەکی ترم پێ شک نابرێت. هەر لەوێ کارەکەم بڕاندەوە و گشت لێپرسراوییەکم گرتە ئەستۆی خۆم. مۆڵەتم نەدا بەهۆی درۆی بێ ئەقڵێکەوە سەرجەم دەستەی نیگارکێشان بکەونە مەترسییەوە.

سەربارى ئەوەش خۆڕاهێنان لەسەر بکوژی، کارێکی دژوارە. لە ماڵەوە ناحەوێمەوە و دەچمە کۆڵان. لەوێش ناگیرسێمەوە و دەڕۆمە کۆڵانێکی تر. پاشان لەو کۆڵانەشەوە دەچمە ئەوی تر و کاتێک لە ڕووی مرۆگەل ورد دەبمەوە، دەبینم زۆر کەس لەوانەی هێشتا هەلی ئەنجامدانی تاوانیان نەکەوتووەتە دەست، خۆیان بە

(*) گالیۆن: جۆرێک بووە لە کەشتیی شەڕ و لە نیوەی یەکەمی سەدەی شازدەیەمی زایینیدا لەسەر دەستی بەریتانی و ئیسپانی و پورتوگالییەکان داهێنراوە و لە دۆزینەوەی پارزەمینی ئەمەریکادا بەکار هێنراوە. – وەرگێڕ –

بێتاوان دەزانن. لە سۆنگەی ئەم مەسەلە بچووکەی بەخت و چارەنووسەوە کە ڕووبەڕووم بووەتەوە، دژوارە بگوترێت زۆربەی مرۆگەل لە من بەڕەوشتتر یان باشترن. هەبێت و نەبێت لەبەرئەوەی هێشتا تاوانیان ئەنجام نەداوە، کەمێک گەمژە دێنە بەرچاو و وەک هەمووو کەمژەکانیش نیازپاک دیارن. دوای کوشتنی ئەو داماوە، چوار ڕۆژ خوولانەوەم بە گەڕەک و کۆڵانەکانی ئەستەنبوڵدا بەس بوو بۆ ئەوەی تێ بگەم هەرکەسێک لەوانەی من لە چاویاندا ترووسکاییی زیرەکی و لە ڕووخساریاندا سێبەرێکی هەڵقوڵاوی ناو ڕۆحیانم بینی، بکوژێکی شاراوەیە. تەنیا گەمژەکان بێ تاوانن.

بۆ نموونە، ئەم ئێوارەیە کاتێک لە قاوەخانەی پشت بازاڕی دیلفرۆشاندا بە قاوەکەم هەناوی خۆم گەرم دەکردەوە و سەیری نیگاری سەگەکەی پشتەوەم دەکرد و خۆم لەبیر کردبوو و منیش لەگەڵ ئەوانی تردا گوێم لە چیرۆکەکانی سەگەکە دەگرت و پێ دەکەنیم، هەستێکی وام لە کن پەیدا بوو ئەو کابرایەی لە تەنیشتمەوە دانیشتووە، بکوژێکی یەکانەیە وەک خۆم. ئەویش وەک من بەدەم چیرۆکبێژەکەوە پێ دەکەنی، بەڵام نازانم بەهۆی ئەوەوە بوو برایانە شانی بە منەوە دابوو، یان لەبەرئەوەی نیگەرانی پەنجە لەرزیوەکانی بوو کە فنجانی قاوەکەی پێ گرتبوو، گەیشتمە ئەو باوەڕەی ئەویش لە توخمی منە. لەپڕ ڕووم وەرگێڕا و ڕەپ و ڕەوان نیگام لە ڕووخساری بڕی. یەکسەر ترسا و ڕووی تێک چوو. دوای بڵاوە لێکردنی قاوەخانە، ناسراوێکی، قۆڵی کردبوو بە قۆڵیدا و پێی دەگوت:

"موریدەکانی مەلا خوسرەت پەلاماری ئێرەش دەدەن."

بە ئاماژەی چاو و برۆ قسەی بە یارۆ بڕی. ترسی ئەوان دەربازی منیش بوو. کەس متمانەی بە کەس نییە. هەموو کەسێک لە گشت ساتێکدا چاوەڕێیە ئەوی دی نامەردیی لە بەرامبەردا بکات.

هەوا ساردتری کردبوو و بەفر بەباشی گۆشەی کۆڵانەکان و بن دیوارەکانی گرتبووەوە و کەڵەکە بووبوو. لەو ئەنگوستەچاوەدا جەستەم تەنیا بە هەست ڕێی خۆی لە کۆڵانە تەنگەبەرەکاندا دەدۆزیەوە. جاروبار لەو شوێنانەی دەریوانەی پەنجەرەی ماڵان بەتەواوی دادرابوونەوە و پەنجەرەکانیان بە تەختەی ڕەشی قیرین داخرابوون، تیشکی لاوازی قوتیلکەیەکی هێشتا لە ژوورەوە داگیرساو دزەی دەکردە



دەرەوە و لەسەر بەفرەکەدا ڕەنگی دەدایەوە. زۆر جاری تریش هیچ شتێک و هیچ تیشکێک نابینم، بگرە گوێ بۆ دەنگی لێدانی بەردەکان بە گۆپاڵی دەستی یاساوڵەکانەوە، قروسکەی سەگەلی بەرەڵا و ناڵینی لە ماڵانەوەهاتوو ڕادەگرم و ڕێگای خۆم دەدۆزمەوە. گاڤی وا هەیە، بەفر بە تیشکێکی جوانی وەک ئەوەی بڵێی لە هەناوی خۆیەوە دەری دەدا، لە نیوەی شەودا کۆڵانە تەسک و ترسناکەکانی ئەستەنبوڵ ڕووناک دەکاتەوە و پێم وایە لە تاریکایی و لە نێوان دار و کەلاوەکاندا خێوگەلی نیشتەجێی سەدان ساڵەی ئەستەنبوڵ دەبینم. جاری واش هەیە لە ماڵانەوە دەنگی کرووزانەوەی بەدبەختان دێت؛ یان سنگەکوتەیانە و دەکۆکن، چڵمی لووتیان هەڵدەلووشن، لە خەونیاندا دەگرین و دەقیرێنن، یان ژن و پیاو، کاتێک منداڵەکانی تەنیشت سەریان دەگرین، دەست دەخەنە بینەقاقای یەکتری.

بۆ ئەوەی ژیانی بەختەوەری پێش سەردەمی بوونم بە بکوژ بیر بکەوێتەوە و خۆم دڵشاد بکەم، یەک دوو جار هاتم بۆ ئەم قاوەخانەیە بۆ گوێگرتن لە چیرۆکبێژەکە. زۆربەی نیگارکێشانی هاوڕێم و ئەوانەی سەرلەبەری تەمەنی خۆمم لەگەڵیاندا بەسەر بردووە، هەموو ئێوارەیەک دێن. دوای ئەوەی ئەو گەمژەیەم کوشت، کە هەر لە منداڵیمانەوە پێکەوە نیگارمان دەکێشا، ئیدی ناخوازم کەسیان ببینم. براکانی من کاتی یەکتربینین بێ قسە و قسەڵۆک و بوختان هەڵناکەن، بۆیە لە ژیانی ئەوان و لەم هەوای بەزم و ڕەزمەدا زۆر شت هەن وام لێ دەکەن شەرم بکەم. بۆ ئەوەی بە لووتبەرزم نەزانن و تانە و تەشەرم لێ نەدەن، منیش یەک دوو نیگارم بۆ کابرای چیرۆکبێژ کێشا. باوەڕیش ناکەم ئەمە پێش لە ئیرەیی پێبردن بگرێت.

بەڵام بە زیادیشەوە مافی ئیرەیی پێبردنیان هەیە، چونکە وەستای هەرە شارەزا لە ڕەنگ تێکەڵکردن، هێڵ کێشان، ڕیزبەندیی پەڕە، هەڵبژاردنی بابەت، کێشانی نیگاری ڕووخسار، جێگیرکردنی جڤاتی شەڕ و ڕاووشکاری قەرەباڵەغ، ئاژەڵ، سوڵتانەکان، ڕەوە گەمی، ئەسپ، سەرباز، کێشانی نیگاری ئەڤینداران و ڕژاندنی شیعری ڕۆح بۆ ناو نیگار و تەنانەت لە زەرکاریشدا هەر خۆمم. مەبەستم لەم قسانەم بەخۆدا هەڵدان نییە، بگرە بۆ ئەوەمە ئێوە لێم تێ بگەن. ئیرەیی پێبردن، بە تێپەڕبوونی کات لە ژیانی نیگارکێشدا دەبێت بە کەرەسەیەکی وەک بۆیاخ و مەحاڵە دەستی لێ هەڵبگیرێت.

له نیوەی پیاسەکانمدا، کە لەتاو بێ ئۆقرەییمدا تا دێن درێژتر دەبنەوە، لووتم دەتەقێت بە لووتی برایەکی ئاینیی تا بڵێی بێگەرد و بێ گوناهمدا و لەپڕ ئەم ختوورە سەیرە بە هەناومدا گوزەر دەکات: ئەگەر ئێستا بیر بکەمەوە من بکوژم، کەسی بەرامبەرم ئەم بیرە لە ڕووخسارمدا دەخوێنێتەوە.

بۆیە خۆم ناچار دەکەم بیر لە شتی تر بکەمەوە، کتومت وەک ساڵانی گەنجایەتیم کاتێک بۆ ئەوەی لە نوێژدا بیر لە ژنان نەکەمەوە، زۆرم بۆ خۆم دەهێنا و لەتاو تەریقی دەتلامەوە. بەڵام بەپێچەوانەی تەنگژەی تافی لاویمەوە، کە چەندی دەمکرد و دەکۆشام نەمدەتوانی بیرۆکەی جووتبوون لە سەری خۆم فڕێ بدەم، ئێستا دەتوانم ئەو تاوانەی ئەنجامم داوە، لە بیری بکەم.

ئێوە تێ دەگەن گشت ئەم شتانە لە ڕوانگەی ئەوەی پێوەندییان بە ڕەوشی خۆمەوە هەیە، دەگێڕمەوە. من تەنانەت ئەگەر خەیاڵ لە شتێکیش لێ بدەم، ئێوە هەموو شتێک حاڵی دەبن. ئەمەش من لە دۆخی بکوژێکی بێ ناو و بێ ناسنامەوە، کە وەک خێو بە نێوتاندا دەسووڕێتەوە، دەردێنێت و دەمخاتە دۆخی تاوانبارێکی ئاساییەوە، تاوانبارێک یەخەی خۆی دابێتە دەستەوە و ڕووخساری ئاشکرا بێت و سەری بۆ پەڕاندن ئامادە بێت. دەستوورم بدەنێ بیر لە هەموو شتێک نەکەمەوە و چەند شتێک بشارمەوە. ئێوەی کەسانی ناسکیش، چەشنی ئەوانەی بە هەڵگرتنی شوێنپێ دز دەدۆزنەوە، هەوڵ بدەن لە ڕێی وشەکانم و ڕەنگەکانمەوە بزانن من کێم. ئەمەش دەمانهێنێتە سەر ئەو بابەتی شێوازەی کە ئێستا زۆر ڕەواجی هەیە: ئایا نیگارکێش شێواز، ڕەنگ و دەنگی تایبەت بە خۆی هەیە؟ پێویستە هەیبێت؟

با سەرنج لە نیگارێکی وەستای وەستایان، بەهزادی پیری نیگارکێشان بدەین. ئەم شتە نایابە لەبەرئەوەی نیگاری تاوانێکە، ڕێک لەگەڵ دۆخی من یەک دەگرێتەوە. لە دووتوێی کتێبێکی نۆسەد ساڵەی بێ کیماسیی کاری هەرات و دەست بەسەرداگیراو لە کتێبخانەی شازادەیەکی عەجەمی تیاچوو لە شەڕی تەخت و دەسەڵاتدا، لەناو ئەو پەڕانەی داستانی شیرین و خەسرەو دەگێڕنەوە، ڕێکەوتی نیگارەکەم کرد. باسی داستانەکەی فیردەوسی ناکەم، بگرە مەبەستم ئەوەکەی نیزامییە:



هەردوو ئەڤیندار، دوای ئەو حەمکە بەسەرهات و فەرتەنەیە زەماوەند دەکەن، بەڵام شیرووییەی کوڕی گەنجی خەسرەو لە ژنی پێشووی، ئیبلیسێک دەبێت لەو گۆڕە و نایەڵێ جووتە دڵدار ئاسوودە بن. ئەم شازادە لاوە چاو دەبڕێتە تەخت و ژنی گەنجی باوکی. شیروویە، بە گوتەی نیزامی "بۆنی دەمی وەک بۆنی دەمی شێران بۆگەن بوو"، ڕێگایەک دەدۆزێتەوە، باوکی خۆی دیل دەکات و لەسەر تەخت دادەنیشێت. شەوێک دەچێتە ژووری نووستنی باوکی و شیرین، بە پەلەکوتێ لە پێخەودا دەیاندۆزێتەوە و خەنجەر لە جەرگی باوکی دەچەقێنێت، تا دەمەوبەیانی خوێنی لەبەر دەڕوات و لە نوێنی هاوبەشدا لەپاڵ شیرینی شۆخ و نوقمی خەوی ئاسوودە، گیان دەسپێرێت.

ئەم نیگارەی بەهزادی مامۆستای گەورە، بەئەندازەی ئەو چیرۆکە، ئاماژەی بۆ ترسێکی ڕاستەقینەش دەکرد و ساڵانێکیش بوو من ئەو ترسەم لە هەناوی خۆمدا هەڵگرتبوو: ترس لەوەی کاتێک مرۆڤ لە تاریکاییی نیوەشەودا بێدار دەبێتەوە و تێ دەگات لەو ژوورەدا، کە چاو چاو نابینێت، خشپەی کەسێکی تر دێت. بیهێننە بەرچاوی خۆتان ئەو کەسە بە دەستێکی خەنجەرێکی هەڵگرتووە و دەستەکەی تریشی لە ملتان دەئاڵێنێت. دیواری جوان و ناسک خەملێندراوی ژوورەکە، پەنجەرە و چوارچێوەی نەخشێندراو، بازنە و گوڵەنگی رایەخی سووری هاوشێوەی ئەو هاوارە کپەی لە قوڕگی جەڕێندراوتانەوە دەردەچێت، هەموو گولیلکی زەرد و مۆری بەوردی و زەوقێکی لە ئەقڵ بەدەرەوە کێشراوی سەر ئەو لێفە شاهانەیەی بکوژەکەتان لە کاتی کوشتنی ئێوەدا بە پێیە خاوس و قرێژەکانی دەچێتە سەری، هەر هەموویان خزمەتی یەک ئامانج دەکەن: لەلایەک، جوانیی نیگاری بەردەستتان دەچەسپێنێت و لەلایەکی ترەوە، بیرتان دەخەنەوە ئەو ژوورەی وا خەریکن تیایدا دەمرن و ئەو دنیایەی وا بەجێی دەهێڵن، چ شوێنێکی خۆشە. کاتێک لەم نیگارە دەڕوانن، واتای بنەڕەتیی نیگارەکەتان بەخەیاڵدا دێت: جوانیی نیگارەکە و دنیا گوێ بە مردنی ئێوە نادەن و ئەگەر کاتی گیانکێشان ژنەکانیشتان بەدیار سەرتانەوە بن، هەر بەتەنیایی سەر دەنێنەوە.

پیرە وەستایەک، کاتێک بیست ساڵ لەمەوبەر لەگەڵ من سەیری ئەم کتێبەی ناو

دەستی لەرزۆکی منی کردبوو، گوتی: "ئەوە هی بەهزادە." ڕووخساری، لەبەر ڕۆشناییی مۆمدانی پشت سەرمانەوە نا، بگرە لەبەر چێژی بینین گەشابووەوە. "ئەوەندە هی بەهزادە کە ئیدی پێویستی بە واژۆ نییە."

بەهزادیش، لەبەرئەوەی بەمەی دەزانی، تەنانەت لە گۆشەیەکی شاراوەی نیگارەکەشدا واژۆیەکی نەکردبوو. بە بۆچوونی پیرە وەستا، جۆرێک لە شەرم و زویربوون لەم هەڵوێستەی بەهزاددا بەدی دەکرێت. هونەر و وەستاییی ڕاستەقینە ئەوەیە هەم نیگارێکی ناوازەی لە دەستی هیچ کەسێکی تر نەهاتوو بکێشرێت و هەم هیچ نیشانەیەک جێ نەهێڵدرێت مرۆڤ بباتەوە سەر نیگارکێش.

قوربانییە زەبوونەکەی خۆم بە شێوازێک، کە لە ترسی ڕۆحی خۆم دامهێنابوو، بە شێوازێکی سادە و زبر کوشت. بۆ گەڕان بەدوای ئەوەدا داخۆ هیچ نیشانەیەکم لەدوای خۆم جێ هێشتووە ببێتە هۆی دۆزینەوەم یاخۆ نا، شەوانە دێمە ئەم شوێنی جێ سووتانە. لە هەر هاتنێکیشمدا، پرسی شێواز زیاتر لە سەرمدا کەڵەکە دەبێت. ئەو شتەی بە شێواز ناودەبرێت، تەنیا هەڵەیەکە ڕێ خۆش دەکات بۆ جێهێشتنی نیشانەی تایبەت بەخۆمان لەدوای خۆمان.

ئەگەر ڕۆشناییی بەفرەکەش نەبوایە، ئێرەم هەر دەدۆزییەوە: ئێرە ئەو شوێنی سووتانەیە کەسێکی برادەری بیست و پێنج ساڵی خۆم لێ کوشتبوو. هەر نیشانەیەک، کە بشێت بە واژۆی من بزانرێت، بەفر سڕیویەتەوە و لەناوی بردووە. ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی خواش لەمەڕ بابەتی شێواز و واژۆ لەگەڵ من و بەهزاددا هاوبیرە. چوار شەو لەمەوبەر، ئەگەر تەنانەت پێشمان نەزانیایە و کاتی نەخشاندنی کتێب گوناهێکی لە لێخۆشبوون نەهاتوومان بکردایە، بەپێی بانگەشەی ئەو بێ ئەقڵە، خوا ئەم خۆشەویستییەی پێشانی ئێمەی نیگارکێشان نەدەدا.

ئەو شەوە کاتێک لەگەڵ زەریف ئەفەندیدا هاتین بۆ ئەم شوێنی سووتانە، هێشتا بەفر نەدەباری. دەنگی وەڕینی سەگ لە دوورەوە دەنگی دەدایەوە و دەگەیشتە بەرگوێمان.

ئەو داماوە پرسی: "بۆچی هاتینە ئێرە؟ لەم ساتەدا لێرە چیم پێشان دەدەیت؟"

گوتم: "لە پێشەوە بیرێک هەیە و دوازدە هەنگاویش لەدواترەوە پارەی کۆکراوەی



ئەو گشت ساڵەم لە چاڵ ناوە. ئەگەر ئەم قسانەم بۆ کەس نەگێڕیتەوە، ئەوا زاوا ئەفەندی و منیش دڵخۆشت دەکەین."

بەزەوقەوە گوتی: "کەواتە ددانی پێدا دەنێی هەر لە سەرەتاوە زانیوتە چی دەکەیت..."

لە ناچاریدا درۆم کرد و گوتم: "ددانی پێدا دەنێم."

بە سادەیییەوە گوتی: "ئایا دەزانی ئەو نیگارانەی دەیانکێشن، گوناهێکی زۆر گەورەیە؟ زەندەقە و کفرێکە کەس ناوێرێت خۆی لە قەرەیان بدات. لە بنی دۆزەخدا دەسووتێن. ئێش و ئازارتان کۆتایی نایەت. منیشتان کرد بە هاولنگی خۆتان."

کاتێک گوێم بۆ ئەم قسانەی ڕاگرت، بە ترسەوە تێ گەیشتم لە داهاتوودا زۆر کەسانی تر بڕوای پێ دەکەن. بۆچی؟ چونکە قسەکانی هێزێک و ڕاکێشانێکی ئەوتۆی تێدا بوو، مرۆڤ، بخوازێت و نەخوازێت، سەرنجی دەدایێ و دەیویست ڕاستیی دەرهەق بە نامەردانی تر بکەوێتە ڕوو. ئاشکرایە لەبەر نهێنیی ئەو کتێبانەی بە نووسینی دەدان و ئەو پارانەی دەیدا، قسە و قسەڵۆکی زۆر لەبارەی زاوا ئەفەندییەوە دەکرا. وەکو تریش، وەستا عوسمانی گەورەی نیگارکێشانیش نەفرەتی لێ دەکرد. خەیاڵم چوو بۆ ئەوەش کە برادەری زەڕکارم درۆکانی خۆی بە زانینەوە لەسەر ئەو ڕاستییانە بنیات نابێت. گەلۆ تا چ ڕادەیەک پێداگریی دەکرد؟

ئەو بانگەشانەم پێ دووبارە کردووە کە ئێمەی کردبوو بەگژ یەکتردا. نەیتوانی وشە بهێنێتە سەر زمانی خۆی. دەتگوت ساڵانی پێکەوە بەسەربردنی شاگردیمانە و بۆ خۆپاراستنمان لە تێڵای وەستا عوسمان داوای پەردەپۆشکردنی قەباحەتێکم لێ دەکات. لەو ساتەدا باوەڕم بە دەربەستبوونی وی دەهێنا. لە سەردەمانی شاگردیشدا ئاوەها چاوەکانی دادەچەقاند، بەڵام ئەو کاتە چاوەکانی لەبەر زەڕکاری یەکجار وەها بچووک نەبووبوونەوە. لەبەرئەوەی ئامادە بوو گشت شتێک بۆ هەمووان بگێڕێتەوە، هیچ کاتێک ڕێم نەدا لە ناخمدا هەست بە خۆشەویستی بکەم لە بەرامبەریدا.

زۆرم دایە خۆم و بەوێڵکردنەوە گوتم: "بڕوانە، زەڕکاری دەکەین، نەخشی قەراغی پەڕە دەکەین، هێڵ دەکێشین، بە ڕەنگی زێڕین پەڕە دەنەخشێنین و وای لێ دەکەین بریسک و باقی بێت، جوانترین نیگار دەکێشین، دۆلاب و قوتوو دەخەمڵێنین.

سالانێکی درێژە ئەمانە دەکەین. ئەمە کاری ئێمەیە. ڕاسپاردەی نیگارمان دەدەنێ. دەڵێن کەشتییەک، کارمامزێک، سوڵتانێک بخە ئەم چوارچێوەیەوە، با مەلی وەها و مرۆی وەهای تێدا بێت، با ئەم جڤاتە لە چیرۆکەکەدا بێت و فلان وەها ڕاوەستێت، ئێمەش دەیکەین. بڕوانە، زاوا ئەفەندی ئەمجارە پێمی گوت – وێنەی ئەسپێکی هەڵقولاو لە ناختەوە لەوێدا بکێشە – بۆ ئەوەی لە واتای نیگارێکی ئەسپی لە ناخمەوە هەڵقولاو تێ بگەم، سێ ڕۆژ وەک گەورە وەستایانی سەردەمی زوو سەدان نیگاری ئەسپم کێشا." نیگاری ڕەوە ئەسپێکم دەرهێنا کە بۆ دەست ڕاهێنان لەسەر کاغەزی زبری سەمەرقەندی کێشابووم و پێشانم دا. سەرنجی دایێ و کاغەزەکەی وەرگرت و چاوەکانی لێ نزیک خستەوە و لەبەر تریفەی لاوازی مانگ دەستی کرد بەسەیرکردنی ئەسپە سپی و ڕەشەکان. گوتم: "وەستایانی کۆنی شیرازی و هەراتی دەڵێن بۆ کێشانی نیگارێکی ڕاستەقینەی ئەسپ بەوجۆرەی خوا دەیخوازێت و دەیبینێت، پێویستە نیگارکێش پەنجا ساڵی ڕەبەق بێ ڕاوەستان نیگاری ئەسپ بکێشێت و ئەوەشی لێ زیاد دەکەن کەوا باشترین نیگاری ئەسپ لە تاریکیدا دەکێشرێت، چونکە نیگارکێشی ڕاستەقینە لە ماوەی پەنجا ساڵدا هێندە کار دەکات تا چاوی کوێر دەبێت و دەستی فێر دەبێت لەبەر نیگاری ئەسپ بکێشێت."

ئەو نیگا پاکژەی، کە من لە سەردەمی منداڵیمانەوە بە ڕووخسارییەوە بینیبووم، لە ئەسپەکانی نەخشێندراوی دەستی من بڕیبوو و خەیاڵی ڕۆیشتبوو.

"ڕاسپاردەی نیگارمان دەدەنێ، ئێمەش هەوڵ دەدەین ئەسپی هەرە نهێنی و هەرە ناوازە وەک ئەوەی وەستایانی کۆن کێشاویانە، بکێشین. هەر ئەوەندە و بەس. دوای خواستنی ئەو شتەی دەیانەوێت، ناهەقییە ئەگەر ئیدی لێپرسراوی بخرێتە ئەستۆی ئێمەوە."

گوتی: "نازانم داخۆ ئەمە ڕاستە؟ ئێمەش لێپرسراوی و ویستمان هەیە. من، خوا نەبێت، لە کەسی تر ناترسم. ئەویش ئەقڵێکی داوە پێمان تا باشە و خراپەی لە یەکتر پێ جیا بکەینەوە."

ئەمە وەڵامێکی بەجێ بوو.

بە عەرەبی پێم گوت:



"خوا هەموو شتێک دەبینێت و دەزانێت... تێش دەگات تۆ و من و ئێمەش لە نەزانیمانەوە ئەم کارە دەکەین. لەکن کێ گازندە لە زاوا ئەفەندی دەکەیت؟ ئەی باوەڕ ناکەیت ویستی خەزرەتی سوڵتانمان لە پشت ئەم کارەوەیە؟"

بێدەنگ بوو.

بیرم کردەوە: هەر بەڕاستی ئەوەندە بێ ئەقڵ بوو، یاخۆ لەبەر ترسی خوا ئارامیی خۆی لەدەست دابوو و قسەی هەڵەت و پەڵەتی دەکرد؟

لە قەراغ بیرەکەدا ڕاوەستاین. تاوێک لە تاریکیدا چاوم بە چاوی کەوت و حاڵی بووم دەترسێت. بەزەییم پێیدا هاتەوە. بەیەکجاری تیر لە کەوان دەرپەڕیبوو. بۆ ئەوەی جارێکی تریش بیسەلمێنم ئەوەی بەرامبەرم بەتەنیا بێ ئەقڵێک نییە، کەسێکی بوودەڵەشە، لە خوا پاڕامەوە.

گوتم: "لێرەوە دوازدە هەنگاو بژمێرە و دەست بە هەڵکۆڵین بکە."

"ئەی دوایی ئێوە چی دەکەن؟"

"بە زاوا ئەفەندی دەڵێم نیگارەکان بسووتێنێت. ئیدی چی ترمان لە دەست دێت؟ ئەگەر جڤاتی مەلا خوسرەتی ئەرزەڕوومی قسەیەکی وەها ببیستنەوە، ئەوا نە ئێمە بە ساغی دەمێنین و نە نیگارخانەش دەمێنێت. هیچ ناسیاوێکت هەیە لەناو ئەواندا؟ ئێستا تۆ ئەم پارانە وەربگرە تا دڵنیا بین لای ئەوان زمانمان لێ نادەیت."

"پارەکە لە چیدایە؟"

"لە کوپەیەکی کۆنی ترشیاتدا حەفتا و پێنج دانە زێڕی ڤینیسیایی هەیە."

سکەی زێڕینی ڤینیسایی بەهەرحاڵ، بەڵام ئەو کوپە کۆنەی ترشیات چی بوو بەخەیاڵمدا هات؟ ئەوەندە توڕەهات بوو کە بۆ باوەڕ پێکردن دەشیا. بەمجۆرە، جارێکی تریش حاڵی بووم خوا لەگەڵ منە، چونکە هاوڕێی سەردەمی شاگردیم، کە ساڵ لەدوای ساڵ پوولەکیتر دەبوو، بگرە بەزەوقەوە دەستی کردبوو بە ژماردنی هەنگاو بەرەو ئەو ئاراستەیەی من پێشانم دابوو.

لەو ساتەدا دوو شتم لە خەیاڵدا بوو. ژێر خۆڵەکە هیچ زێڕ و مێرێکی ڤینیسیاییی تێدا نییە. ئەگەر پارەی نەدەمێ، ئەم نامەردە بوودەڵەیە مەحفمان دەکاتەوە. تاوێک

وام بەخەیاڵدا هات، وەک ئەوەی لە سەردەمی شاگردیماندا دەمانکرد، ئەو نامەردە بوودەڵەیە لە ئامێز بگرم و ماچی بکەم، بەڵام ساڵان ئێمەی زۆر لەیەکدی دوور خستبووەوە. بیرم دەکردەوە چۆن زەویەکە هەڵکۆڵین، بە نینۆک؟ بیرکردنەوەم لە هەموو ئەم شتانە، ئەگەر مرۆڤ ناوی بیرکردنەوەی لێ بنێت، هێندەی چاوترووکاندنێکی خایەند و نەخایەند.

بەشپرزەیی و بە هەردوو دەستم بەردی قەراغ بیرەکەم هەڵگرت. هێشتا لە هەنگاوی حەوتەم و هەشتەمدا بوو، من گەیشتمە سەری و بەهەموو هێزی خۆم لەدواوە کێشام بە سەریدا. هێندە بەخێرایی و توندی بەر سەری کەوت، وەک ئەوەی بە سەری خۆم کەوتبێت، مچورکم پێدا هات و تەنانەت دڵیشم پێی سووتا.

بەڵام لە بری خەمخواردن لەوەی کردبووم، دەمویست هەرچی زووترە کارەکەم بە ئەنجام بگەیەنم، چونکە ئەو لەسەر زەوی دەستی بە لەقەفرتێیەکی ئەوتۆ کردبوو، مرۆڤ بخوازێت و نەخوازێت تووشی شپرزەیی دەبوو.

ماوەیەکی زۆر درێژ دوای بەردانەوەی بۆ ناو بیرەکە، بۆم دەرکەوت ئەم کارەی کردوومە، ڕەهەندێکی زبری تێدایە و ئەمەش بەهیچ کلۆجێک لە نەزاکەتی نیگارکێشێک ناوەشێتەوە.



# 5

## من زاواتانم

من ئەفەندیی زاوای قەرەم، بەڵام خەڵکانی تریش بە زاوا بانگم دەکەن. دایکی قەرە، ماوەیەک دەیویست کوڕەکەی بەم ناوەوە بانگی من بکات. دواتریش هەر بەتەنیا قەرە نا، هەموو کەسێک بەکاری هێنا. قەرە، سی ساڵ لەمەوبەر و دوای نیشتەجێبوونمان لە کۆڵانە تاریک و شێدارەکەی ژێر سێبەری دار ئیخلاموور و شابەڕووی پشتەوەی ئەکسەرایدا، دەستی بە هاتوچۆی ماڵمان کرد. ئەوێ ماڵی پێشووترمان بوو. من هاوینان لەگەڵ مەحموود پاشا بۆ شەڕ دەردەچووم، پایزان لە گەڕانەوەمدا بۆ ئەستەنبوڵ، دەمبینی قەرە و دایکی خۆیان خزاندووەتە ماڵی ئێمە. دایکی خوا لێخۆشبووی، خوشکە گەورەی خاتوونی خوا لێخۆشبووی من بوو. جاروباریش لە گەڕانەوەی ئێوارانی زستانامدا بۆ ماڵەوە، دەمبینی دایکی ئەو و خاتوونی من یەکدییان لە ئامێز گرتووە و بەچاوی پڕ لە ئەسرینەوە خەم و دەرد بۆ یەکتر هەڵدەڕێژن. باوکی قەرە لە قوتابخانە بچووک و دوورەدەستەکان مامۆستاییی دەکرد، بەڵام لە هیچ کامیان نەدەگیرسایەوە. سەرکێش و تووڕە بوو و زۆریشی دەخواردەوە. قەرە ئەو سەردەمە شەش ساڵان بوو. دایکی بگریابایە، ئەویش دەگریا، بێدەنگ بوایە، ئەویش بێدەنگ دەبوو. بەترسەوە سەیری من، زاوای خۆی دەکرد.

ئێستا ڕازیم لەوەی وەک برازایەکی بەڕێز و بەبڕیار و پێگەیشتوو لەبەردەم خۆمدا دەیبینم. ئەو ڕێزەی لە بەرامبەرمدا دەینوێنێت، وریاییەکەی لە کاتی دەست ماچکردنمدا، ئەوەی قوتووی مەرەکەبی مەگۆلیم بە دیاری پێشکێش دەکات و دەڵێت

"تەنیا بۆ مەرەکەبی سوورە"، جووتکردنی وردی ئەژنۆکانی و دانیشتنی جوانی لە بەردەممدا، گشت ئەمانە بەتەنیا نیشانە نین بۆ ئەوەی وەک خۆی دەخوازێت، مرۆڤێکی ئاقڵ و تێگەیشتوو بێت، بگرە جارێکی تریش بیری منی دەخاتەوە من ئەو مرۆڤە بەساڵاچووەم کە دەمویست ببم.

یەک دوو جار باوکیم بینیبوو و ئەمیش وەک ئەو دەچوو: باڵابەرز و زراڤە و کەمێک بەتووڕەیی دەست و قۆڵ دەجووڵێنێت، بەڵام لێی دێت. شێوەی دانانی دەستەکانی لە سەر ئەژنۆیدا، چۆنیەتیی ڕوانینی بۆم کاتێک من شتێکی گرینگ دەڵێم و ئەو بە نیگایەکەوە کە دەڵێت "بەڵێ تێ دەگەم، بە ڕێزەوە گوێم ڕاگرتووە"، بە خواستەوە سەیری ناو چاوانم دەکات و سەرلەقاندنی بە ویردێکی گونجاو لەگەڵ کێشی قسەکانمدا، زۆر لە جێی خۆیدایە. من گەیشتوومەتە ئەم تەمەنە و دەزانم ڕێزی ڕاستەقینە لە دڵەوە نایەت، بگرە لە ڕێسا بچووکەکان و سەردانەواندنەوە سەرچاوە دەگرێت.

ئەو ساڵانەی دایکی قەرە لە ماڵی ئێمە داهاتوویەکی بۆ کوڕەکەی لەبەرچاو گرتبوو و بە هەر بیانوویەک بوایە، پەیتاپەیتا دەیهێنا، کاتێک بۆم ئاشکرا بوو حەز لە کتێب دەکات، وابەستەی یەکدی بووین و بە گوتەی خەڵکی ماڵەوە، بوو بە شاگردم. بۆم گێڕایەوە نیگارکێشانی شیرازی بە کێشانی هێڵی ئاسۆیی تا سەرەوەی نیگار، لە شیراز شێوازێکی نوێیان داهێنابوو. باسی ئەوەم بۆ کرد لە کاتێکدا هەموو کەسێک نیگاری مەجنوونی لەتاو ئەڤینی لەیلا شێتبووی بەتەنیایی لە چۆڵ و بیاباندا دەکێشا، چۆن بەهزادی وەستای گەورە ئەوی لەناو ئاپۆڕەی ژنگەلی سەرقاڵی چێشت لێنان و فووکەر لە پشکۆ و هاتوچۆکەری نێوان ڕەشماڵاندا دەکێشا، کەچی تەنیاتریش دەهاتە بەرچاو. بۆم دەگێڕایەوە زۆربەی ئەو نیگارکێشانەی نیگاری ئەو ساتە دەکێشن کاتێک خەسرەو لە نیوەی شەودا سەیری شیرین دەکات و دەبینێت لە ئاوی چۆمدا خۆی دەشوات، هیچیان شیعرەکەی نیزامییان نەخوێندووەتەوە. پێم دەگوت چەند مایەی پێکەنینە کاتێک نیگارکێشان ئەسپ و جلوبەرگی دڵداران بەو بۆیاخانەی بە خەیاڵی خۆیاندا دێت، دەنەخشێنن. پێم دەگوت ئەگەر نیگارکێشێک نەتوانێت دەقی بەدەستی خۆی نەخشێندراو بە ئاقلی و وردی بخوێنێتەوە، هیچ



هۆکارێکی تری نییە ئەوە نەبێت ئەو نیگارکێشە بۆ پوول و پارە دەستی داوەتە قەڵەم و فڵچە.

ئێستاش بە خۆشحاڵییەوە دەبینم قەرە زانستێکی تری بناخەیی بەدەست هێناوە: ئەگەر دەتەوێت لە نیگارکێشی و هونەردا خەیاڵشکاو نەبی، دەستم بەدامان وەک پیشەی خۆت لێی مەڕوانە. چەندە خاوەن هونەر و توانا بی، ببە، بەڵام لە شوێنانی تردا منەی پارە و دەسەڵات بکە، تا ئەگەر کاتێک هەقدەستی هونەر و ڕەنجی خۆت وەرنەگرت، لە هونەر نەتۆرێیت.

قەرە گێڕایەوە و گوتی سەرجەم وەستایانی نیگارکێش و خۆشنووسانی تەورێزی دووچاری هەژاری و بەدبەختی بوون. قەرە زۆربەی ئەوانی دەناسی، چونکە کتێبی پێ بە نووسین دەدان بۆ پاشایان و دەوڵەمەندانی ئەستەنبوڵ و شارە دوورەکانی تر. بەتەنیا هەر لە تەورێز نا، لە مەشهەد و لە حەلەبیش زۆربەی نیگارکێشان لەبەر بێ پارەیی و فەرامۆشکردن وازیان لە نەخشاندنی کتێب هێناوە و دەستیان داوەتە کێشانی نیگاری یەک پەڕەیی و شتی سەیر و سەمەرە و ڕووت و قووت بۆ دڵخۆشکردنی گەڕیدەکانی فەڕەنگ. بیستوویەتی ئەو کتێبەی شا عەباس کاتی پەیمانی ئاشتی لە تەورێزدا بە دیاری پێشکێش بە سوڵتانی ئێمەی کردووە، لە ئێستاوە پارچە پارچە کراوە و دەست کراوە بە بەکارهێنانی پەڕەکانی لە کتێبێکی تردا. ئەکبەر خانی پادشای هندستان پارەیەکی زۆری بۆ کتێبێکی گەورە و نوێ هەڵڕشتووە و ئەمەش وای کردووە درەوشاوەترین نیگارکێشانی تەورێزی و قەزوینی دەست لە کاری بەردەستیان هەڵگرن و خۆیان بگەیننە کۆشکی ئەو.

بەدەم گێڕانەوەی گشت ئەم شتانەوە بۆم، چیرۆک و بەسەرهاتی شیرینی تریشیان تێ هەڵدەکێشێت: بۆ نموونە، چیرۆکی بەچێژی مەهدییەکی سەختە، یان چیرۆکی شازادەیەکی گەمژە کە سەفەوییەکان بۆ ئاشتی بە بارمتە لای ئۆزبەکەکان دایانناوە، بەڵام شازادە تووشی لەرزوتا دەبێت و لە ماوەی سێ ڕۆژدا دەمرێت. قەرە باسی شپرزەیی و بێسەروبەرەیی دوای ئەو بەسەرهاتەم بۆ دەگێڕێتەوە و بزەم بۆ دەکات. بەڵام لە سێبەرێکەوە کە دەکەوێتە سەر چاوانی، تێ دەگەم ئەو مەسەلەیەی هەردووکمان دەترسێنێت و باسکردنی کارێکی دژوارە، هێشتا بە کۆتایی نەگەیشتووە.

بێگومان قەرەش وەک هەموو ئەو لاوانەی هاتوچۆی ماڵمانیان دەکرد و ئەوانەی هەموو شتێکی سەبارەت بە ئێمەیان دەبیست و تەنانەت ئەگەر لە دووریش بوونایە، بە هەبوونیان دەزانی، دڵی چووبووە شەکوورەی کچی تاقانە و دولبەرم. ئەو کاتە، لەبەرئەوەی گشت کەسێک، تەنانەت زۆربەی کەسانیش بێ ئەوەی هەر هیچ چاویان پێ کەوتبێت، شەیدای کچی جوانی جوانانم دەبوون، لەوانەیە عاشقبوونەکەی قەرە لە بۆچوونی مندا شتێکی ترسناکی شایەنی هەڵوێستە لەسەرکردن نەبووبێت. ئەڤینی قەرە، لەبەرئەوەی دەرگامان بە ڕوویدا کردبووە و ماڵی ئێمە پێشوازییان لێی دەکرد و هەلی بینینی شەکوورەی بۆ ڕەخسابوو، سەودایەکی ڕەش و ئەڤینێکی بێهودەی گەنجێک بوو. بەپێچەوانەی ئومێدخواستنی منەوە، نەیتوانی سەوداکەی لە ناخی خۆیدا بنێژێت و هەڵەیەکی کرد کاتێک ڕاستەوخۆ ئاگری بەتینی هەناوی خۆی بۆ کچەکەم ڕۆ کرد.

لەبەرئەوە ناچار بوو پێ لە ماڵمان ببڕێت.

پێم وابێت ئێستا قەرەش دەزانێت دوای سێ ساڵ لە ڕۆیشتنی ئەو لە ئەستەنبوڵ، کچەکەم لە جوانترین تافی تەمەنیدا لە تەک ئەفسەرێکی سوارەدا زەماوەندی کرد و ئەم ئەفسەرە ئەقڵ لە ئەژنۆیە، دوای ئەوەی دوو کوڕی بە کچەکەی من هێنایە دنیاوە، دەرچوو بۆ شەڕ و هەرگیز نەگەڕایەوە و چوارساڵە کەس هەواڵی نازانێت. لەو ڕووەوە نا کە ئەم جۆرە قسە و قسەڵۆک و ڕووداوانە بەخێرایی لە ئەستەنبوڵ بڵاو دەبنەوە، بگرە لە میانەی ئەو نیگایانەی لە ساتە کپەکانی نێوانماندا دەیبڕێتە چاوانم، هەست دەکەم لەمێژە پەیی بەگشت شتێک بردووە. تەنانەت ئەوەش تێ دەگەم ئێستا لە کاتێکدا چاوی لە "کتاب الروح"ی کراوەی سەر تەختەکە بڕیوە، گوێی بۆ دەنگی گەڕانی منداڵان بەناو ماڵدا ڕاگرتووە، چونکە دەیزانی ماوەی دوو ساڵە کچەکەم لەگەڵ هەردوو کوڕەکەیدا بۆ ماڵە باوان گەڕاوەتەوە.

هیچ لەبارەی ئەم خانووە نوێیەوە نەدواین کە لە کاتی نەبوونی قەرەدا لە ئەستەنبوڵ بە بنیاتنانم دابوو. بە ئەگەری زۆرەوە، لاوێکی وەک قەرە گەیشتن بە سامان و پلە و پایەی لە خەیاڵ ناوە و هەست دەکرێت خوازیار و بەتەماحە، زۆر بە شوورەیی دەزانێت قسە بباتەوە سەر ئەم جۆرە بابەتانە. بەڵام دەستبەجێ لەگەڵ



هاتنە ژوورەوەی لەسەر پلیکانەکاندا گوتم نهۆمی دووەم هەمیشە وشکە و لەبەر ئازارەکانی پشتم، گواستنەوەم بۆ نهۆمی دووەم باش بووە. کاتێک نهۆمی دووەمم گوت، هەستم بە شەرمێکی نامۆ دەکرد، بەڵام دەمەوێت ئەمەش بزانن: ئەوانەی سامانێکی کەمتریش لەوەی منیان هەیە، تەنانەت ئەفسەرانی سوارەی خاوەن یەک پارچە زەویی بچووکیش، دەتوانن بە ماوەیەکی کورت خانووی دوو نهۆمی بنیات بنێن.

لەو ژوورە بووین کە من زستان وەک ژووی نیگارکێشان کەڵکم لێ وەردەگرت. حاڵی بووم قەرە هەستی کردووە شەکوورە لە ژووری تەنیشتمانەوەیە. دەستبەجێ چوومە سەر کرۆکی بابەتی ئەو نامەیەی بۆ تەورێز بۆم ناردبوو و تیایدا بۆ ئەستەنبوڵ بانگم کردبووەوە.

گوتم: "کتومت وەک ئەوەی تۆ لە تەورێز لەگەڵ نیگارکێشان و خۆشنووساندا دەتکرد، منیش کتێبێک بە دروستکردن دەدەم. ئەوەی ڕاسپاردەی پێم بەخشیوە، حەزرەتی سوڵتانی کۆڵەکەی گەردوونمانە. لەبەرئەوەی کتێبەکە نهێنییە، سوڵتانمان دەستووری بە گەورەی خەزنەداران داوە پارەیەکی نهێنیم بۆ تەرخان بکات. لەگەڵ یەک بەیەکی وەستاترین نیگارکێشانی نیگارخانەی سوڵتانمان ڕێک کەوتووم. هەندێک لەوانم بۆ کێشانی نیگاری سەگ، برێکی تریان بۆ کێشانی نیگاری دار، یەکێکیانم بۆ نەخشاندنی کەناری پەڕەکان و کێشانی هەوری ئاسۆ و ئەوی تریانم بۆ کێشانی نیگاری ئەسپ ڕاسپاردووە. ئەو نیگارانەی ڕام سپاردووە بکێشرێن، دەمەوێت کتومت وەک ئەوەی لە نیگاری وەستاکانی ڤینیسیادا هەیە، گوزارە لە هەموو جیهانی سوڵتانمان بکات. بەڵام ئەمانە نیگاری ماڵ و موڵک نابن وەک ئەوەی ڤینیسیاییەکان دەیکێشن، بگرە نیگاری دەوڵەمەندیی ناوەکی و خۆشی و ترسەکانی سوڵتانمان دەبن. ئەگەر نیگاری پارەم بەکێشان دابێت، بۆ بچووک پێشاندانی بووە. ئیبلیس و مردنیشم بۆیە داناوە، چونکە لێیان دەترسین. نازانم قسە و قسەڵۆکەکان باسی چی دەکەن؟ ویستم نەمریی دار و ماندوویی ئەسپ و بێ ئابڕوویی سەگەل ئاوێنەی بالانوێنی جیهانی حەزرەتی سوڵتانمان بن. ویستیشم ئەو نیگارکێشانەی ناسناوی لەقلەق، زەیتوون، زەریف و پەپوولەیان لێ نراوە، بە ئارەزووی خۆیان بابەت

دەستنیشان بکەن. تەنانەت لە ساردترین و شوومترین شەوانی زستانیشدا یەکێک لە نیگارکێشانی نیگارخانەی سوڵتانم بۆ پێشاندانی ئەو شتەی من بۆ کتێبەکە پێم بە نەخشاندن دابوو، دەهاتە لام."

"ناتوانم ئێستا بەتەواوی پێت بڵێم چۆن نیگارمان دەکێشا و بۆچی وەهامان دەکرد. مەبەستم ئەوە نییە لێتی بشارمەوە، بگرە لەبەرئەوەمە وەک بڵێی خۆشم بەتەواوی نەزانم نیگارەکان گوزارە لە چی دەکەن. بەڵام دەمزانی دەبێت چۆن نیگارگەلێک بن."

لە سەرتاشەکەی گەڕەکی ماڵە کۆنەکەمانم بیست قەرە چوار مانگ لە دوای ناردنی نامەکەی من بۆ ئەستەنبوڵ گەڕاوەتەوە و هەر خۆشم بانگم کرد بۆ ماڵەوە. دەمزانی بەڵێنی دەرد و بەختەوەرییەک لە چیرۆکی مندا هەیە و دەتوانێت هەردووکمان پێکەوە گرێ بدات.

گوتم: "هەر نیگارێک، چیرۆکێک دەگێڕێتەوە. نیگارکێش، بۆ خەملاندنی ئەو کتێبەی دەیخوێنینەوە، نیگاری جوانترین جڤاتی چیرۆک دەکێشێت. یەکەمین دیداری ئەڤینداران؛ سەرپەڕاندنی جانەوەری ئیبلیس ئاسا بەدەستی ڕۆستەمی قارەمان؛ خەمی ڕۆستەم دوای ئەوەی بۆ دەردەکەوێت ئەو بیانییەی کوشتوویەتی، کوڕی خۆیەتی؛ مەجنوونی سەوداسەری ئەڤین لەناو شێر، پڵنگ، مامز و چەقەڵدا لە سروشتی خامۆش و هۆڤ؛ کاتێک ئەسکەندەر بەر لە شەڕ دەچێتە دارستان بۆ ئەوەی لە ڕێی باڵندەکانەوە داهاتووی بۆ ئاشکرا بێت و کاتێک دەبینێت وا هەڵۆیەکی زەبەلاح مریشکە کێوییەک پارچە پارچە دەکات، خەمگین دەبێت... چاوەکانمان بە خوێندنەوەی ئەم چیرۆکانە ماندوو دەبن، بەڵام بە بینینی نیگارەکان دەحەسێنەوە. ئەگەر شتێک لە چیرۆکدا هەبێت و ئەقڵ و هێزی خەیاڵمان نەتوانن وێنای بکەن، ئەوا دەمودەست نیگار بە هانامەوە دێت. نیگار بریتییە لە ڕازاندنەوەی چیرۆک بە ڕەنگ. کەس بیری بۆ نیگارێکی بێ چیرۆک ناچێت."

وەک بڵێی پەشیمان بم، شتێکم بۆ قسەکانم زیاد کرد و گوتم: "پێم وابێت کەس بیری بۆی ناچێت."

"بەڵام دەگوترێت لەوانەیە بشکرێت. دوو ساڵ لەمەوبەر جارێکی تریش وەک



نێردراوی سوڵتانمان چوومە ڤینیسیا. تەواوی کات سەیری نیگاری ڕووخساری دەستکردی وەستایانی ئیتاڵیم دەکرد. نەمدەزانی نیگارەکان گوزارە لە چ چیرۆکێک و جڤاتێک دەکەن، بەڵام دەکۆشام تێ بگەم و چیرۆکەکان بدۆزمەوە. ڕۆژێک لەسەر دیواری کۆشکێک لووتم تەقی بە نیگارێکەوە و لە شوێنی خۆم ڕەپ بووم."

"نیگارەکە لە هەموو شتێک زیاتر، نیگاری کەسێکی وەک من بوو. بێگومان نیگاری گاورێک، کەسێکی وەک ئێمە نا. بەڵام تا زیاتر لێی ورد دەبوومەوە، هەستم دەکرد من لەو دەچم. ئەمە بەمەرجێک، ئەو هەر هیچ وەک من نەدەچوو. ڕووێکی بێ ئێسک و خڕ، ئێسکی ڕوومەتی هەر نەبوو. لە بەرامبەر ئەوەشدا، هیچ شوێنەوارێکی چەناگەی بێچاوینیی من لە هی ئەودا نەبوو. هیچ بە من نەدەچوو، بەڵام نازانم لەبەر چ هۆیەک بوو، وەک ئەوەی نیگاری خۆم بێت، دڵم دەستی بە ترپەترپ دەکرد."

ئەو خانەدانە ڤینیسیاییەی منی بە کۆشکدا دەگەڕاند، گوتی نیگاری سەر دیوارەکە هی خانەدانێکی تری وەک خۆمە. هەر شتێکی لە ژیاندا پێ گرینگ بووە، دەستووری داوە بخرێتە نیگارەکەوە. کێڵگەی ناو ئەو دیمەنەی لە پەنجەرە کراوەکەی پشتەوە دەبینرا، گوند و دارستانی ڕەنگ تێکەڵ وەک ڕاستی دەهاتە بەرچاو. لەسەر مێزی بەردەمیشی: سەعات، کتێب، کات، خراپەکاری، ژیان، قەڵەم، نەخشە، قیبلەنۆما، قوتوو، لەناو قوتووەکاندا پارەی زێڕین، وردەواڵە و شتی تریش لەوانەی کەس نازانێت لە چەند نیگاری تریشدا هەن و من لێیان تێ ناگەم، بەڵام هەستیان پێ دەکەم... سێبەری جنۆکە و ئیبلیس و دواتریش کچی جوانی جوانانی ناو خەون و خەیاڵ لە تەنیشت باوکیەوە.

"گەلۆ ئەم نیگارە بۆ خەملاندن و تەواوکردنی کام چیرۆک کێشرابوو؟ کاتێک لێم دەڕوانی، تێ دەگەیشتم چیرۆکی ئەم نیگارە لە هەناوی نیگارەکە خۆیدایە. نیگارەکە درێژکراوەی چیرۆکێک نەبوو، شتێک بوو بۆ خۆی."

"ئەو نیگارە سەرسامی کردم و لە ئەقڵمدا مایەوە. لە کۆشک دەرچووم، گەڕامەوە بۆ ئەو ماڵەی لێی میوان بووم و بەدرێژاییی شەو بیرم لەو نیگارە کردەوە. منیش دەمویست نیگارێکی وەهام لێ بکێشرێت. نەخێر، من حەدم نییە، بگرە پێویستە نیگاری سوڵتانمان بەوجۆرە بکێشرێت. دەبێت نیگاری سوڵتانمان بەگشت

شتەکانیەوە، بەهەر شتێکەوە لە دەوری ئەو ئالابێت و دنیای ئەو پێشان بدات، بەو شێوەیە بکێشرێت. بیرم کردەوە دەکرێت بەم بیرۆکانە کتێبێک بنەخشێنرێت."

"ئەو مامۆستا ئیتالییە نیگاری خانەدانی ڤینیسیاییی بەشێوەیەک چێ کردبوو، تۆ یەکسەر تێ دەگەیشتیت ئەوە نیگاری ئەو خانەدانەیە. تەنانەت ئەگەر ئەو کەسەت هەرگیز نەدیبێت و پێت بڵێن لەناو ئاپۆڕەیەکدا بیدۆزەوە، دەتوانیت لە سایەی ئەو نیگارەدا لەناو هەزاران کەسدا بیدۆزیتەوە و دەست بخەیتە سەری. وەستایانی ئیتاڵی شێوازێکیان دۆزیتەوە بۆ جیاکردنەوەی هەر مرۆڤێک لەسەر بنەمای شێوەی ڕووی، نەک لەسەر بناخەی شێوەی جلوبەرگ و نیشانەکانی. ئەو شتەی ئەوان پێی ئێژن پۆرترێت، ئەمەیە."

"تەنانەت ئەگەر بۆ یەک جاریش نیگاری ڕووت بەو شێوازە بکێشرێت، ئیدی هەتا هەتایە کەس لە بیرت ناکات. بگرە ئەگەر فرە دووریش بیت، ئەو کەسەی سەیری نیگارەکەت دەکات، لە ناخەوە وا هەست دەکات وەک ئەوەی تۆ لەپەنایدا بیت. ئەوانەشی لە ژیانی خۆیاندا تۆیان نەدیوە، چەندین ساڵ دوای مردنت، وەک ئەوەی لە بەردەمیاندا بی، دەتوانن چاو ببڕنە ناو چاوانت."

ماوەیەکی درێژ بێدەنگ بووین. هەرگیز دەریوانەی بەشی خوارەوەی پەنجەرەی بچووکی هەیوان و ڕوو لە کۆڵانمان نەدەکردەوە، بەڵام لە بەشی سەرەوەی پەنجەرەکەوە، کە تازە قوماشی مێودارم تێ گرتبوو، تیشکێکی ترسناکی هاوشێوەی ئەو سەرمایەی لە دەرەوە دەهاتە ژووری، دزەی دەکردە ژوورەوە.

گوتم: "نیگارکێشێکم هەبوو بۆ کتێبی نهێنیی سوڵتانم وەک نیگارکێشانی تر بە دزییەوە دەهاتە لام و تا بەیانی کارمان دەکرد. ئەو باشترین زەڕکاریی دەکرد. زەریف ئەفەندیی داماو شەوێک لێرە دەرچوو، بەڵام هەرگیز نەگەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی. دەترسم وەستای زەڕکاری منیان کوشتبێت."



# 6

## من ئۆرهانم

قەرە گوتی: "کوشتوویانە؟"

ئەم قەرەیە باڵابەرز و زراڤ و کەمێکیش بەسام بوو. ڕێک ئەو کاتەی باپیرم گوتی "کوشتوویانە"، من بەرەوڕووی ئەوان دەچووم و قەرە منی بینی. "تۆ چی دەکەیت لێرە؟"

بەڵام ڕوانینی باپیرم بەجۆرێک بوو کە من بێ سڵکردنەوە چووم و لە باوەشی دانیشتم. وەلێ یەکسەر دای گرتم. گوتی:

"دەستی قەرە ماچ بکە."

دەستیم ماچ کرد. بێ بۆن بوو.

قەرە گۆنامی ماچ کرد و گوتی: "زۆر شیرینە، لە داهاتوودا دەبیت بە شێر."

"ئەمە ئۆرهانە، تەمەنی شەش ساڵە. یەکێکی گەورەتریشیان هەیە، شەوکەت، تەمەنی حەوت ساڵە. ئەو منداڵە زۆر کەللەڕەقە."

قەرە گوتی: "چوومە کۆڵانەکەی ئاکسەرای. زۆر سارد بوو. بەفر و بەستەڵەک هەموو جێیەکی داپۆشیوە، بەڵام دەڵێی هیچ شتێک نەگۆڕاوە."

باپیرم گوتی: "هەموو شتێک گۆڕاوە، گشت شتێک تێک چووە. بگرە زۆریش."

ڕووی لە من کردەوە.

"کاکت لە کوێیە؟"

"لای وەستایە."

"ئەدی تۆ بۆ لێرەیت؟"

"وەستام گوتی ئافەرین، ئیدی تۆ دەتوانیت بڕۆیت."

باپیرم گوتی: "مەگەر بەتەنیا هاتیتەوە؟ دەبێت کاکت بتهێنێتەوە." پاشان بە قەرەی گوت: "دۆستێکی بەرگ تێگرم هەیە ئەمان هەفتەی دووجار دوای دەرسی قورئان دەچنە لای، بەردەستیی دەکەن و فێری بەرگ تێگرتن دەبن."

قەرە گوتی: "تۆش وەک باپیرت حەز لە نیگارکێشی دەکەیت؟"

بێدەنگ بووم.

باپیرم گوتی: "باشە، تۆ هەستە و بڕۆ."

ئەو گەرمییەی لە مەقەڵەکەوە دەهات، زۆر بەچێژ بوو و من نەمدەویست لایان بڕۆم. بۆنی بۆیاخ و زەمقم کرد و کەمێک ڕاوەستام. بۆنی قاوەش دەهات.

باپیرم گوتی: "بۆچی مەگەر نیگارکێشان بەشێوەیەکی تر، بینینە بە شێوازێکی تر؟ لەو سۆنگەیەوە زەرکاری بەستەزمانیان کوشت. بەتایبەتیش ئەو لەسەر شێوازی کۆن زەرکاریی دەکرد. بە کوشتنی نازانم، تەنیا ئەوەندە هەیە ونە. ئەو نیگارکێشانە بە چاودێری و فەرمانی عوسمانی گەورەی نیگارکێشان نیگاری جەژننامەیەک بۆ سوڵتانمان دەکێشن. هەرکەس لە ماڵی خۆیدا کار دەکات. مامۆستا عوسمان لە نیگارخانەیە. بەر لە هەموو شتێک دەمەوێت بچیتە ئەوێ و هەموو شتێک بەچاوی خۆت ببینیت. ترسی ئەوەشم هەیە ئەوانی تر لێیان بووبێت بە دەمەقاڵێ و یەکتریان کوشتبێت. پێویستە بچیتە ماڵی هەریەکەیان و بەو ناوانەوە بیانبینی کە چەندین ساڵ لەمەوبەر سەرگەورەی نیگارکێشان عوسمانی وەستایان لێی ناون: پەپوولە، زەیتوون، لەقلەق..."

لەبری ئەوەی بە پلیکانەکاندا بڕۆمە خوارێ، گەڕامەوە دواوە. لە دۆڵابی ناو دیواری ژووری نووستنی خەیرییەوە دەنگی قرتەقرت دەهات. خۆم کرد بە ئەوێدا. خەیرییە نا، دایکم لە ژوورەوە بوو. بە بینینی من، شەرم دای گرت. نیوەی جەستەی لە دۆڵابەکەدا بوو.





گوتی: "تۆ لە کوێ بوویت؟"

بەڵام خۆی دەیزانی لە کوێ بووم. کونێک لە دۆڵابەکە بوو. لەوێوە ژووری نیگارکێشانی باپیرم دیار بوو. ئەگەر دەرگای ژوورەکە کراوە بووایە، لەوبەری هەیوانەکە ناوەوەی ژووری خەوی باپیرم دەبینرا، بێگومان ئەگەر دەرگای ئەویش لەسەرپشت بوایە.

گوتم: "لای باپیرم بووم. دایە، ئەدی تۆ لێرە چ دەکەیت؟"

بە دەنگێکی نزم، چونکە نەیدەویست میوانەکە گوێی لێ بێت، هاواری کرد: "ئەرێ من بە تۆم نەگوتبوو ئەگەر میوان هەبوو بۆت نییە بچیتە لای؟" دواترێ بە دەنگ و ئاوازی شیرینی خۆی پرسی: "چییان دەکرد؟"

"دانیشتبوون. بەڵام لەگەڵ بۆیاخەکان نا. باپیرم قسەی دەکرد و ئەویش گوێی بۆ ڕاگرتبوو."

"چۆن چۆنی دانیشتبوو؟"

لەپڕ هۆپ لەسەر زەوییەکە دانیشتم و لاساییی میوانەکەم کردەوە. گوتم: "بڕوانە دایە، من ئێستا پیاوێکی زۆر بەدەربەستم. برژانگەکانی خۆم تیژ کردووە و گوێ بۆ باپیرم ڕادەگرم. وەک ئەوەی گوێم بۆ مەولود ڕاگرتبێت، وەک ئەو میوانە زۆر بەهەند و بەدەم ویردەوە سەر دەلەقێنم."

دایکم گوتی: "بڕۆ خوارەوە. خەیرییەم بۆ بانگ بکە. هەر ئێستا."

دانیشت، لەسەر کاغەزێکی بچووکی سەر تەختەکەی ئامێزی، دەستی بە نووسین کرد.

"دایە، ئەوە چی دەنووسیت؟"

"ئەرێ پێم نەگوتی بەپەلە بڕۆ خوارێ و خەیرییەم بۆ بانگ بکە؟"

چوومە ئاشپەزخانە. کاکم هاتبووەوە. خەیرییە قاپێک لە پلاوی میوانەکەی لە بەردەمی دانابوو.

کاکم گوتی: "هەی بێبەخت، ڕۆیشتیت و منت بەتەنیا لای وەستا بەجێ هێشت. هەر خۆم بەتەنیا هەموو نووشتاندنەوەکانم ئەنجام دا. پەنجەکانم شین و مۆر

بوونەتەوە."

"خەیرییە، دایکم بانگت دەکات."

کاکم گوتی: "هەر خواردنەکەم تەواو کرد، دارکاریت دەکەم. سزای تەمەڵی و بێبەختیی خۆت وەردەگریت."

دوای ئەوەی خەیرییە ڕۆیشت، کاکم، تەنانەت بەر لەوەی پڵاوەکەی تەواو بکات، هەستا و بەرەو ڕووم هات. نەمتوانی ڕابکەم. قۆڵی گرتم و دەستی کرد بە بادانی باسکم.

"مەکە شەوکەت مەکە. ئەوە زۆرم ئازار دەدات."

"جارێکی دی کار بەسەر مندا جێ دەهێڵیت و ڕا دەکەیت؟"

"ڕا ناکەم."

"سوێند بخۆ."

"سوێند دەخۆم."

"بە قورئان سوێند بخۆ."

"بە قورئان سوێند دەخۆم."

بەڵام بەری نەدام. منی ڕاکێشا بۆ لای سینییەکە. لە لایەک کەوچکی لە پڵاوەکە دەدا و لەلایەکی ترەوە، لەبەرئەوەی لە من بەهێزتر بوو، هێشتا قۆڵی با دەدام.

خەیرییە خۆی پۆشتە کردبوو و دەچووە کۆڵان. گوتی: "دیسان ئەشکەنجەی براکەت مەدە هەی زۆردار. وازی لێ بێنە."

کاکم کە هێشتا قوڵی با دەدام، گوتی: "تۆ خۆتی تێ هەڵمەقورتێنە ئەی کچی دیل. بۆ کوێ دەچیت؟"

خەیرییە گوتی: "لیمۆ دەکڕم."

کاکم گوتی: "هەی درۆزن، دۆڵابەکە پڕە لە لیمۆ."

لەبەرئەوەی قۆڵمی شل کردبوو، لەپڕ خۆم قورتار کرد. شەقێکم تێی هەڵدا و تاوم دایە دەسکی مۆمدانەکە، بەڵام خۆی هەڵدایە سەرم و نامیە ژێر. خۆی بە مۆمداندا کێشا و سینی قڵپ بووەوە.



دایکم گوتی: "بەڵاکانی خوا. بەمەبەستی ئەوەی نەبادا میوانەکە گوێی لێ بێت، نەیدەقیژاند. ئەرێ چۆن بێ ئەوەی خۆی پێشانی قەرە بدات، بە هەیوانەکەدا تێ پەڕیبوو و بە پلیکانەکاندا هاتبووە خوارێ؟ لێکمانی کردەوە. "ئابڕووی مرۆڤ دەبەن، هەی بیژیی پووچ."

شەوکەت گوتی: "ئۆرهان ئەمڕۆ درۆی کرد. منی بە دیار هەموو کارەکانەوە لای وەستام جێ هێشت و ڕای کرد."

دایکم زللەیەکی تێ سرەواند و گوتی: "کڕ بە."

بە سووکی لێی دابوو، کاکیشم نەگریا. گوتی: "من باوکم دەوێت. کاتێک باوکم گەڕایەوە، شمشێرە سوورەکەی مامە حەسەن لە کێلان دەردێنێت و ئێمەش لەم ماڵەوە بۆ لای مامە حەسەن دەگەڕێینەوە."

دایکم گوتی: "بێدەنگ بە." لەپڕ زۆر توورە بوو، پەلی شەوکەتی گرت و بردی بۆ تاریکاییی ئەوپەڕی بەردەڵانەکە. منیش دوایان کەوتبوم. دایکم دەرگای کردەوە. کاتێک منیشی بینی، گوتی:

"دەی هەردووکتان بچنە ژوورێ."

گوتم: "بەڵام دایە من هیچم نەکردووە." لێ چوومە ژووریشەوە.

دایکم دەرگای لەسەرمان داخست. ژوورەوە تاریکێکی ئەنگوستەچاو نەبوو، لە درزی دەریوانەی پەنجەرەی بەرامبەر دار هەنارەکانەوە تیشکێکی لاواز دەهاتە ژوورەوە، بەڵام ترسام.

گوتم: "دایە دەرگا بکەوە، سەرمامە."

شەوکەت گوتی: "مەگری ترسنۆک، ئێستا دەیکاتەوە."

دایکم دەرگای کردەوە. گوتی: "ئارام دەبن تا میوانەکە دەڕوات؟ باشە، کەوابوو تا قەرە دەڕوات، بەدیار ئاگردانەکەوە دانیشن. ناچنە سەرێ."

شەوکەت گوتی: "لەوێ بێزار دەبین. خەیرییە بۆ کوێ چوو؟"

دایکم گوتی: "خۆت لە هەموو شتێک هەڵدەقورتێنیت. تۆ زۆر پێی لێ ڕادەکێشیت."

لە گەوڕەکەوە گوێمان لە حیلەی لەسەرەخۆی ئەسپێک بوو. دواترێ جارێکی تریش

گوێمـان لێ بوو. ئەمە ئەسپەکەی باپیرم نەبوو، ئەوەی قـەرە بوو. وەک ئەوەی بەیانیی ڕۆژی بازاڕ یان جەژن بێت، خۆشییەک لە نێوانماندا پەیدا بوو. بزەیەک کەوتە سەر لێوی دایکم، وەک بڵێی دەیویست ئێمەش پێ بکەنین. دوو هەنگاوی هاویشت و دەرگای ڕوو لە ئەملای پشتیرەکەی کردەوە.

بەرەو ڕووی ژوورەوە بانگی کرد: "هۆششششش."

گەڕایەوە، ئێمەی بردە ئاشپەزخانە مشکاوییەکەی خەیرییە و لەوێ داینیشاندین. ئێرە ناخۆش بوو و بۆنی ڕۆنی لێ دەهات. "دەستم بەدامێنتان تا میوانەکە دەڕوات، لێرە دەرنەچن. شەڕیش مەکەن با کەس وا نەزانێت ئێوە منداڵی سەرکێش و بەدفەساڵن."

پێش ئەوەی دەرگا دابخات، گوتم: "دایە، دایە، شتێک دەڵێم. زەڕکارە داماوەکەی باپیرمیان کوشتووە."



# 7

## من ناوم قەرەیە

لە یەکەم بینینی منداڵەکەیدا، دەستبەجێ حاڵی بووم چەندین ساڵە چ شتێکی ڕووی شەکوورەم بە هەڵە بیر کەوتووەتەوە. ڕووی شەکوورەش، وەک ڕووی ئۆرهان باریکەڵە بوو، چەناگەشی لەوە درێژتر بوو کە لە بیرەوەریی مندا مابووەوە. بۆیە دەبوو بێگومان دەمی خۆشەویستەکەم زۆر لەوە بچووکتر و تەنگتر بێت کە ساڵانێک بوو من بیرم لێ دەکردەوە. لە ماوەی گەڕانی دوازدە ساڵەم بەم شار و ئەو شاردا، بە خەیاڵی خۆم دەمی شەکوورەم لەسەر ویستی خۆم گەورە کردبووەوە. لێوەکانیشی تێر و ئەستوور، بەڵام وەک دەنکە گێلاسێکی گەورە و بریقەدار و گۆشتنتر و خۆ لەبەردا ڕانەگیراوم دەهاتە پێش چاو.

ئەگەر نیگارێکی بە شێوازی ئیتاڵیایی کێشراوی ڕووخساری شەکوورەم پێ بوایە، ئەوا لە ناوەڕاستی ڕێبوارییی دوازدە ساڵەمدا ناچار نەدەبووم لەبەر نەبوونی توانای بیرهێنانەوەی ڕووی ئەڤیندارە لە پاش بەجێماوەکەم خۆم بێ خاک و بێ نیشتمان بزانم. چونکە ئەگەر دڵدارێکتان هەبێت و نیگاری ڕووتان لە دڵ و هەناوی خۆتاندا کێشابێت، ئەوا ئیدی بزانن گشت گۆشەیەکی ئەم دنیایە ماڵ و وارگەی خۆتانە.

بە بینینی کوڕەکەی شەکوورە و دواندنی و سەیرکردنی ڕووی لە نزیکەوە و ماچکردنی، بێ ئۆقرەییەکی تایبەت بە کەسانی شووم و بکوژان و گوناهکاران سەرتای جەستەی داگرتم. دەنگێک لە ناخەوە پێمی دەگوت: "دەی، هەر ئێستا بڕۆ شەکوورە ببینە."

بۆ تاوێک بیرم لەوە کردەوە، بێ گوتنی هیچ شتێک لای زاوا هەڵسم و دەرچم، هەموو دەرگانی سەر هەیوانە –بە تیلەی چاو ژماردبوومن، بە دەرگای سەر پلیکانەکانەوە سەرجەم پێنج دەرگا بوون– یەک بەیەک بکەمەوە تا شەکوورە دەدۆزمەوە. بەڵام لەبەرئەوەی من لە ناوەخت و بێ حیسێب دڵی خۆم بۆ ئەڤیندارەکەم کردبووەوە، دوازدە ساڵی ڕەبەق لێی دوورکەوتبوومەوە. بێدەنگ و بەدزییەوە چاوەڕێم کرد، سەیری ئەو نیمدەرانەم دەکرد کە مەگەر خوا هەر بۆخۆی بزانێت شەکوورە چەند لەسەریان دانیشتووە، بۆ ئەو شتومەکانەم دەڕوانی کە دەستی ئەویان بەرکەوتبوو و هەمان کاتیش گوێم بۆ زاوا ڕاگرتبوو.

بۆی گێڕامەوە سوڵتان دەیەوێت کتێبەکە فریای ساڵی هەزارەی یەکەمی کۆچی بکەوێت. سوڵتانی کۆڵەکەی جیهانمان دەیویست لە هەزار ساڵەی ساڵنامەدا پێشانی فەرەنگەکانی بدات خۆیشی و دەوڵەتەکەشی دەتوانێت هێندەی ئەوان شێوازەکانی ئەوان بەکار بهێنێت. هەروەها سوڵتان لەبەرئەوەی دەیزانی ئەو وەستایانەی ئەرکی ئامادەکردنی جەژننامەی پێ ڕاسپاردبوون، زۆر سەرقاڵ دەبن، دەستووری دابوو لە ئاپۆڕەی نیگارخانە دوور بکەونەوە و لە ماڵەوە کار بکەن. بێگومان لەوەش ئاگادار بوو کە نیگارکێشان بەدزییەوە سەریان لە زاوام دەدا.

زاوام گوتی: "دەچیت و گەورەی نیگارکێشان وەستا عوسمان دەبینیت. دەڵێن کوێر بووە و خەڵەفاوە. بەڕای من هەم کوێر بووە و هەم خەڵەفاویشە."

زاوام، بێ ئەوەی وەستایەکی نیگارکێش بێت و پیشەی نیگارکێشی بێت، سوڵتان ڕای سپاردبوو سەروکاری ئامادەکردنی کتێبێکی بۆ بکات. هەڵبەتە ئەمەش ناکۆکیی نێوان ئەو و گەورەی نیگارکێشان وەستا عوسمانی بەسالاچووی قوڵتر دەکرد.

سەردەمی منداڵیی خۆمم بیر کەوتەوە و نیگام لە کەلوپەلی ناو ماڵەکە بڕی: کلیمە شینەکەی دەستکاری قولا، سوراحییە مسەکە، سینیی پەرداخەکان و سەتڵەکە، فنجانەکانی قاوە و هێشتا لە بیرمە پووری خوا لێخۆشبووم دوازدە ساڵ لەمەوبەر بە شانازییەوە دەیگوت لە چین و پورتوگالەوە هاتوون. ئەم شتومەکانەش وەک تەختەی قەراغ بە گەوهەر ڕازێندراوە و ڕەفی سەر دیوارەکان و سەرینی قەدیفەییی سووری شەکوورە، کە نەرمییەکەیم بیر کەوتەوە دەستێکم لێ دا، پاشماوەی ماڵەکەی



ئاکسەرای بوون، ئەو ماڵەی من و شەکوورە منداڵیی خۆمان تێدا بەسەر بردبوو. هێشتا بەشێک لە شوێنەواری بەختەوەریم لەو ماڵە و گەشایی ڕۆژانی نیگارکێشانم بەسەر شتەکانەوە مابوو.

بەختەوەری و نیگار. داوا لە خوێنەرانی دەلال دەکەم، ئەوانەی سەرنج لە چیرۆک و دەردەکانی من دەدەن، هەمیشە ئەمەتان وەک سەرەتای دنیای من لە خەیاڵ بێت. سەردەمانێک لێرە، لەناو کتێب و قەڵەم و نیگاردا زۆر بەختەوەر بووم. دواتر لەبەرئەوەی کەوتمە داوی ئەڤینەوە، لەم بەهەشتە وەدەرنرام. لە ساڵانی ئاوارەییی ئەڤینمدا زۆر بیرم لەوە کردەوە من فرە قەرزداری شەکوورە و ئەڤینی ئەوم، چونکە ڕێی بۆم خۆش کردبوو لە تافی لاویمدا گەشبینانە بۆ ژیان و دنیا بڕوانم. لەبەرئەوەی زۆر دڵسافانە گومانم نەبوو لە دوورینەوەی بەری ئەڤینداریی خۆم، زیاد لە ڕادەبەدەر گەشبین بووم و دنیاشم گەشبینانە پەسەند دەکرد و وەک جێیەکی باش چاوم لێ دەکرد. هەر لە سۆنگەی ئەم گەشبینییەوە بوو شەیدای کتێب و ئەو شتانەی تر بووم کە زاوام دەیگوت "بیانخوێنەوە." دڵم چووە سەر ئەو شتانەی لە دەرسخانە فێریان دەبووم و نیگار و نیگارکێشانم خۆش ویست. بەئەندازەی ئەوەی لە نیوەی یەکەمی هەرە دەوڵەمەندی پەروەردەی و گەش و بەسازمدا قەرزداری ئەڤینی شەکوورەم، بەهەمان ڕادەش قەرزداری ڕەتکردنەوەی ئەزموونە تاریکەکانی خۆمم، ئەو ئەزموونانەی پەروەردەی منیان ژەهراوی کردبوو: کاتێک لە ژووری کاروانسەراکان گڕی ئاگر خامۆش دەبوو، من ئارەزووم دەکرد لەگەڵ پشکۆکاندا بفەوتێم و نەمێنم؛ گشت جارێک لە خەونمدا، دوای سەرجێییکردن لەگەڵ ژنەکەی تەنیشتم، دەکەومە دۆڵێکی قوڵ و بێ بنەوە و زۆر جاریش پێم وایە من سەرتۆپی ئەوانەم کە پێنج قروش ناکەن. گشت ئەمانە میراتی شەکوورەیە بۆ من ماوەتەوە.

دواترێ زاوام گوتی: "ئایا دەتزانی دوای مردن ڕۆحەکانمان دەتوانن بگەن بە ڕۆحی ئەوانەی لەم دنیایە لە نوێنی خۆیاندا لە شیرین خەودان؟"

"نەمدەزانی."

"دوای مردن ڕێبوارییەکی درێژ هەیە و ترسی من لە مردن لەم سۆنگەیەوە نییە. ترسی من ئەوەیە کتێبی سوڵتانمان بە ئەنجام نەگەیەنم و بمرم."

بەشێکی هۆشم لەسەر ئەوە بوو گوایە بەبۆچوونی زاوام، من بەهێزتر و هۆشمەندتر و ساغڵەمتر بووم. بەشێکیشی چووبووە سەر گرانبەهاییی ئەو قوماشەی لە هاتنمدا بۆ ئەم پیاوەم کڕیبوو، ئەو پیاوەی دوازدە ساڵ لەمەوبەر ڕازی نەبووبوو کچی خۆیم لێ مارە بکات. هەمان بەشی ئەقڵم چووبووە سەر هەوساری زیوین و ڕەخت و زینی نەخشێندراوی ئەسپەکەم و بەخۆم دەگوت هەر ئێستا بە پلیکانەکاندا دەچمە خوارێ، لە گەوڕ دەری دێنم و سواری دەبم.

پێم گوت هەرچییەک لە نیگارکێشان ببیستم، پێت دەگەیەنمەوە. دەستیم ماچ کرد، لە پلیکانەکان چوومە خوارێ و گەیشتمە حەوشە. کاتێک لە ڕوومدا هەستم بە ساردیی بەفر کرد، بیرم کەوتەوە من نە منداڵم و نە کابرایەکی بەساڵاچوو. هەستم کرد سەرماکە بەختەوەریی ژیان دەڕژێنێتە جەستەمەوە. لەگەڵ داخستنی دەرگای پشتیرەکەدا، بایەک هەڵی کرد. کاتێک لغاوی ئەسپە سپییەکەم گرت و بەدوای خۆمدا ڕام کێشا و لە بەردەڵانەکەوە بەرەو حەوشە ڕۆیشتین، ئەویش لەگەڵ مندا لەرزی لێ هات: وا هەستم کرد وەک ئەوەی ڕانە بەهێز و دەمار ئەستوورەکانی و پشووکورتی و دۆخی لە ڕام کردن نەهاتووی ئەو، هی خۆم بن. هەر ئەوەندەی چوومە کۆڵان، لەوەدا بووم بە هەڵمەتێک سواری ئەسپەکەم بم و لە کۆڵانە تەنگەبەرەکاندا ون بم و وەک سواری ناو داستانەکان هەرگیز نەگەڕێمەوە، ژنێکی کەتە، جووێکی سەرتاپا پەمەییپۆش بوخچەیەکی پێ بوو و من نەمزانی لە کوێوە پەیدا بوو، بەرەو ڕووم هات. ئەوەندە گەورە و فراوان بوو بە دۆلاب دەچوو، بەڵام بە بزاوت و زیت و تەنانەت نازداریش بوو.

گوتی: "شێری خۆم، لاوی جوامێرم، بەڕاستی چەلەنگتر و هۆشمەندتری لەوەی لێت دەگێڕنەوە. ژنداری یان زگورتی؟ لە ئەستەری باشترین بوخچەگێڕی ئەستەنبوڵ دەسماڵێک بۆ دۆستی نهێنیت ناکڕیت؟

"نەخێر."

"پشتوێنێکی سووری لە ئەتڵەس چندراو."

"نەخێر."

"نەخێر، نەخێر مەکە، بڕوانم کەی دەچێتە ئەقڵەوە شێرێکی وەک تۆ مارەبڕ یان



خۆشەویستێکی نهێنیی نەبێت؟ کێ دەزانێت چەند کچی چاو بە فرمێسک قرچەقرچ بۆت دەسووتێن؟"

لە پڕ جەستەی خۆی وەک بەژنی نەرمی تەنافبازێک درێژ کرد و بە زەرافەتێکی سەرسوڕهێنەوە خۆی لێم نزیک خستەوە. هەمان کات بە شێوەی جادووگەرێک، کە بە هونەری خۆی لە هیچەوە شت دەئافرێنێت، نامەیەک لە دەستیدا دەرکەوت. لە چاو لێکنانێکدا پڕم دایە نامەکە و وەک ئەوەی چەندین ساڵ بێت بۆ ئەم ساتە پەروەردە کرابم، خزاندمە پشتوێنەکەمەوە. نامەیەکی قەبە بوو. لە ئێستاوە، لە پشتوێنەکەمدا و لەسەر ناوقەدم، وەک ئاگرێک لەسەر جەستەی تەزیوم هەستم پێ دەکرد.

ئەستەری بوخچەگێڕ گوتی: "سواری ئەسپەکەت بە و بەڕەوانی بازۆ. لەگەڵ ئەم دیوارانە بۆ لای ڕاست بگەڕێوە. گوێ بە قسەی کەس مەدە و بڕۆ، بەڵام کاتێک گەیشتیە کن دارهەنارەکە، ڕووت وەرگێڕە و سەیری ئەو ماڵە بکە کە لێوەی دەرچوویت، سەیری پەنجەرەی بەرامبەرت بکە."

درێژەی بە ڕۆیشتنی خۆی دا و لەپڕ ون بوو. سواری ئەسپەکەم بووم، بەڵام سواربوونێکی ناشیانە وەک ئەوەی جاری یەکەمم بێت سواری ئەسپ بم. دڵم ترپەترپ لێی دەدا، ئەقڵم شپرزە بووبوو و دەستەکانم سەریان لێ شێوابوو و نەیاندەزانی چۆن هەوساری ئەسپەکە بگرن. بەڵام دوای ئەوەی سوار بووم و ڕانەکانم بە جەستەی ئەسپەکەمەوە نووساند، ئەقلێک و هونەرێکی ساغڵەم جڵەوی خۆم و ئەسپەکەمیان گرتە دەست و ئەستەر گوتەنی، ئەسپە ئاقڵەکەم ڕەوان ڕێی کرد و ئاوڕیشمان بۆ کۆڵانی لای ڕاست دایەوە. چەند جوان بوو.

ئەو ساتە هەستم کرد لەوانەیە بەڕاستی چەلەنگ بم. هەستم دەکرد، وەک ئەوەی لە داستانەکاندا هەیە، لە پشت هەر دەریوانەیەک و هەر تەلبەندێکی پەنجەرەوە ژنێکی گەڕەک سەیری من دەکات و منیش بەهەمان ئاگر لەبەرەوە دەسووتێم. ئەرێ ئەمە بوو ئارەزووی من؟ ئایا دەگەڕێمەوە بۆ نەخۆشییەکەی پێش ئەو هەموو ساڵە؟ لەپڕ ڕۆژ دەرکەوت و سەرم لێ شێوا.

دارهەنارەکە لە کوێیە؟ کوا ئەم دارە لاواز و خەمبارەیە؟ بەڵێ خۆیەتی، بەسەر ئەسپەکەمەوە لەسەرەخۆ ڕووم وەرچەرخاند: ڕێک لە بەرامبەرم پەنجەرەیەک هەبوو،

کەسی لە بەردەمدا نەبوو. ئەستەری چەنەباز لە خشتەی بردم.

ڕێک ئەو کاتەی من لەم بیر و خەیاڵانەدا بووم، دەریوانەی بە شەختە داپۆشراوی پەنجەرەکە، وەک ئەوەی بتەقێتەوە، کرایەوە و دڵداری شۆخی خۆم بینی لە چوارچێوەی پەنجەرەکەدا لەبەر تیشکی ڕۆژ دەبریسکایەوە. دوای دوازدە ساڵ لە نێوان لقی دارە بە بەفر داپۆشراوەکانەوە ڕووی شیرینیم بینی. ئایا چاوڕەشم بۆ منی دەڕوانی، یان بۆ ژیانێکی تر لەو دیوی منەوە؟ تێ نەدەگەیشتم داخۆ خەمگینە یان پێ دەکەنێت، یاخۆ بەخەمگینی پێ دەکەنێت؟ ئەسپی بێ ئەقڵم، دڵم وێڵ بکە و هێدی برۆ، جارێکی تریش لەسەر زینی ئەسپەکەم بێ پەروا ئاوڕم دایەوە، تا ڕووی ڕازدار و زەریف و زراڤی لە پشت لق و چڵە سپییەکانەوە ون بوو، من تا کۆتایی بە تاسەوە سەیرم کرد.

ئای دیمەنی من بەسەر ئەسپەکەمەوە و ڕاوەستانی ئەو لەناو پەنجەرەدا چەند بەو جڤاتەی هەزاران جار نیگار کێشراو دەچوو کاتێک خەسرەو دێتە ژێر پەنجەرەی شیرین. – لە نێوان ئێمەشدا، بەڵام کەمێک لە دواترەوە، دارێک هەبوو –. من زۆر دەرەنگ، پاش ئەوەی نامەکەم کردەوە و نیگارەکەی ناویم بینی، لەمە حاڵی بووم. کاتێکیش حاڵی بووم، وەک نیگاری داستانەکانی ناو ئەو کتێبانەی خۆشمان دەویست و شەیدایان بووین، من لە تاو ئازاری ئەڤین قرچەی سووتانم دەهات.



# 8

## من ناوم ئەستەرە

دەزانم هەمووتان پەرۆشی ئەوەن بزانن ئەو نامەیەی ڕادەستی قەرەم کرد، چی تێدا نووسرابوو. لەبەرئەوەی منیش پەرۆشی زانینی بووم، هەمووییم بۆ ئاشکرا بوو. ئەگەر دەخوازن کارێکی وا بکەن وەک ئەوەی پەڕە بەپەڕەی چیرۆکتان بۆ دواوە هەڵبدەنەوە، با بۆتان بگێڕمەوە بزانین پێش ئەوەی نامەکەی بگەیەنمێ، چی ڕووی دا.

ئێستا لای ئێوارەیە. لە گەڕەکی جوولەکانی خۆمانی هەڵکەوتوو لەبەر دەروازەی کەنداوی زێڕیندا، لەگەڵ نەسیمی هاوسەرم لە ماڵەوە دانیشتووین. دوو پیر و بەساڵاچووین، خەڵوز دەخەینە سۆپاوە، نرکەنرک فووی لێ دەکەین و لە هەوڵی خۆ گەرمکردنەوەداین. لەوە گەڕێن ئێستا بە دەممدا هات و بەخۆم گوت پیر. باوەڕتان هەبێت هەر ئەوەندەی دەسماڵی ئاوریشم، دەستکێش، چارشێو، قوماشی ڕەنگاوڕەنگی بە کەشتی لە پورتوگالەوە هاتوو، ئەنگوستیلە، گوارە، ملوانکە و وردەواڵەی وەجۆشهێنەری ژنانم لە بوخچە نا و کردمە قۆڵم، ئەوا ئەستەنبوڵ مەنجەڵ و ئەستەر کەوگیر، کۆڵان نامێنێت سەری پێدا نەکەم. نامە و قسە و قسەڵۆک نەماوە لەم دەرگاوە نەیگوازمەوە بۆ ئەو دەرگا و نیوەی کچانی ئەستەنبوڵ خۆم بە شووم داون. ئێستا بۆ خۆهەڵکێشان سەری ئەم بابەتەم نەکردەوە. گوتم دەمەو ئێوارە دانیشتبووین، تەقتەق لە دەرگا درا. چووم و کردمەوە، خەیرییەی کەنیزەکی بێهۆشم لەبەردەم خۆمدا بینی نامەیەکی بەدەستەوە بوو. نازانم لەتاو سەرما بوو یان لەبەر شپرزەیی، دەلەرزی و خواستی شەکوورەی خۆمی بۆم دەگێڕایەوە.

سەرەتا وامزانی ئەم نامەیە بۆ حەسەن دەنێردرێت و سەرم سوڕما. شەکوورەی دلبەر مێردێکی هەیە ماوەیەکی درێژە لە شەڕ نەگەڕاوەتەوە -ئەگەر لە من دەپرسن، ئەو بەدبەختە لەمێژە پێستی وشک هەڵهاتووە-، ئا ئەو مێردە بۆ ماڵ نەگەڕاوەیەی، برایەکی سەرەڕۆی هەیە ناوی حەسەنە. بەڵام تێ گەیشتم نامەکەی شەکوورە بۆ حەسەن نییە، بۆ کەسێکی ترە. چی لە نامەکەدا نووسرابوو؟ ئەستەر خەریک بوو لە مەراقدا شەقی دەبرد. دواجار لە خوێندنەوەیدا سەرکەوتوو بووم.

ئاشنایەتییەکی ئەوتۆشم لەگەڵ ئێوەدا نییە. ڕاستییەکەی، لەپڕ هەستم بە شەرم و دڵتەنگی کرد. پێتان ناڵێم نامەکەم چۆن خوێندەوە. لەوانەیە مەراقەکەم -وەک ئەوەی ئێوەش لانی کەم هێندەی سەرتاشەکان کەسانی بەمەراق نەبن- بە شوورەیی بزانن و بەچاوی سووک بۆم بڕوانن. با تەنیا ئەوەتان پێ بڵێم کە من لە کاتی خوێندنەوەی نامەکەدا بەرگوێم کەوت. شەکوورەی شیرین بەمجۆرەی نووسیبوو:

"قەرە ئەفەندی، بە پشتبەستن بە نزیک بوونت لە باوکمەوە دێیتە ماڵەکەم. بەڵام پێت وا نەبێت لە منەوە هیچ ئاماژەیەکت دەستگیر بێت. لەدوای ڕۆیشتنی تۆ زۆر شت قەوما. شووم کرد و دوو کوڕی شێرئاسام هەن. یەکێکیان ئۆرهانە، پێش کەمێک هاتبووە ژوورەوە و تۆ بینیبووت. ماوەی چوار ساڵە چاوەڕێی مێردەکەم دەکەم و بیر لە هیچ شتێکی تر ناکەمەوە. لەوانەیە لەگەڵ دوو منداڵ و باوکێکی پیر هەست بە بێکەسی و بێچارەیی و بێهێزیی خۆم بکەم، لەوانەشە پێویستم بە هێز و پەنای پیاوێکیش هەبێت، بەڵام کەس پێی وا نەبێت بتوانێت کەڵک لەم دۆخەم وەربگرێت. بۆیە تکایە جارێکی تر لە دەرگامان مەدەوە. ئاشکرایە جارێک منت شەرمەزار کرد و ئەو کاتە دەرد و ئازاری زۆرم چەشت تا توانیم بێتاوانیی خۆم لەبەر چاوی باوکمدا بسەلمێنم. ئەو کاتەی گەنجێکی ئەقڵ لە ئەژنۆ بوویت، نیگارێکت کێشابوو و بۆ منت ناردبوو. لەگەڵ ئەم نامەیەدا، نیگارەکەشت بۆ دەنێرمەوە بۆ ئەوەی هیچ ئومێدێکت نەمێنێت و هیچ ئاماژەیەکی هەڵەت پێ نەگات. ئەوە درۆیە مرۆڤ بە سەیرکردنی نیگارێک عاشق دەبێت. شتی هەرە باش ئەوەیە پێت لە ماڵمان ببڕێت."



شەکوورە گیانی داماوم نە پیاوە، نە بەگ و نە پادشا تا مۆری ڕازاوەی خۆی لە بنی نامە بدات. پیتی یەکەمی ناوی خۆی، وەک مەلێکی بچووک و ترسنۆک خستبووە پەڕاوێزی نامەکەیەوە. هەر ئەوەندە و بەس.

باسی مۆرم کرد. ئێستا ئێوە پەرۆشی ئەوەن بزانن من چۆن ئەو نامە مۆرکراوانە دەکەمەوە و دادەخەم؟ بەڵام نامەکان سەربەمۆر نین. شەکوورەی شیرینم وا بیر دەکاتەوە ئەم ئەستەرە جوویەکی نەزانە و دەست لە نووسراوەکانی نادات. ڕاستە، من دەستنووسی ئێوەم بۆ ناخوێندرێتەوە، بەڵام ئەرکی خوێندنەوەی بە کەسێکی تر دەسپێرم. هەر خۆیشم نامەکانتان دەخوێنمەوە. چییە، سەرتان لێ شێوا؟

با بە شێوەیەک بۆتان ڕوون بکەمەوە کە سەرقەویترین کەسیشتان تێ بگات.

ئەو پەیامەی نامەیەک لە دووتوێی گرتووە، تەنیا بە نووسین ناگەیەندرێت. نامەش، کتومت وەک کتێب، بە بۆنکردن و دەست پێوەدان و هەڵدانەوەوە دەخوێندرێتەوە. بۆیە ئەوانەی هۆشیان لە سەردایە، دەڵێن ئا ئەو نامەیە بخوێنەوە بزانین چی دەڵێت. کەسانی گەمژەش دەڵێن ئا بیخوێنەوە بزانین چیی تێدا نووسراوە. هونەر بەتەنیا لە خوێندنەوەی نووسراوەکەدا نییە، لە خوێندنەوەی سەرلەبەری نامەکەدایە. گوێ بگرن بزانن شەکوورە چی تریشی گوتووە:

١- دەڵێت ئەگەرچی نامەکەم بەدزییەوە دەنێرم، بەڵام ناردنی بە ئەستەردا، کە گواستنەوەی نامەی کردووە بە کار و خووی خۆی، پێشاندەری ئەوەیە مەبەستێکی نهێنیی ئەوتۆم نییە.

٢- نووشتاندنەوەی چەند قاتەی کاغەزەکە وەک نووشتە، واتای ڕاز و نهێنی دەگەیەنێت. ئەمە بەمەرجێک نامەکە کراوەیە. سەرباری ئەوەش، نیگارێکی گەورەی لەگەڵدایە. مەبەست ئەوەیە وا پێشان بدرێت: ئەمان دەستم بەدامێن، با نهێنیی خۆمان لە هەمووان بشارینەوە. ئەمەش لە نامەی ڕەتکردنەوەی ئەڤین ناچێت، زیاتر نامەی بانگکردنە بۆ ئەڤین.

٣- تەنانەت بۆنی نامەکەش ئەم بۆچوونە پشتڕاست دەکاتەوە. ئەم بۆنە، تا ڕادەی دوودڵ کردنی ئەو کەسەی دەستی دەداتێ، نادیارە (تۆ بڵێی بەمەبەست ئەم بۆنەی پێوە کرابێت)، بەڵام هێندەش دڵگیرە مرۆڤ ناتوانێت فەرامۆشی بکات

(ئایا ئەمە بۆنی عەتری گوڵە یاخۆ بۆنی دەستی ئەوە؟) ئەم بۆنە بەس بوو بۆ بە تاڵانبردنی ئەقڵی ئەو بەلەنگازەی نامەکەی بۆم خوێندەوە. پێم وابێت ئەقڵی قەرەش بەهەمان شێوە لە سەری دەردێنێت.

٤- من ئەستەرێکی نەخوێندەوارم، بەڵام ڕەوتی دەستنووسەکە و سەرباری ئەوەی قەڵەم دەڵێت "دەستم بەدامێن پەلەمە و بێ گرینگی پێدان و بێ لێوردبوونەوە دەنووسم"، پیتەکان پێکەوە بە شنەبایەکی دڵگیر زەریفانە دەلەرێنەوە و وا دێنە بەرچاو وەک ئەوەی لە ناخەوە شتێکی تر بڵێن. ئەگەرچی باسی ئۆرهان دەکات و دەیەوێت بە گوتنی "پێش کەمێک" هێما بکا بۆ ئەوەی ئێستا نامەکەی نووسیوە، ئاشکرایە لەبەر ڕەشنووسێکی پێشتر ئامادەکراودا نووسراوەتەوە، چونکە لە دێر بەدێریدا هەست بە وردبینی دەکرێت.

٥- ئەو نیگارەی لەگەڵ نامەکەدا نێردراوە، تەنانەت منی ئەستەری جووش دەزانم چیرۆکی شیرینی شۆخی ناو داستان دەگێڕێتەوە کاتێک سەیری نیگاری خەسرەوی بەدەو دەکات و دلێ تێ دەچێت. هەموو ژنانی خەیاڵپەرستی ئەستەنبوڵ شەیدای ئەم داستانەن، بەڵام جاری یەکەمە دەبینم نیگار دەنێردرێت.

ئێوەی خوێندەواری بەختەوەر زۆر جار ئەمەتان بەسەر هاتووە: کەسێکی نەخوێندەوار نامەیەکی بۆ هاتووە و لێتان دەپارێتەوە و ئێوەش نامەی پێگەیشتووی بۆ دەخوێننەوە. لەبەرئەوەی نووسراوی ناو نامەکە ئەوەندە هەژێنەر و جۆشبەخش و ئۆقرەبڕە، خاوەن نامە شەرم دەکات ئێوەی کردووە بە هاوبەشی ڕازی خۆی و بە شەرم و بەدزییەوە تکاتان لێ دەکات جارێکی تر بۆی بخوێننەوە. دیسان دەیخوێننەوە. نامەکە ئەوەندە دەخوێندرێتەوە، دواجار هەردووکتان لەبەری دەکەن. دواتر نامەکەت لە دەست وەردەگرێت و دەپرسێت "ئەرێ ئەم قسەیەی لەوێدا گوتووە، یان لێرەدا؟ ئەوی تری لێرەدا کردووە؟" و بێ ئەوەی لە پیتەکان تێ بگات، سەیری ئەو خاڵە دەکات کە بەڕێزتان بە نووکی پەنجەتان پێشانی دەدەن. کاتێک ئەوان دەڕواننە پێچ و بادانەوەی ئەو پیتانەی بۆیان ناخوێندرێتەوە و لەبەریان کردوون، من تا ڕادەی لەبیرکردنی نەخوێندەواریی خۆم دڵتەنگ دەبم و لە ناخەوە ئارەزوو دەکەم ئەو کچە نەخوێندەوارانەی فرمێسکیان بەسەر نامەکاندا ڕژاندووە، ماچ بکەم.



هەروەها کەسانێکی شووم و ڕەزاگرانیش، لە ڕێی خوا ئێوە وەک ئەوان مەبن: کچە نامەکە وەردەگرێتەوە تا جارێکی تر دەستێکی لێ بدات و بزانێت چ قسەیەک لە چ شوێنێک کراوە و بێ ئەوەی لێی تێ بگات، دەخوازێت سەیری بکات. ئەو ئاژەڵە شوومانە پێی دەڵێن: "چی دەکەیت، خۆ تۆ خوێندەواریت نییە، ئیدی سەیری چی دەکەیت؟" هەندێک لەوانە، وەک ئەوەی نامەکە هی خۆیان بێت، هەر نایدەنەوە بە کچە. هەندێک جار ئەرکی بەگژداچوونی ئەوانە و وەرگرتنەوەی نامەکە دەکەوێتە ئەستۆی من، ئەستەر. ئەرێ، منی ئەستەر ژنێکی ئەوەندە باشم، ئەگەر خۆشم بوێن، دەتوانم هاوکاریی ئێوەش بکەم.

# 9

## من شەکوورەم

ئەیەڕۆ، کاتێک قەرە بەسەر ئەسپەکەیەوە ڕێک بە بەردەممدا تێپەڕی، بۆچی من لەوێ لەناو پەنجەرەکە ڕاوەستابووم؟ بۆچی تەواو ئەو ساتە بە گومانێکەوە دەریوانەی پەنجەرەکەم کردبووەوە و گاڤێک لە نێوان لقەکانی دارهەنارە بە بەفر داپۆشراوەکەوە بینیم، ماوەیەکی دوور و درێژ سەیرم کرد؟ ناتوانم بەتەواوی باسی گشت ئەمانەتان بۆ بکەم. من بە خەیرییەدا هەواڵم بۆ ئەستەر نارد، هەڵبەتە دەمزانی قەرە بەوێدا تێ دەپەڕێت. ئەو ساتە من بەتەنیا بۆ چاوگێڕان بە سەرچەفەی ناو سندووقەکاندا چووبووم ژووری دۆلابی ناو دیوارەکە، ئەو ژوورەی بەسەر دار هەنارەکەدا دەڕوانێت. لەبەرئەوەی لە ناخەوە وام دەویست، ئەو ساتە بە جۆش و بەوپەڕی هێزەوە پاڵێکم بە دەریوانەکەوە نا و سەرەتا ماڵەکە پڕ بوو لە تیشکی هەتاو. لەبەردەم پەنجەرەکەدا ڕاوەستام و لەگەڵ قەرە، وەک ئەوەی تیشکی ڕۆژ بە شەوارەی خستبم، نیگامان یەکانگیر بوو؛ زۆر جوان بوو.

گەورە بووبوو، پێ گەیشتبوو، دۆخی لەرزۆکیی سەردەمی لاویی تووڕ هەڵدابوو و چەلەنگ و قۆز بووبوو. دڵم پێی گوتم: "شەکوورە، بڕوانە، قەرە بەتەنیا هەر قۆز نییە، سەیری ناو چاوانی بکە، دڵی لە منداڵ دەچێت، چەند خاوێن و تەنیایە، شووی پێ بکە." بەڵام من نامەیەکی تەواو پێچەوانەی ئەمەم بۆی ناردبوو.

سەرباری ئەوەی دوازدە ساڵ لە منیش گەورەتر بوو، کاتێک من دوازدە ساڵان بووم، دەمزانی لەو پێگەیشتووترم. ئەو سەردەمە لەبری ئەوەی وەک پیاوێک




لەبەردەممدا ڕاوەستێت و بڵێ "ئەمە دەکەم و ئەوە دەکەم، لێرەوە خۆم فڕێ دەدەمە خوارێ و بە ئێرەدا هەڵدەزنێم"، شەرمی لە هەموو شتێک دەکرد و سەری بەسەر کتێب و نیگارەکانی بەردەمیدا شۆڕ دەکردەوە و خۆی دەشاردەوە. دواتریش دڵی چووە من. بە کێشانی نیگارێک ئەڤینی خۆی دەردەبڕی. ئیدی هەردووکمان پێ گەیشتبووین. کاتێک تەمەنم بوو بە دوزادە ساڵان، قەرە سەیری ناو چاوانی منی نەدەکرد. هەستم دەکرد لەوە دەترسێت ئەگەر نیگامان یەکانگیر بێت، من تێ بگەم ئەو عاشقم بووە. بۆ نموونە دەیگوت "ئەو چەقۆ دەسک ددانی فیلەم دەدەیێ؟" بەڵام سەیری چەقۆکەی دەکرد و دواتر چاوی هەڵدەبڕی و سەیری ناو چاوانی منی نەدەکرد. بۆ نموونە ئەگەر دەمپرسی "شەربەتی گێلاسەکە خۆش بوو؟"، وەک ئێمە بە دەمی پڕەوە، بە زەردەخەنەیەک یان ئاماژەیەکی ڕوو وەڵامی بۆ نەدەدرایەوە. شێوەی ئەوەی لەگەڵ کەسێکی کەڕ و گوێگراندا بدوێت، تا تینی تێدا بوو دەیقیڕاند و دەیگوت: "بەڵێ." بۆیە وای دەکرد، چونکە لە ترساندا نەیدەوێرا سەیری ڕووم بکات. ئەو سەردەمانە زۆر شۆخ و نازدار بووم. هەموو کوڕان، گشت ئەوانەی ئەگەر بۆیان بکرایە تەنانەت جارێکیش لە دوورەوە، لە پشت پەردە و دەرگا و لەناو تۆپی قوماشەوە بمبینن، لە جێدا گرفتاری داوی ئەڤینم دەبوون. ئەمانە بۆ خۆهەڵکێشان نا، بۆ ئەوەی لە بەسەرهاتم بگەن و خەمی خۆمتان لەگەڵدا دابەش بکەم، دەگێڕمەوە.

وەک هەمووان دەیزانن، لە داستانی خەسرەو و شیریندا ساتێک هەیە من و قەرە فرە قسەمان لەبارەوە کردبوو. شاپوور نیازی هەیە خەسرەو و شیرین دڵیان بچێتە یەکدی. ڕۆژێک شیرین لەگەڵ یاران و هاودەمانیدا دەچێتە سەیرانی دەشت و دەر. شاپوور بەدزییەوە لە شوێنی پشوودان و حەسانەوە نیگاری خەسرەو بە لقی دارێکەوە هەڵدەواسێت. گاڤێک شیرین نیگاری خەسرەوی چەلەنگ بە لقی دارێکی ئەو باخچە ڕازاوەیەوە دەبینێت، عاشقی دەبێت. زۆر جاران نیگاری ئەو ساتە، یان بە گوتەی نیگارکێشان ئەو جڤاتە کێشراوە. گشت نیگارەکانیش تێڕامانی پڕ لە شەیدابوون و سەرسوڕماویی شیرین لە نیگاری هەڵواسراوی خەسرەو بە لقی دارەوە پێشان دەدەن. قەرە ئەو کاتەی لەگەڵ باوکمدا کاری دەکرد، زۆر جار ئەو نیگارەی دیبوو و یەک دوو جاریش سەیری کردبوو و کتومت وەک خۆی لەبەری

گرتبووەوە. دواتریش، کاتێک کەوتە داوی ئەڤینی منەوە، جارێکیش سەرلەنوێ بۆ خۆی کێشای. بەڵام لە جێی خەسرەو و شیرینی ناو نیگارەکە، خۆی و من، قەرە و شەکوورەی کێشابوو. تەنیا بە نووسینی ژێر نیگارەکەدا، کە تەنیا من لێی تێ دەگەیشتم، دەزانرا کچ و کوڕی ناو نیگارەکە ئێمەین، چونکە هەندێک جار بەگاڵتەوە نیگاری هەردووکمانی بەهەمان هێڵ و هەمان ڕەنگ دەکێشا: من شین دەبووم و ئەویش سوور. وەک بڵێی ئەمە بەس نەبێت، لەژێر نیگاری خەسرەو و شیرینیش ناوی هەردووکمانی نووسیبوو. چەشنی ئەوەی تاوانێک بکات، نیگارەکەی لە شوێنێک، کە من بتوانم بیبینم، جێ هێشتبوو و بۆی دەرچووبوو. لە بیرمە سەیری تێڕوانینی من لە نیگارەکە و کاردانەوەی دواترمی دەکرد.

لەبەرئەوەی دەمزانی وەک شیرین گرفتاری ئەڤینی وی نابم، سەرەتا هیچ خۆم نەشێواند. ئەو ئێوارەیەی هاوین کاتێک بەو بەفرەی دەگوترا گوایە لە ئولوداغەوە هێندراوە، خەریکی فێنککردنەوەی شەربەتی گێلاس بووین، دوای ڕۆیشتنەوەی قەرە بۆ ماڵی خۆیان، من بە باوکم گوت قەرە ئەڤینی خۆی بۆم بەیان کردووە. قەرە ئەو کاتانە تازە لە دەرسخانە دەرچووبوو و لە گەڕەکانی قەراغ شار مامۆستاییی دەکرد. زیاتر لە ویستی خۆی، بە زۆری باوکم دەکۆشا لای نەعیم پاشای زۆر بەهێز و خاوەن خانەدان بگیرسێتەوە. بە قسەی باوکم، ئەقڵی لە ئەژنۆیدا بوو. دەردی باوکم ئەوە بوو قەرە لە کن نەعیم پاشا دابمەزرێت و هەر هیچ نەبێت بە کاری نووسیاری دەست پێ بکات، بەڵام دەیگوت قەرە هیچ هەوڵ بۆ ئەمە نادات، واتا بێ ئەقڵی دەکات. ئەو ئێوارەیە ڕووی قسەی لە ئێمە بوو و گوتی: "تومەز ئەم برازا هەژارەی من چاوی لە بەرزایی بڕیوە." بێ ئەوەی گوێ بە دایکشیم بدات، وای گوت: "تومەز لەوەش ئاقڵترە کە ئێمە پێمان وابوو."

بە دەرد و حەسرەتەوە لە بیرمە ڕۆژانی دواتر باوکم چی کرد، من چۆن خۆم لە قەرە دوور گرت و چۆن سەرەتا پێی لە ماڵمان و دواتر لە سەرانسەری گەڕەک بڕی، بەڵام نامەوێت بۆ ئێوەی بگێڕمەوە، چونکە دەترسم نەفرەت لە باوکم و لە خۆم بکەن. باوەڕتان بێ هیچ چارەیەکی ترمان نەبوو. ئەڤینی بێهودە لە بێهودەییی خۆی تێ دەگات، ڕێسا ناناسێت و حاڵی دەبێت دنیای دڵ چەند بستە و لە دەمی واشدا



کەسانی ماقووڵ بەکورتی دەیبڕن و بازی بەسەردا دەدەن و مافدارانە دەڵێن: "ئێمەیان بەشیاوی یەکدی نەزانی." ئا ئاوەهای لێ هات. با بیرتان بخەمەوە دایکم چەند جارێک گوتی: "هەر هیچ نەبێت دڵی منداڵەکە مەشکێنن." ئەو قەرەیەی دایکم بە منداڵ ناوی دەبرد، تەمەنی بیست چوار ساڵ و منیش نیوەی تەمەنی ئەو بووم. لەوانەیە باوکم لەبەرئەوەی بەیانکردنی ئەڤینی قەرەی بە بێ ئابڕوویی داناوە، بەمەبەست تکای دایکمی فەرامۆش کردبێت.

کاتێک بیستمان ئەستەنبوڵی جێ هێشتووە، ئەگەر بەتەواوی لەبیرمان نەکرد، بەڵام لە دڵی خۆمان دەرمانهێنا. لەبەرئەوەی ساڵانێکی زۆر لە هیچ شارێکەوە هەواڵیمان پێ نەگەیشتەوە، بیرم کردەوە ئەو نیگارەی کێشابووی و پێشانی منی دابوو، وەک یادگارییەکی منداڵی و هاوڕێیەتیی سەردەمی منداڵیمان بشارمەوە. بۆ ئەوەی نەبادا باوکم و دواتر مێردە شەڕوانەکەم نیگارەکە بدۆزنەوە و پێیان ناخۆش بێت و دڵڕەشی بنوێنن، بە مەرەکەبی حەسەن پاشای باوکم وەک ئەوەی دڵۆپ دڵۆپ ڕژابێتە سەری و بەو دڵۆپانە گولیلک نەخشێندرابێت، زۆر شارەزایانە وشەکانی شەکوورە و قەرەی ژێر نیگارەکەم داپۆشی. بەو پێیەی ئەمڕۆ ئەو نیگارەم بۆی ناردەوە، ئەگەر کەسانێک لەناو ئێوەدا هەبن هەوڵ بدەن چوونە بەردەم پەنجەرەکە و خۆپێشاندانم پێی لەدژی من لێک بدەنەوە، ڕەنگە کەمێک شەرم دایان بگرێت، لەوانەشە کەمێک بیر بکەنەوە.

پاش ئەوەی دوای تێپەڕبوونی دوازدە ساڵ خۆم پێشانی دا، لەوێ، تاوێک لەژێر تیشکی سووری خۆری ئێوارەدا لەبەردەم پەنجەرەکەدا مامەوە. تا ئەو دەمەی باخچە لەو تیشکەدا کەمێک سوور بوو و ڕەنگێکی نارنجی وەرگرت و تا سەرما کاری تێ کردم، بە شەیدایی سەیرم کرد. هیچ بای نەدەهات. ئەگەر کەسێکی تێپەڕبوو بە کۆڵاندا، یان باوکم منی لە پەنجەرەی کراوەدا بدیبایە، یان ئەگەر قەرە بە ئەسپەکەیەوە بگەڕایەتەوە و بە بەردەممدا تێپەڕیبایە، هیچ باکم نەبوو چ دەڵێن. مەسروورە کچی زێوەر پاشا بوو، هەمیشە دەم بەخەندە بوو و بەزمی دەگێڕا و لە کاتی هەرە نەشیاودا شتی سەیری دەگوت و من هەفتەی جارێک بۆ خۆشی لەگەڵیدا دەچوومە گەرماو. جارێک پێی گوتم: "تەنانەت مرۆڤ هیچ کاتێک خۆیشی ناتوانێت

بزانێت بیر لە چی دەکاتەوە." من وا بیر دەکەمەوە: جاروبار شتێک دەڵێم، لە کاتی گوتنیدا حاڵی دەبم بیرم لێ کردووەتەوە، بەڵام لە ساتی حاڵیبووندا، بەوپەڕی برواوە بیر لە پێچەوانەکەی دەکەمەوە.

لێتان ناشارمەوە لەناو گشت ئەو نیگارکێشانەی باوکم بۆ ماڵەوە بانگی دەکردن و منیش بەدزییەوە سەیری یەک بەیەکیانم دەکرد، هێندەی دڵتەنگیم بۆ مێردەکەم، بۆ بێسەروشوێنبوونی زەریف ئەفەندیی داماویش خەمگین بووم. ئەو درێوترین و سەرکزترینی نێوانیان بوو.

دەریوانەکەم دادایەوە، لە ژوورەکە هاتمە دەرێ، دابەزیمە خوارەوە بۆ ئاشپەزخانە.

ئۆرهان گوتی: "دایە، شەوکەت بە قسەی تۆی نەکرد. کاتێک قەرە ئەسپی لە گەوڕ دەرهێنا، ئەو لە ئاشپەزخانە چووە دەرێ و لە کونەکەوە سەیری کرد."

شەوکەت، کە دەسکی هاوانەکەی بە دەستەوە بوو، گوتی: "جا چ قەیدی هەیە. دایکیشم لە کونی دۆلابەکەوە سەیری دەکرد."

گوتم: "خەیرییە، ئێوارە نانی بە بادەم و شەکر لە کەمێک ڕۆندا بۆ ئەمانە سوور بکەوە."

ئۆرهان هەڵبەزییەوە و خۆشحاڵ بوو، شەوکەتیش هیچ دەنگی لێوە نەهات. لەو دەمەی بە پلیکانەکاندا سەردەکەوتمە سەرەوە، هەردووکیان بەدەم هاوارەوە لە پشتەوە پێم گەیشتن و بە تەپەتەپ و پاڵنانەوە بەتەنیشتمدا تێ پەڕین. منیش دامە قاقای پێکەنین و گوتم: "لەسەرەخۆ، لەسەرەخۆ، هەی کوێر بن." لەپێکی شیرینم لە سمتی ناسکی هەریەکەیان سرەواند.

چەند خۆشە ئێواران لەگەڵ منداڵاندا لە ماڵەوە بیت.

باوکم بە بێدەنگی نوقمی کتێبەکەی بووبوو.

گوتم: "میوانەکەتان ڕۆیشت، هیوادارم بێزاری نەکردبن."

گوتی: "نا، کەیفخۆشی کردم. وەک جاران ڕێزی هەیە بۆ زاوای خۆی."

"باشە."



"بەڵام بەپارێز و بە پێوانیشە."

ئەمەی زیاتر بۆ داخستنی بابەت و جۆرێک سووکایەتیکردن بە قەرە گوت، نەک بۆ پێوانی کاردانەوەی من. ئەگەر کاتێکی تر بوایە، بە زمانی تیژ وەڵامێکم فریا دەخست. بەڵام ئەمجارە بیرم لەو پیاوە کردەوە کە هەستم کرد هێشتا بەسەر پشتی ئەسپە سپییەکەیەوە بە ڕێگاوەیە و ترسم لێ نیشت.

دواتر نازانم چۆن بوو لەگەڵ ئۆرهان خۆمان لە ژووری دۆلابەکە لە ئامێزی یەکتردا دیتەوە. شەوکەتیش هاتە پاڵمانەوە. کەمێک یەکتریان پاڵ نا. وامزانی دەستیان بەشەڕ کردووە، بەڵام لە پڕ خۆمان لەسەر کورسییە درێژەکە دیتەوە. وەک چۆن سەگ تووتکەکانی خۆی خۆش دەوێت، منیش ئەوانم خۆش دەوێت. پشتی سەر و قژیانم ماچ کرد. نووساندنم بە سنگمەوە و لەسەر مەمکەکانم هەستم بە قورساییان کرد.

گوتم: "ئۆی، بۆنی قژتان دێت. سبەینێ لەگەڵ خەیرییە دەچن بۆ گەرماو."

شەوکەت گوتی: "من چی دی لەگەڵ خەیرییە ناچم بۆ گەرماو."

گوتم: "بۆچی تۆ ئەوەندە گەورە بوویت؟"

شەوکەت گوتی: "بۆچی ئەو کراسە وەنەوشەییە جوانەت لەبەر کردووە؟"

چوومە ژوورەوە و کراسە وەنەوشەییەکەم داکەند. ئەو کراسە سەوزە ڕەنگ کاڵەوەبووەی هەردەم دەمپۆشی، لەبەر کرد. لەگەڵ لەبەرکردنی کراسەکە مچوڕکێکی ساردیم پێدا هات و ترسام، بەڵام هەستم کرد جەستەم وەک ئاگر داگیرساوە و لەوەش زیاتر، هەستم بە زیندوویی و پتەویی لەشم کرد. پارچەیەک سووراو بە گۆنامەوە بوو، لە کاتی پاڵپێوەنان و ماچکردنی منداڵەکان لێی سڕدرابووە و بڵاوەی کردبوو، بەڵام تفم لە پاشماوەکەی دا و زۆر باش بە لەپی دەستم بە ڕووی خۆمدا ساوی. ئەرێ دەزانن، خزمان، ئەو ژنانەی لە گەرماو دەیانبینم و هەرکەسێ دەمبینێت، دەڵێت تۆ لە ژنێکی بیست و چوار ساڵەی پێگەیشتووی خاوەن دوو منداڵ ناچیت، بگرە وەک کچێکی گەنجی تەمەن شازدە ساڵە دەچیت. دەمەوێت باوەڕ بە قسەکانی ئەوان بکەن و خۆشتان وا باوەڕ بکەن. ئەگەرنا، هیچتان بۆ ناگێڕمەوە.

لۆمەم مەکەن کە لەگەڵ ئێوەدا دەدوێم. سالانێکی درێژە بەردەوام سەیری نیگارەکانی ناو کتێبەکانی باوکم دەکەم و هەمیشە لەناویاندا بەدوای ژنان و

شۆخاندا دەگەڕێم. گەرچی کەمیش بن، هەن و بەردەوام شەرمنۆک و شەرمەزار و هەری زیاد، وەک ئەوەی پۆزش بخوازن، سەیری یەکتر دەکەن. هەرگیز چاوەڕێ ناکرێت لێیان شێوەی پیاوان، شەڕوانان و سوڵتانەکان سەر بەرز بکەنەوە و ڕەپ و ڕەوان سەیری دنیا بکەن. بەڵام هەندێک لە ژنانی ناو کتێبە بە پەلەپڕۆزێ نەخشێندراوەکان، لە سۆنگەی ناوردبینیی نیگارکێشەوە چاویان لە زەوی، تەنانەت لە شتێکی ناو نیگارەکە، چووزانم پەرداخێک، یان خۆشەویستەکەیان نەبڕیوە، بگرە ڕاستەوخۆ بۆ خوێنەر دەڕوانن. هەمیشە بیر لەوە دەکەمەوە گەلۆ ئەو خوێنەرانە کێن وا ئەوان بۆیان دەڕوانن؟

کاتێک کتێبە دووسەد ساڵییەکانی پاشماوەی سەردەمی تەیموری لەنگ و ئەو بەرگانەم بیر دەکەوێتەوە، کە گاورەکان بە زێڕ دەیانکڕن و دەیانبەنەوە وڵاتی خۆیان، ترس دامدەگرێت و خەیاڵم دەچێت بۆ ئەوەی لەوانەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان کەسێک لە دوورەوە ئەم چیرۆکەی من ببیستێ. ئەدی مەگەر هەر بۆ ئەوە نییە مرۆڤ دەخوازێت بچێتە کتێبەوە؟ مەگەر هەر لەبەر ئەم ترسە نییە سەرجەم سوڵتان و وەزیرەکان بە توورەکە زێڕ دەدەنە ئەو کتێبنووسانەی خۆیان بۆ ئەوان تەرخان کردووە و باسیان دەکەن؟ کاتێک لە ناخی خۆمدا هەست بەم ترسە دەکەم، منیش کتومت وەک ئەو ژنە شۆخانەی چاوێکیان لەسەر ژیانی ناو کتێبەکەیە و بە چاوێکیش بۆ دەرەوەی کتێبەکە دەڕوانن، دەخوازم بۆ ئێوە بدوێم، ئێوەیەک کەوا کەس نازانێت لە چ شوێن و زەمانێک سەیرم دەکەن. من جوان و هۆشمەندم و دڵخۆش دەبم کاتێک سەیرم دەکەن. ئەگەر جاروبار یەک دوو درۆش ئاوێتەی قسەکانم بکەم، بۆ ئەوەمە بۆچوونێکی هەڵە لەبارەی منەوە لە سەرتاندا پەیدا نەبێت.

ڕەنگە هەستتان پێ کردبێت باوکم منی فرە خۆش گەرەکە. بەر لە من سێ کوڕی بووە، بەڵام خوا ڕۆحی لە یەک بەکیان سەندووەتەوە و دەستی لە منی کچ نەداوە. باوکم ڕۆحی بەسەرمەوە دەردەچێت، بەڵام من شووم بە پیاوێکی هەڵبژێردراوی ئەو نەکرد، بگرە شووم بە ئەفسەرێک کرد کە خۆم بینیبووم و بەدڵم بوو. خۆ ئەگەر بە دەستی باوکم بوایە، ئەوا ئەو پیاوەی شووم پێ دەکرد، پێویست بوو گەورەترین زانا بوایە، هەم لە نیگار و هونەر تێ بگەیشتایە و هەم خاوەن هێز و دەسەڵات و وەک



قارون دەوڵەمەند بوایە. لەبەرئەوەی شتێکی لەو شێوەیە تەنانەت لە کتێبەکانی خۆیشیدا نەبوو، دەبوایە من بە ساڵان لە ماڵەوە دابنیشتمایە و چاوەڕێم بکردایە. جوانی و چەلەنگیی مێردەکەم داستانی سەر زمانی خەڵکی بوو. دوای ئەوەی خۆم بە ناوبژیواندا هەواڵم بۆی نارد، هەڵێکم دۆزییەوە و لە ڕێی گەڕانەوەم لە گەرماو، لە بەردەمم قوت بووەوە و بینیم. ئاگر لە چاوانی دەباری و کتوپڕ عاشقی بووم. ئەسمەر بوو، جەستەی سپی و جوانێکی چاوسەوز بوو. دوو قۆڵی بەهێزی پێوە بوو، بەڵام لە ڕاستیدا وەک ساوایەکی نووستوو بێگەرد و بێدەنگ بوو. ڕەنگە لەبەرئەوەی لە شەڕ گشت هێزی لە کوشتنی مرۆڤ و گردکرنەوەی دەستکەوتدا بەخەرج دابێت، وا هەستم دەکرد تۆزێک بۆنی خوێنی لێ دێت، بەڵام لە ماڵەوە بەوێنەی خاتوون نەرم و نیان بوو. بەبیانووی ئەوەی شەڕوانێکی هەژارە، باوکم سەرەتا نەیویست و دوای ئەوەی هەڕەشەی خۆکوشتنم کرد، ئەوسا ڕازی بوو شووی پێ بکەم. مێردەکەم قارەمانانە لەم شەڕەوە بازی دەدا بۆ ئەو شەڕ و جوامێریی دەنواند و بەوجۆرە بوو بە خاوەنی پارچە زەوییەکی دەهەزار ئاکچەیی و هەموو کەسێک ئیرەییی پێ دەبردین.

چوار ساڵ لەمەوبەر، کاتێک لەگەڵ ئەو سوپایەی لە شەڕی دژ بە سەفەوییەکاندا دەگەڕایەوە، نەهاتەوە، دەسپێک گوێم نەدایێ، چونکە تا شەڕی دەکرد قاڵتر دەبووەوە، خۆبەخۆ کاری بەڕێوە دەبرد، دەستکەوتی گەورەتری دەهێنایەوە، پارچە زەویی زیاتری بەدەست دەخست و سەربازی زیاتری پێ دەگەیاند. کەسانێک هەبوون گەواهییان دەدا و دەیانگوت لە کاروانی سوپا جیابووەتەوە و لەگەڵ پیاوەکانیدا ڕووی لە شاخ کردووە. ڕۆژانی سەرەتا دەمگوت هاکا گەڕایەوە، بەڵام بە ماوەی دوو ساڵ هێدی هێدی بەدیارنەمانی ڕاهاتم. کاتێکیش تێ گەیشتم ژنگەلێکی زۆر لە ئەستەنبوڵ مێردیان بێسەروشوێنە، دۆخەکەم پەسەند کرد.

شەوانە لەگەڵ منداڵەکان لە پێخەودا باوەشمان بەیەکدا دەکرد و دەگریاین. بۆ ئەوەی نەگرین و نەکڕوزێینەوە، جاروبار درۆیەکم بۆ دەکردن، بۆ نموونە دەمگوت فلان کەس دەڵێت و بەڵگەشی هەیە کەوا باوکتان پێش هاتنی بەهار دەگەڕێتەوە. دواتر، درۆکەی من لە زمانی ئەوانەوە دەکەوتە بەرگوێی خەڵکی و بڵاو دەبووەوە، پاشان

وەک "مزگێنی"یەک بۆ خۆم دەگەڕایەوە و خۆشم بەر لە هەموو کەسێکی تر بڕوام پێ دەکرد.

پێکڕا لەگەڵ باوکی خێر لە خۆنەدیو، بەڵام دنیادیدەی مێردم و برای مێردم، کە ئەویش وەک کاکی چاوسەوز بوو، لە خانوویەکی کرێ لە چارشیقاپی دادەنیشتین. دوای ئەوەی مێرد و کۆڵەکەی ماڵم ون بوو، تەنگاسی دەستی پێ کرد. خەزوورم دوای ئەو تەمەنە گەڕایەوە سەر پیشەی کۆنی ئاوێنە دروستکردن. پێشتر، بەهۆی شەڕکردنی زۆری کوڕەکەیەوە دەوڵەمەند بووبوو و دەستی لە کار هەڵگرتبوو. حەسەنی شووبرای زگورتیم لە گومرک کاری دەکرد و کاتێک دەیبینی ئەو پارەیەی دەیهێنێتەوە، وا کەڵەکە دەبێت، دەستی بە کوڕێنی کرد. لە ترسی ئەوەی نەبادا کرێی خانووەکەیان بۆ نەدرێت، ڕۆژێکی زستان ئەو کچە کەنیزەکەی بە کاروباری ناو ماڵدا ڕادەگەیشت، بە پەلەپرۆزێ بردە بازاڕ و فرۆشتیان. داواشیان لە من کرد لەبری ئەو، کاروباری ئاشپەزخانە و جل شۆرین و تەنانەت چوونە بازاڕ و شت کڕینیش لە ئەستۆ بگرم. منیش "بۆچی من ژنی ئەوەم ئەم کارانە بکەم؟"م نەگوت، بەردێکم نایە سەر دڵم و هەموویم ڕاپەڕاند. بەڵام حەسەنی شووبرام لەبەرئەوەی چیدی کەنیزەکێکی نەبوو شەوان بیباتە ژووری خۆی، گڕی خۆی لە من ئاڵاند. منیش سەرم لێ شێوا و نەمدەزانی چ بکەم.

بێگومان دەمتوانی یەکسەر بۆ ئێرە، بۆ ماڵی باوکم بگەڕێمەوە، بەڵام بەپێی قسەی قازی مێردم لە ڕووی شەرعەوە هێشتا لە ژیاندا بوو. بۆیە ئەگەر تووڕەیان بکەم، ئەوا هەر بە ئەوەندەوە ناوەستن بەزۆر لەگەڵ منداڵەکاندا بمگەڕێننەوە بۆ کن شووبرام، واتا بۆ ماڵی مێردم، بگرە بۆیان هەبوو بەبیانووی دەستبەسەردا گرتنی من سووکایەتی بەخۆم و باوکیشم بکەن. حەسەن زۆر لە مێردەکەم مرۆڤانەتر بوو و ئاگاریش بووم لەتاو ئەڤینی من قرچەی لێوە دەهات. ڕاستییەکەی، ئەگەر بەدەست خۆم بوایە، لەگەڵی دەچوومە جێگاوە، بەڵام ئەگەر ئەمەم بێ بیرکردنەوە بکردایە، دواجار نەدەبووم بە ژنی، بگرە، خوایە بمانپارێزی، دەبووم بە کەنیزەکی. ئەوان هیچ ڕازی نەبوون قازی ددان بە مردنی مێردەکەمدا بنێت، چونکە دەترسان داوای بەشە میراتی خۆم بکەم، یان تەنانەت لەگەڵ منداڵەکاندا بگەڕێمەوە کن باوکم. بێگومان



ئەگەر بەپێی بڕیاری قازی مێردەکەم نەمردبێت، بۆم نییە شوو بە حەسەن بکەم. بۆم نەبوو شوو بە کەسێکی تریش بکەم و لە ڕەوشێکی واشدا ناچار دەبووم پابەندی ئەو ماڵە و مێردەکەم بم، بۆیە بەردەوامبوونی دۆخی تەمومژاویی "بێسەروشوێن"ی مێردەکەم، بەلای ئەوانەوە شتێکی شایەنی پەسەند کردن بوو. لە بیریشتان نەچێت، چونکە کاروباری ماڵم ڕادەپەڕاند و لە خواردنەوە بگرە تا جل شۆرین، هەموو کارێکم دەکرد و کەسێکیش لەو ماڵە شێت و سەرمەستانە عاشقم بووبوو.

باشترین چارەسەر بەلای خەزوورم و حەسەنەوە ئەوە بوو من شوو بە حەسەن بکەم، بەڵام مەرج بوو سەرەتا گەواهیدەر ئامادە بکرێت و دواتر قازی قایل بکرێت. ئەو کاتە، باوک و برای مێردم بەو پێیەی نزیکترین کەسانی ئەون، ڕەزامەندییان دەردەبڕی و ئیدی کەس نەیدەتوانی لەدژی بە مردوو لە قەڵەمدانی مێردەکەم بێت. قازیش وا دیار بوو لە بەرامبەر سێ چوار ئاکچەدا باوەڕ بە چەند گەواهیدەرێکی درۆزن بکات کە بێن و بڵێن ئێمە لە شەڕ لاشەی ئەو کابرایەمان دیوە. گەورەترین گرفت ئەوە بوو حەسەن قایل بکەم بەوەی دوای بێوەژن کەوتنم لەم ماڵە نارۆم و داوای میرات ناکەم و لەبری شووکردن پارە ناخوازم و لە هەمووشی گرینگتر، بیبمە ئەقڵییەوە کە من بە ئارەزووی خۆم شووی پێ دەکەم. هەڵبەتە حاڵی بووبووم بۆ ئەوەی لەم ڕووەوە متمانەم پێ بکات، پێویست بوو لەگەڵیدا بخەوم و بیخەمە سەر ئەو باوەڕەی ئەمە لە پێناوی جیابوونەوە ناکەم، بگرە –بە شێوەیەک جێی بڕوا بێت– لەبەرئەوەی عاشقی بووم، دەیکەم.

ئەگەر هەوڵم بدایە، دەمتوانی عاشقی حەسەن بم. ئەو هەشت ساڵ لە مێردە ونبووەکەم گەنجتر بوو. تا مێردم لە ماڵەوە بوو، ئەو وەک برام وا بوو و ئەم هەستەش منی لێی نزیک کردبووەوە. کەسێکی خاکی، بەڵام داخراو بوو. ئارەزووی زۆری بۆ یاریکردن لەگەڵ منداڵەکانم هەبوو و هەندێک جار نیگای پڕ لە تاسەی وای دەنواند وەک ئەوەی ئەو کەسێک بێت لەتاو تێنوێتیدا خنکابێت و منیش پەرداخێک شەربەتی تەزیوی گێلاس بم. من گشت ئەو خەسڵەتانەیم خۆش دەویست. بەڵام دەمزانی دەبێت ڕەنجێکی زۆر بکێشم بۆ ئەوەی عاشقی کەسێک بم کە جلەکانی خۆیم پێ دەشۆرێت و باکی نییە من وەک کەنیزەک و کۆیلە لە بازاڕ بگەڕێم و شتومەک بکڕم. ئەو ڕۆژانە

دەچوومە ماڵی باوکم، سەیری مەنجەڵ و قاپ و قاچاخ و فنجانەکانم دەکرد و دەگریام. بۆ ئەوەی هێز بدەینە یەکدی، شەوان وەک مەڕ لەگەڵ منداڵەکاندا پێکەوە دەنووستین. حەسەن ئەو هەلەی بۆم نەڕەخساند. عاشقبوون پێویست بوو بۆ بەیەک گەیشتنمان، بەڵام لەبەرئەوەی باوەڕی نەدەکرد من بتوانم عاشقی بم و متمانەشی بە خۆی نەبوو، بێئابڕوویی نواند. یەک دوو جار هەوڵی دا تەنگاوم بکات و ماچم بکات و دەستم بۆ ببات. گوتی: "مێردەکەت هەرگیز ناگەڕێتەوە و دەتکوژم." هەڕەشەی لێم کرد و وەک منداڵ گریا. لەبەرئەوەی بە پەلەپەل و شپرزەیی خۆی هەلی بۆ ئەڤینی ڕاست و ڕەسەنی وەک ئەڤینی باسکراوی ناو داستانەکان نەڕەخساند، حاڵی بووم ناتوانم زەماوەندی لەگەڵدا بکەم.

ئەو شەوەی بە زۆر خۆی کوتایە ژووری نووستنی خۆم و منداڵەکانم، دەستبەجێ ڕاپەڕیم و بێ ئەوەی گوێ بە ترسانی منداڵەکان بدەم، تا هێزم تێدا بوو قیژاندم و گوتم جنۆکەی خراپ هاتوونەتە ماڵەوە. خەزوورم هەڵسا و بەدەم ترسی جنۆکە و قیژە و هاوارەوە پەردەم لەسەر حەسەن هەڵماڵی. ئەو هێشتا هێزی هەوەسی دانەمرکابووەوە. بەسالاچووی هۆشمەند، بەدەم ناڵە و کڕووزانەوەی تەوش و بێ واتا و قسەی بێسەروبەرەی سەبارەت بە جنۆکە، بە شەرمەوە ئەو ڕاستییەکی تاڵی بۆ ڕوون بووەوە: کوڕەکەی سەرخۆشە و بێئابڕووانە لە ژنی کوڕەکەی تری خاوەن دوو منداڵ نزیک بووەتەوە. کاتێک گوتم تا بەیانی ناخەوم و لەدژی جنۆکە لەبەر دەگای ژووری منداڵەکانم دادەنیشم و چاوەڕێ دەکەم، فزەی لێوە نەهات. ڕۆژی دواتر گاڤێک ڕام گەیاند بۆ چاودێریکردنی باوکی نەخۆشم لەگەڵ منداڵەکاندا بۆ ماوەیەکی درێژ بۆ ماڵە باوان دەگەڕێمەوە، ناچار بوو دۆڕانی خۆی پەسەند بکات. سەعاتێکی زەنگۆڵەدار کە مێردم لە شەڕی مەجەڕستاندا بە تاڵان دەستی کەوتبوو و نەیفرۆشتبوو و بۆ منی هێنابووەوە؛ قامچییەکی دروستکراو لە ژێی سەرکێشترین ئەسپی عەرەبی؛ تاقمێکی شەترەنجی ددانی فیلی دەستکاری تەورێز کە منداڵەکان بۆ گەمەی شەڕ بەردەکانیان بەکار دەهێنا و مۆمدانێکی زیوینی دەستکەوتی شەڕی نەخجەوان، کە شەڕی دنیام کرد بۆ ڕێگرتن لە فرۆشتنی، وەک نیشانەی ژیانی ژن و مێردایەتی هەڵگرت و گەڕامەوە بۆ ماڵی باوکم.



وەک چاوەڕێم دەکرد، چۆڵکردنی ماڵی مێردی ونبووم بووە هۆی ئەوەی ئەڤینی چەوت و بێڕێزی حەسەن بۆ من وەربگەڕێتە سەر ئاگرێکی بێچارە، بەڵام شایەنی ڕێز. لەبەرئەوەی زانی باوکی پشتگیریی لێ ناکات، دەستی کرد بە ناردنی نامەی دڵداری و لە گۆشەی نامەکاندا نیگاری مەل، شێری چاو بە فرمێسک و ئاسکی خەمبار هەبوون. نامەکان، ئەگەر دۆستێکی شیعردۆستی بۆی نەنووسیبێت و نەنەخشاندبێت، ئەو دەوڵەمەندییەی جیهانی خەیاڵی حەسەن دەخەنە ڕوو کە من کاتی پێکەوە ژیانمان لەژێر هەمان بنمیچ پەیم پێ نەبردبوو. لێتان ناشارمەوە بەم دواییيانە سەرلەنوێ دەستم کرد بە خوێندنەوەی ئەو نامانە. حەسەن لە نامەکانی ئەم دواییيەدا دەینووسی لەبەرئەوەی پوولێکی زۆری دەست کەوتووە، من ناکات بە کۆیلەی کاروبارەکانی ناوماڵ. زمانی پڕ لە ڕێز و شیرین و گاڵتەئامێزی ئەو و شەڕی لە بڕانەوەنەهاتووی منداڵەکان و داخوازییەکانیان و گازندەکانی باوکم، سەرمی وەک مەنجەڵ ئاوساندبوو. بۆیە وەک ئەوەی بە دنیا بڵێم "ئۆخەی"، دەریوانەی پەنجەرەکەم خستبووە سەرپشت.

پێش ئەوەی خەیرییە خوانی ئێوارە ڕابخات، لە باشترین گوڵی ئەو خورمایانەی لە عەرەبستانەوە هێندرابوون، خواردنەوەیەکی گەرمم بۆ باوکم ئامادە کرد. کەوچکێک هەنگوینم تێ کرد و لەگەڵ کەمێک ئاوی لیمۆ تێکم دا. بە ئەسپایی چوومە کنی. لە کاتێکدا "کتاب الروح"ی دەخوێندەوە، کتومت وەک ئەوەی خۆی دەیویست، بێ ئەوەی بهێڵم هەست بەبوونم بکات، لە بەردەمی دامنا.

پرسی "ئەرێ بەفر دەبارێت؟" ئەمەی بە دەنگێکی هێندە خەمگین و لاواز لێم پرسی، دەستبەجێ تێ گەیشتم ئەمە دوا بەفرە باوکی کلۆڵم لە ژیاندا دەیبینێت.

# 10

## من دارێکم

من دارێکم، زۆر تەنیام. لەگەڵ باراندا دەگریم. بۆ ڕەزای خوا گوێ لەم قسانەم بگرن. قاوەکانتان بخۆنەوە تا خەوتان بزڕێت و چاوتان بکرێتەوە. وەک جنۆکە بۆم بڕوانن با بۆتان باس بکەم من بۆچی هێندە تەنیام.

١– دەڵێن هەر بۆ ئەوەی لە پشت سەری وەستای چیرۆکبێژەوە دارێک هەبێت، بە دەستوبرد لەسەر کاغەزێکی زبر و ئەستوور نیگارم کێشراوە. ڕاستە. ئێستا نە داری نازدار و زراڤی تر، نە گیای حەوت پەلی کێوی و نە چینە تاوێری ڕەشی هەندێک جار لە ئیبلیس و مرۆڤ چووم لە تەنیشتەوەیە و نە پەڵە هەوری چینیم بە سەرەوەیە. تەنیا زەوی، ئاسمان، من و هێڵی ئاسۆ. بەڵام بەسەرهاتی من لەوە ئاڵۆزترە.

٢– مەرج نییە بەهەر نرخێک بووە وەک دارێک بەشێک بم لە کتێبێک، بەڵام وەک نیگاری دارێک ڕووپەلی هیچ کتێبێک نیم و ئەمەش ئۆقرەی لێ بڕیوم. وام بەخەیاڵدا دێت ئەگەر لە کتێبێکدا گوزارە لە شتێک نەکەم، لەوانەیە نیگارم بە دیواردا هەڵواسرێت و بەنەریتی بتپەرستان و گاوران کڕنۆشم بۆ ببرێت و بپەسترێم. بەدزییەوە شانازی بەم خەیاڵەوە دەکەم و دواتریش بەدەم شەرمکردنەوە زۆر دەترسم. بەڵام توخوا با پیاوانی مەلای ئەرزەڕوومی ئەمە نەبیستن.

٣– هۆی بنەڕەتیی تەنیاییم ئەوەیە خۆیشم نازانم بەشێکم لە کام بەسەرهات. لەوەدا



بوو ببم بە بەشێک لە چیرۆکێک، بەڵام شێوەی گەڵاڵەیەک لەوێ بەربوومەوە. با ئەوەتان بۆ بگێڕمەوە:

### چیرۆکی بەربوونەوەم لە بەسەرهاتەکەم وەک کەوتنە خوارەوەی گەڵای دار

کاتێک تەهماسپی پادشای عەجەم و دوژمنی سەرەکیی عوسمانی و نیگارپەروەرترین پادشای جیهان چل ساڵ لەمەوبەر دەستی بە وڕێنە کرد، کاری یەکەمی ئەوە بوو لە بەزم و ڕەزم، شەراب، موزیک، شیعر و نیگار سارد بووەوە. دوای ئەوەی دەستی لە قاوەش هەڵگرت، ئیدی بەجارێک مێشکی ڕاوەستا. لەبەرئەوەی پیرانی ڕەزاگران و تاریکپەرستیش دڵیان کرمێ کرد، پایەتەختی خۆی لە تەورێزەوە گواستەوە بۆ قەزوین تا لە سوپای عوسمانی بەدوور بێت. ئەو کاتە تەورێز پایەتەختی عەجەم بوو. گاڤێک پیرتر بوو، ڕۆژێک ئەوانگەل دەستیان لێ وەشاند و ئیدی بەیەکجاری سەری لێ شێوا و تۆبەی لە شەراب و منداڵبازی و نیگارکێشان کرد. ئەمەش بەڵگەیەکی باش بوو بۆ ئەوەی کە پادشای مەزن دوای لە دەستدانی چێژی قاوە، ئەقڵی دروستیشی ون کردووە.

بەوجۆرە بەرگ تێگرانی دەست بە پەرجوو، خۆشنووسان، زەڕکاران و نیگارکێشان، ئەوانەی بیست ساڵ بوو لە تەورێز شاکاری هەرە شاهانەی دنیایان دەئافراند، وەک تۆوی دەم با بە شاراندا بڵاو بوونەوە. سوڵتان ئیبراهیم میرزای والیی مەشهەد، کە هەم خوارزا و هەم زاوای شا تەهماسپ بوو، دەسترەنگینترینیی ئەوانی بۆ مەشهەد بانگ کرد، لە نیگارخانەی خۆیدا جێی کردنەوە. مەسنەویی هەفت ئەژرەنگی جامیی –گەورەترین شاعیری سەردەمی تەیمووری لەنگ بوو لە هەرات– پێ نووسینەوە و پێیانی نەخشاند و دەستی کرد بەئامادەکردنی کتێبێکی شاهانەی نەخش و نیگاردار. شا تەهماسپ خوارزا ئاقڵ و باشەکەی خۆی هەم خۆش دەویست و هەم ئیرەییی پێ دەبرد و پەشیمان بوو لەوەی کچی خۆی دابوویێ، کاتێک هەواڵی کتێبی شاهانەی بیست، شێت و هار بوو و بە هەڵچوونەوە خوارزای خۆی لە مەشهەدەوە بۆ شاری قاین و دواتریش دیسان بە تووڕەبوونەوە بۆ شاری بچووکی سەبزیڤار دوور خستەوە. خۆشنووسان و نیگارکێشانی مەشهەدیش بەرەو

شار و وڵاتانی تر، بەرەو نیگارخانەی سوڵتان و شازادەکانی دی بڵاوەیان لێ کرد.

بەڵام پەرجوویەک وای کرد کتێبە شاهانەکەی سوڵتان ئیبراهیم میرزا بە نیوەناچڵی نەمێنێتەوە، چونکە کتێبدارێکی ڕاستەقینەی هەبوو. ئەم کابرایە سواری ئەسپ دەبوو، دەیگوت وەستای نەخشێنەری باشترین زەڕکاری لە شیرازە و بۆ ئەوێ تێی دەتەقاند. لەوێشەوە دوو پەڕەی هەڵدەگرت و دەیبردە کن خۆشنووسی زەریفترین هێلێ نەستەعلیق(*) لە ئەسفەهان. دوایی چیایەکانی دەبڕی و تا بوخارا نەدەوەستایەوە لەوێ بەوەستا هەرە ناودارەکانی لای خانی ئوزبەک نیگاری دەخستە سەریەک و نیگاری مرۆڤی پێیان دەکێشا. پاشان دادەبەزی بۆ هەرات و ئەمجار شەپۆلی نیگاری ڕووەک و پەلی دارانی لەبەر بەیەکێک لە نیگارکێشانی نیوەنابینای دێرین دەنەخشاند. لە هەرات خۆی دەگەیاندە خۆشنووسێکی تر و نووسینی ناو تابلۆی سەر دەرگای ناو نیگارەکەی بە هێڵی ڕوقعەی زێڕین بە نووسین دەدا. پاشان بەرەو باشوور شۆڕ دەبووەوە و دەچووە قاین و دوای شەش مانگ ڕێبواری، پەڕەی تا نیوە ئەنجامدراوی پێشانی سوڵتان میرزا ئیبراهیم دەدا و ئافەرینانەی خۆی وەردەگرت.

پاشان حاڵی بوون کار وا بڕوات، کتێبەکە هەرگیز تەواو نابێت، بۆیە پەیکبەری تەتەریان بەکرێ گرت. لە نامەیەکدا کاری داواکراویان لە هونەرمەند ڕوون دەکردەوە و دەیانخستە پاڵ پەڕەی ئامادەکراو بۆ نەخشاندن و تیانووسین و دەیاندایە دەستی پەیکبەران. بەمجۆرە، ئەو پەیکبەرانەی پەڕەکانی کتێبەکەیان پێ بوو، بەڕێگا و بانەکانی وڵاتی عەجەم، خوراسان، وڵاتی ئوزبەک و "ما وراء النهر"دا تێ پەڕین. دروستکردنی کتێبەکەش بەشێوەی پەیکبەرەکان ڕەوتێکی خێرای وەرگرت. هەندێک جار پەیکبەری هەڵگری ڕووپەلی پەنجا و نۆ لەگەڵ پەیکبەری هەڵگری ڕووپەلی سەد و شەست و دوو لە شەوێکی بەفراویدا، لە کاروانسەرایەک، کە لوورەی گورگی لێوە دەبیسترا، بەیەک دەگەیشتن، لە میانەی گفتوگۆی دۆستانەی نێوانیانەوە بۆیان ئاشکرا دەبوو بۆ هەمان کتێب کار دەکەن، دەچوون پەڕەکانیان لە ژوورەکانی خۆیان

(*) نەستەعلیق: شێوازێکی نووسینی عەرەبییە لە نێوان هەردوو شێوازی –نسخ وتعلیق–دا.
– وەرگێڕ –



دەهێنا و بەراوردیان دەکردن و هەوڵیان دەدا تێ بگەن کام مەسنەوی لە کوێ دانراوە.

بڕیار بوو منیش پەڕەیەک بم لەو کتێبەی ئەمڕۆ بەدڵی خەمگینەوە هەواڵی تەواو بوونیم بیست. چ جێی داخە ڕۆژێکی سارد و تۆفی زستان، دز و جەردە لە بەردەڵانێکدا ڕێیان بە پەیکبەری تەتەری هەڵگری من بڕی. دەستبەجێ تەتەرە داماوەکەیان دارکاری کرد، دواتریش لەسەر شێوازی دز و جەردە ڕووتیان کردەوە، ئەمجا لاقەیان کرد و پاشانیش بێ بەزەییانە کوشتیان. لەبەرئەوە خۆیشم نازانم لە چ پەڕەیەک بوومەتەوە. تکاتان لێ دەکەم سەیرم بکەن و پێم بڵێن: ئایا دەبووم بە سێبەر بۆ مەجنوون لە کاتێکدا بە جلوبەرگی شوانەوە لە خێوەتدا سەر لە لەیلا دەدات؟ گەلۆ دەڕژامە شەوەوە بۆ ئەوەی تاریکایی ڕۆحی بێباوەڕێکی بەدبەخت ڕووناک بکەمەوە؟ ئەرێ دەمویست ببم بە یاوەری بەختەوەریی دوو دڵداری لە هەموو دنیا هەڵهاتوو کە لە دەریا پەڕیبنەوە و ئاسوودەیی خۆیان لە دوورگەیەکی پڕ لە مەل و میوەدا دۆزیبێتەوە؟ ئایا دەمویست ببم بە سێبەر بۆ دوا ساتەکانی ئەسکەندەر کاتێک لە سەروبەندی گرتنی وڵاتی هندستاندا گڕە لێی دا و بە ڕۆژان خوێن لە لووتی ڕۆیشت و هەر بەو دەردەشەوە سەری نایەوە؟ یاخۆ بەکەڵکی ئەوە دەهاتم ببم بە هێمای هێز و تەمەنی ئەو باوکەی لەبارەی ئەڤین و ژیانەوە ئامۆژگاریی کوڕی خۆی دەکات؟ ئەرێ واتا و زەرافەتم بە کام بەسەرهات دەبەخشی؟

یەکێک لەو جەردانەی پەیکبەرەکەی کوشت و منی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت و بێ گوێدانە شاخ و شار دەسووڕایەوە، جاروبار بەهایەکی بۆم دادەنا. لەبەرئەوەی تێ گەیشتبوو سەیرکردنی نیگاری دارێک لە سەیرکردنی دارێک خۆشترە، ڕەفتاری نەرم بوو لەگەڵمدا. بەڵام بەهۆی ئەوەی نەیدەزانی ئەم دارە بەشی چ بەسەرهاتێکە، بە زوویی لێم بێزار دەبوو. دوای ئەوەی منی شار بە شار لەگەڵ خۆیدا گەڕاند، بەپێچەوانەی ترسی منەوە، ئەو جەردەی ڕێبڕە لەتوپەتی نەکردم و فڕێی نەدام، بگرە لە خانێک منی بە شەربەیەک شەراب بە کابرایەکی زراڤ فرۆشت. ئەو پیاوە باریکەلە و بەستەزمانە هەندێک جار شەوان لەبەر ڕۆشنایی تیشکی مۆم سەیری منی دەکرد و دەگریا. دوای ئەوەی لەتاو خەم و دەردی سەر مرد و گیانی سپارد،

ماڵ و موڵکیان فرۆشت. وەستای چیرۆکبێژ منی کڕی و لە سایەی سەری ئەوەوە تا ئەستەنبوڵ هاتم. ئێستا زۆر شادمانم. شەرەفێکی گەورەیە بۆ من ئەمشەو لێرە لەناو ئێوەی نیگارکێشان و خۆشنووسانی دەست بە پەرجوو، چاو هەڵۆ، ویست پۆڵایین، قۆڵ زەریف و ڕۆح ناسکی سوڵتانی عوسمانیدام. بیکەن بەخاتری خوا و لێتان دەپاڕێمەوە بڕوا بەو کەسانە نەکەن کە دەڵێن وەستایەکی نیگارکێش منی بەپەلە لەسەر کاغەزێکی خراپ کێشاوە بۆ ئەوەی بە دیواردا هەڵبواسرێم.

سەرنج بدەن چ درۆ و دەلەسە و چ وەپاڵدانی بێ پەروا هەیە؟ لە بیرتانە دوێنێ شەو وەستام لێرە نیگاری سەگێکی بە دیوارەکەوە هەڵواسیبوو و بەسەرهاتەکانی ئەو سەگە بێئابڕووەی گێڕایەوە و لەو نێوانەدا ئاماژەی بۆ چیرۆکی مەلا خوسرەتێکی ئەرزەڕوومی کردبوو؟ ئێستا موریدانی حەزرەتی مەلا نوسرەت شتەکە بە هەڵە تێ گەیشتوون، گوایە توانجمان تێ گرتووە. مەگەر ئێمە حەدمان هەیە بڵێین باوکی حەزرەتی مەلا ئەفەندیی گەورەمان نادیارە؟ دووربێت، ئایا دەشێت شتی وا بە ئەقڵماندا ڕاببورێ؟ ئەمە چ فیتنەیەکە تاو دەدرێت و چ بوختانێکی بێ پەروایە؟ مادام خوسرەت ئەرزەڕوومی و نوسرەت ئەرزەڕوومی تێکەڵ دەکرێن، با من چیرۆکی داری مەلا نەدرەتی چاوخێلی سیواستان بۆ بگێڕمەوە.

ئەم مەلا نەدرەتە چاوخێلە سیواسییەش سەرباری ئەوەی نەفرەت لە خۆشویستنی کوڕانی لووس و نیگارکێشی دەکات، گوتوویەتی قاوە کاری ئیبلیسە و ئەوانەی دەیخۆنەوە، دەچنە دۆزەخ. ئێی مەلای سیواسی، مەگەر لەبیرت چووە چۆن ئەم لقە ئەستوورەی من چەماوەتەوە؟ بۆتان دەگێڕمەوە، بەڵام سوێند بخۆن بۆ کەسی تری باس ناکەن بۆ ئەوەی خوا مرۆڤ لە بەڵای ناگەهان بمانپارێزێت. بەیانیانێک سەیرم کرد، بێچاوێنی بێت، کابرایەکی باڵامنارە و پەنجەشێری وەک دێوم بینی لەگەڵ ئەو کەسەی لەسەرەوە ناوی هات، چووبوونە سەر ئەم لقەی من و لەناو گەڵا چڕەکانمدا خۆیان شاردبووەوە و بمبوورن، بە نرکەنرک کاری خۆیان دەکرد. ئەو دێوەی کە دواتر زانیم ئیبلیسە، بەدەم ئەنجامدانی کاری مەلای لەمەڕ ئێمەوە هەم گوێی جوانی بە میهرەبانی ماچ دەکرد و هەم بە گوێیدا دەچرپاند: "قاوە حەرامە، قاوە گوناهە..." بەو پێیە، هەرکەسێک باوەڕی بە زیانی قاوە هەبێت، باوەڕی بە ئیبلیسە، نەک بە





فەرموودەکانی ئاینە جوانەکەمان.

هەروەها دەمەوێت باسێکی نیگارکێشانی فەرەنگیشتان بۆ بکەم تا ئەگەر کەسێکی بێ ڕیشە و ڕەچەڵەک هەبێت خۆزگەیان پێ بخوازێت، دەرس لەم باسەم وەربگرێت. ئێستا ئەو نیگارکێشانەی فەرەنگ نیگاری ڕووی پادشا و قەشە و بەگ و تەنانەت ژنەکانیشیان بەجۆرێک دەکێشن تۆ دەتوانی سەیری نیگاری ئەو کەسە بکەیت و دواتر لە کۆڵان بیناسیتەوە. ئاشکرایە ژنی ئەوانە بە ئازادی بە کوچە و کۆڵاناندا دەسووڕێنەوە، ئیدی خۆتان پێشبینیی ئەوی تری بکەن. بەڵام بەمەشەوە نەوەستاون و کاروباری خۆیان زیاتر بردووەتە پێشێ. ناڵێم لە گەوادیدا، لە نیگارکێشیدا...

وەستایەکی گەورەی نیگارکێشی فەرەنگ لەگەڵ وەستایەکی تری گەورەی نیگارکێش لە مێرگ و چیمەنێکی فەرەنگدا پیاسە دەکەن و لەبارەی وەستایی و هونەرەوە دەدوێن. دارستانێکیان دێتە پێش. ئەویان کە وەستاترە، وا بە ئەوی تریان دەڵێت: "بۆ نیگارکێشان بە شێوازە نوێیەکان، هونەرێکی هێندە بەهێز پێویستە، بەجۆرێک ئەگەر نیگاری دارێکی ناو ئەم دارستانەت کێشا و کەسێکی فزوولی سەیری کرد، بێتە ئێرە و ئەگەر بیەوێت، دارەکە بدۆزێتەوە و لەوانی تری جیا بکاتەوە."

منی هەژار، ئەو نیگاری دارەی وا لەبەر چاوتانە، سوپاسبژێری بۆ خوا دەکەم لەپای ئەوەی بە ئەقلێکی لەو شێوەیە نیگارم نەکێشراوە. بەڵام نەک لە ترسی ئەوەی ئەگەر بەشێوازی فەرەنگ نیگارم بکێشرایە، سەرجەم سەگەلی ئەستەنبوڵ وایان بزانیبایە داری ڕاستەقینەم و میزیان پێدا بکردمایە. ڕاستییەکەی، من ناخوازم ببم بە دارێک خۆی، دەمەوێت ببم بەواتای دارێک.

# 11

## من ناوم قەرەیە

درەنگانی شەو بەفر دای کرد و تا سەرلەبەیانی باری. بەدرێژاییی شەو چەندین جار لەسەریەک نامەکەی شەکوورەم خوێندەوە. کاتێک بەتووڕەیی بە ژووری چۆڵی خانووە خاڵییەکەدا سەر و خوار دەهاتم و دەچووم، لە مۆمدانەکە نزیک دەبوومەوە، لەبەر تیشکی لاواز و لەرزۆکی مۆمەکە سەیری پیتە هەڵچووەکانی یارەکەم و لەرزینی سەرشێتانەیان و تەقڵە لێدانیان بۆ لە خشتەبردنم و سەیری ڕەوتی بەرەو پێشەوەچوونی چەماوەیانم لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەکرد. هاوکاتیش هەڵدانەوەی لەپڕی دەریوانەکە و ڕووی ئەڤینداری خۆم و پێکەنینی خەمگینی دەهاتە بەرچاوم. کاتێک ڕووی ڕاستەقینەی شەکوورەم بینی، هەموو ئەو ڕووانەی ترم لەبیر چوو کە لە شەش حەوت ساڵی ڕابردوودا بە شەکوورەم زانیبوو، ئەو ڕووانەی لە گۆڕانی بەردەوامدا بوون و دەمی ڕەنگ گێلاسییان بەتێپەڕبوونی کات گەورە دەبوونەوە و من لە ئەقڵی خۆمدا دەمگواستنەوە.

شەو، تاوێک کەوتمە سەر کەڵکەڵەی ژنهێنان. لە خەیاڵی خۆمدا هیچ گومانم لە ئەڤینەکەم نەبوو، لەوەش دڵنیا بووم یەکجەمسەری و بێ بەرامبەر نییە. بەوجۆرە، بەکامەرانی زەماوەندمان دەکرد، بەڵام شادمانیی ناو خەیاڵم لە ماڵێکی پلیکانەداردا دەبوو بە تۆز و گەرد: کارێکی ڕاست و دروستم بۆ نەدەدۆزرایەوە، لەگەڵ ژنەکەمدا لێمان دەبوو بە دەمەقاڵێ و دەسەڵاتم بەسەریدا نەدەشکا.

گاڤێک تێگەیشتم من ئەم خەیاڵە ڕەشانەی هاوسەریم لە بەشی زیانەکانی ژیانی



هاوسەری لە کتێبی "أحياء العلوم"ی غەزالییەوە وەرگرتووە کە سەردەمی لاویم لە عەرەبستاندا خوێندبوومەوە، نیوەی شەو بەخەیاڵمدا هات هەمان ئەو پەڕانە قسەی زۆریشیان سەبارەت بە سوودەکانی ژیانی هاوسەری تێدایە. پەڕەکانم چەندین جار خوێندبوونەوە، بەڵام سەرباری ئەو پاڵەپەستۆ زۆرەی خستمە سەر خۆم، تەنیا دووان لە سوودەکانم بەبیر هاتەوە: کاتێک پیاو ژن دەهێنێت، یەکێک کاروباری ناوماڵ ڕێک دەخات، بەڵام لە ماڵە پلیکانەدارەکەی ناو خەیاڵی مندا هیچ نەزمێک نەبوو. دووەمیان، ئەگەر ژنم بهێنایە، لەوە ڕزگارم دەبوو چیدی بەدەم هەستکردن بە تاوانەوە دەستپەڕ لێ بدەم و لەویش تاوانتر، لە کۆڵانە تاریکەکانی پشتەوە بدەمە پەی گەوادەکان و منەی ژنانی لەشفرۆش بکەم.

ئەم بیرۆکەی ڕزگاربوونە، لە درەنگانی شەودا دیسان دەستپەڕی هێنایەوە خەیاڵم. بۆ ئەوەی بەزووترین کات ئەم داخوازە لە سەرم دوور بخەمەوە، وەک هەرجارێک بە ویستێکی بێگەردەوە چوومە گۆشەیەکی ژوورەکەم، بەڵام دوای تاوێک حاڵی بووم دەستپەڕم لێ نەداوە. من، دوای دوازدە ساڵ، جارێکی تر عاشق بووبووم.

لە ئاست ئەم بەڵگە دووربێت هەڵنەگرەدا، خرۆشان و ترسێکی زۆر چووە دڵمەوە و وای لێ کردم وەک تیشکی مۆمەکە بلەرزم و بە ژوورەکەدا هاتم و چووم. شەکوورەیەک ئامادە بێت بێتە بەر پەنجەرە و خۆی پێشان بدات، چ پێویستی بەو نامەیەی تەواو پێچەوانەی ئەو لۆجیکە هەبوو؟ ئەگەر کچە ئەوەندە خۆی لە من دوور دەگرێت، بۆچی باوکی دەنێرێت بەدوامدا؟ ئایا ئەمانە، باوک و کچ، گەمەم لەگەڵدا دەکەن؟ ئەمسەر و ئەوسەری ژوورەکەم دەکرد و هەستم دەکرد دەرگا و دیوار و تەختەی جیڕەجیرکەری زەمینی ژوورەکەم وەک خۆم زمانە بزڕکێیانە و هەوڵ دەدەن بەدەم جیڕوهوڕەوە وەڵامی پرسیارەکانم بدەنەوە.

سەیرێکی نیگارەکەی ساڵانێکی زۆر لەمەوبەر بەدەستی خۆم کێشراوم کرد. نیگارەکە باسی ئەوە دەگێڕێتەوە کاتێک شیرین نیگاری خەسرەو بە هەڵواسراوی بە لقی دارێکەوە دەبینێت، عاشقی دەبێت. ئەو سەردەمە کتێبێکی مامناوەندیی لە تەورێزەوە هاتوو تازە کەوتبووە دەستی زاوام و من نیگارەکەم بە سروشێک کێشابوو کە لە نیگارێکی هاوشێوەی ناو ئەو کتێبەم وەرگرتبوو. سەیرکردنی نیگارەکە، نە

خەجاڵەتی کردم وەک ئەوەی لە ساڵانی دواتردا کاتێک بیرم دەکەوتەوە، تەریق دەبوومەوە (لەبەر سادەییی نیگارەکە و بەیانکردنی ئەڤینم)، نە بردیشمیەوە بۆ بەختەوەریی ساڵانی گەنجایەتیم. لەگەڵ گزنگی بەیاندا ئەقڵم جڵەوی دۆخەکەی گرتە دەست و ناردنەوەی نیگارەکەم لە شەکوورەوە بۆ من بە هەڵمەتێکی شەترەنجی ئەڤین دانا کە شەکوورە فرە وەستایانە لەدژی من ئەنجامی دەدات. دانیشتم، لەبەر ڕۆشناییی مۆمدان نامەیەکی وەڵامم بۆ شەکوورە نووسی.

دوای خەوێکی کورتخایەن، بەیانی نامەکەم خستە باخەڵم و چوومە کوچە و کۆڵانان. پیاسەیەکی دوور و درێژم کرد. بەفر کۆڵانە تەنگەبەرەکانی ئەستەنبوڵی فراوان کردبووەوە و شاریشی لە جەنجاڵی داماڵیبوو. هەموو شتێک لە ئەوانەی ساڵەکانی سەردەمی منداڵیم کپتر و بێ جموجووڵەتر بوو. شێوەی ئەوەی لە ڕۆژانی بەفری زستانانی چاخی منداڵیمدا هەستم پێ دەکرد، پێم وابوو سەربان و قوبە و باخچەکانی ئەستەنبوڵ بە قەلەڕەشکە داپۆشراون. بەدەم بیستنی دەنگی پێمەوە لەسەر بەفرەکە و سەیرکردنی هالاوی دەرچوو لە دەممەوە، ڕێم دەکرد. بەخەیاڵمدا هات کۆشکی نیگارخانەش، کە زاوام ویستبووی سەری لێ بدەم، وەک کۆڵانەکان بێدەنگە و ئەمەش منی دەخرۆشاند. بێ ئەوەی بچمە گەڕەکی جوولەکان، بە منداڵێکدا هەواڵم بۆ ئەستەر نارد و ژوانێکم دانا بۆ یەکتر بینین بەر لە نوێژی نیوەڕۆ تا نامەکەم بگەیەنێت بە شەکوورە.

زوو چوومە باڵەخانەی نیگارخانەکەی پشت ئەیاسۆفیا. ئەو نیگارخانەیەی لە منداڵیمدا شاگردیم تێدا کردبوو و بەهۆی زاوامەوە هاتوچۆیم دەکرد، جگە لەو چلوورانەی بە گوێسوانەکانیدا هاتبوونەوە خوارەوە، هیچ شتێکی تری لێ نەگۆڕابوو.

شاگردێکی گەنج و جوانکیلە لە پێشەوە و منیش بەدوای ئەودا، بەناو وەستایانی بەرگ تێگری گێژبوو لەبەر بۆنی زەمق و چرێش، وەستایانی نیگارکێشی پشت کۆماوە لە تەمەنێکی زوودا و بەناو برێک لاودا تێ پەڕین بەخەمباری چاویان لە گرەکانی ئاگردان بڕیبوو و بێ ئەوەی سەیری جامەکانی سەر چۆکیان بکەن، بۆیاخیان تێکەڵ دەکرد. لە گۆشەیەکدا یارۆیەکی بەسالاچووم بینی هێلکەیەکی



شترمورغی نابووە باوەشی و بە تاسەوە بۆیاخی دەکرد، مامێک بەزەوقەوە کشاوێکی دەنەخشاند و شاگردێکی گەنجم بینی بەڕێزەوە بۆ ئەوانی دەڕوانی. لە دەرگایەکی والاوە دەستەیەک قوتابیم بینی وەستاکانیان لێیان تووڕە بووبوون و ئەمانیش بۆ ئەوەی لە هەڵەکانی خۆیان بگەن، ڕووی سوورهەڵگەڕاویان بەشێوەیەک خستبووە سەر کاغەزەکانی بەردەمیان، خەریک بوو تیایدا نقوم دەبوون. لە ژوورێکی تردا شاگردێکی خەمبار و دڵتەنگ، ڕەنگ و کاغەز و نیگاری لەبیر کردبوو و سەیری ئەو کۆڵانەی دەکرد کە من پێش کەمێک بە خرۆشانەوە پێیدا هاتبووم. برێک نیگارکێشیش لەبەر دەرگای والای ژوورەکاندا نیگاریان لەبەر نیگاری تردا دەگرتەوە، قاڵب و بۆیاخیان ئامادە دەکرد و قەڵەمەکانی خۆیان دەتاشی و دوژمن ئاسا بە تیلەی چاوەوە بۆ منی نامۆیان ڕوانی.

بە پلیکانە ڕچیوەکاندا سەرکەوتینە سەرەوە. بەژێر ئەو دالانەی دەوری نهۆمی دووەمی باڵەخانەی نیگارخانەی دابوو، ڕۆیشتین. دوو قوتابیی تەمەن بچووک لە حەوشی بە بەفر داپۆشراوی ناوەوەدا، سەرباری ئەوەی جوبەی قوماشی ئەستووریشیان لەبەردا بوو، لە سەرماندا هەڵدەلەرزین و دیار بوو چاوەڕێی شتێک، پێم وابێت سزایەکیان دەکرد. ڕۆژانی سەرەتای تافی لاویم هاتەوە بیر کاتێک قوتابیانیان لەپای تەمەڵی نواندن و بەفیڕۆدانی بۆیاخی گرانبەها فەلاقە دەکران و تا خوێن لە بن پێیان دەهات، لێیان دەدرا.

چووینە ژوورێکی گەرمەوە. چەند نیگارکێشێکم بینی بەئاسوودەیی لەسەر چۆک دانیشتبوون، بەڵام من خەیاڵم لای وەستاکانیان نا، لای ئەو گەنجانەیان بوو کە تازە قۆناغی شاگردییان تێ پەڕاندبوو. لەبەرئەوەی ئەو گەورە وەستایانەی مامۆستا عوسمان ناسناوێکی بە هەریەکەیان بەخشیبوو، ئیدی لە ماڵەکانی خۆیاندا کاریان دەکرد، ئەم ژوورەی ڕۆژگارێک ڕێز و خرۆشانی لە ڕادەبەدەری لەکنم دەورووژاند، چی دی لە نیگارخانەی سوڵتانێکی گەورە و دەوڵەمەند نەدەچوو، بگرە ئێستا وەک ژوورێکی گەورەی کاروانسەرایەکی ونبووی ناو چیا خاڵییەکانی ڕۆژهەلات دەچوو.

لە تەنیشتەوە و لە پشت سندووقێکی بچووکەوە، بۆ جاری یەکەم دوای دوازدە ساڵ، مامۆستا عوسمانی گەورەی نیگارکێشانم بینی. لە سێبەرێک زیاتر، وەک

تارماییيەک هاتە بەرچاوم. هەر کاتێک لە میانەی ڕێبواریمدا خەیاڵی نەخشاندن و نیگارکێشیم کردبێت، وەستای گەورە هەمیشە وەک بەهزاد بەسەرسامییەوە لە خەیاڵمدا ئامادە بووە. ئێستا بە جلوبەرگی سپییەوە و لەبەر تیشکی سپیی بەفری دزەکردوو لەو پەنجەرەیەوە کە بەسەر ئەیاسۆفیادا دەڕوانێت، پێ دەچێت لەمێژ بێت تێکەڵاوی خێوەکانی دنیای ئەودیو بووبێت. دەستە بە خاڵ کوتراوەکانیم ماچ کرد و خۆم خستەوە بیری. بۆم باس کرد کاتێک منداڵ بووم، زاوام منی بۆ ئێرە دەهێنا، بەڵام من قەڵەمی خۆم پەسەند کرد و ساڵانی خۆم بە ڕێگا و بانەکانەوە، بە دەفتەرداری و نووسیاریی پاشایانەوە لە شارەکانی ڕۆژهەڵات بەسەر بردووە. گوتم لەگەڵ سەرحەد پاشا و پاشایانی تر لە تەورێز خۆشنووس و نیگارکێشانم ناسیوە و کتێبم ئامادە کردووە، لە بەغدا و حەلەب و وان و تفلیس بووم و شەڕوشۆڕی زۆرم بینیوە.

تیشکێک لە باخچە بەفراوییەکەوە دەهات و بە موشەمای پەنجەرەکەدا دزەی دەکردە ژوورێ. مامۆستا عوسمان بەدەم سەیرکردنی تیشکەکەوە گوتی: "ئاخ تفلیس، ئایا ئێستا لەوێ بەفر دەبارێت؟"

وەک ئەو مامۆستا کۆنانەی عەجەم هەڵسوکەوتی دەکرد کە لەبەر قوڵبوونەوە لە هونەردا بیناییی چاوان لە دەست دەدەن و دوای تەمەنێک، ژیانێکی نیوە ئەولیا و نیوە خەڵەفاو بەسەر دەبەن و داستانی لە بڕانەوە نەهاتوو دەگێڕنەوە. بەڵام دەستبەجێ لە چاوانی جنۆکە ئاسایدا بینیم بەتوندی نەفرەت لە زاوام دەکات و لە منیش بەگومانە. سەرباری ئەوەش پێم گوت لە بیابانی عەرەبی، بەفر وەک ئێرە هەر بەتەنیا بەسەر ئەیاسۆفیادا نابارێت، بگرە بەسەر بیرەوەرییەکانیشدا دەبارێت. بۆم گێڕایەوە و گوتم کاتێک بەفر بەسەر قەڵای تفلیسدا دەباری، ژنان لە کاتی جلشۆریندا گۆرانیی گوڵڕەنگیان دەچڕی و منداڵانیش لەژێر بالیفەکانیاندا دۆڵدرمەیان بۆ هاوین دەشاردەوە.

گوتی: "سادەی بۆم بگێڕەوە لەو وڵاتانەی بۆیان چووی، نیگارکێشان چ دەنەخشێنن و نیگاری چی دەکێشن؟"

نیگارکێشێکی لاو لە گۆشەیەکدا نوقمی خەیاڵ بووبوو و هێڵی بە پەڕەکاندا دەهێنا، سەری لە تەختەی نیگارکێشانی بەردەستی بەرز کردەوە و وەک ئەوەی پێم



بڵێت: "ئێستا چیرۆکی هەرە ڕاست بگێڕەوە"، لەگەڵ ئەوانی تردا سەیری کردم. زۆربەی ئەم مرۆڤانە بێ ئاگان لەوەی بەقاڵی گەڕەک کێیە و بۆچی لەگەڵ سەوزەفرۆشەکەی هاوسێیی لە شەڕدایە و نازانن هۆقەی نان بە چەندە، بەڵام ئاگادارن کام خان و پادشا و سوڵتان و شازادە لە تەورێز و قەزوین و شیراز و بەغدا، چەند پارە و پوولی بۆ کتێب هەڵڕشتووە. بێگومانیش بووم لەوەی بەلایەنی کەمەوە بەشی هەرە زۆری ئەو ورتەورت و قسە و قسەڵۆکانەی شێوەی پەتا بەناو ئەو دەستە و تاقمانەدا بڵاو دەبووەوە، بەرگوێی ئەمانیش کەوتبووەوە. بەڵام سەرباری ئەوەش بۆم گێڕانەوە، چونکە من لە ڕۆژهەڵاتەوە، لەو وڵاتی عەجەمەوە هاتبووم، لەو وڵاتەوەی سوپاکانی لە شەڕدان، شازادەکانی دەستیان ناوەتە بینەقاقای یەکتر و شاران تاڵان دەکەن و دەسووتێنن، هەموو ڕۆژێک باسی شەڕ و ئاشتیی تێدا دەکرێت و چەندین چەرخە باشترین شیعری تێدا دەنووسرێت و نایابترین نەخش و نیگاری لێ دەکێشرێت.

گوتم: "وەک دەزانن، شا تەهماسپ پاش پەنجا و دوو ساڵ دانیشتن لەسەر تەختی پادشایی، بەم ساڵانەی دوایی ئەڤینی کتێب و نەخش و نیگاری لەبیر کرد، پشتی لە شاعیران و نیگارکێشان و خۆشنووسان کرد و خووی دایە خواپەرستی. دواجار کۆچی دوایی کرد و ئیسماعیلی کوڕی لە شوێنی دانیشت. پادشای نوێ، کە باوکی لەبەرئەوەی زانیبووی کەسێکی سەرەڕۆ و شەڕانگێزە، بیست ساڵ لە کونجی زیندان قایمی کردبوو، هەر ئەوەندەی لەسەر تەخت دانیشت، هار بوو و براکانی خۆی بە سەربڕین دا و چاوی هەندێکیشانی هەڵکۆڵی و لە کۆڵی کردنەوە. بەڵام دواجار دوژمنەکانی، ئەفیۆن و ژەهریان دەرخواردی دا و لێی ڕزگار بوون و محەمەد خوابەندی برا گەورەی نیوە ئاقڵیان هێنایە سەر تەخت. هەرچی شازادە، برا، والی و ئوێزبەک هەیە لە سەردەمی ئەودا ڕاپەڕین. لەناو خۆیاندا و لەدژی سەرحەد پاشای ئێمە کەوتنە شەڕێکی زۆر گرانەوە کە وڵاتی عەجەمی تارومار کرد و تۆز و دووکەڵ باڵی بەسەردا کێشا. پادشای ئێستای بێ پارە و پوول و بێ ئەقڵ و نیوەکوێر لە ڕەوشێکدا نییە کتێب بە نووسینەوە و نیگار بە کێشان بدات. بەوجۆرە وەستایانی ئەفسانەییی قەزوین و هەرات، هەموو وەستایانی بەساڵاچوو و ئەو شاگردانەی لە نیگارخانەی شا تەهماسپدا شاکاریان دەئافراند، ئەو نیگارکێشانەی فڵچەکانیان

نیگاری ئەسپیان دەخستە چوارناڵە و پەپوولەیان لە پەڕەکان دەردەهێنا و دەفڕاند، سەرجەم ڕەنگباز و وەستایانی بەرگ تێگر و خۆشنووسان بێکار و بێ حاڵ، بێ پوول و پارە، تەنانەت بێ شوێن و بێ نیشتمان مانەوە. هەندێکیان بەرەو باکور بۆ ناو شەیبانییەکان، بڕێکیان بۆ هندستان و تاقمێکیشان کۆچیان کرد بۆ ئێرە، بۆ ئەستەنبوڵ. ئەوانی دیکەشیان دەستیان دایە کاری تر و هەم خۆیان و هەم شەرەفیشیان لە دەست دا. بەشێکیشیان چوونە پاڵ ئەو شازادە و والییانەی لەدژی یەکتر لە شەڕدان و دەستیان کرد بە کار بۆ کتێبی بچووکی هێندەی ناو لەپی دەست کە هەرە زۆر چوار پێنج ڕووپەل نیگاریان تێدایە. کتێبی هەرزانبەهای بەپەلە نووسراو و سادە نەخشێندراو بۆ زەوقی سەربازی ئاسایی و پاشایانی دنیانەدیو و شازادەگەلی شووم هەموو شوێنێکی تەنیووە."

مامۆستا عوسمان پرسی: "بە چەند دەفرۆشرێن؟"

"دەگوترێت سادقی بەگی گەورە و گران تەنیا بە چل زێڕ نیگارێکی "عجائب المخلوقات"ی بۆ ئەفسەرێکی ئوێزبەکی کێشاوە. لە چادری پاشایەکی نەزاندا کە لە شەڕی ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ئەرزەڕووم گەڕاوەتەوە، دەفتەرێکی نیگاری تژە نیگاری ڕووت و تازیم بینی و نیگاری دەستکردی وەستا سیاوەیشیشی تێدا بوو. هەندێک لەو وەستا گەورانەشی نەیانتوانیوە دەستبەرداری نیگارکێشی بن، نیگاری تاک و تەرای بەدەر لە کتبێک و داستانەکان دەکێشن و دەفرۆشن. کاتێک سەیری ئەو تاک نیگارانە دەکەیت، ناڵێی ئەمە جڤاتی کام داستانە، بگرە تەنیا لەبەر نیگارەکە و بۆ زەوقی بینین سەیری دەکەیت. بۆ نموونە، دەڵێی ئای ئەسپێکی چەند بێ کێماسی و جوانە و هەر لەبەر ئەو هۆیە پارە بە نیگارکێش دەدەی. داخوازی زۆر لەسەر نیگاری شەڕ و نیگاری ڕووتی ساتی سەرجێییکردن و جووتبوونیش هەیە. جڤاتێکی جەنجاڵی شەڕ بۆ سێسەد ئاکچە دابەزیوە و خوازیاریشی وەک نەبێت، وایە. هەندێک لە نیگارکێشانیش هەر بۆ ئەوەی هەرزان بێت و لە فرۆشتن بێت، بێ ئەوەی بۆیاخ بەکار بهێنن، لەسەر کاغەزی زبر و بێ ڕەونەق نیگاری ڕەش و سپی دەکێشن."

مامۆستا عوسمان گوتی: "زەڕکارێکم هەبوو تا بڵێی بەختەوەر و هونەرمەند. هێندە بە زەرافەت کاری بەڕێوە دەبرد، ئێمە پێمان دەگوت زەریف ئەفەندی. بەڵام



ئەویش جێمانی هێشت و ڕۆیشت. ئەوە ماوەی شەش ڕۆژە دیار نییە. زەوی قووتی داوە."

گوتم: "مرۆڤ چۆن ئەم نیگارخانەیە، ئەم ماڵە کامەرانەی باوان جێ دەهێڵێت و دەڕوات؟"

مامۆستا عوسمان گوتی: "چوار وەستای گەنجی هەر لە سەردەمی شاگردییەوە لەبەر دەستی خۆم پێگەیشتوو، پەپوولە، زەیتوون، لەقلەق و زەریف، لەسەر ویست و فەرموودەی سوڵتانمان لە ماڵەوە نەخش و نیگار دەکێشن."

وەک دیار بوو، ئەم بڕیارە بەمەبەستی ئەوە بوو تا بتوانن ئاسانتر کار بۆ ئەو جەژننامەیە بکەن کە سەرجەم نیگارخانە سەرقاڵی بوون. ئەمجار، سوڵتان دەستووری نەدابوو بۆ کتێبێکی تایبەت لە حەوشی کۆشک گۆشەیەکی تایبەت بنیات بندرێت، بگرە فەرمانی پێ دابوون لە ماڵەکانی خۆیاندا کار بکەن. لەبەرئەوەی بەخەیاڵمدا هات لەوانەیە ئەم فەرمانە بۆ کتێبی زاوام درابێت، بێدەنگ بووم. ئەرێ مامۆستا عوسمان تا چ ڕادەیەک قسەی توێکڵداری دەکرد؟

بانگی لە نیگارکێشێکی پشت کۆماوە و سیسەڵە کرد: "نووری ئەفەندی، بارودۆخ بۆ قەرە ئەفەندی ڕوون بکەوە و بیگێڕە."

سوڵتانمان لە ڕۆژگاری بەجۆشدا بۆ لە نزیکەوە بەسەرکردنەوەی گشت شتێکی نیگارخانە، هەردوو مانگ جارێک سەردانێکی نیگارخانەی دەکرد. "بارودۆخ"یش تەدارەکێک بوو لە میانەی سەردانەکانی سوڵتانماندا ساز دەکرا. بە هاوڕێیەتیی حازمی گەورەی خەزنەداران و لوقمانی گەورەی شانامەچییان و مامۆستا عوسمانی گەورەی نیگارکێشان باسی ئەوە بۆ سوڵتانمان دەکرا کام لە نیگارکێشانی نیگارخانە کار بۆ کیژان پەڕەی کام کتێب دەکەن، کێ کام زەڕکاریی کردووە، کێ کیژان نیگاری ڕەنگ کردووە، هەریەک لەو ڕەنگباز و خشتەکێش و زەڕکارانەی هەموو شتێکیان لە دەست دێت و لە هەر دە پەنجەی دەستیاندا دە ماریفەت هەیە، سەرقاڵی چ کارێکن.

لەبەرئەوەی لوقمانی گەورەی شانامەچییانی نووسەری زۆربەی کتێبە نەخشێندراوەکان لە پێ کەوتبوو و لە ماڵ دەرنەدەچوو؛ عوسمانی گەورەی

نیگارکێشان لە دووکەڵی دڵگرانی و هەڵچووندا ون بووبوو؛ چوار وەستاش بە ناسناوەکانی پەپوولە، زەیتوون، لەقلەق و زەریف لە ماڵەکانی خۆیاندا کاریان دەکرد و سوڵتانیشمان وەک جاران لە نیگارخانە شێوەی منداڵ وەجۆش نەدەکەوت، چی دی تەدارەکیش بەرێوە نەدەبرا. ئەوەی نووری ئەفەندی کردی، لاساییکردنەوەی تەدارەکەکە بوو و ئەمەش خەمباری کردم. نووری ئەفەندیش وەک گەلێک نیگارکێشی تر، بێ ئەوەی ژیانێکی خۆش بگوزەرێنێت و لە هونەری خۆیدا پێش بکەوێت، بەختوخۆڕاییی پیر بووبوو. ئەوەش نەبوو چەندین ساڵ خۆی بەسەر تەختەی کاردا شۆڕ کردبێتەوە و لەخۆڕا پشتی کۆمابێتەوە، بگرە هەمیشە سەرنجی لە ڕووداوەکانی ناو نیگارخانە و لەوە داوە کێ کام پەڕەی جوانی نەخشاندووە.

بەمجۆرە بۆ جاری یەکەم بەجۆشەوە سەیری پەڕە ئەفسانەیییەکانی جەژننامەی تایبەت بەباسکردنی تەدارەکی ئاهەنگی خەتەنەسوورانی شازادەکانی سوڵتانمانم کرد. هێشتا لە عەجەمستان بووم ئەم چیرۆکی خەتەنەکردنانەم بیستبوو کە پەنجا و دوو ڕۆژی دەخایاند و سەرجەم خەڵکی ئەستەنبوڵ بە نوێنەرانی خاوەن پیشە و کارە جۆراوجۆرەکانەوە بەشدارییان تێدا دەکرد. هەواڵی کتێبی گێڕانەوەی تەدارەکی خەتەنەسووران هێشتا هەر لە قۆناغی ئامادەکردندا بوو، بەرگوێم کەوتبوو.

لە یەکەم نیگاردا کە خرایە بەردەستم، سوڵتانی کۆڵەکەی جیهانمان لە شانشینی کۆشکی خوا لێخۆشبوو ئیبراهیم پاشا جێی خۆی خۆش کردبوو و بەدڵێکی فراوانەوە سەیری ئاهەنگێکی دەکرد لە خوارەوە لە مەیدانی ئەسپ بەرێوە دەچوو. ڕووی، ئەگەرچی وردەکاریی زۆریشی تێدا نەکرابوو بۆ جیاکردنەوەی لە ئەوانی دی، بەڵام بە ڕێزەوە کێشرابوو. لەلای ڕاستی ئەو دوو ڕووپەلە نیگارەی کە لای چەپییەوە نیگاری سوڵتانمان کێشرابوو، پاشا، باڵیۆزانی عەجەم و تەتەر و فەڕەنگ و ڤینیسیا لە پەنجەرە و تاقدا دەبیندران. ئەمانە لەبەرئەوەی سوڵتان نەبوون، بەپەلە و بە ناوردی کێشرابوون و چاویان لە ئامانجێکی دیاریکراو نەبڕیبوو، بگرە تێکڕا سەیری گۆڵمەزی ناو مەیدانەکەیان دەکرد. دواتر، لە نیگارەکانی تریشدا هەمان ئەو بەجێکردن و ڕیزبەندی و نەخشاندنی دیوار و دار و قرمیدانەم بینی کە ئەگەرچی بە شێوازی تر و بە ڕەنگی دی کێشرابوون، بەڵام سەرلەبەریان دووبارە بوون. ئەگەر خۆشنووسان لە نووسینەوەی جەژننامەکە بوونایەتەوە و نیگارەکانی تەواو بکرابایە



و لە بەرگ بگیرایە، ئەو کاتە خوێنەر لە هەڵدانەوەی پەڕەکانیدا و لە مەیدانی ئەسپی بەر نیگای سوڵتان و لەناو ئاپۆڕەی بانگهێشتنکراواندا، کە لە هەمان دۆخدا سەیری هەمان مەیدانیان دەکرد، هەر جارەی نواندنێکی زۆر جیاوازی بە کۆمەڵێک ڕەنگی تەواو جیاوازەوە دەبینی.

منیش بینیم: مرۆگەلێکم بینی بە سەدان قاپ پڵاوی دانداراویان لەوێ، لە مەیدانی ئەسپ لە دەستی یەکتر دەرفاند و کاتێک گۆشتی گایەکی برژاویان تاڵان دەکرد، لەو کەروێشک و مەلانەی لێوەی دەردەچوون، دەترسان. وەستایانی مسگەرم بینی سواری گالیسکەیەکی پێچەکەدار بووبوون و لە شێوەی کەژاوەی پیشەکاراندا بە بەردەم سوڵتانماندا دەرباز دەبوون، یەکێکیان لە گالیسکەکەدا ڕاکشابوو و سندانێکی گۆشەداری خستبووە سەر سنگی ڕووتی و ئەوانی تریش، بێ ئەوەی چەکوشەکانی دەستیان بەر سنگی ڕووتی کابرا بکەوێت، مسیان لەسەر دەکوتی. ئەو جامچییانەم بینی کاتێک لە گالیسەکەدا بە بەردەم سوڵتاندا تێ دەپەڕین، لەسەر جام گوڵەمێخەک و دارسەروویان دەنەخشاند. جەواڵی پڕ لە شەکری بارکراو لە حوشتر و تووتیی لە شەکر دروستکراو لە قەفەسدا و شەرکچییانم بینی تێپەڕ دەبوون و شیعری شیرینیان دەخوێندەوە. کلیلچییانی بەساڵاچووم بینی گلەییان لە ڕۆژگاری نوێ و لە خراپیی دەرگای نوێ دەکرد و چەندین جۆری کلیلی هەڵواسراو، قەباغدار، سوورمەیی و ددانداریان لە گالیسکەدا پێشان دەدا. جێپەنجەی هەریەک لە وەستایانی نیگارکێش پەپوولە و لەقلەق و زەیتوون بەو نیگارەوە دیار بوو کە جادووبازانی پێشان دەدا: جادووبازێک وەک ئەوەی بەسەر مەڕمەڕێکی پاندا بیبات، هێلکەی بەسەر دارێکی باریکدا دەبرد و نەیدەهێشت بکەوێت و یەکێکی تریشیان دەفی بۆ دەژەند. لە نیگارێکیشدا کتومت بینیم چۆن کاپتنی دەریا کلج عەلی پاشا بەو گاورانەی لە دەریادا گرتبوونی و دیلی کردبوون، لە قوڕ چیایەکی گاوری بە دروستکردن دابوو، هەموویانی لە گالیسکە سوار کردبوو و ڕێک ئەو کاتەی دەگەنە بەردەم سوڵتان، باroوتی ناو چیایەکە دەتەقێنێتەوە و پێشانی دەدات چۆن بە تۆپەکانی ناڵە لە وڵاتی گاوران هەڵدەستێنێت. قەسابی بێ ڕیش و بێ سمێڵم بینی ڕوویان لە ژن دەچوو و جلی لە ڕەنگی گوڵ و باینجانیان پۆشیبوو، دەم بە پێکەنین و سیکارد بە دەستەوە سەیری ئەو مەڕە پەمەیییانەیان دەکرد کە پێستیان گوردرابوو

و بە قولاپەوە شۆڕ کرابوونەوە. شێرێکی زنجیر لەمل هێندرابووە بەردەم سوڵتان و بەهۆی توورەکردن و پێ ڕابواردنییەوە، خوێن زابووە چاوی و دەینەڕاند. شێرەکە هێمای ئیسلام بوو و بەدەم چەپڵەی بینەران و شێربازانەوە، لە ڕووپەلەکەی تردا بەرازێکی بە ڕەنگی بۆر و وەنەوشەیی کێشراو و هێمای گاورانی ڕاو دەنا. دوای تێروپڕ سەیرکردنی نیگاری سەرتاشێک کە لە بنمیچی دووکانێکی جێگیرکراو لەسەر گالیسکەیەک بە پێش سوڵتاندا تێ دەپەڕێت و ڕیشی کڕیارێک دەتاشێت و شاگردێکی منداڵی سوورپۆشیش بەهیوای بەخشیش وەرگرتن، سابوونی بۆنداری لە جامی زیویندا و ئاوێنەی بۆ هەمان کڕیار ڕاگرتووە، پرسیاری نیگارکێشی دەستڕەنگینی بکێشی ئەم نیگارەم کرد.

"گرینگ ئەوەیە نیگار بەجوانیی خۆی مرۆڤ بانگ بکات بۆ دەوڵەمەندییەکانی ژیان، خۆشەویستی، ڕێزگرتن لە ڕەنگەکانی ئەو دنیایەی خوا خولقاندوویەتی و بۆ بیرکردنەوە لە ناخەوە و بۆ باوەڕ. ناسنامەی نیگارکێش گرینگ نییە."

نووریی نیگارکێش لەوە بەنەزاکەتتر بوو وەک من بۆی چووبووم. تۆ بڵێی وا حاڵی بووبێت زاوام بۆ لێپرسینەوە منی بۆ ئێرە ناردبێت، بۆیە بەپارێزەوە قسەی دەکرد، یاخۆ قسەکانی مامۆستا عوسمانی گەورەی نیگارکێشانی دووبارە دەکردەوە؟

پرسیم: "ئایا هەموو ئەو زەڕکارییانە دەستکردی زەریف ئەفەندییە؟ ئەدی کێ ئێستا لە جێی ئەو زەڕکاری دەکات؟"

لە دەرگای والای کراوە بەسەر حەوشی ناوەوەدا دەنگی هاوار و زیرەی منداڵ هات. یەکێک لە سەردەستەی نیگارکێشان لە خوارەوە چەند شاگردێکی فەلاقە دەکرد. لەوانەی شاگردەکان بەئەگەری زۆر تۆزی بارووتیان لە گیرفانیاندا یان پەڕەی زێڕینیان لە کاغەزدا شاردبێتەوە و پێ دەچوو ئەو دووانە بن کەوا پێش کەمێک لە سەرماندا دانەجیرەیان پێ کەوتبوو. نیگارکێشانی گەنج، ئەوانەی هەردەم بۆ بەزم لە هەل دەگەڕان، بۆ سەیرکردن بەرەو دەرگا ڕایان کرد.

نووری ئەفەندی بەپارێزەوە گوتی: "خوا یار بێت، تا منداڵەکان بە فەرمانی مامۆستامان عوسمان زەمینی مەیدانی ئەم نیگارە بە وەنەوشەی گوڵڕەنگ بۆیاخ دەکەن و لێ دەبنەوە، زەریف ئەفەندیی براشمان، لەو شوێنەی بۆی چووە،



دەگەڕێتەوە و زەڕکاریی ئەم دوو ڕووپەلە بەئەنجام دەگەیەنێت. مامۆستا عوسمانی نیگارکێشمان داوای لە زەریف ئەفەندی کرد زەمینی گڵی مەیدانی ئەسپ هەر جارەی بە ڕەنگێک بۆیاخ بکات. بە ڕەنگی وەنەوشەیی گوڵڕەنگ، سەوزی هندی، زەردی زەعفەرانی، یان ڕەنگی جیقنەی قاز، چونکە چاو لە یەکەم نیگاردا تێ دەگات ئەوێ مەیدانە و پێویستە بە ڕەنگی گڵ بۆیاخ بکرێت، بەڵام لە نیگاری دووەم و سێیەمدا بۆ چێژ وەرگرتن داوای ڕەنگی تر دەکات. نیگار بۆ ڕازاندنەوەی ڕووپەل دەکێشرێت."

لە گۆشەیەکدا کاغەزێکمان بینی لە شاگردێک جێی مابوو و نیگارێکی لەسەر کێشرابوو. بۆ زەفەرنامە، لەسەر نیگارێکی یەک پەڕەیی پێشاندەری چوونی ڕەوە کەشتییەک بۆ شەڕ کاری کردبوو. بەڵام دیار بوو کاتێک گوێی لە هاوار و ناڵەی هاوڕێکانی بووە کاتێک بە دار لە بنی پێیان دەدرا، ڕای کردبوو بۆ سەیرکردنیان. ئەو ڕەوە کەشتییەی بە قاڵب لەبەر نموونەی کەشتییەکی تر گرتبوویەوە، لەوە نەدەچوو بەسەر دەریاوە بن، بەڵام نابەجێ بوون و بێ هەواییی چارۆکەکان لە قاڵبەکەوە نا، لە بێ تواناییی نیگارکێشەوە سەرچاوەیان گرتبوو. بە خەم و حەسرەتەوە بینیم قاڵبەکە لە کتێبێک، کە نەمدەزانی کامەیە، یان زۆر هۆڤانە لە دەفتەری نیگارێک کرابێتەوە. دیار بوو مامۆستا عوسمان چی دی گوێی بە زۆر شت نەدەدا.

کاتێک نۆرە هاتە سەر مێزی کاری خۆی، نووری ئەفەندی بە شانازییەوە گوتی سێ هەفتە لە زەڕکاریی واژۆیەکی سوڵتانیدا کاری کردووە و تەواوی کردووە. واژۆکە، بۆ ئەوەی کەس نەزانێت بۆ کێ و بە چ ئامانجێک دەنێردرێت، لەسەر کاغەزێکی خاڵی کێشرابوو و من بەرێزەوە سەیری خۆی و زەڕکارییەکەیم کرد. دەمزانی زۆر پاشای سەرکێش لە ڕۆژهەڵات کاتێک جوانیی پڕ لە هێز و ڕەسەنایەتیی ئەم واژۆی سوڵتانییە دەبینن، دەست لە یاخیبوون هەڵدەگرن.

پاشان، دوایین شاکارە تەواوکراوەکانی جەمالی خۆشنووسمان بینی و بەمەبەستی ئەوەی ماف بەو دوژمنانەی ڕەنگ و نەخش نەدەین کە دەڵێن "هونەری ڕاستەقینە هێڵ و نووسینە و نیگار تەنیا بۆ پێشاندانی هێڵە"، بەخێرایی تێ پەڕین.

ناسری هێڵکێش، گوایە پەڕەی پێنج خشتەکییەکی نیزامیی پاشماوەی ڕۆژانی

کوڕەکانی تەیمووری لەنگ و نیگارێکی چاک دەکرد کە شیرین لە کاتی خۆشوشتندا بە ڕووتی پێشان دەدا و خەسرەو سەیری دەکات، کەچی خراپی دەکرد.

وەستایەکی پیری نەوەد و دوو ساڵە و نیوەکوێر، بەقسەی خۆی شەست ساڵ لەمەوبەر لە تەورێز دەستی مامۆستا بەهزادی ماچ کردووە و دەیگوت ئەو کاتە مامۆستای گەورە و ئەفسانەیی نیوەکوێر و مەست بووە. وەستای پیر، جگە لەم قسەیە هیچ بەسەرهاتێکی تری نەبوو. بەدەستە لەرزۆکەکانی قەڵەمدانێکی قوتووی پێشانم دا کە خۆی دەینەخشاند و بەنیاز بوو دوای سێ مانگی تر تەواوی بکات و وەک دیاریی جەژن پێشکێش بە سوڵتانی بکات.

بێدەنگییەک باڵی بەسەر ژوورە تەنگەکانی نهۆمی خوارەوە و سەرجەم نیگارخانەی شوێنی کاری نزیکەی هەشتا نیگارکێش و قوتابی و شاگرددا کێشابوو. ئەمە بێدەنگیی دوای ئەو فەلاقەکردنە بوو کە من هاوشێوەیم زۆر بیستبوو؛ هەندێک جار بە قاقایەکی مێشک ئاوسێنەر، یان بە گاڵتەیەک، جاروباریش بە یەک دوو قوڵپە و ناڵەیەکی کپکراوی پێش گریان کە دارکاریکردنەکانی ساڵانی شاگردیی بیری نیگارکێشان دەخاتەوە، دەشکێت. وەستای تەمەن نەوەد و دوو ساڵ و نیوەکوێر تاوێک وای لێ کردم هەست بە شتێکی فرە قوڵتر بکەم: لێرە، دوور لە گشت شەڕ و ڕووداوە سەروبنەکان، هەموو شتێک ڕوو لە کۆتاییە. بەر لە بەرپابوونی قیامەتیش، هەر بێدەنگییەکی لەو جۆرە دێتە ئاراوە.

نەخش بێدەنگیی ئەقڵ و مۆسیقای چاوە.

کاتێک بۆ ماڵئاوایی دەستی مامۆستا عوسمانم ماچ کرد، هەستم نەک تەنیا بەڕێزێکی زۆر، بگرە بەشتێکی تەواو جیاوازی هەناو هەژێنەر کرد: بەزەییەکی تێکەڵ لەگەڵ سەرسامی، لەو جۆرەی لە بەرامبەر پیاوچاکێکدا هەستی پێ دەکەن: هەستێکی سەیری خۆ بە گوناهبار زانین. ڕەنگە لەبەرئەوە بێت دژبەری زاوام بوو، چونکە زاوام دەیویست بەنهێنی و بەئاشکرا لاسایی شێوازی مامۆستایانی فەرەنگ بکرێتەوە.

هاوکات هەستێکی وام لە کن پەیدا بوو ئەمە دواجارم بێت مامۆستای گەورە دەبینم. بۆ ئەوەی دڵی خۆش بکەم، پرسیارێکم لێ کرد:



"مامۆستای گەورەم، ئەزبەنی، چ شتێک نیگارکێشێکی ڕەسەن لە یەکێکی ئاسایی جیا دەکاتەوە؟"

وام زانی گەورەی نیگارکێشان بەم پرسیارانە، کە جۆرێک لە ماستاو ساردکردنەوە و مامەحەمەییی تێدا بەدی دەکرێت، ڕاهاتووە و هەر لە سەرەتاوە وەڵامێکی سەرپێییم دەداتەوە و پێم وابوو ئێستا منی هەر لە بیر نەماوە.

بەدەربەستییەوە گوتی: "هیچ پێوەرێک نییە بۆ جیاکردنەوەی نیگارکێشی ڕەسەن لە نیگارکێشی بێ هونەر و بێ باوەڕ. ئەمە بەپێی کات دەگۆڕێت. گرینگ ڕەوشت و هونەری نیگارکێشە دژ بەو خراپەکارییانەی هەڕەشە لە هونەرەکەمان دەکەن. بۆ ئەوەی بزانم نیگارکێشێکی لاو لەم ڕۆژگارەدا تا چ ڕادەیەک ڕەسەنە، سێ پرسیاری لێ دەکەم."

"ئەو پرسیارانە چین؟"

"ئایا پابەندی باوی نوێ دەبێت و لەژێر کاریگەریی چین و فەرەنگدا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت بەهەر نرخێک بووە شێوازێکی نیگارکێشی و ڕێبازێکی تایبەت بەخۆی هەبێت؟ ئایا دەیەوێت وەک نیگارکێش پێشاندان و هەوایەکی جیاواز لە هەمووانی هەبێت و بۆ سەلماندنی ئەمە، شێوەی مامۆستایانی فەرەنگ، واژۆیەک دەخاتە شوێنێکی نیگاری دەستکردی خۆیەوە؟ بۆ ئەوەی لەمە بگەم، دەسپێک پرسیاری شێواز و واژۆی لێ دەکەم."

بە ڕێزەوە پرسیم: "دوایی؟"

"دوایی ئارەزوومە بزانم پاش مردنی ئەو پادشا و سوڵتانانەی ڕاسپاردەی کتێبیان بە ئێمە داوە و دەستاودەست پێکردنی بەرگەکان و بەکارهێنانی نیگارەکانی دەستکردی ئێمە لە کتێبی تر و سەردەمی دیدا، ئەو نیگارکێشە هەست بەچی دەکات. ئەمە شتێکی هێندە هەستیارە کە مرۆڤ نە بەخەمگین بوون و نە بەشادمانی دەربڕین پێی ناوێرێت. بۆیە دەمەوێت پرسیاری سەردەم لە نیگارکێش بکەم. سەردەمی نیگارکێش و سەردەمی خوا. حاڵی دەبیت کوڕی خۆم؟"

نەخێر. هەڵبەتە وام نەگوت. پرسیم: "سێیەمیان؟"

مامۆستای مەزن، عوسمانی گەورەی نیگارکێشان گوتی: "سێیەمیان کوێرییە."

وەک ئەوەی قسەکەی شتێکی ئاشکرا بێت و پێویست بە شیکردنەوە نەکات، بێدەنگ بوو.

بە دەنگێکی نزم و بە شەرمەوە پرسیم: "چیی کوێری؟"

"کوێری، بێدەنگییە. ئەگەر ئەو یەکەم و دووەمەی پێش کەمێک گوتم، بکەیت بەیەک، کوێری دەکەوێتە ڕوو. قوڵترین جێی نیگار، بریتییە لە بینینی ئەو شتەی لە تاریکاییی خواییدا دەردەکەوێت."

بێدەنگ بووم، چوومە دەرەوە. لەسەرەخۆ بە پلیکانە ڕچیوەکاندا هاتمە خوارێ. دەمزانی ئەم سێ پرسیارە گەورەیەی مامۆستای مەزن لە پەپوولە و زەیتوون و لەقلەقیش دەکەم، بەڵام نەک بەتەنیا بۆ لاف لێدان، بگرە بۆ تێگەیشتنیش لەو سێ هاوتەمەنەم، کە هێشتا لە ژیاندا بوون، بووبوون بە ئەفسانە.

بەڵام لە جێوە نەچووم بۆ ماڵی وەستایانی نیگارکێش. لە نزیک گەڕەکی جوولەکان، لە شوێن بازاڕێکی نوێ بەسەر گردێکەوە لەو شوێنەی کەنداوی زێڕینی لێوە دەبینرێت و بەڕووی بوسفۆڕدا دەکرێتەوە، چاوم بە ئەستەر کەوت. لەناو ئەو ژنە کۆیلانەی لە بازاڕ شتومەکیان دەکڕی، ئاپۆڕەی ژنانی گەڕەکە هەژارنشینەکان، ئەوانەی جلی فشەڵ و بێ ڕەنگیان پۆشیبوو و لەناو ئەو جەنجاڵییەی بەربووبوونە ناو گێزەر و هەرمێ و دەسکە پیاز و توور، ئەستەر، بە جلی پەمەییی جوولەکەوە کە ناچاری پۆشینی بوو، بە جەستەی زەلام و نەسرەوتەوە، بە چەنەی لە جووڵە نەکەوتوویی و بە برۆ و چاوەکانیەوە، کە لەسەریەک ئاماژەیان بۆ من دەکرد، زیت و ورشەدار دەهاتە بەرچاو.

نامەکەم دایێ و پێم وابوو سەرانسەری بازاڕ بەدزییەوە بۆمان دەڕوانن. ئەستەر بە جووڵەی پڕ لە نهێنی و وەک کەسێکی شارەزا لە کاری خۆیدا، خستیە پزووی دەرپێکەیەوە. گوتی شەکوورە بیرت لێ دەکاتەوە. بەخشیشی خۆی وەرگرت و گوتم: "دەستم بە دامان، نامەکە بەپەلە و یەکڕاست بگەیەنە." ئەو لە وەڵامدا ئاماژەی بۆ بوخچەکەی کرد و گوتی زۆر کاری تری هەیە و دەمەدەمی نیوەڕۆ نامەکە بە شەکوورە دەگەیەنێت. داوام لێ کرد بە شەکوورە بڵێ من دەچم بۆ بینینی سێ مامۆستای گەنج و مەزن.



# 12

## پێم دەڵێن پەپوولە

پێش نوێژی نیوەڕۆ بوو. لە دەرگا درا، کردمەوە و ڕوانیم: قەرە ئەفەندی بوو. ئەو دەمەی شاگرد بووین، ماوەیەک لە نێوماندا بوو. باوەشمان لەیەک دا و هەڤدومان ماچ کرد. من پەرۆشی ئەوە بووم تۆ بڵێی هەواڵێکی لە زاوایەوە هێنابێت؟ کەچی ئەو گوتی دەیەوێت سەیری پەڕە نەخشێندراوەکانم و نیگارە کێشراوەکانم بکات و گوتی بۆ دۆستایەتی هاتووە و بەناوی سوڵتانیشمانەوە بۆ تاقیکردنەوەم پرسیارێکم لێ دەکات.

من گوتم باشە، ئەو پرسیارەی بەر من دەکەوێت چییە؟ پرسیارەکەی کرد، باشە.

### شێواز و واژۆ

گوتم تا ژمارەی ئەو بێ ڕەچەڵەکانەی بۆ چێژی چاو و باوەڕی خۆیان نا، بۆ پوول و ناوبانگ نیگار دەکێشن ڕوو لە زیادی بێت، واتای وایە بەهەمان ڕێژەی مەراقی شێواز و واژۆ، دزێوی و چاوچنۆکیی زیاتر دەبینین. لە سۆنگەی باوەڕ پێبوونمەوە نا، لەبەرئەوەی شێواز وای دەخواست، بۆیە بەم پێشەکییە دەستم پێ کرد: چونکە بەهرە و هونەری ڕاستەقینە تەنانەت بەحەزکردن لە زێڕ و ناوبانگیش تێک ناچن. بگرە ئەگەر پێویست بەگوتنی ڕاستی بکات، پوول و ناوبانگ مافی خاوەن هونەرە و وەک بەسەر منیش هاتووە، هونەرمەندان بە ئەڤینەوە بۆی دەڕوانن. بەڵام ئەگەر ئەمە بڵێم، نیگارکێشانی سادەی ناو تاقمی نیگارکێشان، ئەوانەی لەبەر دڵپیسی هار بوون، بەتۆمەتی ئەوەی شتێکی هەڵەم گوتووە، پەلامارم دەدەن. منیش بەمەبەستی

ئەوەی بۆیان بسەلمێنم ئەم کارەم لەوان خۆشتر گەرەکە، لەسەر دەنکە برنج نیگاری دار دەکێشم. دەزانم ئەم ئارەزووی شێواز و واژۆ و کەسایەتییە لە ڕۆژئاواوە بە کاریگەریی فەڕەنگەکان و لە ڕۆژهەڵاتەوە، بە کاریگەریی هەندێک وەستای بەلەنگازی چینی کە بە نیگاری قەشە یەسوعییەکان فریویان خواردبوو و لە ڕێ دەرچووبوون، گڕگڕ بە ئێمە گەیشتووە. بۆیە سێ بەسەرهاتی کورتتان بۆ دەگێڕمەوە.

## سێ بەسەرهاتی شێواز و واژۆ

### ئەلف

سەردەمانێک لە قەڵای ناو چیایەکانی باکوری هەرات خانێکی لاوی شەیدای نەخش و نیگار ژیاوە. ئەم خانە لەناو ژنانی حەرەمسەرای خۆیدا تەنیا ژنێکی خۆش دەوێت. کچە تەتەری جوانی جوانانیش دێوانەئاسا عاشقی خان دەبێت. شەو تا بەیانی و تا ئارەقەی شین و مۆر دەدەن، لە جێدا یەکتر دەگەوزێنن و هێندە بەختەوەر دەبن بەڕادەیەک دەیانەوێت ژیان هەمیشە بەوجۆرە بگوزەرێت. بۆیان دەردەکەوێت باشترین ڕێگا بۆ بەدیهێنانی ئەم ئارەزووەیان، هەڵدانەوەی کتێب و بەسەعات و بە ڕۆژان و بێ پسانەوە سەیرکردنی نیگاری دانسقە و بێ کەموکورتیی مامۆستایانی کۆنە. تا زیاتر و بێ ئەوەی سەرسوڕمانیان پێوە دیار بێت، سەیری نیگارە بێ کێماسی و وێکچووەکانی چیرۆکەکان دەکەن، هەست دەکەن کات ڕاوەستاوە و پێیان وا دەبێت سەردەمی زێڕینی بەختەوەریی باسکراو لە داستانەکەدا تێکەڵ بە شادمانییەکانی ئەمان بووە. لە نیگارخانەی خاندا نیگارکێشێکی وەستای وەستایانیش دەبێت و کاری ئەوە دەبێت سەرلەنوێ نیگارەکان وەک خۆیان و بێ خەوش بۆ پەڕەکانی هەمان کتێبگەل بکێشێتەوە. وەک باو دەبێت، وەستای نیگارکێش نیگاری ئازارچێشتنی فەرهاد بەدەست ئەڤینی شیرینەوە، ڕوانینی پڕ لە تاسەی مەجنوون و لەیلا لە ساتی یەکتر بینینیاندا، یان دیمەنی خەسرەو و شیرین کاتێک لە باخچەیەکی دڵگیری بەهەشت ئاسادا بەنیگای جووتواتایی و توێکڵدارەوە بۆ یەکدی دەڕوانن، لە پەڕەی کتێبەکاندا دەکێشێت. بەڵام لە جێی دڵداران، نیگاری خان و شۆخی تەتەر دەکێشێت. گاڤێک خان و یارەکەی لەم ڕووپەلانە دەڕوانن، بۆیان دەردەکەوێت بەختەوەرییان هەرگیز کۆتاییی نایەت و وەستای نیگارکێش



نوقمی ستایش و زێڕ دەکەن. پیاهەڵدان و زێڕی فرە، دواجار وەستای نیگارکێش لە ڕێ دەردەکات و بەفیتی ئیبلیسیش ئەوەی لەبیر دەچێت کەوا لە بێکێماسیبوونی نیگارەکانیدا قەرزداری مامۆستانی دێرینە و پێی وا دەبێت ئەگەر شتێک لە کەسایەتیی خۆیشی بخاتە سەر، ئەوا نیگارەکانی زیاتر جێی ڕەزامەندی دەبن. بەڵام خان و یارەکەی، ئەم نوێکاری و جێپەنجەیەی شێوازی تایبەتی وەستای نیگارکێش بە کێماسی دەزانن و ئۆقرەیان لێ دەبڕێت. کاتێک خان دوور و درێژ سەیری نیگارەکان دەکات و هەست دەکات بەختەوەریی کۆنیان لە زۆر لاوە خراپ بووە، لە پێشدا ئیرەیی بەدولبەری تەتەر دەبات لەبەرئەوەی لەسەر پەڕەکان نیگاری وی دەکێشرا . دواتر، بۆ ئەوەی ئازاری دڵی شۆڕە کچی تەتەر بدات، لەگەڵ کەنیزەکێکی تر سەرجێیی دەکات. کاتێک شۆخی تەتەر لە ڕێی قسە و قسەڵۆکی ناو حەرەمسەراوە هەواڵەکەی پێ دەگاتەوە، ئەوەندە خەمگین دەبێت تا ڕادەی ئەوەی بە بێدەنگی خۆی بە دار سەروویەکی باخچەی حەرەمسەرادا هەڵدەواسێت. خان دوای ئەوەی هەست بەهەڵەی خۆی دەکات و تێ دەگات مەراقی شێوازی تایبەتی نیگارکێش لە پشت هەڵەکەی ئەوەوەیە، هەمان ڕۆژ نیگارکێشی بە فیتی ئیبلیس فریوخواردوو بەکوێرکردن دەدات.

### بێ

لە یەکێک لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات، سوڵتانێکی نیگارپەروەر و شادمانی بەساڵاچوو هەبووە و لەگەڵ جوانی جوانان، ژنە چینییە تازە خوازراوەکەیدا بە کامەرانی ژیاوە. کوڕی سوڵتان لە ژنی پێشووی و ژنی گەنجی سوڵتان دڵیان دەچێتە یەک. کوڕە، لەبەرئەوەی زراوی لە ناپاکیکردن لە باوکی چووبوو، شەرم لە ئەڤینی قەدەغە دەکات، خۆی دەخزێنێتە نیگارخانەوە و خوو دەداتە نیگارکێشی. دانە بەدانەی نیگارەکانی بە خەم و هێزی ئەڤینەوە دەکێشێت و هێندە جوان دەبن تەنانەت وەزیرەکان ناتوانن لە نیگاری مامۆستایانی کۆن جیایان بکەنەوە. سوڵتانی باوکیش شانازی بە کوڕەکەیەوە دەکات. ژنە چینییە گەنجەکەشی سەیری نیگارەکان دەکات و دەڵێت: "بەڵێ، زۆر جوانە، بەڵام ئەگەر واژۆی خۆی نەخاتە سەر، ئەوا بە تێپەڕبوونی ساڵ و زەمان کەس نازانێت ئەو جوانکارییە دەستکردی ئەوە." سوڵتان دەڵێت:" ئەگەر

کوڕەکەم واژۆیان بخاتە سەر، ئایا بەواتای ئەوە نییە ئەو نیگارانەی لەبەر کاری مامۆستایانی دێرین کێشاونی، بە ناڕەوا دەکات بە کاری خۆی؟ جگە لەوەش، ئایا واژۆدانان واتای ئەوە نییە بڵێ ئەم نیگارە کەموکورتییی منی لە خۆ گرتووە؟" کاتێک ژنی گەنجی چینی حاڵی دەبێت ناتوانێت پیاوە پیرەکەی قایل بکات، هەل بەدەست دێنێت و ئەم گفتوگۆیەی واژۆ دەگەیەنێت بە کوڕی گەنجی سوڵتانی خۆ لە نیگارخانە قایم کردوو. کوڕەش لەبەر ناشتنی ئەڤینی بێ ئاکامی لە ناخی خۆیدا، شکۆی بریندار بووە و بە سروش وەرگرتن لەم پێشنیازەی زڕدایکی شۆخ و گەنجی و بە فیتی ئیبلیس واژۆی خۆی دەخاتە سەر گۆشەیەکی هیچ نەبیندراوی نێگارێک لە نێوان گیا و دیوارێکدا. یەکەم نیگاریش کە واژۆی دەخاتە سەر، جڤاتێکی شیرین و خەسرەو دەبێت. وەک دەزانن دوای زەماوەندی شیرین و خەسرەو، شیروویەی کوڕی خەسرەو لە ژنی پێشووی، عاشقی شیرین دەبێت و شەوێک لە پەنجەرەوە دەچێتە ژوورێ و دەبینێت باوکی لەپاڵ شیرین ڕاکشاوە و خەنجەر لە جەرگی دەچەقێنێت. گاڤێک سوڵتانی بەساڵاچوو لەم نیگارەی پێشاندەری جڤات و دەستکردی کوڕی خۆی ورد دەبێتەوە، یەکسەر پەی بە کەموکورتییەک لە نیگارەکەدا دەبات. ڕاستییەکەی، واژۆکە دەبینێت، بەڵام وەک زۆربەی ئێمەومانان، ئەویش هەست بە بینینی ناکات، بۆیە تەنیا هەستێکی وای لەکن پەیدا دەبێت کە "ئەمە نیگارێکی خەوشدارە." لەبەرئەوەی ئەمە کارێک نییە لە مامۆستایانی دێرین بوەشێتەوە، سوڵتان شپرزە دەبێت. نیگارەکە باسی هیچ بەسەرهات و داستانێکی دەستنووسی هاوشێوەی ئەوانە ناکات کە ئەم پێشووتر خوێندوونیەتەوە، بگرە واتای ناشایستەترین شت بە کتێب، واتای گێڕانەوەی بەسەرهاتێکی ڕاستەقینە دەگەیەنێت. ئەم پەی پێبردنە سوڵتانی پیر دەترسێنێت. هەمان کات کوڕە نیگارکێشەکەی، کتومت وەک ئەوەی لە نیگارەکەدا کێشاویەتی، لە پەنجەرەوە دەچێتە ژوورێ، بێ ئەوەی سەیری ناو چاوانی لە ترسان داچەقیوی باوکی بکات، خەنجەرەکەی دەستی کە بەئەندازەی خەنجەری ناو نیگارەکە گەورەیە، لە سنگی باوکی دەچەقێنێت.



جیم

ڕاشیدودینی قەزوینی لە مێژوونامەی خۆیدا بەکەیفەوە دەنووسێت دووسەد و پەنجا ساڵ لەمەوبەر، نەخشاندنی کتێب و هێڵ و نەخش، بەرزترین و خۆشەویستترین هونەر بووە. پادشای ئەو زەمانە لە بێزانسەوە تا چین، فەرمانڕەواییی چل وڵاتی کردووە (لەوانەیە نهێنیی ئەم هێزەی لە سۆنگەی ئەوەوە بووبێت حەزی لە نیگار کردووە)، بەڵام بەداخەوە کوڕی نابێت. بۆ ئەوەی ئەو وڵاتانەی ئەم گرتوونی، لە دوای مردنی دابەش نەبن، پادشا بڕیار دەدات پیاوێکی نیگارکێشی ئاقڵ بۆ کچەکەی بدۆزێتەوە. لە نیگارخانەی خۆی پێشبڕکێیەک بۆ سێ مامۆستای گەورەی نیگارکێشی گەنج و زگوورتی ڕێک دەخات. بەپێی مێژوونامەی ڕاشیدودین، بابەتی پێشبڕکێیەکە زۆر سادە دەبێت: کێ جوانترین نیگار دەکێشێت؟ لەبەرئەوەی نیگارکێشانی لاویش وەک ڕاشیدودین دەزانن دەبێت نیگارەکە لەسەر شێوازی مامۆستایانی کۆن بکێشرێت، هەرسێکیان نیگاری خۆشەویستترین جڤات دەکێشن: کچێک لە باخێکی بەهەشت ئاسادا، لەناو داری سەروو و سنەوبەر، کەروێشکی سڵکەر و پەڕەسێلکەی شپرزەدا نیگای لە زەوەی بڕیوە. هەرسێ نیگارکێش بێ ئەوەی ئاگایان لە یەکدی بێت، هەمان نیگار کتومت لەسەر شێوازی مامۆستایانی کۆن دەکێشن. یەکێکیان لەوانی دی زیاتر بۆ خۆدەرخستن بەپەرۆش دەبێت و بەمەبەستی ئەوەی خۆی لە جوانیی نیگارەکەی بکات بە خاوەن، لە تەنیاترین جێی ناو باخچەکە و لەناو گوڵە نێرگزەکاندا واژۆی خۆی دەشارێتەوە. بەڵام لەبەر ئەم بێ ئابڕووییەی، کە ئەوی لە بێفیزی و خاکیبوونی مامۆستایانی کۆن دوور خستووەتەوە، دەستبەجێ لە قەزوینەوە بۆ چین دوور دەخرێتەوە. بەوجۆرە پێشبڕکێیەکی دی بۆ دوو نیگارکێشەکەی تر ساز دەکرێت. ئەمجارە هەریەکەیان نیگارێکی هێندەی شیعر جوان دەکێشێت و نیگارەکان کتومت وەک یەک دەچن و کچە بەسەر ئەسپەوە لە باخ پێشان دەدەن. یەکێک لە نیگارکێشەکان، نازانرێت بەهۆی هەڵخزانی فڵچەکەیەوە بووە، یان بەمەبەست، لووتی ئەو ئەسپە سپییەی کچی چاوماسیی شێوەی چاوی چینی و ئێسکی ڕوومەت دەرپەڕیوی بەسەرەوە بوو، کەمێک نامۆ کێشابوو. باوک و کچ دەستبەجێ ئەمە بە کێماسی دادەنێن. ئەگەرچی نیگارکێشەکە واژۆی نەخستبووە سەر، بەڵام بۆ جیاکردنەوە و هەست پێکردن

کێماسییەکی وەستایانە لە لووتی ئەسپەکەدا کرابوو. پادشا دەڵێت کێماسی دایکی شێوازە و ئەم نیگارکێشە بۆ بێزانس دوور دەخاتەوە. بەپێی ئەو مێژوونامە ئەستوورەی ڕاشیدودینی قەزوینی، لە کاتی سازدانی تەدارەک بۆ زەماوەندی کچی پادشا لەگەڵ نیگارکێشی سێیەمدا کە نیگارەکەی بێ واژۆ و کەموکورتی کێشابوو، دوایین ڕووداو دەقەومێت: ڕۆژێک بەر لە زەماوەند، کچی پادشا تەواوی ڕۆژ بەدەم حەسرەت و ئاخ هەڵکێشانەوە سەیری نیگاری ئەو مامۆستا لاوە مەزن و بەدەوە دەکات کەوا ڕۆژی دواتر دەبێت بە مێردی ئەم. لەگەڵ داهاتنی تاریکاییی سەر لە ئێوارەدا دەڕواتە کن باوکی و دەڵێت: "ڕاستە مامۆستایانی کۆن لە نیگارە شاهانەکانی خۆیاندا کچانی شۆخیان لەسەر شێوازی چینی دەکێشا و ئەمەش ڕێسایەکی بنەڕەتیی لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتووە، بەڵام ئەگەر کەسێکیان خۆش بویستایە، ئەوا نیشانەیەک یان شتێکی ئەویان دەخستە برۆ، چاو، لێو، قژ و بزە و تەنانەت برژانگی کچە جوانەکانی ناو نیگارەکانەوە. ئەو کێماسییە نهێنییانەی دەیانخستە نیگارەکانی خۆیانەوە، دەبوو بە نیشانەیەک بۆ ئەڤینی ئەوان و تەنیا خۆیان و دڵدارانیان بەمەیان دەزانی. بەدرێژاییی ڕۆژ سەیری نیگاری ئەو کچەم کرد بەسەر ئەسپەکەوە، بەڵام باوکە گیان، هیچ ئاماژەیەکی تێدا نییە بۆ من." بەوجۆرە پادشا دەستبەجێ زەماوەند هەڵدەوەشێنێتەوە و باوک و کچ تا کۆتاییی ژیان پێکەوە دەژین.

قەرە زۆر بە نەزاکەت و بە پێشاندانێکی پڕ لە ڕێزەوە گوتی: "ئایا بەپێی چیرۆکی سێیەم، ئەو کێماسییەی دەبێتە هۆی ئەو شتەی بە شێواز ناو دەبرێت، لە ئاماژەی ڕوو و چاو و بزەی ئەو شۆخەوە، کە نیگارکێش عاشقی بووە، ئاشکرا دەبێت؟"

بەدڵنیایی و بە پێشاندانێکی لووتبەرزانەوە گوتم: "نەخێر، ئەو شتەی لە کچی بزوێنەری هەستی عاشقانەی مامۆستای نیگارکێشەوە دەچێتە نیگارەوە، دواجار دەبێت بە ڕێسا نەک کێماسی، چونکە دوای ماوەیەک، هەموو کەسێک بە لاساییکردنەوەی مامۆستا، نیگاری ڕووی کچان وەک ڕووی ئەو کچە شۆخە دەکێشێت."

کەمێک بێدەنگ بووین. کاتی گێڕانەوەی سێ بەسەرهاتەکە، قەرە زۆر بەوردی



گوێی بۆ ڕاگرتبووم، بەڵام کاتێک هەستم کرد گوێی بۆ دەنگی پێی ژنە جوانەکەم هەڵخستووە کە بە هەیوان و ژووری تەنیشتماندا دەهات و دەچوو، چاوم بڕییە ناو چاوی.

گوتم: "بەسەرهاتی یەکەم پێشانمان دەدات کە شێواز کەموکورتییە. بەسەرهاتی دووەم بۆمان ڕوون دەکاتەوە کەوا نیگاری بێ کێماسی پێویستی بە واژۆ نییە. بەسەرهاتی سێیەمیش، ئەقڵی یەکەم و دووەم دەکات بەیەک و ئەوەمان پێشان دەدات کە واژۆ و شێواز جگە لە پەسندێکی بێ ئابڕوو و گەمژەی کێماسی، شتێکی تر نییە."

ئەرێ ئەم کابرایەی وا دەرسی پێ دەڵێمەوە، چەندە لە نەخش تێ دەگات؟ گوتم: "ئایا لە بەسەرهاتەکانمەوە حاڵی بووی من کێم؟"

گوتی: "حاڵی بووم." بەڵام قسەکەی هیچ جێی بڕوا نەبوو.

بۆ ئەوەی نەبادا خۆتان بە بۆچوون و تێگەیشتنی ئەو سنووردار بکەن و ئەوسا هەوڵی تێگەشتن لە من بدەن، با خۆم ڕاستەوخۆ پێتان بڵێم من کێم. هەموو شتێکم لە دەست دێت. بەشێوەی مامۆستایانی کۆنی قەزوینی بەدەم بەزم و پێکەنینەوە نیگار دەکێشم و ڕەنگی دەکەم. بە زەردەخەنەوە دەڵێم: لە هەموو کەسێک باشترم. ئەگەر هەستم درۆم لەگەڵدا نەکات، هۆی هاتنی قەرە بۆ ئێرە، ونبوونی زەریف ئەفەندییە و ئەم پرسەش بەهیچ کلۆجێک پێوەندیی بە منەوە نییە.

قەرە لێی پرسیم ژیانی هاوسەری و هونەر چۆن پێکەوە مەیسەر دەبێت.

زۆر کار دەکەم و بە زەوقەوە دەیکەم. تازە لەگەڵ جوانترین کچی گەڕەکدا زەماوەندم کردووە. کاتێک نیگار ناکێشم، وەک شێت سەرجێیی لەگەڵدا دەکەم. هەڵبەتە ئەمانەم نەگوت. گوتم ئەمە پرسێکی مەزنە. ئەگەر فڵچەی نیگارکێش کاری شاهانە بڕژێنێتە سەر کاغەز، کاتێک دەچێتە کن ژنەکەی، ناتوانێت هەمان خۆشی بئافرێنێت. درێژەم دایێ و گوتم پێچەوانەکەشی ڕاستە، ئەگەر قامیشی نیگارکێش ژنەکەی بەختەوەر بکات، ئەوا قامیشەکەی تر لەسەر کاغەز مات و مەلوول دەبێت. وەک هەرکەسێکی ئێرەیی بەر بە هونەری نیگارکێش، قەرەش بڕوای بەم درۆیانە کرد و دڵخۆش بوو.

گوتی دەیەوێت ئەو پەڕانەی کە تازە نەخشاندوومن ببینێت. لەبەردەم مێزی کارەکەم لەناو بۆیاخ، قوتووی مەرەکەب، مۆرە(*) ، فلچە، پێنووس و قەڵەمداندا دامنیشاند. کاتێک قەرە سەیری نیگارێکی دوو پەڕەیی پێشاندەری تەدارەکی خەتەنەکردنی شازادەمانی دەکرد و من بۆ جەژننامە دەمکێشا، لە تەنیشت ئەوەوە، لەسەر نیمدەرێکی سووری بچووک دانیشتم. بە گەرمایی نیمدەرەکەدا بیرم کەوتەوە پێش کەمێک ژنە دولبەرەکەم بە سمتە جوانەکانییەوە لەسەری دانیشتبوو. کاتێک من بە قەڵەمە قامیشەکەم نیگاری ئێش و کۆڤانی سزاخواردووانی بەدبەختی بەردەم سوڵتانمانم دەکێشا، ژنە ئاوەزیاوەکەشم قامیشەکەی منی دەگرت.

ئەو جڤاتە دوو پەڕەییەی دەمنەخشاند، پێشانی دەدا ئەوانەی قەرزیان وەرگرتبوو و لەبەرئەوەی بۆیان نەدرابووەوە کەوتبوونە زیندان، لەگەڵ کەسوکاریاندا بەخێری سوڵتان ئازاد دەکران. کتومت وەک ئەوەی لەو تەدارەکەدا بینیبووم، سوڵتانم لە کەناری قالییەکی پڕ لە کیسەی ئاکچەی زیوین دانابوو. کەمێک لە دواتر، گەورەی دەفتەردارانم دانابوو و تۆمارەکانی قەرزم دابووە دەستی و لە دۆخی خوێندنەوەدا کێشابووم. سزادراوانی قەرزدارم کۆت لە مل و بەزنجیر پێکەوە بەستراو لە بەردەم سوڵتان لە ئێش و ئازاردا، برۆ و ڕوو گرژ کێشابوو و هەندێکیشیانم چاو بەگریان پێشان دابوو. کاتێک سوڵتان لە کیسەکانی بەردەمی پارەی ڕزگارکردنی ئەوانی لە زیندان دەدا، هەمووان بە شادمانی دوعایان دەکرد و شیعریان دەخوێندەوە. عوودژەن و تەمبوورڤانم بە ڕووخساری جوانەوە لە ڕەنگی سووردا کێشابوو و ئاوازیان بۆ ئاپۆڕەی بەختەوەران دەژەند. بۆ ئەوەشی ئازار و شەرمی نقومبوون لە قەرزدا بەباشی دەربکەوێت، بێ ئەوەی لە حسابدا بێت، لە تەنیشت دوایین زیندانیکراوی ناشادەوە، نیگاری ژنە جل مۆر و کوشتەی پەرێشانی و نیگاری کچە سەربەرگ سوور و قژ درێژ و خەمیگن و جوانەکەیم کێشابوو. بۆ ئەوەی تێ بگات نیگارکێشان بریتییە لە خۆشویستنی ژیان، لەوەدا بووم باسی چۆنیەتیی دابەشبوونی زیندانیکراوانی زنجیر لە پێ بەسەر دوو ڕووپەلدا، لۆجیکی شاراوەی

(*) مۆرە: ئامێرێک بووە سەردەمانی زوو لە بەردی ئەقیق یان لە گوێچکەماسی دروست کراوە و نیگارکێشان و خۆشنووسان بۆ سفتکردنی کاغەز بەکاریان هێناوە. – وەرگێڕ –



ڕەنگی سووری ناو نیگارەکە و نیگاری ئەو سەگەی بە ئەڤینەوە لە کەناردا کێشابووم، بۆ قەرەی ڕەزاگران بکەم. سەگەکەم بەهەمان ڕەنگی جلوبەرگی ئەتڵەسینی سوڵتان ڕەنگ کردبوو و ئەمەش شتێکی مەحاڵ بوو لەکن مامۆستایانی کۆن. ویستم ئەو قسانەی بۆ بگێڕمەوە کاتێک خۆم و ژنەکەم بەدەم پێکەنین و تریقانەوەوە لە نیگاری سەگەکەمان دەڕوانی و دەمانکرد، کەچی ئەو پرسیارێکی زۆر شوورەییی لێ کردم.

ئایا من دەزانم زەریف ئەفەندیی داماو لە کوێیە؟

نەمگوت کورە بەلەنگازی چی؟ لاساییکەرەوەیەک بوو پێنچ قروشی نەدەهێنا. بوودەڵەیەکی بێ سروش بوو و تەنیا بۆ پارە زەڕکاریی دەکرد. گوتم: "نەخێر، نازانم."

ئایا ئەقڵم بۆ ئەوە دەچێت چاوسوورەکانی دەوروبەری مەلای ئەرزەڕوومی خراپەیەکیان لەدژی زەریف ئەفەندیدا کردبێت؟

ددانم بەخۆمدا گرت و نەمگوت ئەویش یەکێکە لە ئەوان. گوتم: "نەخێر، بۆچی؟"

لەم شاری ئەستەنبوڵە، هۆی ئەو نەداری، پەتا، بێڕەوشتی و ڕەزالەتەی کۆتی دیلیی خستووەتە ئەستۆمان، جگە لە دوورکەوتنەوە لە ئیسلامی سەردەمی پێغەمبەرمان و دەستدانە دابی نوێ و دزێو و دزەکردنی شێوازی فەرەنگ بۆ ناومان، هیچی تر نییە. مەلای ئەرزەڕوومیش تەنیا هەمان شت دەڵێت، بەڵام دوژمنەکانی بەبیانووی ئەوەی موریدانی ئەرزەڕوومی پەلاماری تەکیەکانی شوێنی مۆسیقالێدان دەدەن و گۆڕی پیاوچاکان دەڕووخێنن، دەیانەوێت سوڵتان فریو بدەن. ئێستا لەبەرئەوەی ئەوان دەزانن من دوژمنایەتیی حەزرەتی ئەرزەڕوومی ناکەم، نیازیانە بە نەزاکەتەوە بڵێن ئەرێ تۆ زەریف ئەفەندیت کوشتووە؟

لەپڕ حاڵی بووم ئەم قسە و قسەڵۆکانە لەمێژە بەناو نیگارکێشاندا تەشەنەی کردووە. تاقمی بێ سروش و بێ هونەر و هیچ لە باردا نەبوو ئێستا وای بڵاو دەکەنەوە گوایە من سەردەستەی بکوژانی نامەردم. لە ناخەوە ویستم قوتووی مەرەکەبەکە بکێشم بە سەرە چەرکەزییەکەی ئەو قەرە بوودەڵەیەدا، چونکە درۆکانی ئەو نیگارکێشە دڵپیسانەی بە هەند وەرگرتبوو.

قەرە سەیری ژووری نیگارکێشانەکەی دەکردم و هەرچی دەیبینی، لە ئەقڵی خۆیدا

دەیهێشتەوە؛ بەوردی دەیڕوانییە مقەستە درێژە کاغەزبڕەکانم، قاپە پڕ لە زەرنیخەکان، جامەکانی بۆیاخ، ئەو سێوەی لە کاتی کاردا جاروبار قەپاڵێکم لێ دابوو، قاوەجۆشەکەم لەسەر کەناری ئاگردانەکە، فنجانەکانی قاوەم، نیمدەرەکان، ئەو تیرێژەی لە پەنجەرەوەکەوە دەهاتە ژوورەوە، ئەو ئاوێنەیەی بۆ تاقیکردنەوەی شێوەی ڕووپەلەکان بەکارم دەهێنا، قەڵەمدانەکانم و بالیفی سووری ژنەکەم. کاتێک لە دەرگا درابوو، ژنەکەم بەپەلەپرووزێ لە ژوورەکە دەرچووبوو و بالیفەکەی لێ کەوتبووە خوارێ و وەک تاوانێک لە گۆشەیەک کەوتبوو.

سەرباری ئەوەی بیر و بۆچوونی خۆشم لێ شاردەوە، ئەو نیگارانەی کێشابوومن و ئەم ژوورەی تیایدا دەژیام، ڕادەستی نیگا بێ پەروا و هێرشکارەکانی ئەو کرد: دەزانم، ئەم لووتبەرزی و کەش و فشەم هەمووتان تووشی سەرسوڕمان دەکات، بەڵام من زۆرترین پارەم دەست دەکەوێت و هەر خۆیشم باشترین نیگارکێشم، چونکە خوا ویستوویەتی نیگار کەیف و سەفا بێت تا پێشانی ئەوانەی بدات کە دەزانن بڕوانن، دنیاش سەفا و ڕابواردنە.



# 13

## پێم دەڵێن لەقلەق

کاتی نوێژی نیوەڕۆ بوو. لە دەرگا درا، کردمەوە و ڕوانیم قەرەی ناسیاوی سەردەمی منداڵیم بوو. یەکترمان لە ئامێز گرت. سەرمای بووبوو، هێنامە ژوورەوە و هەر لێشم نەپرسی چۆن ڕێی ماڵەوەی دۆزیوەتەوە. زاوای ئەوی ناردبووە کنم تا زمانم تاقی بکاتەوە بۆچی زەریف ئەفەندی ونە و داخۆ لە کوێیە؟ بەڵام هەر بەوەندەوە نەوەستابوو، لە مامۆستا عوسمانیشەوە هەواڵی هێنابوو و گوتی پرسیارێکم هەیە؛ "مامۆستا عوسمان دەڵێت زەمان، نیگارکێشی ڕەسەن لە ئەوانی تر جیا دەکاتەوە، زەمانی نیگار. تۆ ڕات چییە؟" گوێ ڕادێرن.

### نەخش و زەمان

وەک هەمووان دەزانن، نیگارکێشانی جیهانی ئێمەی عوسمانی، بۆ نموونە مامۆستایانی عەرەبیش، لە ڕابردوودا بەشێوەی تێڕوانینی ئەم ڕۆژگارەی گاورانی فەرەنگ بۆ دنیایان دەڕوانی و لە جێی خۆیانەوە، سەیری سەرسەری و سەگەلی کۆڵان و کەرەوزی سەر مێزی ناو دووکانیان دەکرد و نیگاری گشت شتێکیان دەکێشا. لەبەر بێ ئاگاییان لە شێوازی ڕوانگەی ئەمڕۆی مامۆستایانی فەرەنگ، ئەو شێوازەی بە شانازییەوە پەسنی دەدەن، دنیای نیگارکێشانی ئێمە بەڕادەیەک سنووردار و قەڵس بوو کە تەنیا سەگ و کەرەوزیان دەبینی. دواتر شتێک ڕووی دا و سەرلەبەری دنیای نیگارکێشیی ئێمەی گۆڕی. لەوێوە دەست پێ دەکەم و بۆتان دەگێڕمەوە.

## سێ بەسەرهاتی نەخش و زەمان

### ئەلیف

سێسەد و پەنجا ساڵ لەمەوبەر، ئەو دەمەی لە ڕۆژێکی ساردی مانگی شوباتدا بەغدا کەوتە دەستی مەگۆلەکان و بێ بەزەییانە تالان کرا، "إبن شاکر" بەناوبانگترین خۆشنووس و وەستای نەک هەموو دنیای عەرەب، بگرە گشت ئیسلام بوو. سەرباری تەمەنی کەمی، بیست و دوو بەرگ کتێبی دەستنووسی ئەو، زۆربەیان قورئانی پیرۆز بوون، لە کتێبخانەکانی لەسەر ئاستی دنیا ناسراوی بەغدا هەبوون. "إبن شاکر" لەبەرئەوەی باوەڕی وابوو کتێبەکانی تا قیامەت دەژین، بەبیرێکی قوڵ و ناکۆتای زەمانەوە دەژیا. سەربازەکانی هۆلاکۆی خاقانی مەگۆل بەچەند ڕۆژێک دانە بەدانەی کتێبەکانیان دڕاند، لەتوپەت کرد، سووتاند و فڕێیان دایە ئاوی دیجلەوە. ئەوەی لەم ڕۆژگارەدا پێی نازانرێت، "إبن شاکر" شەوێکی تەواو لەبەر تیشکی لەرزۆکی مۆم قارەمانانە بۆ دوایین کتێبی ئەم زنجیرە کتێبە ئەفسانەییە کاری کردبوو. لەبەرئەوەی ماوەی پێنج سەدە بوو پشتکردنە ڕۆژهەڵات و سەیرکردنی ئاسۆی ڕۆژئاوابوون تاکە ڕێگای مامۆستایانی خۆشنووسی عەرەبی پابەندانی باوەڕی داب و نەمریی کتێب بوو بۆ خۆپاراستن لە کوێربوون و بۆ حەواندنەوەی چاو، "إبن شاکر" بە فێنکیی بەیانی چووە سەر منارەی مزگەوتی خەلیفە و لە بانیژەی منارەوە هەموو ئەو شتانەی بینی کە کۆتاییی بە نەریتێکی نووسینی پێنجسەد ساڵە دەهێنا. یەکەم کەس، ئەو هاتنە ناوەوەی سەربازەکانی هۆلاکۆی بۆ ناو بەغدا بینی و لەسەر منارەکە مایەوە. تالان و وێرانکردنی سەرتاپای شار، کوشتنی سەدان هەزار کەس بە نووکی شمێشر، کوژرانی دوایین ئەو خەلیفانەی ئیسلام، کە ماوەی پێنجسەد ساڵ بوو لە بەغدا فەرمانڕەواییان دەکرد، دەستدرێژکردن بۆ سەر ئابڕووی ژنان، سووتاندنی کتێبخانەکان و فڕێدانی دەیان بەرگ کتێبی بۆ ناو ئاوی دیجلە بینی. دوای دوو ڕۆژ، کاتێک لەناو بۆنی لاشە و هاواری مردندا سەیری ڕەوتی دیجلەی دەکرد و بینی بەهۆی مەرەکەبی ئەو هەموو بەرگە کتێبەی فڕێ درابوونە ناوی، ڕەنگی سوور هەڵگەڕاوە، بیری کردەوە بەدەیان بەرگی کتێب لەوانەی خۆی بە هێڵی جوان نووسیبوونی و ئێستا فەوتابوون، بە کەڵکی پێشگرتن لەم کۆکوژی و



وێرانکارییە نەهاتن و سوێندی خوارد جارێکی تر هیچ نەنووسێت. لەوەش زیاتر، لە ناخەوە هەستی کرد دەبێت بەهونەری نیگارکێشی ئەو ئازار و کارەساتە دەربڕێ، ئەگەرچی تا ئەو ڕۆژەش نیگارکێشیی وەک یاخیبوون لە خوا دەبینی و بە چاوی نزمەوە بۆی دەڕوانی. هەر شتێکی لە منارەکەوە بینی، لەسەر کاغەزی بەردەستی نەخشاند و دواتر هەرگیز ئەو کاغەزانەی لێ جیا نەبوونەوە. ئەم پەرجووە بەختەوەرە تا سێسەد ساڵ دوای هێرشی مەغول هێز و گوڕی بە نیگاری ئیسلامی بەخشی و ئێمە قەرزداری ئەوین. ئەم پەرجووە بووە هۆی داهێنانی ئەو شتەی نیگاری ئیسلامیی لە نیگاری بتپەرستان و کرستیانان جیا دەکاتەوە: نیگاری ئیسلامی لە بەرزاییەوە، لەو شوێنەوەی خوا دنیای لێوە دەبینێت، بە کێشانی هێڵی ئاسۆ و بە ئازارێکی هەڵقوڵاو لە ناخەوە دەنەخشێندرێت. "إبن شاکر" دوای کوشتارەکە، بە نیگارەکانی دەستییەوە و بە تیشکی نەخش و نیگارەوە لە دڵیدا و بەمەبەستی ناسینی مامۆستایانی چینی ڕووی لە باکور کرد، لەو شوێنەی سوپای مەگۆلی لێوە هاتبوو... بەمجۆرە ئاشکرا بوو ئەو خولیای زەمانی بێ کۆتاییەی ماوەی پێنجسەد ساڵ بوو لە دڵی وەستایانی خۆشنووسی عەرەبدا بارگەی خستبوو، بە هێڵ نا، بە نیگار پێک دێت. بەڵگەی ئەمەش، لەتوپەتبوونی کتێب و بەرگەکانە، بەڵام پەڕە نیگاردارەکانی ناویان دەچنە کتێب و بەرگی ترەوە و بۆ هەتا هەتایە دەژین و لەسەر پێشاندانی دنیای خوادا بەردەوام دەبن.

### بێ

لە زەمانێکی هەم کۆن و هەم نوێدا کاتێک شتەکان خۆیان دووبارە دەکردەوە و لەبەرئەوەی ئەگەر پیربوون و مردن نەبوایە، مرۆڤ هیچ هەستی بەشتێک بەناوی زەمان نەدەکرد و دنیایش، وەک ئەوەی زەمان بەهیچ جۆرێک بوونی نەبێت، بەهەمان بەسەرهات و نیگار دەنەخشێندرا، وەک ئەوەی سالمی سەمەرقەندی لە مێژوونامەی کورتی خۆیدا گێڕاویەتییەوە، سوپای بچووکی فاخیر شا، سەربازەکانی سەلاحەدینی "پەرێشان" کرد. فاخیر شای سەرکەوتوو، دوای ئەوەی سەلاحەدین خان بەدیل دەگرێت و بە ئەشکەنجە بە کوشتی دەدات، وەک باو دەبێت، بۆ لێخستنی مۆری خۆی، وەک یەکەم کار سەر لە کتێبخانە و حەرەمسەرای خوا لێخۆشبوو

دەدات. بەرگ تێگرانی خاوەن ئەزموونی کتێبخانە، کتێبەکانی خانی مردوو لەتوپەت دەکەن، لاپەڕەکانی تێکەڵ بەیەکتر دەکەن و بەرگی نوێ دروست دەکەن. خۆشنووسانی کتێبخانە، ناوی سەلاحەدین خانی "هەمیشە سەرکەوتوو" لە نووسراوەکان دەردەهێنن و دەیگۆڕن بەناوی فاخیر شای "سەرکەوتوو". نیگارکێشانیش لە جوانترین نیگاری کتێبەکاندا ڕووی وەستایانە کێشراوی خوا لێخۆشبوو سەلاحەدین خان، کە لە ئێستاوە تۆزی لەبیرچوونی لێ نیشتبوو، دەسڕنەوە و لە جێی ئەو دەست دەکەن بەکێشانی نیگاری ڕووی گەنجانەتری فاخیر شا. کاتێک فاخیر شا دەچێتە حەرەمسەرا، لە دۆزینەوەی دەستبەجێی جوانترین ژندا هیچ دژواری نابینێت، بەڵام لەبەرئەوەی پادشایەکی بەنەزاکەت دەبێت و سەر لە نووسین و نیگار دەر دەکات، بڕیار دەدات بەزۆر خۆی نەکات بە خاوەنی، بگرە لە دڵەوە قایلی بکات و بۆ ئەو مەبەستە دەیدوێنێت. بەمجۆرە، نەریمان سوڵتانی جوانی جوانان و ژنی چاو بەگریانی سەلاحەدین سوڵتان، تەنیا داوای یەک شت لە فاخیر شای مێردی داهاتووی دەکات. لە کتێبێکی بەسەرهاتی لەیلا و مەجنووندا، نەریمان لە جێی لەیلا کێشرابوو و لە بەرامبەریشی، وێنەی ڕووخساری مێردی خوا لێخۆشبووی لەبری مەجنوون کێشرابوو. نەریمان سوڵتان داوا دەکات ڕووی سەلاحەدین خان لەو نیگارەدا نەسڕێتەوە. دەخوازێت ئەو مافی نەمرییەی مێردەکەی سالانێکی درێژ هەوڵی دابوو لە ڕێی کتێب دروستکردنەوە بەدەستی بخات، هیچ نەبێت لە ڕووپەلێکدا بە خوا لێخۆشبوو ڕەوا ببینرێت. فاخیر شا جوامێرانە ئەم داخوازە سادەیە پەسەند دەکات و نیگارکێشان تەنیا دەست بۆ ئەو نیگارە نابەن. بەوجۆرە، نەریمان و فاخیر شا یەکسەر دەچنە جێگاوە و لە ماوەیەکی کورتدا دڵیان دەچێتە یەکدی و ترسناکی و کارەساتی ڕابردوو لەبیر دەکەن. بەڵام فاخیر شا ناتوانێت ئەو نیگارەی لە شێوەی لەیلا و مەجنووندایە، لەبیر خۆی بباتەوە. ئەو شتەی ئۆقرەی لێ بڕیبوو، کێشانی نیگاری ژنەکەی لەگەڵ مێردی پێشوویدا یان دڵ لێ پیسکردن نەبوو، نەخێر. ئەوەی هەناوی ئەمی کرمێ کردبوو، لەبەرئەوەی لەو کتێبە شاهانەیە و لە داستانی کۆندا نیگاری نەکێشراوە، نەدەگەیشت بە زەمانی هەتاهەتایی و تێکەڵ بە نەمران نەدەبوو. پاش پێنج ساڵ نالاندن بەدەست ئەم



گومانەوە، فاخیر شا لە کۆتاییی شەوێکی کامەراندا و دوای چەندین جار جووتبوون لەگەڵ نەریماندا، مۆمدان بە دەستەوە دەگرێت و بە نهێنی و وەک دز دەچێتە کتێبخانەی خۆی. کتێبی لەیلا و مەجنون دەکاتەوە و لە جێی نیگاری ڕووخساری مێردی خوا لێخۆشبووی نەریمان، دەست دەکات بە کێشانی نیگاری ڕووی خۆی و خۆی دەخاتە جێی مەجنوون. بەڵام وەک زۆربەی ئەو خانانەی حەزیان بە نیگار دەکرد، ئەمیش نیگارکێشێکی نەزان دەبێت و نیگاری ڕووی خۆی بەباشی ناکێشێت. بەوجۆرە، کتێبدار لە ڕووی گومانێکەوە کتێبەکە دەکاتەوە و لە بەرامبەر نیگاری نەریمان بە ڕووخساری لەیلاوە، ڕووێکی تر لەبری ڕووی سەلاحەدین خانی خوا لێخۆشبوو دەبینێت. بەڵام ڕادەگەیەنێت ئەم ڕووخسارە هی فاخیر شا نا، بگرە ڕووی عەبدولا شای چەلەنگ و دوژمنی قەستەسەری فاخیر شایە. ئەم واتەواتە، هەروەک چۆن ورەی سەربازەکانی فاخیر شا دەڕووخێنێت، بوێریش دەداتە بەر عەبدولا شای گەنج و هێرشکاری فەرمانڕەوای نوێی وڵاتی هاوسێ. ئەویش لە یەکەم هەڵمەتی شەڕدا، فاخر شا تێک دەشکێنێت، بەدیل دەیگرێت و فەرمانی کوشتنی دەدات. مۆری خۆی لە حەرەمسەرا و کتێبخانەکەی دەدات و دەبێت بە مێردی نەریمانی هەردەم شۆخ و جوان.

## جیم

چیرۆکی ئەو نیگارکێشەی لە ئەستەنبوڵ بە ئوزوون مەمەد و لە وڵاتی عەجەم بە محەمەدی خوراسانی ناسراوە، بەزۆری لەناو نیگارکێشاندا وەک پەند لێ وەرگرتن بۆ تەمەن و کوێری دەگەڕێتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا بەسەرهاتی نەخش و زەمانە. ئەگەر مرۆڤ سەرنج لەم نیگارکێشە بدات، کە بە نۆ ساڵی وەک شاگرد دەستی بە پیشەی خۆی کردووە، دەبینێت گەورەترین تایبەتمەندیی ئەو مامۆستایەی نزیکەی سەد و دە ساڵ بەر لە کوێربوونی نیگاری کێشاوە، ناتایبەتمەندییە. لێرەدا مەبەستم نییە گەمە بە وشە بکەم، بە پیاهەڵدانێکی هەڵقولاو لە دڵەوە دەدوێم. وەک هەموو کەسێک، نیگاری هەموو شتێکی بەزۆری لەسەر شێوازی مامۆستایانی کۆن دەکێشا و لەبەر ئەم هۆیەش گەورەترین مامۆستا بوو. وەک خزمەتێک بۆ خوا سەیری پیشەی نیگارکێشیی دەکرد و خاکیبوون و بێفیزی و پابەندبوونی تەواوی بە پیشەکەیەوە

ئەوی لە شەڕوشۆڕی ناو هەموو ئەو نیگارخانانەی ئەم کاری تێدا دەکرد، پاراست و سەربـاری لەباربوونی تەمەنیشی، لە ئارەزووی بوون بە گەورەی نیگارکێشان دووری خستـەوە. بەدرێژاییی ژیانی نیگارکـێشـیی خـۆی، لە مـاوەی سـەد و دە سـاڵاندا، نیگاری وردەکـاریی پاشـمـاوەی کـەنارەکـان، گـیا بۆ پڕکردنەوەی دامـێن و لێـواری پەڕەکـان، هـەزاران گـەڵای داران، پـەڵەی هـەور، یاڵی ڕەوە ئەسپی تاڵ تاڵ شـانەکراو، خـەمـڵی دیواری خـشـتی سـوور و دیواری تری لە ژمـارە نەهاتـوو و دووبارەوە بوو، چاوی بادەمی، چەناگەی باریک و دەیان هـەزار ڕووی هاوشێوەی بە هێمنی کێشا. زۆر کـامـەران و فـرە بێـدەنگ بوو. هـەرگـیـز هـەوڵـی نەدا سنگ دەرپەڕێنێت و داوای شـێـواز و کـەسـایـەتیـشـی لێ نەبیـسـترا. هـەر کـاتێک لە نیگارخـانەی هـەر خـان و شـازادەیەکدا کاری بکردایە، ئەوێی بە مـاڵی خـۆی و خـۆیشی بە کاڵای ناو ئەو مـاڵە دەزانی. کاتێک خـان و شـاکـان دەکەوتنە کوشـتاری یەکدی و نیگارکێشـانیش وەک ژنانی حـەرەمـسـەرا لەم شـارەوە دەچوونە لای سـەردارێکی نوێ لە شـارێکی تردا، شێوازی نیگارخـانەی نوێ سەرەتا لە گەڵا، چیمـەن، پێچاوپێچی تاوێر و لە شـەپۆلی شـاراوەی پشـوودرێژیی ئەودا دەردەکەوت. کـاتێک تەمـەنی گـەیشـتـە هەشـتـا، مـردنی لەبیـر کـرا و خـەڵکی باوەڕیان وابوو لەو داسـتـانـانـەدا دەژی کـە خـۆی نیگاریان دەکێشێت. ڕەنگە لـەم سۆنگـەیـەوە بووبێت هـەندێک کـەس پێیان دەگـوت ئەو ئیدی لە دەرەوەی زەمانە و لەبەرئەوەش هـەرگیز پیر نابێت و نامرێت. سـەرباری بێ مـاڵی و بێ هـەواری و ژیانی ناو ژووری نیگارخانـەکان و شـەوبەدەریی ناو چادران و بەسـەربردنی زۆربەی کـات بەدەم سـەیرکردنی کـاغـەزەوە، دواجـار کـوێر نـەبوو. کـەسـانێک هـەبوون ئەمـەیان وەک پەرجووی ڕاوەسـتـانی زەمان بۆ لێک دەدایـەوە. بڕێکی تریش دەیانگوت خۆی لە ڕاستیدا کوێر بووە، بەڵام لەبەرئەوەی نیگاری گشت شتێک لەبەر دەکێشێت، ئیدی پێویسـتی بە بینین نەماوە بۆ نیگارکێشـان. ئـەم مامۆسـتـا ئەفسانەییـیـە هـەرگیز ژنی نەهێنابـوو و خـەنجـەری نێوان لنگانی لە کـالان دەرنەهێنـابوو. کـاتێک لە سـەد و نۆزدە سـاڵیی خـۆیدا لـە نیگارخـانـەی شـا تەهمـاسپ چـاوی دەکـەوێت بە شـاگـردێکی شـازدە سـاڵانی جوان و بەدەوی دووڕەگـی نیو چینـی و نیو کرواتی لە شێوەی ئەو لاوە لوس و جـوان و چاومـاسـی و چەنـاگـە درێژ یـان ڕوو لە مـانگ چووانەی سـەد سـاڵی ڕەبەق بوو نیگاری دەکـێـشـان و مـافی خـۆی بوو عـاشـقی بێت. بۆ ڕامکردنی ئەم





شـاگردە منداڵ و لە ڕادەبەدەر جـوانـە، وەک ئەوەی ئەڤینداریکی ڕاسـتـەقـینە دەیکات، خووی دایە شـەڕی دەسـەڵاتی نێـوان نیگارکێشـەکان، درۆکردن، لەخشتـەبردن و فێڵ و تەڵەکـەبازی. هـەرچەندە هـەوڵدان بۆ گـەیشـتن بە خـواسـتـەکانی دنیـا کە سـەد سـاڵ بوو توانیـبـووی خـۆی دوور بگرێت لێـیـان، دەسـپـێـک ڕۆحـی نەمـریی بە مـامـۆسـتـای نیگارکێشی خوراسانی بەخشیبوو، بەڵام لە زەمـانی هەتاهەتاییی داستانە کۆنەکان دابڕا. ئێـوارە وەختـێک، لە دەمێکدا لەبـەر پەنجـەرە چەقیبـوو و بەدەم داڵغەوە سـەیری شـاگـردی شـۆخـی دەکرد. بای سـاردی تەورێز زەفـەری پـێ برد و ڕۆژی دواتر بەدەم پژمـینەوە کـوێر بوو. دوای دوو ڕۆژی تریش لە پلیکانەی بەردینـی بەرزی نیگارخـانە کەوتە خوارەوە و مرد.

قەرە گوتی: "مـن ناوی ئوزوون محـەمـەدی خوراسـانیم بیسـتووە، بەڵام ئـەم چیرۆکەم بەرگوێ نە کەوتووە."

ئەم قسـانەی بەنەزاکەتەوە کرد بۆ ئەوەی پێشانی بدات بەسـەرهاتەکە تەواو بووە و سـەری پڕ بووە لەو قسـانەی من گێڕاومەتەوە. کەمێک بێدەنگ بووم بۆ ئەوەی تێر و پڕ بۆم بڕوانێت. لەبـەرئەوەی کـاتێک دەسـتـەکـانم بەتاڵ بن، ئـۆقـرەم لێ دەبڕێت، دەسـتـبـەجێ دوای دەسـتکردن بە گـێـڕانەوەی بەسـەرهاتی دووەم، دەسـتم دابووە تەواوکردنی ئەو نیگارەی لە کاتی لێدانی دەرگادا دەستم لێ هەڵگرتبوو. مەحمـوودی شـاگردی جـوانکیلەم، کە هـەمـیشـە لەبەر پێم دادەنیشێت، بۆیاخـەکانم تێک دەدات و نووکی قـەڵەمـەکـانم تیژ دەکـات و جـاروبار هـەڵـەکانم دەسـڕێتـەوە، لە تەنیـشـتـمـەوە دانیـشـتـووە، هـەم سـەیر دەکـات و هـەم گـوێی ڕاگـرتـووە. لە ژووریشـەوە دەنگی خشـەخشـی ژنەکەم دێت.

قەرە گوتـی: "ئـۆی، سوڵتان هـەستاوەتە سەرپێ."

کـاتێک ئەو بە سـەرسـوڕمـانەوە سـەیری نیگارەکـەی دەکرد، من خـۆم وا نواند وەک ئەوەی گرینگی بە هۆکاری سـەرسوڕمـانەکەی نەدەم، بەڵام توخوا با ڕاست و ڕەوان خۆم پێتان بڵـێم: لە تەدارەکی خەتەنەسوورانـدا، کە ئێمە نیگارەکانیمان بۆ جەژننامە کێشـابوو، سـوڵتـانی باڵامـان لە پەنجـەرەی خـوار ئەو شـانشـینەی جێی خـۆی تێدا گـرتووە، مـاوەی پەنجـا و دوو ڕۆژ سـەیری بـازرگـانـان، نوێنـەرانی پیـشـەکـاران،

جەماوەر، سەرباز و چەتە و ڕێبڕان دەکات و لە دووسەد نیگاردا بە دانیشتوویی دەبینرێت. تەنیا لەم نیگارەدا نەبێت لە دۆخێکدا کێشاومە هەستاوەتە سەرپێ و لە کیسەی پڕ لە فلۆرینەوە پارە بەسەر ئاپۆڕەی مەیدانەکەدا دەڕژێنێت. ئەمەشم بۆیە کرد بۆ ئەوەی سەرسامی و شادمانیی ئەو ئاپۆڕەیە پێشان بدەم کە بۆ گرتنەوەی پارە دەستیان دەخستە بینەقاقای یەکتر و بە مستەکۆڵە و شەق دەکەوتنە گیانی یەکتر و لە کاتی کۆکردنەوەی پارەدا ڕووی قوونیان لە ئاسمان دەکرد.

گوتم: "ئەگەر لە بابەتی نیگارێکدا ئەڤین هەبێت، ئەوا پێویستە نیگارەکەش بە ئەڤینەوە بکێشرێت. خۆ ئەگەر ئازاری تێدا بێت، ئەوا دەبێت ئازاری لێ بچۆڕێت. بەڵام ئازارەکە لە کەسانی ناو نیگارەکەوە، یان لە فرمێسکی ئەوانەوە نا، بگرە دەبێت لە پێکهاتەی ناوەکیی نیگارەکەوە، کە لە یەکەم بینینی نیگارەکەدا نابیندرێت، بەڵام هەستی پێ دەکرێت، بێتە دەرێ. هەرچەندە من نەهاتووم وەک ئەو سەدان مامۆستایەی چەندین سەدەیە نیگار دەکێشن، نیگاری کەسێک بکێشم پەنجەی دۆشاومژەی نابێتە دەمی خڕی، بەڵام کارێکی وام کردووە هەموو کەسێک بەم نیگارە سەرسام بێت. ئەمەش بە هەستاندنە سەرپێی سوڵتان پێک دێت."

بۆ ئەوەی سەرەداوێکی دەست بکەوێت، سەیری شتومەک و کەرەسەی نیگارکێشی و لە ڕاستیدا هەموو ژیانمی کرد و منیش لە چاوی ئەوەوە ژیانی خۆم بینی.

ئەها سەردەمانێک جۆرە نیگارێکی کۆشک و گەرماو و قەڵای لە تەورێز و قەزوین کێشراو هەبوو؛ بۆ ئەوەی نیگاریش هاوتەریبی سەرنجی خوای مەزن و بینەر و بیسەری هەموو شتێک بێت، نیگارکێشان نیگاری کۆشکیان وەک ئەوەی بە پەرجوویێک لە ناوەڕاستدا بە گوێزان لەت کرابێت، بە هەموو شتومەکانی ناوییەوە، لە قاپ و قاچاخەوە بگرە بۆ پەرداخ، نەخش و ڕازاندنەوەی سەر دیوارەکان، کە بە هیچ جۆرێک لە دەرەوە نەدەبیندران، پەردە، تووتیی ناو قەفەس، نهێنیترین گۆشەکان و سەرین و شۆخانی دانیشتووی پاڵ سەرین، کە هێشتا هەتاو لە ڕوویان نەکەوتبوو، دەکێشا. وەک ئەوەی خوێندەوارێکی بەپەرۆش بەسەرسامییەوە سەیری ئەو نیگارە بکات، قەرەش دەیڕوانییە بۆیاخەکانم، کاغەزەکانم، کتێبەکانم، شاگردە جوانکیلەکەم، پەڕەکانی ئەو پۆشاکنامە و دەفتەری نیگارەی بۆ گەڕیدەکانی فەرەنگم



دروست کردبوون، چەند نیگارێکی ساتی گان و سەرجێییکردن، کە بەدزی و پەلەپرووزێ بۆ پاشایەک کێشابووم، ڕووپەلی بێ ئابروو، قوتووی مەرەکەبەکانم لە ڕەنگی شووشە و برۆنز و خاک، قەڵەمتاشەکانی لە ددانی فیل دروستکراوم، قەڵەمە دەسکزێڕینەکان و نیگای شاگردە جوانکیلەکەم.

بۆ پڕکردنەوەی بێدەنگییەکە بە هەبوونی خۆم، گوتم: "من، بەپێچەوانەی مامۆستایانی کۆنەوە، زۆر شەڕم بینیووە. زۆر ئامێری شەڕ، تۆپ، سوپا و کوژراوانم بینیوە. من بنمیچی چادری شەڕی سوڵتانمان و پاشاکانم دەنەخشاند. دوای گەڕانەوەشمان لە شەڕەوە بۆ ئەستەنبوڵ، هەر خۆم نیگاری دیمەنەکانی شەڕم دەکێشا و کەسانی تر لە بیریان دەکرد. نیگاری جەستەی دوولەتکراو، تێکڕژانی سوپاکان، سەربازانی بێچارەی گاور کە بەترسەوە لە قەڵا گەمارۆدراوەکانەوە سەیری سوپا و تۆپەکانی ئێمەیان دەکرد، یاخیبوانی سەرپەڕێندراو و جۆشی ئەو ئەسپانەم دەکێشا کە بە چوارناڵە هێرشیان دەبرد. هەر شتێک دەبینم، لە هۆشمدا دەمێنێتەوە: ئاشێکی نوێی قاوە، ئەڵقەی پەنجەرەیەکی پێشتر هەرگیز نەدیتووم، تۆپێک، پەلەپیتکەی چەکێکی نوێی فەرەنگی، لە سەردانێکدا کێ جلی لە کام ڕەنگی پۆشیوە، کێ چی خواردووە، کێ دەستی لە کوێ و چۆن داناوە..."

قەرە بە خۆپێشاندانەوە وەک ئەوەی هەموو شتێک کورت بکاتەوە و کەمێکیش حەسێب لە من بخوازێت، پرسی: "چ پەندێک لەو سێ بەسەرهاتەدا هەیە کە گێڕاتەوە؟"

گوتم: "ئەلف، بەسەرهاتی یەکەم، ئەوەی منارەکەی تێدایە، پێشانی دەدات هونەری نیگارکێش هەرچییەک بێت با ببێت، زەمان نیگاری بێ کەموکورتی دەکێشێت. بێ، بەسەرهاتی دووەمی حەرەمسەرا و کتێب، پێشانی دەدات هونەر و نیگار تاکە ڕێگایە بۆ چوونە دەرەوە لە زەمان. کەوابوو تۆش سێیەمیان بڵێ."

قەرە بەمتمانە بەخۆبوونەوە گوتی: "جیم، بەسەرهاتی سێیەمی نیگارکێشە تەمەن سەد و نۆزدە ساڵەکە، ئەلف و بێ دەکات بەیەک و ئەوەی لە ژیان و نەخشی بێ کەموکورتی دابڕێت، تەواو دەبێت و دەمرێت، ئا ئەمە پێشان دەدات."

# 14

## پێم دەڵێن زەیتوون

دوای نوێژی نیوەڕۆ بوو؛ کاتێک خێرا خێرا، بەڵام بەزەوقەوە نیگاری ڕووی کوڕانی جوانکیلەم دەکێشا، لە دەرگا درا. لەبەر خرۆشان دەستم دەلەرزی، دەستم لە قەڵەم هەڵگرت. تەختەی کارەکەی باوەشم بەدزواری و بەوردی لە تەنیشتەوە دانا و وەک ئەوەی بفرم، ڕام کرد و پێش ئەوەی دەرگا بکەمەوە، کەمێک پاڕامەوە: خوای خۆم... ئێوەی بیسەرانی قسەکانی من لەنێو ئەم کتێبەوە، لەبەرئەوەی زۆر لە خواوە نزیکترن وەک لەم دنیا قرێژ و پەرێشانەی ئێمە و کۆیلە نامەردەکانی سوڵتانمانەوە، لێتان ناشارمەوە: دەگوترێت پادشای هندستان، ئەکبەر خانی دەوڵەمەندترین پادشای دنیا، کتێبێک بەدروستکردن دەدات و چاوەڕێ دەکرێت ببێتە ویردی سەر زمان. هەواڵی ناردووە بۆ هەر چوار لای وڵاتی ئیسلام بۆ ئەوەی دەستڕەنگینترین نیگارکێشانی دنیا بچنە کن وی. ئەو پیاوانەی بۆ ئەستەنبوڵی ناردوون، دوێنێ هاتنە لام و منیان بۆ وڵاتی هندستان بانگهێشتن کرد. دەرگام کردەوە، ئەمجار ئەوان نەبوون، قەرە بوو. لە سەردەمی منداڵییەوە لەبیرم کردبوو. جاران نەیدەتوانی تێکەڵمان بێت، ئیرەیی پێ دەبردین. بەڵێ؟

بەمەبەستی دەمەتەقێ و دۆستایەتی و بینینی نیگارەکانم هاتووە. فەرمووم لێ کرد بۆ ئەوەی هەموو شتەکانم ببینێت. تازەش دەستی مامۆستا عوسمانی گەورەی نیگارکێشانی ماچ کردبوو. مامۆستای مەزن قسەیەکی گەورەی پێ گوتووە: نیگارکێشی ڕەسەن بەوەدا دەناسرێتەوە کاتێک لەمەڕ کوێری و بیرەوەری دەدوێت. دە ئەوجا تێ بگەن:



### کوێری و بیرەوەری

پێش نیگار تاریکییەک هەبوو و دوای نیگاریش تاریکییەک دەبێت. بە بۆیاخ و هونەر و ئەڤینی خۆمان ئەو شتانەی خوا دەڵێت "بیبینە"، بیر دەخەینەوە. بیرکەوتنەوە بریتییە لە زانینی ئەوەی کەوا دەیبینی. زانینیش بریتییە لە بیرکەوتنەوەی ئەوەی دەیبینی. بینین، زانینی بێ بیرکەوتنەوەیە. کەواتە نیگارکێشان بیرهێنانەوەی تاریکییە. ئەڤینی نیگارکێشیی مامۆستایانی گەورە دەزانێت ڕەنگ و بینین لە لە تاریکییەوە دەئافرێن، بۆیە دەیەوێت بە ڕەنگەوە بۆ تاریکاییی خوایی بگەڕێتەوە. ئەوەی بیرەوەریی نەبێت، نە خوای بیر دەکەوێتەوە و نە تاریکاییی خوایی. سەرجەم مامۆستایانی گەورە، لە نیگار و ڕەنگەکانی خۆیاندا بەدوای ئەو تاریکاییییە قوڵەی دەرەوەی زەماندا دەگەڕێن. داکو تێ بگەن بیرهێنانەوەی ئەم تاریکییەی داهێنراوی گەورە وەستایانی کۆنی هەرات چ دەگەیەنێت، وا بۆتان دەگێڕمەوە.

### سێ بەسەرهاتی کوێری و بیرەوەری

#### ئەلف

لە دەقی تورکیی "نفاهة الإنس"دا، کە جامیی شاعیر بەسەرهات و چاکەی پیاوچاکانی تێدا نووسیوە و لامیع چەلەبی وەری گێڕاوەتە سەر زمانی تورکی، نووسراوە شێخ عەلی تەورێزیی بەناوبانگ لە نیگارخانەی جیهان شای فەرمانڕەوای قەرەقۆیونلو، دانەیەکی دانسقەی لە کتێبی شیرین و خەسرەو کێشاوە. نووسین و ئامادەکردنی ئەم کتێبە دە ساڵی خایاندووە و وەک بیستوومە، مامۆستای مامۆستایان شێخ عەلی هونەرێکی وای تێدا پێشان داوە و پەڕەی نایابی ئەوتۆی ڕازاندووەتەوە کە مەگەر هەر لە دەستی بەهزادی هەرە مەزنی مامۆستایانی کۆن بێت. کتێبەکە هێشتا لە نیوەدا بووە جیهان شا تێ گەیشتووە وا خەریکە دەبێت بە خاوەنی کتێبێکی شاهانەی بێ هاوتا و بێ وێنە لە دنیادا. جیهان شای قەرەقۆیونلو ئۆزوون حەسەنی فەرمانڕەوای لاوی ئاکقۆیونلوی وەک دوژمنی خوێنخۆری خۆی ڕاگەیاندبوو و هەم لێی دەترسا و هەم دڵی لێ پیس کردبوو. زۆر بیری لەو هەیبەتە

کردووەتەوە کە لە دوای تەواوبوونی ئەم کتێبە شاهانەیە دەستی دەکەوێت و لەپڕ بەخەیاڵیدا هاتووە دەشێت دانەیەکی باشتر لەبەر کتێیبەکە بۆ ئوزوون حەسەنی ئاکقۆیونلو بگیرێتەوە. ئەو، لەبەرئەوەی کەسێک بوو لەو دڵپیسە ڕاستەقینانەی بە ختوورەی "باشە چی ئەگەر ئەوانی تریش بەختەوەر بن؟" بەختەوەریی خۆیان ژەهراوی دەکرد و دەستەجێ هەستی کردووە ئەگەر مامۆستای نیگارکێش دانەیەکی باشتر لەم کتێبە ئامادە بکات، ئەوا بۆ ئوزوون حەسەنی باوەکوشتەی ئەمی دەکات. بەمجۆرە، بۆ ئەوەی لە خۆی زیاتر کەسی تر نەبێت بە خاوەنی ئەم کتێبە دانسقەیە، بڕیار دەدات لەگەڵ تەواوبوونی کتێبەکە، مامۆستای نیگارکێش شێخ عەلی بکوژێت. بەڵام شۆخێکی چەرکەزیی دڵنەرم لە حەرەمسەراکەی بیری دێنێتەوە و پێی دەڵێت کوێرکردنی وەستای نیگارکێش بەسە. جیهان شا ئەم بڕیارە درەوشاوەیە پەسەند دەکات و بۆ چاپلووس و لێبووکەکانی دەوروبەری خۆیشی دەدرکێنێت و لەوانیشەوە دەگاتەوە بەرگوێی مامۆستای نیگارکێش شێخ عەلی، بەڵام ئەو لاسایی نیگارکێشانی سادە ناکاتەوە و لە نیوەدا دەست لە کتێبەکە هەڵناگرێت و لە تەورێز نارِوات. بگرە بیر لەوەش ناکاتەوە بۆ دواخستنی کوێرکردنی، پەنا بۆ ڕێبازی وەک سستکردنەوەی ئامادەکردنی کتێبەکە، یان کێشانی نیگاری خراپ ببات بەمەبەستی ئەوەی کەموکورتیی تێ بخات. بەشەوق و باوەڕێکی بەهێزترەوە لە ڕابردوو کار دەکات. لە ماڵێکدا بەتەنیا، لە دوای نوێژی بەیانییەوە دەست بە کار دەکات، تا نیوەشەو کاتێک لەبەر ڕۆشنایی مۆمدان فرمێسکی ئازار لە چاوانی ماندووی دەرژێت، بێ هەدادان نیگاری هەمان ئەسپ، دار سنەوبەر، ئەڤینداران، ئەژدیها و شازادەگەلی شۆخ و بەدەو دەکێشێت. زۆربەی جاران، چەندین ڕۆژ سەیری پەڕەیەکی دەستکردی گەورە مامۆستایانی دێرینی هەرات دەکات، لەولاشەوە لەسەر کاغەزێکی تر، بێ ئەوەی سەیر بکات، هەمان نیگار کتومت وەک خۆی دەکێشێتەوە. دواجار کتێبەکە بۆ جیهان شای قەرەقۆیونلو تەواو دەکات، وەک مامۆستای نیگارکێش پێشبینیی کردبوو، سەرەتا ستایش دەکرێت و لە زێڕدا نقوم دەکرێت. پاشان بە دەرزییەکی پەڕەمووچی نووک تیژ چاوی کوێر دەکرێت. شێخ عەلی چاوەڕێی بڕانەوەی ئازاری چاوەکانی ناکات، یەکسەر لە هەرات دەڕوات و دەچێتە



کن ئوزوون حەسەنی فەرمانڕەوای ئاکقۆیونلو. دەڵێت: "بەڵێ، کوێرم، بەڵام گشت جوانییەکانی ئەو کتێبەی دەساڵی ڕابردوو سەرقاڵی نەخشاندنی بووم، لە هەر قەڵەم پێداهێنانێکەوە بگرە بۆ هەر فڵچە ڕاکێشانێک، لە بیرەوەریمدایە و بێ ئەوەی توانای بینینم هەبێت، دەستم دەزانێت لەبەر بیانکێشێت. خاقانم، دەتوانم جوانترین کتێبێکی بێ وێنە لە دنیادا بۆ تۆ بنەخشێنم. لەبەرئەوەی چاوەکانم چی دی کاتی خۆی بەسەیرکردنی قڕێژیی ئەم جیهانەوە بەفیڕۆ نادات، دەتوانم بەهەموو جوانییەکانی خواوە لە بیرەوەریمدا، بە ڕوونترین شێوە نیگار بکێشم." ئوزوون حەسەن دەمودەست بڕوا بە مامۆستای گەورەی نیگارکێش دەکات، مامۆستاش پابەندی بەڵێنی خۆی دەبێت و شاهانەترین کتێبی هەموو سەردەم و ڕۆژگارێک بۆ خاقانی ئاکقۆیونلو دروست دەکات. دواتر، کاتێک ئوزوون حەسەنی ئاکقۆیونلو لە هەڵمەتێکدا لای بینگۆڵ، جیهان شای قەرەقۆیونلو دەبەزێنێت و دەیکوژێت، هەموو کەسێک دەزانێت هێزی مانەویی کتێبە تازەکە لە پشت خاقانی سەرکەوتووەوە بووە. کاتێک ئوزوون حەسەنی سەرکەوتوو لە شەڕی ئۆتلوکبەلی لە بەرامبەر خوا لێخۆشبوو فاتیح سوڵتان محەمەد خان تێک شکا، ئەم کتێبە دانسقەیە و ئەوەی پێشووتریش کە شێخ عەلی تەورێزی بۆ خوا لێخۆشبوو جیهان شای دروست کردبوو، خرایە گەنجینەی سوڵتانمانەوە. ئەوانەی بینیویانە، دەیزانن.

## بێ

سوڵتان سلێمان خانی قانوونیی بەهەشتنشین بایەخی زیاتری بە خۆشنووسان دەدا، بۆیە نیگارکێشانی بەدبەختی سەردەم وەک نموونەی ئەوەی نیگار لە هێل گرینگترە، ئەم بەسەرهاتەیان گێڕاوەتەوە و منیش لێرەدا بۆ ئێوەی دەگێڕمەوە. بەڵام وەک ئەوەی گوێگری باش هەستی پێ دەکات، مژار لەبارەی کوێری و بیرەوەرییەوەیە. هەرچەندە کوڕان و نەوەکانی تەیموری فەرمانڕەوای جیهان دوای مردنی ئەو، کەوتنە گیانی یەکتر و بێ بەزەییانە لەدژی یەکدی شەڕیان کرد و شارانی یەکتریان داگیر کرد، یەکەم کاریان بریتی بوو لە لێدانی سکەی پارە و خوێندنەوەی وتاری هەینی بەناوی خۆیان. دووەم کاریشیان بریتی بوو لەوەی هەرچی کتێبێکی لای یەکتر دەستیان بەسەردا گرتبوو، لەوتوپەت کرد، نووسین و دەستەواژەی نوێی

"فەرمانڕەوای جیهان"یان خستە سەر و سەرلەنوێ بەرگیان تێ گرتنەوە. ئامانجیش ئەوە بوو کاتێک بینەر سەیری کتێبی ئەو دەسەڵاتدارە دەکات، باوەڕ بکات فەرمانڕەوای جیهانە. کاتێک عەبدول لەتیفی کوڕی ئولوغ بەگی نەوەی تەیموور دەست بەسەر هەراتدا دەگرێت، بەمەبەستی دروستکردنی کتێبێک لەسەر ناوی باوکی، نیگارکێش و خۆشنووس و بەرگ تێگران دەخاتە سەفەربەرێکی ئەوەندە خێراوە و هێندە پەلەیان لێ دەکات تا کار دەگات بەوەی نیگاری وەرگیراو لە بەرگە لەتوپەت کراوەکان و پەڕە نووسراوەکان دەدڕێندرێن و دەسووتێن و تێکەڵ بەیەک دەبن. لەبەرئەوەی بەرگ تێگرتنی هەڕەمەکییانەی نیگارەکان و دروستکردنی دەفتەری نیگار بێ گوێدانە ئەوەی کام کتێب پارچەی کام داستانە، بۆ شان و شەوکەتی ئولوغ بەگی نیگارپەروەر جوان نەبوو، کوڕەکەی، هەموو نیگارکێشانی هەراتی کۆکردەوە و داوای لێ کردن بەسەرهاتی نیگارەکان بگێڕنەوە داکو بتوانرێت ڕیز بکرێن. بەڵام لەهەر سەرێکەوە بەسەرهاتێک دەردەچێت و نیگارەکان هێندەی دی تێکەڵ بەیەکتر دەبن. ئەمجار دەکەونە منەکردنی دوایین گەورەی نیگارکێشانی پیر، ئەو نیگارکێشەی پاش نەخشاندنی کتێبی سەرجەم شا و شازادەکانی فەرمانڕەوای پەنجا و چوارساڵی ڕابردوودی هەرات ڕووناکیی چاوی کوژاوەتەوە و لەبیر کراوە. دواجار مامۆستای نیگارکێش دەدۆزنەوە. کاتێک بەسەیرکردنی وێنەکان بۆیان دەردەکەوێت مامۆستای دێرین کوێرە، قاڵەقاڵێک پەیدا دەبێت، بگرە هەندێک پێ دەکەنن. مامۆستای پیر داوای منداڵێکی نەخوێندەوار، بەڵام ژیری تەمەن ژێر حەوتساڵان دەکات. دەستبەجێ دەدۆزرێتەوە و دەهێنرێت. نیگارکێشی بەساڵاچوو نیگارێک دەخاتە بەردەستی منداڵەکە و پێی دەڵێت ئەوەی دەیبینی بۆم بگێڕەوە. کاتێک منداڵەکە ئەوەی لە نیگارەکاندا دەبینێت، دەگێڕێتەوە، پیرەی نیگارکێش چاوی نابینای لە ئاسمان دەبڕێت و بەوردی گوێ دەگرێت. دواتر وا دەڵێت: "ئەمە بەشێکە لە شانامەی فیردەوسی کاتێک ئەسکەندەر دارای مردوو لە ئامێز دەگرێت... ئەمە بەسەرهاتی حەزکردنی مامۆستایەکە لە قوتابییە جوانەکەی لە گوڵستانی سەعدیدا... پێشبڕکێی پزیشکان لە "مخزن الأسرار"ی نیزامیدا..." نیگارکێشانی تر لە نیگارکێشی کوێر و بەساڵاچوو تووڕە دەبن و دەڵێن: "ئێمەش هەر ئەمانەمان



دەگوت. ئەمانە زانراوترین جڤاتی بەناوبانگترین داستانەکانن." ئەمجار نیگارکێشی کوێر و بەساڵاچوو داوا دەکات دژواترینی نیگارەکان بخرێتە بەردەستی منداڵەکە و دیسان بەوردی گوێی بۆ ڕادەگرێت. سەرلەنوێ ڕوو لە ئاسمان دەڵێت: "ئەمە ئەو بەشەی شانامەی فیردەوسییە کاتێک هورمز ژەهر دەرخواری خۆشنووسان دەدات و یەک بەیەک دەیانکوژێت... ئەمە بەشێکە لە مەسنەویی مەولانا، چیرۆکی خراپ و نیگاری هەرزانبەهای ئەو بەسەرهاتەیە کاتێک پیاوێک ژنەکەی و دۆستی ژنەکەی بەسەر دار هەرمێیەکەوە دەگرێت." بەمجۆرە زۆربەی ئەو نیگارانەی ناتوانێت بیانبینێت، بەباسکردن دەناسێتەوە و کاری بەرگ تێگرتنی کتێبەکان ئاسان دەکات. کاتێک ئولوغ بەگ بەخۆی و سوپاوە دێتە هەرات، پرسیاری ئەو ڕازە لە نیگارکێشی بەساڵاچوو دەکات و دەپرسێت کاتێک وەستایانی نیگارکێش بە بینینی نیگارەکان سەریان لە بەسەرهاتەکان دەرنەکردووە، ئەو چۆن بێ بینینی نیگارەکان، بەسەرهاتەکانی هەڵهێناوە. نیگارکێشی بەساڵاچوو دەڵێت: "هۆکار ئەوە نییە وەک ئەوەی هەمووان پێیان وایە، کوێریم هۆکاری بەهێزیی بیرەوەریم بێت. تەنیا ئەوەندە هەیە من هەرگیز لە بیری ناکەم کە داستانەکان بەخەیاڵ نا، بە وشە دەکەونەوە بیری مرۆڤ." ئولوغ بەگ دەڵێت: "نیگارکێشەکانی خۆیشم ئەو وشە و بەسەرهاتانە دەزانن، بەڵام نیگارەکانیان بۆ ڕیز نەکراوە." نیگارکێشی پیر دەڵێت: "چونکە ئەوان زۆر بیر لە نەخشی هونەر و پیشەی خۆیان دەکەنەوە، بەڵام نازانن مامۆستایانی کۆن ئەم نیگارانەیان بۆ بیرهێنانەوەی خوا کێشاوە." ئولوغ بەگ دەپرسێت منداڵێک چۆن دەتوانێت سەر لەم کارە دەر بکات؟ نیگارکێشی بەتەمەن دەڵێت: "منداڵەکە نازانێت، ئەوەندە هەیە من وەک نیگارکێشێکی کوێر و بەساڵاچوو دەزانم خوا جیهانی بەشێوەیەک ئافراندووە وەک ئەوەی منداڵێکی ئاقڵی حەوت ساڵە ئارەزوو دەکات بیبینێت. خوا جیهانی لە سەرەتادا تەنیا بۆ سەیرکردن خوڵقاند. پاشان وشەی داینێ بۆ ئەوەی قسە لەسەر شتە بینراوەکان بکەین و بۆ یەکتری بگێڕینەوە. بەڵام ئێمە لە وشەکان داستانمان هۆندەوە و وامان زانی نیگار بۆ ئەو داستانانە دەکێشرێت. ئەمە لە کاتێکدا نیگار بریتییە لە بیرهێنانەوەی ڕاستەوخۆی خوا و بینینی جیهان لە ڕوانگەی ئەوەوە."

## جیم

دەزانرێت بەهۆی ترسی مافدار و لەمێژینەی ڕەگەزی نیگارکێشانەوە لە بەرامبەر کوێربووندا، سەردەمانێک نیگارکێشانی عەرەب کاتی ڕۆژهەڵهاتن ڕوویان لە ڕۆژئاوا دەکرد و تێر و پڕ سەیری ئاسۆیان دەکرد. سەدەیەک دواتریش، زۆربەی نیگارکێشانی شیراز، بەیانیان بە سکی ناشتا کاکڵی گوێز و گەڵای کوتراوی گوڵیان دەخوارد. لە هەمان ڕۆژگاردا، نیگارکێشانی ئەسفەهانی وەک ئەوەی پەتایان تێ کەوتبێت، یەک لەدوای یەک کوێر دەبوون و هۆکاری کوێربوونی خۆیان بۆ تیشکی ڕۆژ دەگەڕاندەوە و بۆ ئەوەی تیرێژی هەتاو ڕاستەوخۆ لە مێزی کارەکانیان نەدا، لە گۆشەیەکی نیوە تاریکی ژوورەوە یان لەبەر تیشکی مۆم کاریان دەکرد. مامۆستایانی نیگارخانەکانی ئوێزبەکیش لە بوخارا، لە کۆتاییی ڕۆژدا بە ئاوێک، کە شێخ و پیاوچاکان بەسەریاندا دەخوێند، چاوی خۆیان دەشووشت. لەناو گشت ئەم شێوازانەدا، ئەو شێوازەی هەرە سادە بۆ کوێریی دەڕوانێت، بێگومان لە داهێنانی مامۆستای نیگارکێش سەعید میرەکی فێرکەری بەهزادی گەورە مامۆستای نیگارکێشانە. بەپێی مامۆستای نیگارکێش میرەک، کوێربوون بەڵا نییە، بگرە دوایین بەختەوەرییە خوا بە نیگارکێشێکی دەبەخشێت سەرتاپای ژیانی خۆی لە جوانیی ئەودا تواندبێتەوە، چونکە نەخش هەڵوەدابوونی نیگارکێشە بەدوای ئەوەی خوا جیهان چۆن دەبینێت و ئەم بینینە بێ هاوتایەش، تەنیا دوای ماندووبوونی چاو و داڕزانی نیگارکێش و کوێربوونی لە ئاکامی ژیانێکی لێوانلێو لە کاردا، بە بیرهێنانەوە پێک دێت. کەواتە تەنیا لە توێی بیرەوەریی نیگارکێشانی کوێرەوە بۆمان دەردەکەوێت خوا چۆن بۆ جیهان دەڕوانێت. کاتێک نیگارکێشی بەساڵاچوو ئەم خەیاڵەی بۆ دێت، واتە گاڤێک لە بیرەوەری و تاریکاییی کوێریدا دیمەنی خوای بۆ ئاشکرا دەبێت، بەدرێژاییی ژیان دەستی خۆی لەسەر ئەوە ڕادەهێنێت خۆبەخۆ نیگاری شاهانە بخاتە سەر کاغەز. بەبۆچوونی مێژووناس میرزا محەمەد حەیدەر دوگلاتی نووسەرەوەی ژیان و بەسەرهاتی نیگارکێشانی ئەو سەردەمەی هەرات، مامۆستا سەعید میرەک سەبارەت بە تێڕوانینی خۆی بۆ نەخش، نموونەی نیگارکێشێکی هێناوەتەوە کە دەخوازێت نیگاری ئەسپێک بکێشێت. بەگوێرەی ئەوە، تەنانەت بێ تواناترین نیگارکێشیش، لەبەرئەوەی سەری خاڵی و چۆڵ و هۆڵە، کاتێک



نیگاری ئەسپێک دەکێشێت، با وەک نیگارکێشانی ئەم سەردەمەی فەڕەنگیش ناوبەناو سەر بەرز بکاتەوە و سەیری ئەسپەکە بکات، ئەوا نیگارەکە لە بیرەوەری و خەیاڵی خۆیەوە دەکێشێت، چونکە کەس بۆی ناکرێت هەمان کات بۆ ئەسپ و بۆ کاغەزی بەردەمی بڕوانێت و نیگاری ئەسپ بکێشێت. نیگارکێش سەرەتا سەیری ئەسپەکە دەکات و دواتر ئەو شتەی لە ئەقڵی خۆیدایە لەسەر کاغەز دەکێشێت. تەنانەت ئەگەر هێندەی چاوترووکاندنێکیش کاتی بەسەردا تێ پەڕێت، ئەوەی نیگارکێش دەیخاتە سەر کاغەز، ئەسپەکە نییە، بگرە بیرەوەریی ئەو ئەسپەیە کەوا پێش کەمێک بینیویەتی. ئەمەش بۆ نیگارکێشی داماو بەڵگەی ئەوەیە نیگار تەنیا بە بیرەوەری سەردەگرێت. لەبەر ئەو باوەڕەی پێی وایە ژیانی پیشەییی چالاکی نیگارکێشان بریتییە لە خۆ سازدان و ئەنجامدانی ئامادەکاری بۆ قۆناغی بەختەوەریی کوێری و بیرەوەریی کوێران لە داهاتوودا، مامۆستایانی نیگارکێشی هەرات ئەو سەردەمە وەک ڕاهێنانی دەست و مەشق بۆ ئەو نیگارانەیان دەڕوانی کە بۆ پادشا و شازادەی کتێبپەروەرانیان دەکێشا. کار، کێشانی بێ بڕانەوە و چەندین ڕۆژ لەسەریەک سەیرکردنی بێ پسانەوەی ڕووپەلی کتێبیان لەبەر ڕووناکیی مۆم، وەک کارێکی بەختەوەر و بەکێشکەری نیگارکێش بەرەو کوێربوون پەسەند دەکرد. مامۆستای نیگارکێش میرەک، بەدرێژاییی ژیان، جاروبار لەسەر نینۆک، دەنکە برنج و تەنانەت لەسەر تاڵی قژ نیگاری داری بەهەموو لق و گەڵاکانییەوە دەکێشا و بەمەبەست و بەخێرایی لە کوێری نزیک دەکەوتەوە. هەندێک جاریش باخچەی بەختەوەر و پڕ لە تیشکی خۆری دەکێشا و بەپارێزەوە تاریکیی دوادەخست و هەمیشە منەی باشترین کاتی دەکرد بۆ گەیشتن بە کۆتاییی بەختەوەر. کاتێک گەیشت بەتەمەنی حەفتا ساڵی، سوڵتان حوسێن بایقەرە بۆ خەڵاتکردنی ئەم مامۆستا گەورەیە، دەرگای گەنجینەی خۆی، کە هەزاران پەڕەی کتێبی تێدا کەڵەکە کردبوو و چەندین دەرگای لەسەر داخستبوو، خستە سەرپشت. مامۆستا میرەک لە گەنجینەی پڕ لە چەک، قوماشی ئاوریشم و قەدیفە و زێڕدا، سێ شەو و سێ ڕۆژ بێ ڕاوەستان لەبەر تیشکی مۆمدانی زێڕین سەیری پەڕەی دانسقەی کتێبی شاکاری مامۆستایانی کۆنی هەراتی کرد و دواجار کوێراییی داهات. وەک ئەوەی پێشوازیی لە فریشتەکانی خوا بکات، بە کامڵی و خۆسپاردنەوە ڕووبەڕووی ئەم ڕەوشە نوێیە

بووەتەوە. دواتر، مامۆستای مەزن جارێکی تر بڕای ببڕ نە قسەی کردووە و نە نیگاری کێشاوە. میرزا محەمەد حەیدەر دوگلاتی نووسیاری مێژووی ڕاشیدی، دیاردەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی کە نیگارکێشێکی گەیشتوو بە دیمەنەکانی زەمانی هەتا هەتاییی خوا، هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆ پەڕەکانی ئەو کتێبانەی بۆ کەسانی سادە و فانی دروست دەکرێن و دەڵێت: لەو جێیەی بیرەوەریی نیگارکێشی کوێر بەخوا دەگات، بێدەنگییەکی پەتی، تاریکییەکی بەختەوەر و ناکۆتاییی ڕووپەلی خاڵی هەیە.

بێگومان دەمزانی کاتێک قەرە پرسیارەکەی مامۆستا عوسمانی سەبارەت بە کوێری و بیرەوەری لێم کردبوو، لەبەرئەوەی نەبوو بەڕاستی پەرۆشی زانینی وەڵامی من بێت، بگرە زیاتر بۆ ئەوەی بوو بتوانێت بەئاسوودەیی سەیری شتەکانم، ژوورەکەم و نیگارەکانم بکات. بەڵام سەرباری ئەوەش شادمان بووم گاڤێک بینیم بەسەرهاتەکانم باندۆرێکی قوڵیان لەسەری داناوە. پێم گوت: "کوێری جیهانێکی بەختەوەرە و ئیبلیس و تاوان ناتوانن بچنە ناوی."

قەرە گوتی: "لە تەورێز، هەندێک لە نیگارکێشانی خاوەنی شێوازی کۆنی لەوانەی بە کاریگەریی مامۆستا میرەک کوێری بە گەورەترین فەزیلەت و خێری خوایی دەزانن، بەهۆی ئەوەی سەرباری چوونە ساڵیانەوە هێشتا کوێر نەبوون، شەرمیان بە خۆیاندا دێتەوە و لەبەر ترسیان لەوەی ئەمە بەڵگەی بێ توانایی و بێ هونەری بێت، هێشتا لاساییی کوێران دەکەنەوە. لە سۆنگەی ئەم ڕەوشتەوە کە کاریگەریی جەمالەدینی قەزوینیشی پێوە دیارە، هەندێکیان سەرباری ئەوەی کوێریش نین، بۆ ئەوەی خۆیان ڕابێنن وەک کوێر بۆ دنیا بڕوانن، لە تاریکیدا لەبەردەم ئاوێنە دادەنیشن و چەندین هەفتە لەسەریەک بێ ئەوەی بخۆن و بخۆنەوە، لەبەر تیشکی لاوازی چرای ڕۆن گەرچەک سەیری پەڕیلەکانی وەستایانی کۆنی هەراتی دەکەن."

لە دەرگا درا. کردمەوە و سەیرم کرد شاگردێکی جوانکیلەی نیگارخانەیە و چاوە جوانەکانی داچەقاندووە. گوتی تەرمی زەریف ئەفەندیی زەڕکاری برامان لە کوێرە بیرێکدا دۆزراوەتەوە و لای ئێوارە لە مزگەوتی میهرماهەوە بۆ گۆڕستان بەڕێ دەکرێت. تێی تەقاند بۆ ئەوەی هەواڵ بەئەوانی تریش بگەیەنێت. ئەی خوام، تۆ بمانپارێزە.



# 15

## من ناوم ئەستەرە

ئەرێ عەشق مرۆڤ گەمژە دەکات، یاخۆ تەنیا گەمژەکان عاشق دەبن؟ چەندین ساڵە بوخچەگێڕی و دەلاڵی دەکەم و کچی ئەم شارە بەشوو دەدەم، کەچی وەڵامی ئەم پرسیارە نازانم. زۆر ئاواتەخوازم کچ و کوڕێک، بگرە هەر کوڕێکیش بناسم کاتێک دڵیان دەچێتە یەک، زیرەکتر و فێڵزانتر بن و ئاقڵانەتر نەخشەڕێژی بکەن. ئەوەی من دەیزانم؛ ئەگەر پیاوێک پەنا بۆ فێڵ و تەڵەکەبازی و قۆڵبڕی ببات، ئەوا بەهیچ کلۆجێک ئەڤیندار نییە. قەرە ئەفەندیشیمان، کاتێک لەگەڵ من باسی شەکوورە دەکات، هەر لە ئێستاوە وای پێشان دەدات خوێنساردیی خۆی ون کردووە و و گشت پێوانەیەکی لە دەست داوە.

لە شوێن بازاڕەکە پێم گوت شەکوورە هەمیشە بیرت لێ دەکاتەوە، پرسیاری وەڵامی تۆم لێ دەکات و هیچ کاتێک بەوجۆرە نەمبینیوە. ئەمانە و چەند بالۆرەیەکی تری لەوانەی لەبەرم کردووە و بۆ هەموو کەسێکی دەڵێمەوە، بۆ ئەویش گوتەوە. بەشێوەیەکی وا بۆمی دەڕوانی، من بەزەییم پێدا هاتەوە. نامەکەی دایە دەستم و گوتی "بەپەلە و یەکڕاست" بیگەیەنە شەکوورە. سەرجەم گەمژەکان لەبەرئەوەی پێیان وایە ئەڤینی ئەوان پێویستیی بە دەستوبردێکی تایبەت هەیە، تین و تاوی ئەڤینی خۆیان دەخەنە ڕوو و چەک دەدەنە دەست دڵدارانیانەوە. ئەگەر ئەوانیش هۆش لە سەریاندا هەبێت، وەڵام دوادەخەن. ئەنجام: پەلەکردن لە ئەڤیندا کار دوا دەخات.

بۆیە ئەگەر قەرە ئەفەندی بیزانیایە ئەو نامەیەی بەدەم گوتنی "بەپەلە، بەپەلە"وە

دایە دەستم، من لە پێشدا بۆ شوێنێکی تری دەبەم، ئەوا سوپاسی دەکردم. لە بازاڕ ئەوەندە چاوەڕێم کردبوو، ڕچیبووم و لەبەر سەرما مەیيبووم. بەخۆم گوت با بەمەبەستی خۆ گەرمکردنەوە بەسەر ڕێگاوە سەر لە ماڵی یەکێک لە جگەرگۆشەکانم بدەم. ئەو کچانەی نامەم بۆیان گواستووەتەوە و بەدەستی خۆم بە شووم داون، پێیان دەڵێم جگەرگۆشەکانم. ئەم کچە جرتنەم ئەوەندە سوپاسبژێری منە، هەر کاتێک دەچمە سەردانی، سەرباری ئەوەی وەک پەروانە لە دەورم دەگەڕێت، چەند ئاکچەیەکیش لە مستم دەنێت. دووگیان بوو و فرە شادمان بوو. چای ئیخلامووری لێنا، بە ئارەزووی دڵ و بەچێژ لێ وەرگرتنەوە خواردمەوە. کاتێکیش بەتەنیا مامەوە، ئەو پارانەم ژمارد کە قەرە ئەفەندی پێی دابووم. بیست ئاکچە.

دیسان کەوتمەوە ڕێ. بەکۆڵانە تەسک و شووم و قوڕ و لیتە بەستووەکانی کەڵک پێوەنەماودا بۆ ڕۆیشتن، تێ پەڕیم. کاتێک لە دەرگایماڵەکەم دا، زەوقی گاڵتەم هەستا و هاوارم کرد:

"بوخچەگێڕ هات، بوخچەگێڕ. قوماشی نایابی لێوار چندراوی شایستەی پادشایانم هەیە. شاڵی شاهانەی کشمیر، پشتوێنی قەدیفەی بورسایی، باشترین کراسی ئاودامان ئاوریشمینی چندراو بڕاو لە کەتانی میسری، پۆشاکی چندراو لە قوماشی بە نەخش و نیگار، بەرگی نیمدەر و نوێن و دەسماڵی ڕەنگاوڕەنگم هەیە. بوخچەگێڕ هات."

دەرگا کرایەوە و چوومە ژوورەوە. وەک هەمیشە بۆنی نوێن، خەو، ڕۆنی داخکراو و شێ لە ماڵەکە دەهات. بۆنی ترسناکی ئەو پیاوە سەڵتانەی لەبەرەوە دەچنە تەمەنەوە.

گوتی: "جادووباز، بۆچی هاوار دەکەیت؟"

بێ ئەوەی هیچ شتێک بڵێم، نامەکەم دەرهێنا و دامە دەستی. لە ژوورە نیوە ڕۆشنەکە وەک سێبەرێک لێم نزیک کەوتەوە و لەپڕ نامەکەی لە دەستم فڕاند. چووە ژوورەکەی تەنیشتەوە، لەوێ چرایەکی هەمیشە داگیرساو هەبوو. من لەبەر دەرگا ڕاوەستام.

گوتم: "بابا ئەفەندی لە ماڵ نییە؟"

وەڵامی نەدایەوە. نامەکەی دەخوێندەوە و هۆشی بەسەر خۆیەوە نەمابوو. لێی



گەڕام بیخوێنێتەوە. لەبەرئەوەی لە پشت چراکەوە ڕاوەستابوو، من نەمدەتوانی ڕووی ببینم. دوای ئەوەی لە خوێندنەوەی نامەکە بووەوە، جارێکی تریش خوێندییەوە.

گوتم: "بەڵێ، چی نووسیوە؟"

حەسەن دەستی بە خوێندنەوە کرد:

"شەکوورە خانمی خۆشەویست. لەبەرئەوەی منیش چەندین ساڵە بەخەیاڵی تاکە کەسێکەوە دەژیم، چاوەڕێکردنی مێردەکەت و بیرنەکردنەوەت لە کەسی تر جگە لەو، بەڕێزەوە تێ دەگەم. لە دروستی و داوێنپاکیی بەدەر، چاوەڕێی هیچ شتێکی تر لە ژنێکی وەک تۆ ناکرێت. (حەسەن قاقایەکی لێ دا)، بەڵام هاتنم بۆ کن باوکت بەمەبەستی نیگارکێشی، بۆ زویرکردنی تۆ نییە. بەهیچ جۆرێک شتی وام بەخەیاڵدا نایەت. لافی ئەوەش لێ نادەم ئاماژە و بوێریم لە تۆوە وەرگرتبێت. کاتێک ڕووت لە پەنجەرەدا وەک تیشک بۆ من درەوشایەوە، گوتم ئەمە چاکەیەکی خوایە و لەوە زیاتر بیرم لە شتی تر نەکردەوە، چونکە بەختەوەریی توانای بینینی ڕووت بەسە بۆ من. (حەسەن بەتووڕەیی خۆی تێ هەڵقورتاند و گوتی ئەم بەشەی لە نیزامی دزیوە.) بەڵام مادام دەڵێی لێم نزیک مەبەوە، سا بێژە، مەگەر تۆ فریشتەی تا نزیکبوونەوە لێت جێی مەترسی بێت؟ گوێم لێ بگرە، گوێ لەمە بگرە: کاتێک بەنیوە شەوان، لە پەنجەرەی کاروانسەرایەکی چۆڵ و نەفرەت لێکراوەوە، کە جگە لە خانچییەکی بێ ئومێد و ڕێبڕێکی بە لەسێدارەدان سزادراو کەسی تری تێدا نەبوو، سەیری تریفەی مانگم دەکرد بەسەر شاخە ڕووتەڵەکانەوە و گوێم بۆ ڕەوە گورگی لە خۆم بەختڕەشتر و تەنیاتر ڕاگرتبوو و هەوڵی خەوتنم دەدا، بیرم لەوە دەکردەوە ڕۆژێک لەپڕ بۆم دەردەکەوی ڕێک وەک ئەوەی لەو پەنجەرەیەدا بۆم دەرکەوتیت. گوێ بگرە: ئێستا من بۆ کاری کتێب گەڕاومەتەوە کن باوکت و تۆ ئەو نیگارەم دەدەیتەوە کە لە سەردەمی منداڵیمدا کێشاومە. دەزانم، ئەمە بۆ من نیشانەی دۆزینەوەی تۆیە، نەک ئاماژەی مردنت. یەکێک لە کوڕەکانت، ئۆرهانم بینی. هەتیوی بەلەنگاز.

رۆژێک دێت دەبم بە باوکی."

گوتم: "بێچاوێنی بێت، جوانی نووسیوە. کوڕەکە بووە بە شاعیر."

گوتی: "دەستەواژەی –مەگەر تۆ فریشتەی تا نزیکبوونەوە لێت جێی مەترسی بێت؟–ی لە "إبن زرقانی" دزیوە. من باشتر دەنووسم." نامەکەی خۆیشی لە گیرفانی دەرهێنا. "بگرە، ئەمە بگەیەنە شەکوورە."

ئەو پوولەی لەگەڵ نامەکان دایە دەستم، بۆ یەکەمجار منی نیگەران کرد. لە پەیوەستبوونی شێتانەی ئەم کابرایە بە ئەڤینی بێ وەڵامی خۆیەوە، هەستم بە شتێکی نەفرەتبەخش کرد. حەسەن، وەک ئەوەی بخوازێت گومانەکانم پشتڕاست بکاتەوە، بۆ جاری یەکەم دوای ماوەیەکی درێژ، نەزاکەتی نایە لاوە و بەزبری گوتی:

"پێی بڵێ، ئەگەر بمانەوێت بە گوشاری قازی دەیگێڕینەوە بۆ ماڵەوە."

"هەر بەڕاستی پێی بڵێم؟"

بێدەنگییەک هاتە ئاراوە. گوتی: "پێی مەڵێ." لەبەرئەوەی تیشکی چرای ناو ژوورەکە لە ڕووی دەدا، بینیم وەک منداڵێک کەتنێکی کردبێت، سەیری بەردەمی خۆی دەکرد. لەبەرئەوەی بەم دۆخانەیان دەزانم، ڕێز لە ئەڤینیان دەگرم و نامەیان بۆ دەگوازمەوە، نەک بۆ پارە وەک ئەوەی هەموو کەسێک بۆی دەچێت.

لەوەدا بووم لە ماڵ بێمە دەرێ، حەسەن لەناو دەرگا ڕای گرتم.

بەڕق هەستاوی و بێ ئەقڵانە گوتی: "بە شەکوورە دەڵێی چەندەم خۆش دەوێت؟"

"بۆچی ئەمە لە نامەکانتدا نانووسیت؟"

"پێم بڵێ، چۆن دەتوانم خۆی و باوکی قایل بکەم؟"

گوتم: "وەک مرۆڤێکی باش." ئەمەم گوت و ڕووم لە دەرگا کرد.

بەدەم ئازارێکی هەڵقوڵاو لە ناخەوە گوتی: "تازە دوای ئەم تەمەنە زۆر درەنگە..."

گوتم: "حەسەن چاوش، پارەی زۆرت دەست دەکەوێت. ئەمەش مرۆڤ باش دەکات..." ئەمەم گوت و دەرچووم.

ناو ماڵەکە بەڕادەیەک تاریک بوو و دڵی مرۆڤی دەگووشی کە من وا هەستم کرد هەوای دەرەوە گەرم داهاتبێت. تیشکی ڕۆژ دای لە ڕووم. بیرم کەوتەوە من



بەختەوەریی شەکوورە دەخوازم. بەڵام بەجۆرێک لە جۆرەکان حەسێبم بۆ بەستەزمانەکەی ناو ئەو ماڵە شێدار و سارد و تاریکەش دەکرد. بێ بیرکردنەوەی پێشوەخت و لە سۆنگەی بانگێکی لە ناخمەوە هاتوو، لە لالەلی خۆم کرد بە بازاڕی بەهاراتفرۆشاندا. وام دەزانی بە بۆنی دارچین و زەعفەران و بیبەر بێدار دەبمەوە و دێمەوە سەرخۆم، بەڵام بە هەڵەدا چووبووم.

کاتێک شەکوورە لە ماڵی خۆی نامەکانی وەرگرت، سەرەتا پرسیاری قەرەی کرد. گوتم ئاگری ئەڤین هەموو شوێنێکی جەستەی سووتاندووە. قسەکەمی پێ خۆش بوو.

دوایی قسەکەم گۆڕی و گوتم: "هەموو کەسێک، تەنانەت ئەو ژنانەی لە ماڵانی خۆیان خەریکی ڕستن و چنینیشن، باسی هۆی کوشتنی زەریف ئەفەندیی داماو دەکەن."

شەکوورە گوتی: "خەیرییە، حەلوا دروست بکە و بیبە بۆ قەلبییەی ژنی زەریف ئەفەندیی بێچارە."

گوتم: "دەگوترێت هەموو ئەرزەڕوومییەکان و ئاپۆڕەیەکی زۆر ئامادەی بەڕێکردنی تەرمەکەی دەبن. خزمەکانیشی دەڵێن خوێنی بەفیڕۆ ناڕوات."

بەڵام شەکوورە دەستی کردبوو بە خوێندنەوەی نامەکەی قەرە. بەهەموو سەرنجی خۆم و بەتووڕەیی بۆ ڕوویم ڕوانی. ئەم ژنە بەشی ئەوە ئەزموونی ژیانی هەیە تا بتوانێت جڵەوی شێوەی ڕەنگدانەوەی هەستەکانی لەسەر ڕووی بگرێتە دەست. کاتێک نامەکەی دەخوێندەوە، بێدەنگبوونی منی پێ خۆش بوو. هەستم کرد ئەمەی وەک ڕازیبوونی من بەو بایەخە تایبەتەی بە نامەکەی قەرەی دابوو، تێ گەیشتووە. بەمجۆرە، دوای ئەوەی لە خوێندنەوەی نامەکە بووەوە و بزەیەک کەوتە سەر لێوی، ناچار بووم بۆ دڵخۆشکردنی شەکوورە، ئەم پرسیارەی لێ بکەم:

"چ دەڵێت؟"

"وەک سەردەمی منداڵی... دڵی پێمەوەیە."

"تۆ ڕات چییە؟"

"من هاوسەردارم. چاوەڕێی مێردەکەم دەکەم."

بەپێچەوانەی پێشبینیکردنی ئێوەوە، پاش ئەوەی داوای لێم کردبوو بایەخی پێ بدەم، هیچ لەم درۆیەی زویر نەبووم، بگرە دەبێت بڵێم ئەمە منی ئاسوودە کرد. ئەگەر زۆر کچی گەنج و ژنانی لەوانەی نامەم بۆ گواستوونەتەوە و لەبارەی ژیانەوە ئامۆژگاریم کردوون، هەمان ئەم بایەخ پێدانەی شەکوورەیان پێشان بدایە، ئەوا هەم کاری ئەوان و هەم کاری منیش نیواونیو ئاسانتر دەبوو و بگرە زۆربەیان بە مێردی زۆر باشتریش دەگەیشتن.

دیسان پرسیم: "ئەوی تریان چ دەڵێت؟"

لە وەڵامدا گوتی: "نامەکەی حەسەن ئێستا ناخوێنمەوە. ئایا لە گەڕانەوەی قەرە بۆ ئەستەنبوڵ ئاگادارە؟"

"بگرە لە هەبوونیشی ئاگادار نییە."

دولبەری خۆم چاوە ڕەشەکانی هەڵهێنایەوە و گوتی: "لەگەڵ حەسەن دەدوێیت؟"

"لەبەرئەوەی تۆ دەتەوێت."

"بەڵێ؟"

"بەدەست دەرد و ئازارەوە دەناڵێنێت. تۆی زۆر خۆش دەوێت. تەنانەت ئەگەر دڵت مەیلی کەسێکی تریش بکات، زۆر دژوارە بتوانی لەمەودا خۆتی لێ ڕزگار بکەیت. وەرگرتنی نامەکانی لەلایەن تۆوە، زۆر ئومێدی لە کن وی زیندوو کردووەتەوە. لێی بترسە، نەک بۆ گەڕاندنەوەت بۆ ماڵ، بگرە خۆی ئامادە کردووە تا بە مردنی کاکی قایلت بکات و بتخوازێت." بۆ ئەوەی پارسەنگی هەڕەشە ئامێزی ڕستەی دوایی ڕابگرم و شەکوورە نەمخاتە خانەی وتەبێژی ئەو بەدبەختەوە، بزەیەکم بۆ کرد.

پرسی: "ئەدی باشە ئەوی تریان چ دەڵێت؟" بەڵام ئایا دەیزانی پرسیاری کێ دەکات؟

"نیگارکێشەکە؟"

ڕەنگە لەبەر ترسی بووبێت لە بیر و ڕامانەکانی، لەپڕ گوتی: "سەرم لێ شێواوە و هەست دەکەم شتەکان زیاتریش دەشێوێن. باوکم ئیدی وا خەریکە پیر دەبێت. لە داهاتوودا چی بەسەر خۆم و ئەم منداڵە هەتیوانەدا دێت؟ هەست دەکەم خراپەیەک



ڕوو لە هەمووومان دەکات و ئیبلیس خۆی مەڵاس داوە بۆمان. ئەستەر، شتێکی وام پێ بڵێ کامەرانم بکات."

بەدەم دڵەکوتێوە پێم گوت: "گیانەکەم شەکوورە، هیچ خەمت نەبێت. بەڕاستی تۆ زۆر ژیریت، فرە شۆخ و نازداریت. ڕۆژێک دێت لەپاڵ مێردەکەتەوە لە پێخەودا دەنوویت، لە ئامێزی دەگریت، هەموو خەمەکانت لە بیر دەکەیت و بەختەوەر دەبیت. ئەمە لە چاوانتدا دەخوێنمەوە."

"باشە، بەڵام ئەو مێردە کامیان دەبێت؟"

"بۆچی مەگەر ئەو دڵە ئاقڵەت ئەمەت پێ ناڵێت؟"

"بەدبەختییەکەم لەوەوەیە ناتوانم تێ بگەم دڵم چیم پێ دەڵێت."

بێدەنگییەک ئەو ناوەی دایە بەر. تاوێک وا بیرم کردەوە شەکوورە هیچ متمانەی بە من نییە و بۆ ئەوەی قسەم لە زمان بێنێتە دەر، بێ متمانەیی خۆی دەشارێتەوە و خۆی دەخاتە دۆخێکەوە مرۆڤ سکی پێ بسووتێ. کاتێک تێ گەیشتم ئێستا وەڵامی نامەکان ناداتەوە، بەر لەوەی دەست بدەمە بوخچەکەم و خۆم بۆ حەوشە بدزمەوە، هەمان ئەو قسەیەی بە کچانی خۆمی دەڵێم، بەوانەشیانەوە کە چاویان خێلە، بە ئەویش گوت:

"گیانەکەم، ئەگەر هەریەکێک لەو چاوە جوانانەت بکەیت بەچوار، هیچت بەسەر نایەت، نیگەران مەبە."

# 16

## من شەکوورەم

جاران، لە هەر هاتنێکی ئەستەری بوخچەگێڕدا، خەیاڵم دەچوو بۆ ئەوەی نامەی ئەڤیندارێکی بۆم هێنابێت کە لە دوا ساتدا کەوتبێتە خۆ و بۆ ئەوەی دڵی ژنێکی ئاقڵ، شۆخ، باش پەروەردەکراو، بێوەژن، بەڵام ئابڕوودارى وەک من بخاتە ترپەترپ، نووسیبیەتی. کاتێکیش دەمبینی نامەکان لە هەمان داخوازیکەرانی هەمیشەییەوە هاتوون، هیچ نەبوایە هێز و پشوودرێژیی زیاترم بۆ چاوەڕێکردنی مێردەکەم پەیدا دەکرد. ئێستاش، دوای هەر ڕۆیشتنێکی ئەستەری بوخچەگێڕ، سەرم لێ دەشێوێت و هەست دەکەم لە جاران بێچارەترم.

هەرچی دەنگی دنیا هەیە هاتە بەرگوێم. لە ئاشپەزخانەوە دەنگی قوڵپەقوڵپی کوڵان و بۆنی لیمۆن و پیاز دێت: دەزانم خەیرییە کوولەکە لێ دەنێت. شەوکەت و ئۆرهان لەژێر دار هەناری ناو حەوشەدا یەکتر ڕاو دەنێن و بە شمشێر گەمان دەکەن و گوێم لە دەنگی هاوار و قیڕەیانە. باوکم بێدەنگ لە ژوورەکەی تەنیشتەوەیە. نامەکەی حەسەنم کردەوە و خوێندمەوە، جارێکی تریش حاڵی بووم شتێک لە ئارادا نییە مایەی نیگەرانی بێت. تەنیا ئەوە نەبێت کەمێکی تریش لێی ترسام و پیرۆزبابییم لە خۆم کرد لەپای ئەوەی کاتێک لە هەمان ماڵدا دەژیاین، بەرەنگاری هەوڵەکانی بووبوومەوە و ڕێم نەدابوو بێتە ناو جێگامەوە. دواتر نامەکەی قەرەم، وەک ئەوەی شتێک بێت لە شکان بێت و ئازاری پێ بگات، بەدەستەوە گرت و خوێندمەوە و ئەقڵم سەروبن بوو. هیچی تر نامەکانم نەخوێندەوە. ڕۆژ دەرکەوت و من وەها بیرم کردەوە:



ئەگەر شەوێک لە شەوان بچوومایەتە باخەڵی حەسەنەوە و سەرجێییم لەگەڵدا بکردایە، خوا نەبێت، کەسی تر پێی نەدەزانی. لە مێردە بێسەروشوێنەکەم دەچوو، هەمان شت بوو. جاروبار بیرۆکەیەکی وا قۆڕ و سەیرم بەخەیاڵدا دێت. ڕۆژ هەڵهاتبوو و کاتێک لەپڕ گەرماییم تێ گەڕا، وەک بڵێی هەستم کرد جەستەیەکم هەیە، هەستم بە پێست و گەردن و گۆی مەمکەکانم کرد. گاڤێک تیشکی ڕۆژ بەوجۆرە لە کەلێنی دەرگاوە لێی دەدام، ئۆرهان خۆی کرد بە ژووردا.

گوتی: "دایە، چی دەخوێنیتەوە؟"

باشە، درۆم لەگەڵ کردن کاتێک پێش کەمێک گوتم ئەو نامانەی ئەستەر هێنابوونی، چیدی نەمخوێندنەوە، چونکە دیسان دەمخوێندەوە. بەڵام ئەمجار بەڕاستی نامەکانم نووشتاندەوە و خستمنە بن جێگاکەمەوە و بە ئۆرهانم گوت:

"ئا وەرە ئێرە، وەرە باوەشمەوە." هات. گوتم: "ئۆف بێچاوێنی بێت، چەند گران بوویت، زۆر گەورە بوویت." ماچم کرد. کاتێک من گوتم: "ڕچیوی"، ئەو گوتی:

"دایە، ئای چەند گەرمی." پشتی لکاند بە سنگمەوە.

خۆمان بەیەک سپاردبوو و بێ قسە دانیشتبووین و ئەمەش بۆ هەردووکمان خۆش بوو. بۆنی گەردنیم کرد، ماچم کرد. توندتر بەخۆمەوە نووساند. بێدەنگ بووین و لەو دۆخەدا ماینەوە.

زۆر دواتر گوتی: "ختووکەم دێت."

بە دەنگێکی بەدەربەستەوە پێم گوت: "ئا بڵێ بزانم، ئەگەر سوڵتانی چین بێت و بڵێ چی داوا دەکەیت، بیکە، شتێک هەرە زیاد لە ژیاندا بتەوێت، چییە؟"

"دەخوازم شەوکەتمان لەگەڵدا نەبێت."

"چی دەخوازیت، دەتەوێت باوکێکت هەبێت."

"نەخێر. گەورە بم، خۆم دەتخوازم."

خەیاڵم چوو بۆ ئەوەی کەوا شتی خراپ، پیربوون و دزێوبوون و بێ مێردی و هەژاری نییە، بگرە ئەوەیە کەس لە ژیاندا ئیرەییت پێ نەبات. جەستەی گەرم داگەڕاوی ئۆرهانم لە باوەشم هێنایە خوارێ. بەخۆم گوت کەسێکی بەدرۆحی شێوەی من دەبێت شوو بە مرۆڤێکی باش بکات. چوومە کن باوکم.

گوتم: "حەزرەتی سولّتانمان تەواوبوونی کتێبەکە بەچاوی خۆی دەبینێت و جەنابتان خەڵات دەکات. دیسان دەڕۆن بۆ ڤینیسیا."

باوکم گوتی: "نازانم، ئەم تاوانە منی ترساندووە. پێ دەچێت دوژمنانمان بەهێز بن."

"من دەزانم ئەم ڕەوشەی منیش بوێریی بەوان بەخشیوە و ڕێی خۆش کردووە بۆ بەهەڵە تێگەیشتن و ئومێدی بێ بناخە."

"چۆن؟"

"ئیدی دەبێت هەرچی زووترە شوو بکەم."

باوکم گوتی: "چی؟ بە کێ؟ بەڵام تۆ بەشووی." پرسی: "ئەمە لە کوێوە پەیدا بوو؟ داخوازیکەرت کێیە؟ تەنانەت ئەگەر ئارەزوویەکی زۆر ماقوڵ و لە ڕەتکردنەوە نەهاتووشت هەبێت، پێم وا نییە بەئاسانی کەسێکی وا بدۆزینەوە و بەگەنی بکەین." باوکی ماقوڵم دوای ئەوەی ئەم قسەیەی کرد، بەخترەشیی منی بەمجۆرە پوخت کردەوە: "دەزانی، بۆ ئەوەی بتوانی شوو بکەیت، زۆر مەسەلە هەن پێویستە چارەسەر بکرێن." دوای بێدەنگییەکی درێژ وای گوت: "گیانەکەم، دەتەوێت بڕۆیت و من بەجێ بهێڵیت؟"

گوتم: "دوێنی لە خەونمدا بینیم مێردەکەم مردووە."بەڵام وەک ژنێک نەگریام کە بەڕاستی ئەم خەونەی دیبێت.

"مرۆڤ هەروەک چۆن لە نیگار دەڕوانێت و دەزانێت بیخوێنێتەوە، پێویستە بزانێت خەونیش بخوێنێتەوە."

"ئایا بەلاتانەوە گونجاوە خەونەکەمتان بۆ بگێڕمەوە؟"

تاوێک بێدەنگ بووین و وەک کەسانی هۆشمەند، کە خێرا خێرا چاو بەسەرجەم ئەنجامەکانی وتووێژیاندا دەگێڕنەوە، هەریەکەمان بزەیەکی بۆ ئەوی دی کرد.

"من دەتوانم خەونەکەت لێک بدەمەوە و بڕوا بکەم مێردەکەت مردووە، بەڵام خەزوورت و شووبرات و قازیش، کە ناچارە گوێ لە ئەوان بگرێت، داوای بەڵگەی تر دەکەن."



"ئەوە دوو ساڵە منداڵەکانم هەڵگرتووە و بۆ ماڵەوە گەڕاوینەتەوە، بەڵام خەزوورم و شووبرام ناتوانن بمگێڕنەوە."

باوکم گوتی: "چونکە زۆر باش دەزانن کەموکورتییان هەیە، بەڵام ئەمە واتای ئەوە ناگەیەنێت بە داوای تەڵاقی تۆ ڕازین."

گوتم: "ئەگەر لەسەر مەزەبی مالیکی یان حەنبەلی بووینایە، کاتێک قازی سەیری بکردایە چوار ساڵ تێ پەڕیوە، بڕیاری تەڵاق و بگرە بڕینەوەی بژێویشی بۆم دەدا. بەڵام ئێمە لەبەرئەوەی، لە خوا بەزیاد بێت، حەنەفین، ئەمەشمان بۆ ناکرێت."

"باسی جێگرە شافیعییەکەی قازیی ئوێسکودارم بۆ مەکە، ئەوانە کاری پووچن."

"دەگوترێت هەموو ئەو ژنە ئەستەنبوڵییانەی مێردیان لە شەڕدا ون بووە، بۆ تەڵاق ڕووی تێ دەکەن. لەبەرئەوەی شافیعییە، دەڵێت مێردەکەت بێسەروشوێنە، لە کەنگێوە ونە، ژیانت پێ هەڵناسوڕێت، ئەمانە ناسیاوتن؟ ئەم شتانەیان لێ دەپرسێت و هەر لەوێدا تەڵاقنامەیان دەداتە دەست."

باوکم گوتی: "کچی شیرینم، کێ ئەم شتانە دەخاتە مێشکتەوە؟ کێ ئەقڵی بردوویت؟"

"ئەگەر دوای وەرگرتنی تەڵاق کەسێک هەبێت بتوانێت ئەقڵم ببات، ئەوا بێگومان ئێوە پێم دەڵێن کێیە و سەبارەت بەشووکردنیشم بە هەرکەسێ، بەهیچ جۆرێک لە بڕیاری ئێوە دەرناچم."

کاتێک باوکی فێڵزانم بینی کچەکەشی هێندەی خۆی فێڵزانە، دەستی بەتروکاندنی چاوەکانی کرد. ڕاستییەکەی، باوکم لەبەر سێ هۆ ئاوا بەخێرایی چاوەکانی دەتروکێنێت: ١- گاڤێک تەنگاو دەبێت و بەپەلە مێشکی دەخاتە کار بۆ دۆزینەوەی فێڵێک. ٢- کاتێک لەتاو بێچارەیی و خەم لە دڵەوە دەگری. ٣- ئەو دەمانەی بۆ ئەوەی لە کاتی تەنگانەدا فێڵێک بکات، هۆی یەکەم و دووەم تێکەڵ دەکات و ئاماژەیەکی وا دەدات کە دەتوانێت پاش کەمێکی تر لە تاو دەرد و خەمباری بگری.

"پەلی منداڵەکان دەگریت و دەڕۆیت و باوکە بەساڵاچووەکەت بەتەنیا جێ دەهێڵیت؟ دەزانی لە سۆنگەی کتێبەکەمانەوە - بەڵێ، گوتی کتێبەکەمان - لە کوشتن دەترسام، بەڵام ئێستا لەبەرئەوەی تۆ دەتەوێت پەلی منداڵەکان بگریت و بڕۆیت، من

خۆزگەی مردن دەخوازم."

"باوکی شیرینم، مەگەر هەر ئێوە نەبوون هەمیشە بە منتان دەگوت بۆ ڕزگاربوون لەو شووبرا بێ کەڵکە پێویستە تەڵاق وەربگریت؟"

"نامەوێت جێم بهێڵی. لەوانەیە مێردەکەت ڕۆژێک لە ڕۆژان بگەڕێتەوە. نەشگەڕێتەوە، بەشووبوونت هیچ زیانێکی نییە. بەس لەم ماڵە لەگەڵ باوکی خۆتدا دانیشە."

"منیش زیاتر لە دانیشتن لەم ماڵە لەگەڵ ئێوەدا، هیچ شتێکی ترم ناوێت."

"گیانەکەم، مەگەر پێش تۆزێک نەتگوت ئیدی دەبێت هەرچی زووترە شوو بکەم؟"

ئیدی وتوویژ لەگەڵ باوکدا بەوجۆرەیە: دواجار خۆیشم دێمە سەر ئەو باوەڕەی من ناهەقم.

چاوم لەبەر پێی خۆم بڕیبوو و گوتم: "دەمگوت." دواتر خۆم ڕاگرت بۆ ئەوەی نەگریم. بە وەرگرتنی بوێری لە ڕەواییی ئەو شتەی هاتە مێشکمەوە، گوتم:

"باشە، من لەمەودوا هەرگیز شوو ناکەمەوە؟"

"ئەو کەسەی ناتبات و تۆم لێ دوور ناخاتەوە، جێی لەسەر سەرمە. داخوازیکەرت کێیە، ئامادەی لەم ماڵە لەگەڵ ئێمەدا بژی؟"

بێدەنگ بووم. بێگومان هەردووکمان دەمانزانی باوکم ڕێز لە زاوای لەم ماڵە لەگەڵ ئێمە دانیشتوو ناگرێت و هێدی هێدی دەیشکێنێتەوە. باوکم دەتوانێت زاوایەکی لەو شێوەیە، کە زاوا ڕێویی پێ دەگوترێت، ئەوەندە پووشتانە و وەستایانە بشکێنێتەوە کە من ئامادە نەبم خۆمی ڕادەست بکەم.

"بەم حاڵەتەوە ئەگەر ڕەزامەندیی باوکتی لەسەر نەبێت، ناتوانی شوو بکەیت. دەزانیت، وا نییە؟ نامەوێت شوو بکەیت و مۆڵەتیشت نادەم."

"من شووکردن نا، تەڵاقدانم دەوێت."

"چونکە ئاژەڵێکی بێ مێشک لەوانەی جگە لە بەرژەوەندیی خۆیان بیر لە هیچی تر ناکاتەوە، دەتوانێت بتڕەنجێنێت. کچی شیرینم، خۆ دەزانی چەندم خۆش دەوێی، وا نییە؟ پێویستە ئەم کتێبەش تەواو بکەین."



بێدەنگ بووم. چونکە ئیبلیسیش هەستی بە پەستبوونم کردبوو و زۆری بۆم دەهێنا ئەگەر دەستم بە قسان بکردایە، لە ڕووی باوکمدا دەمگوت دەزانم شەوانە خەیریبە دەبەیتە ناو جێگاوە. بەڵام ئایا لە کچێکی وەک من دەوەشێتەوە بە پیرە باوکی خۆی بڵێ دەزانم شەوانە لەگەڵ کەنیزەکدا دەنوویت؟

"کێ دەیەوێت بتخوازێت."

سەیری بەردەم خۆم کرد و بێدەنگ بووم، بەڵام نەک لەبەر شەرم، بگرە لەتاو هەڵچوون و پەستبوونم. لەوەش خراپتر، سەرباری ئەوەی دەمزانی پەست بووم، دەمکرد و دەمکۆشا نەمدەتوانی وەڵام بدەمەوە و ئەمەش هێندەی تر منی کەللەیی دەکرد. ئەو ساتە لە خەیاڵی خۆمدا بیرم دەکردەوە باوکم و خەیریبە لە ڕەوشێکی پێکەنیناوی و قێزەوندا لە جێگادان. خەریک بوو بدەمە پڕمەی گریان، بەدەم سەیرکردنی بەرپێی خۆمەوە گوتم:

"کوولەکە لەسەر ئاگرە، با نەسووتێ."

چوومە ژووری تەنیشت پلیکانەکان، ئەو ژوورەی پەنجەرە هەرگیز نەکراوەکەی بەسەر بیرەکەدا دەڕوانێت. بە لەپەکوتێ لە تاریکییەکەدا نوێنەکەم دۆزییەوە و خۆم بەردایەوە سەری: ئای چەند خۆشە کاتێک مرۆڤ بە منداڵی ناهەقی لێ دەکرێت، خۆی فڕێ دەداتە سەر جێگاکەی و بەدەم گریانەوە خەو دەیباتەوە. تەنیا هەرخۆم خۆم خۆش دەوێت و ئەم تەنیاییە هێندە تاڵە کاتێک لەتاو تەنیاییی خۆم دەگریم، ئێوە گوێتان لە هەنسک و ناڵەم دەبێت و بە هانامەوە دێن.

دوای کەمێک سەیرم کرد ئۆرهان لە جێگاکەمدا ڕاکشاوە. سەریم خستە نێوان مەمکەکانمەوە، سەیرم کرد ئەویش ئاخ هەڵدەکێشێت و فرمێسک دەڕێژێت. ڕام کێشایە لای خۆمەوە و بەخۆمەوە نووساند.

دوای کەمێک گوتی: "مەگری دایە، باوکم لە شەڕ دەگەڕێتەوە."

"لە کوێوە دەزانیت؟"

بێدەنگ بوو. بەڵام ئەوەندە خۆشم ویست و هێندە بەهێز نووساندم بە سنگمەوە، هەموو خەمەکانم لەبیر چووەوە. بەر لەوەی خۆم لە جەستەی ئێسک نەرم و نیانی ئۆرهان بئاڵێنم و خەو بمباتەوە، ئێستا تەنیا خەمێکم هەیە، با بۆتان بدرکێنم.

ئێستا پەشیمانم لەو شتەی پێش کەمێک بەتووڕەبوونەوە سەبارەت بە باوکم و خەیرییە بە ئێوەم گوت. نەخێر، ئەوەی گوتم درۆ نییە، بەڵام لەبەر گوتنی ئەو شتە زۆر تەریق دەبمەوە. ئێوە ئەو قسەیەم لەبیر بکەن، وا بڕوانن بۆمان وەک ئەوەی هەرگیز نەگوترابێت و باوکم و خەیرییەش وایان نەکردبێت. مەگەر نابێت؟



# 17

## من زاواتانم

دژوارە، خاوەندارییی کچ دژوارە. لە ژوورەوە دەگریا، گوێم لە هەنسکەکانی بوو، بەڵام جگە لە سەیرکردنی پەڕەکانی کتێبەکەی دەستم، هیچی ترم لە دەست نەدەهات. هەوڵم دەدا کتێبی "أهوال القيامة" بخوێنمەوە. لە پەڕەیەکیدا نووسراوە: ڕۆح، دوای سێ ڕۆژ لە مردن مۆڵەت لە خوا وەردەگرێت و دەچێتەوە سەردانی ئەو جەستەیەی لە ڕابردوودا تیایدا ژیاوە. کاتێک جەستەی کۆنی خۆی لە گۆڕدا لە خوێن و بۆگەناو و دۆخێکی پەرێشاندا دەبینێت، خەم دای دەگرێت و دەڵێت: "جەستەی بێچارە، جەستەی کۆنی خۆشەویست و بێچارەم." دەداتە پرمەی گریان و پرسە دەگێڕێت. بەوجۆرە ماوەیەک بیرم لە کۆتاییی تاڵی زەریف ئەفەندی، لە دۆخی وی لە بنی بیرەکەدا کردەوە. بیرم چوو بۆ ئەوەی ڕۆحی ئەو لە گۆڕدا نا، بگرە لە بنی بیرەکەدا سەری لێ داوە و بێگومان زۆریش خەمگین بووە.

کاتێک گوێم لە هەنسکەکانی شەکوورە بوو، کتێبی مردنم نایە لاوە. کراسێکی لە خووریی چندراوی زیادەم لەبەر کرد، بۆ ئەوەی پشتم گەرم بکاتەوە، پشتوێنی لە لبادی ئەستوور دروستکراوم بەتوندی لە پشتم ئاڵاند و شەرواڵێکی لە فەرووی کەروێشک بڕدراویشم لە پێ کرد. لە ماڵ چوومە دەرەوە، بینیم شەوکەت لەبەر دەرگایە.

"باپیرە بۆ کوێ؟"

"برۆ ژوورەوە. دەچم بۆ گۆڕستان."

بە کۆڵانە خاڵی و بە بەفر داپۆشراوەکاندا، بەناو خانووی داڕزاو و وێران و بەزۆر بەپێوە ڕاوەستاوی هەژاران و بە شوێن سووتاوییەکاندا تێ پەڕیم. بە هەنگاوی پیرانەی وردم و بەدەم هەوڵدانەوە بۆ ئەوەی لەسەر بەستەڵەک نەخزێم و نەکەوم، بەناو گەڕەکەکانی قەراغ شار، بێستان و کێڵگەکاندا، بەپێش ڕیزە دووکانی دروستکردنی تاقمی گالیسکە، فرۆشتنی پێچکە و کاری ئاسندا و بەبەردەم کورتاندرووان، زینکەران، هەوسارچییان و ناڵبەندانداندا دوور و درێژ ڕێگام بڕی.

نازانم بۆچی تەرمەکە لە مزگەوتی میهرماهی ئەدرنەقاپییەوە بۆ گۆڕستان دەبەن؟ لە مزگەوت، برایانی سەرزل و سەرسوڕماوی کابرای مردووم لە ئامێز گرت. پەست و کەللەڕەق دەهاتنە بەرچاو. لەگەڵ نیگارکێشان و خۆشنووساندا باوەشمان بەیەکدا کرد و گریاین. لەپڕ تەمێکی خۆڵەمێشی پەیدا بوو و هەموو شوێنێکی نزمی داپۆشی. کاتێک لەو تەمەدا نوێژی مردوومان دەخوێند، نیگام چووە سەر تابووتی سەر بەردەنوێژەکە و هەستم بە ڕقێکی ئەستوور کرد بەرامبەر ئەو نامەردەی ئەم کارەی لێ وەشاوەتەوە و بگرە هێندە پەست بووم تەنانەت دوعای "اللهم بارك" لە سەرمدا تێکەڵ و پێکەڵ بوو.

دوای نوێژ، کاتێک جڤات تەرمەکەیان خستە سەر شانیان، من هێشتا لە ڕیزی نیگارکێشان و خۆشنووساندا بووم. هەندێک لەو شەوانەی لەگەڵ لەقلەق بۆ کتێبەکە تا گزنگی بەیان لەبەر تیشکی لاوازی چرا دادەنیشتین، هەوڵی دەدا بمخاتە سەر ئەو بڕوایەی کە زەڕکارییەکانی زەریف ئەفەندی هەرزانبەهان و نەزانانە ڕەنگ – بەمەستی ئەوەی دەوڵەمەند بێتە بەرچاو، ڕەنگی شینی تۆخ لە هەموو جێیەک دەدات– بەکار دەهێنێت. ڕاستییەکەی، هەردووکمان لەبیرمان چووبوو کەوا منیش مافم دابوویێ و گوتبووم "بەڵام کەسی تر نییە." دیسان بەدەم گریانەوە باوەشمان بەیەکدا کرد. کاتێک زەیتوون دۆستانە و بەجۆرێک ڕێزەوە بۆمی ڕوانی و دواتر لە ئامێزی گرتم –ئەوەی بزانێت چۆن کەسانی تر لە ئامێز دەگرێت، مرۆڤی باشە–، هەر زۆرم پێ خۆش بوو و جارێکی تریش بیرم کردەوە لەناو سەرجەم نیگارکێشان و خۆشنووسان، ئەو لە هەموویان زیاتر باوەڕی بە کتێبەکەم هەیە.

ئەگەرچی لەسەر پلیکانەکانی بەر دەرگای حەوشە لەگەڵ مامۆستا عوسمانی



گەورەی نیگارکێشاندا کەوتینە شانی یەکدی، بەڵام نەمانزانی چی بەیەکتر بڵێین. ساتێکی سەیر و هەستیار بوو؛ یەکێک لە براکانی خوا لێخۆشبوو هەنسکی دەدا و دەستی بەگریان کردبوو، کەسێکی شەیدای خۆدەرخستنیش تەکبیری کێشا.

هەر بۆ ئەوەی قسەیەک بکات، لێی پرسیم: "بۆ کام گۆڕستان؟"

لەبەرئەوەی لە ناخەوە هەستم کرد گوتنی "نازانم" هەڵوێستێکی نەیارانە دەبێت، شڵەژام و بێ بیرکردنەوە، لەسەر پلیکانەکە لەوەی تەنیشت خۆمەوە پرسی و گوتم: "بۆ کام گۆڕستان؟ ئەوەی ئەدرنەقاپی؟"

گەنجێکی شێتۆکەی ڕیشن و تووڕە گوتی: "بۆ ئەیوب."

منیش ڕووم لە مامۆستا کردەوە و گوتم: "بۆ ئەیوب"، بەڵام ئەو گوێی لە قسەی لاوە شێتۆکە ڕیشن و تووڕەکە بووبوو. بە نیگایەکی ئەوتۆوە کە "تێ گەیشتم"ی دەگەیاند، سەیری منی کرد. منیش تێ گەیشتم ناخوازێت ڕووبەڕووبوونەوەکەمان لەوە زیاتر درێژە بخایەنێت.

مامۆستا عوسمان، بەهۆی ئەوەی سوڵتانمان نووسین و نەخشاندن و کێشانی نیگاری ئەو کتێبەی من بە "نهێنی" ناوم دەبرد، ئاڕاستەی من کردبوو، بێگومان دڵی گەردی گرتبوو. وەکو تریش، سوڵتانمان لەژێر کاریگەریی مندا زەوقی چووبووە سەر شێوازی فەڕەنگی لە نیگارکێشاندا. سوڵتان پێشتر پۆترێتێکی بە نیگارکێشێکی ئیتاڵی بەکێشان دابوو و جارێک عوسمانی مامۆستای گەورەی ناچار کرد سەیری بکات و سەرلەنوێ بیکێشێتەوە. مامۆستا عوسمان بەبێز لێهاتنەوە نیگارەکەی کێشا و بە "ئەشکەنجە" ناوی برد. دەمزانی منی بە لێپرسراوی لەبەرگرتنەوەی ئەو نیگارە سەیرە ئیتاڵییە دادەنا. مافی خۆی بوو.

لە ناوەڕاستی پلیکانەکاندا ڕاوەستام و تاوێک بۆ ئاسمانم ڕوانی. کاتێک حاڵی بووم زۆر باش دواکەوتووم، لە پلیکانە شەختەگرتووەکان هاتمە خوارەوە. گران گران دوو پلیکانە هاتبوومە خوارێ و نەهاتبووم، یەکێک خۆی خستە بن باڵم: قەرە.

گوتی: "زۆر ساردە، سەرماتان نییە؟"

هیچ گومانم نەبوو لەوەی ئەم کوڕە ئەقڵی شەکوورەی بردووە. متمانە بەخۆبوونیشی بەوەی خۆی دایە بن هەنگڵم، بەڵگەی ئەوە بوو. لە ڕەفتاریدا شتێکی

وەک "دوازدە ساڵ کارم کردووە و بووم بە پیاو" بەدی دەکرا. پلیکانەکان کۆتاییان هات. پێم گوت دوایی بۆم باس بکات لە نیگارخانە چی بیستووە.

گوتم: "کوڕم، تۆ لە پێشەوە بڕۆ، بڕۆ و فریای جڤات بکەوە."

سەری سوڕما، بەڵام بەسەر خۆی نەهێنا. تەنانەت کەیفم پێ هات کاتێک بەگرانی لە بن باڵم دەرچوو و ڕۆیشت. ئەرێ ئەگەر شەکوورەی بدەمێ، لە هەمان ماڵدا لەگەڵ ئێمە دەژی؟

تازە لە ئەدرنەقاپییەوە لە شار دەرچووبووین کاتێک لەو خوارانەوە تابووتەکە و نیگارکێشان و خۆشنووسان و شاگردەکانم بینی تابووتەکەیان لەسەر شان هەڵگرتبوو و خەریک بوو لە تەمەکەدا ون دەبوون و بەپەلە لە هەورازەکەوە بەرەو کەنداوی زێڕین شۆڕ دەبوونەوە. هێندە خێرا دەڕۆیشتن، لە ئێستاوە گەیشتبوونە نیوەی ئەو ڕێگا قوڕاوییەی لە دۆڵەکەوە بەرەو ئەیوب شۆڕ دەبووەوە. لای چەپەوە، دووکەڵکێشی مۆمخانەی وەقفی خانم سوڵتان لە بێدەنگی و تەمدا بەکەیفەوە دووکەڵی دەر دەدا. لەژێر شووراکانی شاردا ڕیزێک پێستەفرۆش و قەسابخانەیەکی لێ بوو چوست و چالاک بۆ قەسابە ڕۆمەکانی ئەیوب کاری دەکرد. مزگەوتی ئەیوب لەوێوە بەئاستەم دەبیندرا و بۆنی کەلاکی ئەو ناوە دەگەیشتە قوبەی مزگەوتەکە و ئەو دۆڵەی تا نزیک دار سەرووەکانی گۆڕستان درێژ دەبووەوە. دوای کەمێک ڕێکردن، لە خوارەوە، لە بالاتی گەڕەکی نوێی جووەکانەوە گوێم لە هاوار و زیقەی بڕێک منداڵ بوو لەو ناوە گەمەیان دەکرد.

کاتێک گەیشتینە تەختایی ئەیوب، پەپوولە خۆی لێم نزیک خستەوە. بەحاڵی ئاگرینی هەمیشەییی خۆیەوە، گرم و هوڕ چووە سەر بابەتەکە:

گوتی: "زەیتوون و لەقلەق ئەم کارەیان کردووە. ئەوانیش وەک هەموو کەسێکی تر زۆر باش دەیانزانی من نێوانم لەگەڵ خوا لێخۆشبوودا خۆش نەبوو. دەشیانزانی گشت کەسێک بەمە دەزانێت. سەبارەت بەوەی دوای مامۆستا عوسمان کێ سەروکاری نیگارخانە دەگرێتە دەست، ئیرەیی پێبردن، بگرە هەستی نەیارانەی دژ بەیەک و دوژمنایەتی لە نێوانماندا هەیە. ئێستا پێشبینی دەکەن تاوانەکە بخرێتە ئەستۆی من و بەلایەنی کەمەوە گەورەی خەزنەداران و لەژێر کاریگەریی ئەویشدا،



سوڵتانمان لە من، نەخێر، لە ئێمە دوور دەکەوێتەوە."

"گوتت ئێمە. ئێوە کێن؟"

"ئێمە دەڵێین با ڕەوشتی کۆنی ناو نیگارخانە بپارێزرێت، ڕێبازی وەستایانی عەجەم بگرینەبەر و لە پێناوی پوول و پارەدا هەموو بابەتێک نەکرێت بە نیگار. لەبری چەک، سوپا، دیل و داگیرکردن، با داستانی کۆن، چیرۆک و بەسەرهاتی کۆن بخرێتە کتێبەکانمانەوە. دەڵێین پێویستە دەستبەرداری کتێبە کۆنەکان نەبین و نیگارکێشانی ڕەسەن لە دووکانەکانی ناو بازاڕ بۆ چوار پێنج ئاکچە نیگاری هەر شتێک و هەر بابەتێک لەوانەی دێتە بەردەستیان، نەکێشن و شتی پڕوپووچ نەکەن. حەزرەتی سوڵتانمان مافمان دەداتێ."

بۆ ئەوەی بابەتەکە لە کورتی ببڕێتەوە، گوتم: "لەخۆڕا بوختان بۆ خۆت دەکەیت. دڵنیام کەسێکی خاوەن خوویەکی لەو جۆرە ئەگەر کارێکی وای لێ بوەشێتەوە، ناتوانێت لە نیگارخانە بحەوێتەوە. هەمووتان برای یەکترن. کێشانی نیگاری چوار پێنج بابەتی لە ڕابردوودا نەکێشراو زیانێکی هێندە گەورەی تێدا نییە تا پاڵ بە مرۆڤەوە بنێت بۆ دوژمنایەتیکردن."

هەمان کات، وەک ئەوەی جاری یەکەمم بێت ئەم هەواڵەم بیستبێت، ڕاستییەکی دووربێت هەڵنەگر تێ گەیشتم. بکوژی زەریف ئەفەندی یەکێکە لە نیگارکێشە هەڵبژێردراوەکانی نیگارخانەی کۆشک و لەناو ئەو ئاپۆڕەیەی بەردەممدایە و بە هەورازی گۆڕستاندا هەڵدەکشێت. ئەو ساتە لەوەش دڵنیا بووم بکوژەکە لەسەر ئیبلیسی و دووزمانی بەردەوام دەبێت، دەبێتە دوژمنی ئەو کتێبەی من دروستی دەکەم و بەئەگەری زۆر دێتە ماڵم و کاری نەخش و نیگار بۆ کتێبەکەم وەردەگرێت. ئایا پەپوولەش وەک هەموو ئەو نەخشساز و نیگارکێشانەی هاتوچۆی ماڵی منیان دەکرد، دڵی چووبووە کچەکەم؟ کاتێک درێژەی بە بوختانەکانی دەدا، ئایا لەبیری چووبوو من هەندێک جار داوای نیگاری تەواو پێچەوانەی بۆچوونی خۆیم لێ کردبوو، یاخۆ وەستایانە قسەی تێ دەگرتم؟

دوای کەمێک بیرم کردەوە، نەخێر، قسەی تێ نەدەگرتم. وەک سەرجەم وەستایانی تری نیگارکێش، لە پەپوولەشدا هەستێکی ئاشکرای منەتباری بەرامبەر بە من

هەبوو: دوای ئەوەی بەهۆی شەڕ و فەرامۆشیی سوڵتانمانەوە پارە و دیاریی بەخشراو بە نیگارکێشان بڕا، ماوەیەک، تاکە داهاتی شایەنی باسی هەر هەموویان، بەدەر لە مووچەکانیان، لە سایەی کتێبەکەی منەوە بوو. دەمزانی لەبەر من ئیرەییان بەیەکتر دەبرد، تەنانەت لەبەر ئەو هۆیە – هەر بەتەنیا ئەو هۆیە نا – یەک بەیەک لە ماڵی خۆمان چاوم پێیان دەکەوت و ئەمەش بەهیچ جۆرێک بەواتای ئەوە نەبوو دوژمنایەتیی من بکەن. هەموو نیگارکێشانی من، کەسانێکی تا ئەو ڕادەیە پێگەیشتوون بتوانن ئاقڵی بنوێنن و هۆکارێکی مرۆییانەتر بدۆزنەوە بۆ خۆشویستنی ئەو کەسەی ناچارن لە پێناوی بەرژوەندیی خۆیاندا حەزی پێ بکەن.

بۆ ئەوەی بێدەنگییەکە درێژە نەخایەنێت و نەگەڕێینەوە سەر هەمان بابەت، گوتم: "بێچاوێنی بێت، دەتوانن تابووتەکە بەهەمان ئەو خێراییەی لە هەورازەکە هێنایانە خوارەوە، سەربخەنە سەریشەوە."

پەپوولە، بەشێوەیەکی شیرین پێ کەنی و هەموو ددانەکانی دەرکەوتن: "لە تاو سەرما."

لە خۆم پرسی تۆ بڵێی ئەمە پیاوی پێ بکوژرێت، بۆ نموونە لەبەر ئیرەیی پێبردن، دواتریش من بکوژێت؟ دەیتوانی بیانوویێک بۆ خۆی بدۆزێتەوە: ئەم کابرایە سووکایەتیی بە ئاینەکەم دەکرد. بەڵام مامۆستایەکی مەزن و هونەربازێکی تەواوە، بۆچی بکوژێت؟ پیری هەر ئەوە نییە لە هەڵکشان بە هەورازدا دژواری بچێژی، پێویستە زیاتر نەترسانیش بێت لە مردن؛ جۆرێک بێت لە بێ زەوقی، وەک ئەوەی لە سۆنگەی زەوق هەستانەوە نا، بگرە شکاندنی تابوویەک بچێتە جێگای کچە کەنیزەکەوە. بە پەی پێبردنێکی لە ناکاوەوە، ئەو ساتە بڕیاری خۆم دا و لە ڕووی ویدا گوتم:

"ئیدی لەسەر کتێبەکەم بەردەوام نابم."

پەپوولە ڕووی تێم کرد و گوتی: "چۆن؟"

"نەگبەتییەکی تێدایە. سوڵتانیشمان پارەی بڕیوە. بە زەیتوون و لەقلەقیش بڵێ."

پێ دەچوو پرسیاری زیاتر بکات، بەڵام ئەوەندەمان زانی لە چڕە دار سەرووی قەدپاڵەکە و گژوگیای هەڵچوو و بەردی گۆڕستانەکەداین. لەبەرئەوەی گۆڕەکە بە




ئاپۆڕەی ڕیزبەستوو دەور درابوو و لە میانەی بەرزبوونەوەی دەنگی گوتنەوەی "بسم الله" و باشترینی مرۆڤ "رسول الله" و گریانەوە، حاڵی بووم لەو ساتەدا تەرمەکە بۆ ناو گۆڕ شۆڕ دەکرێتەوە.

یەکێک گوتی: "سەروچاوی باش بکەنەوە، باش."

کفنەکەیان لادا، ئەگەر چاوێک لە سەری ورد و خاشکراویدا مابێت، ئێستا لەگەڵ مردووەکە بۆ یەکتر دەڕوانن؛ بەڵام لەبەرئەوەی لە پشتەوە ڕاوەستابووم، نەمدەتوانی هیچ شتێک ببینم. من لەسەر گۆڕ نا، لە شوێنێکی زۆر جیاوازتر سەیری ناو چاوی مردنم کردووە.

بیرەوەرییەک: پێش سی ساڵ، باپیری بەهەشتنشینی سوڵتانمان کەوتبووە سەر کەڵکەڵەی وەرگرتنەوەی دوورگەی قوبرس لە ڤینیسیاییەکان. "شیخ الإسلام أبو سعود" ئەفەندیش بیری خستنەوە ئەم دوورگەیە سەردەمانێک لەلایەن سوڵتانەکانی میسرەوە بۆ بژێوی مەکە و مەدینە تەرخان کراوە و فەتوایەک دەردەکات و دەڵێت دوورگەیەک بژێویی شوێنگەلی لە ڕووانگەی ئاینی پیرۆزەوە دابین دەکات، مانەوەی لەژێر دەستی گاورانی کرستیاندا کارێکی ڕاست نییە. بەمجۆرە، یەکەمین ئەرکی باڵیۆزیم کارێکی زۆر دژوار بوو. دەبوو ئەم بڕیارە چاوەڕواننەکراوە بە ڤینیسیاییەکان ڕابگەیەنم و بڵێم پێویستە دوورگەکە بخەنە ژێر دەسەڵاتی ئێمەوە. کڵێساکانی ڤینیسیا گەڕیابووم، سەرم لە پرد و کۆشکەکان سوڕمابوو و کەوتبوومە بەر جادووی نیگاری ناو ماڵانی هەرە دەوڵەمەند. لەم سەرسامییەدا و بەپشتبەستن بە میوانپەروەریی ئەوان، نامەی پڕ لە هەڕەشەم ڕادەستیان کرد و داخوازی پۆزبڵندانەی سوڵتانم سەبارەت بەویستنی دوورگەی قوبرس پێ ڕاگەیاندن. ڤینیساییەکان بەڕادەیەک تووڕە بوون کار گەیشتە ئەوەی ئەنجوومەن دەستبەجێ کۆبێتەوە و بڕیار بدات تاوتوێکردنی نامەیەکی لەو جۆرە بگرە کارێکی دروست نییە. دواتر ئاپۆڕەی هەڵچوو منیان لە کۆشکی دۆق قایم کرد. ئەو سەرسەرییانەی لە پارێزەران و دەرگاوانەکان دەرباز بووبوون و خۆیان گەیاندبووە من، خەریک بوو بمخنکێنن. بەڵام دوو شەڕوانی نزیک لە دۆق بە هانامەوە هاتن و منیان بە پێچ و پەناکانی کۆشکدا فڕاند و گەیاندمیانە دەرگایەکی پشتەوە کە بەسەر جۆگە ئاوێکدا

دەیڕوانی. لەوێ، لە تەمێکی وەک ئەوەی ئێرەدا، بۆ تاوێک وام زانی ئەو بەلەموانە بالابەرز و سیسەڵە و سپیپۆشەی هاتە بەردەمم و خۆی دایە بن پیلم، مردن خۆیەتی و سەیری ناو چاوەکانیم کرد و خۆم تیایاندا بینی.

بە تاسەوە خەیاڵم لێ دا کتێبەکەم بە نهێنی تەواو بکەم و بتوانم جارێکی تر بچمەوە ڤینیسیا. گۆڕەکە بە ڕێکوپێکی دەکوترایەوە، لێی نزیک کەوتمەوە: ئێستا فریشتەکان لەوێدا دەیخەنە بەر لێپرسینەوە، پرسیاری ڕەگەز و ئاین و پێغەمبەری لێ دەکەن. بیرم لە مردنی خۆم کردەوە.

قەلەڕەشێک بە تەنیشتمدا فڕکەی کرد و هەڵفڕی. دۆستانە چاوم بڕییە ناو چاوانی قەرە و ویستم قۆڵ لە قۆڵم بکات و لە گەڕانەوەدا هاوڕێیەتیم بکات. پێم گوت سەرلەبەیانیی زووی ڕۆژی دواتر لە ماڵەوە بۆ کارکردن لە کتێبەکەدا چاوەڕێی دەکەم. چونکە هەر ئەوەندەی بیرم لە مردنی خۆم کردەوە، جارێکی تریش حاڵی بووم پێویستە بەهەر نرخێک بووە کتێبەکەم تەواو بکەم.



# 18

## دواجار پێم دەڵێن بکوژ

کاتێک خۆڵی ڕچیوو و قوڕاوی بەسەر جەستەی لەتوپەتکراوی زەریف ئەفەندیی بێچارەدا دەکرا، من لە هەمووان زیاتر گریام. هاوارم دەکرد و دەمگوت با منیش لەگەڵ ئەودا بمرم و لێم گەڕێن با منیش لەپاڵ ویدا بنێژرێم. بۆ ئەوەی نەکەومە گۆڕەکەوە، توند لە پشتەوە گرتیانم. کاتێکیش خەریک بوو هەناسەم لێ ببڕێت، لەپێ دەستیان بە ناوچەوانمدا هێنا و سەرمیان بۆ پشتەوە وەرچەرخاند تا بتوانم هەناسە وەربگرم و بدەمەوە. لە نیگای خزمەکانی خوا لێخۆشبووشەوە بۆم دەرکەوت زیاد لە پێویست هەنسک دەدەم و فرمێسکی چاو دەڕژێنم، بۆیە بەپەلە خۆم گورج کردەوە. لەوانەش بوو گریانی زۆرم ببێتە هۆی ئەوەی دووزمانەکانی نیگارخانە پێیان وابێت جۆرێک لە ڕایەڵیی دڵ لە نێوان من و زەریف ئەفەندیدا هەبووبێت.

بەمەبەستی ئەوەی سەرنجی زیاتر بۆ سەر خۆم ڕانەکێشم، تا کۆتاییی شاردنەوەی تەرمەکە، خۆم لەپاڵ دار چنارێکدا شاردەوە. خزمێکی زۆر گەمژەتری ئەو گەمژەیەی ڕەوانەی دۆزەخم کردبوو، لە پشت دار چنارەکەوە تەنگی پێم هەڵچنی و بە نیگایەک، کە خۆی زۆر بە توێکڵداری دەزانی، چاوی بڕییە ناو چاوانم. تێر و پڕ لە ئامێزی گرتم. دواتر ئەو گەمژەیە وای گوت: "تۆ شەمەیت یان چوارشەم؟" کاتێک من گوتم: "چوارشەم سەردەمانێک ناوی خوا لێخۆشبوو بوو"، ئەو سەری سوڕما.

ئەم ناسناوانەی تا ئێستا وەک نهێنییەک ئێمە پێکەوە گرێ دەدات، چیرۆکێکی زۆر سادەی هەیە. لە سەردەمی شاگردیماندا، هەموومان ڕێز و سەرسامی و ئەڤینێکی

له ڕادەبەدەرمان بۆ عوسمانی نیگارکێش هەبوو. ئەو کاتە تازە قۆناغی سوختەییی بڕیبوو و بووبوو بە وەستا. نیگارکێشێکی گەورە بوو، خوا هونەرێکی ئەفسووناوی و ئەقڵێکی جنۆکەئاسای پێ بەخشیبوو و هەموو شتێکی فێری ئێمە کرد. وەک ئەوەی دەبوو شاگردەکان هەموو بەیانیانێک بیکەن، پێویست بوو هەر ڕۆژە یەکێکمان بچێتە ماڵی مامۆستا، قوتووی قەڵەمەکانی و جانتاکەی و جلدبەندی پڕ لە کاغەزی هەڵبگرێت و تا نیگارخانە لە دوایەوە بڕوات و هاوڕێیەتیی بکات. ئێمە ئەوەندە هەوڵمان دەدا تا لێوەی نزیک بین، تا ڕادەی ئەوەی لە نێوان خۆماندا لێمان دەبوو بەشەڕ و هەریەکەمان دەیگوت ئەم بەیانییە من دەڕۆم.

مامۆستا عوسمان شاگردێکی لەبەر دڵان شیرینی هەبوو، بەڵام هەموو بەیانیانێک هاتنی ئەو دەبووە هۆی پەرەسەندنی دووزمانی و گاڵتەی بێئابڕووانە و لە بڕانەوەنەهاتووی ناو دەستەی نیگارکێشان. بۆیە مامۆستای گەورە بڕیاری دا هەر ڕۆژێکی هەفتە، یەکێکمان هاوڕێیەتیی بکات. مامۆستای مەزن ڕۆژانی هەینی کاری دەکرد و ڕۆژانی شەمە نەدەچووە نیگارخانە. کوڕەکەی وەک ئێمە شاگرد بوو و باوکی زۆر خۆشی دەویست و ساڵانی دواتر ناپاکیی لە بابی و لە هەمووان کرد و لە هونەر دوورکەوتەوە. ئەو ڕۆژانی دووشەم وەک شاگردێکی ئاسایی هاوڕێیەتیی باوکی دەکرد. برایەکی باریکەڵەی باڵابەرز و لە گشتمان بەتواناتریشمان هەبوو ناوی پێنجشەم بوو و دواتر بە نەخۆشییەکی نەزانراو بەدەم تاوە بە گەنجی کۆچی دوایی کرد. خوا لێخۆشبوو زەریف ئەفەندی ڕۆژانی چوارشەم دەهات، بۆیە ئەو چوارشەم بوو. بەڵام دواتر مامۆستای گەورەمان ناوەکانمانی لە سێشەمەوە بۆ زەیتوون، لە هەینییەوە بۆ لەقلەق و لە یەکشەمەوە بۆ پەپوولە گۆڕی. لەبەر خۆشەویستی و بەواتاوە و بە سروش وەرگرتن لە زەرافەتی زەڕکارییەکەی، بە زەریف ناوی ئەوی دەبرد. مامۆستای گەورە وەک ئەوەی لەتەک هەمووماندا دەیکرد، سەردەمانێک دەبوو گشت بەیانییەک بەئەویش بڵێت: "بەخێر بێیت چوارشەم، ئادەی بزانم چۆنی."

کاتێک بیرم کەوتەوە چۆن بانگی منی دەکرد، هەستم کرد چاوەکانم تەڕ بوون: سەربازی ئەو هەموو تێ هەڵدانەی لەسەر دەستی ئەو دەمانخوارد، لەبەرئەوەی



مامۆستا عوسمان ئێمەی خۆش دەویست، بە بینینی نیگارەکانمان ئاو دەڕژایە چاوانی و دەست و قۆڵمانی ماچ دەکرد و کاتێکیش ئەو ماچی دەکردین، هونەرەکەمان گوڵی ئەڤینی دەگرت و دەتگوت لە بەهەشتین. تەنانەت ئەو دڵپیسییەی لەو ڕۆژگارەدا سێبەری بەسەر بەختەوەرییەوە کردبوو، ڕەنگێکی تری هەبوو.

دەبینن هەست دەکەم کەسێکی تەواو دوولەتکراوم وەک ئەو مرۆڤانەی مامۆستایەک نیگاری سەر و دەستیان و یەکێکی تریش نیگاری جەستە و جلوبەرگیان دەکێشێت. کاتێک کەسێکی لە خواترسی وەک من، بێ ئەوەی پێشتر نیازی بووبێت، دەبێت بە بکوژ، وا بەزوویی ڕانایەت. بۆ ئەوەی وا هەڵسوکەوت بکەم وەک ئەوەی ژیانی کۆنم درێژەی هەبێت، دەنگێکی دووەمی شیاو بە بکوژیم پەیدا کردووە. ئێستا من بەو دەنگی دووەمە گاڵتەجاڕ و ناپاکە دەدوێم و ئەو دەنگەم بەهیچ جۆرێک تێکەڵی ژیانی کۆنی خۆم نەکردووە. بێگومان ئێوە جاروبار گوێتان لە دەنگە کۆن و ناسراوەکەشم دەبێت، ئەو دەنگەی ئەگەر بکوژ نەبوومایە، پێی دەدوام، بەڵام بەناوی "من بکوژم" نا، بگرە بە ناسناوی خۆمەوە. با کەس هەوڵ نەدات بۆ پێکەوە گرێدانی ئەم دووانە، چونکە من هیچ شێواز و کێماسییەکەم نییە تا بمدات بە دەستەوە. من بڕوام وایە شێواز یان هەر شتێکی تری جیاکەرەوەی نیگارکێشێک لە یەکێکی تر، کێماسییە نەک کەسایەتی وەک ئەوەی هەندێک کەس بە ستایشەوە دەیڵێن.

بەڵام ددانیشی پێدا دەنێم ئەمە لە ڕەوشی تایبەتی مندا گرفتێکی خوڵقاندووە، چونکە کاتێک ئێمە ناسناوەکانی خۆمان بەکار دەهێنین، واتا ئەو ناسناوانەی مامۆستا عوسمان بە عەشقەوە لێمانی ناوە و زاوا ئەفەندی بە خۆشەویستییەوە دووبارەیان دەکاتەوە، نامەوێت ئێوە بەهیچ جۆرێک تێ بگەن گەلۆ من پەپوولەم، زەیتوونم یان لەقلەق. ئەگەر تێ بگەن، ئەوا بەئەگەری زۆر، دەستبەجێ دەکەونە خۆ و ڕادەستی ئەشکەنجەدەرانی سەرگەورەی پاسەوانانم دەکەن.

لەبەرئەوە ناتوانم بیر لە هەموو شتێک بکەمەوە و بیدرکێنم. ڕاستییەکەی، کاتێک خۆبەخۆی خۆیشم بیر دەکەمەوە، ئاگام لێیە ئێوە چاودێریم دەکەن. بۆیە ناتوانم هەڵچوونەکانم و ئەو وردەکارییانەی ژیانم، کە بۆیان هەیە بمدەنە دەستەوە، بێ بیرکردنەوە بەخەیاڵی خۆمدا بهێنم. کاتێک سێ بەسەرهاتم بەناوی ئەلف، بێ و

جیمەوە بۆ گێڕانەوە، بە گۆشەیەکی ئەقڵم لە نیگای ئێوەم دەڕوانی.

ئەو شەڕوان و ئەڤیندار و شازادە و قارەمانی داستانانەی دەیان هەزار جار نیگارم کێشابوون، لایەکیان ڕووی لەو شتانەیە کە نیگاریان کێشراوە، لەوێندرێ، لەو دوژمنانەی لەو سەردەمە ئەفسانەییەدا شەڕیان لەدژ کردوون، لەو ئەژدیهایانەی خنکاندوویانن و لەو کچە شۆخانەی ڕۆندکیان بۆ دەڕێژن. بەڵام بەلایەکی تر و بە نیوەی جەستەیان بۆ ئەو نیگارپەروەرانە دەڕوانن کە سەیری ئەو نیگارە دانسقانە دەکەن. خۆ ئەگەر شێواز و کەسایەتییەکم هەبێت، ئەوا بەتەنیا لە نیگارمدا نا، بگرە لە تاوانەکەم و وشەکانیشمدا خۆی شاردووەتەوە. دەی بزانم، لە ڕەنگی وشەکانمەوە بمدۆزنەوە و بزانن من کێم؟

باوەڕیش ناکەم دەستگیرکردنی من لەلایەن ئێوەوە ئاسوودەیی بە ڕۆحی بەدبەختی زەریف ئەفەندیی بێچارە بدا. ئێستا کاتێک من لەژێر دار و بەدەم جریوەجریوی باڵندەوە سەیری ئاوی زێڕینی کەنداوی زێڕین و قوبەکانی ئەستەنبوڵ دەکەم و سەرلەنوێ پەی بەجوانی و خۆشیی ژیان دەبەم، بە بێڵ خاک بەسەر ئەودا دەکرێت. زەریف ئەفەندیی بەلەنگاز، لەم دواییانە و پاش ئەوەی دەستی کرد بە هاوڕێیەتیکردنی پیاوانی ئەو مەلا ئەرزەڕوومییە برۆ گرژە، هیچ حەزی بە چارەی من نەدەکرد، بەڵام لە ماوەی ئەو بیست و پێنج ساڵەی کتێبمان بۆ سوڵتانمان دەنەخشاند، کاتی وا هەبووە هەستمان بەنزیکی لە یەکتر کردووە. بیست ساڵ لەمەوبەر گاڤێک بۆ شانامەی باوکی خوا لێخۆشبووی سوڵتانمان کارمان دەکرد، بووین بەدۆست، بەڵام هەرە زیاد ئەو کاتە لە یەکتر نزیک بووینەوە کاتێک هەشت پەڕەمان بۆ دیوانی فزوولی دەنەخشاند. ئەو سەردەمە، بۆ بەشداربوون لە داخوازە ڕەوا، بەڵام نالۆجیکەکانی ئەو (گوایە پێویستە نیگارکێش ئەو دەقەی دەینەخشێنێت، لە ناخی خۆیدا هەستی پێ بکات)، هاتبوومە ئێرە، ئێوارەیەکی هاوین بەدەم فڕینی شێتانەی پۆلە پەڕەسێلکەوە بەسەر سەرماندا، من بەپشوودرێژی گوێم بۆ چەند بەیتێک ڕاگرت لەو بەیتانەی بەخۆبادانەوە لە دیوانی فزوولی دەیخوێندەوە. لەو شەوەوە ئەو نیوە بەیتەم لەبیر ماوە کە دەڵێت: "من من نیم، ئەوەی من دەڵێم منم، هەر تۆیت." ئەوەشم لەبیر ماوە لە خۆم پرسیبوو چۆن دەتوانم نیگاری ئەم نیوە بەیتە بکێشم.



هەر ئەوەندەی زانیم تەرمەکەی دۆزراوەتەوە، بە قەڵەمبازێک خۆم گەیاندە ماڵەکەی. باخچەی بچووکی ماڵەکەیان کە شوێنی دانیشتن و شیعرخوێندنەوەمان بوو، بووبووە ژێر بەفرەوە و هەستم کرد وەک گشت باخچەیەکی تر لە بینینەوەی دوای چەندین ساڵدا، بچووک بووەتەوە. ماڵەکەشی بەهەمان شێوە بوو. لە ژوورەکەی تەنیشتەوە، دەنگی هاوار و قیژەی زیاد پێوەنراوی ژنان شێوەی ئەوەی لە پێشبڕکێدا بن، دەهات. کاتێک برا گەورەکەی دەستی بە گێڕانەوە کرد، من گوێم ڕاگرت: سەروچاوی زەریفی برای بێچارەمان لەتوپەت بووە و سەری پان بووەتەوە. دوای دەرهێنانی لە بنی ئەو بیرەی چوار ڕۆژ بوو تیایدا بوو، براکانی لە ناسینەوەیدا دژوارییان بۆ پێش هاتبوو، قەلبییەی ژنی داماو لە ماڵەوە هێندرابوو و ناچار بووبوو لە تاریکاییی ئەنگوستەچاودا جلوبەرگی تیکەتیکە بووی ئەو مردووە نەناسراوە دەستنیشان بکات. دیمەنی دەرهێنانی یوسف لەلایەن بازرگانانی میدیانلییەوە هاتە بەرچاوم کە برایانی چاوچنۆکی فڕیان دابووە بیرەوە. زۆر کەیفم بەکێشانی نیگاری جڤاتی یوسف و زولێخا دێت، چونکە بیری مرۆڤی دەخاتەوە کە بنەڕەتترین هەست لە ژیاندا چاوچنۆکی و ئیرەیی پێبردنی برایانە.

کاتێک بێدەنگی بۆ تاوێک هاتە ئاراوە، هەستم کرد سەیری من دەکەن. ئەرێ بگریم؟ بەڵام نیگام چووە سەر قەرە. هیچ و پووچی نامەرد، لە هەموومان ورد دەبێتەوە و هەوڵ دەدات خۆی وا دەربخات وەک لەلایەن زاوا ئەفەندییەوە نێردراوەتە ناو نیگارکێشان داکو لە بناخەی ئەم کارە بکۆڵێتەوە.

برای گەورە لە ناکاو قیڕاندی: "کێ نامەردیی وای لە دەست دێت، چ بێ ویژدانێک دەستی چووەتە برای بێ وەیمان، ئەو مرۆڤەی تەنانەت خۆی لە قەرەی ئازاردانی مێرووڵەیەکیش نەدەدا؟"

یارۆ بەگریان وەڵامی پرسیارەکەی خۆی دایەوە و منیش بە خۆپێشاندانەوە وەک ئەوەی لە دڵەوە بێت، بەشداری ئەم پرسیارە بووم و بەدوای وەڵامێکدا بۆ خۆم گەڕام. دوژمنەکانی زەریف کێن؟ ئەگەر من نەمکوشتبا، کێی تر دەیکوشت؟ دێتەوە بیرم سەردەمانێک، – پێم وابێت ساڵانی ئامادەکردنی هونەرنامە بوو –، لەگەڵ هەندێک لە نیگارکێشان دەیکردە دەمەقاڵێ و لێیان دەبوو بەشەڕ، چونکە دەیگوت شێوازی

وەستایانی کۆن پشتگوێ دەخەن و بۆ ئەوەی زەڕکاریی هەرزانتر و چاپوکتر بکەن، ئێمە ئەو گشت ڕەنجە لە نەخشاندنی پەڕەدا دەدەین و ئەوان لێوارەکانیان تێک دەدەن. ئەوانە کێ بوون؟ بەڵام دواتر، بەپێی قسە و قسەڵۆک دەرکەوتووە ئەمە هۆکاری دوژمنکارییەکە نەبووە، بگرە ئەڤینی شاگردێکی جوانکیلەی بەرگ تێگر بووە لە نهۆمی خوارەوە. بەڵام ئەمە چیرۆکێکی زۆر کۆن بوو. وەکو تریش هەندێک کەس هەبوون لە زەرافەت و نەزاکەتی زەریف و ڕەوشی ژنانەی پڕ لە ڕێزی وی دڵگران بوون، بەڵام ئەمانە پێوەندیی بە هۆکاری ترەوە هەبوو: زەریف شێوەی کۆیلە بەشێوازە کۆنەکانەوە پەیوەست بوو، وردبوونەوەی زیاد لە پێویستی بۆ گونجاندنی نیگار و ڕەنگ، لە بەردەمی مامۆستا عوسمان بەوپەڕی زماندرێژی و زۆر بەنەزاکەتەوە باسی کەموکورتیی لە گۆڕێدانەبووی نیگارکێشانی تر – بەتایبەتی منی دەکرد... دوایین بەگژداچوونی ئەو پێوەندیی بە بابەتێکەوە هەبوو و ئەو مژارەش سەردەمانێک بەلای مامۆستا عوسمانەوە زۆر هەستیار بوو؛ نیگارکێشانی کۆشک بەدزییەوە کاریان بۆ دەرەوە دەکرد و ڕاسپاردەی ورد و بچووکیان لە دەرەوەی کۆشکدا پەسەند دەکرد. لەبەر کزبوونی مەیلی سوڵتانمان و کەمبوونەوەی ئەو پارەیەی لە سالانی دواییدا لە گەورەی خەزنەدارانەوە دەهات، سەرجەم نیگارکێشان دەستیان کردبوو بە سەردانی کۆشکی دوونهۆمیی پاشایانی هیچ نەزان و دنیانەدیتە و نیگارکێشی هەرە وەستای ناو نیگارکێشان شەوانە دەچووە سەردانی زاوا.

هیچ باکم نەبوو لەوەی زاوا بەبیانووی هەبوونی نەگبەتییەوە بڕیاری دا لەسەر کتێبەکەی، کتێبەکەمان بەردەوام نەبێت. بێگومان وای بۆ دەچێت زەریف ئەفەندیی مێشک بچکۆلەی وەک مێشکی باڵندە، بەدەستی یەکێک لە ئێمەی نەخشێنەری کتێبەکەی ئەو لەناو براوە. ئەگەر ئێوە لە شوێنی ئەو بوونایە، ئایا هەردوو هەفتە جارێک بەشەو بکوژێکتان بەمەبەستی نیگارکێشان بۆ ماڵی خۆتان بانگ دەکرد؟ یاخۆ لە پێشدا بڕیاری خۆتان دەدا کوا گەلۆ بکوژی ڕاستەقینە کێیە و باشترین نیگارکێش کێیە؟ هیچ گومانم نییە لەوەی دوای ماوەیەکی کورت تێ دەگات ئەو نیگارکێشانەی هاتوچۆی ماڵەکەی دەکەن، هونەرمەندترینیان لە ڕەنگڕێژییەوە بۆ زەڕکاری، لە خشتەکێشانەوە بۆ نیگارکێشی، لە کێشانی نیگاری ڕووەوە بۆ پەڕە



ڕیزکردن، کێیە و دڵنیام داوا دەکات لەمەوپاش بەتەنیا خۆم لەگەڵیدا بەردەوام بم. هیچ باوەڕ ناکەم خۆی دابگرێتە خوارەوە بۆ ئەو ئاستەی بیر لەوە بکاتەوە من نیگارکێشێکی خاوەن هونەری ڕەسەن نا، بکوژێکی ئاسایی بم.

بە تیلەی چاو سەیری ئەو قەرە ئەفەندییە، ئەو گەمژەیەی لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی، دەکەم. کاتێک ئەو جووتە پێکەوە لە گۆڕستان دەرچوون و لەگەڵ ئاپۆڕەی گۆڕستاندا بەرەو لەنگەرگای ئەیوب شۆڕ بوونەوە، منیش کەوتمە دوایان. ئەوان لە لەنگارگا سواری کەڵەکێکی چوار سەوڵی بوون. منیش لەگەڵ شاگردانی لاو، ئەوانەی مردوو و بە خاکسپاردنی تەرمەکەیان لەبیر چووبووە و لەناو خۆیاندا پێ دەکەنین، سواری کەڵەکێکی شەش سەوڵی بووین. لە دەروازەی فەنەرقاپی، جارێک کەڵەکەکانمان ئەوەندە لەیەک نزیک بوونەوە خەریک بوو بەیەکدا بکێشن. لەو ساتەدا زۆر باش لە نزیکەوە بینیم چۆن قەرە بە فسکەفسک هەندێک شتی بۆ زاوا دەگێڕایەوە. لەپڕ جارێکی تر بیرم کردەوە مرۆکوشتن کارێکی چەند سانایە. خوای خۆم، تۆ ئەم هێزە لە ڕادەبەدەرەت بەهەموومان داوە، کەچی چاوترسێنت کردووین تا بەکاری نەهێنین.

بەڵام مرۆڤ هەر ئەوەندەی کەوتە خۆ و جارێک ئەم ترسەی شکاند، دەستبەجێ دەبێت بە کەسێکی تر. جاران نەک هەر لە ئیبلیس، بگرە لە بچووکترین خراپەی هەناوی خۆیشم زراوم دەتۆقی. کەچی ئێستا هەست دەکەم خراپە شتێکە دەکرێت مرۆڤ خۆی لەژێر باریدا ڕابگرێت و بگرە شتێکی پێویستە بۆ نیگارکێش. ئەگەر دەستلەرزینی ئەو چەند ڕۆژەی دوای تاوانەکە بخەینە لاوە، ئەوا لەو ساتەوەی ئەو هیچ و پووچەم کوشتووە، فرە باشتر نیگار دەکێشم، درەوشاوەتر و بوێرانەتر ڕەنگ بەکار دەهێنم و لە هەموویشی گرینگتر، دەبینم هێزی خەیاڵم شاکار دەئافرێنێت. بەڵام ئایا چەند کەس لە ئەستەنبوڵ هەن ڕێز و بەها بۆ شاکارەکانم دابنێن؟

لە دەروازەی جیبالی و لە ناوەڕاستی کەنداوی زێڕینەوە بە هەڵچوونەوە لە ئەستەنبوڵم ڕوانی. لەپڕ هەتاو سەری دەرهێنا و قوبەکانی بە بەفر داپۆشراو لەژێر تیشکی هەتاودا بریسک و باسکیان بوو و دەدرەوشانەوە. کەواتە شارێک چەند گەورە و ڕەنگین بێت، بارتەقای ئەوەش گۆشە و پەنای هەیە بۆ شاردنەوەی تاوان و گوناهەکانتان. چەند جەنجاڵ بێت، هێندەش مرۆڤی تێدایە بۆ ئەوەی بە

تاوانەکانتانەوە بچنە ناویانەوە. ژیریی شاران، بە جیهانەکانی ناویان، کتێبخانەکانیان، نیگارکێشانیان، خۆشنووسان و دەرسخانەکانیان نا، بگرە پێویستە بەزۆریی ئەو تاوانانەی بەدرێژاییی هەزاران ساڵ لە کۆڵانە تاریکەکانیاندا چەپەڵانە ئەنجام دراون، بپێورێن. بەم لۆجیکە بێت، هیچ گومانم نییە لەوەی ئەستەنبوڵ ژیرترین شاری سەرتاسەری جیهانە.

منیش لە لەنگەرگای ئونقاپانی لەدوای زاوا و قەرەوە لە کەڵەک دابەزیم. کاتێک خۆیان دابووە پاڵ یەکتر و بە هەورازەکاندا سەردەکەوتن، منیش لە دوایانەوە بووم. لە شوێن سوتاوییەکی پشت مزگەوتی سوڵتان محەمەد ڕاوەستان و بۆ دوایین جار قسەیان کرد و پاشان لەیەکتر جودابوونەوە. کاتێک زاوا ئەفەندی بەتەنیا مایەوە، وەک پیرێکی کەنەفت و بێ تاقەت هاتە بەرچاوم. لە ناخی خۆمەوە ویستم بە قەڵەمبازێک خۆمی بگەیەنمێ و بوختانەکانی ئەو پڕوپووچەی لە ناشتنی تەرمەکەی دەهاتینەوە و ئەو شتانەی بۆ خۆپاراستن لەو بوختانە کردبووم، بۆ باس بکەم و لێی بپرسم: "ئەرێ ئەو قسانەی زەریف ئەفەندی ڕاستن؟ ئایا خراپ کەڵک وەرگرتن لە متمانەی سوڵتانمان و ناپاکیکردن لە شێوازەکانی نیگارکێشیمان و سووکایەتیکردن بە ئاینی خۆمان لەو نیگارانەدا هەیە کە ئێمە دەیانکێشین؟ گەلۆ دوایین نیگاری گەورەت تەواو کردووە؟"

کاتی ئێوارە لە ناوەڕاستی کۆڵانە بە بەفر داپۆشراوەکەدا ڕاوەستام، سەیری کۆتاییی تاریکی ئەو کۆڵانەم کرد کە زارۆک و باوکانی سەر ڕێی گەڕانەوەیماڵەوە جێیان دەهێشت و بۆ من و جنۆکە و پەری و ڕێگر و دز و خەمی دارە بە بەفر داپۆشراوەکان چۆڵیان دەکرد. لەوسەری کۆڵانەکە، لە ماڵی دوونهۆمی و ڕازاوەی زاوا ئەفەندیدا، ئێستا لەوێ، لەژێر ئەو بنمیچەی جارێک لە نێوان لقەکانی شابەڕووە ڕووتەڵەکانەوە بینیم، جوانترین ژنی دنیای لێیە. بەڵام من نامەوێت ئاوەزی خۆم لە دەست بدەم.



# 19

## من پارەم

من زێڕی عەیار بیست و دووی سوڵتانی عوسمانیم. مۆری بەشان و شکۆی حەزرەتی سوڵتانی کۆڵەکەی جیهانمانم بەسەرەوەیە. لەقلەقی ئەندامی دەستەی گەورە مامۆستایانی سوڵتانمان، لەبەرئەوەی دوای بە خاکسپاردنەکە و ئێستا لێرە، لەم قاوەخانە خەمگین و دڵگیرە بەنیوەی شەو نیگاری منی کێشا، نەیتوانی ئاوی زێڕم بەسەردا بکات. بەڵام دەی ئێدی ئێوە لە سەری خۆتاندا تەواوی دەکەن. نیگارەکەم لێرەیە، بەڵام خۆم لە کیسەی لەقلەقی مامۆستای گەورە و برای نیگارکێشماندام. ئێستا هەڵدەسێتە سەرپێ، من لە کیسەی خۆی دەردەهێنێت و پێشانی ئێوەم دەدات. سڵاو، سڵاو، سڵاو لە مامۆستایانی هونەرمەند و لە میوانان. بەتیشکی من بە شەوارە دەکەون، کاتێک تیشکی چراکە لەسەر من دەشکێتەوە، ئێوە خرۆش دەتانگرێت و ئیرەیی بە مامۆستا لەقلەقی خاوەنی هەرە دواییم دەبەن. مافی خۆتانە، چونکە لە من بترازێت، هیچ شتێکی تر نییە بۆ پێوانەی هونەری نیگارکێش.

مامۆستا لەقلەق ئەم سێ مانگەی دوایی چل و حەوت دانەی ڕەبەق زێڕی هاوشێوەی منی پەیدا کردووە. هەموومان لەم کیسەداین و بڕوانن لەقلەق ئەفەندی لە کەس نامانشارێتەوە و دەشزانێت لەناو نیگارکێشانی ئەستەنبوڵدا کەس نییە هێندەی ئەو پارەی دەست بکەوێت. زۆر سەربڵندم بەوەی لەناو نیگارکێشاندا وەک پێوەرێک پەسەند دەکرێم و کۆتایی بە گەنگەشەی ناپێویست دێنم. لە ڕابردوودا، گاڤێک هێشتا هۆگری قاوە نەبووبووین و هۆشمان نەهاتبووەوە سەرمان،

نیگارکێشانی ئەقڵ بچووکی وەک ئەقڵی مەل، ئێواران دەکەوتنە چەنەبازی و دەیانگوت: "نا، تۆ هونەرمەندتریت، نا، ڕەنگبازی ڕاستەقینە هەر خۆمم، من باشترین نیگاری دار دەکێشم، کەس نییە لە کێشانی نیگاری هەوردا شان لە شانم بدات." هەر بەوەندەشەوە نەدەگیرسانەوە، بگرە هەموو شەوێک دەکەوتنە گیانی یەکتری و ددانی یەکتریان دەشکاند. ئێستا باڵادەستیی لۆجیکی من بەسەر هەموو شتێکەوە، گونجانێکی شیرین بە نەزمی کاری نیگارخانە و بگرە ڕێکوپێکییەکی شایەن بە وەستایانی دێرینی هەراتی پێ دەبەخشێت.

با چەند شتێکی جۆراوجۆرتان بۆ بژمێرم کە دەتوانن بە گونجان و چۆنیەتیی ئەم لۆجیکەوە منیان پێ بگۆڕنەوە: تاکە پێیەکی پەنجا پێی کچە کەنیزەکێکی گەنج و شۆخ؛ ئاوێنەیەکی باشی سەرتاشی لە داری گوێز و چوارچێوە لە ئێسک گیراو؛ سندووقێکی نەوەت ئاکچەیی کاغەز زیوین و بە نیگاری هەتاو نەخێشندراو و ناودار و باش بۆیاخ کراو؛ سەد و بیست دانە نان؛ خاکی سێ گۆڕ و سێ تابووت؛ بازووبەندێکی زیوین؛ یەک لەسەر دەی ئەسپێک؛ لنگی ژنە کەنیزەکێکی بەتەمەن و قەڵەو؛ بەچکە گامێشێک؛ دوو قاپی باشی چینی؛ مووچەی مانگێکی نیگارکێشی عەجەم دەروێش محەمەدی تەورێزی و زۆربەی نیگارکێشانی تری وەک وی لە نیگارخانەی سوڵتانمان؛ بازێکی باش بە قەفەسەوە؛ دە گۆزە شەرابی پانایۆت* بەسەربردنی سەعاتێکی بەهەشتی لەگەڵ مەحموودی شۆخە کوڕی ناسراوی دنیا و زۆر توانای تری لە ژماردن نەهاتوو.

ماوەیەک پێش ئەوەی بێمە ئێرە، دە ڕۆژم لە گۆڕەویی چڵکنی شاگرد پینەچییەکی هەژاردا بەسەر برد. ئەو بێچارەیە، هەموو شەوێک بەدەم ژماردنی ئەو شتە لە بن نەهاتووانەوە کە دەیویست بە من پەیدایان بکات، خەو دەیبردەوە. بەیتەکانی ئەم شیعرە درێژە شێوەی لاواندنەوە شیرینن و بۆ من بەڵگەی ئەوەن کون نەماوە پارەی تێ نەکەوتبێت.

ئەوە ناوی کونم هێنا، شتێکم بیرم کەوتەوە؛ ئەگەر بەسەرهاتی پێش لە هاتنم بۆ ئێرە بگێڕمەوە، چەندین بەرگ کتێبی لێ دەردەچێت. خۆبەخۆی خۆمانین و بێگانەمان

(*) پانایۆت: مارکەیەکی شەرابی یۆنانیی نایاب و ناسراوە و مێژوویەکی کۆنی هەیە. – وەرگێڕ –



لەناودا نییە، ئەگەر بۆ کەسی نەگێڕنەوە و لەقلەق ئەفەندیش لێمان لالووت نەبێت، ڕازێکتان بۆ دەدرکێنم. سوێند دەخۆن؟

باشە. ددانی پێدا دەنێم. من زێڕی ڕاستەقینەی عەیار بیست و دووی سوڵتانی عوسمانی نیم و لە سکەخانەی چەمبەرلیتاشی لە قاڵب نەدراوم. من پارەیەکی قەڵبم. منیان لە ڤینیسیا لە زێڕی عەیار نزم دروست کرد و هێنامیانە ئێرە و بەناوی زێڕی عوسمانییەوە خستیانمە بازاڕەوە. زۆر سوپاستان دەکەم لەپای تێگەیشتنتان.

وەک ئەوەی من لە سکەخانەی ڤینیسیا گوێم لێ بوو، ساڵانێکە ئەم کارە دەکرێت. بەڵام تا ئەم ماوەیەی دواییش، ئەو زێڕە عەیار نزمانەی گاورانی ڤینسیایی هێنایانە ڕۆژهەڵات و بڵاویان کردەوە، کاری دۆقەکانی ڤینیسیا خۆیان بوو و لە هەمان سکەخانەدا ئەنجامیان دەدا. عوسمانییەکانیش بە لۆجێکی ئەوەی چی لەسەر شتێک نووسرابێت ئیدی هەر ئەوەیە، ڕەفتار دەکەن. کاتێک بینییان نووسراوی سەر زێڕەکان هەمان شتە و لەبەرئەوەی لە دووکانەکانی خۆیان گوێیان بەڕێژەی زێڕ لە پارەکاندا نەدا، زێڕی قەڵبی ڤینیسیایی ئەستەنبوڵی پڕ کرد. دواتر فێربوون بە گەستن پارەی قەڵبی زێڕ کەم و مس زۆر بناسنەوە. بۆ نموونە، لەتاو ئاگری ئەڤین قرچەت دێت و دەسووتێیت، بەپەلەپرووزێ خۆت دەگەیەنیتە کن مەحموودی کوڕە شۆخی شۆخان، ئەو کوڕەی سەرانسەری دنیا ئەڤیندار و کوشتەیەتی. ئەویش لە پێشدا لەبری هەرامەکەت، پارەکە بۆ دەمی دەبات، گازێکی لێ دەگرێت و دەڵێت قەڵبە، بۆیە لەبری سەعاتێک، تەنیا نیو سەعات دەتبات بۆ بەهەشت. کاتێک گاوری ڤینیسیایی بینی پارە قەڵبەکەی ئەو ئەنجامە تراجیدیانەی هەیە، گوتی بارەخ با زێڕی ساختەی عوسمانیش دروست بکەم، خۆ ئەوان هەر هەستی پێ ناکەن، ناکەن.

ئێستا دەمەوێت سەرنج بۆ سەر دۆخێکی سەیر و نامۆ ڕابکێشم. ئیدی ئەم گاورانەی ڤینیسیا کاتێک نیگار دەکێشن، وەک ئەوە وایە نیگار نا، بگرە ڕاستیی شتە نیگار کێشراوەکان بئافرێنن. بەڵام گاڤێک پارە دروست دەکەن، ڕاستەقینەکەی نا، ساختەکەی دروست دەکەن.

لە ڤینیسیا خراینە سندووقی ئاسنەوە، لە کەشتی سوار کراین، بە لارەلار و ژەندنەوە گەیشتینە ئەستەنبوڵ. لە دووکانی سەڕافێک، لە دەمی وەستایەکدا خۆم

ديتەوە. كابرا بۆنی سیر لە دەمیەوە دەهات. کەمێک چاوەڕێمان کرد و نەکرد، دێهاتییەکی گێژەڵۆکە هات بۆ زێڕ وردکردنەوە. وەستای سەڕافی ئیبلیسی کوڕی ئیبلیس گوتی: "ئادەی بزانم زێڕەکەت قەڵبە، بێنە با بیگەزم." زێڕەکەی لە کابرای گوندی وەرگرت و نایە دەمی.

کاتێک لە دەمیدا دەیگێڕا، بینیم ئەوەی یارۆی دێهاتی زێڕی ڕاستەقینەی سوڵتانی عوسمانی بوو. زێڕەکەی تر بە بینینی من لە بۆنی سیردا، گوتی: "تۆ سەختەی." خۆ ڕاستی دەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی لووتبەرزانە هاتبووە گۆ و شکۆی منی شکاندبوو، منیش درۆم کرد. گوتم: "قەڵبی ڕەسەن هەر خۆتی."

کابرای لادێیی گێژەڵۆکە لەو ساتەدا بە شان و باڵی زێڕەکەی خۆیدا هەڵدەدا و دەیگوت: "مەگەر زێڕی من قەڵب دەردەچێت؟ بیست ساڵە لەژێر خاکدا شاردوومەتەوە، بۆچی ئەو سەردەمە بێ ڕەوشتیی لەمجۆرە هەبوو؟"

کاتێک من بەپەرۆش بووم بزانم چ دەقەومێت، کابرای سەڕاف زێڕی گوندییەکە نا، منی لە دەمی دەرهێنا و گوتی: "بگرە، ئەوە زێڕەکەتە. پارەی قەڵبی گاوری نامەردی ڤینیسیاییم ناوێت." جنێوێکیشی گرتە یارۆی گێژەلۆکی دێهاتی و گوتی: " ئەوە تۆ هیچ شەرم لە خۆت ناکەیت؟" ئەویش کەمێک وەڵامی دایەوە و منی هەڵگرت و بردمی. دوای ئەوەی قسەی لە هەمان شێوەی لە سەڕافەکانی تریش بیست، دڵی شکا و منی وەک پارەی زێڕ نزم بە نەوەد ئاکچە ورد کردەوە. گەشتی حەوت ساڵەی لە بڕانەوە نەهاتووم لەم دەستەوە بۆ ئەو دەست، ئا بەوجۆرە دەستی پێ کرد.

دەتوانم بە شانازییەوە بڵێم وەک ئەوەی پارەیەکی ئاقڵ پێویستە بیکات، زۆربەی کاتی خۆم لە ئەستەنبوڵ لەم کیسەیەوە بۆ ئەو کیسەیە و لەم پشتوێنەوە بۆ ئەو گیرفانە بەسەر برد. ترسی گەورەم ئەوە بوو بخرێمە بنی گۆزەیەکەوە، یان بەساڵان لەژێر بەردی ناو باخچەیەکدا بشاردرێمەوە، ناڵێم هیچ بەسەرم نەهات، بەڵام لەبەر هۆیەک، کە نازانم چی بوو، ئەم دەمانەی تەنگاسی کورتیان دەخایەند. زۆرینەی ئەوانەی منیان دەکەوتە دەست، بەتایبەتیش ئەگەر بۆیان دەربکەوتایە ساختەم، دەیانویست بە زووترین کات لە کۆڵم بکەنەوە. هێشتا تووشی هیچ کەسێک نەبووم بە وەرگری بێ ئەقڵم بڵێت ئەم پارەیە قەڵبە. بەڵام ئەوانەی هەستیان بە قەڵبیم نەدەکرد



و سەد و بیست ئاکچەیان لە پێناومدا دەژمارد، هەر ئەوەندەی دەیانزانی فریو دراون، تا ئەو کاتەی کەسێکی تریان فریو دەدا و لە من ڕزگاریان دەبوو، بە تەنگژەی هەڵچوون، ناشادی و بێ ئۆقرەییدا تێ دەپەڕین و لە خۆیان دەدا. سەرباری ئەوەی لە ماوەی ئەو تەنگژەیەدا چەندین جار هەوڵیان دەدا خۆشیان و کەسانی تریش لەخشتە ببەن (لەتاو هەڵچوون و بێ ئۆقرەیی هەمیشە مایەپووچ دەبوون)، لە دڵەوە جنێویان بەو کەسە دەدا کە منیان پێ دەفرۆشت و پێیان دەگوت: "بێ ڕەوشت."

بەدرێژاییی ئەم حەوت ساڵەی ڕابردوو، لە ئەستەنبوڵ پێنجسەد و شەست دەستم گۆڕیوە. ماڵ، دووکان، بازاڕ، مزگەوت، کڵێسا و سیناگۆگ نەماوە سەری پێدا نەکەم. چەند زیاتر گەڕیام، بینیم زیاتر لەوەی من پێشبینی دەکەم، لە پشتملە باسم دەکرا، ئەفسانەم بۆ دەسازێندرا و درۆم لەبارەوە دەکرا. بێ هەدادان بە ڕوومدا دەدرایەوە و دەگوترا: لە من بترازێت، هیچ نرخێک و بەهایەکی تر نەماوە، بێ بەزەییم، چاو کوێرم، منیش حەزم لە پارەیە، چ جێی داخە دنیا لەسەر من بنیات نراوە، دەتوانم هەموو شتێک بکڕم، چەپەڵم، سەرسەری و نامەردم. ئەوانەی لە قەڵبببوونم ئاگادار دەبوونەوە، بە هەڵچوونی زیاترەوە ڕەفتاریان دەنواند و شتی خراپتریان پێم دەگوت. لەگەڵ دابەزینی بەهای ڕاستەقینەمدا، بەهای مەجازیم لە هەڵکشان بوو. بەڵام سەرباری ئەو گشت مەجازە بێ ویژدان و ئەو هەموو بوختانە بێ بناخەیە، بینیم زۆربەی خەڵکی بە عەشقێکی لە دڵەوە هەڵقوڵاو حەزم لێ دەکەن. من پێم وایە، ئەم خۆشەویستییە لە دڵەوە هەڵقوڵاوە، بگرە ئەم سێڵاوی حەز لێکردنە، شتێکە پێویستە لەم سەردەمە خۆشەویستی لێ داماڵدراوەدا هەموومان دڵخۆش بکات.

کۆڵان بە کۆڵان و گەڕەک بە گەڕەک هەموو گۆشەیەکی ئەستەنبوڵم بینیوە، لە جوولەکەوە بیگرە بۆ ئابخاز، لە عەرەبەوە بۆ مینگەریان، دەستی هەموو کەسێکم ناسی. جارێک لە کیسەی مەلایەکی ئەدرنەییدا کە بۆ مانیسا دەچوو، چوومە دەرەوەی ئەستەنبوڵ. کاتێک جەردە ڕێیان پێمان گرت و هاواریان کرد: "یان ڕۆحت، یان ماڵت"، مەلای بێچارە بەشپرزەیی ئێمەی لە کونی دواوەیدا شاردەوە. ئێرە لەناو دەمی کابرای سیرخۆر پیستر بۆنی دەهات و زۆر دژوار بوو. بەڵام دوای کەمێک

یەکسەر هەموو شتێک وەرگەڕایە سەر خراپتر، چونکە جەردەکان بە مەلایان نەگوت: "یان ماڵت یان ڕۆحت."، بگرە گوتیان : "یان شەرەفت، یان ڕۆحت." و ڕیزیان بۆ بەست. توخوا لێ گەڕێن با هیچ بۆتان باس نەکەم لەو کونە تەنگەدا چمان بەسەرهات. لەبەرئەوە و لەو کاتەوە هیچ حەزم لە چوونە دەرەوەی ئەستەنبوڵ نییە.

لە ئەستەنبوڵ هەمیشە خۆش ویستراوم. کچانی لاو، وەک ئەوەی پیاوی خەونەکانیان بم، منیان ماچ دەکرد، منیان لە کیسەی قەدیفەدا، لە بن سەرین، لە نێوان مەمکە زلەکانیان و لە دەرپێکانیاندا دەشاردەوە و بۆ ئەوەی بزانن لە جێی خۆم ماوم، بەدەم خەوەوە دەستیان لێم دەدا. لە تەنیشت ئاگردانی ناو گەرماوێکەوە، لە جزمەیەکدا، لە بنی شووشەیەکی بچووکی بۆنخۆشی ناو دووکانی کابرایەکی مسکفرۆش و لە گیرفانی نهێنیی جەواڵە نیسکی ئاشپەزێکدا خۆم شاردەوە. لە پشتوێنی دروستکراو لە چەرمی حوشتر، لە بەتانیی چندراو لە جاوی میسری، لە ناوکەفی کەتانی پێڵاو و لە گۆشەی شاراوەی شەرواڵی ڕەنگاوڕەنگدا هەموو ئەستەنبوڵ گەڕام. پەترۆی سەعاتچی منی خستە شوێنی شاراوەی سەعاتە چەکوشدارەکەیەوە و بەقاڵێکی ڕۆمیش ڕەپ و ڕاست منی خستە ناو پەنیری مەڕەوە؛ پێکەوە لەگەڵ مۆر و خشڵ و کلیل لە پارچەی کەتانەوە پێچراین و لە دووکەڵکێش، ناو ئاگردان، بن پەنجەرە، لەناو سەرینی دروستکراو لە پووش، لە شوێنی نهێنیی دۆڵابی زەمینی و سندووقدا شاردرامەوە. باوکانێکم بینی هەر جارناجارێک لەسەر خوانی نان هەڵدەستان و بۆ ئەوەی بزانن لە شوێنی خۆم ماوم، سەیرێکیان دەکردم؛ ژنگەلێکم بینی بێ ئەوەی پێویست بکات، منیان وەک شەکر دەخستە دەمیان و دەیانمژیم؛ منداڵم بینی بۆنیان دەکردم و منیان دەخستە کونی لووتیانەوە و پیر و کەنەفتی وەهام بینی سەرباری ئەوەی پێیان لە لێواری گۆڕ بوو، ئەگەر ڕۆژی حەوت جار منیان لە کیسەی چەرم دەرنەهێنایە و سەیریان نەکردمایە، ئۆقرەیان نەدەگرت. ژنە چەرکەزێکی وردبین هەبوو، دوای ئەوەی بەدرێژاییی ڕۆژ ماڵی گسک دەدا و دەسڕییەوە، ئێمەی لە کیسە دەردەهێنا و فلچەی دارینی تێمان هەڵدەسوو؛ سەڕافێکی یەکچاو بێ ڕاوەستان قوولەی لێمان دروست دەکرد؛ کۆڵبەرێک بۆنی گوڵە شیلان لە دەستەکانی دەهات، خۆی و خێزانەکەی، وەک ئەوەی سەیری دیمەنێک





بکەن، بۆ ئێمەیان دەڕوانی؛ زەڕکارێکیش کە ئێستا لەناوماندا نییە –پێویست ناکات ناوی بهێنین–، ئێواران، بێ پسانەوە ئێمەی لە دۆخی جۆراوجۆردا ڕیز دەکرد. بە کەڵەکی داری ماون(*) گەڕام و چوومە کۆشک و هاتمە دەرەوە، خۆم لە بەرگی دەستکاری هەرات و لە پاژنەی ئەو پێڵاوانەی بۆنی گوڵیان لێ دێت و لە توێی کورتاندا شاردەوە. سەدان دەستی چڵکن، تووکن، خرپن، چەور، لەرزۆک و پیرم بینی. بۆنی جڤاتی ئەفیۆن کێشان و کارخانەکانی بەرهەمهێنانی مۆم و باسترمەی ماسیی قومری و بۆنی هەموو ئارەقەدەردانی ئەستەنبوڵ بە ڕوومدا پژا. پاش تێپەڕبوون بەو هەموو جۆش و خرۆش و بزاوتەدا، کاتێک ئەو ڕێگرە نامەردە دوای بڕینی ملی قوربانییەکەی لە تاریکاییی شەودا، منی خستە کیسەی خۆیەوە و لە ماڵە شوومەکەی تفێکی لێ کردم و گوتی: "تف، هەمووی لە چارەی تۆوەیە"، من ئەوەندەم ئازار چێشت و دڵم ڕەنجا، بەڕادەیەک خۆزگەم بە لەناوچوونی خۆم دەخواست.

بەڵام ئەگەر من نەبم، کەس ناتوانێت نیگارکێشی باش و خراپ لە یەکتری جیا بکاتەوە و لەبەرئەوەی نیگارکێشان لەم ڕووەوە دەست بە کوشتنی یەکتر دەکەن، من لەناو نەچووم و چوومە کیسەی هونەرمەندترین و هۆشمەندترین نیگارکێشەوە و بۆ ئێرە هاتم.

ئەگەر ئێوەش نیگارکێشی لەو باشترن، دەسا من بەدەست بخەن.

(*) داری ماون یان ماهاگۆنی: دارێکی ئەستووره و لە ڕابردوودا بۆ دروستکردنی کەڵەک و بەلەم سوودی لێ وەرگیراوە. – وەرگێڕ –

# 20

## من ناوم قەرەیە

تۆ بڵێی باوکی شەکوورە تا چ ڕادەیەک لەو نامانە ئاگادار بێت کە من و شەکوورە بۆ یەکتری دەنێرین؟ لە نامەکانی شەکوورەدا خۆپێشاندانی هەڵوێستی کچی نەوێر و لە باوک ترساو بەدی دەکرێت و ئەگەر من سەرنجی ئەو خۆپێشاندانەم بدابایە، دەبوو بگەمە ئەو ئاکامەی ئەوان لە نێوان خۆیاندا بەیەک وشەش باسی منیان نەکردووە، بەڵام هەستم دەکرد دۆخەکە وا نییە. نیگای فێڵبازانەی ئەستەر، جادووی دەرکەوتنی شەکوورە لە پەنجەرەدا، پێداگرتنی زاوا لەسەر ناردنی من بۆ لای نیگارکێشان و ئەو بێچارەییەی ئەم بەیانییە لە کاتی بانگهێشتنکردنی مندا بە ڕوویەوە بینیم، منی نیگەران دەکرد.

بەیانی، زاوام هەر ئەوەندەی منی لە بەردەم خۆیدا دانیشاند و دانەنیشاند، دەستی کرد بە گێڕانەوەی باسی ئەو پۆرترێتانەی لە ڤینیسیا دیبوونی. وەک باڵیۆزی سوڵتانی کۆڵەکەی جیهانمان هاتوچۆی زۆر کۆشک،ماڵی دەوڵەمەند و دێری کردووە. بەڕۆژان لە بەردەم هەزاران پۆرترێتدا ڕاوەستاوە، هەزاران ڕووی بینیوە نیگاریان لەسەر قوماشی ڕاکێشراو و و تەختە و لە چوارچێوەدا بە دیوارەوە کێشراون. گوتی: "هەریەکیان جیاوازترە لەوانی دی، بەتاقی تەنیا ڕووی بێ هاوتای مرۆڤە." زاوام بە هەمەجۆری، ڕەنگ، نەرمی و خۆشیی ئەو تیشکەی دەکەوێتە سەر ڕوویان، تەنانەت بە دژوارییان و بەواتای ناو چاویان مەست بووە.

گوتی: "کتومت دەڵێی پەتایان گرتووە، هەمووان، هەموو ڤینیسیا پۆرترێی خۆیان



بە کێشان دەدەن. ئەوانەی پارە و هێزیان هەیە، هەم بۆ ئەوەی بۆ ژیانیان ببێت بە نیشانە و بیرەوەری و هەم وەک ئاماژەیەک بۆ سامان و هێز و دەسەڵاتیان، پۆرترێتی خۆیان بەکێشان دەدا. مەبەستیان ئەوەیە لەوێ، لە بەرامبەرماندا ڕابووەستن، هەبوونی خۆیان بەیەکتر ڕابگەیەنن و ئاماژەی ئەوەمان بدەنێ کەوا لە کەس ناچن و لە هەموو کەسێک جیاوازترن."

شێوەی ئەوەی لە بارەی ئیرەیی و تەماح و چاوچنۆکییەوە بدوێت، وشەکانی بێ ڕەوشتانە بوون، بەڵام کاتێک لەمەڕ ئەو پۆرترێتانەی لە ڤینیسیا بینیبووی قسەی دەکرد، جاروبار ڕووی بۆ تاوێک وەک ڕووی منداڵ ڕووناک دەبووەوە و پڕ دەبوو لە ژیان.

درێژەی دەدایێ و دەیگوت دەوڵەمەندانی پارێزەری نیگار، میر و خێزانە گەورەکان لە هەموو هەلێکدا نیگاری سەروچاوی خۆیان بەکێشان دەدا و ئەمەیان کردبووە نەخۆشییەکی ئەوتۆ، تەنانەت ئەو گاورانە کاتێک نیگاری دیمەنی چیرۆکی ئایینی وەرگیراویان لە ئینجیلەوە لەسەر دیواری کڵێساکان بە دروست کردن دەدا، مەرجیان دادەنا ڕووی خۆیشیان بخرێتە ناو نیگارەکانەوە. بەوجۆرە، بۆ نموونە، سەیری نیگاری بە خاکسپاردنی ستێفانی پیاوچاکت دەکرد، های لەوە، دەتبینی ئەو میرەی بە شادی و خۆشی و پیاهەڵدانی زۆرەوە نیگاری سەر دیوارەکانی کۆشکی پێشانی تۆ داوە، لە نیگارەکەدا، لەناو ئاپۆڕەی چاو بەگریانی سەر گۆڕەکەدایە. دواتر لە نیگاری پێشاندەری پەترۆسی پیاوچاکدا کە بە سێبەری خۆی نەخۆش چاک دەکاتەوە، کاتێک بۆت ئاشکرا دەبوو ئەو نەخۆشە بەدبەختەی لەتاو ئازاردا هەدادانی نییە و لەلایەکی ناو نیگارەکەدا ڕاکشاوە، برای خانەخوێی بەنەزاکەتت و لە بەراز لەشساغترە، تۆ تووشی خەیاڵشکاندن دەبوویت. ڕۆژی دواتریش، ئەمجار لە نیگارێکی پێشاندەری زیندووبوونەوەی مردوواندا، سەیری دیمەنی مردنی کەسێکت دەکرد کە پێش کەمێک لەسەر خوانی نیوەڕۆ لە تەنیشت تۆوە ورگی بە مێزی نانخواردنەوە نابوو.

زاوام بە ترسێکەوە وەک ئەوەی باسی هێزی بەکێشکردنی ئیبلیس بکات، گوتی: "هەندێکیشیان کاریان هێندە بردووەتە پێشەوە، تەنیا بەمەبەستی ئەوەی خۆیان بخەنە نیگارێکەوە، ڕازی بوون لە نیگارەکەدا ببن بەو خزمەتکارەی جامی مەی پڕ

دەکــات، ئەو دڵڕەقــەی ژنێکی زیناکــار بەردباران دەکــات، یان بکوژێکی دەست بەخوێن."

خۆم لە نەزانی دا و گوتم:

"ئەمە کتومت وەک ئەوە وایە لە کتێبی ئەفسانە کۆنەکانی عەجەمدا دانیشتنی شا ئیسماعیل لە سەر تەختەکەی ببینین. یان وەک ئەوەی لە داستانی خەسرەو و شیریندا تووشمان ببێت بە تووشی نیگاری تەیمووری لەنگەوە کە سەردەمانێکی زۆر درەنگتر لە دوای ئەوان فەرمانڕەوایی کردووە."

ئەرێ ئەوە لە شوێنێکی ماڵەکەوە دەنگی خشەخشێک دەهات؟

دواتر زاوام گوتی: "بەڵام وەک بڵێی ئەو نیگارە فەرەنگییانە بۆ ترساندنی ئێمە دەکێشرێن. نیگارەکان تەنیا بەهێز و دەوڵەمەندیی ئەو کەسانەی بە کێشانیان داون، نامانترسێنن. هەروەها تێ دەکۆشن بیبەنە مێشکمانەوە کە بوونمان لەم دنیایەدا شتێکی زۆر تایبەت و پڕ لە ڕازە. ئەوان دەخوازن بە ڕوو و چاو و شێوەی ڕاوەستانی بێ هاوتایان و بەو جلوبەرگانەیان کە لۆ بەلۆی لەژێر سێبەردایە، ببنە نموونەی ئافرێندراوێکی پڕ لە نهێنی و بمانترسێنن."

بۆمی گێڕایەوە جارێک چووەتە کۆشکی موڵکدارێکی دەوڵەمەند لە لێوار دەریاچەی کۆمۆ و یارۆ ئارەزوومەندێکی شەیدا بووە و لە شاوە بۆ کاردینالێ و لە ئەفسەرانەوە بۆ شاعیران، نیگاری ڕووی هەموو ناودارانی مێژووی فەرەنگی کۆکردووەتەوە و ئەمیش لەناو ژوورەکانی باخچەی شاهانەی پۆرترێتەکاندا ون بووە. گوتی: "خانەخوێی میوانپەروەر بەشانازییەوە بە ماڵی خۆیدا دەیگێڕام، کاتێک منی بەجێ هێشت بۆ ئەوەی بە ئارەزووی دڵ بە ماڵەکەیدا بگەڕێم، بینیم ئەو کەسایەتییە گاورە گوایە گرینگانەی کە زۆربەیان وەک کەسی ڕاستەقینە دێنە بەرچاو و هەندێکیشیان ڕێک بۆ ناو چاومیان دەڕوانی، تەنیا لەبەرئەوەی پۆرترەیان کێشرابوو، بووبوون بە کەسانێک بۆ زیاتر پڕکردنی ئەم دنیایە. کێشانی پۆرترێتی ئەوان شتێکی ئەوەندە ئەفسووناویی پێیان دابوو و هێندە بێ هاوتای کردبوون کە من لەناو نیگارەکاندا بۆ تاوێک هەستم کرد خەوشدار و بێ هێزم. وەک ئەوەی بڵێی ئەگەر بەم شێوازە نیگارم بکێشرایە، باشتر تێ دەگەیشتم بۆچی لەم دنیایەدام."



دواجار، دەستبەجێ حاڵی بووە نەخشی ئیسلامی، ئەو هونەرەی لەسەر دەستی کۆنە وەستایانی هەراتیدا گەیەندراوە بە قۆناغی کەماڵ و نەگۆڕی، بە خولیای پۆرترێت کۆتایی پێ دێت و لەم ڕووەوە لە ویست و ئارەزووی خۆی ترساوە. گوتی: "بەڵام وەک بڵێی دەمویست هەستیش بکەم لە گشت کەسێک جیاوازترم و لە کەس ناچم و لە شێوەم نییە."

بەوجۆرە، هەستی کردووە وەک ئەو کاتانەی ئیبلیس بەرەو گوناھ بەکێشمان دەکات، ئەو بە ڕاکێشانی داخوازی شتێکی بەهێزەوە بەکێش کراوە بەرەو ئەو شتەی لێی ترساوە. "نازانم چۆن باسی بکەم، وەک بڵێی داخوازێکی گوناهبارانە بوو، وەک خۆ گەورەنواندن لە بەرامبەر خوادا، خۆ بە شتێکی گرینگ زانین و شێوەی خۆ جێگیرکردن لە چەقی دنیادا."

دواتر هەستی کردووە ئەم شتەی لە دەستی وەستایانی فەرەنگدا بووە بە گەمەی منداڵێکی لەخۆبایی، ئەگەر لەلایەن سوڵتانی باڵامانەوە ئاڕاستە بکرێت، دەبێتە هێزێکی ڕەوای ئەوتۆ بتوانێت جادووش تێ پەڕێنێت و بینەران بخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە و خزمەت بە ئاینەکەمان بکات.

هەر لەو سەروبەندەشدا بووە بیرۆکەی کتێبێک بۆ نیگاری سوڵتانمان و ئەو شتانەی ئەو دەنوێنن، هاتووەتە ئاراوە. زاوام، دوای گەڕانەوەی بۆ ئەستەنبوڵ، کاتێک بە حەزرەتی سوڵتانمانی گوتووە زۆر باش دەبێت ئەگەر لەسەر شێوازی فەرەنگیدا نیگاریان بکێشرێت، ئەو دەسپێک ناڕەزاییی پێشان داوە.

گوتوویەتی: "شتی بنەڕەتی چیرۆکە. نیگاری جوان چیرۆک بەزەرافەتەوە تەواو دەکات. کاتێک هەوڵ دەدەم بیر لە نیگارێک بکەمەوە کە نابێت بەتەواوکەری چیرۆکێک، وام بە خەیاڵدا دێت ئەو نیگارە دواجار دەبێت بە بت، چونکە ئەگەر بروامان بە چیرۆکێکی نەبوو هەبێت، واتای ئەوەیە باوەڕ بەو نیگارە و بەو شتەش دەهێنین. ئەمە شتێکە لە وێنەی پەرستنی بتەکانی کەعبە بەر لەوەی پێغەمبەرمان بیانشکێنێت. ئەگەر شتێک بەشێک نەبێت لە چیرۆکێک، بۆ نموونە، ئەگەر ئەم گوڵە مێخەکە یان ئەو گرگنە بێ ئەدەبە بەشێک نەبن لە داستانێک، چۆن نیگاریان دەکێشیت؟"

"بە پێشاندانی ئەوەی کەوا جوانیی گوڵە مێخەک لە بێ هاوتاییی خۆیدایە."

"بۆچی مەگەر دواتر لە ڕیزکردنی پەڕەکاندا لە چەقی دنیا دای دەنێی؟"

زاوام گوتی: "ترسام و کاتێک حاڵی بووم بیرۆکەکانی سوڵتانمان بەرەو کوێم دەبەن، لەپڕ شپرزە بووم."

هەستم کرد زاوام ترساوە بکەوێتە بارێکەوە جگە لە نیازی خوا، شتێکی تر بە شایەنی چەقی دنیا و کاغەز ببینێت.

سوڵتانمان، ڕێک وەک من پێشبینیم کردبوو زاوامی ترساندبوو و گوتبووی: "پاشان دەتەوێت ئەو نیگارەی گرگنێکت لە چەقیدا جێگیر کردووە، بە دیواردا هەڵبواسی، بەڵام نیگار بە دیواردا هەڵناواسرێت. چونکە ئەگەر نیگارێک بە دیواردا هەڵبواسرێت، ئەوا ئامانجمان هەرچی دەبێت با ببێت، دوای ماوەیەک دەست بەپەرستنی دەکەین. ئەگەر منیش وەک گاورەکان باوەڕم بکردایە حەزرەتی عیسا – دووربێت– هەمان کات پەروەردگاریشە، ئەو کاتە تێ دەگەیشتم دەکرا خوا لە دنیا ببینرێت و تەنانەت لە شێوەی مرۆڤدا خۆی بنوێنێت و منیش دەمتوانی ڕازی بم نیگاری مرۆڤ بکێشرێت و بە دیواردا هەڵبواسرێت. خۆ دەزانی دواجار دەکەوینە کڕنۆشبردن بۆ هەموو نیگارێکی بە دیواردا هەڵواسراو، وا نییە؟"

زاوام بە منی گوت: "زۆر باش لێی حاڵی دەبووم و لەبەرئەوەش لەو شتەی هەردووکمان بیرمان لێ دەکردەوە، دەترسام."

سوڵتانمان گوتوویەتی: "لەو سۆنگەیەوە ڕازی نابم نیگارم بە دیواردا هەڵبواسرێت."

زاوام بزەیەکی ئیبلیسییانەی خستە سەر لێوی و بەچرپە بەمنی گوت: "بەڵام دەیویست."

ئێستاش نۆرەی ترسان هاتبووە سەر من.

سوڵتانمان گوتوویەتی: "بەڵام دەشخوازم نیگارێکم لەسەر شێوازی فەرەنگی بکێشرێت. پێویستە نیگارەکە لە توێی پەڕەکانی کتێبێکدا بشاردرێتەوە. هەر تۆش پێم دەڵێی ئەو کتێبە چۆن دەبێت."



زاوام گوتی: "ماوەیەک بە سەرسامی و شەیدابوونەوە بیرم کردەوە. دواتر بزەیەکی هاوشێوەی بزە فێڵبازانەکەی تۆزێک لەمەوبەری خستە سەر لێوی و بەجۆرێک بزەی هاتێ، وا هەستم کرد خەریکە باوەڕ دێنم زاوام گۆڕاوە و بووە بە کەسێکی تر.

"حەزرەتی سوڵتانمان فەرمانی پێم دا یەکسەر دەست بەدروستکردنی کتێبەکە بکرێت. لە شادمانیدا سەرم سوڕی خوارد. فەرمانیشی دا ئەم کتێبە وەک دیارییەک بۆ دۆقی ڤینیسیا ئامادە بکرێت و دیسان من بنێرێتە کنی. دەیویست کاتێک کتێبەکە تەواو دەکرێت، لە هەزار ساڵەی ساڵنامەی کۆچیدا ببێتە گەواهیدەری هێزی سەرفرازیی خەلیفەی موسڵمانان و سوڵتانی مەزنمان. بەڵام بۆ ئەوەی نەزانرێت نیازی ڕێکەوتنی لەگەڵ ڤینیسیاییەکاندا هەیە و بەمەبەستی ڕێگرتن لە ئیرەیی و دڵپیسی لە نیگارخانە، داوای لێ کردم کتێبەکە بەنهێنی ئامادە بکرێت. منیش بەشادمانی و بەنهێنی دەستم کرد بە بەکێشاندانی نیگارەکانم."

# 21

## من زاواتانم

بەوجۆرە، سەرلەبەیانیی ڕۆژی هەینی بۆم باس کرد ئەو کتێبەی نیگاری سوڵتانمان لەسەر شێوازی مامۆستایانی فەرەنگ لەخۆ دەگرێت، بەچ شێوەیەک دەبێت. خاڵی دەسپێکم ئەوە بوو چۆن هەمان چیرۆکم بۆ سوڵتانمان گێڕابووە و بۆ دروستکردنی کتێبەکە فریوم دابوو. بەڵام ئامانجی شاراوەم ئەوە بوو نووسینەوەی چیرۆکی بەرامبەر نیگارەکان بە قەرە بسپێرم، چونکە خۆم هێشتا نەمتوانیبوو دەست بە نووسینەوەیان بکەم.

گوتم زۆربەی نیگارەکانی کتێبەکەم تەواو کردووە و دوا نیگاریش لە تەواوبووندایە. گوتم: "لە کتێبەکەمدا نیگاری مردن هەیە بۆ ئەوەی پێشانی بدات جیهانی سوڵتانمان سەرزەمینێکی چەند ئارام و پڕ لە ئاسایشە. نیگاری دار هەیە بە نیگارکێشی هۆشمەند لەقلەق بە کێشانم داوە. نیگاری ئیبلیس، نیگاری ئەسپ، ئەو ئاژەڵەی تا شوێنە دوورەکان دەمانگەیەنێت، نیگاری سەگی هەمیشە چەپەڵ و زۆرزان و نیگاری پارەیە هەیە..." بە قەرەم گوت: "ئەمانەم هێندە جوان بە وەستایانی نیگارکێشی نیگارخانە بە کێشان داوە، هەر ئەوەندەی جارێک چاوت پێ کەوت، یەکسەر بڕیار دەدەیت نووسینەکەی چۆن بێت. شیعر و نیگار، ڕەنگ و وشە، ئەمانە برای یەکن، دەزانی."

جارێک بەخەیاڵمدا هات داخۆ پێی بێژم کچەکەمی دەدەمێ؟ ئایا لەم ماڵە لەگەڵ ئێمەدا دادەنیشێت؟ دواتر بەخۆم گوت ئێستا تۆ بە سیمای منداڵ ئاسای و بەوە



فریو مەخۆ کە بەسەرنجەوە گوێی بۆت ڕاگرتووە، ئەگەرنا، ئومێد دەخوازێت شەکوورە هەڵگرێت و بیفرێنێت. بەڵام لەویش بترازێت، کەسی ترم نەبوو بتوانێت کتێبەکەم بە ئەنجام بگەیەنێت.

بەدەم گەڕانەوە لە نوێژی هەینی، باسی سێبەرم بۆ گێڕایەوە وەک گەورەترین داهێنانی نیگاری مامۆستایانی ئیتاڵی. گوتم: "ئەگەر نیگاری خۆمان لەوێوە، لە چەقی کۆڵانەوە، بەجۆرێک بکێشین وەک ئەوەی لە کۆڵان بڕوا و ڕاوەستێ و چەنەبازی بکات و بۆ دنیا بڕوانێت، ئەوا پێویستە شێوەی مامۆستایانی فەرەنگ فێر بین سێبەریش، کە شتێکی هەرە زیاد بینراوە لە کۆڵان، بخەینە نیگارەکەوە."

قەرە پرسی: "جا چۆن نیگاری سێبەر دەکێشرێت؟"

کاتێک گوێی بۆم ڕادەگرت، جاروبار پشووکورتیم لای برازای خۆم دەبینی. هەندێک جار بەو شووشە مەرەکەب مەگۆلییەی خۆی هێنابووی، گەمەی دەکرد. جاروباریش شیشی ئاگردانەکەی بەدەستەوە دەگرت و ئاگرەکەی تێک دەدا. هەندێک جار بەخەیاڵمدا دەهات بەبیانووی ئەوەی نیگار لە چاوی خوا دوور دەخەمەوە، ناپاکی لە نیگارەکانی بەرهەمی هزری مامۆستایانی هەراتی و سەرجەم نەریتی نیگارکێشی دەکەم و بۆ ئەم مەبەستەش سوڵتانمانم فریو داوە، خوازیارە ئەو شیشە بکێشێت بە سەرمدا و بمکوژێت. ناوبەناویش بێ ئەوەی جووڵەی لێوە بێت، ماوەیەکی درێژ دادەنیشت و چاوی لەسەر چاوم لانەدەبرد. پێشم وابوو لە خەیاڵی خۆیدا دەیگوت بۆ ئەوەی کچەکەتم دەست بکەوێت، ئامادەم ببمە کۆیلەشت. جارێک، کتومت وەک ئەوەی لە منداڵیی ئەودا دەمکرد، بردمە باخچە، هەوڵم دا وەک باوکێک باسی دارەکان، لێدانی تیشکی ڕۆژ لە گەڵاکان، بەفری دەست بەتوانەوە کردوو و باسی ئەوەی بۆ بکەم بۆچی ماڵەکانی گەڕەکی خۆمان لەگەڵ دوورکەوتنەوەیان بچووک دەبنەوە. بەڵام ئەم کارەم هەڵە بوو: تەنانەت ئەمە بەس بوو بۆ ئەوەی پێشانم بدات ئەو شێوە پێوەندییەی باوک و کوڕ کە لە ڕابردوودا لە نێوانماندا پێک هاتبوو، لەمێژە کۆتاییی پێ هاتووە. ئەو ئێستا چاوی لە کچی کابرایەکی خەڵەفاو بڕیوە و لەبری مەراق و خولیای فێربوونی سەردەمی منداڵی، خۆی لەسەر پشوودرێژی لە بەرامبەر قسەی هەلەق و مەلەقی ئەو کابرا خەڵەفاوەدا ڕاهێناوە. دژواری و تۆزی ئەو وڵات و شارانەی دوازدە ساڵ پیایاندا گەڕابوو، بەتەواوی هێزی خۆیەوە لە ڕۆحی برازاکەم

نیشتبوو. لە منیش ماندووتر بوو، بەزەییم پێدا هاتەوە. وا بزانم، نەک تەنیا هەر لەبەرئەوەی دوازدە ساڵ لەمەوبەر شەکوورەم نەدابوویێ –ئەمە مەحاڵ بوو–، بگرە بەهۆی ئەوەی خەیاڵم لە کێشانی نیگاری جیاواز لە کاری نیگارکێشانی ئیسلام و دوور لە شێوازی مامۆستایانی ئەفسانەییی هەرات دابوو و بە سووربونەوە ئەم تورەهاتانەم دەگێڕایەوە، لێم زویر بووبوو. ئا بەوجۆرە بوو پێشبینیم کرد مردنم لەسەر دەستی ئەودا بێت.

بەڵام لێی نەدەترسام: تەواو بەپێچەوانەوە، هەوڵم دا من ئەو بترسێنم، چونکە هەستم کرد ترسەکەی گونجاوە لەگەڵ ئەو نووسینەی من داوای نووسینەوەیم لێ کردبوو. گوتم وەک ئەوەی لەو نیگارانەدا هەیە، پێویستە مرۆڤ بتوانێت خۆی بخاتە چەقی دنیاوە. درێژەم دایێ و گوتم: "یەکێک لە نیگارکێشانەکانم زۆر بەجوانی نیگاری مردنی بۆ کێشاوم. سەیرێکی ئەمە دەکەیت؟"

ئا بەوجۆرە دەستم کرد پێشاندانی ئەو نیگارانەی ساڵێک بوو وەستایانی نیگارکێش بەنهێنی بۆیان دەکێشام. سەرەتا کەمێک شەرمی دەکرد؛ بگرە دەترسا. پاش ئەوەی بۆی ڕوون بووەوە بۆ کێشانی نیگاری مردن سروش لەو جڤاتی مردنانە وەرگیراوە کە لە زۆربەی نووسراوەکانی شانامەدا دەبینرێت، وەک پەڕاندنی سەری سیاوش بە دەستی ئەفراسیاو، یاخۆ ڕۆستەم کاتێک نازانێت زۆراب کوڕی خۆیەتی و دەیکوژێت، توانی دەستبەجێ بچێتە بابەتەکەوە. یەکێک لەو نیگارانەم بەخاک سپاردنی خوا لێخۆشبوو سوڵتان سلێمان پێشان دەدات و من بە ڕەنگی خەمبار و گران بە کێشانم دابوو، دیدێکی ڕیزکردنی لەسەر شێوازی مامۆستایانی فەڕەنگی پێوە دیار بوو و هەوڵێکی سێبەرکێشانیشی تێدابوو بە قەڵەمی خۆم بۆم زیاد کردبوو. ئاماژەم کرد بۆ ئەو قولاییە فێڵبازەی نیگارەکە کە هێڵی ئاسۆ و هەورەکان ئاوێتەی یەکتر دەکات. بیرم خستەوە مردن وەک کەسایەتییەکی بێ هاوتا کێشراوە، جۆری ئەو کەسایەتییە گاورانەی پۆرترێتیانم لە کۆشک و سەراکانی ڤینیسیادا دیبوو و هەموویان پەلەقاژێی ئەوەیان بوو تایبەت و خۆبەخۆی خۆیان بن. گوتم: "زۆر خوازیارن تاک و بێ وێنە بن و ئەم داخوازەیان فرە بەتەوژم و گوڕو تینە. تۆ بڕوانە، بڕوانە، سەیری ناو چاوی مردن بکە، مرۆڤ لە مردن نا، بگرە لەم تەوژمی ویستی



تاک و بێوێنە و هەڵاوێردییەی ئەوان دەترسێت. بڕوانە ئەو نیگارە و چیرۆکی بۆ بنووسەوە. ئەوە کاغەز و ئەوەش قەڵەم، مردن بێنە گۆ. نووسراوەکەت دەستبەجێ دەدەمە خۆشنووس."

ماوەیەک بەبێدەنگی سەیری نیگارەکەی کرد. پاشان گوتی: "کێ نیگاری ئەمەی کێشاوە؟"

"پەپوولە. ئەو هەرە دەستڕەنگینتریانە. مامۆستا عوسمان ساڵانێک عاشق و شەیدای بوو."

قەرە گوتی: "هاوشێوەیەکی نیگاری ئەم سەگەم، بەڵام بەدفەساڵتر، لەو قاوەخانەیەی چیرۆکبێژ چیرۆکی لێ دەگێڕێتەوە، بینی."

"زۆربەی نیگارکێشانم بە ڕۆح بە مامۆستا عوسمان و نیگارخانەوە پەیوەستن و باوەڕیان نییە بەو شتانەی بۆ کتێبەکەی من ئەنجامی دەدەن. دەتوانم پێشبینی بکەم چۆن نیوەی شەو لێرە دەڕۆن و بێ ئەدەبانە لە قاوەخانەیە گاڵتە بەو نیگارانەی بۆ پارە کێشاویانە و بە من دەکەن. جارێک سوڵتانمان بەزۆری من دەستووری دا نیگارکێشێکی ڤینیسیایی لە باڵیۆزخانەوە بێت و نیگاری خۆی پێ بە کێشان دا. دواتر، مامۆستا عوسمانی ڕاسپارد بەشێوازی خۆی دانەیەک لەبەر ئەو نیگارەی کە بە بۆیاخی چەور کێشرابوو، بگرێتەوە. مامۆستا عوسمان ناچار کرابوو لاساییی نیگارکێشە ڤینیسیاییەکە بکاتەوە و منی بە لێپرسراوی ئەو ناچارکردنە چەپەڵە و نیگارە شەرمبەخشەکەی دەستکردی خۆی دانا. مافی خۆی بوو."

جگە لە دواین نیگار، کە بەدرێژاییی ڕۆژ بۆم تەواو نەکرابوو، هەموو نیگارەکانی ترم پێشانی دا، دنەم دا چیرۆکەکانیان بنووسێتەوە، باسی خووی نیگارکێشانم کرد و بۆم ژمارد چەند پارەم دابوونێ. هێندەی لەمەڕ ڕوانگە و ئەوەی ئایا هەرچی بچووکتر بوونەوەی شتەکانی پشتەوەی نیگاری ڤینیسیایی بێ ئاینییە یاخۆ نا، قسەمان کرد، ئەوەندەش باسی ئەوەمان کرد دەشێت زەریف ئەفەندیی بەستەزمان لەبەر چاوچنۆکیی پارە و تەماح کوژرابێت.

دوای ئەوەی قەرە شەو بۆ ماڵی خۆی گەڕایەوە، ئیدی دڵنیا بووم لەوەی سەرلەبەیانیی ڕۆژی دواتر، وەک ئەوەی بەڵێنی دابوو، دێتەوە و سەرلەنوێ گوێ بۆ

چیرۆکەکانی کتێبەکەم ڕادەگرێت. بەدەم گوێگرتن لە ونبونی دەنگی هەنگاوەکانی لەبەر دەرگای کراوە، شتێک لە شەوی سارددا هەبوو کە بکوژی بێ خەو و سەرکێشی منی لە خۆم و کتێبەکەم بەهێزتر و ئیبلیسانەتر دەکرد.

دوای ڕۆیشتنی ئەو، دەرگای حەوشم توند قایم کرد. کوپەیەکی کۆنی ئاوم هەبوو وەک گوڵدانی ڕەیحانە بەکارم دەهێنا و وەک نەریتی گشت شەوێکم لە پشتەوە نامە پاڵ دەرگاکە. بەرلەوەی ئاگری ئاگردانەکە بە خۆڵەمێش داپۆشم و بچمە ناو جێگاوە، بینیم شەکوورە لە بەردەممدا بوو. بە کراسێکی سپیی ئاودامانەوە لە تاریکییەکەدا وەک خێو دەهاتە پێش چاو.

لێم پرسی: "هەر سووری لەسەر ئەوەی شوو بەم کابرایە بکەیت؟"

"نەخێر باوکی شیرینم. بگرە لەمێژە لە شووکردن پاشگەز بوومەتەوە. سەرباری ئەوەش، من بەشووم."

"ئەگەر هێشتا دەتەوێت شووی پێ بکەیت، من ئیدی دەتوانم مۆڵەتت بدەم."

"نامەوێت شووی پێ بکەم."

"بۆچی؟"

"چونکە ئێوە ناخوازن. کەسێک ئێوە گەرەکتان نەبێت، منیش لە ناخەوە نامەوێت."

لەپڕ بینیم ژیلەمۆی ناو ئاگردانەکە لە چاویدا دەبریسکێتەوە. چاوەکانی لەبەر بەخترەشی نا، لەتاو تووڕەیی پیر بووبوون، بەڵام هیچ دڵگرانییەک لە دەنگیدا نەبوو.

وەک ئەوەی ڕازێکی بۆ بدرکێنم، گوتم: قەرە زۆری خۆش دەوێیت."

"دەزانم."

"لەبەر عەشقی نیگار نا، لەتاو ئەڤینی تۆ بوو بەدرێژاییی ڕۆژ گوێی بۆ قسەکانی من ڕاگرت."

"مەگەر کتێبەکەتان تەواو ناکات؟ گرینگ ئەوەیە."

گوتم: "ڕۆژێک مێردەکەت دەگەڕێتەوە."

"نازانم بۆچی، ڕەنگە لەبەر بێدەنگی بێت، ئەمشەو زۆر باش حاڵی بووم مێردم هەرگیز ناگەڕێتەوە. دەبێت ئەو شتانەی لە خەوندا دەیانبینم ڕاست بن: کوشتویانە.



زۆر لەمێژە لە چۆڵەوانی بووە بە خۆراکی قەل و داڵ." ئەمەی دواییانی وەک ئەوەی بشێت منداڵە نووستووەکان گوێیان لێ بێت، بەچرپە و بە هەڵچوونێکی سەیرەوە گوت.

گوتم: "ئەگەر بکوژرێم، دەمەوێت ئەم کتێبەی هەموو شتێکی خۆم پێ داوە، بەئەنجام بگەیەنیت. سوێند بخۆ بۆ ئەم مەبەستە."

"سوێند دەخۆم، بەڵام کێ کتێبەکەتان تەواو دەکات؟"

"قەرە. تۆ دەتوانیت ئەم ئەرکەی پێ ڕاپەڕێنیت."

"بابەگیان، ئەوەتانێ خۆت پێی بەدروستکردن دەدەیت. پێویستت بەمن نییە."

"ڕاستە، بەڵام لەبەر خاتری تۆیە بەرگەی من دەگرێت. ئەگەر بکوژرێم، ڕەنگە بترسێت و دەست لە کتێبەکە هەڵگرێت."

کچی ئاقڵم بەدەم بزەیەکەوە گوتی: "جا ئەو کاتە ژیانی هاوسەری لەگەڵ منیشدا پێک ناهێنێت."

لەکوێوە زانیم بزەی کردووە؟ بەدرێژاییی گشت ئەم وتووێژە، جگە لە تیشکێک کە جاروبار لە چاوانیدا دەبریسکایەوە، هیچ شتێکی ترم نەبینیبوو. لە ناوەڕاستی ژوورەکە، لەسەر پێ لە بەرامبەر یەکتر ڕاوەستابووین. خۆم بۆ ڕانەگیرا و گوتم: "ئاگاتان لە یەکتر هەیە، ئاماژە بۆ هەڤدوو دەکەن؟"

"چۆن دەتوانن بیر لە شتێکی لەو جۆرە بکەنەوە؟"

بێدەنگییەکی درێژ و بەئازار هاتە ئاراوە. لە جێیەکی زۆر دوور سەگێک وەڕی. کەمێک سەرمام بوو و مچوڕکم پێدا هات. ئیدی ژوورەکە زۆر تاریک داهات و نەماندەتوانی یەکتر ببینین، تەنیا ئەوە نەبێت هەستمان دەکرد لە بەرامبەر یەکتردا ڕاوەستاوین. دواتر، لە پڕ یەکترمان لە ئامێز گرت و بەهەموو هێزمانەوە یەکترمان لە باوەش کرد. دەستی کرد بەگریان، گوتی تاسەی دایکی کردووە. دەستم بەسەریدا هێنا و قژیم ماچ کرد. هەمان بۆنی قژی دایکی لە پرچی ئەمیش دەهات. بردمە سەر جێگاکەی و لە تەنیشت منداڵە لەپاڵ یەکەوە ڕاکشاوەکانی خەواندم. کاتێک بیرم لە دوو ڕۆژی ڕابردوو کردەوە، هیچ گومانێکم نەما کە شەکوورە و قەرە ئاگایان لە هەواڵی یەکتر هەیە.

# 22

## من ناوم قەرەیە

شەو، دوای گەڕانەوەم بۆ ماڵ، خۆم لە دەست ژنەی خاوەن خانوو، کە بەخێرایی دەستی پێ کردبوو خۆی بە دایکم بزانێت، ڕزگار کرد و دەمودەست چوومە ژوورەکەم، لەسەر دۆشەک ڕاکشام و بیرم لە شەکوورەی خۆم کردەوە.

با لەو خشەخشەوە دەست پێ بکەم کە بەکەیفی گەمەیەکەوە هزرم بۆ ڕاگرتبوو: لە هاتنی دووەمی دوای دوازدە ساڵمدا بۆ ماڵیان، هیچ خۆی پێشانم نەدا. لەلایەکی تر، بەشێوەیەکی وا ئەفسووناوی گەمارۆی دابووم، دڵنیابووم لەوەی هەمیشە دەمبینێت، وەک مێردی دواڕۆژی دەمپێوێت و دەمبرێت و چێژی گەمەیەکی ئاقڵانەش لەم ڕەفتارەی وەردەگرێت. بۆیە منیش هەمیشە پێم وابوو ئەو دەبینم. بەوجۆرە باشتر لە وتەکانی "إبن العربی" سەبارەت بە ئەڤین تێ گەیشتم کاتێک دەڵێت ئەڤین توانای بینینی شتە لە بینین نەهاتووەکانە و ویستی مرۆڤە بۆ هەستکردن بەبوونی هەمیشەیی نەبیندراوەکان لە تەنیشتییەوە.

بە هەست ڕاگرتنم بۆ دەنگی ناو ماڵەکە و جیرەجیرەی تەختەکان، دەمتوانی بزانم شەکوورە هەمیشە چاودێریم دەکات. جارێک بێ هیچ گومانێک تێ گەیشتم لەگەڵ منداڵەکانیدا لەو ژوورەی تەنیشتەوەیە کە بەسەر هەیوانەکەدا دەڕوانێت، چونکە گوێم لێ بوو منداڵەکانی یەکتریان ڕاو دەنا و شەڕیان دەکرد، بەڵام لەبەر نیگاری هەڕەشەکارانە و جووتکردنی برۆی دایکیان، هەوڵیان دەدا دەنگیان نزم بکەنەوە. تاوناتاوێک، بەشێوەیەکی ناسروشتی دەنگی چرپەچرپی دەستکردیان و دواتریش



تریقەتریقی پێکەنینیان دەکەوتە بەر گوێم. چرپەچرپەکەشیان وەک ئەوە نەدەچوو، بۆ نموونە، لەبەر پەرتنەکردنی سەرنجی کەسێکی نوێژ دابەستوو بکرێت.

جارێکی تر، کاتێک باپیریان باسی شاکارەکانی تیشک و سێبەری بۆم دەکرد، هەردوو منداڵەکە، شەوکەت و ئۆرهان خۆیان کرد بە ژووردا و بە جووڵەی ورد و بایەخ پێدراوی پێشتر داڕێژراوەوە، سینییان بەدەستەوە گرتبوو و قاوەیان نایە بەردەممان. بیرم کردەوە ڕاستییەکەی دەبوو خەیرییە ئەم کارە بکات، بەڵام دایکیان ڕێکی خستووە بەمەبەستی ئەوەی هەلی بینینی ئەو پیاوەی لەوانەیە دواڕۆژ ببێت بە باوکیان، بۆ منداڵەکانی بڕەخسێنێت و بتوانێت لەمەڕ وی لەگەڵیان بدوێت. بەدەم ئەم بیرکردنەوانەوە بە شەوکەتم گوت: "دوو چاوی چەند جوانت هەن." کاتێک هەستم کرد لەوانەیە ئۆرهانی برا بچووکی ئیرەیی پێ ببات، بەویشم گوت: "ئەوانەی تۆش". دوای ئەوەی گەڵایەکی سیسەوەبووی گوڵە مێخەکێکم لە گیرفانم دەرهێنا و خستمە سەر سینییەکە، ڕوومەتی هەردوو منداڵەکەم ماچ کرد. دواتر، لە کونی ماڵەوە دەنگی پێکەنین و تریقەتریق هات.

جاروبار مەراقم بوو بزانم ئەو چاوەی چاودێریم دەکات لە پشت کونی کام دیوار و کێژان دەرگای داخراو و تەنانەت کێها بنمیچەوەیە و لە چ ڕوویەکەوە سەیری من دەکات. چەند درز و گرێیەکەم لەبەرچاو دەگرت و خەیاڵی ئەوەم لێ دەدا شەکوورە لە پشت ئەو درزەوە چۆن دانیشتووە. هێشتا ئەمە نەدەبڕایەوە من بە ختوخۆڕایی گومانم لە خاڵێکی تری ڕەش دەکرد و بۆ ئەوەی بۆم ساغ بێتەوە گومانەکەم لە جێی خۆیدایە یان نا، گەرچی بێڕێزی نواندن لە بەرامبەر زاواشمی لێ دەکەوتەوە، چونکە بێوچان درێژەی بە گێڕانەوە دەدا، لە شوێنی خۆم هەڵدەسام و بۆ ئەوەی بۆ زاوامی بسەلمێنم گوێم لە گێڕانەوەی چیرۆکەکانیەتی، بە پێشاندانێکی گوایە زۆر سەرقاڵانە و فرە سەرسوڕهێن و بەدەم بیرکردنەوەوە ئەمسەر و ئەوسەری ژوورەکەم دەکرد و لەو درز یان ڕەشایی جێی گومانی دیوارەکە نزیک دەبوومەوە.

کاتێک لەوێ، لە پشت ئەو شتەوەی بە کونی سەیرکردنم دەزانی، چاوم بە چاوی شەکوورە نەدەکەوت، تووشی خەیاڵشکان دەبووم. لەپڕ هەستێکی نامۆی تەنیایی جەستەمی دادەگرت و وەک کەسێک نەزانێت لە ژیاندا چ دەکات، ئۆقرەم لێ دەبڕا.

هەندێک جار لەناکاو لە دڵی خۆمدا هەستم دەکرد شەکووره سەیرم دەکات و هێندە بەهێزەوە بڕوام دەکرد لەژێر چاودێریی نیگاکانی ئەودا بم، وەک چۆن کەسێک بۆ کاریگەری دانان لەسەر ئەو کچەی خۆشی دەوێت خۆی لە ڕاستیی خۆی قوڵتر و بەهێزتر و بە دەسەڵاتتر پیشان دەدا، منیش هەمان هەوام بەخۆم دەدا. زۆر دواتر، بەخەیاڵمدا دەهات شەکووره و منداڵەکانی، من لەگەڵ ئەو مێردەی هەرگیز لە شەڕ نەدەگەڕایەوە و ئەو باوکە ونبووە بەراورد دەکەن و هەمان کات خەیاڵم وەردەگەڕایەوە سەر ئەو ناودارە نوێیانەی ڤینیسیا کە زاوام باسی چۆنیەتیی نیگارکێشانی ئەوانی دەکرد. تەنیا لەبەرئەوەی شەکووره لە باوکییەوە ناویانی بیستبوو، خۆزگەم دەخواست لەو ناودارە نوێیانە بچم کە ناوبانگی خۆیان لە ڕێی نووسینی کتێب و کێشانی نیگارەوە بەدەست هێنابوو، نەک وێنەی پیاوچاکان کە لە ڕێی ئازارچێشتنەوە لە خەڵوەتگا ناوبانگ دەردەکەن، یاخۆ شێوەی مێردی ونبووی کە بە سەر پەڕاندن بەهێزی بازوو و نووکی شمشێر ناوبانگی بۆ خۆی پەیدا کردبوو. بە گوتەی زاوام، نیگاری ئەو ناودارانە بە ئیلهام وەرگرتن لە هێزی گۆشە پڕ لە ڕازەکان و تاریکایی بە چاو بیندراوی دنیا کێشراون. زاوام خۆی شاکارەکانی بینیبوو و هەوڵی دەدا بۆ برازای خۆی بگێڕێتەوە و برازاش هەرگیز نەیدیبوون. منیش هەوڵێکی لە ڕادەبەدەرم دەدا بۆ ئەوەی بتوانم بیانهێنمە بەرچاوی خۆم، بەڵام کاتێک لە ئاکامدا نەمدەتوانی خەیاڵی هیچ شتێک بکەم، تووشی جۆرێک لە ئاڵۆزی دەبووم و خۆمم بچووک دەهاتە بەرچاو.

دیسان لەپڕ شەوکەتم لە بەردەم خۆمدا بینییەوە. کاتێک بەبڕیارەوە لێم نزیک کەوتەوە، وام زانی وەک ئەوەی لەکن هەندێک لە هۆزەکانی عەرەب لە "ما وراء النهر" و نەتەوەکانی چەرکەز لە چیاکانی قەفقاسدا باوە، گەورەترین منداڵی نێرینەی ماڵ دەستی میوان تەنیا کاتی هاتن نا، بگرە لە بەڕێ کردنیشیدا ماچ دەکات. بێ ئەوەی بەخۆم بزانم، دەستم بۆ درێژ کرد تا ماچی بکات و بیبات بۆ تەوێڵی. هەمان سات و لە جێگایەکی نادوورەوە گوێم لە شەکووره بوو پێ کەنی. ئەرێ تۆ بڵێی بەمن پێ بکەنێت؟ شپرزە بووم و بیرەبیرەم پێ کەوت و بۆ خۆ ڕزگارکردن، وەک بڵێی داواکراو لە من ئەمەیە، شەوکەتم گرت و هەردوو گۆنایم ماچ کرد. کاتێک ئەمەم کرد، زانیم




قسەم بە زاوام بڕیوە، بەڵام بەشێوەیەک بۆی ڕوون بێتەوە کە من لە ڕاستیدا بێ ڕێزیم بەرامبەری نەنواندووە، بزەیەکم بۆ کرد. لەلایەکی دیش، بۆ ئەوەی بزانم داخۆ بۆنی دایکی پێوەیە، لەپڕ و بە هۆشیاری بۆنێکی منداڵەکەم کرد. ئەو کاتەی هەستم کرد پارچە کاغەزێکی خزاندووەتە دەستمەوە، دەمێک بوو شەوکەت ڕووی وەرگێڕابوو و دوور دەکەوتەوە.

دەستی خۆم گرموڵە کرد و کاغەزەکەم وەک خشڵێک تێدا شاردەوە. کاتێک بەتەواوی حاڵی بووم ئەمە نامەیە و لە شەکوورەوە بۆم نێردراوە، هێندەی نەمابوو لەبەر شادمانی سەرسامانە بۆ زاوام لە قاقای پێکەنین بدەم. ئایا تەنیا ئەمە بەڵگە نەبوو بۆ ئەوەی شەکووره بەتەواوی هێزەوە منی دەوێت؟ لەپڕ و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لە خەیاڵی خۆمدا من و شەکووره وەک شێت لەگەڵ یەکتر جووت دەبووین. ئەوەندە خەیاڵبڵاوانە باوەڕم دەکرد ئەو شتەی ناو خەیاڵم بە ماوەیەکی نزیک بەدی دێت، تا هەستم کرد هەرامەکەم لە بەردەم زاوام و بەشێوەیەکی نەگونجاو ڕەپ بووە. ئایا شەکووره ئەمەی بینیبوو؟ بۆ ئەوەی سەرنجی خۆم لەسەر خاڵێکی تر کۆ بکەمەوە، بەدرێژی گوێم بۆ گێڕانەوەکانی زاوام ڕاگرت.

زۆر دواتر، کاتێک زاوام خۆی درێژ کرد بۆ ئەوەی پەڕەیەکی نەخشێندراوی تری کتێبەکەیم پیشان بدات، من کاغەزەکەم کردەوە. بۆنی گوڵە شیلانی لێ دەهات و سەیرم کرد هیچی تێدا نەنووسراوە. لەبەرئەوەی نەمدەتوانی بڕوا بکەم کاغەزەکە خاڵییە، هەڵم دەگێڕایەوە و ئەمدیو و ئەودیوم پێ دەکرد.

زاوام گوتی. "پەنجەرە، بەکارهێنانی شێوازی ڕوانگە وەک سەیرکردنی دنیا وایە لە پەنجەرەوە. ئەو کاغەزە چییە؟"

گوتم: "هیچ نییە زاوا ئەفەندی." بەڵام دواتر تێروپڕ بۆنم بە کاغەزەکەوە کرد.

دوای نانی نیوەڕۆ، لەبەرئەوەی نەمویست دەستشۆری زاوام بەکار بهێنم، مۆڵەتم لێ وەرگرت و چوومە ئاودەستی ناو باخچەکەوە. ئەوێندەرێ وەک شەختە سارد بوو. بێ ئەوەی بهێڵم پاشەڵم زۆر بتەزێت، بەپەلە کاری خۆم تەواو کرد و دەرچوومە دەرەوە. بینیم شەوکەت وەک ڕێگر، بەڵام لە بێدەنگییەکی چەپەڵدا لە بەردەمم قوت بووەوە. دەستشۆرە پڕەکەی باپیری بەدەستەوە بوو و هێشتا هەڵمی لێ هەڵدەستا.

لە پشت منەوە چووە ئاودەستەکەوە و دەستشۆرەکەی خاڵی کردەوە. لە دەرەوە، دەستشۆرەکەی بەدەستەوە بوو و گوپە خڕپنەکانی پڕ کرد لە فوو و چاوە جوانەکانی لەناو چاوم بڕی.

گوتی: "تۆ هەرگیز پشیلەی مردارەوەبووت بینیووە؟" لووتی، کتومت ئەوەی دایکی بوو. ئایا دایکی سەیرمانی دەکرد؟ سەرێکم بەرز کردەوە، بینیم پەنجەرەی خەیاڵیی نهۆمی دووەم، ئەو پەنجەرەیەی دوای چەندین ساڵ بۆ یەکەم جار شەکوورەم تێدا دیبوو، دەریوانەکەی داخرابوو.

"نەخێر."

"پشیلە مردارەوەبووەکەی ماڵی جووە لە سێدارەدراوەکەت پێشان بدەم؟"

بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامی من بکات، چووە کۆڵان و دەستی بە ڕۆیشتن کرد و چووە باخچەیەکی فەرامۆش کراوەوە. لەو دەوروبەرە بۆنی گەڵای تەڕ و ڕزیو و کەمێکیش کەڕوو دەهات. منداڵەکە، بە متمانەی کەسێکی زۆر شارەزای شوێنەکەوە و بەدەم تەپەتەپی هەنگاوەکانییەوە خۆی کرد بە دەرگای ماڵێکی زەردی هەڵکەوتوو لە چۆڵاییی پشت کۆمەڵێک دار هەنجیر و دار بادەمی خەمبارەوە.

ماڵەکە چۆڵ و هۆڵ بوو، بەڵام وەک ئەوەی کەسانێکی تێدا بژین، وشک و کەمێکیش گەرم بوو.

پرسیم: "ئەمە ماڵی کێیە؟"

"ماڵی جووەکانە. دوای ئەوەی پیاوەکە مرد، ژن و منداڵەکانی گواستیانەوە بۆ لەنگارگای یەمیش لە گەڕەکی جوولەکان. ئێستا ئەستەری بوخچەگێڕیان ڕاسپاردووە خانووەکەیان بۆ بفرۆشێت." ڕووی لە سووچێکی ژوورەکە کرد، گەڕایەوە و گوتی: "پشیلەکە ڕۆیشتووە، نەماوە."

"مەگەر پشیلەی مردارەوەبوو دەڕوا؟"

"باپیرم دەڵێت مردووان دەگەڕێن."

گوتم: "بەڵام خۆیان نا، ڕۆحیان دەگەڕێن."

دەستشۆرەکەی باوەشی توند بەخۆیەوە نووساندبوو و بە دەربەستەوە گوتی: "لە



کوێرا دەزانیت؟"

"وایە دەزانم، تۆ هەموو جارێ دێی بۆ ئێرە؟"

"دایکم لەگەڵ ئەستەر دێت. بە شەویش دێو و درنج دێنە ئێرە، بەڵام من لێرە ناترسم. ئایا تۆ هیچ کاتێک مرۆڤت کوشتووە؟"

"بەڵێ."

"چەند دانە؟"

"زۆر نا، دووان."

"بە شمشێر؟"

"بە شمشێر."

"ئایا ڕۆحەکانیان دەگەڕێت؟"

"نازانم. بەڵام بە قسەی کتێب بێت، دەبێت بگەڕێن."

"مامە حەسەنم شمشێرێکی سووری هەیە بگاتە هەرچییەک دەیبڕێت. خەنجەرێکی دەسک یاقووتیشی هەیە. ئەرێ تۆ باوکی منت کوشتووە؟"

بە سەر جووڵەیەکم کرد کە نە واتای بەڵێ و نە واتای نەخێری نەدەگەیاند. "تۆ لە کوێ دەزانی باوکت کوژراوە؟"

"دایکم دوێنێ وای گوت. دەڵێت ئیدی ناگەڕێتەوە. لە خەونی خۆیدا بینیویەتی."

ئەها هەندێک کاری نابەجێ هەیە ئامادەمان کردووە بۆ بەرژەوەندیی چەپەڵی خۆمان و هەستی شەهوەتی گڕگرتوومان و ئەڤینی دڵشکێنەرمانی بکەین، بەڵام ئەگەر هەل بێتە پێشەوە، دەمانەوێت بۆ ئامانجی باڵاتری بکەین، منیش بەهەمان شێوە لەو ساتەدا جارێکی تریش بڕیارم دا ببمە بابی ئەو هەتیوانە. لەبەرئەوە، کاتێک بۆ ماڵ گەڕاینەوە، باشتر گوێم بۆ گێڕانەوەکانی باپیری ڕاگرت لەمەڕ ئەو کتێبەی پێویست بوو من نووسین و نیگارەکانی بە ئەنجام بگەیەنم.

با لەو نیگارانەوە دەست پێ بکەم کە زاوام پێشانی دابووم، بۆ نموونە لە ئەسپەکەوە: سەرباری نەبوونی مرۆڤ لەم نیگارەدا و خاڵیبوونی دەوروبەری ئەسپەکە، نەمدەتوانی بڵێم ئەمە نیگاری ئەسپێکە و هیچی تر. ئەسپەکە لەوێدا بوو،

بەڵام دیاریش بوو سوارەکە خۆی لادابووە لایەکەوە، یاخۆ لە ئاکامدا لەناو پووش و پەڵاشی بە شێوازی قەزوینی کێشراوی دواوە، پەیدا دەبێت. مرۆڤ بخوازێت و نەخوازێت، ئەمە لە زینی سەر ئەسپەکە و نەخشی بەگانەی کێشراوی سەریەوە حاڵی دەبوو. یان ڕەنگە چەند کەسێکی شمشێر بەدەست لەوەدا بن لە تەنیشت ئەسپەکەوە پەیدا بن.

دیار بوو زاوا داوای لە یەکێک لەو وەستا نیگارکێش، لەوانەی بەنهێنی لە نیگارخانەوە بانگی دەکردن، کردبوو نیگاری ئەسپێکی بۆ بکێشێت. نیگارکێشی لە شەودا هاتوو، تەنیا دەیتوانی نیگاری ئەسپەکە وەک بەشێک لە داستانێک لەبەر لەسەر کاغەز بکێشێت و بەوجۆرە دەست بەدروستکردنی بکات، چونکە نیگارەکەی کتومت وەک قاڵب خستبووە ئەقڵی خۆیەوە. ئاشکرایە نیگارکێش چەندین هاوشێوەی ئەو نیگارەی بەهەزاران جار لە دۆخەکانی شەڕ و جڤاتەکانی ئەڤیندا بینیوە، بەڵام دەبێت زاوام بە ئیلهام وەرگرتن لە ڕێبازەکانی شێوازی فەڕەنگی، دەستی لە شوێنێکی نیگاری ئەسپەکە: بۆ نموونە دەیگوت: "نیگاری سوارەکە مەکێشە. لەوێشدا دارێک بکێشە، بەڵام با بچووک بێت و لە دواوە بێت."

نیگارکێشی بەشەو هاتوو، لەگەڵ زاوام لە بەردەم سندووقێکدا دادەنیشت و لەبەرئەوەی زاوام بۆ هەریەکەیان پارەیەکی باشی دەدایێ، ڕاشکاوانەتر، بەهۆی ئەوەی ئەم کێشانی نیگارە سەیرە شتێکی سەرنجڕاکێش بوو، نیگارکێش لەبەر تیشکی مۆم بەزەوقەوە نیگاری ئەو جڤاتانەی لەبەری کردبوون و دەستی پێیان ڕاهاتبوو و ئەو نیگارە نامۆ و لە ڕێسابەدەر و لە یەکنەچووانەی دەکێشا. بەڵام ئەو نیگارکێشەش کتومت وەک زاوام دەگەیشتە خاڵێک و لەوە بەدواوە نەیدەزانی ئەم نیگاری ئەسپە بۆ خەملاندنی کام چیرۆک دەکێشرێت. داخوازیی زاوام لە من ئەوە بوو سەیری ئەم نیگارانەی بە شێوازی نیوە ڤینیسیایی و نیوە عەجەمی کێشرابوو بکەم و لە پەڕەکانی بەرامبەریان چیرۆکی گونجاویان بۆ بنووسم. بۆ ئەوەی شەکوورەم دەست بکەوێت، پێویست بوو هەرچۆنێک بووە ئەو چیرۆکانە بنووسمەوە، بەڵام جگە لە گێڕانەوەکانی چیرۆکبێژی قاوەخانە، هیچی ترم بە خەیاڵدا نەدەهات.



# 23

## دواجار پێم دەڵێن بکوژ

سەعاتە چاڵمەکەم بە کرتەکرت دەیگوت کات ئێوارەیە. هێشتا بانگ نەدرابوو، بەڵام لەمێژ بوو من مۆمدانی تەنیشت مێزی کتێبەکانم داگیرساندبوو. ئەو کاتەی بە قەڵەمەکەم، لەسەر کاغەزێکی باش پۆڵیشکراو و جوان سفتکراوی لە مەرەکەبی ڕەشی حەسەن پاشا هەڵکێشراو، لەبەر و بەپەلە نیگاری ئەفیۆنکێشێکم تەواو کردبوو، لە ناخی خۆمدا گوێم لەو دەنگە بوو کە هەموو ئێوارانێک منی بۆ کۆڵان بانگ دەکرد. بەڵام ددانم بە خۆمدا گرت. ئەوەندە سوور بووم لەسەر ئەوەی ئێوارە نەڕۆمە کۆڵان و لە ماڵەوە کار بکەم، تەنانەت جارێک هەوڵم دابوو لە دیوی ناوەوە دەرگای ماڵەکەم بزمارڕێژ بکەم.

ئەم کتێبەی بەپەلەپڕۆزێ نەخشاندبووم، ڕاسپاردەی ئەرمەنییەک بوو. بەیانییەک پێش ئەوەی کەس لە خەو بێدار بێتەوە، یارۆ لە گالاتەوە هاتبوو و دەرگای کوتابوو. ئەم کابرایەی سەرباری ئەوەی لاڵ بوو، کاری وەرگێڕان و ڕابەرایەتی دەکات، کاتێک گەڕیدەکانی فەڕەنگ و ئیتاڵی داوای پۆشاکنامە دەکەن، دەستبەجێ دێت دەمدۆزێتەوە و دەکەوێتە سەودا و مامەڵەیەکی سەختەوە. لەبەرئەوەی سەرلەبەیانی بۆ پۆشاکنامەیەکی مامناوەندیی بیست نیگاری بە سەد و بیست ئاکچە ڕێک کەوتبووین، کاتی نوێژی ئێوارە و لە دانیشتنێکدا بە بایەخ پێدان و وردەکارییەوە نیگاری جلوبەرگی دەرزەنێک مرۆڤی ئەستەنبوڵیم کێشا: "شیخ الإسلام"، سەرگەورەی دەرگاوانان، پێشنوێژ، یەنیچەرە، دەروێش، ئەفسەر، قازی، جگەرچی،

جەلاد –نیگاری جەلاد لە کاتی ئەشکەنجەداندا زۆر برەوی هەیە–، سواڵکەر، ژن بە ڕێگای گەرماوەوە، ئەفیۆنکێش. لە پێناوی پەیداکردنی چوار پێنج ئاکچەی زیادەدا ئەوەندەم لەم کتێبانە نەخشاندبوو، بۆ ئەوەی کاتی کێشانی نیگارەکان بێزار نەبم، بۆ خۆم گەمەم دادەهێنا؛ بەخۆم دەگوت بێ ئەوەی فڵچەکەم لەسەر کاغەز هەڵبگرم، نیگاری قازی دەکێشم، یان چاو دەنووقێنم و نیگاری سواڵکەر دەکێشم.

گشت ڕێگر، شاعیر و خەمباران دەزانن کاتێک بانگی ئێوارە دەدرێت، جنۆکە و ئیبلیسەکانی ناخیان هەموو پێکڕا هەڵدەگەڕێنەوە، یاخی دەبن و لە ڕێ لایان دەدەن. دەنگە بێ ئۆقرەکەی هەناومان دەڵێت: "بۆ دەرەوە، بۆ دەرەوە، ڕاکە بۆ ناو مرۆڤەکانی تر، بۆ تاریکی، پەرێشانی و مەینەتی." ساڵانی خۆم بە هێورکردنەوەی ئەو جنۆکە و ئیبلیسانە دابوو. ئەو نیگارانەی زۆر کەس بەپەرجووی دەستی منیان دەزانی، من بە هاوکاری ئەم جنۆکە و ئیبلیسانە کێشابوومن. بەڵام ماوەی حەوت ڕۆژە، لەو کاتەوەی ئەو نامەردەم کوشتووە، ئیدی بە ئێوارانیش جنۆکە و ئیبلیسەکانی هەناوی خۆم بۆ دابین ناکرێت. ئەوان هێندە بەتوندی هەڵدەگەڕێنەوە و یاخی دەبن، وا بەخۆم دەڵێم: ئەگەر کەمێک بچمە دەرێ، ڕەنگە داساکێن و هێور ببنەوە.

دوای ئەم قسەیەم، بێ ئەوەی حاڵی بم چۆن ڕووی دا، وەک هەمیشە خۆم لە کۆڵان دیتەوە. خێرا ڕۆیشتم. بێ ڕاوەستان بە کۆڵانی بەفراوی، ڕێڕەوی قوڕاوی، هەورازی شەختەبەستوو و ئەو پلیکانانەی کەس پیایاندا ناڕوات، تێ پەڕیم. هەرچەندی من دەڕۆیشتم و تاریکیی شەو بۆ ناو چۆڵترین و بێ مرۆترین گۆشەکانی شار شۆڕ دەبووەوە، تاوانەکەم هێدی هێدی لە دوامەوە جێ دەما و چەندی هەنگاوەکانم لە کۆڵانە تەنگەکان، خانە بەردینەکان، دەرسخانەکان و دیواری مزگەوتەکاندا دەنگیان دەدایەوە، ترسەکانم سووکتر دەبوون.

لاقەکانم لە خۆیانەوە منیان هێنایە ئەم گەڕەکە لاچەپەی هەموو شەوێک بۆی دێم و ئەم گەڕەکە چۆڵکراوانەی کە خێو و جنۆکەش ناتوانن بێ ترس خۆیانی پێدا بکەن. بیستبووم دەگوترا نیوەی پیاوانی ئەم گەڕەکە لە شەڕی عەجەماندا کوژراون و نیوەکەی تریشی لەبەر شوومی و نەگبەتی لە گەڕەک باریان کردووە، بەڵام من بڕوا بە شتی وا ناکەم. تەنیا کارەساتێک بەهۆی شەڕی عەجەمەوە بەسەر ئەم گەڕەکە



دڵگیرەدا هاتبوو، ئەوە بوو چل ساڵ لەمەوبەر دەرگای تەکیەی قەلەندەر بەبیانووی ئەوەی بووە بە هێلانەی دوژمن، بە زنجیر بەسترابوو.

لە پشت درک و داڵی تووترکەکان و ڕووەکەکانی خارەوە(*) کە تەنانەت لە ساردترین هەواشدا بۆنیان دەهات، سووڕامەوە، بەوردەکاریی هەمیشەییی خۆم تەختەکانی نێوان دووکەڵکێشە شکاوەکە و پەنجەرە دەریوانە داخراوەکەم ڕاست کردەوە و چوومە ژوورەوە: بۆنی بخوور و کەڕووی سەد ساڵەم هەڵکێشایە هەناوی خۆمەوە. بوونم لێرە بەڕادەیەک شادمانی کردم کە وام زانی فرمێسک بە چاوانمدا دێتە خوارێ.

ئەگەر تا ئێستا نەمگوتبێت، ئەوا ئێستا دەمەوێت بڵێم لە خوا نەبێت، لە کەسی تر ناترسم و ئەو سزایەی لەم دنیایە بۆم دەبڕێتەوە، لە چاوی مندا دوو پارە ناکات. ترسی من ئەو ئازارەیە، وەک لە قورئانی پیرۆزدا، بۆ نموونە لە سوورەتی "الفرقان"دا بە ئاشکرا هاتووە و بکوژانی جۆری من لە ڕۆژی قیامەتدا دەیچێژن و دەگوترێت چین لەسەر چین زیاتر دەبێت. ڕەنگ و تەوژمی ئەم سزایە، ئەو دیمەنانەی دۆزەخم بیر دەخاتەوە کە نیگارکێشانی کۆنی عەرەب بەسادەیی و منداڵانە، بەڵام بەشێوەیەکی ترسناک لەسەر پێستی ئاژەڵ کێشاویانە و لەو کتێبی کۆندا هەن و بەدەگمەن دەکەونە دەستم. نازانم لەبەرچی، بەڵام دیمەنی ئەشکەنجەی بەدەستی مامۆستایانی چین و مەگۆل کێشراویشم بیر دەخاتەوە. کاتێکیش ئەم سزایە لە پێش چاوم بەرجەستە دەبێت، ناتوانم واتایەکی تری پێ نەدەم و بەم لۆجیکە بیر نەکەمەوە. ئایا ئایەتی ژمارە سی و سێی سوورەتی "الإسراء" چ دەڵێت؟ مەگەر ناڵێت ئەگەر لەسەر هەق نەبێت، کەسێک مەکوژن خوا کوشتنی ئەوی لێتان قەدەغە کردبێت؟ باشە، سا ئەگەر وابێت: ئەو نامەردەی ڕەوانەی دۆزەخم کردووە، هەم باوەڕمەندێک نەبوو لەوانەی خوا کوشتنی قەدەغە کردوون و هەم منیش هۆکاری ڕەوام هەبوو بۆ پانکردنەوەی سەری.

ئەم کابرایە لەدژی ئێمە، کارمەندانی ئەو کتێبەی سوڵتانمان بەنهێنی ڕاسپاردەی

(*) خار یان غار: جۆرێک داری هەمیشە سەوزە و گەڵاکانی لە چەندین جۆری خواردندا بەکار دەهێنرێت.– وەرگێڕ –

دروستکردنی دابوو، بوختان و زماندرێژیی دەکرد. ئەگەر نووزەم لێ نەبڕیبایە، زاوا ئەفەندی و سەرجەم نیگارکێشان و تەنانەت مامۆستا عوسمانیشی بە زەندیق ڕادەگەیاند و فڕێی دەداینە بەردەم موریدە هاربووەکانی مەلای ئەرزەڕوومی. ئەم ئەرزەڕوومییانە خۆیان بۆ پێشاندانی هێز لە بیانوو دەگەڕێن و هەر هێندەی چاویان پێوە بێ کەسێک بە دەنگی بەرز بڵێ نیگارکێشان کاری پێچەوانەی ئاین دەکەن، ئەوا تەنیا وەستایانی نیگارکێش نا، بگرە گشت نیگارخانە تەخشان و پەخشان دەکەن و سوڵتانیشمان بێ ئەوەی نقەی لێوە بێت، تەماشا دەکات.

وەک لە هاتنی هەموو جارێکمدا کردوومە بە خوو، بە گسک و پارچە پەڕۆیەکی شاراوە لە سووچێک، ئەو ناوەم گسک دا و خاوێنم کردەوە. بەدەم ڕاپەڕاندنی ئەم کارەوە، هەناوم گەرم بووەوە و هەستم کرد بەندەیەکی گوێڕایەڵی خوام. دوور و درێژ لە خوا پاڕامەوە تا لە بەخشینی ئەم هەستی خۆ بە باش زانینە درێغیم لێ نەکات. سەرمایەکی گورچووبڕ کاری لە مێشکم کرد. خەریک بوو ئازاری چەپەڵی دەوری قوڕگم سەری هەڵدەدا، دەرچوومە دەرەوە.

یەکسەر دوای ئەوە، بەهەمان باری دەروونیی سەیرەوە خۆم لە گەڕەکێکی تری تەواو جیاوازدا دیتەوە. نازانم لە نێوان گەڕەکی تەکیە چۆڵکراوەکە و ئێرەدا چ ڕوویدا و بیرم لە چی کردووەتەوە و چۆن هاتوومەتە ئەم کۆڵانانەی کە هەردووبەری داری سەرووی لێ نێژراوە.

بەڵام چەندەش بڕۆم، بیرۆکەیەک هەیە ناتوانم لە پاش خۆم بەجێی بهێڵم و وەک گورگ هەناوم دەخوات. ئەگەر بۆ ئێوەی باس بکەم، ڕەنگە کەمێک بارم سووکتر بێت. ئەگەر دەخوازن بە درۆزنی سووک و چرووک و ئەگەر پێشتان خۆشە بە زەریف ئەفەندیی داماو ناوی دەبەین -هەردووکیشیان هەر هەمان شتن-. زەڕکاری خوا لێخۆشبوو ماوەیەکی کورت پێش ئەوەی ببێت بە خوا لێخۆشبوو، بەگەرمی زاوای تاوانبار کرد و شتێکی تریشی بە من گوت. کاتێک بینی قسەی سەبارەت بەوەی زاوا ئەفەندی لە هەموو نیگارەکاندا پەیڕەوی لە ڕوانگەی گاوران کردووە، زۆر کاری لە من نەکردووە، ئەمجار ئەو چەپەڵە گوتی: "دوایین نیگارێکی هەیە، زاوا لەو نیگارەدا جنێو بەهەموو شتێک لەو شتانەی ئێمە باوەڕمان پێ هەیە، دەدات. ئەوەی دەیکات،



چی دی زەندیقی نییە، بگرە ڕاست و ڕەوان کفرە." سێ هەفتە بەر لەم بوختانەی ئەو هیچ و پووچە، زاوا ئەفەندی بەڕاستی داوای لە من کردبوو لە سووچی جیاجیای کاغەزێکدا، وەک ئەوەی لە نیگاری فەرەنگیدا هەیە، نیگاری کۆمەڵێک شتی جیاوازی تا ڕادەی سەرسوڕمان لە یەکتر دوور -ئەسپ، پارە و شتی وەک مردن-ی بۆ بکێشم. ڕووبەری ئەو ئەو پەڕە خشتە بۆ کێشراوەی داوام لێ کرابوو بینەخشێنم و بڕێکی زۆری ئەو بەشەی زەریف ئەفەندیی بەلەنگاز زەڕکارییەکەی دەکرد، وەک ئەوەی بویسترێت لە من و نیگارکێشانی تر بشاردرێتەوە، هەمیشە کاغەزی تری بەسەرەوە بوو.

دەمەوێت لە زاوا بپرسم لەو دوایین نیگارە مەزنەدا چ دەکێشێت، بەڵام زۆر شت هەن ناهێڵن بپرسم. ئەگەر بپرسم، بە دڵنیایی گومان دەکات من زەریف ئەفەندیم کوشتبێت و ئەم گومانەشی لەکن گشت کەسێک بڵاو دەکاتەوە. شتێکی تری هۆکاری ئۆقرە لێبڕانم ئەوەیە، ئەگەر من ئەم پرسیارەی لێ بکەم، ئەوا زاوا دەڵێت زەریف ئەفەندی لەسەر هەقە. هەندێک جار بەخۆم دەڵێم با لە ڕووی بەدگومانیی خۆمەوە بپرسم، نەک ئەوەک ئەوەی زەریف ئەفەندی ئەم گومانەی لەکنم ورووژاندبێت، بەڵام ئەمە ترسەکانم کەمتر ناکاتەوە. ئەگەر مرۆڤ پێ نەزانێت و ڕەفتاری پێچەوانەی ئاین بنوێنێت، لەوانەیە شتێکی هێندە ترسناک نەبێت، بەڵام ئێستا هەموو شتێک بۆ من ڕوون و ئاشکرایە.

لاقەکانم، کە هەمیشە لە سەرم بە ئاوەزترن، لەخۆیانەوە منیان برد تا کۆڵانی ماڵی زاوا ئەفەندی. خۆم خزاندە گۆشەیەکەوە و ئەوەندەی توانیم لە تاریکییەکەدا بیبینم، تێر و پڕ سەیری ماڵەکەم کرد: خانوویەکی دوونهۆمیی گەورە و پۆشتە و پەرداخ لەناو دار و درەختدا، نەمدەزانی شەکوورە لە کام گۆشەی ماڵەکەدایە. شێوەی ئەوەی لە هەندێک نیگاردا هەیە لەوانەی لە سەردەمی شا تەهماسپدا لە تەورێز کێشراون، وەک ئەوەی ماڵەکە بە چەقۆ کرابێت بە دوولەتەوە، لە خەیاڵی خۆمدا هەوڵم دا بیهێنمە بەرچاوی خۆم نیگاری شەکوورە لە پشت کام دەریوانەوە بکێشم.

دەرگا کرایەوە. لە تاریکییەکەدا بینیم قەرە لە ماڵەوە دەرچوو. زاواش کەمێک لە پشت دەرگای حەوشەوە تاوێک بەدلۆڤانی بۆ قەرەی ڕوانی و دەرگای داخست.

تەنانەت سەری جەنجاڵ و پڕ لە خەیاڵیشم دەستبەجێ بە ئازارەوە و خۆبەخۆ ئەم سێ ئەنجامەی لەو دیمەنە هەڵێنجا:

یەک: قەرە لەبەرئەوەی هەرزانترە و مەترسیی کەمترە، زاوا ئەفەندی، کتێبەکەمان، کتێبەکەی ئێمە بە وی بەتەواوکردن دەدات.

دوو: شەکوورەی شۆخ شوو بە قەرە دەکات.

سێ: قسەکانی زەریف ئەفەندیی داماو ڕاست دەرچوون: بەختوخۆڕایی کوشتبووم.

لەم دۆخانەدا، واتە ئەو ئەنجامە بەئازارەی دڵمان هەوڵ دەدات و پێی ناگات، هەر ئەوەندەی ئەقڵی بێ بەزەییمان پەی پێ برد، هەموو جەستەمان لێی هەڵدەگەڕێتەوە. سەرەتا، نیوەی ئەقڵم بەوپەڕی هێزەوە دژی ئەنجامی سێیەم ڕاوەستایەوە کە دەڵێت من بێ هیچ هۆیەک بووم بە بکوژێکی چەپەڵ. لەم کاتەدا، لاقەکانم دیسان خێراتر و لۆجیکییانەتر لە ئەقڵم هەڵسوکەوتیان کرد و بگرە منیان خستبووە دوای قەرە ئەفەندییەوە.

چەند کۆڵانێکمان بڕیبوو، بیرم کردەوە کوشتنی ئەم قەرەیەی لە ژیان و لە خۆی ڕازییە و لە پێشمەوە دەڕوات، زۆر ئاسانە و بەم کارە دەمتوانی خۆم لە ڕووبەڕووبوونەوەی هەردوو ئەنجامی یەکەم و دووەم ڕزگار بکەم، ئەو ئەنجامانەی ئەقڵم پەی پێ بردوون و بێزاریان دەکردم. بگرە ئەو کاتە نەدەکەوتمە بارێکەوە بەختوخۆڕایی کەللەی زەریف ئەفەندیی بەستەزمانم شکاندبێت. وای بۆ چووم ئەگەر ئێستا هەشت نۆ هەنگاو ڕابکەم و لە دواوە خۆمی پێ بگەیەنم و بەتەواوی هێزمەوە گورزێک لە سەری بسرەوێنم، هەموو شتێک وەک لە ڕابردوودا هەبووە، بەردەوام دەبێت و زاوا ئەفەندی بانگم دەکات و دەڵێت با کتێبەکەمان بەئەنجام بگەیەنین. بەڵام لایەکی دروستتر و خۆپارێزتری ئەقڵم (جا زۆر جاران بەدروستی لە ترس بترازێت، چ شتێکی ترە؟)، هێشتا پێمی دەگوت ئەو نامەردەی تۆپاندبووم و فڕێم دابووە بیرەوە، بەڕاستی بوختانچی بووە. ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، واتای وایە من ئەوم بێ هۆ نەکوشتووە و زاوا ئەفەندیش شتێکی نهێنی لە کتێبەکەیدا نییە و من بۆ ماڵی خۆی بانگ دەکات.



بەڵام کاتێک بۆ قەرەم دەڕوانی لە پێش منەوە ڕێگای دەبڕی، دەستبەجێ حاڵی دەبووم: هیچ کام لەمانە هەلی پێکهاتنی نەبوو. هەمووی خەیاڵ بوو. قەرە لە من ڕاستتر بوو. بەسەر هەموومان دێت: هەندێک جار لۆجیکییانە بیر دەکەمەوە و دەڵێم دوای چەندین هەفتە و ساڵ خەیاڵکردنەوە، ڕۆژێک شتێک دەبینین، ڕوویەک، جلوبەرگێک و مرۆڤێکی بەختەوەر دەبینین و تێ دەگەین خەیاڵەکانمان بەدی نایەن، بۆ نموونە دەڵێین هەرگیز ئەو کچەمان نادەنێ، یاخۆ هیچ کاتێک ناگەیەندرێینە ئەو پلەیە.

بە نەفرەتێکی قوڵی دڵی داخکەرەوە سەیری سەر و پشتمل و هەڵبەز و دابەزی شانەکانی و سەیری ئەو ڕێ و ڕۆیشتنەیم کرد –دەتگوت بە منەتەوە هەنگاو دەنێ–، کە دەماری مێشکی مرۆڤی دەهاڕی. کەسانی وەک قەرە لە ئازاری ویژدان بەدوورن، پاشەڕۆژێکی بەختەوەریان لە پێشە، سەرانسەری دنیا بە ماڵی خۆیان دەزانن و وەک سوڵتانێک بچێتە پشتیرەوە، هەموو دەرگایەک دەکەنەوە و یەکسەر ئێمەی ژوورەوە دەشکێننەوە. بەزۆر خۆم ڕاگرت تا بەردێک هەڵنەگرم و بەدوایدا ڕانەکەم و نەیکێشم بە سەریدا.

ئێمە، دوو پیاوی ئەڤیندار بەهەمان ژن، ئەو لە پێشەوە و منیش، ئەو بە هیچ جۆرێک هەستی پێم نەکردووە، لە دواوە، کاتێک بە کۆڵانەکانی ئەستەنبوڵدا دەخوولێینەوە و هەڵدەکشێین و دادەبەزین و دەردەچین، گاڤێک بەکۆڵانە چۆڵکراوەکان بۆ شەڕە سەگ، بەو شوێن سووتاوییەکانی شوێنی خۆمەلاسدانی جنۆکە، بەحەوشی ئەو مزگەوتانەی فریشتە لە گومەزەکانیاندا پاڵ کەوتوون و نووستوون، بەتەنیشت ئەو دار سەرووانەی وژەوژ لەگەڵ ڕۆحەکاندا دەدوێن، بە قەراغ ئەو گۆڕستانە بەفر لێ نیشتوانەی خێو و تارماییيان تێدا ئاوێتە بووە، کەمێک بەلای ئەو ڕێگرانەی قوڕگی پیاو هەڵدەدڕن، بە نێوان دیواری دووکانی لە ژماردن نەهاتوو، ئاخوڕ، تەکیە، مۆمخانە و سەڕاجدا وەک دوو برا تێ دەپەڕین، پێم وایە من دوای ئەو نەکەوتووم، بگرە لاسایی دەکەمەوە.

# 24

## من ناوم مردنە

وەک دەبینن من مردنم، بەڵام پێویست ناکات بترسن، چونکە نیگاریشم. کەچی لە چاوتاندا دەخوێنمەوە لێم دەترسن. هەرچەندە سوور دەزانن من ڕاستی نیم، بەڵام وەک ئەوەی لەگەڵ مردن خۆی ڕووبەڕوو بووبێتنەوە، شێوەی منداڵانی نقومبووی ناو گەمەی خۆیان شپرزە دەبن و ئەمەش مایەی خۆشحاڵیی منە. تا زیاتر سەیرم بکەن، هەست دەکەن کاتێک ساتی کۆتایی، ئەو دەمەی مەحاڵە خۆتانی لێ بپارێزن، نزیک دەبێتەوە، چۆن لە ترساندا ژێر خۆتان پڕ دەکەن. گاڵتە نییە؛ بەتایبەتی بەشی هەرە زۆری پیاوانی شێرئاسا، لە ڕووبەڕووبوونەوەی مردندا خۆیان ڕادەست دەکەن. بۆیە ئەو مەیدانی شەڕانەی هەزاران جار بەدەستی ئێوە نیگاریان کێشراوە، بۆنی خوێن و باروت و زرێی داخبوویان لێ نایەت وەک ئەوەی گومان دەکرێت، بگرە بۆنی گوو و گۆشتی بۆگەنیان لێ دێت.

دەزانم جاری یەکەمتانە نیگارێکی مردن دەبینن.

ساڵێک لەمەوبەر، پیرێکی درێژ، زراڤ و پڕ لە نهێنی، مامۆستای لاوی بکێشی منی بۆ ماڵی خۆی بانگ کرد. لە ژوورێکی نیگارکێشیی نیوە تاریک و نیوە ڕوونی خانوویەکی دوونهۆمیدا، قاوەیەکی گرانبەها و بەتام و چێژی بۆن عەنبەرینی نایە بەردەم لاوەکە و هۆشی هێنایەوە جێی خۆی. دواتر لە ژوورێکی دەرگا شینی بەر سێبەردا، باشترین کاغەزی هندستانی، فڵچەی دروستکراو لە کلکی سمۆرە، کاغەزی زێڕین، قەڵەمی جۆربەجۆر و قەڵەمتاشی دەسک مەرجانی پێشان دا،



ئاماژەی بۆ پێدانی پارەیەکی باش کرد و وەستای نیگارکێشی هێنایە سەر هەوەس.

دوایی گوتی: "نیگاری مردنم بۆ بکێشە."

ئەو نیگارکێشە دەستڕەنگینەی دواتر نیگاری منی کێشا، گوتی: "من هەرگیز نیگاری مردنم نەدیوە و ناتوانم بکێشم."

پیری زراڤی سەوداسەر گوتی: "بۆ ئەوەی نیگاری شتێک بکێشی، پێویست ناکات بەهەر جۆرێک بووە لە پێشدا نیگارەکەی ببینی."

مامۆستای نیگارکێشی بکێشی من گوتی: "بەڵێ، لەوانەیە پێویست نەبێت، بەڵام ئەگەر بخوازیت نیگارەکەت وەک کاری مامۆستایانی کۆن بێ کەموکورتی بێت، دەبێت لەوەوبەر هەزاران جار کێشرابێت. نیگارکێش چەند مامۆستا بێت با ببێت، کاتێک بۆ یەکەمجار بابەتێکی نوێ دەکێشێت، وەک شاگردێک دەیکێشێت و ئەمەش بەهیچ جۆرێک لە شان و شەوکەتی من ناوەشێتەوە. نامەوێت لە پێناوی کێشانی نیگاری مردندا وەستاییی خۆم بنێمە لاوە، چونکە ئەمە شتێکە لە جۆری مردن بۆ من."

پیرە گوتی: "لەوانەیە ئەم مردنە لە بابەتەکە نزیکت بخاتەوە."

"ئەوەی دەمانکات بە وەستا، ژیان لەگەڵ بابەت نییە، بگرە هیچ نەژیانە لە تەکیدا"

"کەواتە پێویستە ئەم وەستاییە ئاشنای مردن بێت."

بەمجۆرە، بەشێوەیەکی شایەن بەو نیگارکێشانەی ڕێز لە وەستایانی کۆن و هونەرەکەیان دەگرن، کەوتنە گفتوگۆیەکی پڕ لە قسەی جووتواتایی، کینایە، ڕەوانبێژی، ئاماژە و پەی پێبردنی دوور و درێژەوە. ئەم وتووێژەی لەبەرئەوەی لەبارەی هەبوونی منەوە بوو، بەوردی گوێم بۆ هەمووی ڕاگرت، دەزانم نیگارکێشە نایابەکانی قاوەخانەکەمان قەڵس دەکات. جارێک کار گەیشتە ئەم خاڵە: نیگارکێشی خاوەنی دەستی پەرجوویی و چاوجوان و هۆشیار گوتی: "ئایا پێوەری هونەری نیگارکێش ئەوەیە وەک مامۆستایانی کۆن نیگاری هەموو شتێک بێ کێماسی بکێشێت، یاخۆ ئەوەیە ئەو بابەتانەی کەس نەیبینیوە بخاتە نیگارەکەیەوە؟" سەرباری ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارەشی دەزانی، بەڵام بەپارێز بوو.

پیری لافلێدەر گوتی: "ڤینیسیاییەکان هێزی نیگارکێش بە دۆزینەوەی بابەتی

هەرگیز نەکێشراو و شێوازەکانیان دەپێون."

ئەو نیگارکێشەی دەبوو دواتر نیگاری من بکێشێت، گوتی: "ڤینیسیایی وەک ڤینیسیایی دەمرن."

پیرە گوتی: "بەڵام مردنی هەمووان وێک دەچێت."

نیگارکێشی ئاوەزیاو گوتی: "داستان و نیگار ئەوە نییە هەموو کەسێک بەیەک بچوێنی، بگرە ئەوەیە وێکنەچوونیان بکەی بە چیرۆک. مامۆستای نیگارکێش بەوە دەبێت بە مامۆستا کاتێک داستانە جوداکان هاوشێوەی یەکدی دەکێشێت."

بەوجۆرە قسە هاتە سەر مردنی ڤینیسیایی و موسڵمانان، ئیزرائیل، فریشتەکانی تری خوا و باسی ئەوەی مرۆڤ نابێت هیچ کاتێک نیگاری ئەوان و گاوران تێکەڵ بکات. ئەو مامۆستا لاوەی دەبوو دوای کەمێکی تر نیگاری من بکێشێت و ئێستا لە قاوەخانە دەلالەکەمان بە چاوە جوانەکانییەوە سەیرم دەکات، لەو ساتەدا قەڵس بوو، ئۆقرە لە دەستەکانی بڕا، دەیویست نیگاری من بکێشێت، بەڵام نەیدەزانی من شتێکی چۆنم.

پیری چەپەڵ دەیویست مامۆستا لاوەکە لە خشتە ببات و فێڵبازانە هەستی بەشپرزەیی ئەو کرد. زەق زەق چاوە درەوشاوەکانی لەبەر تیشکی چرای لە ختوخۆڕایی داگیرسێندراوی ژووری بەر سێبەر لە مامۆستای گەنجی دەست بەپەرجوو بڕی و گوتی:

"ئەو مردنەی ڤینیسیاییەکان وەک بڵێی لە شێوەی مرۆڤدا کێشاویانە، فریشتەیەکە لە جۆری ئیزرائیلی ئێمە، بەڵام لە بەرگی مرۆڤدایە. کتومت وەک ئەوەی لە کاتی دابەزینی قورئانی پیرۆزدا جبرائیل لە بەرگی مرۆڤدا خۆی پێشانی پێغەمبەرمان دا. حاڵی دەبیت؟"

تێ گەیشتم مامۆستای گەنجی خاوەن بەهرەی لە ئەقڵ بەدەری خواپێداو ئارامی لەبەر بڕا و دەیەوێت نیگاری من بکێشێت، چونکە کابرای پیری ئیبلیس ئاسا، توانیبووی ئەم بیرۆکە ئیبلیسانەیەی تێدا بورووژێنێت: ڕاستییەکەی، ئێمە ناخوازین نیگاری شتێک بکێشین، کە بەگشت ڕووناکییەکانییەوە دەیناسین، بگرە دەمانەوێت بتوانین نیگاری شتێکی نەناسراو و نیوە تاریک بکێشین.



ئەو نیگارکێشەی دەبوو دوای تۆزێکی تر نیگاری من بکێشێت، گوتی: "ئەو مردنە بەهیچ جۆرێک ناناسم."

پیرە گوتی: "هەموومان مردن دەناسین."

"لێی دەترسین، بەڵام نایناسین."

پیرە گوتی: "ئێ تۆش نیگاری ئەو ترسە بکێشە."

هیچی وای نەمابوو لەو ساتەدا نیگارم بکێشرێت. هەستم کرد پشتملی گەورە مامۆستای نیگارکێش کەوتە مێرووله کردن، ماسولکەکانی مەچەکی گرژبوونەوە و بە نووکی پەنجەکانی بۆ قەڵەم دەگەڕا. بەڵام لەبەرئەوەی گەورە وەستایەکی ڕاستەقینە بوو، هەستی کرد ئەم گرژبوونەوەیە ئەڤینی نیگارکێشی لە ڕۆحیدا قووڵتر دەکاتەوە، بۆیە خۆی ڕاگرت.

پیری فێڵبازیش لەبەرئەوەی ئەمە تێ گەیشتبوو، چەند بەشێکی لە کتێبەکانی بەردەمی وەک کتێبی "کتاب الروح"ی "الجوزیة" و "کتاب أهوال القیامة"ی غەزالی و کتێبی "سیوطی"ی خوێندەوە بۆ ئەوەی ببێت بە ئیلهام بۆ نیگاری من و دڵنیا بوو لەوەی دواکی کەمێکی تر دەکێشرێت.

بەمجۆرە، کاتێک مامۆستای دەست بەپەرجوو ئەم نیگارەی منی کێشا کە ئێستا ئێوە بە زراوی تۆقیوەوە تەماشای دەکەن، بیستی فریشتەی مردن هەزاران باسکی هەیە و لە بەهەشتەوە تا دنیا و لە دوورترین پنتی ڕۆژهەڵاتەوە تا دوورترین خاڵی ڕۆژئاوا درێژ دەبنەوە و ئەم باسکانە بۆ باوەڕمەندان پەناگان و هەریەکەشیان بۆ گوناهکاران و یاخیبووان شێوەی مێخێکی سووتێنەرن. لەبەرئەوەی زۆربەی ئێوەی نیگارکێشانیش دۆزەخین، وەستام نیگاری منی بە مێخ و بزمار داپۆشیوە. ئەو فریشتەیەی خوا بۆ کێشانی گیانی ئێوە ڕەوانەی دەکات، دەفتەرێکی بەدەستەوەیە ناوی هەمووتانی تێدا تۆمار کراوە و لە پەڕەکانیدا هێڵێکی بازنەیی ڕەش بەدەوری ناوی هەندێکتاندا کێشراوە. بەڵام خوا تەنیا خۆی دەزانێت کەی ساتی مردن دێت و لەگەڵ هاتنی ئەو ساتەش گەڵایەک لە دارەکەی دامێنی عەرش دەکەوێتە خوارەوە و کەسێک گەڵاکە بگرێتەوە و بیخوێنێتەوە، دەزانێت نۆرەی مردنی کێیە. نیگارکێشی من ئەم شتانەی بیست، بۆیە نیگاری منی وا ترسناک، بەڵام وەک کەسێکی خاوەن

ئەزموون و بەڕامان کێشا. پیرەی تەختە ناتەواو لە کتێبێکدا خوێندییەوە کەوا فریشتەی مردن لە بەرگی مرۆڤدا دێتە کن کەسێک وادەی هاتبێت و دەستی بۆ درێژ دەکات و گیانی لێ دەسێنێتەوە. دواتر، لەپڕ ڕووناکییەکی لە شێوەی تیشکی ڕۆژ دەوروبەر ڕووناک دەکاتەوە. نیگارکێشی هۆشیاریش بە بیستنی ئەم قسەیە، نیگاری منی لەناو تیشک و ڕووناکیدا کێشا، چونکە دەیزانی ئەم ڕووناکییە بۆ ئەوانەی دەوروبەری کەسی مردوو دەرناکەوێت. پیرەی سەوداسەر لە "کتاب الأرواح"وە چەند بەشێکی لەبارەی ئەو شتانەوە خوێندەوە کە گۆڕدزانی کۆن دیویانە: وەک جەستەی مێخڕێژکراو لە چەند لاوە، بینینی ئاگر بە تەرمی تازەوە لە کاتی گۆڕ هەڵدانەوەدا و ئەو سەرانەی بەر فیشەک دراون. نیگارکێشی دەستڕەنگینیش بەوردی گوێی بۆ ڕاگرتبوو و لە کاتی کێشانی نیگاری مندا هەر شتێک بۆ ترساندنی بینەر دەست بدات، خستییە نیگارەکەوە.

بەڵام دوایی لەم کارەی پەژیوان بووەوە؛ نەک لە ترسی ئەو شتانەی خستبوونیە نیگارەکەوە، بگرە لە سەرجەم نیگارەکە پاشگەز بووەوە. منیش هەست دەکەم کەسێک بم وەک ئەو کەسەی کە باوکی بە شەرم و پەشیمانییەوە باسی دەکات.

مامۆستای نیگارکێشی دەستڕەنگین بۆچی لە کێشانی نیگاری من پەژیوان بوو؟

١- چونکە نیگاری مردن، من، وەک پێویست وەستایانە نەکێشرابوو. وەک دەبینن، پوخت و تەواو نیم وەک ئەو شتانەی گەورە مامۆستایانی ڤینیسیایی یان مامۆستایانی کۆنی هەراتی دەیانکێشن. خۆیشم شەرم لەم حاڵە شڕ و پەشێوەی خۆم دەکەم و گەورە مامۆستای بکێشی منیش ئەم ڕەوشە بە شایەنی ویقاری مردن نازانێت.

٢- کابرای پیر ڕێبازێکی ئیبلیسانەی نابووە بەر وەستای نیگارکێش و فریوی دابوو نیگاری من بکێشێت. بۆیە لەپڕ دەیبینی وا بێ بیرکردنەوە لاسایی شێواز و بۆچوونی مامۆستایانی ڤینیسیایی دەکاتەوە و لەبەرئەوەی جۆرێکیش لە بێ ڕێزیی لە بەرامبەر مامۆستایانی کۆن نواندووە و بۆ یەکەم جار هەستی دەکرد ئەم جووڵانەوەیەی بێ ڕەوشتییەکی سەیرە، گینگڵی دەخوارد.

٣- هەندێک لەو کەر و گەوجانەی وا خەریکن لێرە لەگەڵ من ڕادێن و پێ دەکەنن،



پێویستە ببرێتە مێشکیانەوە: گاڵتە لەگەڵ مردندا ناکرێت.

وەستای نیگارکێشی بکێشی نیگاری من، ئێستا لەتاو پەشیمانی، شەوانە بێ وچان بە کۆڵانەکاندا دەسوڕێتەوە. کتومت وەک هەندێک مامۆستای چینی، خۆی لێ دەبێت بەو شتەی خۆی کێشاویەتی.

25

## من ناوم ئەستەرە

ژنانی گەڕەکەکانی قزڵەناره و قەرەکەدی ڕاسپاردەی قوماشی مۆر و سووری دۆڵمای بیلەجیکیان بۆ بەرگی لێفە دابوو، سەرلەبەیانی زوو نامە بوخچەکەم. قوماشی سەوزی ئاوریشمی چینیی تازە بە کەشتیی پورتوگالی هێنراوم لادایە لاوە و لە شینەکەیم خستە بوخچەوە. بەخۆمم گوت ئەم بەفرە خۆشی ناکاتەوە و ئەم زستانە نابڕێتەوە، بۆیە دەستە دەستە گۆرەوی، پشتوێنی خووریی ئەستوور و هێلەکی خووریی پتەو و ڕەنگ جیاوازیشم بە جوانی قەد کرد و خستمە نێوان بابەتەکانەوە بۆ ئەوەی هەر هێندەی بوخچەم کردەوە، تەنانەت دڵی بێ مەیلترین ژنیش لە خۆشیاندا دەست بە ترپەترپ بکات. دوایی کیسەی پارە، کیسەی نەخشێندراوی گەرماو و دەسڕی ئاوریشمنی سووک، بەڵام گرانبەهام بۆ ئەو ژنانەی لەبری شت کڕین بۆ قسە و قسەڵۆک بانگم دەکەن، نایە بوخچەوە. بوخچەم بەرز کردەوە، ئای چەند قورسە، پشتم دەشکێت. دامنایەوە زەوی و دیسان کردمەوە، کاتێک سەیرم دەکرد چ شتێکی لێ دەربهێنم، لە دەرگا درا، نەسیم کردییەوە و بانگی کردم.

خەیرییەی کەنیزە بە ڕووی سوورهەڵگەڕاوەوە لەبەر دەرگا ڕاوەستابوو و نامەیەکی بەدەستەوە بوو.

بەچرپە گوتی: "شەکووره خاتوون ناردوویەتی." وەها شپرزە بوو بوو، واتدەزانی ئەوەی عاشق بووە و بەنیازە شوو بکات، خۆیەتی.



نامەکەم بەوپەڕی دەربەستەوە لێ وەرگرت، ئامۆژگاریی کچەی گەمژەم کرد بێ ئەوەی کەس بیبینێت، بۆ ماڵ بگەڕێتەوە. نەسیم بەدوو چاوی پڕ لە پرسیارەوە سەیری دەکرد. دەستم دایە بوخچەی گەورە، بەڵام سووک و درۆزنانە. هەر کاتێک نامە بگوازمەوە، ئەم بوخچەیە لەگەڵ خۆمدا دەگێڕم.

گوتم: "شەکوورەی کچی زاوا ئەفەندی لە ئاگری ئەڤیندا دەسووتێ و قرچەی دێت. ئەو بێچارەیە بەتەواوی ئەقڵی لە دەست داوە."

قاقایەکم لێ دا و چوومە دەرێ، بەڵام دەستبەجێ شەرمێک هەناومی داگرت. ڕاستییەکەی، دەمویست فرمێسکی چاوان بۆ ژیانی خەمگینی شەکوورە بڕێژم، نەک گاڵتە بە سەرچڵییەکانی دڵی بکەم. کچی چاوڕەش و لێوبەباری خۆم چەند دولبەر و نازدارە.

بەخێرایی بە بەردەم خانووە داڕووخاوەکانی گەڕەکی جوولەکانی خۆماندا تێ پەڕیم. ئەم گەڕەکەی ئێمە لە سەرمای سەرلەبەیانیدا چۆڵتر و داماوتر دێتە بەر چاوان. زۆر دواتر، کاتێک ئەو سواڵکەرە کوێرەم بینی، کە لە کۆڵانی ماڵی حەسەن گۆشەیەکی گرتبوو و چاودێریی هاتوچۆکەرانی دەکرد، بەتەواوی هێزەوە هاوارم کرد: "بوخچەگێڕ."

گوتی: "قەڵەوی چەنەباز، خۆ هاواریش نەکەی، بە دەنگی ترپەی پێتدا هەر دەتناسمەوە."

گوتم: "کوێری چەپەڵ، تەتەری شووم، کوێر بەڵان و خوا دەستی لێ هەڵگرتوون. بەڵای خوات لێ بدات."

جاران توورە نەدەبووم و گوێم بەو شتانە نەدەدا. بابە ئەفەندی دەرگای حەسەنی کردەوە. ئەبغازە، ئەفەندییە و جوامێرە.

گوتی: "ئادەی با بڕوانم ئەمجارە چیت بۆمان هێناوە؟"

"کوڕە تەمبەڵەکەت لە خەودایە؟"

"دەخەوێت؟ چاوی لە ڕێیە، چاوەنۆڕی هەواڵی تۆیە."

ماڵەکە هێندە تاریک و نووتەکە، هەموو جارێک وا دەزانم چوومەتە گۆڕەوە. بۆ ئەوەی شەکوورە هیچ پرسیاری ئەمان نەکات و نەڵێت چ دەکەن، من هەموو جارێک

بەشێوەیەک باسی ئەم ماڵەی بۆ دەکەم کە هەرگیز بیر لە گەڕانەوە بۆ ناو ئەم گۆڕە نەکاتەوە. تەنانەت بەخەیاڵیش دژوارە مرۆڤ بیر لەوە بکاتەوە شەکوورەی شۆخم سەردەمانێک خانمی ئەم ماڵە بووبێت و لەگەڵ پیاوە بێ کەڵکەکانی ناویدا ژیابێت. لەناو ماڵەکەوە بۆنی خەو و مردن دەهات. چوومە ژوورەکەی تر، زیاتر بە تاریکاییەکەدا شۆڕ بوومەوە.

چاو، چاوی نەدەبینی. هێشتا نامەکەم دەرنەهێنابوو، حەسەن لە تاریکییەکەدا دەرکەوت و لە دەستمی ڕاپسکاند. وەک هەموو جارێ لێ گەڕام بیخوێنێتەوە و تاسەی خۆی بشکێنێت. دەستبەجێ سەری لەسەر کاغەزەکە بەرز کردەوە.

گوتی: "هیچ شتێکی تر نییە؟" بەڵام خۆ دەیزانی هیچ شتێکی تر نییە. گوتی: "ئەمە نامەیەکی کورتە." دەستی بە خوێندنەوەی کرد:

"قەرە ئەفەندی، دێیە ماڵمان و ڕۆژ تا ئێوارێ دادەنیشیت. بەڵام بیستم تەنانەت دێڕێکیش بۆ کتێبەکەی باوکم نانووسی. نەکەیت پێش تەواوکردنی کتێبەکەی باوکم، ئومێدی بێ بناخە بۆ خۆت هەڵچنیت."

نامەکەی بەدەستەوە گرتبوو، وەک ئەوەی گشت شتێک تاوانی من بێت، سەیری ناو چاومی دەکرد و تاوانباری دەکردم. حەز بەم بێدەنگییەی ناو ئەم ماڵە ناکەم.

گوتی: "ئێدی قسەیەک لە گۆڕێدا نییە سەبارەت بەبەشووبوونی خۆی و گەڕانەوەی مێردی لە شەڕ. بۆچی؟"

گوتم: "من چووزانم، خۆ ئەم نامانە من نایاننووسم."

گوتی: "جاروبار لەویش دەکەومە گومانەوە." ئەمەی گوت و نامەکەی لەگەڵ پازدە ئاکچەدا بۆم گەڕاندەوە.

گوتم: "هەندێک پیاو تا زیاتر پارەیان دەست بکەوێت، ڕژدتر دەبن، بەڵام تۆ وا نیت."

ڕەهەندێکی هێندە ئیبلیسانە و ژیر لەم کابرایەدا هەیە وا لە مرۆڤ دەکات تێ بگات بۆچی شەکوورە سەرباری حاڵی تاریک و خراپی حەسەن، هێشتا نامەکانی وەردەگرێت.



"کتێبەکەی باوکی شەکوورە چییە؟"

"دەزانیت چی؟ دەڵێن هەموو پارەکەی سوڵتانمان دەیدات."

گوتی: "نیگارکێشان، لەبەر نیگارەکانی ناو ئەو کتێبە یەکتر دەکوژن. ئایا بۆ پارەکەیەتی، یاخۆ –دووربێت– لەبەرئەوەیە سووکایەتی بە ئاینەکەمان دەکات؟ دەڵێن هەرکەسێک سەیری ئەو نیگارانە بکات، دەمودەست کوێر دەبێت."

ئەمانەی بە زەردەخەنەیەکی ئەوتۆوە گوت کە من حاڵی بووم پێویست ناکات بەهەند وەریان بگرم. تەنانەت ئەگەر قسەیەکیش بووبێت بۆ بەهەند وەرگرتن، بەلایەنی کەمەوە، لای ئەو شتێکی وای تێدا نەبوو بۆ ئەوەی من بەهەندی وەربگرم. حەسەنیش وەک زۆربەی ئەو پیاوانەی دەستەودامێنی نامە گواستنەوە و ناوبژیوانیی منن، کاتێک شکۆی بریندار دەبێت، من دەشکێنێتەوە. منیش، بۆ ئەوەی دڵخۆشیان بکەم، لەبەر خاتری کارەکەم خۆم وا دەنوێنم وەک ئەوەی زویر بووبم. کچانیش کاتێک شکۆیان بەتەواوی دەشکێت، باوەشم پێدا دەکەن و دەگرین.

حەسەن پێی وابوو هەستی منی بریندار کردووە و بۆ ئەوەی برینی شکۆم سارێژ بکات، گوتی: "تۆ ژنێکی ئاقڵی، بەزوویی ئەمە بگەیەنە. پەرۆشی زانینی وەڵامی ئەو بوودەڵەیەم."

لەپڕ بە ناخمدا هات بڵێم: "قەرە هێندەش بوودەڵە نییە." ئیرەیی بەیەکبردنی پیاوانی ڕکابەر لەم دۆخانەدا، پارەی زۆر بۆ ئەستەری دەلاڵ پەیدا دەکات. بەڵام ترسام لەپڕ تووشی تەنگژەی هەڵچوون بێت.

بەدەم هاتنە دەرەوەوە لە دڵی خۆمدا گوتم: "سواڵکەرە تەتەرەکەی ئەوسەری کۆڵان زۆر بێ ڕەوشتە."

بۆ ئەوەی خۆمی لێ ببوێرم، لەوسەری تری کۆڵانەکەوە ڕۆیشتم و بەیانی زوو بە بازاڕی مریشک فرۆشاندا تێپەڕیم. بۆچی میللەتی موسڵمان سەر و لاقی مریشک ناخۆن؟ لە سەیر و سەمەرەییی خۆیانە. دایکی دایکم، جێگای بەهەشت بێت، دەیگێڕایەوە و دەیگوت کاتێک لە پورتوگالەوە هاتوون، بە مەنجەڵ لاقە مریشکیان کوڵاندووە، چونکە هەرزان بووە.

کاتێک لە کەمەرارلغی ژنێکم بینی وەک پیاو قیت و قۆز بەسەر ئەسپێکەوە بوو و

کۆیلەکانی دەورەیان دابوو و تا بڵێی لووتبەرز بوو و نازانم شازن بوو یان کچی دەوڵەمەندان و ئاخێکم هەڵکێشا. شەکوورەش، ئەگەر کچی باوکێکی ئەقڵ لە ئەژنۆ و خۆ بۆ کتێب تەرخان کردوو نەبوایە و ئەگەر مێردەکەی بە دەستکەوتەوە لە شەڕی سەفەوی بگەڕایەتەوە، ئێستا ئەویش وێنەی ئەو ژنە لووتبەرزە دەژیا. ئەم جۆرە ژیانە لە هەموو کەسێک زیاتر، شایەنی ئەوە.

کاتێک گەیشتمە کۆڵانی ماڵی قەرە، لەپڕ لێدانی دڵم زیادی کرد. ئەرێ من دەمەوێت شەکوورە شوو بەم یارۆیە بکات؟ دەتوانم شەکوورە لەگەڵ حەسەن هەم لە پێوەندیدا بهێڵمەوە و هەم دووریش لێی ڕابگرم، بەڵام ئەدی قەرە؟ ئەم کابرایە، جگە لە ئەڤینی بۆ شەکوورە، هەموو شتێکی تری زۆر دروستە.

"بوخچەگێێێێێڕ."

کامەرانیی گەیاندنی نامەیەک بەو ئەڤیندارانەی لەتاو تەنیایی و بێ ژنی و بێ پیاوی گەمژەبوونە، بەهیچ شتێکی تر ناگۆڕمەوە. ئەگەر سوور بزانن خراپترین هەواڵیشیان پێ دەگات، کاتێک دێنە سەر خوێندنەوەی نامەکە، ئومێدێک هەناوی هەموویان ڕۆن دەکاتەوە.

لەبەرئەوەی شەکوورە هیچ ئاماژەی بۆ گەڕانەوەی مێردی نەکردبوو و مەرجێکی بۆ قسەی "هیچ ئومێدی بێ بناخە هەڵمەچنە" دانابوو، بێگومان قەرە مافی خۆی بوو بەزیادیشەوە ئاوات بۆ خۆی بنیات بنێت. بە چێژەوە سەیری شێوازی خوێندنەوەی نامەکەیم کرد. لەبەر شادمانی شپرزە بوو، بگرە ترسا. کاتێک ئەو بۆ نووسینی وەڵام کشایە دواوە، منیش وەک ئەوەی ژنە بوخچەگێڕێکی هۆشیار دەیکات، بوخچەی درۆزنانەی خۆم کردەوە، کیسەیەکی ڕەشی پارەم دەرهێنا و پێشانی خاوەن ماڵە فزوولییەکەی قەرەم دا.

گوتم: "باشترین قەدیفەی عەجەمە."

گوتی: "کوڕەکەم لە شەڕی عەجەمان کوژرا. تۆ لە کێوە نامە بۆ قەرە دێنی و دەبەیت؟"

لە ڕوویدا خوێندمەوە خەریکی نەخشەکێشانە بۆ ئەوەی کچە بەرەڵاکەی خۆی یان چووزانم کچی کێی تر بخاتە ئەستۆی قەرەی شێر. گوتم: "لە هیچ کەسێکەوە.



خزمێکی هەژاری لە ژوورەکانی بایرام پاشا لە سەرەمەرگدایە و داوای پارە دەکات."

بێ ئەوەی هیچ باوەڕ بکات، گوتی: "واخ، واخ، ئەو بەدبەختە کێیە؟"

بە کەڵلەڕەقییەوە پرسیم: "کوڕەکەت لە شەڕ چۆن کوژرا؟"

بەچاوی دوژمن سەیری یەکدیمان دەکرد. بێوەژنێکی تاک و تەنیا؛ ژیانی چەند دژوارە. ئەگەر ئەستێرەکی بوخچەگێڕ و نامەبەر بن، لە ژیاندا دەبینن تەنیا دەوڵەمەندی، دەسەڵات و بەسەرهاتە بروا پێنەکراوەکانی ئەڤینی ناو داستانەکان مرۆڤ پەرۆش دەکەن. ئەوی تر: خەم، جودایی، دڵپیسی، تەنیایی، دوژمنکاری، فرمێسک، قسە و قسەڵۆک و هەژاری و نەداریی لە برانەوە نەهاتوو، کتومت لە شتومەکی ناو ئەم ماڵە دەچن: کۆنە کلیمێکی پەرۆینی ڕەنگ بزرکاو، کەوچک و قاپی سەر سینییەکی بەتاڵی بۆرەک، مقاش و قوتووی خۆڵەمێشی بەردەم ئاگردان، دوو سندووقی وێران، یەکێکیان گەورە و ئەویتریان بچووک، کڵاودان بۆ ئەوەی هەست نەکرێت بێوەژنێک بەتەنیا لەم ماڵەدا دەژی و شمشێرێکی کۆنیش بۆ ترساندنی دز.

قەرە بەشادمانی و بە کیسەیەک پارەوە گەڕایەوە. بە دەنگێک، کە زیاتر مەبەستی بوو خاوەن ماڵە فزوولییەکە بیبیستێ وەک لە من، گوتی: "ژنی بوخچەگێڕ، ها ئەمە بگرە و بیبە بۆ ئەو نەخۆشی بێچارەیە. ئەگەر وەڵامی هەبێت، چاوەڕێی دەکەم. دواتریش بەدرێژاییی ڕۆژ لای زاوا ئەفەندیم."

هیچ پێویست بەم هەموو گەمەیە ناکات. شتێکی شایەن بە شاردنەوە نییە ئەگەر لاوێکی جوامێری وەک قەرە ئاماژەیەک وەربگرێت، دەسڕ و نامە بنێرێت و کچێک بۆ خۆی هەڵبژێرێت. یان بەڕاستی چاوی لە کچی ژنی خاوەن خانووەکە بڕیوە؟ جاری وا هەیە هیچ متمانەیەکم بە قەرە نامێنێت و ترسی ئەوەم هەیە زۆر خراپ دەستی شەکوورە ببڕێت. سەرباری ئەوەی ڕۆژ تا ئێوارە لەگەڵ شەکوورە لە هەمان ماڵدایە، کەچی لە خۆی ڕانابینێت ئاماژەیەکی بۆ بکات.

لە کۆڵان کیسەکەم کردەوە، دوازدە ئاکچە و نامەیەکی تێدا بوو. تا بڵێی پەرۆشی زانینی ناوەڕۆکی نامەکە بووم، بۆیە بە قەڵەمبازێک خۆم گەیاندە کن حەسەن. سەوزەفرۆشەکان کەلەرم و گێزەریان لە بەردەم دووکانەکانیاندا ڕیز کردبوو. بەڵام من تەنانەت وزەی ئەوەشم تێدا نەبوو دەستێک ببەم بۆ ئەو دەسکە پیازە

ئەستوورانەی کەوا زمانی حاڵیان دەیگوت: ئەستەر، وەرە دەستێکمان لێ بدە.

کاتێک چوومە کۆڵانەکەوە، بینیم تەتەری کوێر وا خەریکە دیسان جنێوم پێ بدات. ڕووم تێ کرد و گوتم: "تفوو"، هەر ئەوەندە و بەس. ئەم سەرمایە بۆچی ئەم نامەردانە ڕەق ناکاتەوە و نایانکوژێت؟

گاڤێک حەسەن لە دڵی خۆیدا نامەکەی دەخوێندەوە، من بەزۆر ددانم بە خۆمدا گرت. دوای ئەوەی خۆم بۆ نەگیرا و "بەڵێ"یەکم بۆ کرد، بۆ منیشی خوێندەوە:

"گیانەکەم شەکوورە خاتوون، داوام لێ دەکەیت کتێبەکەی باوکت تەواو بکەم. بیزانە، لەوە بترازێت، هیچ ئامانجێکی ترم نییە. هەر بۆ ئەم مەبەستەش هاتوچۆی ئەو ماڵە دەکەم، نەک بۆ بێزارکردنی تۆ وەک پێشتر گوتبووت. زۆر باش دەزانم ئەڤینی من بۆ تۆ گرفتی خۆمە. بەڵام هەر لە سۆنگەی ئەم ئەڤینەوەیە دەکەم و دەکۆشم ناتوانم بەگوێرەی ویستی باوکت، زاوام، نووسینی پێویست بۆ کتێبەکە بنووسم. هەر کاتێک هەست بە بوونت لە ماڵەوە بکەم، مات و مۆلەق دەبم و ناتوانم هاوکاریی باوکت بکەم. زۆر بیرم لێ کردەوە، ئەمە تەنیا یەک هۆی هەیە: دوای دوازدە ساڵ، تەنیا جارێک ڕووی تۆم بینییوە، ئەویش کاتێک لە پەنجەرەدا دەرکەوتی. ئێستا زۆر لە ونکردنی ئەو خەیاڵە دەترسم. ئەگەر بمتوانیبا جارێکی تر لە نزیکەوە بتبینم، ئەوا ترسی ونکردنی ڕووتم نەدەما و بە ئاسانی کتێبەکەی باوکتم بە ئەنجام دەگەیاند. دوێنێ شەوکەت بردمی بۆ خانووی جووە بەداردا کراوەکە. کەس لەو ماڵە چۆڵە نامانبینێت. ئەمڕۆ، هەر کاتێک بخوازی، دەتوانم بچمە ئەوێ و چاوەڕێت بکەم. شەوکەت دوێنێ گوتی لە خەونتدا بینیووتە مێردەکەت مردووە."

حەسەن بەدەم خوێندنەوەوە لە هەندێک جێی نامەکەدا دەنگە بە ڕەچەڵەک زیقنەکەی خۆی وەک ژن زیاتر باریک دەکردەوە و لە بڕێک جێی تریش شێوەی دڵدارێکی هۆش لە دەستچوو دەلەرزی و دەپاڕایەوە و قاقا پێ دەکەنی. گاڵتەی بەوەدا هات قەرە ویستی خۆی بۆ "تەنیا جارێک بینین" بە فارسی نووسیوە. گوتی: "قەرە هەر ئەوەندەی بینی شەکوورە ئومێدی داوەتێ، دەستی بە سەودا و مامەڵە



کردووە. ئەم حیسێبخوازییە کاری ئەڤیندارانی ڕاستەقینە نییە."

بە ساویلکەیی گوتم: "بەڕاستی عاشقی شەکوورە بووە."

گوتی: "ئەم قسەیەشت بۆم دەسەلمێنێت تۆ لایەنگری لە قەرە دەکەیت. نووسینی ئەوەی لە خەونیدا بینویەتی کاکم مردووە، واتا مردنی مێردەکەم پەسەند دەکەم."

وەک گەمژەیەک گوتم: "ئەوە خەونێکە و هیچی تر."

"دەزانم شەوکەت چەند ئاقڵ و فێڵبازە. چەندین ساڵ پێکڤە لەم ماڵەدا ژیاوین؟ ئەگەر مۆڵەت و گوشاری دایکی نەبوایە، قەرەی نەدەبردە ماڵی جووە لە سێدارەدراوەکە. شەکوورە خۆی لە خشتە دەبات ئەگەر پێی وابێت پاڵ بە کاکم و ئێمەوە دەنێت، کاکم هێشتا زیندووە و هاکا لە شەڕ گەڕایەوە."

پێش کۆتاییهێنان بە قسەکەی، چووە ژوورەوە، لەوەدا بوو بە ئاگری ئاگردانەکە مۆمێک دابگیرسێنێت، دەستی خۆی سووتاند و هاوارێکی لێ بەرز بووەوە. بەدەم لێستنەوەی دەستییەوە مۆمەکەی داگیرساند و لە قەراغ کورسیی قورئانەکە داینا. قەڵەمێکی ئامادەی لە قەڵەمدان دەرهێنا، کردی بە شووشەی مەرەکەبەکەدا و بەپەلە لەسەر کاغەزێکی بچووک دەستی بە نووسین کرد. دەستبەجێ حاڵی بووم کەیفی پێ دێت سەیری بکەم، بەڵام بۆ ئەوەی پێشانی بدەم لێی ناترسم، تا هێزم تێدا بوو پێ کەنیم.

"ئەم جووە لە سێدارەدراوە کێیە، تۆ دەیزانیت؟"

"کەمێک لە پشت ماڵی ئەوانەوە خانوویەکی زەرد هەیە. دەگوترێت پزیشکی خۆشەویستی سوڵتانی پێشوو و سەرتۆپی دەوڵەمەندان موشێ هامۆن، چەندین ساڵ یارە جووەکەی ئەماسیایی و براکەی لەوێ شاردووەتەوە. چەندین ساڵ لەمەوبەر و ڕۆژی پێش جەژنی مەساخیری جوولەکە، گوایە گەنجێکی ڕۆم لە گەڕەکی جوولەکانی ئەماسیا ون دەبێت و بانگەشەی ئەوە دەکرێت سەربڕاوە تا لە خوێنەکەی نانی جەژن دروست بکرێت. دوای دۆزینەوەی گەواهیدەری ساختە، ئیدی دەست بە لە سێدارەدانی جووەکان دەکرێت. پزیشکی خۆشەویستی سوڵتانیش ئەو ژنە جوانە و براکەی دەفرێنێت و بە مۆڵەتی سوڵتان دەیانشارێتەوە. دوای مردنی سوڵتان، دوژمنەکانیان دەستیان لە ژنە جوانەکە گیر نەبوو، بەڵام پیاوە تەنیاکەیان

هەڵواسی."

حەسەن نامەکانی دامێ و گوتی: "ئەگەر شەکوورەش چاوەڕێی گەڕانەوەی کاکم نەکات لە شەڕ، ئەوا سزا دەدرێت."

بەڵام لە ڕوویدا، لەبری هەڵچوون و تەماح، بەدبەختی و ناشادیی تایبەت بە ئەڤیندارانی ڕاستەقینە دەخوێندرایەوە. لە چاوانیدا بینیم ئەڤین لە ماوەیەکی کورتدا ئەم پیاوەی پیر کردووە. ئەو پارانەشی لە گومرک دەستی دەکەوت، ئەوی هیچ گەنج نەکردبووەوە. لە میانەی نیگا خەمبارەکانییەوە بە ئەقڵمدا هات لەوانەیە دوای ئەو هەموو هەڕەشە و گوڕەشەیە لێم بپرسێت چۆن دەتوانێت شەکوورە تەفرە بدات. بەڵام ئیدی لەوە نزیک بوو ببێت بە مرۆڤێکی هێندە خراپ تا ئەو ڕادەیەی ئەم پرسیارەم لێ نەکات. هەر ئەوەندەی مرۆڤ حاڵی بوو کەسێک خراپە، -ئەمەش گرینگترین هۆکاری ڕەتکردنەوەیە لە ئەڤیندا- ئەوا زۆر بە ئاسانی کاری دڕندانەی لێ دەوەشێتەوە. تا بڵێی لەو شمشێرە سوورەی منداڵەکان باسی دەکەن و دەڵێن هەموو شتێک دەبڕێت و لەو شتانەی بە ئەقڵمدا هاتن ترسام، هەڵهاتنم بە ئاوات خواست و بە شپرزەیی خۆم گەیاندە کۆڵان.

ئا بەوجۆرە تەتەری سواڵکەر بە جنێوەکانی غافڵگیری کردم. بەڵام یەکسەر هاتمەوە سەرخۆم، پارچە بەردێکم لە زەوی هەڵگرت و لەسەرەخۆ خستمە سەر دەسرەکەی و گوتم: "بگرە تەتەری گەڕ."

کاتێک بەئومێدەوە دەستی بۆ بەردەکە برد و وای زانی پارەیە، من هیچ پێ نەکەنیم و سەیرم کرد. چاوەڕێم نەکرد گوێ لە جنێوەکانی بگرم و چوومە کن یەکێک لە کچەکانم. بۆ ئەم کچەشم مێردێکی باشم دۆزیبووەوە و بەشووم دابوو.

کچی شیرینم، بۆرەکی سپێناخی پاشماوەی دوێنێی نایە بەردەمم، بەڵام هێشتا تازە بوو. بۆ نیوەڕۆ، یاخنیی(*) گۆشتی بەرخی بە هێلکەوە لێ دەنا و وەک ئەوەی من ئارەزووم دەکرد، بە گێلاس کەمێک ترشی کردبوو. بۆ ئەوەی دڵی نەشکێنم، چاوەڕێم کرد و پڕ دوو کەپچەم بە نانی گەرمەوە خوارد. شەربەتێکی مێوژی خۆشیشی

(*) یاخنی: جۆرێک خواردنی بەتام و چێژە و بە پلەی یەکەم لە گۆشت و سەوزە ئامادە دەکرێت. - وەرگێڕ -



کولاندبوو، بێ ئەوەی شەرم بکەم، داوای مورەبای گوڵم کرد و بە جوانی کەوچکێکم لێ کرد بەسەر شەربەتەکەدا و دوای ئەوەی بەمەبەستی هەرسکردنی خواردنەکە، خواردمەوە، نامەکانی شەکوورەی خەمگینم گەیاند.

# 26

## من شەکوورەم

دەمویست بڵێم ئەو کاتەی خەیرییە گوتی ئەستەر هاتووە، من خەریک بووم جلی دوێنێ شۆردراو و وشکەوەبووم دەخستە سندووقەکەوە... جا توخوا بۆچی درۆتان لەگەڵدا بکەم؟ باشە، کاتێک ئەستەر هات، من لە کونی دۆڵابەکەوە سەیری باوکم و قەرەم دەکرد و بەهۆی ئەوەی بەسەر ئاگرەوە چاوەڕێی هاتنی نامەکانی قەرە و حەسەنم دەکرد، هۆشیشم لای ئەستەر بوو. هەروەک چۆن هەست دەکەم ترسی باوکم لە مردن پشت بە گومانێکی مافدار دەبەستێت، دەزاشنم مەیلی قەرە تا کۆتاییی ژیان درێژە ناخایەنێت. قەرە بە هەمان ڕادەی عاشقبوونی، خوازیارە ژیانی هاوسەریش پێکەوە بنێت. لەبەرئەوەی دەیەوێت ژن بهێنێت، بەئاسانی عاشقیش دەبێت. ئەگەر لەگەڵ من سەرنەگرێت، ئەوا لەگەڵ کەسێکی تردا زەماوەند دەکات و پێش زەماوەندیش، دەمودەست عاشقی ژنەکە دەبێت.

خەیرییە، ئەستەری لە گۆشەی ئاشپەزخانە دانابوو، پەرداخێک شەربەتی ئاوی گوڵی دابووە دەستی و وەک ئەوەی تاوانێکی کردبێت، لە منی دەڕوانی. لەو ساوەی خەیرییە لەگەڵ باوکمدا دەچێتە جێگاوە، بیرم بۆ ئەوە دەچێت هەرشتێک دەبینێت، یەک بەیەک دەگەیەنێتە باوکم و ئەمەش دەمترسێنێت.

ئەستەر گوتی: "چاوڕەشەکەم، بەختڕەشەکەم، جوانی جوانانم، دواکەوتم، چونکە چەندی هەوڵم دا ئەو نەسیمە بەرازەی مێردم دەستی لە یەخەم بەرنەدا. بەس نییە تۆ مێردێکت نییە بە گژتدا بچێت. نرخی ئەمە بزانە."



هەر هێندەی نامەکانی دەرهێنا، من لە دەستیم فڕاند. خەیرییە، بەشێوەیەک لەبەردەستی ئێمەدا نەبێت، بەڵام بتوانێت گوێی لە هەموو شتێک بێت، خۆی خزاندبووە گۆشەیەکەوە. بەمەبەستی ئەوەی سەیری ڕووم نەکات، پشتم لە ئەستەر کرد و سەرەتا نامەی قەرەم خوێندەوە. کاتێک بیرم لە خانووی جووە هەڵواسراوەکە کردەوە، لەپڕ مچوڕکێکم پێدا هات. بەخۆم گوت: "مەترسە شەکوورە، دەرەقەتی هەموو شتێک دێیت." ئەمجار دەستم کرد بە خوێندنەوەی نامەی حەسەن. ئەویش چی وای نەمابوو شێت و پەتەری بێت.

"شەکوورە خاتوون، قرچەی سووتانم دێت، بەڵام دەزانم تۆ خەمی منت نییە. شەوان لە خەونمدا دەبینم بەسەر گردە چۆڵەکاندا بەدوای تۆدا ڕادەکەم. دەزانم نامەکانم دەخوێنیتەوە، بەڵام هەر جارێک بێ وەڵام دەیاندەیتە لاوە، تیرێکی سێسەری تووکن لە جگەرم دەچەقێت. بەهیوای ئەوەی بەڵکو وەڵام بدەیتەوە، ئەمەت بۆ دەنووسم. بیستراوە و قسە ئەم زمان و ئەو زمان دەگەڕێت و دەگوترێت منداڵەکانت دەڵێن: گوتووتە لە خەونمدا بینیومە مێردەکەم مردووە و ئیدی بێوەژنم. ئایا ڕاستە؟ نازانم. ئەوەی من بیزانم، تۆ هێشتا ژنی کاکمی و پێویستە بەم ماڵەوە پەیوەست بیت. لەبەرئەوەی ئیدی باوکیشم من لەسەر ماف دەبینێت، ئەمڕۆ دەچینە لای قازی بۆ ئەوەی بتگەڕێنینەوە بۆ ماڵ. کۆمەڵێک پیاوم بۆ ئەم مەبەستە کۆکردووەتەوە و بە یاوەریی ئەوان دێم، با باوکیشت ئەمە بزانێت. بوخچەکەت ئامادە بکە، بۆ ماڵ دەگەڕێیتەوە. هەر ئێستا بە ئەستەردا وەڵامم بۆ بنێرە."

دوای ئەوەی بۆ جاری دووەم نامەکەم خوێندەوە، خۆم گورج کردەوە و بە دوو چاوی پڕ لە پرسیارەوە سەیرێکی ئەستەرم کرد. بەڵام هیچ شتێکی تازەی پێم نەگوت، نە لەبارەی حەسەن و نە لەبارەی قەرەوە.

قەڵەمێکم لە قەراغ دۆڵابی مەنجەڵەکان شاردبووەوە، دەستبەجێ دەرم هێنا و کاغەزێکم خستە سەر مێزی خواردنەکە و ڕێک لەوەدا بووم نامەیەک بۆ قەرە بنووسم، ڕاوەستام.

شتێکم بە ئەقڵدا هات. سووڕامەوە و سەیرێکی ئەستەرم کرد: بە شادمانیی منداڵێکی خرپنەوە هێندە هۆگری شەربەتەکە بووبوو، لەپڕ هاتمەوە سەر هۆشی خۆم و بەخۆم گوت شتێکی بێ واتایە ئەگەر پێم وابێت ئەستەر بزانێت من بیر لە چی دەکەمەوە. کاغەز و قەڵەمەکەم دانا، ڕووم لە ئەستەر کرد و بزەیەکم خستە سەر لێوم.

پێمی گوت: "بڕوانە چەند شیرین پێ دەکەنی دلبەری من. خەمت نەبێت، دواجار هەموو شتێک باش دەبێت. ئەستەنبوڵ جەمەی دێت لە بەگ و پاشای خوازیاری زەماوەند لەگەڵ کچێکی جوانی جوانانی وەک تۆدا کە دە ماریفەت لە هەر دە پەنجەی دەستتدا هەیە."

ئێوە دەزانن: جاری وا هەیە ئەو شتەی باوەڕمان پێی هەیە، بەشێوەیەک دەری دەبڕین کە دواتر لە خۆمان دەپرسین: "سەربارى باوەڕی زۆرم بەو قسەیە، بۆچی وام دەربڕی وەک ئەوەی باوەڕم پێی نەبێت؟" منیش ئا بەوجۆرە گوتم:

"بەڵام ئەستەر، بۆ خاتری خوا، کێ دەیەوێت لەگەڵ بێوەژنێکدا بە دوو منداڵەوە زەماوەند بکات؟"

بەدەستی هێمای زۆریی نواند و گوتی: "زۆر، زۆۆۆۆۆر پیاو خوازیارن لەگەڵ کەسێکی وەک تۆدا زەماوەند بکەن."

سەیری ناو چاوانیم دەکرد. بیرم لەوە دەکردەوە خۆشم ناوێت. بێدەنگ و کپ بوونەکەم بەشێوەیەک بوو ئیدی ئەو حاڵی بوو نامەی نادەمێ و تەنانەت تێ گەیشت پێویستە بڕوات. دوای ڕۆیشتنی ئەستەر، چۆن بۆتان باس بکەم، لە ڕۆحیشمدا هەستم بەهەمان بێدەنگی کرد و کشامەوە گۆشەکەی خۆم.

پشتم دایە دیوارەکەوە و ماوەیەکی درێژ، بێ ئەوەی هیچ شتێک بکەم، لە تاریکیی ژوورەکەدا بەپێوە ڕاوەستام. بیرم لە خۆم کردەوە، لەوەی چ بکەم و لەو ترسەی لە هەناومدا تەشەنەی دەکرد و گەورە دەبوو. بەدرێژاییی ئەو ماوەیە توانیم گوێم لە دەنگی شەوکەت و ئۆرهان بێت. هەردووکیان لەسەرەوە لە نێوان خۆیاندا قسەیان دەکرد.

شەوکەت گوتی: "ترسنۆکی ژنانی. لە پشتەوە هێرش دەکەیت."



ئۆرهان گوتی: "ددانم دەلەقێت."

بەڵام لە لایەکی ترەوە، بە گۆشەیەکی ئەقڵم چاودێریی گفتوگۆی نێوان باوکم و قەرەم دەکرد.

لەبەرئەوەی دەرگا شینەکەی ژووری نیگارکێشی لەسەرپشت بوو، دەمتوانی بەئاسانی گوێم لە دەنگیان بێت. باوکم گوتی: "دوای پۆرترێتەکانی مامۆستایانی ئیتاڵی، مرۆڤ حاڵی دەبێت چاوەکانی ناو نیگارەکە، چی دی کونی خڕ و سادەی وێکچوو نین، بگرە لە چاوانی ئێمە دەچن و وەک ئاوێنە تیشک دەدەنەوە و وەک بیر هەڵی دەمژن. لێوەکانیان لە درز ناچن بەناوەڕاستی ڕووی ڕەپ و ڕاستی کاغەز ئاساوە، بگرە هەریەکەیان گرێیەکی سووری واتادارە، دەکشێت و خاو دەبێتەوە و گشت نەشئە و خەم و ڕۆحمان دەردەبڕێ. کەپوومان دیوارێکی ناحەز نییە ڕوومانی کردبێت بە دوولەتەوە، بگرە هەر لووتێک ئامێرێکی زیندوو و بەپەرۆشە و لەکن هەریەکەمان بیچمێکی جیاوازی هەیە."

ئایا قەرەش وەک من سەری سوڕمابوو کاتێک باوکم "ئێمە"ی بەکار دەهێنا بۆ ئەو بەگە گاورانەی نیگاری خۆیان بەکێشان دابوو؟ کاتێک لە کونەوە سەیرم کرد، ڕووی قەرەم زۆر بەکزی هاتە بەرچاو و لەپڕ ترسم لێ نیشت. گیانەکەم، ئەسمەری خۆم، جوامێری خەمبارم، بەدەم بیرکردنەوە لە منەوە بەدرێژاییی شەو نەنووستوی، ئەرێ لەبەرئەوەیە ڕەنگت زەرد هەڵگەڕاوە؟

لەوانەیە ئێوە نەیزانن: قەرە باڵابەرز و زراڤ و قۆزە. تەوێڵێکی پان، دوو چاوی بادەمی، لووتێکی جوان و بەهێزی هەیە. دەستەکانی، وەک لە سەردەمی منداڵیدا، باریکەڵە و درێژن و پەنجەکانی بەبزاوت و چالاکن. کاتێک هەڵدەسێتە سەرپێ، وەک ڕم باریک و بەهێز و قیتە. ناوشانی کەمێک فراوانە، بەڵام هێندەش پان نییە وەک تەختەی ناوشانی بارهەڵگران. لە سەردەمی منداڵیدا، چ جەستە و چ ڕووی باش نەخەملیبوون. کاتێک دوای دوازدە ساڵ بۆ یەکەمجار لەم گۆشەیەوە سەیرم کرد، دەمودەست حاڵی بووم کامڵ بووە.

ئێستا، هەر کاتێک لە تاریکیدا بەباشی چاو بەم کونەوە دەنێم، هەمان ئەو خەمە بەڕووی قەرەوە دەبینم کە دوای دوازدە ساڵ دیبووم. هەست بە تاوانباری و شانازی

دەکەم لەپای ئەو هەموو دەرد و نەهامەتییەی لە پێناوی مندا چێشتبووی. قەرە ئێستا سەیری نیگارێکی کێشراو بۆ کتێبەکەی باوکم دەکات و گوێی بۆ وی ڕاگرتووە و ڕووێکی پاک و منداڵانەی هەیە. ڕێک ئەو کاتەی بینیم وەک منداڵ دەمی پەمەیی کردووەتەوە، لە ناخەوە ئارەزووم کرد مەمکەکانم بنێمە ناو دەمی. دەمگوت ئەگەر پەنجەکانم بە پشتمل و قژی قەرەدا بگێڕابایە، ئەویش سەری بخستبایە سەر بۆشاییی نێوان مەمکەکانم و وەک ئەوەی منداڵەکانم دەیکەین، بە لێو گۆی مەمکمی بنایەتە دەمی، لەبەر شادمانی چاوەکانی بنوقاندبایە و وەک منداڵێکی بەلەنگاز و بێچارە حاڵی بوایە تەنیا لە سایەی دلۆڤانیی مندا بەئارامی دەگات، ئەوا بۆ هەتا هەتایە پێمەوە پەیوەست دەبوو.

ئەم داڵغە لێدانەم فرە پێ خۆش بوو و لەبەرەوە هێدی هێدی ئارەقەم دەردەدا. لە خەیاڵی خۆمدا قەرە سەیری ئەو نیگاری ئیبلیسەی نەدەکرد، کە باوکم پێشانی ئەوی دەدا، بگرە سەوداسەرانە و بەوردی سەیری گەورەییی مەمکەکانی منی دەکرد. هەر مەمکەکانم نا، شێوەی سەرخۆشێک سەیری قژ و گەردن و هەموو شتێکی دەکردم. هێندە دڵی تێم دەچوو، هەموو ئەو قسە شیرین و خۆشانەی نەیتوانیبوو لە تافی لاویدا بۆم بکات، ئێستا بۆی دەکردم. لە ڕووی و لە نیگاکانیەوە تێ دەگەیشتم شەیدای سەربەزری، ئەزموون، پەروەردە، مانەوەی پشوودرێژانە و ئازایانەم لە چاوەڕوانیکردنی مێردەکەمدا و شەیدای جوانیی نامەکانمە.

لەپڕ ڕقم لە باوکم هەستا، چونکە خەریکی نەخشە دارشتن بوو بۆ تەگەرە خستنە بەردەم شووکردنەوەم. لەو نیگارانەی بەلاساییکردنەوەی مامۆستایانی فەرەنگ بەکێشانی دابوون و لە بیرەوەرییەکانی ڤینیسیاشی زۆر بێزار بووم.

کاتێک سەرلەنوێ چاوەکانم نوقاندەوە، پەروەردگارم، من ئەمەم بەویستی خۆم نەکرد، لە خەیاڵمدا قەرە هێندە بەشیرینی لێم نزیک کەوتەوە، وەک بڵێی هەستم کرد لەو تاریکییەدا هاتووەتە پەنامەوە. هەستم کرد لەپڕ هاتووەتە پشتمەوە و ناوشان و گەردن و پشت گوێیەکانم ماچ دەکات و تا بڵێی بەهێز و بەگوڕە. لەبەرئەوەی تەندروست و گەورە و پتەو بوو و دەمتوانی پاڵی پێوە بدەم، هەستم بەدڵنیایی دەکرد. پشتملم ختووکەی دەکرد و گۆی مەمکەکانم دەلەرینەوە. کاتێک لە تاریکیدا چاوم





نوقاندبوو، هەستم دەکرد وەک ئەوەی بڵێی ئەوا لە پشتەوە هەرامە زلەکەی لێم گیر کردووە و منیش سەرم سووڕ دەخوات. تۆ بڵێی دەعباکەی قەرە چۆن بێت؟

مێردەکەم جاروبار لە خەونمدا ئەوەی خۆیم بەدەم ئێش و ئازارەوە پێشان دەدات. لەلایەک دەبینم مێردەکەم هەوڵدەدات جەستەی خوێناویی خۆی، کە سەربازەکانی سەفەوی بەر ڕمیان داوە و تیر ئەنجنیان کردووە، ڕاست بکاتەوە و بڕوا. لەلایەکی دیش، لە ئێمە نزیک دەبێتەوە، بەڵام داخی گرانم ڕووبارێک لە نێوانماندایە. گاڤێک ئەو لەوبەر ڕووبارەکەوە بەدەم خوێن لەبەر ڕۆیشتن و ئازارەوە بانگم دەکات، من دەبینم پێشەوەی گەورە بووەتەوە. ئەگەر قسەی بووکە گورجییەکەی گەرماو و پیرەژنە چەنەبازەکان ڕاست بێت کاتێک دەڵێن "بەڵێ، ئەوەندە دەبێت"، ئەوا هەرامەی مێردی من زلێکی ئەوتۆ نەبووە. خۆ ئەگەر ئەوەی قەرە لەوەی مێردەکەم ئەستوورتر بێت، ئەگەر ئەو شتە زەبەلاحەی وا دوێنێ دوای وەرگرتنی ئەو کاغەزە خاڵییەی بە شەوکەتدا بۆم ناردبوو، لە خوار بەنەخوێنەکەیەوە بینیم، بەڕاستی خۆی بێت -کە بەڵێ خۆی بوو-، ئەوا ترسی ئەوەم لێ نیشت لەوانەیە بە مندا نەچێت، یان ئەگەر بشچێت، زۆر ئازارم بدات.

"دایە، شەوکەت لاساییم دەکاتەوە."

لە گۆشەی تاریکی دۆلابەکە هاتمە دەرەوە، بە بێدەنگی چوومە ژوورەکەی بەرامبەر، هێلەکێکی چۆغەی سوورم لە سندووق دەرهێنا و پۆشیم. نیمدەرەکەمیان دەرهێنابوو، هاوار و قیژەیان بوو و یەکتریان لەسەری دەهێنا و دەبرد. "ئەرێ پێم نەگوتن کاتێک قەرە دێت بۆ ماڵمان، هاوار و قیژە نییە؟"

شەوکەت گوتی: "دایە، بۆچی ئەو هێلەکە سوورەت لەبەر کردووە؟"

ئۆرهان گوتی: "بەڵام یادێ، ئۆرهان لاساییم دەکاتەوە."

"مەگەر پێم نەگوتی لاساییی مەکەوە؟ ئەم شتە پیسە چییە لێرە؟" پارچە پێستەیەک لەسەر زەوی بوو. ئۆرهان گوتی: "کەلاکە، شەوکەت لە ڕێگا هەڵی گرتەوە."

"بڕۆن خێرا بیبەنەوە و لەو شوێنەی لێتان هەڵگرتووە، فڕێی بدەن."

"با شەوکەت بیبات."

"دەی، گوتم."

کاتێک بینییان بە ددانەکانم دەستم کرد بە گەستنی لێوم وەک ئەوەی هەموو جارێک بەر لە دارکاریکردنیان دەیکەم، ترسان و ڕۆیشتنە دەرەوە. خوا بکەم زوو بگەڕێنەوە و سەرمایان نەبێت.

لەناو هەموو نیگارکێشاندا قەرەم بەدڵە، چونکە فرە خۆشمی گەرەکە و ڕۆحی دەناسم. کاغەز و پێنووسم گرتە دەستەوە و بە هەڵمەتێک، وەک ئەوەی هیچ بیرم نەکردبێتەوە، ئەمەم نووسی:

"باشە، پێش نوێژی ئێوارە لە خانووی جووە لە سێدارەدراوەکە دەتبینم. هەرچی زووترە کتێبەکەی باوکم تەواو بکە."

وەڵامم بۆ حەسەن نەنووسی، چونکە ئەگەر ئەمڕۆش بچنە کن قازی، ئەوا باوەڕ ناکەم خۆی و باوکی بە پیاوە کۆکراوەکانەوە یەکسەر بدەن بە سەرماندا. ئەگەر وا بوایە، نامەی نەدەنووسی و چاوەڕێی وەڵامی نەدەکرد و دەمودەست هەڵی دەکوتایە سەر ماڵەکەمان. جارێ ئێستا چاوەڕێی نامەی من دەکات، کاتێک پێی ناگات، ئیدی هار دەبێت و ئەمجار پیاو کۆ دەکاتەوە و هێرشمان بۆ دێنێت. بە قوربانتان بم وا نەزانن هەر هیچ لێی ناترسم. گەر ڕاستیتان دەوێت، بۆیە متمانەم بە قەرە هەیە، بۆ ئەوەی لە حەسەن بمپارێزێت. بەڵام با ئەو شتەشتان پێ بڵێم کە ئێستا بە دڵمدا ختوورە دەکات: وا دیارە هێندەش لە حەسەن ناترسم، چونکە ئەویشم خۆش دەوێت.

ئەگەر دەشپرسن خۆشەویستی واتای چی دەگەیەنێت، ئەوا بێ ئەوەی زویر بم، دەڵێم لەسەر مافن. ئەو ساڵانەی لەژێر هەمان بنمیچ چاوەڕێی گەڕانەوەی مێردی منمان لە شەڕدا دەکرد، وەنەبێت نەمدیبێت ئەم کابرایە چەند بوودەڵە و لاواز و هەلپەرستە. بەڵام ئەستەر دەڵێت ئێستا پارەیەکی زۆری دەست دەکەوێت و بە بەرزبوونەوەی بڕۆکانی ئەستەردا تێ دەگەم ئەمە درۆ نییە. ئیدی لەبەرئەوەی پارەی هەیە و متمانەی بەخۆیەتی، پێم وایە گشت ئەو خراپەکارییانەی حەسەن لەبەر چاوان ڕەش دەکەن، نەماون و ئێستا ڕەهەندە تاریک و جنۆکەئاسا و نامۆکەی ئاشکرا بووە و ئەمەش من ڕادەکێشێت. من، لە ڕێی ئەو نامانەیەوە، کە بە کەللەڕەقیی خۆی بۆم دەنێرێت، پەردەم لەسەر ئەم ڕەهەندەی هەڵدایەوە.



چ قەرە و چ حەسەن، لەبەرئەوەی عاشقی من بوون، چەرمەسەریی زۆریان چێشتووە. قەرە دوازدە ساڵ ڕووی لە شوێنە دوورەکان کرد، دیار نەما و زویر بوو. حەسەنیش هەموو ڕۆژێک نامەی بۆم نارد و نیگاری مەل و ئاسکی لە لێوارەی کاغەزەی نامەکاندا نەخشاند. نامەکانیم هێندە خوێندەوە تا فێربووم دەسپێک لێی بترسم و دواتریش بۆی بەپەرۆش بم.

بەهۆی ئەوەی دەمزانی حەسەنیش پەرۆشی هەموو شتێکی منە، سەرم سوڕ نەما کاتێک زانی من لە خەونمدا بینیبووم مێردەکەم مردووە. گومانم لە شتێک هەیە، گومان دەکەم ئەو نامانەی بۆ قەرەیان دەنێرم، ئەستەر بە حەسەن بە خوێندنەوەیان دەدات. بۆیە وەڵامم پێدا نەناردەوە بۆ قەرە. سا ئیدی ئێوە دەزانن ئەم گومانەم ڕاستە، یان نا.

کاتێک منداڵەکان گەڕانەوە، بەتووڕەیی گوتم: "چیتان لێ هات؟"

بەڵام دەمودەست تێ گەیشتن قسەکەم بە هەڵچوونێکی ڕاستەقینەوە نەکردووە. بەدزیی ئۆرهانەوە، شەوکەتم بۆ گۆشەیەک بەکێش کرد، بۆ قەراغ دۆڵابی ناو تاریکاییەکە. کردمە باوەش. گەردنی و قژی و پشتملیم ماچ کرد.

گوتم: "گیانەکەم سەرمات بووە. کوا ئەو دەستە جوانانەتم بدەرێ با دایکت گەرمیان بکاتەوە..."

بۆنی کەلاک لە دەستی دەهات، بەڵام دەنگم نەکرد. سەریم نا بە سنگمەوە و توند بەخۆمەوە نووساند. دوای کەمێک گەرمی لە لەشی گەڕا و لە خۆشیدا جوان جوان وەک پشیلە مرەمڕی پێ کەوت و خاو بووەوە.

"ئادەی بزانم دایەت فرە فرە خۆش گەرەکە؟"

"مممهممم"

"بەڵێ؟"

"بەڵێ."

"لە هەموو کەسێک زیاتر؟"

"بەڵێ."

منیش وەک ئەوەی ڕازێکی بۆ بدرکێنم، گوتم: "کەواتە منیش شتێکت پێ دەڵێم. بەڵام بەهیچ کەسێک نالێی، باشە؟" چرپاندم بە گوێیدا: "منیش تۆم لە هەموو کەسێک زیاتر خۆش دەوێت. حاڵی بوویت؟"

"لە ئۆرهانیش زیاتر؟"

"لە ئۆرهانیش زیاتر. ئۆرهان بچووکە، شتێکە وەک باڵندە و هیچ نازانێت. تۆ ژیرتریت. تێ گەیشتیت؟" تێر بۆنی قژیم کرد و ماچم کرد. "بۆیە ئێستا داوای شتێکت لێ دەکەم. ئەها دوێنێ کاغەزێکی خاڵیت بۆ قەرە ئەفەندی برد. ئەمڕۆش بۆی دەبەیت. دەبێت؟"

"باوکمی کوشتووە."

"چی؟"

"باوکمی کوشتووە. دوێنێ خۆی لە خانووی جووە هەڵواسراوەکە گوتی."

"چی گوت؟"

"گوتی من باوکتم کوشت. گوتی من زۆر پیاوم کوشتووە."

لەپڕ شتێک ڕووی دا. دوای ئەوە شەوکەت یەکسەر لە باوەشم دەرچووبوو و دەگریا. ئەرێ ئێستا ئەو منداڵە بۆچی دەگری؟ باشە، تومەز کەمێک لەمەوبەر خۆم بۆ نەگیراوە و زللەیەکم لە بناگوێی سرەواندووە. نامەوێت کەس بەدڵڕەقم بزانێت. بەڵام لەبەرئەوەی شتێکی وەهای لەمەڕ پیاوێک گوت، کە من نەخشە دەکێشم بۆ باشەی ئەوان شووی پێ بکەم، تووڕە بووم.

هەتیوی بێچارە هێشتا دەگریا و زۆر دڵم پێی سووتا، خەریک بوو خۆشم بگریم. باوەشمان بەیەکدا کرد. جارنەجارێک هەنسکی دەدا، بەڵام ئێستا ئەم زللەیە هی ئەوە بوو ئەوەندە بیگرێنێت؟ دەستم بە قژیدا هێنا.

هەموو شتێک وەها دەستی پێ کرد: ئێوە ئاگادارن پێرێ لەناو قسەکانمدا بە باوکم گوت لە خەونمدا بینیوومە مێردەکەم مردووە. ڕاستییەکەی، بەدرێژایی ئەو چوار ساڵەی لە شەڕی عەجەمان نەدەگەڕایەوە، من ئەوەم گەلێک جاران لە خەونمدا بەوجۆرە دیتبوو، مردوویەکیش هەبوو، جا ئایا ئەو بوو مردبوو؟ ئەمەیان هیچ ڕوون نەبوو.



خەونەکان هەمیشە بەکەڵکی کارێکی تر دێن. لە پورتوگال، لەو شوێنەی نەنکی ئەستەری لێوە هاتووە، خەون بەکەڵکی ئەوە دێت زەندیقەکان بگەنە ئیبلیس و سواری یەکدی بن. بۆیە ئەو کاتە باووباپیرانی ئەستەر هەرچەندە گوتوویانە ئەوا دەستمان لە جوولەکایەتی هەڵگرت و وەک ئێوە بووین بە کرستیانی کاتۆلیک، یەسوعییەکانی ئەشکەنجەدەری کڵێسای پورتوگال بڕوایان پێ نەکردوون و هەموویان ئەشکەنجە داون. دانە بەدانەی جنۆکە و ئیبلیسی خەونەکانیان پێ هەڵڕشتوون و هەرچی خەونی نەبینراویش هەیە بەزەبری لێدان و ئەشکەنجە خراوەتە ئەستۆیان و ناچار کراون ددانی پێدا بنێن داکو گشت جووەکان بسووتێنرێن. کەواتە لەوێ خەون بەکەڵکی لە یەکتر سواربوونی مرۆڤ و ئیبلیس و تاوانبارکردنی مرۆڤ و سووتاندنی دێت.

خەون بەدەردی سێ شت دەخوات:

ئەلف: شتێک دەخوازی، بەڵام تەنانەت مۆڵەتی خواستنیشت پێ نادرێت. ئەو کاتە دەڵێی لە خەونمدا بینیم. بەمجۆرە، بەناڕەزای دڵ ویستەکەی خۆت دەخوازیت.

بێ: دەتەوێت خراپەک لەدژی کەسێک بکەی، بۆ نموونە، درۆ بەدەمی کەسێکەوە هەڵدەبەستی. ئەو کاتە دەڵێی لە خەونمدا فلان خاتوونم بینی زینای دەکرد، یاخۆ دەڵێی لە خەونمدا بینیم بە گۆزە شەراب بۆ فیسار پاشا دەچوو. بەمجۆرە ئەگەر بڕواشت پێ نەکرێت، لەبەرئەوەی بەشێکی خراپەکارییەکە گوتراوە، دەمودەست حسێب دەکرێت.

جیم: شتێکت دەوێت، بەڵام تەنانەت خۆشت نازانی چیت دەوێت. خەونێکی تێکەڵ و پێکەڵ دەگێڕیتەوە. یەکسەر بۆت شی دەکەنەوە و پێت دەڵێن پێویستە چی بخوازیت و دەتوانیت چی بدەیت. بۆ نموونە دەڵێن: پیاوێک، منداڵێک، یان خانوویەک بۆ تۆ پێویستە...

ڕاستییەکەی، ئەم خەونانە بەهیچ کلۆجێک ئەو شتانە نین لە کاتی خەوتنماندا دەیانبینین. هەموو کەسێک ئەو خەونەی بەنوێژی نیوەڕۆ دەیبینێت، دەڵێت لە شەودا بینیوومە بۆ ئەوەی بەدەردی شتێک بخوات. تەنیا ساویلکە و گەلحۆکان خەونی شەوانە کتومت وەک خۆی دەگێڕنەوە. ئەو کاتە، یان تیزت پێ دەکەن، یاخۆ وەک

هەموو جارێک بەخراپە بۆت لێک دەدەنەوە. هیچ کەسێک، تەنانەت خەوبینەرانیش خەونی ڕاستەقینە بەهەند وەرناگرن. چما ئێوە گوێی دەدەنێ؟

ئەو کاتەی بەنابەدڵی خەونێکم گێڕابووەوە و تیایدا ئاماژەم بۆ ئەگەری مردنی مێردم کردبوو، باوکم سەرەتا گوتی: "من ئەم خەونە وەک ئاماژەیەک بۆ ڕاستی پەسەند ناکەم." بەڵام دوای ئەوەی لە گۆڕستان گەڕایەوە، لە خەونەکەمەوە ئەنجامی مردنی مێردمی دەرهێنا. بەمشێوەیە، کە چوار ساڵ چوار ساڵ بوو هەر نەدەمرد، هەمووان هەر بەوەندەوە نەوەستان بڕوا بکەن لە خەوندا مردووە، بگرە مردنەکەیان بەشێوەیەک پەسەند کرد وەک ئەوەی بڵێی ڕاگەیەندراوە و بڕاوەتەوە. ئەوسا تێ گەیشتن منداڵەکان بەڕاستی هەتیون و بۆ ئەمەش خەمبار بوون.

لە شەوکەتم پرسی: "هیچ خەون دەبینیت؟"

بەدەم بزەوە گوتی: "بەڵێ. باوکم ناگەڕێتەوە، بەڵام دواجار خۆم زەماوەندت لەگەڵدا دەکەم."

لووتی تەسک و چاوە ڕەشەکانی و ناوشانی پانی، لە باوکی نا، لە من دەچن. لەبەرئەوەی نەمتوانیبوو ناوچەوانی فراوان و بڵندی باوکیان بدەمە هیچ کامێک لە کوڕە سەر خڕەکانم، جاروبار هەست بە تاوانباری دەکەم.

"دەی بڕۆ لەگەڵ براکەتدا یاریی شمشێر بکە."

"بە شمشێرە کۆنەکەی باوکم؟"

"بەڵێ."

بەدەم گوێگرتن لە تەقوڕەقی شمشێر و تەختەی منداڵانەوە، ماوەیەکی درێژ سەیری بنمیچم کرد و هەوڵم دا ترس و شپرزەییی گەشەکردووی هەناوم ببەزێنم. چوومە خوارەوە بۆ ئاشپەزخانە، بە خەیرییەم گوت:

"ماوەیەکی درێژە باوکم حەزی لە شۆربای ماسییە. لەوانەیە بتنێرم بۆ قادرگا. چەند بەستەیەک لەو باسووقەی شەوکەت حەزی لێیە، لە شوێنی شاردنەوەی دەربهێنە و بیدە بە منداڵەکان."

ئەو دەمەی شەوکەت لە ئاشپەزخانە خواردنی دەماشییەوە، من و ئۆرهان



سەرکەوتینە سەرەوە. کردمە باوەش و گەردنیم ماچ کرد.

گوتم: "لە ئارەقەدا نقوم بوویت. ئێرەت چی لێ هاتووە؟"

"شەوکەت گوتی ئەمە شمشێرە سوورەکەی مامەمە و لە منی دا."

دەستێکم لێ دا و گوتم: "مۆر هەڵگەڕاوە. ئایا دێشێت؟ ئەم شەوکەتە چەند بێ مێشکە، وەرە بزانە چیت پێ دەڵێم. تۆ زۆر ژیر و ناسکی. شتێکت لێ دەخوازم، ئەگەر بۆم بکەی، ڕازێکت بۆ دەدرکێنم نە بۆ شەکەوت و نە بۆ هیچ کەسێکی ترم نەدرکاندبێت."

"چییە؟"

"ئەم کاغەزە دەبینیت؟ دەچیتە تەنیشت باپیرتەوە. بێ ئەوەی بهێڵی ئەو بیبینێت، دەدەیتە دەست قەرە ئەفەندی. تێ گەیشتیت؟"

"تێ گەیشتم."

"دەیکەیت."

"چ نهێنییەکم بۆ دەدرکێنیت؟"

گوتم: "تۆ جارێ کاغەزەکە ببە." دیسان گەردنیم ماچ کرد. بۆنی مسکی لێ دەهات. هەروا لە خۆمەوە وشەی مسکم بەدەمدا هات، ئەگەرنا زۆر چڵکن بوو. لە کەنگێوەیە پێویست بوو خەیرییە ئەم منداڵانە ببات بۆ گەرماو؟ لەو ساوەی هەرامەکەی شەوکەت لە گەرماو لە ژنان هەستاوە، نەیبردوون. ماچێکم کرد و گوتم: "دواییی ڕازەکەت پێ دەڵێم. تۆ فرە ئاقڵی، زۆر جوانی. شەوکەت سەرەڕۆ و شەڕانگێزە، تەنانەت دەست لە دایکیشی بەرز دەکاتەوە."

گوتی: "نایبەم. لە قەرە ئەفەندی دەترسم. باوکمی کوشتووە."

گوتم: "شەوکەت گوتی، وا نییە؟ خێراکە بڕۆ خوارێ و بۆم بانگ بکە." لەتاو بینینی گرژی و تونديی سەر ڕووم، بەترسەوە لە کۆشم هاتە خوارێ و ڕای کرد. لەوانەیە لەبەرئەوەی هەستی کردووە گۆزەکە لە سەری شەوکەتدا دەشکێندرێت، کەمێکیش خۆشحاڵ بوویێت. پاش تۆزێک هەردووکیان بەڕووی سوورهەڵگەڕاوەوە هاتنەوە. شەوکەت بەدەستێک باسووق و بە دەستەکەی تری شمشێرێکی گرتبوو.

گوتم: "بە براکەت گوتووە قەرە ئەفەندی باوکتانی کوشتووە. جارێکی تر شتی وا ناگوترێت لەمماڵەدا. دەبێت قەرە ئەفەندیتان خۆش بوێت و ڕێزی بگرن. حاڵی بوون؟ خۆ نابێت هەموو ژیانتان بێ باوک بەسەر ببەن."

شەوکەوت بێ ئابڕووانە گوتی: من ئەوم ناوێت. من بۆ ماڵەوە، بۆ کن مامە حەسەنم دەگەڕێمەوە و چاوەڕێی باوکم دەکەم."

لەپڕ هەڵچووم و شەپازللەیەکم لە بناگوێی سرەواند. هێشتا شمشێرەکەی دانەنابوو، لە دەستی کەوتە خوارەوە.

بەدەم گریانەوە گوتی: "باوکم دەوێت."

بەڵام من لەو زیاتر دەگریام.

بەدەم گریان و هەنسکدانەوە گوتم: "ئیدی باوکتان نییە، ناگەڕێتەوە. بێ باوک مانەوە، تێ گەیشتن هەی زۆڵی بێ ڕەچەڵەکینە؟" ئەوەندە بەتاو گریام، ترسی ئەوەم بوو لە ژوورەوە گوێیان لێم بێت.

شەوکەت بەگریانەوە گوتی: "ئێمە زۆڵی بێ ڕەچەڵەک نین." دوور و درێژ تا کوڵی دڵمان دامرکایەوە، گریاین. دوای کەمێک هەستم کرد بۆیە گریاوم، چونکە گریان دڵمی نەرم کردووە و کردوومی بە مرۆڤێکی باش. بەدەم گریانەوە لەگەڵ منداڵەکاندا باوەشمان بەیەکدا کرد و لەسەر دۆشەک ڕاکشاین. شەوکەوت زۆر باش سەری خزاندبووە نێوان مەمکەکانمەوە. جاری وا هەیە وەک ئەوەی خۆیم پێوە بنووسێنێت، دێتە باوەشم و هەست دەکەم لە ڕاستیدا نەنووستووە. لەوانە بوو منیش لەپاڵ ئەواندا بخەوتمایە، بەڵام هۆشم لە خوارەوە بوو. بۆنێکی خۆشی نارنجی کوڵاو دەهات. لەپڕ پلێکم دا و دەنگێکی وام دەرکرد کە منداڵەکانی ئاگەدار کردەوە.

"بڕۆن با خەیرییە لە خوارەوە سکتان تێر بکات."

بەتەنیا بووم لە ژوورەکە مامەوە. بەفر دەستی پێ کردبوو. لە خوا پاڕامەوە یارمەتیم بدات. پاشان قورئانی پیرۆزم کردەوە و جارێکی تر ئەو ئایەتەی سوورەتی "آل عمران"م خوێندەوە کە دەفەرمووێت ئەوەی لە شەڕ لە پێناوی خوادا بکوژرێت، دەچێتەوە کن پەروەردگار و بەمجۆرە دڵی خۆم لەمەڕ مێردی خوا لێخۆشبووم ئاسوودە کرد. ئەرێ باوکم نیگارە هێشتا تەواونەکراوەکەی سوڵتانمانی پێشانی



قەرە دابوو؟ بە بڕوای باوکم ئەم نیگارە هێندە لە ڕاستی دەچێت، ئەگەر هەرکەسێک سەیری بکات، دەترسێت و چاو وەردەگێڕێت، ڕێک وەک ئەوەی بەسەر ئەو کەسانە دێت کە هەوڵ دەدەن ڕاستەوخۆ سەیری ناو چاوی سوڵتانمان بکەن.

ئۆرهانم بانگ کردە کن خۆم، بەر لەوەی بیکەمە باوەش، تێرتێر سەر و ڕوومەتەکانیم ماچ کرد. "ئێستا بێ ئەوەی هیچ بترسی و بهێڵی باپیریشت ببینێت، ئەم کاغەزە دەدەیتە قەرە. حاڵی بوویت؟"

"ددانم دەلەقێت."

گوتم: "ئەگەر دەتەوێت، دوای گەڕانەوەت بۆت هەڵدەکێشم. خۆتی لێ نزیک بخەوە، ئەویش سەری سوڕ دەمێنێت و لە باوەشت دەکات. تۆش ئەو کات لەسەرەخۆ کاغەزەکە لە دەستی دەنێیت. تێ گەیشتیت؟"

"دەترسم."

"هیچ شتێک نییە لێی بترسی. ئەگەر قەرە نەبێت، دەزانی کێ خوازیارە لە جێی ئەو ببێت بە باوکت؟ مامە حەسەن، ئایا دەتەوێت مامە حەسەن ببێت بە باوکت؟"

"نامەوێت."

گوتم: "کەوابوو ڕابە هەی ئۆرهانی جوان و ئاقڵم. ئەگەر نا، منیش تووڕە دەبم... بشگری، زیاتر تووڕە دەبم."

بێ ئومێدانە و هێمنانە دەستی بچووکی بۆم درێژ کردبوو. منیش نامەکەم قەد کرد و نامە ناو دەستی. پەروەردگارم، بە هانامەوە وەرە، هەموو ئەمەم بۆ ئەوەیە هەتیوەکانم پەرێشان نەبن. دەستیم گرت و بردم بۆ پێش دەرگا. لە شیپانەی دەرگا بۆ دواجار بەترسەوە سەیرێکی کردم.

گەڕامەوە گۆشەکەی خۆم و لە کونەکەوە چاوم لێ بوو بە هەنگاوی ڕاڕاوە بە هەیواندا تێ پەڕی، لە باوکم و قەرە نزیک کەوتەوە، ڕاوەستا، بۆ تاوێک بێچارە مایەوە و لە پشت خۆیەوە بەدوای مندا دەگەڕا و سەیرێکی کونەکەی کرد. دەستی کرد بەگریان، بەڵام لە دوایین هەوڵدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا و خۆی هاویشتە باوەشی قەرەوە. لەبەرئەوەی سەری قەرە هێندە بەکارە تا ڕادەی ئەوەی مافی باوکایەتیی منداڵەکانی منی پێ ببڕێت، کاتێک ئۆرهانی لە باوەشی خۆیدا بینی

نەیدەزانی بۆچی دەگری، بەڵام نەشڵەژا و ناو لەپی منداڵەکەی پشکنی.

هەر ئەوەندەی ئۆرهان بەژێر نیگا سەرسامەکانی باوکمدا گەڕایەوە، ڕام کرد و لە ئامێزم گرت، تێر و پڕ ماچم کرد، بردمە خوارەوە بۆ ئاشپەزخانە، دەمیم تژە کرد لەو مێوژەی حەزی لێ بوو و گوتم:

"خەیرییە، منداڵەکان ببە و بچن لە دووکانی کۆستا لە بەندەری قادرگا ماسیی شۆربا بۆ باوکم بکڕن. ها بگرە ئەوە بیست ئاکچە. بەو پارەیەی لە کڕینی ماسی دەمێنێتەوە، لە گەڕانەوەدا، هەنجیری زەرد و سووره گێوژی وشک بۆ ئۆرهان دەکڕن. بۆ شەوکەتیش نۆک و سجووقی گوێزدار بکڕە. تا نوێژی ئێوارە بەدڵی خۆیان بیانگەڕێنە، بەڵام ئاگادار بە سەرمایان نەبێت."

دوای ئەوەی هەموویان خۆیان پۆشتە کرد و چوونە دەرەوە، چێژم لە بێدەنگیی ماڵەکە وەرگرت. چوومە سەرێ، ئەو ئاوێنەیەی غەزوورم دروستی کردبوو و مێردم بە دیاری دابووی بە من، لە شوێنی شاردنەوەی لە نێوان بەرگە سەرینەکان، لەو شوێنەی بۆنی گوڵی لاوەندیان لێ دەهات، دەرهێنا و هەڵم واسی. کاتێک لە دوورەوە لە بەرامبەری ڕاوەستام و سەیرم کرد، ئەگەر کەمێک خۆم بلەراندبایە، دەمتوانی جەستەی خۆمی لە دۆخی پارچەبووندا تێدا ببینم. هێلەکی چۆغە سوورەکەم زۆر جوان لێ هاتبوو، بەڵام دەمویست ئەو کراسە مۆرەشم لەبەردا بێت کە دایکم لە باوڵی بووکێنیی خۆی دەری هێنابوو. ئەو کورتەکە فستقییەشی داپیرم بەدەستی خۆی گوڵی لەسەر چنیبوو، لە باوڵ دەرهێنا و پۆشیم، بەڵام بەبەری نەکردم. کاتێک کراسە مۆرەکەم لەبەر کرد، سەرمام بوو و لەرزیم، ئاگری مۆمەکەش لەگەڵ مندا لەرزی. هەڵبەتە بەنیاز بووم سەربەرگێکی ئاودامان سوور و بەرگ لە پێستی ڕێوی لەسەر جلەکانی ترمەوە بپۆشم، بەڵام دوا سات بڕیاری خۆم گۆڕی. بەکپی بە هەیواندا تێ پەڕیم و ئەو سەربەرگە درێژ و زۆر فشەڵە و شینی ئاسمانییەی دایکم دایبوومێ، لە باوڵ دەرهێنا و پۆشیم. بەڵام کاتێک لە دەرگاوە گوێم لە دەنگ بوو، لەپڕ شڵەژام: قەرە دەڕوات، دەمودەست سەربەرگە کۆنەکەی دایکم داکەند، سەربەگی سووری بەرگ لە پێستی ڕێویم لەبەر کرد: مەمکەکانمی دەگوشی، بەڵام پێم خۆش بوو. سەرم بەجوانی داپۆشی، پەچە کەتانییەکەم ڕێکوپێک بەسەر ڕوومدا بەردایەوە.



بێگومان قەرە ئەفەندی هێشتا نەڕۆیشتبوو، من لە حەژمەتی خرۆشان سەرم لێ شێوابوو. ئەگەر ئێستا لە ماڵ دەربچم، دواتر بە باوکم دەڵێم چووبووم لەگەڵ منداڵەکان ماسی بکڕم. وەک پشیلە بە پلیکانەکاندا هاتمە خوارەوە.

شێوەی خێو بە دەنگێکی زۆر هێدی دەرگام داخست. بەبێدەنگی چوومە حەوشە، کاتێک گەیشتمە کۆڵان، لەناکاو هەڵوێستەیەکم کرد و لە توێی پەچەوە سەیرێکی دواوەم کرد، ماڵەکەم وا هاتە بەرچاو وەک ئەوەی ماڵی ئێمە نەبێت.

کەس بە کۆڵانەکانەوە نەبوو، تەنانەت پشیلەش. تاک و تەرا کلووە بەفر دەباری. بەترسەوە چوومە باخچەی فەرامۆشکراوی هەرگیز تیشکی ڕۆژ نەدیتوو. بۆنی گەڵای گەنیو و شێ و مردنی لێ دەهات، بەڵام هەر ئەوەندەی پێم نایە ناو خانووی جووەی هەڵواسراو، وام زانی لە ماڵی خۆمم. دەگوترێت بەشەوان جنۆکە لێرە کۆ دەبنەوە، ئاگر دادەگیرسێنن و بەزم و ئاهەنگ دەگێڕن. بیستنی دەنگی هەنگاوی پێ لە ماڵێکی چۆڵدا شتێکی ترسناک بوو: جووڵەم لە خۆم بڕی و چاوەڕێم کرد. خشەیەک لە باخچەکەوە هات، بەڵام لە پڕ کپی باڵی بەسەر هەموو شتێکدا کێشا. لە شوێنێکەوە لەو نزیکانە سەگێک وەڕی؛ گشت سەگەکانی گەڕەکی خۆمان بەشێوەی وەڕینیاندا دەناسمەوە، بەڵام نەمتوانی ئەم وەڕینە بناسمەوە.

لە بێدەنگیی دوای ئەوەدا هەستم بەم شتانە کرد: وەک بڵێی کەسێکی تر لە ماڵەکەدا بوو و بۆ ئەوەی گوێی لە دەنگی تەپەی پێم نەبێت، جووڵەم لە خۆم بڕیبوو. چەند کەسێک بەدەم قسەکردنەوە بە کۆڵاندا تێ پەڕین. بیرم لە خەیرییە و منداڵەکان کردەوە؛ خوا یار بێت، سەرمایان نابێت. لە بێدەنگییەکی دواتریشدا، هێدی هێدی پەشیمانی هەناوی کرمێ دەکردم. لە دڵی خۆمدا دەمگوت قەرە نایەت، من هەڵەم کرد و بەر لەوەی شکۆم لەوە زیاتر بریندار بێت، دەبێت بۆ ماڵەوە بگەڕێمەوە. ئەو کاتەی بەترسەوە خەیاڵم چووبوو بۆ ئەوەی حەسەن بەدوامەوە بێت، لە باخچە گوێم لە خشەخشێک بوو. دەرگا کرایەوە.

لەپڕ و بەخێرایی شوێنی خۆم گۆڕی. نەمدەزانی بۆچی وام کردووە، بەڵام کاتێک ئەو پەنجەرەیەی ڕووناکیی باخچەکەی پێ دەگات، کەوتە لای ڕاستمەوە، تێ گەیشتم قەرە دەتوانێت لەو تیشکەدا کە لەسەر جەستەم دەشکێتەوە، بەگوتەی باوکم، لەناو

نهێنیی سێبەردا بمبینێت. پەچەم دادایەوە و بەدەم گوێگرتنەوە لە تەپەی پێ، چاوەڕێم کرد.

گاڤێک قەرە لە شیپانەی دەرگا تێ پەڕی و منی بینی، چەند هەنگاوێکی نا و ڕاوەستا. بەوجۆرە، لە دووریی پێنج شەش هەنگاو لە یەکترەوە، سەیری یەکدیمان کرد. گەلێک ساغلەمتر و بەهێزتر بوو لەوەی من لە کونی دۆلابەکەوە چاودێریم کردبوو. بێدەنگییەک دەستی پێ کرد.

بەچرپە گوتی: "تکایە پەچەکەت لادە."

"من بەشووم، چاوەڕێی مێردم دەکەم."

بەهەمان دەنگ گوتی: "پەچەکەت لادە. هەرگیز ناگەڕێتەوە."

"منت بۆ ئێرە بانگ کردووە داکو ئەمەم پێ بڵێیت؟"

"نەخێر بۆ بینینت. دوازدە ساڵی ڕەبەقە بیرت لێ دەکەمەوە. پەچەت لادە گیانەکەم، با جارێک بتبینم."

پەچەم لادا. فرە کەیفم پێ هات کاتێک بەبێدەنگی و تێر و پڕ سەیری ڕووم و ناوچاوانی کردم.

"شووکردن و بوون بەخاوەنی منداڵ، هێندەی تر جوانی کردووی. ڕوویشت گەلێک جیاوازە لەوەی من بیرم دەکەوتەوە."

"چۆن منت بیر دەکەوتەوە؟"

"بەئازارەوە، چونکە کاتێک تۆم بیر دەکەوتەوە، دەمگوت ئەم شتە تۆ نیت، بگرە خەیاڵتە. لە سەردەمی منداڵیمان باسی شیرین و خەسرەومان دەکرد و دەمانگوت نیگاری یەکتریان بینیووە و عاشقی یەکدی بوون، بیرت دێت، وا نییە؟ بۆچی شیرین کاتێک جاری یەکەم نیگاری خەسرەوی قۆزی بە هەڵواسراوی بە لقی دارەکەوە بینی، عاشقی نەبوو و چما بۆ عاشقبوون پێی، پێویست بوو سێ جار نیگارەکەی ببینێت؟ تۆ دەتگوت لە داستانەکاندا هەموو شتێک بە سێ جار دەبێت. منیش دەمگوت پێویستە ئەڤین لە یەکەم نیگاردا گڕ بگرێت. بەڵام داخۆ کێ دەیتوانی نیگاری خەسرەو هێندە دروست بکێشێت تا ڕادەی ئەوەی مرۆڤ عاشقی بێت و بیناسێتەوە؟



لەم بارەیەوە هیچ قسەمان نەدەکرد. ئەگەر بەدرێژاییی دوازدە ساڵی ڕابردوو نیگارێکی ڕاستەقینەی ئەو ڕووە بێ هاوتایەتم پێ بوایە، لەوانەبوو ئەو گشت ئازار و دەردەسەرییە نەچێژم."

بەم واتایە، زۆری شتی خۆشی وەک چیرۆکی سەیرکردنی نیگار و عاشقبوون و ئەو ئازارانەی لەبەر من چێشتبوونی، بۆ گێڕامەوە. لەبەرئەوەی هۆشم چووبووە سەر ئەوەی لەو کاتەدا هێدی هێدی لێم نزیک دەبووەوە، وشە بەوشەی قسەکانی لە ئەقلمدا نەمان و ڕاستەوخۆ تێکەڵی بیرەوەرییەکانم دەبوون. بەخۆم گوت دواتر بەبیری خۆمیان دێنمەوە و بیر لە یەک بەکیان دەکەمەوە. ئێستا تەنیا لە ناخی خۆمدا هەست بە ئەفسوونی قسەکانی دەکەم و پێیانەوە پەیوەست دەبم. هەستم بە تاوانباریی خۆم کرد لەپای ئەو گشت ئازارەی بەدرێژاییی دوازدە ساڵ پێم بەچێشتن دابوو. ئای ئەم قەرەیە مرۆڤێکی چەند باشە و قسەی چەند خۆش دەکات، لە منداڵی بێگەرد دەچێت. ئەمانەم لە چاوانیدا دەخوێندەوە. بە خۆشەویستیی لە ڕادەبەدەری بۆ من، متمانەی پێم دەدا.

یەکترمان لە ئامێز گرت. ئەمەم هێندە پێ خۆش بوو، تەنانەت هەستم بە چ گوناهێک نەکرد. بەدەم هەستێکی زۆر خۆش و لە هەنگوین شیرینترەوە ئاگام لە خۆم نەما. قایمتر باوەشم پێدا کرد. مۆڵەتم دا ماچم بکات، منیش ئەوم ڕامووسی. لە کاتێکدا ماچ و مووچمان دەکرد، لەوە دەچوو سەرانسەری جیهان لە تاریکاییەکی شیریندا نقوم بووبێت. خۆزگەم خواست هەموو کەسێک وەک ئێمە یەکدی لە ئامێز بگرن. وەک بڵێی خەریک بوو بیرم دەکەوتەوە کەوا خۆشەویستی شتێکی لەم بابەتەیە. زمانی نایە ناو دەمم. ئەم ڕەفتارەی خۆم هێندە پێ خۆش بوو، پێم وابوو جیهان لەگەڵ ئێمەدا نوقمی تیشکی چاکە دەبێت و ختوورەی هیچ خراپەک بە ئەقڵدا تێ نەدەپەڕی.

ئێستا ئەوەتان پێ دەڵێم ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەم بەسەرهاتە داماوەی من لە کتێبێکدا بگێڕدرێتەوە و بەدەستی نیگارکێشانی ئەفسانەییی هەرات بنەخشێندرێت، نیگاری لە باوەشگرتنی من و قەرە چۆن دەکێشرێت. هەندێک پەڕەی دانسقە هەبوون جاروبار باوکم پێشانی منی دەدا: ڕەوتی نووسینەکان و شەپۆڵی گەڵا و درەختەکان

هەمان جۆش و خرۆشیان هەیە، نەخشی دیوارەکان و زەڕکاریی ڕووپەلەکان هەمان هۆنینەوەیان هەیە؛ شپرزەییی ئەو پەڕەسێلکانەی بە باسکی خۆیان چوارچێوە و زەڕکاری کون دەکەن و شپرزەییی دڵداران هاوشێوەی یەکن. ئەو ئەڤیندارانەی لە دوورەوە بۆ یەکتر دەڕوانن و بەگوتەی توێکڵدار ستەم لە یەکدی دەکەن، لەم نیگارانەدا هێندە بە بچووکی دەکێشرێن و ئەوەندە لە دوور دیارن، مرۆڤ بۆ تاوێک پێی وایە چیرۆک باسی بەسەرهاتی ئەوان نا، بگرە باسی کۆشکی شاهانەی شوێنی بەیەک گەیشتنیان و حەوشی کۆشک و باخچەی دانسقە –یەک بەیەکی درەختەکانی ناوی بە عەشقەوە کێشراون– و شەوی ئەستێرەداری ڕووناککەرەوەی درەختەکان و دارەکانی ناو تاریکی دەکات. بەڵام ئەگەر بەوردی سەرنج لە نەزمی شاراوەی ڕەنگی ئەم نیگارە بدەین کە نیگارکێش تەنیا بەویستێکی هەڵقوڵاو لە دڵەوە توانیویەتی بیکێشێت و ئەگەر بڕوانین بۆ ئەو تیشکە پڕ لە ڕازەی لە هەموو گۆشەیەکی نیگارەکەوە دێتە دەرێ، ئەوا بینەری باش دەمودەست حاڵی دەبێت ڕازەکانی ئەم نیگارانە و ئەڤین بەهەمان کەرەسە کێشراون. کتومت دەڵێی تیشکێک لە دڵدارانی نیگار کێشراوەوە هەڵقوڵاوە و دزەی کردووەتە ناو قوڵاییی نیگارەکەوە. باوەڕتان هەبێت، کاتێک قەرە و من باوەشمان بەیەکدا کردبوو، وامدەزانی چاکەیەک بەهەمان شێوە بە سەرانسەری جیهاندا تەشەنەی دەکرد.

لە خوا بەزیاد بێت بەشی ئەوە ئەزموونم لە ژیاندا هەیە تێ بگەم چاکەیەکی لەم شێوەیە هەرگیز ماوەیەکی درێژ ناخایەنێت. قەرە دەسپێک مەمکەکانی پڕ باخەڵمی نایە دەستی. هێندەم کەیف پێ هات تا ڕادەی ئەوەی هەموو شتێکم لە بیر کرد و خۆزگەم خواست گۆیەکانیشی بنێتە دەمی. ئەوەی بەتەواوی بۆ نەکرا، چونکە خۆیشی لە کردنی دڵنیا نەبوو. لەوە دەچوو نەزانێت چ بکات، بەڵام دەیویست زیاتر بکات لەوەی کە کردبووی. بەو شێوەیە کاتێک قایمتر خۆمان پێکەوە نووساند، ترسێک و شەرمێک لە نێوانماندا دەستی پێ کرد. کاتێک سمتەکانمی ڕاکێشا و دەعبا سەرزل و ڕەپ بووەکەی لە سکم چەقاند، لە پێشدا پێم خۆش بوو؛ بەپەرۆش بووم و شەرمم نەکرد؛ بە لووتبەرزییەوە بەخۆم گوت: "تۆیەک ئەوەندە توند خۆتی پێوە بنووسێنیت، ئەمەش دەقەومێت." دواتر لەگەڵ دەرهێنانی هەرامەکەیدا، من ڕووم



وەرگێڕا، بەڵام چاوەکانم لەحەژمەت گەورەییی ئامێرەکە داچەقیبوون و نەمتوانی چاوی لەسەر هەڵبگرم.

زۆر دواترێ، کاتێک زۆری لێ کردم بێ ڕەوشتییەک بنوێنم کە تەنانەت لە ژنانی قپچاک(*) و ژنانی بێڕەوشتی چیرۆکبێژی گەرماویش نەدەوەشایەوە، سەرسامانە و بە بێ بڕیاری ڕاوەستام.

لێم پاڕایەوە و گوتی: "برۆکانت وا گرژ مەکە گیانەکەم."

هەستامە سەرپێ، پاڵێکم پێوە نا و بێباک لەوەی خەمگین دەبێت، دەستم کرد بە قیژاندن بەسەریدا.

(*) قپچاک: گەلێکە لە ئاسیای ناڤین.– وەرگێڕ –

# 27

## من ناوم قەرەیە

شەکوورە لە تاریکایی ماڵی جووە هەڵواسراوەکە برۆی گرژ کردبوو و بەسەرمدا دەیقیژاند و بەبۆچوونی ئەو دەمتوانی ئامێری سەرقەویی بەدەستەوە گرتووم بەئاسانی بنێمە دەمی ئەو کچە چەرکەزانەی لە تفلیس تووشیان بووبووم، ژنانی قپچاکی داوێنپیس، ئەو بووکە هەژارانەی لە خانەکان دەفرۆشران، بێوەژنانی تورکمان و عەجەم، ئەو سۆزانییە سووکانەی تا دەهات زیاتر بە ئەستەنبوڵدا تەشەنەیان دەکرد، بێ ئابڕووانی مینگەری، لەشفرۆشانی چەنەبازی ئەبخاز و ئەرمەنی، جادووگەرانی جێنێوایی و سریانی، کەسانی نێرەمووک و لاوانی چاوبرسی، بەڵام نەک دەمی ئەو. بەگوێرەی ئەو قسانەی شەکوورە بە هەڵچوونەوە لە خەیاڵی خۆیدا دروستی دەکردن و بەمنی دەگوت، من لە کۆڵانەکانی شارە بچووک و گەرمەکانی عەرەبستانەوە تا لێوارەکانی دەریای قەزوین و لە وڵاتی عەجەمانەوە تا بەغدا، لەگەڵ گشت جۆرە ماڵێکی هەرزان و پەرێشان و مامنێوەنددا سەروسەودام هەبووە و لەوانەیە گشت پێوانەیەکم لە دەست دابێت و لەبیرم چووبێت هەندێک لە ژنان خاوەن ڕەوشتن. بەقسەی ئەو، وشەکانیشم لەبارەی ئەڤینەوە، لە دڵەوە نەبوون.

وتە ڕەنگینەکانی یاری خۆم ڕەنگی ئامێرە تاوانخوازەکەی ناو دەستمیان پەڕاندبوو و من بەڕێزەوە گوێم بۆ ڕاگرتبوون و تا ئەوپەڕی سنووری تەریقبوونەوە شەرمم لە حاڵی خۆم و لە بەزینەکەم کرد، بەڵام دوو شت هەبوون منیان دڵخۆش دەکرد: ١- وەک ئەوەی زۆربەی جاران لەم دۆخانەدا چەشنی ئاژەڵ لەدژی ژنانی دی



دەمکرد، هیچ هەوڵم نەدا بەهەمان تەنگژەی تووڕە بوون و بەهەمان زمان وەڵامی هەڵچوون و قسەکانی شەکوورە بدەمەوە. ٢- حاڵی دەبووم شەکوورە بەزیادەوە ئاگای لە ڕێبوارییی من بووە، کەواتە زیاد لەوەی من بۆی چووبووم، بیری لێم کردووەتەوە.

شەکوورە، کاتێک بینی لەبەر بەدینەهاتنی خواستەکەم دڵم ڕەنجا، بگرە هەر لە ئێستاوە بۆم بەداغ بوو.

وەک ئەوەی بخوازێت داوای لێبوورین بکات، گوتی: "ئەگەر منت بەڕاستی لە دڵەوە خۆش بویستایە، ئەوا چەشنی پیاوێکی بەشەرەف جڵەوی خۆت لە دەست نەدەدا و نەدەکۆشای شکۆی ژنێکی نیازپاک بشکێنیت. تۆ تەنیا کەس نیت بۆ خواستنم خەرێکی فێڵ و تەڵەکەبازی بێت. لە هاتنتدا بۆ ئێرە کەس تۆی بینی؟"

"نەخێر."

وەک بڵێی کەسێک بە باخچە بە بەفر داپۆشراوەکەدا بڕوات، ڕووی شیرینی ماوەی دوازدە ساڵ لە زەینی من ونبووی لە دەرگا کرد و چێژی ئەوەی پێ دام لەلاوە ڕووی ببینم. کاتێک لەپڕ دەنگی خشپەیەک هات، هەردووکمان بێدەنگ بووین و چاوەڕێمان کرد، بەڵام کەس لە دەرگاوە نەهات بەمدیودا. ئێستا بیرم کەوتەوە شەکوورە هێشتا دوازدە ساڵی بوو هەستێکی ترس و تابووی دەورووژاند، چونکە لە من وریاتر و زۆرزانتر بوو.

گوتی: "تارماییی جووە هەڵواسراوەکە لەم ناوە دەگەڕێت."

"ئایا هیچ دێیت بۆ ئێرە؟"

"جنۆکە، جادووگەر و خێوەکان... ئەمانە لەگەڵ بادا دێن، تێکەڵ بە شتەکان دەبن و دەنگ لە بێدەنگی دەردەهێنن. باسی هەموو شتێک دەکەن. پێویست بە هاتن بۆ ئێرە ناکات. ئەوەتانێ گوێم لێیە."

"شەوکەت منی هێنا بۆ ئێرە تا پشیلەیەکی مردارەوە بووم پێشان بدات، بەڵام شتی وای لێ نەبوو."

"ئەرێ ئەوە پێت گوتووە بابیت کوشتووە؟"

"من کتومت وام نەگووت. بۆچی قسە گەیشتووەتە ئەو ڕادەیە؟ من نەمدەویست باوکی بکوژم، بگرە دەمویست ببم بە باوکی."

"بۆچی پێت گوتووە باوکیت کوشتووە؟"

"سەرەتا لێی پرسیم داخۆ هەرگیز مرۆڤم کوشتووە؟ منیش ڕاستیم درکاند و پێم گوت دوو کەسم کوشتووە."

"بۆ خۆهەڵدان و کەش و فش؟"

"هەم بۆ خۆهەڵدان و هەم بۆ ئەوەی بکەومە چاوی منداڵێکەوە کە حەز لە دایکی دەکەم، چونکە بۆم دەرکەوت دایکی ئەو چەتە بچکۆلانە لە ماڵەوە دەستکەوتەکانی شەڕیان پێشان دەدات و بە زمانی شیرینی وەک هەنگوین سوارچاکیی باوکیان لە شەڕدا دەگێڕێتەوە و خەمیان دەرەوێنێتەوە."

"دە کەوابوو بە شان و باڵی خۆتدا هەڵدە، چونکە خۆشیان ناوێی."

بە سەربەرزیی وەگیرخستنی هەڵەیەکی یارەکەمەوە گوتم: "شەوکەت خۆشی ناوێم، بەڵام ئۆرهان بەڵێ. وەلێ دەبم بە باوکی هەردووکیان."

لەپڕ، وەک ئەوەی بڵێی لە نیمچە تاریکییەکەدا سێبەری شتێکی نەبوو بەنێوانماندا تێ پەڕی، بە شپرزەیی و لەرزەوە ترسمان لێ نیشت. لەو دەمەیدا من خۆم گورج دەکردەوە، شەکوورە دەگریا و وردە هەنسکی دەدا.

"مێردی داماوم برایەکی هەیە: حەسەن. لە چاوەنۆڕیی مێردەکەمدا، دوو ساڵ لەگەڵ وی و غەزوورم لە هەمان ماڵ پێکەوە ژیاین. عاشقم بووە. ئێستا گومانی لەکن پەیدا بووە، بەخەیاڵی خۆی من لەتەک کەسێکدا –لەوانەشە لەگەڵ تۆ– زەماوەند دەکەم. هەواڵی بۆم ناردووە و دەیەوێت بەداری زۆر بمباتەوە ماڵە خەزووران. بەو پێیەی من لە چاوی قازیدا بێوەژن نیم، دەڵێن بەزۆر بەناوی مێردەکەتەوە بۆ ئەو ماڵە دەتگێڕینەوە. هەر ساتێک بێ هێرشمان بۆ دێنن. باوکیشم ناخوازێت بە بڕیاری قازی بێوەژن بکەوم، چونکە پێی وایە ئەگەر تەلاق وەربگرم، مێردێکی نوێ بۆ خۆم دەدۆزمەوە و ئەو بەتەنیا جێ دەهێڵم. گەڕانەوەی خۆم و منداڵەکانم بۆ کن بابم لە کاتی تەنیایی دوای مردنی دایکمدا، ئەوی زۆر شادمان کرد. ئایا لەگەڵ ئێمەدا دادەنیشیت؟"



"چۆن؟"

"ئەگەر زەماوەند بکەین، لەگەڵ باوکم و ئێمە دادەنیشیت؟"

"نازانم."

"هەتا زووە بیرێکی لێ بکەوە. باوەڕم پێ بکە کاتێکی زۆریشت نابێت. باوکم هەستی بە نزیکبوونەوەی خراپەیەک کردووە، مافیشی پێ دەدەم. ئەگەر حەسەن و پیاوەکانی و یەنیچەرەکان پەلامارمان بۆ بێنن و باوکیشم ببەنە بەردەم قازی، ئایا دەڵێی مردنی مێردەکەمت بینیوە؟ تۆ لە وڵاتی عەجەمان گەڕاویتەوە، بڕوات پێ دەکەن."

"دەیڵێم، بەڵام من نەمکوشتووە."

"باشە. بەمەبەستی ئەوەی بێوەژن بکەوم، ئامادەی لەگەڵ گەواهیدەرێکی تر بڵێی مێردی منت لە شەڕی وڵاتی عەجەماندا بینیوە خەڵتانی خوێن بووە؟"

"نەمبینیوە گیانەکەم، بەڵام لەبەر خاتری تۆ دەیڵێم."

"منداڵەکانمت خۆش دەوێت؟"

"خۆشم دەوێن."

"کوا بڵێ چیی ئەوانت خۆش دەوێت."

گوتم: "هێز، بەبڕیاری، دروستی، ئەقڵ و کەللەڕەقیی شەوکەت و زیریی و بچووکی و ئاقڵیی ئۆرهانم خۆش دەوێت. ئەوەشیانم خۆشم دەوێت کە منداڵی تۆن."

چاوڕەشی خۆم کەمێک پێ کەنی و تۆزێک فرمێسکی ڕشت. بە حیسێبی کەسێکی شپرەزەوە کە دەخوازێت بە ماوەیەکی کورت کاری زۆر ئەنجام بدا، دەستبەجێ چووە سەر بابەتێکی تر:

"ئەو کتێبەی باوکم دروستی دەکات، پێویستە کۆتاییی پێ بێت و ڕادەستی سوڵتانمان بکرێت. ئەو شوومی و نەگبەتییەی دەور و خولانی داوە، هەمووی لە چارەی ئەم کتێبەوەیە."

"جگە لە کوشتنی زەریف ئەفەندی، چ خراپەیەکی تر لە گۆڕێدایە؟"

بۆ تاوێک کەیفی بەم پرسیارە نەهات. لەبەرئەوەی دەیویست لە ناخەوە بێتە گۆ، بێ

ئەوەی ڕاستگۆییی پێوە دیار بێت، گوتی:

"موریدانی مەلا نوسرەتی ئەرزەڕوومی، بەناو خەڵکدا بڵاو دەکەنەوە گوایە کفر و فەرەنگیبوون لە کتێبەکەی باوکمدا هەیە. بۆچی ئەو نیگارکێشانەی هاتوچۆی ماڵمان دەکەن، ئیرەیی بەیەک دەبەن و چاڵ بۆ یەکدی هەڵدەکەنن؟ تۆ تێکەڵ بەوان بووی، باشتر دەزانیت."

گوتم: "ئایا برای مێردی خوا لێخۆشبووت هیچ سەروسەودای لەتەک نیگارکێشان و کتێبەکەی باوکت، یاخۆ لەگەڵ موریدانی مەلا نووسرەتدا هەیە، یان کەسێکی خۆپارێزە و دەستی بە کڵاوی خۆیەوە گرتووە؟"

گوتی: "هیچ پێوەندیی نییە، بەڵام حەسەن کەسێکی خۆپارێزیش نییە." بێدەنگییەکی پڕ لە ڕاز و سەیر هاتە ئاراوە.

"ئەو کاتەی لەگەڵ حەسەن لە هەمان ماڵدا دادەنیشتن، هیچ کەینوبەینێک لە نێوانتاندا دروست نەبوو؟"

"هەر بەئەندازەی ئەوەی لە ماڵێکی دوو چاوە ژووریدا دەقەومێت."

ئا لەو ساتەدا بوو یەک دوو سەگ لە شوێنێکی زۆر دوور نا، بەتەواوی خۆیان دابووە ئەو کارەی دەیانکرد و بەشپرزەیی دەستیان بە وەڕین کردبوو.

هەڵبەتە نەمگوت: "مێردەکەت مادام هێندە شەڕی کردبوو و سەرکەوتبوو و بووبوو بەخاوەن زەوی، بۆچی تۆی لەگەڵ براکەی لە ماڵێکی دوو ژووریی بچووکدا دانابوو؟" بە ترس و دوودڵییەوە ئەمەم لە خۆشەویستی سەردەمی منداڵیم پرسی: "بۆچی شووت بە مێردت کرد؟"

گوتی: "هەڵبەتە شووم بە یەکێک هەر دەکرد." ئەمە ڕاست بوو و زۆر ژیرانە و بەدەم پیاهەڵدانی مێردەکەیەوە و بێ ئەوەی من بڕەنجێنێت، هۆی شووکردنی خۆی ڕوون کردەوە: "تۆ ڕۆیشتی و نەگەڕایتەوە. لەوانەیە زویربوون نیشانەی ئەڤین بێت، بەڵام ئەڤینی تووڕە هەم مرۆڤ قەڵس دەکات و هەم هیچ داهاتوویەکیشی نییە."

ئەمەشی ڕاست بوو، بەڵام ئەمە هۆی شووکردنی نەبوو بەو ڕێگرەی بووبوو بە مێردی. شتێکی هێندە دژوار نەبوو لە میانەی سەرنجە فێڵبازەکانی سەر ڕوویەوە حاڵی بم شەکوورەش وەک هەموو کەسێکی تر، ماوەیەکی کورت دوای دەرچوونم لە



ئەستەنبوڵ، منی لەبیر کردووە. بیرم کردەوە ئەم درۆ بێ تامەی بۆ ئەوە بوو کەمێک دڵی شکاو و بریندارم سارێژ بکاتەوە و ئەمەش نیشانەیەکی نیازپاکییە و دەبوو من بە سوپاسبێژییەوە پەسەندم بکردایە. ئەمجار کەوتمە گێڕانەوەی ئەوەی چۆن لە ساڵانی ڕێبواریمدا هیچ کاتێک ئەوم لە ئەقڵی خۆم دەرنەهێناوە و چۆن بەدرێژاییی شەو خەیاڵی ئەو وەک خێو بۆ خۆم دەگەڕایەوە. ئەمانە نهێنیترین و قووڵترین ئەو چەرمەسەری و نەهامەتییانەم بوون کە پێم وابوو بەهیچ جۆرێک بۆ کەسانی تری ناگێڕمەوە؛ بەڵام جۆری ئەوەی ئەو ساتە بەسەرسامی هەستم پێ کرد، قسەکانم بەهیچ کلۆجێک لە دڵەوە نەبوون.

بۆ ئەوەی هەست و داخوازەکانی ئەو ساتەم بەڕاستی بۆ تێگەیشتن دەست بدەن، دەبێت لێرەدا بێمە سەر واتای ئەم جیاوازییەی یەکەمجار بوو لە ژیانمدا هەستم پێ دەکرد: واتا هەندێک جار گێڕانەوەی ڕاستی وەک خۆی، پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بەرەو نادەربەست بوون. لەوانەیە مرۆڤ بتوانێت باشترین نموونە لە نیگارکێشانەوە بێنێتەوە کە ئێستا بکوژێکی ناویان ئۆقرەی لێمان بڕیوە: تەنانەت بێ کێماسیترین نیگار –با بڵێین نیگاری ئەسپێک–، ئەسپێکی ڕاستەقینە، تا چ ئەندازەیەک ئەو ئەسپەی خوا بەوردی خوڵقاندوویەتی و ئەسپی مامۆستایانی گەورەی نیگارکێشیش دەنوێنێت یا بنوێنێت، بۆی هەیە وەڵامدەرەوەی ئەو هەستە بەدەربەستانە نەبێت کە نیگارکێشی هونەربازمان کاتی کێشانی نیگارەکە هەیبووە. دەربەستیی نیگارکێش، یان بەندەی خوای لە شێوەی ئێمەی نەفس نزم، لە ساتەکانی هونەر و پوختەییبووندا نا، بگرە تەواو بەپێچەوانەوە، لە ساتەکانی خزانی زمان و تووشبوونی دڵشکاوی و هەڵە و زویربووندا ئاشکرا دەبێت. ئەمانە بۆ ئەو خاتوونە ژنانە دەڵێم کە وەک شەکووره دەڕوانن و تووشی خەیاڵشکان دەبن و هیچ جیاوازی ناخەنە نێوان ئەو خواستی بەهێزەی لەو ساتەدا لەبەرامبەر شەکوورەدا هەستم پێ دەکرد و ئەویش پەی پێ بردبوو و نێوان ئەو خواستە سەر وەگێژهێنەرەی، بۆ نموونە، لە بەرامبەر کچە قەزوینییەکی دەموچاو باریک و ڕەنگ مسی و دەم وەنەوشەییدا هەستم پێ دەکرد. شەکوورەی نازداریشم بەو گشت ئەزموونەی ژیانەوە کە خوا پێی دابوو و بە چاوکراوەییی خۆی حاڵی دەبوو من هەم دوازدە ساڵی ڕەبەق لەتاو ئەڤینی ئەو

ئازاری هاوشێوەی ئەشکەنجەی چینیم چێشتووە و هەم لە یەکەم تاکبوونەوەی دوای دوازدە ساڵماندا، وەک پڕوپووچێکی ئالوودەی شەهوەت، کە جگە لە بەپەلە دامرکاندنەوەی ویستی ڕەشی خۆی چاوی هیچ شتێکی تر نابینێت، ڕەفتارم نواندووە. نیزامی، دەمی شیرینی شۆخی شۆخان لەگەڵ شووشە مەرەکەبێکی پڕ لە دووڕ و گەوهەردا بەراورد دەکات.

کاتێک سەگە ڕەنجکێشەکان دیسان بەوپەڕی هێزی خۆیانەوە دەستیان بەوەڕین کردەوە، شەکوورە بەنیگەرانی گوتی: "ئیدی دەبێت بڕۆم." سەرباری ئەوەی هێشتا مابووی ئێوارە دابێت، ئەو ساتە پێکەوە سەرنجمان دا ماڵە خێوەکەی جووەکە تەواو تاریک بووە. جەستەم، بۆ دووبارە لە ئامێزگرتنەوەی وی، لە خۆیەوە جووڵەیەکی کرد، بەڵام ئەو شێوەی چۆلەکەیەکی هەڵقوون، فڕکەی کرد و جێی گۆڕی.

"ئایا هێشتا جوانم؟ خێرا بیڵێ."

گوتم و ئای چەند جوان گوێی ڕاگرت و باوەڕی بە قسەکەم کرد و پەسەندی کرد.

"جلوبەرگ و پۆشاکم؟"

باسی ئەویشم کرد.

"بۆنم خۆشە؟"

بێگومان شەکوورەش دەیزانی ئەو شتەی نیزامی بە "شەترەنجی ئەڤین" ناوی دەبات، لەم وشەسازییەدا پێک نایەت، بگرە لەو جووڵانەی ڕۆح، کە لەژێری ژێرەوە بەناو ئەڤیندارانداا دێت و دەچێت، پێک دێت.

پرسی: "ئێستا تۆ چیت دەست دەکەوێت، ئایا دەتوانیت هەتیوەکانم بەخێو بکەیت؟"

باسی ئەزموونی دوازدە ساڵ زیاتری خۆم لە بواری کاری دەوڵەت و نووسیاریدا، ئەو ئەزموونە گرانبەهایەی لە کاتی بینینی شەڕ و تەرمەوە وەدەستم هێنابوو و داهاتووی درەوشاوەی خۆم بۆ گێڕایەوە و توند لە باوەشم کرد.

گوتی: "پێش تۆزێک چەند جوان یەکترمان لە هەمبێز کردبوو. ئێستاش شتەکان ئەفسوونی سەرەتایان لە دەست داوە."



بەمەبەستی ئەوەی بەهەندبوونی خۆمی بۆ بسەلمێنم، زیاتر و توندتر بەخۆمەوە نووساند و لێم پرسی ئەو نیگارەی پێش دوازدە ساڵ بۆم کێشابوو و دابوومێ، بۆچی دوای ئەو هەموو ساڵە لە پاراستنی، بە ئەستەردا بۆی ناردبوومەوە؟ گاڤێک لە چاوانیدا خوێندمەوە سەری لە سەرسامیی من سوڕماوە و لە ناخیدا شەپۆلی دلۆڤانی و میهرەبانی بەرامبەر بە من بەرز بووەتەوە، کەوتینە ڕاموسانی یەکتر. ئەمجاریان هەستم نەکرد خۆم بۆ هەوەسێکی سەر وەگێژهێن چەماندبێتەوە، بگرە ئەڤینێکی بەتین ڕۆدەچووە دڵ و سنگ و گەدە و هەموو شوێنێکی جەستەی هەردووکمانەوە و ئەمەش جۆری ئەوەی هەڵۆیەک لە شەقەی باڵ بدات، منی دەهێنایە هەژان. مەگەر جووتبوون و بەیەک شادبوون باشترین ڕێگا نییە بۆ خاوکردنەوە و سەرکوتکردنی ئەڤین؟

کاتێک مەمکەکانی پڕ باخەڵیم نایە ناو دەستم، شەکوورە بە بڕیارێکی لێبڕاوانەتر و شیرینتر پاڵی پێوە نام. من پیاوێکی ئەوەندە پێگەیشتوو نەبووم تا لە توانامدا بێت ژیانێکی هاوسەریی پڕ لە متمانە لەگەڵ ژنێکدا پێکەوە بنێم پێشتر دەستم بۆ بردبێت و شکۆیم شکاندبێت. کەسێکی ئەوەندەش ئەقڵ لە ئەژنۆدا بووم بەئەندازەیەک لەبیرم چووبوو ئیبلیس دەست دەخاتە کاری بەپەلەوە. هێندەش بێ ئەزموون بووم، تا ڕادەی ئەوەی نەزانم بەر لە هاوسەرییەکی بەختەوەر، چ پشوودرێژی و ئازارچەشتنێک پێویستە. لە ئامێزم دەرپەڕیبوو، پەچەی کەتانی بەردابووەوە سەر دەموچاوی و بەرەو دەرگا هەنگاوی دەنا. کاتێک لە دەرگا کراوەکەوە ئەو بەفری باریوی کۆڵانە زوو تاریک داهاتووەکەم بینی، لەبیرم چوو ئێمە لێرە بەچرپە دەدواین –ڕەنگە لەبەرئەوەمان بووبێت ڕۆحی جووە هەڵواسراوەکە نەورووژێنین–، هاوارم کرد:

"لەمەودوا چی دەکەین؟"

بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ ڕێساکانی شەترەنجی ئەڤیندا گوتی: "نازانم." شۆخی خۆم ئەمەی گوت و بە بێدەنگی ڕۆیشت و شوێن پێی خۆی لە باخچە کۆنەکە جێ هێشت بەفریش بەخێرایی دای دەپۆشی.

# 28

## دواجار پێم دەڵێن بکوژ

دڵنیام ئەم شتەی پێتانی دەڵێم، بەسەر ئێوەش دێت. کاتێک پێچاوپێچ بە کۆڵانە لەبن نەهاتووەکانی ئەستەنبوڵدا دەسووڕێمەوە، گاڤێک لە ئاشپەزخانەیەک پاروویەک سەوزەی سوورەوەکراو دەنێمە دەمم، یاخۆ چاوەکانم دێنمەوە یەک و بەوپەڕی سەرنجەوە سەیری هێڵبەندیی لێواری ڕووپەلێکی لەسەر شێوازی قامیش و زەل نەخشێندراو دەکەم، لەپڕ هەست دەکەم ژیانی ئێستام وەک ژیانی ڕابردووم بەسەردەبەم. کاتێک لە کۆڵان پێ لە بەفر دەنێم و ڕێ دەکەم، لە ناخەوە دەمەوێت بڵێم: لە کۆڵان پێم لە بەفر دەنا و ڕێم دەکرد.

ئەم شتە ناباوانەی من دەیانگێڕمەوە، هەم لەم کاتی ئێستادا کە هەموومان هەستی پێ دەکەین، دەقەومێت و هەم وەک بڵێی لە ڕابردووشدا قەوماون. دەمەدەمی ئێوارە، تاریکایی باڵی بەسەر زەویدا کێشابوو، تاک و تەرا کلووە بەفر دەهاتە خوارێ و منیش بەرەو کۆڵانی ماڵی زاوا ئەفەندی ڕێگام دەپێوا.

بەپێچەوانەی هەندێک شەوی ترەوە، بەبڕیارەوە هاتبووم و دەمزانی چیم گەرەکە لێرە. لە کاتێکدا وەک هەندێک شەوی دی بیرم لە شتی تر دەکردەوە –دەستنووسی بە نیگاری هەتاو خەملێندراو بەڵام زێڕکەفتنەکراوی هەراتیی پاشماوەی سەردەمی تەیمووری لەنگ، کاتێک بۆ یەکەمجار بەدایکم گوت حەوسەد ئاکچەم لە کتێبێک دەست کەوتووە– و بەدەم داڵغە لێدانیشەوە بیرم لە تاوانەکانم و بوودەڵەییی خۆم دەکردەوە و ئەوە نەبوو لاقەکانم هەر لە خۆیانەوە منیان بۆ ئەم کۆڵانە هێنابێت.



دەمزانی چ دەکەم و باش بیرم لێ کردبووە و ئەوسا هاتبوومە ئێرە.

من ترسی ئەوەم هەبوو دەرگای حەوشەم لێ نەکاتەوە، کەچی کاتێک بەمەبەستی لێدانی دەستم بۆ برد، لە خۆیەوە کرایەوە و کەوتە سەرپشت. بەبینینی ئەمە بۆم دەرکەوت دیسان خوام لەگەڵە. بەردەڵانە درەوشاوەکەی ناو حەوشە، کە ئەو شەوانەی بۆ زیادکردنی نیگار لە کتێبەکەی زاوا ئەفەندی دەهاتمە ئێرە و پێیدا تێ دەپەڕیم، کەسی تێدا نەبوو. لای ڕاست، دەولکەی بیرەکە داندرابوو و چۆلەیەکی بەسەرەوە هەڵنیشتبوو و پێ نەدەچوو گلەییی لە سەرما هەبێت. لە پێشتریشەوە، ئاگردانێک هەبوو و نەمدەزانی بۆچی سەرلەئێواران دانەدەگیرسێندرا. گەوڕێکیش کەوتبووە لای چەپ و تەنیا بۆ بەستنەوەی ئەسپی میوان و ئیدی هەموو شتێکی تر لە شوێنی خۆی بوو. لە دەرگای کراوەی لای گەوڕەکەوە چوومە ژوورێ. بە لاقەکانم لەسەر پلیکانە تەختەکان کردمە تەپەتەپ و بەدەم کۆکینەوە سەرکەوتمە سەرێ.

کەس نە وەڵامی کۆخەکەمی دایەوە و نە وەڵامی تەقوهوڕی دانانی پێڵاوە قوڕاوییەکانم. لەسەرەوە پێڵاوەکانم لە دەرازەی هەیوانەکە داکەند و لە تەنیشت جووت پێڵاوە ڕیزکراوەکانی ترەوە دامنان. وەک ئەوەی لە هەموو هاتنێکمدا کردبووم بە خوو، سەیری پێڵاوە ڕیزکراوەکانم کرد و کاتێک ئەو جووتە پێڵاوە سەوز و نەخشێندراوەم نەبینی، کە پێشبینیم دەکرد پێڵاوی شەکوورە بن، ئەقڵم چوو بۆ ئەوەی لەوانەیە کەس لە ماڵەوە نەبێت.

لەناکاو چوومە یەکەم ژووری لای دەستەڕاست و وای بۆچووم شەکوورە و منداڵەکانی لە باوەشی یەکتردا لەوێ نووستبن. دەستم لە دۆشەک و پێخەوەکانیان دا، سندووقێکی تەنیشت و دۆلابێکی دەرگا سووکی وەک پەڕم کردەوە. کاتێک خەیاڵم دەکردەوە ئەم بۆنە بادەمییە سووکەی ناو ژوورەکە هەبێت و نەبێت بۆنی جەستەی شەکوورەیە، سەرینێکی گیرخواردوو لەسەر ئەو دۆلابەی دەرگایم کردبووەوە، کەوتە خوارەوە و سەرەتا دای بە تەوقی سەری گێژبوومدا و دواتر کێشای بە سوراحییە مسەکە و پەرداخەکانی تەنیشتیدا و کەوتە خوارەوە. وەک ئەنگۆش دەزانن مرۆڤ کاتێک گوێی لە تەقوهوڕ دەبێت ئینجا تێ دەگات ژوورەوە تاریکە، کەچی من هەستم کرد ساردە. زاوا ئەفەندی لە ژوورەوە بانگی کرد:

"خەیرییە، شەکوورە، کێهانتانن؟"

لە چاو لێکنانێکدا لە ژوورەکە دەرچووم، چەپ و ڕاست بە هەیوانەکەدا تێ پەڕیم، چوومە ئەو ژووری نیگارکێشانە دەرک شینەی ڕۆژانی زستان بۆ کتێبەکەی زاوا ئەفەندی کارمان تێدا دەکرد و گوتم:

"منم زاوا ئەفەندی، من."

"تۆ کێیت؟"

لەو ساتەدا حاڵی بووم ئەو ناسناوانەی مامۆستا عوسمان لە سەردەمی منداڵیماندا پێمانی دابوو، بۆ ئەوە باش بوو زاوا ئەفەندی تا چەپەڵانە پێمان ڕابوێرێت. شێوەی ئەوەی خۆشنووسێکی لووتبەرز و بەخۆناز لە کۆتاییی نووسینەوەی کتێبێکی شاهانەدا دەیکات، منیش ناسناوی "بەندەی هەژار و گوناهبار"تان و ئەو شوێنەی لێوەی هاتبووم و ناوی تەواوی خۆم بەناوی باوکیشمەوە، هێدی هێدی هێنایە گۆ و حینجەم کرد.

دەسپێک گوتی: "ها؟" دواتر گوتی: "ها!"

بەشێوەی ئەو پیاوە پیر و کەنەفتەی ڕووبەڕووی مردن دەبێتەوە و من لە منداڵیمدا لە داستانێکی سریانیدا بیستبووم، ماوەیەکی کورت لە بێدەنگییەکدا نقوم بوو و وێ دەچوو ئەو بێدەنگییە تاهەتایە بەردەوام بێت.

ئەگەر کەسێک لەناو ئێوەدا بێت و پێم بڵێ تۆ ئێستا باسی مردنت کرد و بەنیازی کردنی شتێکی لەو بابەتەوە بۆ ئێرە هاتوویت، ئەوا بە هەڵە لە کتێبی بەردەستی گەیشتووە. چما ئەگەر کەسێک نیازی کوشتنی هەبێت، هیچ لە دەرگا دەدات، پێڵاوەکانی دادەکەنێت و بێ چەقۆ دێت؟

دیسان وەک پیرەی ناو داستانەکە گوتی: "کەواتە هاتی." بەڵام دواتر لەبزی خۆی بەتەواوی گۆڕی و گوتی: "بەخێر هاتی کوڕم. پێم بڵێ، چیت دەوێت؟"

ئێدی دەرەوە تەواو تاریک داهاتبوو. لە ڕووی ئەو پەنجەرە بچووک و تەسکەوەی بە مێو داپۆشرابوو و بەهاران لە کاتی کردنەوەیدا بەسەر دار چنار و هەنارەکاندا دەیڕوانی، هەر ئەوەندە ڕووناکی دزەی دەکردە ژوورەوە تەنیا بەشی بەدژواری



ناسینەوەی هێڵەکانی ژوورەوە بکات و مایەی خۆشحاڵیی نیگارکێشانی چینی بێت. زاوا ئەفەندی لە گۆشەی بەردەوامی خۆی لە بەردەم مێزی قورئانەکەدا دانیشتبوو و ڕووناکییەکەی خستبووە لای چەپییەوە و من نەمدەتوانی بەتەواوی ڕووی ببینم. کاتێک لێرە شەو تا بەیانی لەبەر تیشکی مۆم بەم فلچە و قوتووی مەرەکەب و قەڵەم و مۆرانە نیگارمان دەکێشا و لەبارەی نیگارکێشانەوە قسەمان دەکرد، من هەستم بەنزیکی دەکرد لێی. ئێستاش بەشپرزەیی هەوڵم دەدا هەست بەهەمان ئەو نزیکایەتییە بکەمەوە. نازانم لەبەر ئەم هەستی خۆ بەنامۆزانینە بوو، یاخۆ بەهۆی ئەوەی لەپڕ شەرمم کرد ڕاستەخۆ باسی دڵەڕاوکێ و گومانەکانی خۆمی بۆ بکەم و بڵێم کاتێک نیگار دەکێشم، هەست دەکەم گوناه ئەنجام دەدەم و وشکە سۆفییەکانیش هەستیان بەم شتانە کردووە، لەو ساتەدا بڕیارم دا بە بەسەرهاتێک دەردی خۆمی بۆ بەیان بکەم.

ڕەنگە ئێوەش بەسەرهاتی شێوەساز شێخ محەمەدی ئەسفەهانیتان بیستبێت. لە هەڵبژاردنی ڕەنگ، ڕیزکردنی ڕووپەل، کێشانی نیگاری مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕوو و لە جێکردنەوەی جۆش لە نیگاردا وەک ئەوەی مەگەر تەنیا لە شیعر و لە لۆجیکی شاراوەی ئەندازەدا دەبینرێت، کەس نەبوو شان لە شانی ئەم نیگارکێشە بدات. پاش ئەوەی بە تەمەنی گەنجی دەگات بە پلەی وەستایی، ئەم مامۆستا دەست بەپەرجووە، ماوەی سی ساڵی ڕەبەق لە بواری بابەت هەڵبژاردن و داهێنان و شێوازدا، بێ پەرواترین و چاونەترسترین و دەسپێشخەترین نیگارکێشی ڕۆژانی خۆی بووە. نیگاری ئیبلیسی ترسناک، جنۆکەی شاخدار، ئەسپی گوندرێژ، ئافرێندراوی نیمچە جانەوەر و نیمچە مرۆڤ، دێو و جنۆکەی بە قەڵەمی ڕەش کێشراو و لە ڕێی مەگۆلەکانەوە لە چینەوە هاتوو، بە هونەر و پێوانەی ئەم مامۆستا دەستڕەنگینە لە نیگاری ئیبلیسانە و هەستیاری هەرات زیاد کرابوو. بەر لە هەموو کەسێکی تر، ئەو بایەخی بە پۆرترێتی بە کەشتی لە پورتوگال و فلامەندەرستانەوە هاتوو داوە و کەوتووەتە ژێر کاریگەرییان. هەر ئەو بووە شێوازە کۆنەکانی تا سەردەمی جەنگیزخانی لە کتێبی لەتوپەتکراودا دۆزیوەتەوە و دەری هێناوەتەوە و گیانی بەبەردا کردووەتەوە. پێش گشت کەسێکی تر، ئەو بوێرانە نیگاری بابەتی وای کێشا

کە کێر ڕەپ دەکەن: وەک ئەوەی ئەسکەندەر لە دوورگەی ژنان بەدزییەوە سەیری مەلەی شەکرە ژنانی ڕووت و قووت دەکات و شیرین بەشەو لەبەر تریفەی مانگە شەو خۆی دەشوات؛ یاخۆ نیگاری فڕینی حەزرەتی پێغەمبەرمان بە سواری بوراق، شا و سوڵتانەکان لە کاتی خۆخوراندندا، سەگەل لە دۆخی جووتبووندا و شێخانی سەرخۆش و خوومار و مەستی بادەی کێشابوو و سەرجەم جڤاتی نیگارکێشانی بەپەسەندکردنیان قایل کردبوو. بەدزی و بە ئاشکرا تێروپڕ شەرابی خواردبووە و ئەفیۆنی کێشابوو و هەموو ئەمانەی لە ماوەی لێهاتوویی و جۆشێکی سی ساڵەدا ئەنجام دابوو. دواتر، گاڤێک پیر دەبێت و پەکی دەکەوێت، دەبێت بە موریدی شێخێکی سۆفی، بە ماوەیەکی کورت لە تەوقی سەرەوە تا نووکی پێ گۆڕانی بەسەردا دێت و دەگاتە ئەنجامێک کە ئەو نیگارانەی لە ماوەی سی ساڵی ڕابردوودا کێشاونی، سەرلەبەریان بێ ئاینی و بێ باوەڕییە و نکۆڵییان لێ دەکات. لەوەش زیاتر، لە سی ساڵی پاشماوەی ژیانیدا، شار بە شار و کۆشک بە کۆشک و کتێبخانە بە کتێبخانە دەگەڕێت و لە گەنجینە و کتێبخانەی پادشا و سوڵتانەکان منەی کتێبەکانی دەستکردی خۆی دەکات و دەیاندۆزێتەوە لەناویان دەبات. لە کتێبخانەی هەر شایەک نیگارێکی چەند ساڵ لەمەوبەری بەدەستی خۆی کێشراوی بدۆزیباوە، دەور و خولی دەدا و ئەگەر بەقسەی خۆش و فڕوفێڵ بۆی نەچووبایە سەر، ئەوا لە ساتێکی غەفڵەتدا، یان پەڕەی کتێبەکەی دەستکردی خۆی دەدڕی، یاخۆ ساتەوەختێکی گونجاوی هەڵدەبژارد و ئاوی بەسەر شاکارەکەیدا دەڕژاند و دەیشێواند. ئەم چیرۆکەم بۆیە گێڕایەوە داکو ببێتە نموونە بۆ ئەوەی کاتێک نیگارکێش بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت، بە جۆشی نیگارەوە لە ئاین لابدات، بۆی هەیە چ دەرد و ئازارێک بچێژێت. بۆیە بیرم خستەوە شێخ محەمەد تەنیا لەبەرئەوەی نەیتوانیبوو لە نێوان سەدان کتێبدا یەک بەیەکی ئەو کتێبانەی خۆی نیگاری کێشابوون، بدۆزێتەوە و بفەوتێنێت، ئاگری لە کتێبخانەی شاهانەی قەزوینی ژێر قەڵەمڕەوی والی شازادە عەباس میرزادا بەردا. وەک ئەوەی بەسەر خۆم هاتبێت، بە پێوەنانەوە باسی مردنی نیگارکێشەکەم بۆ گێڕایەوە کە بەدەم ئازار و پەشیمانیچێشتنەوە لەو ئاگرە سامناکەدا سووتابوو و بووبوو بە خۆڵەمێش.



زاوا ئەفەندی بەدلۆڤانییەوە گوتی: "کوڕی خۆم، لە نیگارەکانی دەستکردی خۆمان دەترسیت؟"

ناو ژوورەکە تا بڵێی تاریک بوو، بۆیە نەمبینی ئەمەی بەدەم زەردەخەنەوە بە من گوتبێت، بگرە خۆم وای بۆچووم.

گوتم: "کتێبەکەمان هیچ ڕەهەندێکی نهێنیبوونی پێوە نەماوە، ڕەنگە ئەمە گرینگ نەبێت. بەڵام قسە بەهەموو شوێنێکدا دەگەڕێت. دەگوترێت ئێمە بەشێوەیەکی سەرداپۆشراو کفر بە ئاینەکەمان دەکەین. دەگوترێت ئێمە لێرە ئەو کتێبە دروست ناکەین کە حەزرەتی سوڵتانمان دەیخوازێت و چاوەڕێی دەکات، بگرە بەپێی چێژی خۆمان کتێبێک ئامادە دەکەین و تەنانەت ئەم کتێبە شۆخی بەحەزرەتی سوڵتانمان دەکات و خراپەکاری و زەندیقی تێدایە و و لاسایی وەستایانی گاور دەکاتەوە. بگرە کەسانی وا هەن دەڵێن کتێبەکەمان تەنانەت ئیبلیسیش شیرین پێشان دەدات. بەبۆچوونی ئەوان، ئێمە لە چاوی سەگی گڵاوی کۆڵانەوە بە ڕوانگە بۆ جیهان دەڕوانین و نیگاری مێشە کەرانەیەک و مزگەوتێک –بەبیانووی ئەوەی مزگەتەکە لە پشتەوەیە– بەهەمان گەورەیی دەکێشین و بەم کارەشمان کفر بە ئاینەکەمان دەکەین و گاڵتە بە باوەڕمەندانی ڕوو لە مزگەوت دەکەین. شەوانە، لەبەر بیرکردنەوە لەم شتانە، خەو ناچێتە چاوم."

زاوا ئەفەندی گوتی: "نیگارەکانمان پێکەوە کێشاوە. ئایا تەنانەت جارێکیش کێشانی ئەو شتانە بە دڵماندا ختوورەی کردووە؟"

بە پێوەنانەوە گوتم: "دووربێت، بەڵام سا لە هەر کوێیەکەوە بەرگوێیان کەوتبێت، بیستوویانەتەوە و دەڵێن دوایین نیگارێک هەیە نەک هەر تەنیا زەندیقییەکی سەرداپۆشراوی تێدایە، بگرە دەڵێن کفرێکی ڕووت و ئاشکرایە لەو گۆڕە."

"ئێ تۆ دوا نیگارت بینیوە."

بەوردبینی و سووربوونێکی دەستکردی ئەوتۆوە و بەجۆرێک مایەی ڕێزی زاوا ئەفەندی بێت، گوتم: "لە گۆشە و کەناری ڕووپەلێکی گەورەی دەستنیشانکراوی ئێوەدا، من لەسەر داوای خۆتان چەند نیگارێکی دوو پەڕەییم کێشا، بەڵام تەواوی نیگارەکەم نەبینی. ئەگەر سەرلەبەریم بدیبایە، گشت ئەو بوختانەم بەدرۆ دەخستەوە

و ویژدانی خۆم بەتەواوی ئاسوودە دەکرد."

پرسی: "لەپای چی هەست بە تاوانباری دەکەیت؟ چ شتێک ئازاری ڕۆحت دەدا؟ کێ تۆی لە خۆت خستووەتە گومانەوە؟"

"ئەگەر مرۆڤ گومانی هەبێ لەوەی ئەو کتێبەی چەندین مانگە بەکامەرانی کاری بۆ دەکات، هێرش دەکاتە سەر ئەو شتانەی ئەم بەلایەوە پیرۆزە، بەواتای ئەوەیە بەزیندوویی ئازاری دۆزەخ بچێژێت. ئەگەر بمتوانیبایە جارێک ئەو دوایین نیگارەم بدیبایە."

گوتی: "ئایا ئەمەیە هەموو دەردی تۆ؟ بۆ ئەمە هاتوویتە ئێرە؟"

لەپڕ شپرزە بووم. ئایا تۆ بڵێی بیری بۆ شتێکی وا قرێژ بچێت و وا بزانێت من زەریف ئەفەندیی بەلەنگازم کوشتووە؟

گوتم: "ئەوانەشی دەیانەوێت سوڵتانمان لە تەخت بێننە خوارێ و شازادە بخەنە شوێنی، گلاونەتە ئەم بوختانەوە و لە گشت لایەک قسە دەکەن و دەڵێن سوڵتانمان ژێربەژێر پشتیوانی لە کتێبەکە دەکات."

بەپێشاندانێکی ماندوو و بێزارەوە گوتی: "چەند کەس باوەڕ بەمانە دەکەن؟ هەر مەلایەکی توندڕەو، کاتێک گوێی لێ دەگیرێت و بە بایەخپێدانی خەڵکی مەست دەبێت، دەست دەکات بەگوتنی ئەوەی ئاین لە دەست چووە. ئەمەش ساغڵەمترین دەروازەی نان پەیداکردنە."

ئەرێ تۆ بڵێی بیر لەوە بکاتەوە من تەنیا بۆ گەیاندنی ئەم قسانە هاتبێتمە ئێرە؟

بەدەنگێکی لەرزۆکەوە گوتم: "گوایە خوا لێخۆشبوو زەریف ئەفەندیی داماو لەبەرئەوەی تەواوی دوایین نیگاری بینیوو و کاتێک حاڵی بووە ئەمە کفرە دژ بە ئاین، ئێمە کوشتوومانە. سەردەستەی تاقمێکی نیگارکێشانی نیگارخانەی نزیک لە خۆم ئەم شتانەی بۆم گێڕایەوە. خۆتان دەزانن شاگرد و گەورە شاگردان چۆنن؛ هەموویان لە پاشملە قسە و قسەڵۆک دێنن و دەبەن."

هەمان لۆجیکم پەیڕەو کرد و بەتێپەڕبوونی کات زیاتر خرۆشام و دوور و درێژ قسەم بۆ کرد. نازانم چەندی قسەکانم لەوانە بوون کە بەرگوێی خۆم کەوتبوون و



چەندی تری خۆم دوای کوشتنی ئەو بیژییە لە ترساندا هەڵم بەستبوو و چەندیشی زادەی خەیاڵی گێڕانەوەکانی ئەو ساتەم بوون. پاش ئەو هەموو چەنەبازییەم، ئیدی بەهیوا بووم زاوا ئەفەندی ئەو نیگارە دووپەڕەییە دەربهێنێت و پێشانم بدات و هێورم بکاتەوە. ئەرێ بۆچی تێ نەدەگەیشت من تەنیا بەوجۆرە دەتوانم لەو گومانانەم ڕزگارم بێت کە خەریک بوو لە گوناهدا نوقمیان دەکردم؟

بۆ ئەوەی گورزێکی لێ بوەشێنم، لەپڕ و بەچاوقایمی گوتم: "ئایا مرۆڤ دەتوانێت بێ ئەوەی ئاگای لێ بێت، نیگارێک بکێشێت بێ باوەڕیی تێدا بێت؟"

لەبری وەڵام، وەک ئەوەی کۆرپەیەکی نووستوو لە ژوورەوە بێت و بیەوێت من هوشیار بکاتەوە، لەپڕ بەدەستی جووڵەیەکی شیرینی کرد و منیش بێدەنگ بووم. بەچرپە گوتی: "زۆر تاریکی کرد. ئادەی با ئەو مۆمدانە داگیرسێنین."

کاتێک مۆمدانەکەی بە پشکۆی ئاگردان داگیرساند، بەخۆنازینێکم لە ڕوویدا بەدی کرد کە پێشتر هیچ پێی ڕانەهاتبووم و پێم خۆش نەبوو. یاخۆ ئەمە نیشانەی بەزەیی پێداهاتنەوە بوو؟ ئایا هەموو شتێک تێ گەیشتبوو و منی بە بکوژێکی نامەرد دەزانی، یاخۆ لێم دەترسا؟ دێتەوە بیرم بە مۆڵەق ماوی و سەرسامی هەستم دەکرد وا دیسان لەپڕ جڵەوی بیرکردنەوەم لە دەست داوە و دەتگوت ئەو شتانەی لەو کاتەدا بیریان لێ دەکەمەوە، بیرۆکەی کەسێکی ترن. ڕایەخی سەر زەوییەکە: شتێکی لە شێوەی گورگ لە سووچێکیدا بوو. ئەدی باشە من بۆچی تا ئێستا نەمدیبوو؟

زاوا ئەفەندی گوتی: "سەرجەم ئەو خان و پادشا و سوڵتانانەی خۆشەویستییان بۆ نیگار و نەخش و کتێبی جوان هەیە، خولیاکانیان سێ وەرزی هەیە. سەرەتا بوێر و مرڤدۆست و بەپەرۆشن. لەبەرئەوەی نیگاریان لای کەسانی تر بینیوە، بۆ ناوبانگی خۆیان دەیخوازن. لەم وەرزەدا فێر دەبن. لە وەرزی دووەمدا بۆ کەیف و سەفای خۆیان بە دڵی خۆیان کتێب بەدروستکردن دەدەن. لەبەرئەوەی بەسەیرکردنی نیگارەکان لە ناخەوە فێری هەستکردن بەخۆشی دەبن، هەم ناوبانگ و پایە پەیدا دەکەن و هەم کتێبیان لە پاش بەجێ دەمێنێت بۆ ئەوەی دوای مردنیان لەم دنیایەدا بۆیان ببێت بە ناوبانگ. لە پایزی تەمەنیشیدا ئیدی هیچ سوڵتانێک خۆی بەهیچ شتێکەوە خەریک ناکات کە بەنەمری لە دنیا بمێنێتەوە. من لەوە دەگەم مرۆڤ

بخوازێت نەوە و وەچەکانی تر یادی نەمرییەکانی ئەم دنیایە بکەنەوە. هەرچی فەرمانڕەوایانی نیگارپەروەریشە، بەو کتێبانەی بە ئێمە بەدروستکردنیان داوە و ناوی خۆیان و جاری واش هەیە مێژووی خۆیان تێ ئاخنیوە، لەم دنیا نەمرییەکیان بۆ خۆیان مسۆگەر کردووە. کاتێک دەگەنە قۆناغی پیری، دەیانەوێت لە دنیای ئەودیو شوێنێکی باش وەگیر بخەن و هەموشیان دەگەنە ئەو باوەڕەی نیگار کۆسپی سەر ئەو ڕێگەیەیە. ئەوەشی هەرە زیاد خەمگینم دەکات و دەمتۆقێنێت، هەر ئەمەیە. شا تەهماسپیش خۆی مامۆستایەکی نیگارکێش بوو و تافی لاویی لە نیگارخانەدا بەسەر بردبوو، بەڵام کاتێک تارماییی مردنی لێ دەرکەوت، ئەو نیگارخانە شاهانەیەی داخست، نیگارکێشانی پەرجووی لە تەورێز دوورخستەوە، هەرچی کتێبی بەدروستکردنی دابوو، تەخشان و پەخشان کرد و کەوتە ناو گێژاوی پەژیوانییەوە. باشە بۆچی گشت ئەمانە بیریان دەچێت بۆ ئەوەی نیگار دەروازەی بەهەشتیان لێ دادەخات؟"

"دەزانن بۆچی؟ چونکە بیریان دەکەوێتەوە حەزرەتی پێغەمبەرمان فەرموویەتی خوا لە ڕۆژی قیامەتدا توندترین سزای نیگارکێشان دەدات."

زاوا ئەفەندی گوتی: "نیگارکێشان نا، شێوەسازان. ئەوە حەدیسە و بوخاری گێڕاویەتییەوە."

بەهۆشیارییەوە گوتم: "لە ڕۆژی قیامەتدا داوا لە شێوەساز دەکرێت گیان بکات بکاتە بەر ئەو بیچمانەی ئافراندوونی، بەڵام لەبەرئەوەی ناتوانێت ڕۆح بە بەر هیچ شتێکدا بکات، بە ئاگری دۆزەخ سزا دەدرێت. پێویستە ئەوەش لەبیر نەکەین شێوەساز لە قورئانی پیرۆزدا سیفەتێکی خوایە. هەر خوا ئافرێنەر و بەدیهێنەرە و شت لە نەبوو دەخوڵقێنێت و گیان دەکات بەبەر بێ گیاندا. پێویستە کەس لەگەڵ ئەو نەکەوێتە پێشبڕکێوە. گەورەترین گوناە ئەوەیە نیگارکێشان بە کارەکانی خوا ڕادەبن و لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە هێندەی ئەو ئافرێنەرن."

وەک ئەوەی منیش ئەوم تاوانبار کردبێت، ئەم قسانەم بەتوندی کردبوو. چاوی بڕییە ناو چاوم.

"بەڕای تۆ ئێمە شتی وەهامان دەکرد؟"





بەدەم زەردەخەنەوە گوتم: "بەهیچ جۆرێک، بەڵام خوا لێخۆشبوو زەریف ئەفەندی، پاش بینینی تەواوی دوایین نیگار، وای زانیوە وایە. گوتوویەتی ئەمە بەلارێدابردنێکی ئیبلیسانەیە ئەگەر مرۆڤ سوود لە شێوازەکانی مامۆستایانی فەرەنگ وەربگرێت و بە زانستی ڕوانگە نیگار بکێشێت. لە دوایین نیگاردا و بەبەکارهێنانی شێوازەکانی فەرەنگ، نیگاری ڕووی کەسێکی فانی بەشێوەیەک دەکێشین کاتێک کەسێک سەیری دەکات، ناڵێت ئەوە نیگارە، بگرە دەڵێت ڕاستییە. ئەوەشی بۆی دەڕوانێت، هەستی کڕنۆشبردن بۆ نیگارەکە، وەک ئەوەی لە کڵێساکان دەکرێت، بەهەناویدا تێ دەپەڕێت. نەک هەر لەبەرئەوەی ڕوانگە نیگار لە نیگای خواوە دادەبەزێنێت بۆ ئاستی نیگای سەگی کۆڵان، بگرە زەریف ئەفەندی گوتوویەتی بەکارهێنانی شێوازی مامۆستایانی فەرەنگ و ئاوێتەکردنی زانیاری و هونەری خۆمان لەگەڵ هونەر و شێوازی گاوران، لە ڕەسەنایەتی و بێگەردیی خۆمان دامانده‌ماڵێت و بەلارێدابردنێکی ئیبلیسانەیە بۆ کرندمان بە کۆیلەی ئەوان."

زاوا ئەفەندی گوتی: "هیچ شتێکی ڕەسەن بوونی نییە. هەر کاتێک لە نەخش و نیگاردا بەرهەمی دانسقە بئافرێندرێت و جوانییەک لە نیگارخانەیەک پەیدا بێت کە ئاو لە چاوم بێنێت و مووەکانی لەشم ڕەپ بکات، تێ دەگەم دوو شتی پێشتر هەرگیز لە پەنای یەکتردا نەبوو هاتوونەتە ئەوێ و کارێکی نوێی شاهانەیان بەرهەم هێناوە. لە جوانیی نیگارکێشیی بەهزاد و هەموو نیگاری عەجەمدا قەرزداری ئاوێتەبوونی نیگارکێشیی عەرەبین لەگەڵ نیگارکێشیی مەگۆل-چین. نیگارە هەرە بەدەوەکانی شا تەهماسپ شێوازی عەجەم و هەستیاریی تورکمانی یەک خست. ئەگەر ئەمڕۆ هەموو کەسێک بێ بڕانەوە باس لە نیگارخانەکانی ئەکبەر خانی هندستان دەکات، لە سۆنگەی ئەوەوەیە هانی نیگارکێشەکانی دەدات شێوازەکانی مامۆستایانی فەرەنگ هەڵبگرنەوە. ڕۆژهەڵاتیش هی خوایە و ڕۆژئاواش. خوا لە ئارەزووەکانی کەسی ساویلکە و تێکەڵنەبوو بمانپارێزێت."

سەروچاوی لەبەر ڕووناکیی مۆمەکە چەندە نەرم و ڕۆن دەهاتە بەرچاو، سێبەرەکەشی بە دیوارەکەوە هێندە تاریک و تۆقێنەر بوو. سەرباری ئەوەی قسەکانیم زۆر بە ماقوڵ و ڕاست دەزانی، کەچی نەمتوانی باوەڕی پێ بکەم.

لەبەرئەوەی بیرم دەکردەوە لێم کەوتبێتە گومانەوە، منیش گومانم لەو دەکرد و هەستم دەکرد جاروبار هەستی بۆ دەرگای حەوشەی خوارەوە ڕادەگرت و چاوەڕێی کەسێکی دەکرد لە دەستی من ڕزگاری بکات.

گوتی: "باسی ئەوەت بۆم گێڕایەوە شێوەساز شێخ محەمەد لەتاو ئازاری ویژدان، کتێبخانەیەکی گەورەی بەهۆی ئەوەی نیگارە نکۆڵی لێکراوەکانی خۆی تێدابووە، بەخۆیەوە سووتاندووە. با منیش لایەنێکی تری ئەو داستانەت بۆ بگێڕمەوە کە تۆ پێی نازانیت. بەڵێ، نیگارکێش لە دوایین سێ ساڵی تەمەنیدا بەدوای نیگارەکانی خۆیدا گەڕاوە، بەڵام لە هەڵدانەوەی پەڕەکاندا، لە نیگارەکانی خۆی زیاتر، ئەو نیگارانەی دەبینی کە بە ئیلهام وەرگرتن لە وی، لاسایی کرابوونەوە. ساڵانی دواتریش دەبینێت ئەو نیگارانەی ئەم نکۆڵیی لێ کردوون، دوو نەوەی شێوەسازان کردوویانە بە قاڵب بۆ خۆیان و هەر بەکێشانی نیگارەکان لە بیرەوەریی خۆیان و بە لەبەرکردنیانەوە نەوەستابوون، بگرە کردوویانن بەبەشێک لە ڕۆحی خۆیان. شێخ محەمەد تا زیاتر بەدوای نیگارەکانی خۆیدا گەڕابێت و فەوتاندبنی، حاڵی بووە نیگارکێشانی لاو، نیگارەکانی ئەویان بە ئەڤینەوە لە کتێبی تردا کێشاوەتەوە، لە کێشانی نیگاری بەسەرهاتی تردا سوودیان لێ وەرگرتووە، خستوویانەتە بیرەوەریی هەموو کەسێکەوە و بە سەرانسەری دنیادا بڵاویان کردووەتەوە. دوای ئەوەی چەندین ساڵ سەیری ئەم کتێب و ئەو کتێب و ئەم نیگار و ئەو نیگار دەکەین، حاڵی دەبین شاکارەکانی نیگارکێشکی باش هەر بەوەندەوە ناوەستێ جێی خۆی لە دڵماندا بکاتەوە، بگرە دواجار دیمەنی بیرەوەریمان دەگۆڕێت. گاڤێکیش هونەر و نیگاری نیگارکێشێک ئەو گشت باندۆرە لەسەر ڕۆحمان دادەنێت، دەبێت بە پێوەرێک بۆ هەموو جوانی و بەدەویی جیهان. شێوەسازی ئەسفەهانی، هەر ئەوە نەبوو لە کۆتاییی تەمەنیدا ببینێت تا زیاتر نیگارەکانی خۆی بسووتێنێت، ژمارەشیان زیاد دەکات، حاڵیش بووە هەموو کەسێک دنیا بەوجۆرە دەبینێت کە ئەم ڕۆژگارێک بینیوویەتی و هەر شتێک لە نیگارەکانی تافی لاویی خۆی نەچووبێت، ئیدی بە قرێژ هاتووەتە بەرچاو. "

شەپۆلی شەیدایی و سەرسامیی بەرزەوەبووی ناو هەناوم و ئارەزووی خۆم بۆ



ئەوەی زاوا ئەفەندیی پێ خۆشحاڵ بێت، پێ جڵەو نەکرا و خۆم هاویشتە بەردەست و پێی. لە کاتێکدا دەستەکانیم ماچ دەکرد، فرمێسک زایە چاوم و هەستم کرد لە ناخی خۆمدا ئەو پایەیەی دەدەمێ کە بە مامۆستا عوسمانی ڕەوا دەبینم.

زاوا ئەفەندی بەخۆپێشاندانی کەسێکی لەخۆڕازییەوە گوتی: "نیگارکێش، بێ ئەوەی لە هیچ شتێک بترسێت، نیگاری خۆی بە گوێگرتن لە ویژدان و بەپێی ئەو ڕێسایانەی باوەڕی پێیان هەیە، دەکێشێت. بێباکە لە قسەی دوژمنان و سۆفیگەل و ئیرەیی پێبەران."

بەڵام کاتێک بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە دەستە بەخاڵ و پەڵەدارەکانیم ماچ دەکرد، کەوتەوە بیرم خۆ زاوا ئەفەندی نیگارکێشیش نییە. دەمودەستیش شەرمم لەم بیرکردنەوەیەم کرد. وەک ئەوە وابوو کەسێکی تر ئەم بیرۆکە ئیبلیسانە و بێ ئابڕووەی خستبێتە سەرمەوە. سەرباری ئەوەش، ئێوە دەزانن بیرکردنەوەکەم ڕاستە.

زاوا گوتی: "لەوانە ناترسم، چونکە سڵ لە مردن ناکەمەوە."

ئەوانە کێ بوون؟ وەک ئەوەی لە قسەکەی گەیشتبم، سەرم بۆی لەقاند. بەڵام ڕق و هەڵچوونێکیش لە ناخمدا شەپۆلی دەدا. کەمێک لەولای زاواوە دەستنووسی کۆنی "کتاب الروح"ی "الجوزیة"م بینی. ئەم کتێبە باس لە بەسەرهاتەکانی ڕۆح لە دوای مردن دەکات و هەموو خەڵەفاوانی مردنخواز شێت و شەیدایین. لەو ساوەی دواجار هاتبوومە ئێرە، لەناو سینییەکان و قوتووی نووسین و لەسەر سندووقەکە، لە نێوان قەڵەمدان و قەڵەمتاش و پارچە و قوتووی مەرەکەب و قوتووی قەڵەمدا، تەنیا یەک شتی نوێم بینی: قوتوویەکی مسی زەردی مەرەکەب.

چاوقایمانە گوتم: "با بیسەلمێنین لێیان ناترسین. دوایین نیگار دەربهێنن با پێشانی ئەوانەی بدەین."

"باشە ئەمە پێشانی نادات ئێمە بەلایەنی کەمەوە ئەوەندەی بوختانەکانیان بەهەند وەردەگرین، هێندەش نرخیان بۆ دادەنێین؟ شتێکی شایەنی ترسانمان نەکردووە داکو بترسین. کوا چی تر هەیە ماف بەم هەموو ترسەی تۆ دەدات؟"

وەک باوکێک دەستێکی بە قژمدا گێڕا. ترسی ئەوەم هەبوو دیسان فرمێسک لە چاوانمەوە سەر بکەن و باوەشم پێدا کرد.

به خرۆشەوە گوتم: "دەزانم زەریف ئەفەندیی بەستەزمان لەبەر چی کوژراوە. ئەو، بوختانی بۆ ئێوە و کتێبەکەتان و ئێمە دەکرد و پیاوەکانی مەلا نوسرەتی ئەرزەڕوومیی بە گژماندا دەکرد. گەیشتبووە ئەو باوەڕەی لێرە بێ ئاینییەکی گونجاو لەگەڵ ویستی ئیبلیس دەکرێت و ئەمەی بەڕاست و بەچەپدا بڵاو دەکردەوە و دەستی کردبوو بە هاندانی نیگارکێشانی تری کتێبەکەتان لەدژی ئێوە. نازانم بۆچی لەپڕ ئەم کارەی لێ وەشایەوە. لەوانەیە لە ئیرەیی پێبردنەوە بووبێت و ڕەنگیشە ئیبلیس بەلاڕێیدا بردبێت. نیگارکێشانی تریش، ئەوانەی بۆ کتێبەکەتان کار دەکەن، بیستیان زەریف ئەفەندی چەند سوور بووە لەسەر تەفروتووناکردنی هەموومان. دەتوانن پێشبینی بکەن چۆن هەموویان فریشکیان کەوتووە و وەک من کەوتوونەتە گومانەوە. یەکێک لەوانە، لەبەرئەوەی زەریف ئەفەندی گوشاری خستبووە سەری و ئەوی لەدژی ئێوە، ئێمە، کتێبەکەمان، نەخش، نیگار و دژی هەر شتێکی باوەڕمان پێی هەیە، هاندابوو، شپرزە بووبوو و شەوێک لە نیوەی شەودا ئەو نامەردەی کوشت و فڕێی دایە بنی بیرێکەوە."

"نامەرد؟"

گوتم: "زەریف ئەفەندی ناپاکێکی بێ خوو و هەوێن پیس بوو." وەک ئەوەی لەو ساتەدا لە ژوورەکە لە بەرامبەرمدا بێت، هاوارم کرد: "هەی شیر حەرام."

بێدەنگییەک چێ بوو. ئایا لێم دەترسا؟ من لە خۆم دەترسام. دەتگوت بەر بای هەڵچوون و ئەقڵی کەسێکی تر کەوتووم، بەڵام خۆش بوو.

"ئەو نیگارکێشە کێیە وەک تۆ و نیگارکێشی ئەسفەهانی شپرزە بووە؟ کێ کوشتوویەتی؟"

گوتم: "نازانم."

بەڵام ویستم بە ڕوویشمدا تێ بگات کەوا درۆم کردووە. حاڵی دەبووم بەهاتنم بۆ ئێرە هەڵەیەکی فرە گەورەم کردبوو. بەڵام بەهیچ شێوەیەک نەکەوتبوومە بەر هەستی تاوانباری و پەشیمانی. دەمبینی زاوا ئەفەندی گومانم لێ دەکات و ئەمەش زەوق و هێزی پێ دەدام. دەمویست دوایین نیگار، نەک لەبەرئەوەی بێ ئاینیی تێدا کراوە، بگرە بەپەرۆش بووم بزانم شتێکی چۆنە، ببینم. بەخێرایی بیرم کردەوە ئەگەر باش



تێ بگات من بکوژم و لێم بترسێت، ئەوا نیگارەکە دەردێنێت و پێشانم دەدات.

گوتم: "گەلۆ گرینگە بزانرێت کێ ئەو بێ ڕەچەڵەکەی کوشتووە؟ بۆچی ئەوەی گسکی لێ داوە و ڕای ماڵیوە، کارێکی باشی نەکردووە؟"

تێبڕینی چاوانی لە چاوانم، بوێریی پێ دام. کەسانی باڵاتر، ئەوانەی خۆیان لە ئێوە باشتر و بە بەڕەوشتتر دەزانن، کاتێک لەپای ڕەفتارەکانتان شەرمەزاری دەچێژن، ناتوانن بەوجۆرە بۆ ناو چاوەکانتان بڕوانن، چونکە لەوانەیە بیر بکەنەوە هەواڵتان لێ بدەن و ڕادەستی جەلادی ئەشکەنجەدەرتان بکەن.

سەگەل، وەک ئەوەی هار بووبن، ڕێک لەبەردەمی دەرگای حەوشە دەستیان بە وەڕین کرد.

گوتم: "لە دەرێ دیسان بەفر دەبارێت. ئەوانی تر بەم ئێوارە وەختە لە کوێن؟ بۆچی ئێوەیان بەتاقی تەنیا لە ماڵەوە جێ هێشتووە و ڕۆیشتوون؟ تەنانەت مۆمێکیشیان دانەگیرساندووە."

گوتی: "ئەمە زۆر سەیرە، زۆر. هیچ نەمتوانی لەمە بگەم."

هێندە بەدەربەست بوو بەتەواوی باوەڕم پێ کرد و سەرباری ئەوەی لەگەڵ نیگارکێشانەکانی تر گاڵتەم پێ دەکرد، کەچی جارێکی تریش لە قوڵاییی ناخمەوە هەستم کرد خۆشم دەوێت. نازانم و بۆم نەبرایەوە سەریەک چۆن دەمودەست حاڵی بوو، لەپڕ ڕێز و خۆشەویستییەکی لە ڕادەبەدەر لە دڵمدا بەرامبەر وی شەپۆلی دا و ئەویش سەرلەنوێ بەو میهرە باوکانە خۆ لەبەر ڕانەگیراوەوە دەستی بە سەرمدا هێنا. هەستم کرد نەخشی مامۆستا عوسمان کە ئیلهام لە مامۆستایانی دێرینی هەرات وەردەگرێت، هیچ داهاتوویەکی نییە. ئەمە بیرێکی هێندە تۆقێنەر بوو، وای لێ کردم لە خۆم بترسم. دوای کارەسات، ئەمە لە گشتمان ڕوودەدات: وەک دوا ئومێد و بێ ئەوەی گوێ پێ بدەین خەڵکانی تر بەهیچ لەباردا نەبوو و مایەی پێکەنینمان دەزانن، دەپاڕێینەوە بۆ ئەوەی هەموو شتێک وا بەردەوام بێت وەک ئەوەی لە ڕابردوودا هەبووە.

گوتم: "سەرباری ئەوەش با لەسەر کێشانی نیگاری کتێبەکەمان بەردەوام بین و با هەموو شتێک لە ڕابردوودا چۆن بووە، وا درێژەی هەبێت."

"تاوانبارێک لەناو نیگارکێشاندا هەیە. لەگەڵ قەرە ئەفەندی درێژە بە کتێبەکە دەدەم."

ئەرێ هانی دەدام بۆ ئەوەی بیکوژم؟

گوتم: "ئێستا قەرە لە کوێیە؟ کچەکەتان و منداڵەکان لە کوێن؟"

هەستم دەکرد هێزێکی تر ئەم وشانەی خستبێتە سەر زمانم، بەڵام خۆشم پێ ڕانەدەگیرا. ئیدی چ ڕێیەکم لە پێشدا نەمابوو بۆ بەختەوەربوون و ئومێد چنین. تەنیا دەمتوانی خۆم بکەم بە کەسێکی ژیر و گاڵتەجاڕ و لە پشت ئەم دوو جنۆکە هەمیشە بەزمگێڕەی ژیری و گاڵتەجاڕیشەوە، هەستم بەنزیکبوونەوە و هەبوونی ئیبلیس، کە جڵەوی ئەوانی بە دەستەوە بوو، دەکرد. هەمان کات سەگەلی شوومی بەر دەرگای حەوشە، وەک ئەوەی بۆنی خوێنیان کردبێت، شێتانە دەستیان بە وەڕین و حەپەحەپ کردبوو.

ئەرێ پێشتر شتێکی وەک ئەمەم بەسەرهاتبوو؟ لە شارێکی فرە دوور، لە مێژوویێکدا کە ئێستا زۆر دوورە بەلامەوە، گاشێک لە دەرەوە بەفر باریبوو و من نەمبینیبوو، پیرێکی کەنەفت و خەڵەفاو تۆمەتی دزینی بۆیاخی دابووە پاڵم و منیش لەبەر ڕووناکیی مۆمێک بەدەم گریانەوە هەوڵم دابوو بۆی باس بکەم بێ تاوانم. ئەو کاتەش کتومت وەک ئێستا، سەگەکانی پشت دەرگا دوورەکەی حەوشە شێوەی ئەوەی بۆنی خوێنیان کردبێت، دەستان بەوەڕین کردبوو. زاوا ئەفەندیش چەناگەیەکی گەورەی وێنەی ئەوەی ئەو کابرا چرچەوەبوو و بوودەڵە و قرێژەی پێوە بوو. ئێستاش لەو چاوانەیەوە، کە لە ئەنجامدا بێ بەزەییانە لەناو چاوانی منی بڕیوە، تێ گەیشتم نیازی هەیە بمپلیشێنێتەوە و بۆی دەرباز بێت. هەروەک چۆن دەمتوانی ئەم بیرەوەرییە خراپەی پاشماوەی ئەو سەردەمەی دە ساڵان بووم و شاگردی نیگارکێش بووم، وەک نیگارێکی هێڵ ئاشکرا و ڕەنگ کاڵەوەبووی ناو ئەقڵم بهێنمە بەرچاوی خۆم، ئەم ساتەشی ئێستا تێیدا بووم، شێوەی بیرەوەرییەکی مسۆگەر و کاڵەوەبوو وابوو بۆم.

بەمجۆرە، ئەو نیگارکێشە لێهاتووەی ناو ئەقڵم کە سەرگەورەی نیگارکێشان مامۆستا عوسمان ئێمەی لە هەبوونی ئاگادار کردبووەوە، لە شوێنی من هەڵدەستا و



لە پشت زاوا ئەفەندییەوە دەسووڕایەوە و لە نێوان قوتووە ئاشناکانی مەرەکەبدا کە هەندێکیان شووشە و بڕێکیان فەخفوری و بەشێکیان کریستاڵ بوون، ئەو قوتووە مسە نوێیەی دەدایە دەستم و بە ڕەنگێکی مسۆگەر و کاڵ نیگاری ڕەفتار و شتە بینراوەکانی بۆ دەکێشام، بەڵام وەک ئەوەی بیرەوەرییەکی زۆر کۆن بێت، نەک شتێک بێت ئێستا بەسەرم هاتبێت. ڕێک شتێک بوو شێوەی ئەوەی لە خەونماندا لە دەرەوە سەیری خۆمان دەکەین و مچوڕکمان پێدا دێت. قوتووە مسە قەڵەو و مل باریکەکەی مەرەکەبم بەدەستەوە گرت و بەهەمان مچوڕکەوە گوتم:

"کاتێک شاگردبووم و دە ساڵان بووم، قوتوویەکی لەم شێوەیەم بینیبوو."

زاوا ئەفەندی گوتی: "قوتوویەکی سێسەد ساڵەی مەگۆلییە، قەرە لە تەورێزەوە هێناویەتی. تەنیا بۆ سوور بەکار دەهێنرێت."

بێگومان ئەوەی ئەو کاتە دنەی دام تا هێزم تێدایە قوتووەکە بکێشم بە سەری گەنیوی ئەم خەڵەفاوە لە خۆباییەدا، ئیبلیس بوو. بەڵام بەقسەیم نەکرد و بەئومێدێکی گەمژانەوە گوتم:

"من زەریف ئەفەندیم کوشت."

ئێوە حاڵی دەبن بۆچی ئەمەم بەئومێدەوە گوت، وا نییە؟ ئومێدەوار بووم زاوا لێم تێ بگات و بمبوورێ. لێشم بترسێت و هاوکاریشم بکات.

# 29

## من زاواتانم

کاتێک گوتی زەریف ئەفەندیم کوشتووە، بێدەنگییەکی درێژ باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا. وای بۆچووم منیش بکوژێت. ماوەیەکی درێژ دڵم بەخێرایی لێی دا. ئایا بۆ کوشتنی من هاتبووە ئێرە، یان بۆ ددان پێدانان، یاخۆ بۆ ترساندن؟ ئەرێ خۆی دەیزانی چی دەوێت؟ ئەم نیگارکێشە لێهاتووەی ساڵانێک بوو ئاشنای گشت هونەر و ماریفەتەکانی بووم، حاڵی بووم بەهیچ جۆرێک دڵیم نەناسیوە و ئەمەش ترساندمی. هەستم دەکرد هێشتا ئەو قوتووە مسە گەورەیەی مەرەکەبی بەدەستەوەیە و لە پشتمەوە چەقیوە و ڕێک لە دوای پشتەملەوە ڕاوەستاوە، بەڵام خۆم نەسووڕاند و سەیری ڕوویم نەکرد. دەمزانی بێدەنگی نیگەرانتری دەکات، بۆیە گوتم:

"سەگەکان هێشتا لە وەڕین نەکەوتوون."

بەوجۆرە، دیسان بێدەنگ بووین. حاڵی بووم ئەمجار ڕزگاربوونم لە مردن و لەم بەڵایەی بەسەرم هاتووە، لە دەستی خۆم و لەو شتانەدایە کە پێی دەڵێم. جگە لە هونەری نەخش و نیگاری، تاقە شتێکی تر، کە لەبارەی ئەوەوە دەمزانی، زیرەکییەکەی بوو. ئەمەش، ئەگەر بڕواتان وا بێت پێویستە نیگارکێش بەهیچ جۆرێک خۆی و ڕۆحی لە بەرهەمی خۆیدا پێشان نەدات، شتێکە مایەی شانازی. باشە، چۆن منی لەم ماڵە چۆڵ و هۆڵەمدا تەنگاو کردووە؟ ئەقڵی پیربووم خێرا خێرا بیری لەم شتانە دەکردەوە، بەڵام لەوەش ئاڵۆزتر بوو بتوانێت لەم گەمەیە ڕزگاری بێت. ئەرێ شەکوورە لە کوێندەرێیە؟



لێی پرسیم: "هەر زوو تێ گەیشتبوویت کە من کوشتوومە، وا نییە؟"

تێ نەگەشتبووم، تا ئەو دەمەی پێی گوتم، من تێ نەگەیشتبووم. سەرباری ئەوەش، بە گۆشەیەکی ئەقڵم بیرم لەوە دەکردەوە بە کوشتنی زەریف ئەفەندی کارێکی باشی کردووە، چونکە بەڕاستی لەوانە بوو وەستای زەرکاری خوا لێخۆشبوو هێدی هێدی ترس دای بگرتایە و سەری هەموومانی بەفەتارەت بدایە.

ئەمەش وای کرد لەم ماڵە چۆڵ و خاڵییە، لە بەرامبەر ئەم بکوژە هەستێکی دیار و نادیاری سوپاسبژێری لە هەناومدا سەر هەڵبدا.

گوتم: "سەرم لە کوشتنی سوڕنامێنێت. ئەوانەی وەک ئێمە لەگەڵ کتێبدا دەژین و پەڕەکان لە خەوندا دەبینن، هەمیشە لەم دنیایە لە شتێک دەترسن. لەوەش زیاتر، ئێمە لە شارێکی موسڵماندا سەرقاڵی شتێکی قەدەغەتر و ترسناکترین، مژوولی نیگارکێشانین. لە هەناوی هەر نیگارکێشێکدا وەک شێوەساز شێخ محەمەدی ئەسفەهانی، بزوێنێکی بەهێز هەیە پاڵی پێوە دەنێت خۆی بە گوناهبار بزانێت، پەژیوان بێتەوە، خۆی بەر لە هەموو کەسێکی تر بە تاوانبار بزانێت و پەشیمان بێتەوە و داوای لێبووردن لە خوا و لە جڤات بکات. جۆری تاوانباران کتێبەکانمان بەدزییەوە و زۆربەی جارانیش وەک ئەوەی داوای لێبووردن بکەین، ئامادە دەکەین. من گەلێک باش دەزانم سەر دانەواندنی پێشوەخت بۆ هێرشی ئەو خۆجە و مەلا و قازی و شێخانەی ئێمە بە بێ ئاینی تۆمەتبار دەکەن، هەم خەیاڵی نیگارکێش دەکوژێت و هەم دەوڵەمەندیشی دەکات."

"واتا لەپای لە کۆڵکردنەوەی زەریف ئەفەندی تاوانبارم ناکەی."

"ئەو شتەی ئێمە لە نووسین و نەخش و نیگاردا بەکێش دەکات، ئا لەو ترسەدایە. ڕۆژ تا ئێوارە و شەوانیش لەبەر تیشکی مۆم، لەسەر چۆک دادەنیشین و تا کوێر دەبین خۆمان بە نیگار و کتێب دەدەین و تاکە هۆکاری ئەمەش بەتەنیا پوول و خێر نییە، بگرە ڕاکردنە لە چەقەچەقی کەسانی تر و لە جڤات. بەڵام سەرباری ئەم دڵشکاوییەش، خوازیارین ئەو کەسانەی لە دەستیان هەڵهاتووین و خۆمان لێیان شاردووەتەوە، نیگارەکانمان کە بەئیلهامەوە کێشاومانن، ببینن و ڕێزی لێ بگرن. بەڵام ئەی ئەگەر پێمان بڵێن "بێ باوەڕان." ئەمە شێوەسازی ڕاستەقینەی خاوەن

هونەر زۆر دەیەشێنێت. ڕاستییەکەی، نیگاری ڕاستەقینە و ڕەسەن لە ناخی ئەو شتە هیچ نەبینراو و نەکراوەدایە، لەو نیگارەدایە کە هەموو کەسێک سەرەتا پێی دەڵێت خراپ، ناشایەن و بێ ئاین. نیگارکێشی ڕاستەقینە، هەم دەزانێت پێویستە بچێتە ئەوێ و هەم لە تەنیایی وێندەرێش دەترسێت. بەڵام ئایا کێ بەدرێژایی ژیان بەرگەی ئەو ژیانە ترسناک و دڵتەنگە دەگرێت؟ نیگارکێش پێی وایە ئەگەر پێش هەموو کەسێکی تر خۆی تاوانبار بکات، ئەوا دەتوانێت خۆی لە ترسی چەندین ساڵە ڕزگار بکات. تەنیا ئەو کاتەی ددان بە تاوانی خۆیدا دەنێت بڕوای پێ دەکرێت و دەسووتێنرێت. نیگارکێشی ئەسفەهانی، خۆی ئەم کارەی کرد."

گوتی: "تۆ نیگارکێش نیت. منیش ئەوم لە سۆنگەی ترسانمەوە نەکوشت."

"ئەدی بۆیە کوشتت بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆت و بێ ترس نیگار بکێشیت."

ئەو نیگارکێشەی دەیویست ببێت بە بکوژم، شتێکی ئاقڵانەی گوت و ماوەیەکی درێژ بوو شتی وای لە دەم دەرنەچووبوو: "دەزانم، هەموو ئەم شتانە بۆ دڵدانەوە و هەڵخەڵەتاندن و دەرچوون لەم دۆخە دەڵێی." درێژەی دایێ و گوتی: "بەڵام دوا قسەت ڕاستە. واتای ئەمەم دەوێت. گوێم لێ بگرە:"

هەڵگەڕامەوە و سەیری ناو چاوانیم کرد. لە کاتی قسەکردن لەگەڵ مندا بەتەواوی دەستی لە ئەدەبی کۆنی نێوانمان بەردابوو و وای پێشان دەدا ئیدی سەری هەڵگرتووە و دەڕوا. بەڵام بۆ کوێ؟

گوتی: "خەمت نەبێت، درێغی ناکەم لە ڕێزگرتنت." لە پشتەوە هاتە پێشمەوە و قاقایەکی لێ دا، بەڵام ڕەهەندێکی زۆر بەئازاری تێدا بوو. گوتی: "ڕێک وەک ئێستا، شتێک دەکەم، بەڵام وەک ئەوە وایە بکەری ئەو شتە من نەبم. هەست دەکەم شتێکی بەجموجووڵ لە هەناومدا هەیە و گشت خراپەکارییەکان ئەو پێم دەکات. بەڵام زۆریش پێویستم پێیەتی. بۆ نیگارکێشانیش هەر وایە."

"ئەمە قسە و قسەڵۆکی سەر تەنوورن و سەبارەت بە ئیبلیس دەگوترێن."

"واتا من درۆ دەکەم؟"

هەستم کرد بوێریی تەواوی تێدا نییە بۆ کوشتنم و دەیەوێت لێی تووڕە بم. "درۆ ناکەیت، بەڵام ئەو شتەی لە هەناوتدا هەستی پێ دەکەیت، نایناسی و نامۆیە بەتۆ."



"نەخێر، شتەکەی ناو هەناوی خۆم زۆر باش دەناسم. بەر لە مردنم ئازاری گۆڕ دەچێژم. بێ ئەوەی خۆمان پێی بزانین، لە سایەی تۆووە تا گرێمل نوقمی گوناه بووین. ئێستاش پێم دەڵێی جەرگ قایمتر بە. من بەهۆی تۆوە بووم بە بکوژ. ئەو سەگانەی مەلا نوسرەت هاری کردوون، هەموومان دەکوژن و تاقبڕمان دەکەن."

هەر چەندی زیاتر بڕوای بە قسەکانی نەکردایە، قایمتر دەینەڕاند و توندتر قوتووی مەرەکەبەکەی لە دەستیدا دەگوشی. ئایا ڕێبوارێکی کۆڵانە بەفراوییەکە دەیتوانی قیڕەی ببیستێ و بێت؟

گوتم: "چۆن بوو وا کوشتت؟ چۆن لە لێواری ئەو بیرە بەیەک گەیشتن؟" زیاتر مەبەستم کات بەدەستخستن وەک لە پەرۆشی.

بەویستێکی گێڕانەوەی چاوەڕواننەکراوەوە گوتی: "زەریف ئەفەندی ئەو شەوەی لای تۆوە دەرچوو، خۆی منی دۆزییەوە. گوتی دوایین نیگارە دوو پەڕەییەکەی بینیوە. زۆر هەوڵم دا دەهۆڵ نەکوتێ و نەیکات بە قاڵەقاڵ. بردم بۆ شوێن سووتاوییەکە، گوتم لە نزیک بیرەکەوە پارەی لەژێر گڵ شاراوەم هەیە. کاتێک گوێی لە پارە بوو، باوەڕی کرد. بەڵگەی لەمە باشتریش دەست ناکەوێت بۆ ئەوەی کەوا نیگارکێش بۆ پوول کار دەکات. بۆیە هیچ خەمگین نیم، نیگارکێشێکی خاوەن هونەری ئاسایی بوو. ئامادەبوو گڵە ڕچیوەکە بە نینۆک هەڵکۆڵێت. ئەگەر بەڕاستی زێڕی شاراوەم لەژێر گڵی لێواری بیرەکە هەبوایە، هیچ پێویستی نەدەکرد بیکوژم. تۆ کەسێکی پڕوپووچت بۆ ئەنجامدانی زەڕکاری هەڵبژاردبوو. خوا لێخۆشبوو دەست و پەنجەیەکی کارامەی هەبوو، بەڵام لە هەڵبژاردنی ڕەنگ و بەکارهێنانی لە زەڕکاریدا، ساکار بوو. هیچ نیشانەیەکیشم لەدوای خۆم جێ نەهێشت. ئا پێم بڵێ بناخەی ئەو شتەی شێوازی پێ دەڵێن، چییە؟ ئێستا چ فەرەنگەکان و چ چینییەکان باس لە شێواز و ڕەنگی هونەری نیگارکێش دەکەن. ئایا پێویستە نیگارکێشی باش شێوازێکی تایبەت بەخۆی هەبێت بۆ ئەوەی لەوانی تری جیای بکاتەوە، یاخۆ نا؟

گوتم: "خەمت نەبێت، شێوازێکی نوێ بەگوێرەی ویستی دڵی نیگارکێش پێک نایەت. شازادەیەک دەمرێت، شاهێک لە شەڕدا دەدۆڕێت، کۆتایی بە دەورانێک دێت کە کەس پێی وانییە بڕوا و ببڕێتەوە، نیگارخانەیەک دادەخرێت و نیگارکێشانی ناوی

پەرتەوازە دەبن و سەرزەوین و پشتوپونای کتێبپەروەری تر بۆ خۆیان دەدۆزنەوە. ڕۆژێک، سوڵتانێک ئەم نیگارکێش و خۆشنووسە بێ وڵات و سەرسام و هونەرمەندانەی لە شوێنی جۆراوجۆرەوە هاتوو، با بڵێین لە هەرات و حەلەبەوە هاتوون، بەدلۆڤانی لەژێر چادر یان لە کۆشکی خۆی گرد دەکاتەوە و بەیایەخەوە نیگارخانەی خۆی دادەمەزرێنێت. ئەم نیگارکێشانە بەیەکتریش ڕانەهاتبن و دەسپێک لەسەر ئەو شێوازە کۆنانەی پێشتر پێی ئاشنابوون نیگار بکێشن، دواتر کتومت وەک برێک منداڵ کە لە کۆڵان دەکەون و هەڵدەستنەوە و تێکەڵ بەیەکدی دەبن، جۆرە وێکچوون و شەڕ و حیسێب خواستنێک لە نێوانیاندا چێ دەبێت. ئەو شتەی لە ئەنجامی شەڕ، ئیرەیی، گەلەکۆمە و کاری ڕەنگ و نەخشدا دێتە ئاراوە، شێوازێکی نوێیە. بەزۆری، درەوشاوەترین و هونەربازترین نیگارکێشی ناو نیگارخانە ئەم شێوازە نوێیە دادەهێنێت. با پێشی بێژین نیگارکێشی هەرە بەختەوەر. ئەرکی پاشماوەی نیگارکێشانی تر بریتی دەبێت لە لاساییکردنەوەی ئەم شێوازە و کامڵکردن و بگرە گەشەپێدانی."

بێ ئەوەی ڕاستەوخۆ سەیری ناو چاوەکانم بکات، بە خۆپێشاندانێکی دلۆڤانانەی چاوەڕوانەکراوەوە بۆ من، هێندەی دروست بوون، داوای چاکەشی لێ کردم و هەروەک کچێکی جوان لەرزی و پرسی:

"ئایا من شێوازێکی تایبەت بەخۆم هەیە؟"

بۆ تاوێک هەستم کرد لە چاوانمەوە فرمێسک سەردەکات. بەتەواوی هێزمەوە هەوڵم دەدا نەرم و دلۆڤان و باش بم لەگەڵیدا و ئەو شتەم پێ گوت و خۆیشم لە دڵەوە بڕوام پێ دەکرد:

"تۆ پڕ هونەرترین و دەست ئەفسووناویترین و چاوتیژترین و پڕ پەرجووترین نیگارکێشی کە لە ماوەی شەست ساڵی تەمەنمدا دیبێتم. ئەگەر نیگارێکم لەبەردەستدا بێت شوێنی نووکی قەڵەمی هەزار شێوەسازیشی پێوە بێت، من یەکسەر شوێنی ئەو قەڵەمە دانسقەیەی خوا پێی داویت، دەدۆزمەوە و دەستنیشانی دەکەم."

گوتی: "منیش بەهەمان شێوە بیر دەکەمەوە، بەڵام تۆ تا ئەو ڕادەیە ژیر نیت



بتوانی لە ڕازی هونەری من بگەی. ئێستا لەبەرئەوەی لێم دەترسیت، درۆ دەکەیت. سەرباری ئەوەش، باسی شێوازی خۆمم بۆ بکە."

"وەک ئەوە وایە قەڵەمەکەت بەدەستی تۆ نا، بگرە لە خۆیەوە هێڵی ڕاست بدۆزێتەوە. ئەو شتەی قەڵەمی تۆ پێشانی دەدا، نە ڕاستە و نە گاڵتە. کاتێک نیگاری جڤاتێکی جەنجاڵ دەکێشیت، لە نیگای نێوان مرۆڤەکان و ڕیزکردنی پەڕەکان و واتای دەقەکەوە پەستانێک دێتە دەر و ئەم پەستانە لە نیگارەکەی تۆدا وەردەگەڕێتە سەر چپەیەکی زەریف و بێ برانەوە. من بۆ بیستنی ئەو چپەیە، سەرلەنوێ دەگەڕێمەوە سەر نیگارەکانت و تەماشایان دەکەم؛ لە هەر گەڕانەوەیەکمدا دەبینم واتا گۆڕاوە و بزەیەک دەکەوێتە سەر لێوم و نازانم چۆن دەری ببڕم. دیسان وەک نووسین دەست بە خوێندنەوەی نیگارەکە دەکەم. بەمجۆرە، چین و ئاستەکانی واتا لەدوای یەک ڕیز دەبن و قوڵاییەک دروست دەبێت کە ڕوانگەی مامۆستایانی فەرەنگیش تێ دەپەڕێنێت."

"هممم. باشە. واز لە مامۆستایانی فەرەنگ بێنە. جارێکی تر بیڵێ."

"قەڵەمی تۆ، بەڕاستی هێندە دانسقە و بەهێزە، ئەوەی سەیری نیگاری تۆ دەکات، باوەڕ بە دنیا نا، بەو شتە دەکات وا تۆ کێشاوتە. بەمشێوەیە، تۆ هەروەک چۆن دەتوانیت کەسێکی خاوەن باوەڕێکی پتەو لەڕێ دەربکەیت، دەشتوانی بە نیگارێک کەسێکی لە باوەڕ داماڵدراو و یاخیبوو بگەڕێنیتەوە سەر ڕێگای خوا."

"ڕاستە، بەڵام نازانم ئایا ئەمە پیاهەڵدانە. کوا جارێکی تر بیڵێ."

"هیچ نیگارکێشێک ناتوانێت وەک تۆ سەر لە پێوانە و نهێنیی بۆیاخ دەربکات. هەر تۆی هەمیشە درەوشاوەترین و زیندووترین و ڕاستەقینەترین ڕەنگ ئامادە دەکەیت."

"باشە. چی تر؟"

"تۆ دەزانی لە پاڵ بەهزاد و میر سەعید عەلیدا، گەورەترین نیگارکێشی."

"ڕاستە، دەزانم. ئەگەر تۆش دەیزانیت، بۆچی کتێبەکە لەگەڵ من نا، لەگەڵ ئەو قەرە ئەفەندییەی نموونەی مامنێوەندیبوونە تەواو دەکەیت؟"

گوتم: "ئەو کارەی ئەو دەیکات، بگرە پێویستی بە هونەری نیگارکێش نییە. ئەمە

یەک. دووەم، ئەو وەک تۆ بکوژ نییە."

زەردەخەنەیەکی شیرینی بۆ کردم، چونکە منیش بە هەستێکی دڵفراوانییەوە پێکەنیبووم. هەستم دەکرد بەم خۆنواندن و بەم شێوازە، لەم دێوەزمەیە ڕزگارم دەبێت. بەمجۆرە و دوای ئەوەی من بابەتەکەم کردەوە، وەک باوک و کوڕ نا، بگرە جۆری دوو پیری بەپەرۆش و خاوەن ئەزموون، دەستمان کرد بە دەمەتەقێیەکی خۆش سەبارەت بە قوتووە مسەکەی مەرەکەبی مەگۆلیی دەستی ئەو. لەبارەی گرانیی مسەکەوە، هاوسەنگیی قوتووەکە، قوڵاییی ملەکەی و درێژیی قامیشی خۆشنووسانی کۆنەوە قسەمان کرد. هاتینە سەر باسی ڕازەکانی مەرەکەبە سوورەکە و ئەویش کاتێک بەپێوە لەبەردەمم ڕاوەستابوو، هێدی هێدی دەیهەژاند و دەیپێوا... باسی ئەوەمان کرد ئەگەر مەگۆلەکان لە وەستایانی چینییەوە فێری نهێنییەکانی مەرەکەبی سوور نەبوونایە و نەهێنابایە خۆراسان و بوخارا و هەرات، ئەوا ئێمەمان بەهیچ جۆرێک نەماندەتوانی لە ئەستەنبوڵ ئەم نیگارانە بکێشین. دەتگوت بەدەم قسەکردنی ئێمەوە پێوانەی زەمانیش وەک بۆیاخ دەگۆڕێت و کاتیش هەر تێ دەپەڕی. گۆشەیەکی ئەقڵم سەری سوڕمابوو لەوەی بۆچی کەس لە ماڵ نییە و خوازیار بووم قوتووە مەرەکەبە گرانەکە دانێتەوە شوێنی خۆی.

بەو ساناییی‌یەی لە کاتی پێکەوە کارکردنمان لە ڕابردوودا لەسەری ڕاهاتبوو، پرسی: "ئەوانەی دوای تەواوبوونی کتێبەکە سەیری نیگارەکانم دەکەن، ئایا هونەری من دەناسنەوە؟"

"ئەگەر خوا مەیلی لێ بێ ڕۆژێک لە ڕۆژان بە سەلامەتی ئەم کتێبە بە ئەنجام بگەیەنین، حەزرەتی سوڵتانمان بە دەستییەوە دەگرێت و ئاوا چاوێکی لێ دەکات، بێگومان سەرەتا بەتیلەی چاو دەڕوانێت بۆ ئەوەی بزانێت داخۆ پەڕە زێڕینەکان لە شوێنی خۆیاندا بەکارهێنراون یاخۆ نا، چەشنی ئەوەی سەیری شەمایلنامەیەک(*) بکات، تەماشای نیگاری خۆی دەکات و وەک هەموو سوڵتانێکی دی، شەیدای خۆی دەبێت لەبەرئەوەی نیگاری کێشراوە و بایەخ بە نیگاری شاهانەی دەستکردی ئێمە

(*) شەمایلنامە: وشەیەکی عوسمانیی کۆنە، واتای نیگاری سەرتاپای مرۆڤ دەگەیەنێت.
– وەرگێڕ –



نادات. خۆ ئەگەر دوای ئەوەش کاتی هەبێت و سەیری ئەو شاکارانە بکات، کە ئێمە بەو گشت دژواری و ماندووییی چاو و زەوقەوە و بە ئیلهام وەرگرتن لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کێشاومانە، ئەوا دەبێت سوپاسی خوا بکەین. خۆ تۆ دەزانیت، ئەگەر پەرجوویەک نەبێت، هەرگیز ناپرسێت کێ ئەم چوارچێوەیەی کردووە، زەڕکاری کاری کێیە و کێ نیگاری ئەم کابرا و ئەم ئەسپەی کێشاوە و دواتر لەسەر کتێبەکە دەنێرێتە گەنجینە و دەرگای لەسەر دادەخرێت. بەڵام ئێمەش چەشنی سەرجەم خاوەن هونەرانی تر، بەهیوای ئەوەی ڕۆژێک ئەو پەرجووە پێک دێت، هەمیشە نیگار دەکێشین."

تۆزێک بێدەنگ بووین. دەتگوت پشوو دەدەین.

پرسی: "ئەو پەرجووە کەنگێ پێک دێت؟ ئەو هەموو نیگارەی تا کوێربوونمان دەیانکێشین، بەڕاستی کەی مرۆڤ لێی حاڵی دەبێت؟ کەی ئەو خۆشەویستییەمان پێ ڕەوا دەبینرێت کە مافی خۆم، مافی خۆمانە؟"

"هەرگیز."

"چۆن؟"

گوتم: "ئەو شتەی تۆ دەتەوێت، هەرگیز ناتدرێتێ و لە داهاتووشدا کەمتر لێت حاڵی دەبن."

لەخۆباییییانە، بەڵام بەمتمانە بەخۆبوونێکی ناتەواوەوە گوتی: "کتێبەکان چەندین سەدە دەمێننەوە."

"ئەو شیعر و باوەڕ و هەستیاری و ڕەسەنایەتیی ڕەنگ و درەوشانەوەیەی بەلای تۆوەیە، باوەڕت هەبێت بەلای هیچ مامۆستایەکی ئیتاڵییەوە نییە. بەڵام نیگاری ئەوان بڕوابەخشترە و زیاتر لە ژیانی خۆیان دەچێت. تۆ دەزانی ئەوان نیگاری هەموو شتێک دەکێشن. وەک ئەوەی لە بانیژەی منارەیەکەوە سەیری دنیا بکەن و بێ پشتگوێخستنی ئەوەی ئەو شتەی ڕوانگەی پێ دەڵێن، لە کۆڵانەوە، یاخۆ لەناو ژووری شازادەوە، نیگاری خۆی، پێخەوەکەی، مێزەکەی، ئاوێنەکەی، قاپەکانی، کچەکەی و پارەکانی پێکەوە دەکێشن. من بەهەموو شتێکی دەستکردی ئەوان فریو ناخۆم؛ بەڕای من ئەگەر نیگار ڕەپ و ڕاست لاساییی دنیا بکاتەوە، ئەوا لە بەهای دێتە

خواریّ و ئەمەش کارێکی دژوارە بەلای منەوە. ئەوان نیگاری ئەو شتانەی دەیانبینن و ئێمەش نیگاری ئەو شتانەی سەیریان دەکەین، دەکێشین. هەر ئەوەندەی چاوت بە دەستکارەکانی ئەوان کەوت، دەمودەست تێ دەگەیت مانەوەی ڕوو تا قیامەت بەشێوازی فەرەنگدا تێ دەپەڕێت. هێزی بەکێشکردنی ئەو شێوازە هێندە پتەوە، کە ڤینیسیا بەتەنیا، بگرە سەرجەم بەرگدرووان، قەساب، سەرباز، قەشە، بەقاڵ... گشت کەسێکی وڵاتانی فەرەنگ نیگاری خۆیان بەکێشان دەدەن. چونکە ئەگەر تۆش جارێک ئەو نیگارانە ببینی، دەتەوێت خۆت وەها ببینی و باوەڕ بکەیت بەتەواوی لە هەموو کەسێکی تر جیاوازیت، بێ وێنەیت و ئافرێندراوێکی تایبەت و نامۆی. ئەم هەلەش کاتێک دەڕەخسێت نیگاری مرۆڤ بەو شێوەیەی چاو دەیبینێت بکێشرێت، نەک بەوجۆرەی ئەقڵ دەیبینێت. ڕۆژێک دادێت لە داهاتوودا هەموو کەسێک لەسەر شێوازی ئەوان نیگار بکێشێت. کاتێک ناوی نیگار دەبرێت، هەموو جیهان لە شتەکانی دەستکردی ئەوان تێ دەگات. لەوێ، تەنانەت بەرگدروویەکی بەستەزمان و گەمژەشە خوازیارە بەو شێوازە نیگاری بکێشرێت، بۆ ئەوەی کاتێک سەیری گرێی لووتی خۆی کرد، بتوانێت باوەڕ بکات ئەو سەرتۆپی گەمژەکەکان نییە، بگرە کەسایەتییەکی فرە تایبەت و بێ هاوتایە."

بکوژی قۆشمە گوتی: "ئێ، کەواتە ئێمەش ئەو نیگارە دەکێشین."

گوتم: "نایکێشین، مەگەر لە خوا لێخۆشبوو زەریف ئەفەندیی کوشتەی دەستی خۆتەوە فێر نەبووی کەسانی وەک ئەو تا چ ڕادەیەک لەوە دەترسن ببن بە لاساییکەرەوەی فەرەنگان؟ ئەگەر نەترسن و هەوڵی تاقیکردنەوەش بدەن، دەگەنە هەمان ئەنجام. دواجار شێوازەکانی خۆمان دەمرن، ڕەنگەکانمان کاڵ دەبنەوە و وای لێ دێت کەس بایەخ بە کتێب و نیگارەکانمان نادات. ئەوانەشی بایەخی پێ دەدەن، یان هیچی لێ حاڵی نابن و لێو هەڵدەهێننەوە و دەڵێن بۆچی ڕوانگەی تێدا نییە، یان هەرگیز کتێبەکانیان بۆ پەیدا ناکرێت، چونکە کات و کارەسات شانبەشانی بایەخ پێنەدان و فەرامۆشکردن، لەبەرەوە کتێبەکانمان دەکرتێن و لەناویان دەبەن. لەبەرئەوەی چرێشی عەرەبیی دەستنووسەکان ماسی و هەنگوین و ئێسکی تێدایە و پەڕەکانی بە گیراوەی لە هێلکە و نیشاستە دروست کراو سفت کراوە، مشکی برسی





و بێ ئابڕوو دەیانکرتێن و هەلاهەلایان دەکەن؛ مێرووڵەی سپی، کرم و هەزاران جۆری مێروو، کتێبەکانمان دەقرتێن و لەناویان دەبەن. دەستنووسەکان لەتوپەت دەکرێن و ڕووپەلەکان لێ دەکرێنەوە؛ دز، خزمەتکارانی بێ دەربەست، منداڵان و ئەو ژنانەی ئاگردان دادەگیرسێنن، بێ بیرکردنەوە ڕووپەل و نیگارەکان دەدڕن. وای لێ دێت شازادەگەلی منداڵ بە قەڵەمی گەمەی ناو دەستیان نیگارەکان دەشێوێنن، چاوی مرۆڤەکانی ناویان دەکۆڵن، لیکی دەمیان بەپەڕەکان دەسڕنەوە، بە قەڵەمی ڕەش هێڵ بە لێواری پەڕەکاندا دەهێنن؛ ئەوانەی هەر تاوناتاوێک دەڵێن ئەم کارە گوناهە، گشت شتێک ڕەش دەکەنەوە، نیگارەکانمان دەدڕن و دەبڕن و لەوانەیە بۆ نیگاری تر، یاخۆ گەمە و بەزم و سەفای خۆیان بەکاری بهێنن. دایکانیان نیگارەکانمان بەبیانووی ئەوەی بێ پەردەن، دەدڕن و برایانی گەورەیان دەستپەڕ بە نیگاری ژنانەوە لێ دەدەن و ئاوی خۆیانی بەسەردا دەڕژێنن؛ ڕووپەلەکان نەک بەتەنیا لەبەر ئەمە، بگرە بەهۆی قوڕ، شێ، چرێشی خراپ، تف، پیسیی جۆربەجۆر و پەڵەی خواردنەوە پێکەوە دەلکێن. لە پیس و پۆخڵی و کەڕووی شوێنی پێکەوە لکانیشەوە، پەڵە و دوومەڵ چەشنی گوڵ سەر دەردێنن. دواتریش باران و دڵۆپەی بنمیچ و لافاو و شەپۆلی قوڕ کتێبەکانمان دەفەوتێنێت. ئەگەر لەگەڵ ئەو پەڕانەی کە بەهۆی ئاو، شێ، مێروو و فەرامۆشکردنەوە بوون بە هەویر، ڕزیون، کونیان تێ بووە، کاڵ بوونەتەوە و چی دی بۆ خوێندەوە دەست نادەن، دوایین کتێبیش بەپاک و خاوێنی لە سندووقێکی پەرجوویی دەربهێنرێت، ئەوا بێگومان ڕۆژێک لە ڕۆژان بە ئاگرێکی بێ بەزەیی دەسووتێ و دەبێت بە خۆڵەمێش. بۆچی گەڕەک هەیە لە ئەستەنبوڵ هەر بیست ساڵ جارێک نەسووتێ و وێران نەبێت تا کتێب بمێنێت؟ لەم شارە، کە هەر سێ ساڵ جارێک کتێب و کتێبخانەی زیاتر لەوەی مەگۆلەکان لە بەغدا سووتاندیان و تاڵانیان کرد، دەسووتێنرێت، کام نیگارکێش دەتوانێت خەیاڵ لێ بدا شاکارەکەی سەد ساڵ بژی و ڕۆژێک لە ڕۆژان سەیری نیگارەکانی بکرێت و وەک بەهزاد یادی بکرێتەوە؟ نەک هەر بەتەنیا ئەو شتانەی ئێمە دەیانکەین، بگرە هەر شتێک کە چەندین سەدەیە لەم دنیایە دەکرێت و بەرهەم دەهێنرێت، بەهۆی سووتان و کرم و پشتگوێ خستنەوە دەفەوتێت. بەوجۆرە، نیگاری شیرین کاتێک بەشانازییەوە لە پەنجەرەوە بۆ خەسرەو

دەڕوانێت و خەسرەویش چەند جوان سەیری شیرین دەکات گاڤێک لەبەر تریفەی مانگ خۆی دەشوات و نیگاری هەموو ئەڤینداران لەو کاتەی بە شیرینی و نازکی بۆ یەکدی دەڕوانن؛ نیگاری ڕۆستەم کاتێک لەگەڵ ئیبلیسی سپی دەستەویەخە دەبێت و لە بنی بیردا دەیکوژێت؛ نیگاری حاڵی خەمگینی مەجنوونی شەیدا و سەوداسەری ئەڤین لە بیابان و هاوڕێیەتیکردنی لەتەک پڵنگی سپی و بزنە کێویدا؛ نیگاری بە داردا هەڵواسینی ئەو سەگە ناپاکەی شوان کە لەگەڵ گورگێکدا جووت دەبێت و هەموو شەوێ مەڕێکی لەو ڕانەی خۆی پاسەوانیەتی، بەدیاری پێشکێش دەکات؛ هەموو نەخشەکانی لێواری ڕووپەلی ڕازاوە بە گولیلک و فریشتە و چڵی گڵادار و مەل و فرمێسکی چاو؛ گشت ئەو عوودژەنانەی بۆ خەملاندنی شیعرە پڕ لە ڕازەکانی حافیز کێشراون؛ سەرجەم ئەو نەخش و جوانکارییانەی سەر دیوار کە چاوی هەزار، دەیان هەزار شاگردی نیگارکێشی تێک داوە و مامۆستایانی کوێر کردووە؛ سەرجەم ئەو بەیتانەی لەسەر دەرگا و تابلۆی بچووکی بە دیواردا هەڵواسراو و چوارچێوەی بەیەکداچووی ناو نیگارەکاندا خۆیان حەشار داوە؛ واژۆی خاکی و بێ فیزی شاراوەی ناو دیواران، گۆشە، نقێم، ژێرپێ، پوش و پەڵاش و تاوێر؛ هەموو گوڵ و گولیلکی سەر لێفەی ئەڤینداران؛ گشت ئەو کەللە بڕاوانەی گاوران لە کاتی هێرشی باپیری خوا لێخۆشبووی سوڵتانماندا بۆ سەر قەڵای دوژمن، لە قەراغەوە بە ئارامی چاوەڕێ دەکەن؛ نیگاری ئەو ساتەی نێردراوی گاوران پێی باپیری سوڵتانمان ماچ دەکات و هەموو تۆپ و تفەنگ و چادری قولاییی ناو نیگارەکە کە تۆ لە تافی لاویتدا لە کێشانیدا بەشدار بوویت؛ سەرجەم ئیبلیسانی شاخدار، بێ شاخ، کلکدار، بێ کلک، کەڵبە تیژ و نینۆک درێژ؛ بەهەزاران مەلی جۆربەجۆر بە پەپوو سلێمانەی زانا و چۆلەکەی هەڵقوون، مەلی کوڵەماری ناشی و بولبلولی شاعیرەوە؛ پشیلەی ئاسوودە، سەگی بێ ئۆقرە و هەوری تیژتێپەڕ؛ گیای بچووک و شیرینی دووبارەوەبوو لە هەزاران نیگاردا، ئەو تاوێرانەی نەزانانە نیگاری سێبەرەکانیان کێشراوە و دەیان هەزاران داری سنەوبەر و چنار و هەنار کە دانە بەدانەی لق و چڵ و گەڵا و پۆپیان بەپشوودرێژیی پێغەمبەران کێشراوە؛ ئەو کۆشکانەی بەلاسایییکردنەوەی کۆشکەکانی پاشماوەی سەردەمی تەیمووری لەنگ یاخۆ شا تەهماسپ بنیادنراون،



بەڵام بەسەرهاتی سەردەمانێکی زۆر کۆنتریان لەسەر نەخشێندراوە و سەدان هەزار خشتی ئەو کۆشکانە؛ دەیان هەزار شازادەی خەمگین کە لەسەر فەرشی شاهانەی ڕاخراو لەسەر گوڵ و لەژێر داری چرۆ دەرکردووی بەهاراندا لە دەشت و دەر و چۆڵەوانی دانیشتوون و لە پاڵ ژنانی جوان و خولامی نازدار گوێ بۆ مۆسیقا ڕادەگرن؛ سەرتاپای نیگاری سەر ئەو فەخووری و فەرشانەی پلەی کەمالیان لەم سەد و پەنجا ساڵەی ڕابردوودا قەرزداری ئەو تێ هەڵدانانەیە کە هەزاران شاگردی نیگارکێش لە سەمەرقەندەوە تا ئەستەنبوڵ بەدەم هەڵڕشتنی فرمێسکەوە خواردوویانە؛ نیگاری ئەو باخچە دانسقانە و ئەو کوڵەمارانەی تۆ تا ئێستاش بە جۆشەوە دەیانکێشیت؛ جڤاتی لە ئەقڵ بەدەری مردن و شەڕ؛ ئەو سوڵتانانەی بەزەرافەتەوە ڕاو دەکەن و ئەو ئاسکە سڵکەرانەی بەهەمان زەرافەتەوە غار دەدەن؛ شاهانی مردوو؛ دوژمنانی بە دیل گیراو، کەشتیی چارۆکە و شارەکانی دوژمن و گشت ئەو شەوە تاریک و نووتەکانەی وەک دڵۆپەی تاریکی لە قەڵەمەکەت دەچۆڕێن؛ ئەستێرەکان، دار سەرووی چەشنی تارمایی و ئەو نیگارانەی ئەڤین و مردنی بەڕەنگی سوور بۆیاخ کردووت، گشتیان، هەر سەرلەبەریان لەناو دەچن."

تا هێزی تێدا بوو قوتووی مەرەکەبەکەی کێشا بە سەرمدا.

سەرەتا، بەهێزی لێدانەکە سەرسمێکم دا. هەستم بە ئازارێکی تۆقێنەری ئەوتۆ کرد کە بەهیچ جۆرێک ناتوانم وەسفی بکەم. بۆ تاوێک پێم وابوو سەرانسەری دنیا لە ئازاری منەوە گلا و زەرد هەڵگەڕا. سەربارى ئەوەی بەشێکی فراوانی ئەقڵم لێی ڕوون بوو ئەوەی لە بەرامبەرمدا کراوە، پێشتر نەخشەی بۆ داڕێژدراوە، بەشەکەی تری ئەقڵم، کە بە لێدانی بەسەرم -یان لەبەر لێدانەکە- باش کاری نەدەکرد، بەنیازێکی خەمبارەوە دەیویست بەو هارەی خەریک بوو دەبوو بە بکوژم، بڵێت: "دەستم بە دامان، تۆ لە خۆڕا ئازارم دەدەی."

جارێکی تریش قوتووە مسەکەی کێشایەوە بە سەرمدا.

ئەمجارە، بەشە بێ ئاوەزەکەی ئەقڵیشم حاڵی بوو ئەمە هەڵەیەک نییە، بگرە شێتی و هەڵچوونە و بۆی هەیە دواجار مردنیشی بەدواوە بێت. بەڕادەیەک لەم دۆخە ترسام کە بەوپەڕی هێزم و بە ئازارەوە، وەک ئەوەی بلورێنم، دەستم بەهاوار کرد. ئەگەر

نیگاری قیژانەکەم بکێشرابایە، سەوزێکی تێر دەردەچوو. حاڵی بووم تاک و تەنیام و هیچ کەسێک لە کۆڵانی خاڵی بەم تاریکاییی ئێوارەیە گوێی لە هاوار و ناڵەم نابێت.

لە ناڵە و هاوارم ترسا و ڕاوەستا. تاوێکی کورت چاوەکانمان یەکانگیر بوون. لە گلێنەی چاوانیدا بینیم لەسەر ئەو کارەی بەشەرم و سەرسوڕمانەوە ئەنجامی دابوو، ڕاهاتووە و پێی پەسەندە. ئەو وەستا نیگارکێشە نەبوو کە من دەمناسی، بگرە بیانییەکی دوور و خراپەکار بوو و بگرە زمانی منیشی نەدەزانی. ئەمەش بێکەسیی ئەو ساتەی منی بۆ چەندین سەدە درێژ کردەوە. وەک ئەوەی چۆن مرۆڤ باوەش لەم دنیایە دەدات، ویستم دەستی بگرم، بێ سوود بوو. پاڕامەوە؛ یاخۆ پێم وابێت شتێکی وام کرد: "کوڕم، کوڕم، مەمکوژە." چەشنی ئەوەی لە خەوندا دەبینرێت، لەوە دەچوو هیچ گوێی لێم نەبووبێت.

جارێکی تریش قوتووەکەی کێشایەوە بە سەرمدا.

دەتگوت ئەقڵم، ئەو شتانەی دەیانبینم، بیروەرییەکانم، چاوەکانم، هەمووی بووە بەترس بۆم و تێکەڵ بەیەکتر بوون. هیچ ڕەنگێکم نەدەبینی و وامدەزانی هەموو ڕەنگەکان سوورن. ئەو شتەی وامزانیبوو خوێنی منە، مەرەکەبە سوورەکە بوو. ئەو شتەشی بەدەستی ئەوەوە بوو و من پێم وابوو مەرەکەبە، خوێنی سەرکردوو و لە ڕاوەستان نەهاتووی من بوو.

ئای مردنی خۆمم لەو ساتەدا چەند پێ ناڕەوا و بێ ویژدان و بێبەزەییانە بوو. بەڵام ئەمە ئەو شوێنە بوو سەری پیربووی خوێناویم هێدی هێدی منی بۆ هێنابوو. دواترێ پەیم بەم ڕاستییە برد. بیرەوەرییەکانم سپیی سادە بوون وەک بەفرەکەی دەرەوە. سەرم لەناو دەممدا ترپەی دەهات و ژانی دەکرد.

ئێستا باسی مردنی خۆمتان بۆ دەگێڕمەوە. لەوانەیە لە زووەوە تێ گەیشتبن: مردن کۆتایی هەموو شتەکان نییە؛ ئەمە گومانی تێدا نییە. بەڵام وەک ئەوەی هەموو کتێبەکانیش نووسیوویانە، شتێکی لە ڕادەبەر ئازاردەرە. نەک تەنیا کەللەی شکێندراوی سەرم و مێشکم، بگرە دەڵێی سەرتاپای ئەندامانی جەستەم بەیەکدا دێن و دەچن و بەدەم ئێشەوە دەلەرزن و دەسووتێن. خۆڕاگرتن لەبەر ئەم ئازارە بێ سنوورەدا کارێکی هێندە دژوار بوو، وەک بڵێی بەشێکی ئەقڵم، وەک تاکە ڕێگەچارە،



فەرامۆشی بکات و گوشاری خەوم بۆ بێنێت.

پێش ئەوەی بمرم، داستانێکی سوریانیم بیر کەوتەوە کە بە منداڵی لە کاتی شاگردیمدا بیستبووم. پیاوێکی پیر و تەنیا لە نیوەی شەودا لە خەو هەڵدەسێت و لێوانێک ئاو دەخواتەوە. کاتێک پەرداخەکە دەخاتەوە سەر سێپایەکە، دەبینێت مۆمەکەی سەری نەماوە. لە کوێیە؟ تیشکێک چەشنی تاڵە دەزوو لە ژوورەوە دزە دەکات. شوێنی دەکەوێت تا دەگاتەوە ژوورەکەی خۆی و دەبینێت کەسێکی تر مۆمێکی بەدەستەوەیە و لە پێخەوی ئەودا نووستووە. پاشان دەپرسێت "تۆ کێیت؟" یارۆی نامۆ لە وەڵامدا دەڵێت: "من مردنم." پیاوە پیرەکە بۆ تاوێک نوقمی بێدەنگییەکی پڕ لە نهێنی دەبێت. دواتر دەڵێت: "کەواتە هاتی." مردن کەیفسازە و دەڵێت: "بەڵێ." پیاوە بەساڵاچووەکە بەپێ داگرتنەوە دەڵێت: "نەخێر، تۆ خەونی نیوەناچڵ ماوی منی." لەپڕ بە فوویەک مۆمی دەستی کابرای نامۆ دەکوژێنێتەوە و هەموو شتێک لە تاریکیدا ون دەبێت. پیاوە پیرەکە دەچێتە پێخەوە خاڵییەکەی خۆیەوە و لێی دەنوێت. بیست ساڵی تر دەژی.

دەمزانی شتێکی لەوجۆرە بەسەر مندا نایەت، چونکە جارێکی تریش قوتووە مەرەکەبەکەی کێشابووەوە بەسەرمدا. ئازارێکی هێندە خەستم چێشت ئیدی بەئاستەم هەستم بە پێداکێشانی سەرم دەکرد. ئەو و قوتووی مەرەکەبە و ژوورەکەش کە مۆمەکە بەحاڵ ڕووناکی دەکردەوە، لە ئێستاوە دوور کەوتبوونەوە و لە چاوم ون بووبوون.

بەڵام سەرباری ئەوەش دەژیام؛ ئەمەش لەم شتانەوە تێ دەگەیشتم: باوەشم بەم دنیایەدا کردبوو و دەمویست ڕابکەم و خۆم ڕزگار بکەم؛ دەست و قۆڵەکانم لە جووڵەدابوون بۆ پاراستنی سەری خوێناوی و ڕووم؛ پێم وابێت جارێک مەچەکیم گرت و ئەویش جارێک قوتووە مەرەکەبەکەی کێشا بە دەموچاومدا.

وا بزانم کەمێک شەڕمان کرد، ئەگەر ناوی شەڕی لێ بنرێت. فرە بەهێز و گەلێکیش تووڕە بوو. لەسەرپشت درێژی کردم. هەردوو چۆکی نایە سەر شانم و بە زەوییەوە نووساندم و بە زمانێکی بێ ڕێز چەند شتێکی بۆ منی بەساڵاچووی لێواری مردن گێڕایەوە. ڕەنگە لەبەرئەوەی بووبێت هیچ لێی حاڵی نەبووم و نەمتوانی گوێم

لێی بێت و حەزم بە بینینی چاوە خوێن تێزاوەکانی نەدەکرد، دیسانەوە قوتووە مەرەکەبەکەی کێشایەوە بە سەرمدا. دەموچاو و جلەکانی بەری بە مەرەکەبی ڕژاو لە قوتووەکە و پێم وابێت بە خوێنی ڕژاوی من، سەرلەبەر سوور بووبوو.

زۆر خەمگین و ڕەنجەڕۆ بووم بەوەی دوایین شت لەم دنیایە دەیبینم ئەم کابرایەی دوژمنی خۆمە. پێڵووی چاوەکانم دادایەوە. یەکسەر بەدوای ئەوەدا تیشکێکی شیرین و نەرمۆکەم بینی. ئەم تیشکە چەشنی خەو، خۆش و ڕاکێشەر بوو و پێم وابوو هەر ئێستا هەموو ئازارەکانم ڕادەگرێت. لە ژوورەوە کەسێکم بینی. وەک منداڵ لێم پرسی: "تۆ کێیت؟"

گوتی: "من ئیزرائیلم. من کۆتایی بە ڕێبواریی ئادەمیزاد لەم دنیایە دەهێنم. ئەوە منم منداڵان لە دایکانیان، ژنان لە پیاوانیان، خۆشەویستان لە یەکتر و باوکان لە کچانیان جوێ دەکەمەوە. هیچ بوونەوەرێک لەم جیهانەدا نییە تووشی نەبێت بەتووشی منەوە."

کاتێک تێ گەیشتم مردن نەبێت، هیچ ڕێیەکی ترم لە بەردەمدا نەماوە، دەستم کرد بەگریان.

گریانیش لە ناخەوە تینووی دەکردم. لەلایەک، ئازارێک هەبوو تا زیاتر تاوی دەسەند مرۆڤی گێژتر دەکرد، ئەوێ جێیەکی بەپەلە و زۆردار بوو و لەوێ ڕوو و چاوەکانم نوقمی خوێن بووبوون. لەلایەکی ترەوە، شوێنێک هەبوو لەوێ پەلەپەل و زۆرداری کۆتاییان پێ دەهات، بەڵام ئەو جێیە تۆقێنەر و بەمن نامۆ بوو. لەبەرئەوەی دەمزانی ئەو دنیای مردووانەی ئیزرائیل منی بۆ بانگ کرد، ئەو دنیا ڕووناکەیە، لەو جێیە دەترسام. بەڵام لەولاشەوە تێ دەگەیشتم ماوەیەکی درێژ لەم دنیایەی من تیادا بەدەم ئازارەوە دەقیژێنم و پێچ دەخۆم، نامێنمەوە و حاڵی دەبووم لەم وڵاتی ئازاری ترسناک و ئەشکەنجەیە هیچ گۆشەیەکی ئاسوودە بۆ من نەماوەتەوە. دەتگوت بۆ ئەوەی بتوانم لەم دنیایەدا بمێنمەوە، پێویستە بەدرێژاییی ژیان شان بدەمە بەر ئەم ئازارە پشتشکێنە و ئەمەش شتێک نەبوو بەم پیرییە بەمن بکرێت.

بۆیە ماوەیەکی کورت بەر لە مردنم، خۆم ویستم بمرم. هەمان کات حاڵی بووم ئەم داخوازە سادەیە، وەڵامە بۆ پرسیاری: چۆن هەر هەموو مرۆگەل بێ هەڵاوێردە لە



مردندا سەرکەوتوو دەبن؟ ئەو پرسیارەی بەدرێژاییی ژیان خۆم پێوە ماندوو کردبوو و نەمتوانیبوو لە کتێبەکاندا وەڵامی بدۆزمەوە. هەروەها تێ گەیشتم مردن زاناترم دەکات.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بێ ئۆقرەییی کەسێک هەناومی تەنی کە تا بۆ دواجار سەیرێکی ژوورەکەی و شتومەمەکانی و ماڵەکەی نەکات، ناکەوێتە سەر ڕێی کاروانێکی درێژ. بەشپرزەیی و بەتاسەوە ویستم جارێکی تر کچەکەم ببینمەوە. ئەم داخوازەم بەئەندازەیەک بەهێز بوو کە تاوێک پێم وابوو ددانەکانم دەگوشم و بەرگەی ئێش و ئازار و تینوێتیی پەرەسەندووم دەگرم و دەتوانم چاوەڕێی کچەکەم بکەم.

بەمشێوەیە تیشکە شیرین و بکوژەکەی بەرچاوم کەمێک کز بوو و ئەقڵم دەرگاکانی خۆی بۆ دەنگ و تەقوتۆقی ئەو دنیایە کردەوە کە من خەریک بوو دەمردم و لێی دەردەچووم. دەمتوانی گوێم پێوە بێت بکوژەکەم بە ژوورەکەدا دەگەڕێت، دۆڵابەکەی کردووەتەوە، کاغەزەکانم بەسەر یەکدا دەشێوێنێت، بەهەڵچوونەوە بەدوای دوایین نیگاردا دەگەڕێت و لەبەرئەوەی بۆی نەدەدۆزرایەوە، دەستی دەخستە تاقمی بۆیاخەکانمەوە و شەقی لە سندووق، جام، قوتووی مەرەکەب و کورسییەکان هەڵدەدا. حاڵیش بووم تاوناتاوێک دەناڵێنم و قۆڵە پیرەکانم و ڕانە ماندووەکانم جووڵەی سەیر دەکەن و لنگەفرتێیانە. چاوەڕێم کرد.

ئازارەکانم ئارام نەدەبوونەوە و تا دەهات زیاتر تینووم دەبوو و چی دی نەمتوانی ددانەکانم بگوشم. دیسان تاوێکی تر چاوەڕێم کرد.

لەو ساتەدا بوو بەئەقڵمدا هات ئەگەر کچەکەم بێتەوە، ئەوا ڕووبەڕووی بکوژە نامەردەکەم دەبێتەوە، بەڵام نەمویست تەنانەت بیر لەم شتەش بکەمەوە. هەمان کات هەستم کرد بکوژەکەم لە ژوورەکە دەرچووە. لەوە دەچوو دوایین نیگاری دۆزیبێتەوە.

لە تینوێتیدا تینم تێدا نەمابوو، بەڵام دیسان چاوەڕێم کرد. کچی خۆم، شەکوورەی شۆخم، ئێ دە وەرە.

نەهات.

بڕستم لێ بڕابوو و چی دی توانای بەرگەگرتنی ئازارم نەمابوو. حاڵی بووم دەمرم و کچەکەم نابینم. ئەمە هێندە تاڵ و بەئازار بوو بۆم، ئیدی لە تاو خەم خۆزگەم

بەمردن خواست. ڕێک لەو ساتەدا لای چەپەمەوە ڕوویەکی پێشتر هەرگیز نەدیتووم لێ دەرکەوت، زەردەخەنەیەکی بۆ کردم و میهرەبانانە پەرداخێک ئاوی بۆ درێژ کردم.

هەموو شتێکم لەبیر کرد و بەتەماحەوە پەلاماری ئاوەکەم دا.

پەرداخەکەی کێشایەوە دواوە و گوتی: "بڵێ پێغەمبەر محەمەد درۆی کردووە. نکۆڵی لە گوتەکانی بکە."

ئەمە ئیبلیس بوو. وەڵامم نەدایەوە، بگرە لێشی نەترسام. لەبەرئەوەی هیچ کاتێک باوەڕم وا نەبوو نیگارکێشان واتای ئەوەیە ئیبلیس نیگارکێشی لە خشتە بردبێت، بەمتمانەوە کەوتمە چاوەڕێکردن. خەیاڵم چوو بۆ داهاتووم و ڕێبوارییی هەمیشەییم.

کاتێک فریشتەکەی ناو بازنەی تیشک، ئەوەی پێش کەمێک بینیبووم، لە هەمان کاتدا لێم نزیک کەوتەوە، ئیبلیس ون بوو. لایەکی ئەقڵم دەیزانی ئەم فریشتەیەی ناو تیشک وا ئیبلیسی قاو دا، ئیزرائیل بوو. بەڵام لایەکی تری یاخیبووی ئەقڵم بیری دەخستمەوە لە "كتاب أهوال القيامة"دا نووسراوە ئیزرائیل فریشتەیەکە هەزار باڵی هەیە، لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا کشاوە و گشت دنیای بەدەستەوە گرتووە.

لەو دەمەیدا ئەقڵم بەتەواوی شێوابوو، ئەو فریشتەیەی ناو ڕووناکی لێم نزیک کەوتەوە، بەخۆپێشاندانێکەوە وەک ئەوەی بیەوێت هاوکاریم بکات، بەڵێ، کتومت چەشنی ئەوەی لە "دورة الفاخرة"ی غەزالیدا هاتووە، بە زمانێکی شیرین گوتی:

"دەم بکەرەوە با ڕۆحتی لێوە دەربچێت."

لە وەڵامیدا گوتم: "جگە لە بیسمیلا، هیچ شتێکی تر لە دەمی منەوە دەرناچێت."

بەڵام ئەمە دوایین بیانووم بوو. لێم ڕوون بوو بەرگە ناگرم و کاتم هاتووە. لەبەر جێهێشتنی ئەم جەستە دزێو و خەڵتانی خوێنەم لەم ڕەوشە پەرێشانەدا بۆ کچەکەم، کە لەمەودا هەرگیز نایبینمەوە، تاوێک شەرم دای گرتم. وەک ئەوەی بخوازم لە پۆشاکێکی تەسک دەربچم، ویستم لەم دنیایە دەربچم.

دەمم کردەوە و گشت شتێک وەک شتەکانی ناو ئەو نیگارانەی سەردانی پێغەمبەرمان لە میعراجدا بۆ بەهەشت دەگێڕێتەوە ڕەنگی دایەوە و وەک ئەوەی زێرکفت کرابن، ڕووناکییەکی شاهانە دای پۆشین.



فرمێسکی ئازار لە چاوانمەوە سەری کرد. بەزۆر هەناسەیەک لە جگەرم و لە دەمم دەرچوو و گشت شتێک نوقمی کپییەکی شاهانە بوو.

ئێستا دەمتوانی ببینم ڕۆحم بەهێمنی لە جەستەم جیابووەتەوە و بەدەستی ئیزرائیلەوەیە. ڕۆحم هێندەی مێشە هەنگێک دەبوو و لەبەر ئەو لەرزینەی لە کاتی دەرچوونی لە جەستەم پێی کەوتبوو، بەدەستی ئیزرائیلەوە وەک جیوە دەلەرزی. بەڵام ئەقڵم لەوێ نەبوو، بگرە لای جیهانی تەواو نوێی تازە هەوارم بوو.

پاش ئەو هەموو ئازارە، ئێستا جۆرێک لە ئاسوودەیی هەناومی تەنیبوو و مردن، وەک ئەوەی لێی دەترسام، ئازاری نەدەدام، بگرە تەواو بەپێچەوانەوە، ئۆخژنم هاتبوویێ و لەو ساتەدا یەکسەر حاڵی بووم ئەم ڕەوشەی ئێستا تێیدام، هەتا هەتاییە و ئەو تەنگاوییە وەڕسکەرەشی لە ژیاندا هەستم پێ دەکرد، شتێکی کاتییە. ئیدی گشت شتێک بۆ سەدان ساڵ هەروا دەمێنێتەوە؛ نە گازندەم لەم ڕەوشە هەیە و نە لێشی ڕازیم. ئەو ڕووداوانەی سەردەمانێک بەدوای یەکدا و بەخێرایی بەسەرم دەهاتن، ئێستا لە هەمان کاتدا پەیدا بووبوون و لە مەودایەکی بێ سنووردا کشابوون و بڵاو دەبوونەوە. چەشنی ئەوەی لە نیگارێکی دوو پەڕەیی فراواندا هەیە کە نیگارکێشی قۆشمە لە هەر گۆشەیەک شتێکی جودا و دابڕاو لەوی تری کێشاوە، ئێستا گەلێک شت هەمان کات ڕوویان دەدا.

# 30

## من شەکوورەم

بەفــر هێندە بەچڕی دەباری، لە پەچەکـــەم ئاودیو دەبوو و دەچووە چاومـــەوە. لە باخچەکەی بە گیای ڕزیو و قوڕ و لق و چڵی شکاو داپۆشـراودا، بەزۆر هەنگاوم نا، بەڵام هەر ئەوەندەی گـەیشـتمـە کـۆڵان، پێم هەڵگرت. دەزانم، پەرۆشی ئەوەن بزانن بیرم لە چی کردووەتەوە. تا چ ڕادەیەک متمانەم بە قەرە هەیە؟ کەواتە با ڕاشکاوانە شتێکتان پێ بڵێم. خۆیشم پەرۆشی ئەوەم بزانم بیرم لە چی کردووەتەوە. تێ دەگەن، وا نییە؟ هۆشم جەنجاڵ و شێواوە. بەڵام سەرباری ئەوەش، لە ئێستاوە ئەم شتە دەزانم: وەک هەمیشە سەرقاڵی خواردن و منداڵەکان و باوکم و شتی تر دەبم. دوای ماوەیەکیش و بێ ئەوەی پێویست بکات من پرسیاری لێ بکەم، دڵم لە خۆیەوە و بەچرپە پێم دەڵێت چ ڕاستە و چ هەڵەیە. سبەینێ ناگاتە نیوەڕۆ بۆم ڕوون دەبێتەوە شوو بە کێ دەکەم.

شتێک هەیە دەمەوێت تەنانەت پێش ئەوەی بگەمەوە ماڵ، بۆتانی باس بکەم. نەخێر گیانەکەم، ئێستا واز لەو ئامێرە سەرقەوییەی قەرە بێنن کە پێشانی دابووم. ئەگەر بخوازن، دواتر باسی دەکەین. کرۆکی ئەوەی دەمەوێت بیڵێم، ئەم بەپەلەبوونەی قەرەیە. خۆ ئەوەش نەبێت بیرم نەکردبێتەوە چاوی جگە لە شەهوەت، شتێکی تر نابینێت. ڕاستییەکەی، ئەگەر واش بێت، هیچ شتێک لە مەسەلەکە ناگۆڕێت. ئەوەی سەرم لێ سوڕماوە، بێ مێشک بوونەکەیەتی. کەواتە هیچ بە ئەقڵیدا نایەت من بترسێنێت و لە دەستم بدات، گەمە بە ئابڕووم بکات و من لە خۆی سارد بکاتەوە و



بگرە ڕێ بۆ شتی ترسناکتریش خۆش بکات. یەکسەریش لە نیگای ڕووی خەمبارییەوە تێ دەگەم چەند حەزی لێمە و دەیەوێم. ئایا بۆچی دوای دوازدە ساڵ چاوەڕێکردن، دوازدە ڕۆژی تر بەپێی داوونەریت چاوەڕێ ناکات؟

ئەرێ دەزانن هەست دەکەم عاشقی ئەو ناجەربەزەیی و ئەو نیگا منداڵانەیەی بووم. کاتێک هەستم بەم شتە کرد کە پێویستترین کات بوو بۆ تووڕە بوونم لێی، بەڵام بەزەییم پێدا هاتەوە. دەنگێک لە هەناومەوە دەیگوت: "ئەیەڕۆ منداڵی داماوم، هەم ئەو گشت ئازارە دەچێژێت و هەم هێندەش ناجەربەزەیت." لە ناخەوە بەئەندازەیەک دەمویست بیپارێزیم تا ڕادەی ئەوەی لەوانە بوو شتێکی هەڵە بکەم و خۆم ڕاستی ئەو شملی شەڕە بکەم.

بیرم لە منداڵە بەستەزمانەکانم کردەوە و هەنگاوەکانم خێراتر کرد. لە بەفرە چڕەکە و لە تاریکایی زوو داهاتوودا، هەستم کرد پیاوێک وەک خێو بەرەو ڕووم دێت. سەرم باش دانەواند و لە ڕۆیشتن بەردەوام بووم.

هەر هێندەی لە دەرگای حەوشە چوومە ژوورەوە، دەستبەجێ حاڵی بووم خەیرییە و منداڵەکان هێشتا نەهاتوونەتەوە. باشە، هێشتا بانگی ئێوارەی نەداوە. بە پلیکانەکاندا سەرکەوتم، ماڵەکە بۆنی مورەبای نارنجی لێ دەهات؛ باوکم لە ژووری تاریک و نووتەکی خۆیەتی؛ پێیەکانم ڕچیون؛ کاتێک بە چراکەوە چوومە ژوورێ و بینیم دۆڵابەکە کراوەتەوە و سەرینەکان بەربوونەتەوە و ئەو ناوە شێوێندراوە، گوتم هەبێت و نەبێت کاری شەوکەت و ئۆرهانە. بێدەنگیی ماڵەکە، نەدەچووەوە سەر ئەو بێدەنگییەی پێشتر دەقی پێوە گرتبوو. جلی ماڵەوەم پۆشی و گەرچی بە ئەقڵمدا هات بەتەنیا لە تاریکیدا دانیشم و تۆزێک داڵغە لێ بدەم، بەڵام لە خوارەوە، ڕێک لەژێر خۆمەوە، لە ئاشپەزخانەکەوە نا، بگرە لە ژووری نیگارکێشانی هاوینەوە خشپەیەک هات. تۆ بڵێی باوکم بەم سەرمایە بۆ ئەوێ دابەزیبێت؟ بەڵام لە کاتێکدا بە خۆم گوت نایەتەوە بیرم لەوێ ڕووناکیی چرام بینیبێت، ئەمجار جیرەی ئەو دەرگایەم بەرگوێ کەوت کە لە بەردەڵانەکەوە بەڕووی حەوشەدا دەکرایەوە. دواتر، کاتێک وەڕەی سەگەلی شووم و سەربەگۆبەندی ئەودیو دەرگای حەوشەم بیست، گومانم پەیدا کرد و ترسم لێ نیشت.

هاوارم کرد: "خەیرییە، شەوکەت، ئۆرهان..."

لەتاو سەرما هەڵدەلەرزیم. ئاگردانەکەی باوکم داگیرسابوو، بەنیازی دانیشتن بەدیاریەوە و خۆ گەرمکردنەوە – ئیدی هۆشم لای قەرە نا، لای منداڵەکانم بوو –، ڕووم لە ژووری باوکم کرد. چراکەم بەدەستەوە بوو.

کاتێک بە هەیوانەکەدا تێ پەڕیم، بیرم لەوە دەکردەوە داخۆ لە خوارەوە ئاو بنێمە سەر ئاگر بۆ شۆربای ماسی یاخۆ نا؟ چوومە ژوورە دەرگا شینەکەوە، ئەو ناوە بەسەریەکدا شێوێندرابوو، لەوەدا بووم بەنیوە لە هۆش خۆچوونێکەوە بڵێم دە بڕوانە باوکم چی کردووە.

دواتر، باوکمم لەوێ، لەسەر زەوییەکە بینی.

بە سەری سوڕماوەوە قیژاندم. جارێکی تریش هاوارم کرد. دوایی سەیری تەرمی باوکم کرد و دەنگم لە خۆم بڕی.

بڕوانن، لە میانەی بێدەنگی و خوێنساردیتانەوە تێ دەگەم ئێوە دەمێکە بەهەموو ڕووداوەکانی ناو ئەم ژوورە دەزانن. هەمووشی نەبێت، زۆربەی. ئێستا پەرۆشی ئەوەن بزانن هەست بەچی دەکەم و کاردانەوەم چییە لە بەرامبەر ئەو شتانەی بینیم. وەک ئەوەی هەندێک کەس جاروبار سەیری نیگارێک دەکەن و بەبیرکردنەوە لە چۆنیەتیی گەیشتنی بەسەرهاتەکە بەو قۆناغە، دەرد و ئازاری قارەمانی ناو نیگارەکەیان بۆ ئاشکرا دەبێت، ئێوەش دواتر سەیری هەڵسوکەوتەکانی من دەکەن و لەبری تێ گەیشتن لە ئازارەکانم، هەوڵ دەدەن بەزەوقەوە تێ بگەن ئەگەر خۆتان لە جێی من بوونایە و باوکتان بکوژرایە، هەستتان بە چی دەکرد.

باشە. ئێوارە گەڕامەوە ماڵ و کەسێک باوکمی کوشتبوو. بەڵێ، کێشام بە سەری خۆمدا و قژم ڕنیەوە. بەڵێ، لە دڵەوە گریام. بەڵێ، وەک ئەوەی لە منداڵیمدا دەمکرد، تا هێزم تێدابوو لە باوەشم گرت و بۆنیم هەڵمژی. بەڵێ، تاوێکی باش لە ترساندا و لەتاو ئازار و بێکەسی هەڵلەرزیم و هەناسەم بۆ نەدرا. بەڵێ، نەمتوانی بڕوا بە چاوانم بکەم و لە یەزدان پاڕامەوە هەستێت و وەک هەمیشە لە گۆشەکەی خۆی لەناو کتێبەکانی بە بێدەنگی دانیشێت. هەستە بابە، هەستە و مەمرە، دەی بابە، هەستە بابە. بەڵام سەری خەڵتانی خوێنی وردوخاش کرابوو. لە دڕانی کاغەز و کتێبەکان،



شکاندن و پەرش و بڵاوکردنەوەی تاقمی بۆیاخ و قوتووی مەرەکەبەکان، شکاندنی هۆڤانەی کورسییەکان و مێزی قورئان و بڵاوکردنەوەی نیمدەر و هەموو شتەکانی تر و زیاتر، لەو قینەی باوکمی کوشتبوو و لەو نەفرەتە ترسام کە گشت شتێکی ناو ژوورەکەی بەوجۆرە تێکوپێک دابوو. چی دی نەدەگریام. دوو کەس بەدەم پێکەنین و قسەکردنەوە بە کۆڵانی تەنیشتدا تێ پەڕین، لە هۆشی خۆمدا کپیی بێ سنووری دنیام دەبیست و بەدەست، فرمێسکی سەر ڕووم و چڵمی لووتم دەسڕی. ماوەیەکی درێژ بیرم لە منداڵەکان و لە ژیانی خۆمان کردەوە.

گوێم بۆ بێدەنگی ڕادێرا. غارم دا. لاقەکانی باوکم گرت و بەڕاکێشان هێنامە هەیوان. لەبەرچی بوو نازانم، لەوێ کەمێک قورستر بوو، بەڵام گوێم پێ نەدا و بە پلیکانەکاندا هێنامە خوارێ. کاتێک لە ناوەڕاستی پلیکانەکاندا بڕستم لێ بڕا، دانیشتم، لەوانە بوو بگریامایە، بەڵام بە دەنگی خشپەیەکدا وامزانی خەیرییە و منداڵەکان هاتنەوە، بۆیە دیسانەوە پەلاماری لاقەکانی بابم دا و چنگم لێ قایم کرد و ئەمجارە خێراتر دابەزیمە خوارەوە. سەری باوکە نازدارەکەم بەجۆرێک پارچەپارچە بووبوو و خوێنی تێدا کۆبووبووەوە، کاتێک دەیکێشا بە پلیکانەکانیدا، دەنگێگی وەک دەنگی پارچە پەڕۆیەکی تەڕی گوشراوی لێوە دەهات. لە خوارەوە جەستەی باوکم، کە نازانم لەبەر چی بوو سووکتر بووبوو، وەرگەڕاند، بەسەر بەردەڵانەکەدا ڕام کێشا و بە هەڵمەتێک بردمە ژووری نیگارکێشانی هاوینەی تەنیشت پشتیرەکەوە. بەمەبەستی بینینی ناوەوەی ژوورە تاریک و ئەنگوستە چاوەکە، غارم دا بۆ ئاگردانی ئاشپەزخانە. کاتێک گەڕامەوە، باوکم بردە ژووری نیگارکێشان و لەبەر ڕووناکیی مۆمەکەی دەستم بینیم ئەوێش تارومار کراوە و تاوێک زمانم بەسترا.

ئەمە کێیە، پەروەردگارم، کامیانە؟

هۆشم بەخێرایی کاری دەکرد و بەدەستوبرد حسێبی زۆر شتم دەکرد. باوکم لەو ژوورە شێوێندراوە جێ هێشت و دەرگاکەم بەباشی داخست. لە ئاشپەزخانەکە سەتڵێکم هەڵگرت، لە بیرەکە ئاوم هەڵکێشا و پڕم کرد، چوومە سەرێ، لەبەر ڕووناکیی چرای پێشتر داگیرسێندراوم خوێنی هەیوانەکە و دواتریش سەر پلیکانەکانم سڕییەوە. ئەمانەم زۆر بەپەلە ئەنجام دا. چوومە ژوورەکەم لە سەرەوە،

جله خوێناوییەکانم داکەند و جلی خاوێنم پۆشی. سەتڵ و پەڕۆم بەدەستەوە بوو و لەوەدا بووم بچمە ژوورەکەی باوکم، گوێم لێ بوو دەرگای حەوشە کرایەوە. هەمان کات بانگی ئێوارەش درا. هەموو هێزی خۆم کۆکردەوە و چرا بەدەستەوە لەسەر پلیکانەکان چاوەڕێم کردن.

ئۆرهان گوتی: "یادێ، ئێمە هاتینەوە."

بەهەموو هێزی خۆمەوە هاوارم کرد، بەڵام پێم وابوو هاوار ناکەم و دەچرپێنم:

"خەیرییە، ئەوە چیتان لێ هات؟"

شەوکەت گوتی: "دایە، بەڵام نەکەوتینە دوای بانگی ئێوارە..."

"بێدەنگ بن، باپیرتان نەخۆشە، نووستووە."

خەیرییە لە خوارەوە گوتی: "نەخۆشە؟" بەڵام لە بێدەنگیی منەوە هەستی بەتووڕەبوون و هەڵچوونم کرد. "شەکوورە خاتوون، چاوەڕێی کۆستامان کرد. تا ماسیش هات، بێ ڕاوەستان خارمان کۆکردەوە. بۆ منداڵەکانیش هەنجیر و سوورە گێوژی وشکەوەکراوم کڕی."

لە ناخەوە دەمویست بچمە خوارەوە و لە خەیرییە زویر بم، بەڵام بیرم لەوە کردەوە ئەگەر بچمە خوارەوە، ئەوا چراکەی دەستم پلیکانە تەڕەکان و ئەو دڵۆپە خوێنانەی لەتاو پەلەپەل بۆم نەسڕابووەوە، ڕووناک دەکاتەوە. منداڵەکان تەپ و هوڕ بە پلیکانەکاندا سەرکەوتن و پێڵاوەکانیان داکەند.

بەدەم پاڵ پێوەنانیانەوە بۆ ژوورەکەی خۆمان، گوتم: "ششششت، باپیرتان نووستووە، مەچنە ئەولا."

شەوکەت گوتی: "دەچمە کن ئاگردانی ژوورە دەرگا شینەکە، ناچمە کن باپیرم."

بەچرپە گوتم: "باپیرتان لەوێ خەوی لێ کەوتووە."

بەڵام بینیم هەڵوێستەیەکیان کرد و تاوێکیش ڕاوەستان. گوتم: "بۆ ئەوەی ئەو جنۆکە خراپانەی چوونەتە لەشی باپیرتانەوە و نەخۆشیان خستووە، دەستتان لێ نەوەشێنن. دەی بڕوانم، بچنە ژوورەکەی خۆتان." دەستی هەردووکیانم گرت، بردمنە ئەو ژوورەی تیایدا لە باوەشی یەکدیدا دەنووستین. "ئادەی پێم بڵێن تا ئێستا چیتان دەکرد لە کۆڵانان؟"



شەوکەت گوتی: "دەرۆزەکەرانی عەرەبمان بینی." پرسیم: "لە کوێ؟ ئالایان پێ بوو؟" ئۆرهان گوتی: "لە هەورازەکە. لیمۆیەکیان دا بە خەیرییە. ئەویش پارەی دانێ. بەفر، پۆشاکی بەریان و سەروچاویانی داپۆشیبوو." "چی تر؟" "لە مەیدانەکە تیریان دەگرتە نیشان. " گوتم: "هەر ئەوەندە؟" شەوکەت گوتی: "دایە، من سەرمامە، دەچمە ژوورە دەرگا شینەکە." گوتم: "لەم ژوورە ناچنە دەرێ، ئەگەرنا، دەمردن. ئێستا خۆم ئاگردانەکەتان بۆ دێنم بۆ ئێرە." شەوکەت گوتی: "بۆچی دەمرین؟" گوتم: "شتێکتان بۆ دەگێڕمەوە، بەڵام نابێت بۆ کەسی بگێڕنەوە. تێ گەیشتن؟" بەڵێنیان دا بە کەسی تری نەڵێن. "ئەو کاتەی ئێوە لە کۆڵان بوون، پیاوێکی سپیی ڕەنگپەڕیوی ڕەنگی مردوو لێ نیشتوو، زۆر لە دوورەوە، لە وڵاتێکی ترەوە هاتە ئێرە و لەگەڵ باپیرتان قسەی کرد. تومەز ئەمە جنۆکە بوو." پرسییان ئەو جنۆکەیە لە کوێوە هاتووە. گوتم: "لەوبەری ڕووبارەکەوە." شەوکەت گوتی: "لەو شوێنەوە کە باوکمی لێیە؟" گوتم: "بەڵێ، لە وێندەرێوە. ئەو جنۆکەیە بۆ سەیرکردنی نیگارەکانی ناو کتێبەکانی باپیرتان هاتبوو. دەگوترێت هەر گوناهکارێک سەیری ئەو نیگارانە بکات، دەمودەست دەمرێت."

بێدەنگییەک هاتە ئاراوە.

گوتم: "بڕوانن، من دەچمە خوارێ بۆ کن خەیرییە. ئاگردانەکەش دێنمە ئێرە، سینیی خواردنەکەش. دەستم بە دامێنتان نەڵێن لە ژوورەکە دەردەچین، ئەگەرنا، دەمرن، چونکە ئەو جنۆکەیە هێشتا لەماڵەوەیە."

ئۆرهان گوتی: "دایە، دایە مەڕۆ."

ڕووم لە شەوکەت کرد و گوتم: "تۆ بەرپرسیاری لە براکەت. ئەگەر دەرچنە دەرەوە و جنۆکە دەستتان لێ نەوەشێنێت، خۆم دەتانکوژم." ئەو نیشانە تۆقێنەرەم خستە سەر ڕووم کە هەموو جارێک پێش لێدانیان دەینوێنم. "ئێستا بپاڕێنەوە بۆ ئەوەی باپیرە نەخۆشەکەتان نەمرێت. ئەگەر باش بن، خوا پاڕانەوەکەتان قەبووڵ دەکات. کەسیش دەستتان بۆ نابات." بێ ئەوەی زۆر خۆیانی پێوە ماندوو بکەن، دەستیان بە پاڕانەوە کرد. چوومە خوارەوە.

خەیرییە گوتی: "یەکێک مورەبای نارنجەکەی قلێپ کردووەتەوە. ئەگەر بڵێم

پشیلەیە، ئەوا پشیلە هێزی ئەوەی نییە. سەگیش نایەتە ماڵەوە..."

لەپڕ نیشانەی سەرسوڕماویی بە ڕوومەوە بینی و لە جێی خۆی وشک بوو. گوتی: "خێرە، چ قەوماوە؟ ئایا شتێک لە بابا ئەفەندیتان ڕووی داوە؟"

"مرد."

قیژەیەکی کرد. چەقۆ و پیازەکەی دەستی هێندە بەهێز بە تەختەکەدا کێشا، ئەو ماسییانەی بڕیبوونی، پەرش و بڵاو بوونەوە. قیژەیەکی تریشی کرد. هەمان کات بینیمان ئەو خوێنەی بەدەستی چەپییەوە بوو، خوێنی ماسییەکە نەبوو، بگرە خوێنی پەنجەی دۆشاومژەی بوو و لە قیژەی یەکەمدا بڕیبووی. بە ڕاکردن چوومەوە سەرێ، کاتێک لە ژوورەکەی بەرامبەر بەدوای پارچە خامێکدا دەگەڕام، گوێم لێ بوو لە ژووری منداڵەکانەوە هەرا و زەنا و قیژ و قاو دەهات. پارچە قوماشێکم بڕیبوو و بە دەستمەوە بوو و بەو حاڵەوە چوومە ژوورەوە. شەوکەوت خۆی دابوو بەسەر ئۆرهاندا، ئەژنۆکانی لە شانی قایم کردبوو و دەیقیژاند بەسەریدا.

هەتا هێزم بڕی کرد، قیژاندم: "ئەرێ ئەوە ئێوە چ دەکەن"

شەوکەوت گوتی: "ئۆرهان لە ژوورەکە دەردەچوو."

ئۆرهان گوتی: "درۆیە، شەوکەت دەرگای کردبووەوە، گوتم مەڕۆ دەرێ." دایە پرمەی گریان.

"ئەگەر بێدەنگ دانەنیشن، هەردووکتان دەکوژم."

ئۆرهان گوتی: "دایە مەڕۆ."

لە خوارەوە، پەنجەی خەیرییەمان پێچا و خوێن چوونەکەیمان ڕاگرت. کاتێک گوتم باوکم بە مردنی ئاسایی نەمردووە، ترسا و دەستی کرد بە خوێندنی نزای خوایە بمانپارێزە. سەیری پەنجە بریندارەکەی خۆی کرد و گریا. ئایا بەئەندازەی گریان و چاو هەڵگڵۆفینەکەی باوکی منی خۆش دەویست، یان هەر هێندەی گریانەکەی خۆشی دەویست؟ ویستی بچێتە سەرێ و باوکم ببینێت.

گوتم: "لە سەرەوە نییە، لە ژوورەکەی پشتەوەیە."

بەگومانەوە سەیری ڕووی کردم. بەڵام کاتێک حاڵی بوو من ناتوانم برۆم و تەماشا بکەم، ئەو نەیتوانی بەسەر پەرۆشی و ترسی خۆیدا زاڵ بێت. چرای هەڵگرت و



ڕۆیشت. لە شوێنی خۆمەوە، لە دەروازەی ئاشپەزخانەکەوە بینیم چوار پێنج هەنگاو بە بەردەڵانەکەدا ڕۆیشت، بەرێز و بە نیگەرانییەوە پاڵێکی لەسەرەخۆی بە دەرگای ژوورەکەوە نا و لەبەر ڕووناکیی چراکەی دەستی سەیری ناو ژوورە شێوێندراوەکەی کرد. لەبەرئەوەی لە پێشدا باوکمی نەدی، چراکەی بەرزتر کردەوە و هەوڵی دا گۆشەکانی ژوورەکە ڕووناک بکاتەوە.

دوایی هاواری کرد و گوتی: "ئاخ" باوکمی لە پشت دەرگا، لەو شوێنەی من لێم دانابوو، دیبوو. بێ ئەوەی جووڵە بکات، سەیری باوکمی کرد. سێبەرەکەی بەسەر بەردەڵان و دیواری گەوڕەکەوە هیچ جووڵەی نەدەکرد. لە کاتێکدا ئەو تەماشای دەکرد، منیش خەیاڵم چوو بۆ ئەو شتەی ئەو دەیبینێت. گەڕایەوە و لە هاتنەوەیدا نەدەگریا. کاتێک بینیم هێندە هۆشی بەخۆی هەیە بتوانێت قسەکانم بکاتە ئەڵقە و لە گوێی بکات، دڵخۆش بووم.

دەستم لە خۆیەوە پڕی دابووە چەقۆی ماسییەکە و ڕای دەوەشاند و قسەم دەکرد.

"خەیرییە، ئێستا گوێم لێ بگرە، نهۆمی سەرەوەش تێک دراوە بەسەر یەکدا. ئەو ئیبلیسە شوومە، چووەتە ئەوێش و گشت شتێکی شکاندووە و ڕژاندوونی بەسەر یەکدا. کون و قوژبن گەڕاوە. لەوێ سەر و ڕووی باوکمی پارچەپارچە کردووە و کوشتوویەتی. با منداڵەکان نەترسن و بۆ ئەوەی تۆش لەسەرەتادا نەترسیت، باوکم هێنایە خوارێ. لەدوای ئێوە، منیش دەرچووبووم. باوکم بەتەنیا لە ماڵەوە بوو."

بێ ئابڕووانە گوتی: "نەمدەزانی، لە کوێ بوویت؟"

کەمێک بێدەنگ بووم، ویستم بەباشی هەست بەبێدەنگبوونەکەم بکات. دوایی گوتم: "لەگەڵ قەرە بووم. لە ماڵی جووە هەڵواسراوەکە یەکترمان بینی. بەڵام نابێت ئەمە لە کن هیچ کەسێک بدرکێنی. جارێ بە کەسیش ناڵێی باوکم کوژراوە."

"کێ کوشتوویەتی؟"

ئەرێ بەڕاستیش ساویلکە بوو، یان بۆ تەنگاوکردنی من وای دەکرد؟

گوتم: "ئەگەر بمزانیبایە، ئەوا مردنەکەیم نەدەشاردەوە. نازانم. تۆ دەزانیت؟"

گوتی: "من چووزانم، ئێستا چ بکەین؟"

گوتم: "وا دەکەیت وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت." لە ناخەوە دەمویست بدەمە پرمەی

گریان، بەڵام کپ بووم. تاوێک، دووبەدوو بێدەنگ بووین.

زۆر دواتری گوتم: "ئێستا واز لە ماسی بهێنە، دەستبەجێ خوان بۆ منداڵان ڕابخە."

کاتێک دەستی کرد بە نووزەنووز و گریا، لە ئامێزم گرت و توند باوەشمان بەیەکدا کرد. تاوێک بەتەنیا دڵم هەر بەخۆم و منداڵان نا، بە ئەویش سووتا و خۆشم ویست. لەلایەکی دی، چەندی زیاتر لە ئامێزم دەگرت، لە ناخەوە گومانم پەیدا دەکرد. ئێوە دەزانن کاتێک باوکم کوژرا، من لە کوێ بووم. ئاگادارن من خەیرییە و منداڵەکانم لە ماڵ دوور خستەوە و دەزانن ئەمەم بەنیازێکی ترەوە کرد و ڕێکەوتەکانیش بەدوای یەکدا ڕیزیان بەست... بەڵام ئایا خەیرییە بەمە دەزانێت؟ ئەگەر مرۆڤ بۆی باس بکات، تێ دەگات؟ هەم تێ دەگات و هەم گومانیش دەکات. زیاتر و زیاتر بەخۆمەوە نووساند؛ بەڵام کاتێک خەیاڵم چوو بۆ ئەوەی لەوانەیە بە ئەقڵی کەنیزەکیی خۆیەوە وای بۆ بچێت من بۆ شاردنەوەی فڕوفێڵەکانی خۆم وا دەکەم، خۆم وەک کەسێک هاتە بەرچاو بخوازێت فریوی بدات. کاتێک باوکم لێرە دەکوژرا، من چووبوومە کن قەرە و چێژمان لە یەکدی وەردەگرت. ئەگەر تەنیا خەیرییە بەم ئەقڵەوە بیری بکرداباتەوە، هێندە هەستم بە تاوانباری نەدەکرد، بەڵام گرفتەکە لەوەدایە دەزانم ئێوەش بەهەمان شێوە بیر دەکەنەوە. وەی کڵۆڵ و داماو خۆم وەی، وەی بەدبەخت و ڕەنجەڕۆ خۆم وەی، بەمجۆرە، کاتێک من دەستم بەگریان کرد، خەیرییەش گریا و دیسانەوە باوەشمان بەیەکدا کردەوە.

لەسەر ئەو خوانەی لە سەرەوە ڕامان خست، وا خۆم پێشان دا وەک ئەوەی بخۆم و خۆم تێر بکەم. ناوبەناو دەمگوت با بڕۆم سەرێک لە باپیرتان بدەم، دەهاتمە دەرێ و فرمێسکم دەڕشت. منداڵەکان لەبەرئەوەی کەوتبوونە گومانەوە، کاتێک چووینە جێگاوە، لێم نزیک بوونەوە و خۆیان پێوە نووساندم. لە ترسی جنۆکە، ماوەیەکی درێژ خەویان لێ نەکەوت و تاوناتاوێک دەیانگوت: "دەنگی تەقەتەقێک دێت، گوێت لێ بوو؟" بەڵێنی گێڕانەوەی داستانێکی ئەڤینم پێ دان بۆ ئەوەی بەئاسانی خەویان لێ بکەوێت. ئەنگۆ دەزانن، وشەکان لە تاریکیدا باڵ دەگرن.

شەوکەت گوتی: "دایە، شوو بەکەس ناکەیت، وا نییە؟"



گوتم: "ئێستا گوێ ڕاگرە. هەبوو نەبوو شازادەیەک هەبوو، لە دوورەوە دڵی چووبووە کچێکی سەرتۆپی جوانان. ئەمە چۆن بووە؟ لەبەرئەوە بەر لە بینینی شۆخی شۆخان خۆی، نیگارەکەی بینیوە."

وەک ئەوەی لە ڕۆژانی بەختەڕەشی و خەمگینیی خۆمدا دەمکرد، داستانەکەم بەشێوەیەک هەڵبەست و گێڕایەوە چەشنی ئەوەی شتێک بێت لەو ساتەدا بەخەیاڵمدا هاتبێت، نەک پێشتر زانیبێتم. لە سۆنگەی ئەوەی داستانەکەم بەڕەنگی ختوورەکانی دڵم و بیروەری و ئازارەکانم هۆنییەوە، قسەکانم لە نەخشێکی خەمگین دەچوو و هاوڕێیەتیی بەسەرهاتەکانی خۆمی دەکرد.

دوای نووستنی منداڵەکان، لە پێخەوی گەرم هاتمە دەرێ و لەگەڵ خەیرییە دەستمان کرد بە کۆکردنەوەی ئەو شتومەکانەی ئیبلیسی قێزەون پەرش و بڵاوی کردبوونەوە. کاتێک یەک بەیەکی سندووق و کتێب و قوماشە تێکدراوەکان، پەرداخ و قاپ و قوتووی مەرەکەبە شکاوەکان، کورسییە لەتکراوەکە، قاپی ڕەنگ و ئەو کاغەز و پەڕانەی بە نەفرەتەوە دڕێندرابوون و فڕێ درابوون، کۆ دەکردەوە، هەر جارەی یەکێکمان تاوێک دەستی لە کارەکەی هەڵدەگرت و دەگریا. وەک بڵێی لە خەمی کوشتنی باوکم زیاتر، خەمی تێکدانی ناو ژوورەکان و پەرش و بڵاوکردنەوەی شتومەکەکان و ئەو دەستدرێژییە دڕندانەی سەر ئابڕوومان بوو. من لە ئەزموونی خۆمەوە دەزانم؛ ئەوانەی کەسێکی خۆشەویستیان دەمرێت، خوویەکیان هەیە بۆ ئەوەی دڵی خۆیانی پێ خۆش بکەن، پێیان وایە هەموو شتێک لە ماڵەوە وەک ئەوەی هەبووە، دەگوزەرێت و بەوە لە خشتە دەچن پەردە و سەرپۆشی سەر مێزەکان و تیشکی هەتاو، وەک ئەوەی لە ڕابردوودا هەبووە، دێتە بەرچاو و جاروبار ناخوازن باوەڕ بکەن ئیزرائیل زۆر لەمێژە کەسی خۆشەویستی ئەوانی بردووەتەوە. تێکوپێکدانی دڵڕەقانەی ئەم ماڵەمان، کە باوکم بە پشوودرێژی و ئەڤینەوە بۆی دەڕوانی و بەوردی دەرگا و گۆشەکانی نەخشاندبوو، سەبووری و خەیاڵێکی لەو جۆرەی بۆ ئێمە نەهێشتبووەوە. سەرباری ئەوەش، تێکدانی ماڵەکەمان ئەو دڵڕەقییە دۆزەخییەی بیرمان دەخستەوە کە ئەم ڕەفتارەی لێ وەشابووەوە و ئەمەش دەیترساندین.

بۆ نموونە؛ دوای ئەوەی لەسەر داخوازی من چووینە خوارەوە، لە بیرەکە ئاوی تازەمان هەڵکێشا و دەستنوێژمان گرت و کاتێک لەو قورئانە دەستنووسەی هەرات، کە باوکی خوا لێخۆشبووم زۆری خۆش دەویست، سوورەتی "آل عمران"م دەخوێندەوە – باوکم زۆر حەزی لەم سوورەتە بوو و دەیگوت هەمان کات باسی ئومێد و مردنیش دەکات –، هەردووکمان بەو ترسەوە هەستمان کرد جیرەی دەرگای حەوشە دێت، بەڵام ئەمە درێژەی نەکێشا. نیوەی شەو، دوای ئەوەی پێکەوە شمشێرەی دەرگای حەوشەمان دا و ئینجانەی ئەو ڕەیحانەیەمان خستە پاڵی کە باوکم بەیانیانی بەهاران خۆی ئاوی لە بیر هەڵدەکێشا و ئاوی دەدا و کاتێک هاتینە ژوورەوە، تاوێک پێمان وابوو سێبەری کشاوی بەر ڕووناکیی چراکەی دەستمان، سێبەری کەسانێکی ترن. دەمگوت جگە لەوەی دەبوو قەبووڵی بکەم باوکم بە فەرمانی خوا مردووە، هیچ چارەیەکی ترم نەبوو و هەرە زۆریش، کاتێک ڕووە خوێناوییەکەیمان دەشووشت و بە بێدەنگی جلەکانیمان دەگۆڕی –خەیرییە بەچرپە گوتی دەستیم لەژێرەوە بدەرێ–، ترسێکی وەک جۆرێک لە پەرستنی بێدەنگ هەناومانی داگرتبوو و ترساندبوومانی.

پاش ئەوەی جلەکانی سەرەوە و ژێرەوەی باوکمان داکەند، ئەو شتەی سەری ئێمەی هێنایە سوڕ و پێی سەرسام بووین، پێستی باوکم بوو کە لەبەر ڕووناکیی مۆمی ناو ژوورە تاریکەکە ڕەنگێکی سپی و پڕ لە ژیانی لەخۆ گرتبوو: هەردووکمان، لەبەرئەوەی لەتاو شتێکی مایەی هەڕەشەی زیاتر ناوبەناو دەلەرزین و دەترساین، هیچ شەرممان نەدەکرد سەیری تەرمی پڕ لە خاڵ و برینداری لەوێدا سەربەستانە درێژکراوی باوکم بکەین. کاتێک خەیرییە بۆ هێنانی جلەکانی ژێرەوەی و کراسە ئاوریشمینە ڕەنگ سەوزەکەی چووە سەرێ، من خۆم بۆ ڕانەگیرا و سەیرێکی هەرامەی باوکی بەستەزمانم کرد و زۆریش لەم کارەم پەشیمان بوومەوە. دوای ئەوەی جلی خاوێنمان کردە بەری و بەوردی خوێنی لامل و ڕوو و سەر و قژیمان سڕییەوە، تا گوڕم تێدا بوو باوەشم پێدا کرد. لووتم خستە ناو ڕیشی، تێر تێر بۆنم کرد و تاوێکی درێژ گریام.

بەو کەسانەی من بە بێ ویژدان، بگرە بە تاوانبار دەزانن، دەڵێم دوو جاری تریش گریام: ١– کاتێک لە ژوورەکەی سەرەوە منداڵەکانم بردە دۆخێکەوە هەست نەکەن چ



قەوماوە، وەک ئەوەی لە منداڵییەوە خووم پێوە گرتبوو، مووروویێکی ناو گوێچکە ماسیم نایە گوێمەوە و هەستم کرد دەنگی دەریا لە کزیی داوە. ٢– کاتێک بینیم ئەو نیمدەرە قەدیفە سوورەش، کە باوکم بیست ساڵی دوایی هێندە لەسەری دانیشتبوو، بووبوو بەبەشێک لە سمتی، دڕێندرابوو.

دوای ئەوەی جگە لەو زیانانەی لەقەرەبووکردنەوە نەدەهاتن، هەموو شتومەکەکانی تری ناو ماڵمان گەڕاندەوە دۆخی کۆن، داخوازیی خەیرییەم بۆ ڕاخستنی جێگاکەی بۆ ئەمشەو لە ژووری ئێمە، بێبەزەییانە ڕەت کردەوە. پێم گوت: "با سبەینێ منداڵەکان نەکەونە گومانەوە." بەڵام ڕاستییەکەی، بۆ ئەوەم بوو خۆم بەتەنیا لەگەڵ منداڵەکان بم و خەیرییە سزا بدەم. چوومە جێگاوە، تا ماوەیەکی درێژ خەوم لێ نەکەوت. بەهۆی ئەوەوە نا بیرم لە ترسناکیی ئەو بەڵایە کردبێتەوە کە بەسەرم هاتبوو، بگرە لەبەرئەوەی حسێبی ئەو شتانەم دەکرد کە لە داهاتوودا بەسەرم دێن.

# 31

## من ناوم سووره

کاتێک فیردەوسیی شاعیری شانامە هاتە غەزنە و پاشان شاعیرانی کۆشکی شا مەحموود بەبیانووی ئەوەی دێهاتییە، سووکایەتییان پێ کرد و ئەویش نیوە بەیتی کۆتاییی چوارینەیەکی گوت کە سێ بەیتی یەکەمی بە سەروایەکی دژوار کۆتاییان دەهات و کەس بۆی تەواو نەدەکرا، من لەوێ بەسەر سەڵتەکەی فیردەوسییەوە بووم. گاڤێک ڕۆستەمی قارەمانی ئەفسانەییی شانامە بەدوای ئەسپە ونبووەکەیدا چووە وڵاتانی دوور، من بەسەر تیردانەکەیەوە بووم. ئەو دەمەی بە شمشێرە بێ وێنەکەی دێوی ئەفسانەییی دوولەت کرد، من لە خوێنی سەرکردووی دێوەکەدا بووم. چاخێک لە ماڵی شای خانەخوێ شەوی بەدەم جووتبوونەوە لەگەڵ کچی پادشادا بەسەر برد، من لە چرچ و لۆچی لێفەکەیدا بووم. لە هەموو شوێنێکدا بووم و وام لە گشت جێیەک. کاتێک توور نامەردانە ئیرەجی برای سەربڕی، گاڤێک سوپای ئەفسانەییی جوانی وەک خەون لە دەشت و دەران پێکدا هەڵدەپرژان و کاتێک ئەسکەندەر لەبەرئەوەی گرە لێی دابوو، یەکبین خوێن لە لووتی جوانی دەچوو و خوێنەکەی لەبەر تیشکی ڕۆژ باق و بریسکی بوو، من لەوێ بووم. بەهرام گویری پادشای ساسانی هەر ڕۆژێکی هەفتە، شەوی لەگەڵ شۆخێکی شاهانەی لە هەرێمێکی دوورەوەهاتوو لەژێر قوبەیەکی ڕەنگ جیاوازدا بەسەر دەبرد و گوێی بۆ بەسەرهاتی ڕادەگرت. من بە جلوبەرگی ئەو شۆخە نازدارە بووم کە شا بەهرام گویر بەبینینی نیگارەکەی عاشقی بووبوو و ڕۆژانی سێشەم دەچووە سەردانی. من هەر لە تاجی خەسرەوەوە،



کە شیرین بە بینینی نیگاری شەیدای بووبوو، تا دامێنی سەڵتەکەی، بەهەموو جلوبەرگەکانییەوە بووم. بەسەر ئاڵای سوپایانی گەمارۆدەری قەڵاکانەوە و بە سەرپۆشی خوانی میوانداریییەوە بووم. بەسەر سەڵتەی قەدیفەی ئەو باڵوێزانەوە بووم کە پێی سوڵتانەکانیان ماچ دەکرد. لە شوێنی کێشانی نیگاری ئەو شمشێرە بووم کە منداڵان شێت و شەیدای بەسەرهاتەکانی بوون. لەژێر نیگای شاگردانی چاو جوان و وەستایاندا بە فڵچەی زراف درام لە کاغەزی ئەستووری لە هندستان و بوخاراوە هاتوو. من، خاولیی ئوشاق،(*) خەملاندنی دیوار، ئەو کراسانەی ژنانی جوان و سەر دانەواندوو لەو کاتەی لە چوارچێوەی پەنجەرەوە سەیری کۆڵانیان دەکرد، لەبەریان دەکرد؛ پۆپنەی کەڵەشێری بەشەڕهاتوو؛ میوە و هەناری ئەفسانەییی وڵاتانی ئەفسانەیی؛ دەمی ئیبلیس؛ هێڵی باریک و زراڤی ناو چوارچێوە؛ نەخش و نیگاری پێچ و پەنای چادران؛ ئەو گولیلکەی نیگارکێش بۆ کەیف و سەفای خۆی دەیکێشێت و تەنیا بەچاوی ڕووت دەبینرێت؛ چاوی لە گێلاس دروستکراوی پەیکەری مەلی لە شەکر چێکراو؛ گۆرەویی شوانان؛ کازیوەی ئەفسانەیی و جەستە و برینی هەزاران، بگرە دەیان هەزار سەرباز و پادشا و ئەڤیندارم پێشان دا. پێم خۆشە بدرێم لەو جڤاتی شەڕانەی خوێن وەک گوڵ تیایاندا دەپشکوێت و دەم دەکاتەوە، لە سەڵتەی لێهاتووترین شاعیر کاتێک کوڕانی شۆخ و شاعیران لە دەشت و چۆڵەوانی شەراب نۆش دەکەن و گوێ لە مۆسیقا دەگرن، لە باڵی فریشتە، لە لێوی ژنان، لە برینی مردووان و لە سەری بڕاوی خەڵتانی خوێنیان.

پرسیارەکەتان دەبیستم: بوون بەڕەنگ چ هەستێکە؟

ڕەنگ، تەماسی چاو و مۆسیقای کەڕانە و وشەیەکە لە تاریکیدا. لەبەرئەوەی دەیان هەزار ساڵە لە کتێبەوە بۆ کتێب و لە ئامێرەوە بۆ ئامێر وەک گڤەی با ئاخاوتنی ڕۆحەکان دەبیستم، دەبێت بڵێم، دەست پێوەدانی من، وەک دەست پێوەدانی فریشتە وایە. لایەکم لێرە بانگی چاوانی ئێوە دەکات؛ ئەوە لایەنی گرانمە. لایەکیشم لەگەڵ نیگاکانی ئێوە بە ئاسماندا دەفرێت؛ ئەوەش لایەنی سووکمە.

---

(*) ئوشاق: شارێکە لە ڕۆژئاوای تورکیا و ئێستاش وەک ڕابردوو، مەڵبەندێکی بەناوبانگی ڕستن و چنینە. - وەرگێڕ -

ئای چەندە کامەرانم لەپای سووربوونم، هەناوم دەسووتێت؛ بەگوڕ و تینم؛ دەزانم هەستم پێ دەکرێت و دەشزانم خۆتان بۆ ڕاناگیرێت لە بەرامبەرمدا.

خۆم ناشارمەوە: ئەمەشم بە زراقی و لاوازی یان بێهێزی بۆ پێک نایەت، تەنیا بەبەبڕیارداری و ویست بۆم مەیسەر دەبێت. خۆم دەسەلمێنم. لە ڕەنگەکانی تر و لە سێبەر و جەنجاڵی یان لە تەنیایی ناترسم. چەند جوانە کاتێک ڕووبەرێکی بەندەواری خۆم بە ئاگری سەرفرازیم پڕ دەکەمەوە. لەو شوێنەی منی لێ بڵاو دەبمەوە، چاوان دەدرەوشێنەوە، شەیدایی تاو دەسێنێت، برۆکان ڕاست دەبنەوە و لێدانی دڵ خێرا دەبێت. بۆم بڕوانن؛ ژیان چەند خۆشە. سەیرم بکەن؛ بینین چ خۆشە. ژیان بینینە. لە هەموو جێیەک دەبینرێم. باوەڕم پێ بکەن ژیان لەگەڵ مندا دەست پێ دەکات و هەموو شتێک بۆ من دەگەڕێتەوە.

ئێ دە بێدەنگ بن و گوێ بگرن و بزانن چۆن سوورێکی وا نایابم. مامۆستای نیگارکێشی شارەزای بۆیاخ، باشترین سوورە مەگەزی وشکەوەکراوی لە گەرمترین ناوچەی هندستانەوە هاتووی لە هاواندا بە دەسکی هاوان کوتا و کوتا تا کردی بە تۆزێکی باش. لەمە پێنج درهەم و درهەمێک گیای سابوون و نیو درهەمیش لۆتۆری(*) ئامادە کرد. سێ هۆقە ئاوی کردە مەنجەڵێکەوە، گیای سابوونەکەی تێ هاویشت و تیایدا کوڵاندی. پاشان لۆتۆرەکەی کردە ئاوەکەوە و جوان تێکی دا. بەئەندازەی ماوەی خواردنەوەی قاوەیەکی بەچێژ، کوڵاندی. کاتێک ئەو قاوەکەی دەخواردەوە، من چەشنی ئەو منداڵەی دوای کەمێکی تر لەدایک دەبێت، ئۆقرەم لێ بڕابوو. دوای ئەوەی قاوەکە مێشکی ساف کرد و وەک جنۆکە چاوەکانی کردەوە، تۆزە سوورەکەی کردە مەنجەڵێکەوە، بە یەکێک لەو چیلکە باریکانەی بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێندرا، جوان تێکی دا. ئێستا لەوەدا بووم ببم بە سوورێکی ڕاستەقینە، بەڵام پێکهاتەی من ئەوەندە گرینگە کە هەم پێویست دەکات ئاوەکە لەخۆڕا نەکوڵێت و هەم کەمێکیش بێتە کوڵ. بە نووکی چیلکەی باریک کەمێک ئاوی هەڵگرت و لە نینۆکی پەنجە کەڵەی گرت. (پەنجەکانی تر بەهیچ جۆرێک دەست نادەن.) ئاه

(*) لۆتۆر: گوڵی لۆتۆس، لە هندستان بەسەر ئاوەوە سەوز دەبێت و گەشە دەکات و گوڵێکی زۆر پیرۆزە بەلای پەیڕەوانی ئاینی هندۆسییەوە. – وەرگێڕ –



شتێکی چەند خۆشە ئەگەر سوور بیت. نینۆکیم سوور کرد، وەک ئاو بە قەراغی نینۆکیدا نەهاتمە خوارێ؛ پێکهاتەکەم باش بوو، بەڵام تڵپ و خڵتەم هەبوو. مەنجەڵی لەسەر ئاگر هێنایە خوارێ و منی بە پارچە قوماشێکی پاک و خاوێن پاڵاوت. بێگەردتر بووم. دواتر خستمیەوە سەر ئاگر، دوو جاری تر کوڵاندمیەوە و کەفی پێ کردم، کەمێک زاخی کوتراوی بەسەرمدا کرد و دایانم بۆ ساردبوونەوە.

چەند ڕۆژێک تێپەڕین، لەوێ، بێ ئەوەی خۆم لە قەرەی هیچ شتێک بدەم، لە مەنجەڵدا مامەوە. کاتێک لە ناخەوە ئارەزووم دەکرد لە هەموو پەڕەیەک و گشت جێیەک و هەموو شوێنێک بدرێم، مانەوەم لەم دۆخەدا منی دڵگران دەکرد. لەم بێدەنگییەدا بیرم لەوە کردەوە داخۆ سووربوون واتای چ دەگەیەنێت؟

جارێکیان لە شارێکی عەجەم، کاتێک بە فڵچەی شاگردێک دەدرام لە زینی نیگاری ئەسپێکی لەبەر کێشراو بەدەستی نیگارکێشێکی کوێر، گوێم لە دەمەتەقێی نێوان دوو مامۆستای نیگارکێشی کوێر بوو.

ئەو نیگارکێشە کوێرەی نیگاری ئەسپەکەی لەبەر کێشابوو، گوتی: "ئێمە، بێگومان لەبەرئەوەی بەدرێژاییی ژیانی نیگارکێشیمان بەشەوق و باوەڕەوە کارمان کردووە و دواجار کوێر بووین، دەزانین و دێتەوە بیرمان سوور ڕەنگێکی چۆن و هەستێکی چۆنە."

"بەڵام ئەگەر بە کوێری لەدایک بووباین، چۆن لەو سوورە تێ دەگەیشتین کە ئێستا شاگردە جوانەکەمان ڕەنگی پێ دەکات؟"

ئەوی تریان گوتی: "ئەمە مەسەلەیەکی خۆشە، بەڵام ڕەنگ بۆ تێگەیشتن نابێت، هەستی پێ دەکرێت."

"مامۆستام، بۆ کەسێکی بگێڕەوە لە هەستی ڕەنگی سوور بێ ئاگا بێت."

"ئەگەر نووکی پەنجەمان پێوە بدایە، لە نێوان ئاسن و مسدا دەبوو. بمانخستبایە لەپی دەستمانەوە، دەیسووتاند. تاممان بکردبایە، وەک گۆشتێکی سوێر بەری دڵی دەگرت. بۆ دەممان ببردایە، پڕی دەکرد. بۆنمان بکردبایە، بۆنی ئەسپی لێ دەهات. ئەگەر بۆنی گولیلکی لێ بهاتبایە، وەک بەیبوون و نازناز دەچوو، نەک گوڵی سوور."

لەبەرئەوەی ئەو سەردەمانە، واتە سەد و دە ساڵ لەمەوبەر، نیگاری فەڕەنگی

هەڕەشەیەکی ئەوتۆ نەبوو تا پادشاکان بایەخی پێ بدەن و مامۆستایانی گەورە و ئەفسانەییش چەشنی باوەڕیان بە خوا، باوەڕیان بە شێوازی خۆیشیان هەبوو، کاتێک مامۆستایانی فەرەنگ ڕەنگی سووری جۆراوجۆریان لە برینی ئاساییی شمشێر یان تەنانەت لە پارچە چۆغەی هەرە هەرزاندا بەکار دەهێنا، ئەمان بەجۆرێک لە بێڕەوشتی و نەزانییان دادەنا و پێکەنیان پێ دەهات. دەیانگوت تەنیا نیگارکێشی نەزان و بێ بڕیار و بێ ویست ڕەنگی سووری جیاواز بۆ سوورایی سەڵتەیەک بەکار دەهێنێت. ناکرێت سێبەر بکرێت بەبیانوو. ئاشکرایە تەنیا هەر سوورێک هەیە و بەتەنیا متمانە بەوی دەکرێت.

ئەو نیگارکێشە کوێرەی نیگاری ئەسپەکەی لەبەر کێشابوو، دیسان پرسی: "واتای ئەم سوورە چییە؟"

ئەوی دی گوتی: "واتای ڕەنگەکان ئەوەیە لێرە لە پێش ئێمەن و دەیانبینین. مرۆڤ ناتوانێت باسی ڕەنگی سوور بۆ کەسێک بکات کە ڕەنگەکە نەبینێت."

ئەو نیگارکێشە کوێرەی نیگاری ئەسپەکەی کێشابوو، گوتی: "کەسانی خراپەکار و زەندیق و بێ باوەڕانیش بۆ ئەوەی نکۆڵی لە هەبوونی خوا بکەن، دەڵێن خوا خۆی پێشان نادات."

وەستاکەی تر گوتی: "بەڵام ئەو خۆی پێشانی کەسێکی خاوەن بەهرەی بینین دەدات. قورئانی پیرۆز لەم ڕووەوە دەڵێت هیچ کاتێک بینەر و نابینا نابن بەیەک."

شاگردە جوانەکە هێدی هێدی منی لە ڕووی زینی ئەسپەکە دابوو. جێکردنەوە بۆ تێرڕەنگی و هێز و زیندوویی من لە نیگارێکی ڕەش و سپیی جواندا هەستێکی ئەوەندە خۆشە، کە هەر کاتێک بە فڵچەی لە تووکی پشیلە دروستکراو بەسەر کاغەزدا بڵاوم دەکەنەوە، لە خۆشیاندا ختووکەم دێت. بەمشێوەیە، چەندی من ڕەنگ دەدەمەوە، وەک ئەوە وایە بە گەردوون بڵێم "ببە" و گەردوونیش لە ڕەنگی خوێنینی من پێک بێت. ئەوەی نابینێت، نکوولّی دەکات، بەڵام من لە گشت شوێنێک هەم.



# 32

## من شەکوورەم

بەیانی، پێش ئەوەی منداڵان لە خەو هەڵسن، من لە جێگە دەرچووم، بۆ ئەوەی قەرە دەمودەست بگاتە خانووی جووە هەڵواسراوەکە، نامەیەکی بچووکم نووسی، پەستاندمە دەستی خەیرییەوە تا بە غاردان بیگەیەنێت بە ئەستەر. ئەگەرچی خەیرییە کاتێک نامەکەی لێم وەرگرت، لە ترسی ئەو بەڵایانەی بەسەرمان دێن، بێباکانەتر سەیری ناو چاوانی کردم، منیش لەبەرئەوەی ئیدی باوکێکم نەبوو لێی بترسم، بە بێباکییەکی تازە بە دەستخستوومەوە سەیری ناو چاوانی ئەوم کرد. ئەمەش پێشانی دەدا ئاداب و ڕێسای نێوانمان لەمەودوا چۆن دەبێت. با ئێستا لەکن ئێوە دانی پێدا بنێم و بڵێم من بەدرێژاییی دوو ساڵی ڕابردوو نیگەرانی ئەوە بووم خەیرییە منداڵێک لە باوکم دروست بکات و کەنیزەکبوونی خۆی لەبیر بکات و پۆزی خاتوون بوون لێ بدات. پێش ئەوەی منداڵەکان لە خەو هەستن، سەرێکم لە باوکی داماوم دا و بەڕێزەوە دەستیم ماچ کرد. دەستی وەک بەرد وشک هەڵاتبوو، بەڵام بەشێوەیەکی سەیر نەرمایی خۆی لە دەست نەدابوو. پێڵاو و کڵاو و سەربەرگە مۆرەکەیم شاردەوە و دوای ئەوەی منداڵەکان لە خەو هەڵسان، پێم گوتن باپیرتان باشتر بووە و بەیانی زوو چووە بۆ مستەفا پاشا.

خەیرییە پاش گەڕانەوەی لە گەڕی بەیانی، خوانی بۆ نانی بەیانی ڕاخست. منیش بەدەم دانانی بەشی بەکەڵکی خواردن هاتووی شیلەی نارنجەکەوە لەسەر خوانەکە، بیرم لەوە دەکردەوە ئەستەر ئێستا دەرگای قەرە دەکوتێ. بەفرەکە خۆشی کردبوو و

هەتاو دەرکەوتبوو.

گاڤێک چوومە باخچەی ماڵی جووە هەڵواسراوەکەشەوە، هەر هەمان شتم بینی: چلوورەی شۆڕەوەبووی گوێسوانەکان و قەراغ پەنجەرەکان بەخێرایی بچووک دەبوونەوە و باخچەی نقومبووی بۆنی کەڕوو و گەڵای ڕزیو تامەزرۆیانە پێشوازیی لە تیشکی ڕۆژ دەکرد. بینیم قەرە لەو جێیەی دوێنێ بۆ یەکەمجار ئەوم لێ بینیبوو، چاوەڕێم دەکات. هێندە دوور دەهاتەوە یادم هەر دەتگوت چەندین هەفتەی بەسەردا تێ پەڕیوە. پەچەم لابرد و گوتم:

"دڵخۆش بە ئەگەر خۆشیت بە دڵدا دێت. ئیدی لە نێوانماندا جێ بۆ ناڕەزایی و دژبەری و گومانەکانی باوکم نەماوەتەوە. دوێنێ شەو، کاتێک تۆ لێرە بێڕەوشتانە هەوڵت دەدا من تەنگاو بکەیت، کەسێک، ئیبلیسێک چووەتە ماڵە چۆڵەکەمان و باوکمی کوشتووە."

ئێوە لە کاردانەوەی قەرە زیاتر، مەراقی ئەوەتانە بزانن من بۆچی لە بەرزاییەوە ڕوانیومە و لووتبەرزانە و بەنواندنێکی کەمێک نابەدڵ قسەم کردووە. منیش وەڵامی ئەمە بەتەواوی نازانم. لەوانەیە لەبەرئەوەم بووبێت ئەگەر بگریم، قەرە باوەشم پێدا بکات و منیش خێراتر لەوەی بۆی دەچم، لێی نزیک ببمەوەە.

"ماڵەکەمان تێک دراوە بەسەر یەکدا و زۆر شت شکێندراوە. دیارە بەهەڵچوون و نەفرەتەوە جووڵاوەتەوە. هیچ باوەڕ ناکەم ئەم ئیبلیسە کاری خۆی بەئەنجام گەیاندبێت و بەئارامی لە گۆشەیەک بگیرسێتەوە. دوایین نیگاری کتێبەکەی باوکمی دزیوە. دەمەوێت من و ئێمە و کتێبەکەی باوکمی لێ بپارێزیت. بەڵام ئایا بە چ سیفەتێک و خزمایەتییەک دەمانپارێزیت؟ ئێستا مەسەلە ئەمەیە."

لەوەدا بوو بۆ گوتنی شتێک هەڵمەتێک ببات، بەڵام من بە نیگاکانم، وەک ئەوەی هەمیشە ئەمە پیشەم بووبێت، بە ئاسانی بێدەنگم کرد.

"لە ڕوانگەی قازییەوە، دوای مردنی باوکم، مێردم و خێزانی مێردم سەرپەرشتیاری منن. تەنانەت پێش مردنی باوکیشم هەر وابوو، چونکە لە چاوی قازییەوە مێردی من لە ژیاندایە. لەبەرئەوەی برای مێردم هەوڵی دا لە نەبوونی کاکیدا سوود لە من وەربگرێت و ئەم بێ ڕەوشتی و بێ توانایییە خەزوورمی دوودڵ



کرد، هەلم بۆ ڕەخسا بێ ئەوەی بێوەژن بکەوم، بتوانم بێمەوە ماڵی باوکم. ئێستا بەو پێیەی باوکم مردووە و برام نییە، واتای ئەوەیە تەواو بێ خاوەنم. یاخۆ بێ هیچ گومانێک برای مێردم و خەزوورم خاوەنی منن. تۆ خۆت دەزانی ئەوان کەوتوونەتەخۆ بۆ گەڕاندنەوەم بۆ ماڵ و لەوەدان پاڵەپەستۆ بخەنە سەر باوکم و بڕیاریان داوە بە هەڕەشە تەنگاوم بکەن. هەر ئەوەندەی هەواڵی مردنی باوکم بگاتە بەرگوێیان، دەکەونەخۆ بۆ بردنەوەم بۆ ماڵەوە. لەبەرئەوەی نامەوێت بۆ ئەو ماڵە بگەڕێمەوە، مردنی باوکم دەشارمەوە. لەوانەشە ئەم شاردنەوەیەم لە خۆڕایی بێت، چونکە ڕێی تێ دەچێت ئەوان ئەم کارەیان کردبێت."

چەپکێک تیشکی زراڤی ڕۆژ لە دەریوانە شکاوەکان و پەنجەرە ڕووخاوەکانی ماڵی جووە هەڵواسراوەکەوە بەزەرافەت دزەی کردە ژوورێ و تۆزی کۆنی ناو ژوورەکەی ڕووناک کردەوە و ڕێک لەو ساتەدا خۆی کرد بە نێوان من و قەرەدا.

لەبەرئەوەی قەرە لە ئەڤین زیاتر، بە سەرنجەوە بۆ منی دەڕوانی و منیش ئەمەم پێ خۆش بوو، چاوم لە چاوی بڕی و گوتم: "شاردنەوەی مردنی باوکم هەر لەبەر ئەم هۆیە نییە. ترسی ئەوەم هەیە نەتوانم بیسەلمێنم لە کاتی کوشتنیدا لەکوێ بووم. ئەگەر گەواهیی خەیرییە هیچ نرخێکیشی نەبێت، دەترسم لەدژی من –منیش نا، لەدژی کتێبەکەی باوکم– ببێتە بەشێک لەو تەپکە و داوەی وا لە نانەوەدایە. ئاشکراکردنی مردنی باوکم لە کاتێکدا سەرپەرشتیار یان خاوەنێکی بەرجەستەم نەمابێت، گەرچی دەسپێک ئاسانکارییەکیش بێت بۆ ڕوونکردنەوەی تاوانەکە، بەڵام دەتوانم زۆر باش پێشبینی بکەم دواتر تەنیا لەبەر ئەو هۆیانەی پێش کەمێک باسم کردن –بۆ نموونە لەوانەیە خەیرییە پێی زانیبێت باوکم نەیدەویست من شوو بە تۆ بکەم–، بەڵای زۆرم بۆ بنێتەوە."

قەرە پرسی: "مەگەر باوکت نەیدەویست شوو بە من بکەیت؟"

"نەیدەویست، چونکە ترسی ئەوەی هەبوو هەڵم بگری و لەوم دوور بخەیتەوە. ئێستاش لەبەرئەوەی تۆ ئەو ڕەفتارە خراپە لە بەرامبەر باوکمدا نانوێنیت، لەم دۆخەدا باوکی بەستەزمانم بەهیچ جۆرێک لەدژی زەماوەندی ئێمەدا نابێت. مەگەر تۆ هیچ ناڕەزایییەکەت هەیە؟"

"نا شۆخی خۆم."

"باشە. سەرپەرشتیاریشم داوای هیچ پارە و زێڕێکت لێ ناکات. بمبوورە ئەگەر بێ ئابڕووییم نواندبێت و بەناوی خۆمەوە قسە بکەم و مەرجەکانی مارەییی خۆم بخەمە ڕوو، بەڵام چەند مەرجێکی مارەییم هەیە و بەداخەوە دەبێت هەر ئێستا بچمە سەر وردەکارییەکانیان و بیانخەمە ڕوو."

لەبەرئەوەی تاوێکی درێژ بێدەنگ بووم، قەرە بەنواندنێکەوە وەک ئەوەی لێبووردن بخوازێت، گوتی: "بەڵێ."

دەستم پێ کرد و گوتم: "یەکەمیان، لەبەردەم دوو گەواهیدەر سوێند دەخۆی ئەگەر ڕەفتاری خراپم لەگەڵدا بنوێنی یان ژنم بەسەردا بهێنی، بە دابینکردنی بژێوەوە تەڵاقم دەدەیت. دووەمیان، لە بەردەم دوو گەواهیدەر سوێند دەخۆی ئەگەر بەهۆ و بێ هۆ لە شەش مانگ زیاتر لە ماڵ دوور بکەویتەوە و نەگەڕێیتەوە، ئەوا من بە تەڵاقدراو دادەنرێم و بژێوی ژیانم دەکەوێتە ئەستۆی تۆ. سێیەمیان، بێگومان دوای زەماوەندکردنمان دەگوازیتەوە بۆ ماڵی ئێمە، بەڵام تا بکوژی باوکم نەدۆزمەوە، یان تۆ نەیدۆزیتەوە –دەمەوێت بەدەستی خۆم ئەشکەنجەی بدەم– و تا بە هەوڵ و هونەری تۆ کتێبەکەی سوڵتانمان بەئەنجام نەگەیەنرێت و سەربەرزانە ڕادەستی نەکرێت، لە هەمان پێخەودا هاوجووتم نابیت. چوارەمیان، کوڕەکانم لە هەمان پێخەودا لەگەڵ خۆم دەنوون و دەبێت وەک ئەوەی کوڕی خۆت بن، خۆشت بوێن."

"باشە، ئەگەر سەرجەم ئاستەنگەکانی بەردەممان بەم خێراییە هەڵبگیرێن، کەواتە بەزووترین کات دەچینە قەفەسی زێڕینەوە."

"قەفەسی زێڕین بەڵێ، بەڵام هەمان پێخەو نا."

گوتم: "زەماوەند لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە، پێویستە دەسپێک ئەوە چارەسەر بکەین. ئەڤین دوای زەماوەند دێت. لەبیرت نەچێت: ئاگری بەگڕ و کڵپەی ئەڤینی پێش زەماوەند بەسازدانی زەماوەند دەکوژێتەوە و شوێن ئاگرێکی خاڵی و خەمگینی لەپاش بەجێ دەمێنێت. بێگومان ئەڤینی دوای زەماوەندیش کۆتاییی پێ دێت، بەڵام بەختەوەری جێگای دەگرێتەوە. کەچی سەرباری ئەمەش، هەندێک گەوجی پەلەکەر بەر لە زەماوەند عاشق دەبن و بەدەم سووتانەوە هەموو ئەڤینی خۆیان بە با دەدەن.



بۆچی؟ چونکە پێیان وایە ئەڤین گەورەترین ئامانجە لە ژیاندا."

"ڕاستییەکەی چییە؟"

ڕاستییەکەی بەختەوەرییە. ئەڤین و زەماوەندیش لە پێناوی بەدەست هێنانی کامەرانیدایە: پیاوێک، ماڵێک، منداڵ، کتێبێک. مەگەر نابینی حاڵی من سەرباری ونبوونی مێردم و مردنی باوکم لەو تەنیاییيە وشک و برینگەی تۆ باشترە؟ خۆم و منداڵەکانم بەدرێژاییی ڕۆژ پێ دەکەنین و لەیەک دەدەین و یەکدیمان خۆش دەوێت. ئەگەر ئەوان نەبن، من دەمرم. تۆ لەبەرئەوەی بایەخ بەم ڕەوشەی من دەدەیت و تەنانەت لەبەرئەوەی سەر دەدەی بۆ ئەوەی شەو لەگەڵ من، ئەگەر لە هەمان پێخەویشدا نەبێت، لەگەڵ تەرمی باوکم و لەناو قەرەباڵەغیی منداڵەکانمدا لەژێر هەمان بنمیچدا تێ پەڕێنیت، ئێستا بە گوێی ڕۆح گوێ بۆ قسەکانم ڕادەگریت."

"گوێم ڕاگرتووە."

"شێوازی جۆراوجۆر هەیە بۆ تەڵاق وەرگرتن. گەواهیدەرانی ساختە دەتوانن گەواهیم بۆ بدەن مێردم منی بە مەرج تەڵاقداوە و بۆ نموونە سوێند بخۆن و بێژن پێش ئەوەی بچێتە شەڕ، سوێندی خواردووە ئەگەر تا دوو ساڵی تر نەگەڕامەوە، ئەوا ژنەکەم تەڵاقی کەوتووە. یان دەتوانن ڕاستەوخۆ بڵێن مێردی منیان لە شەڕگە بینیوە و ڕەنگ و وردەکارییەکانی بگێڕنەوە و سوێند بخۆن. بەڵام ئەگەر تەرمەکەی ماڵەوە و نارەزاییی خەزوورم و شووبرام لەبەرچاو بگریت، ئەم گەواهیدانە درۆیە بێ کەڵکە و قازیانی ئاوەزیاو و خەمخۆر دەترسن و ڕازی نابن. قازیانی حەنەفیی سەر بە مەزەبی خۆشمان، ئەگەر بشزانن مێردم منی بێ بژێو جێ هێشتووە و ماوەی چوار ساڵە لە شەڕ نەگەڕاوەتەوە، هەر ناتوانن تەڵاقم بدەن. بەڵام قازیی ئوێسکودار بۆ ئەوەی هەلی جیابوونەوە بۆ ئەو ژنانە بڕەخسێنێت، کە هەمان حاڵی منیان هەیە و لە سۆنگەی شەڕی عەجەمەوە هەموو ڕۆژێک ژمارەیان زیاد دەکات، بە چاوپۆشی لێکردنی حەزرەتی سوڵتانمان و "شیخ الإسلام"، جاروبار شوێنی خۆی بۆ جێگرە شافیعییەکەی چۆڵ دەکات و ئەویش بەئاسانی تەڵاقیان دەدات و بژێویان بۆ دەبڕێتەوە. ئێستا ئەگەر دوو گەواهیدەر بدۆزیتەوە بۆ ئەوەی بەدروستی گەواهی بۆ حاڵی من بدەن، کەمێک پارەیان بدەیتێ و بپەڕیتەوە بەری ئوێسکودار و قازی ڕازی

بکەن و مسۆگەری بکەن بۆ تەڵاقدانم جێگرەکەی شوێنی بگرێتەوە، بەگوتەی گەواهیدەران تەڵاق بدرێم و تەڵاقدانەکەم لە دەفتەری قازیدا تۆمار بکرێت و کاغەزێک یان بەڵگەیەک بۆ ئەم مەبەستە وەربگری و بەڵگەیەکی تریش وەربگری بۆ سەلماندنی ئەوەی کەوا یەکسەر دوای تەڵاقدانم، شووکردنیشم ڕەوایە و گشت ئەمانە تا ئەم دوا نیوەڕۆیە ئەنجام بدەیت و بپەڕیتەوە ئەمبەر، ئەوا بەو پێیەی کارێکی دژوار نابێت لای ئێوارە مەلایەک بدۆزینەوە بۆ ئەوەی منت لێ مارە بکات، دەتوانی ئەمشەو وەک مێردی من لە تەک خۆم و منداڵەکانم لەژێر هەمان بنمیچدا بمێنیتەوە. بەمجۆرە ناهێڵی لەو ئیبلیسە بترسین و شەو بەدەم گوێگرتن لە تەقوهوڕی ناو ماڵەوە بەسەر ببەین. بەیانیش کاتێک مردنی باوکم ڕادەگەیەنین، لەوە ڕزگارم دەکەیت وەک ژنێکی کلۆڵ و بێ خاوەن بکەومە بەرچاوی خەڵک."

قەرە، گەشبینانە و کەمێکیش زارۆکانە گوتی: "بەڵێ، بەڵێ دەتهێنم."

وەک دەزانن پێش کەمێک گوتبووم نازانم بۆچی وەها لە بەرزاییەوە دەمڕوانی و پۆزبڵندانە لەگەڵ قەرەدا دەدوام. ئێستا دەیزانم: قەرە هەر لە منداڵییەوە گێژ و وێژ بوو و تومەز منیش هەستم کردبوو تەنیا دەتوانم بەنواندنێکی لەو جۆرە قایلی بکەم بۆ ئەنجامدانی ئەو شتانەی خۆیشم بەحاڵ بڕوام بە سەرگرتنیان هەبوو.

"زۆر شت هەیە دەبێت لەدژی ئەو کەسانەی تەڵاقدانم و مارەبڕینی لەسەرخێری ئەم ئێوارەیەم لە تۆ بە ڕەوا نازانن و ئەوانەی بۆ ڕێگرتن لە تەواوکردنی کتێبەکەی باوکم خراپەکاری دەکەن و لەدژی دوژمنانمان ئەنجامی بدەین، بەڵام با ئێستا ئەقڵی تۆی شێواوتر لە ئەقڵی من، زیاتر نەشێوێنم."

قەرە گوتی: "ئەقڵت بەهیچ جۆرێک نەشێواوە."

بۆ ئەوەی پێی وا نەبێت هەموو ئەم قسانە لە ئەقڵی ژنانەی منەوە دەرچوون و تا بڕوا بە قسەکانم بکات، گوتم: "چونکە ئەمانە ئەقڵی من نین، ئەو شتانەن لە ئەنجامی چەندین ساڵ قسەکردنەوە لەگەڵ باوکمدا فێریان بووم."

قەرە شتێکی گوت کە گشت ئەو پیاوانەی من بە ئاوەزیاو دادەنێن، بەرەوڕوو پێم دەڵێن:

"زۆر جوانی."



گوتم: "بەڵێ، پەسندانی ئاوەزی خۆمم فرە پێ خۆشە. کاتێک منداڵ بووم، باوکیشم زۆر جاران ئەمەی دەکرد."

بەڵام لەوەدا بووم بڵێم کاتێک پێ گەیشتم و گەورە بووم، باوکم دەستی لە پەسندانی ئاوەزم هەڵگرت، دامە پڕمەی گریان. کاتێک دەگریام، وەک ئەوە وابوو لە هەناوی خۆم بێمە دەرێ و ببم بە ژنێکی تر و وەک ئەو خوێنەرەی لە پەڕەی کتێبێکدا سەیری نیگارێکی بەئازار دەکات و دڵتەنگ دەبێت، ژیانی خۆم لە دەرەوە دەبینی و دڵم بەخۆم سووتا. هەڵڕشتنی فرمێسکی مرۆڤ بۆ ئازارەکانی خۆی چەشنی ئەوەی ئازاری کەسانێکی تر بن، ڕەهەندێکی هێندە ڕوونی هەیە، کاتێک قەرە باوەشی پێدا کردم، هەستی چاکە هەناومانی داگرت. بەڵام ئەمجارەش لە ئاوێزانبوونماندا، ئەو چاکەیە لە نێوان خۆماندا دەما و هەرگیز نەیدەتوانی خۆی بگەیەنێتە جیهانی دوژمنانی دەوروبەرمان.

# 33

## من ناوم قەرەیە

پاش ئەوەی شەکوورەی بێوەژن و هەتیو و خەمبار بە هەنگاوی سووکی وەک پەڕ کشایەوە و ڕۆیشت، بەو بۆنی بادەمەی لەوەوە گرتبووم و بەخەیالاتی ژنهێنانەوە، لە بێدەنگیی مالی جووە هەلواسراوەکەدا مامەوە. سەرم لێ شێوابوو، بەلام ئەوەندەش خێرا کاری دەکرد هێندەی نەمابوو ئازارم بدات. منیش، بێ ئەوەی بتوانم وەک پێویست بۆ مردنی زاوام خەمگین بم، بەڕاکردن خۆم گەیاندەوە مالی خۆم. لەلایەک، گومانی ئەوەی شەکوورە لە خشتەم دەبات و وەک بەشێکی نەخشە و گەمەیەکی گەورە بەکارم دەهێنێت، هەناومی کرمێ دەکرد و لەلایەکی ترەوە، خەیالی پێکەوەژیانی بەختەوەرانە لەبەر چاوم نەدەڕەوییەوە.

لە مال، ژنی خاوەن مالەکە لە شیپانەی دەرگای حەوشدا بەگیری هێنام و دەیویست بزانێت لە بەیانییەوە تا ئەم کاتە لە کوێ بووم و ئێستا لە کوێ دێمەوە. دوای ئەوەی وەلامم دایەوە، لە ژوورەکەم بیست و دوو دانە زێڕی ڤینیسیاییم لە پشتی پشتوێنی لە بەتانیی شاردراوەمدا دەرهێنا و بە پەنجەی لەرزۆکم خستمنە کیسەکەمەوە. دوای ئەوەی دیسان کەوتمەوە کۆلان، دەمودەست تێ گەیشتم چاوی تەڕ و خەمبار و ڕەشی شەکوورە بەدرێژاییی ڕۆژ لە خەیالم دەرناچێت.

سەرەتا پێنج دانە لە زێڕەکانی ڤینیسیام لەکن سەڕافێکی جوولەکەی هەمیشە دەم بە زەردەخەنە ورد کردەوە. دوایی گەڕامەوە ئەو گەڕەکەی لەبەر حەزنەکردنم لە ناوەکەی، تا ئێستا بە ئێوەم نەگوتووە (با ئێستا پێتان بلێم: گەڕەکی یاقوتلار) و



بەدەم بیرکردنەوەوە چوومە گەڕەکی ئەو مالەی زاوای مردووم و شەکوورە و مندالەکانی تیایدا چاوەڕێیان دەکردم. کاتێک بە کۆلانەکاندا وەک ئەوەی غار بدەم، ڕێم دەکرد، دار چنارێکی بەرز، لە سۆنگەی ئەوەی لە ڕۆژی مردنی زاوامدا خەریکە بەدەم خەیال و نەخشەکێشانەوە بۆ ژنهێنان وا خەریکم لە خۆشییاندا دەفڕم، بەچاوی سووکەوە بۆی ڕوانیم. کانیی گەڕەک لەبەر توانەوەی بەفر خوڕەخوڕ ئاوی لەبەر دەڕۆیشت و ئەویش ڕێک لەو ساتەدا پێی گوتم: "گوێ مەدەیێ، کارەکانت ڕێک بخە و خەریکی بەختەوەریی خۆت بە." دوای ئەوە، پشیلەیەکی ڕەشی شووم بەدەم خۆ لێستنەوەوە لە گۆشەیەک ئەقلی تێک دام و گوتی: "باشە، بەلام هەموو کەسێک، بە خۆشتەوە، گومانی ئەوەت لێ دەکەن دەستت لە کوشتنی زاواتدا هەبێت."

پشیلەکە دەستی لە خۆلێستنەوە هەلگرت و تاوێک چاوە ئەفسووناوییەکانی لە چاوم بڕی. ئێوە دەزانن ئەم پشیلانەی ئەستەمبول لەبەرئەوەی خەلک ڕوویان دەداتێ، بێ ئابڕوو دەبن.

لە مال نا، لە حەوشی مزگەوتی گەڕەک مەلا ئەفەندیم بینی. مەلا، لەبەرئەوەی پێلووی چاوە گەورەکانی شۆڕ بووبوونەوە، بەردەوام وەک نووستوو دەهاتە بەرچاو. پرسیارێکی یاساییی زۆر بەربلاوم لێ کرد و لێم پرسی گەواهیدان لە دادگا کەی پێویستە و کەی خۆویستانەیە؟ بەنواندن و لە خۆباییبوونەوە وەلامی دایەوە و منیش وەک ئەوەی یەکەمجارم بێت ئەم وەلامە ببیستم، برۆکانم بەرز کردەوە. مەلا ئەفەندی ڕای گەیاند ئەگەر لە ڕووداوێکدا گەواهیدەری تر هەبن، ئەوا گەواهیدان کارێکی خۆویستانەیە، بەلام ئەگەر تاکە گەواهیدەرێک هەبێت، ئەو کاتە گەواهیدان فەرمانی خوایە و پێویستە."

دەستم بە قسە کرد و گوتم: "دەردی منیش هەر ئەمەیە. لە بابەتێکی ڕوون و ئاشکرادا لە کن هەمووان، لەبەرئەوەی گەواهیدەران خۆیان لە پشت ئەم بیانووی گەواهیدانی خۆویستانەوەیەوە دەشارنەوە و لە چوونیاندا بۆ دادگا لەشگرانی دەنوێنن، کاری ئەو مرۆڤانەی من هاوکارییان دەکەم، بەخێرایی پێک نایەت."

مەلا ئەفەندی گوتی: "بێ قەزا بیت یا خوا، دە کەمێک دەمی کیسەکەت ئاوەلا بکە."

منیش کردمەوە و زێڕە ڤینیسیاییەکانی ناویم پێشان دا: حەوشی فراوانی

مزگەوتەکە و ڕووی مەلا و هەموومان لەپڕ بە بریسک و باسکی زێڕەکە ڕۆن بووینەوە. پرسی مەسەلە چییە؟

بۆم گێڕاوە من کێم و ڕام گەیاند: "زاوا ئەفەندی نەخۆشە. دەخوازێت پێش ئەوەی بمرێت، بێوەژنبوونی کچەکەی ڕووی فەرمی وەربگرێت و بژێوی بۆ دابین بکرێت."

بگرە هیچ پێویستی نەکرد باسی جێگری قازیی ئوێسکودار بکەم. مەلا ئەفەندی هەموو شتێک تێ گەیشت و گوتی جا خۆ ماوەیەکی درێژە هەموو خەڵکی گەڕەک بۆ شەکووره خانمی بێ بەخت خەمبارن و تەنانەت کار لەم ڕووەوە بە درەنگیش کەوتووە. لەبری ئەوەی لەبەر دەروازەی قازیی ئوێسکودار لە دووی گەواهیدەری دووەمی پێویست بۆ تەڵاقدان بگەڕێین، مەلا ئەفەندی برایەکی خۆی دێنێت. بە قسەی ئەو، ئەگەر ئێستا زێڕێکیش بەوی بدەم، ئەوا خێرم بە براکەی کردووە. براکەی لە هەمان گەڕەکدا دەژی و ئاگاداری دەرد و خەمی شەکووره و هەتیوە خۆشەویستەکانیەتی. دوو زێڕم پێشانی مەلا ئەفەندی خۆی دا، کرێی گەواهیدەری دووەمیشی بۆ دادەشکاندم؛ هەر لەوێندەرێ ڕێک کەوتین. مەلا ئەفەندی چوو بۆ کن براکەی.

بەشی دوای ئەمەی ڕۆژی ئەمڕۆمان بەشێوەیەک وەک چیرۆکی ئەو ڕاونان و قاودانانە دەچوو کە من لە قاوەخانەکانی حەڵەب بینیبووم و چیرۆکبێژەکان هەم دەیانگێڕایەوە و هەم نواندنیان بۆ دەکرد. ئەو کەسانەی چیرۆکەکانیان بەشێوەی مەسنەوی دەنووسییەوە و دەیانکرد بە کتێب، با بە هێڵی جوانیش بیانووسیبایە، بەڵام لەبەرئەوەی سەرەڕۆیی و فرتوفێڵی زۆریان تێدا بوو، هەرگیز بەهەند وەریان نەدەگرت و نیگاریان بۆ نەدەکێشا. هەرچی منیشم سەرکێشیی درێژاییی ئەم ڕۆژەی خۆمانم بە چوار جڤات لە پەڕەی ئەقڵی خۆمدا کۆکردەوە و نەخشاندم و نیگاریم کێشا.

لە جڤاتی یەکەمدا، پێویستە نیگارکێش نیگاری ئێمە لە ناوەڕاستی ئاوی تەنگەی بوسفۆر و لەناو بەلەمێکی چوار سەوڵیدا، کە لە ئونقاپانی سواری بووین و پێی پەڕینەوە بۆ بەری ئوێسکودار، لە نێوان سەوڵ لێدەرە سمێل بابڕ و ڕیش تێک ئاڵقاو و بازوو ئەستوورەکاندا بکێشێت. کاتێک مەلا و برا ڕەشتاڵە و سیسەکەی بەم



گەشتەی پێشتر لە خەیاڵدا نەبوو دڵخۆش بوون و لەگەڵ سەوڵ لێدەرەکاندا دەدوان، منی هەژار لەسەر لووتی بەلەمەکە دانیشتبووم و خەیاڵی لەبن نەهاتووی پێکەوە ژیانی بەختەوەرانەی دوای زەماوەند لەبەر چاوم نەدەڕەوییەوە. بەمەبەستی دۆزینەوەی نیشانەیەکی نەگبەتی، بۆ نموونە پاشماوەی کەشتییەکی چەتەی دەریا، بەترسەوە سەیری قوڵاییی ئاوی تەنگەی بوسفۆرم دەکرد و ئاوەکە لەو بەیانییە هەتاوەی زستاندا لە گشت کاتێک ڕوونتر دەهاتە بەرچاو. کەواتە نیگارکێش نیگاری دەریا و هەورەکان چەند بە ڕەنگی پڕ لە نەشئەش بکێشێت، پێویستە نیگاری شتێکی تاریکیش بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی لەبەرامبەر خەیاڵەکانی بەختەوەریمدا، بۆ نموونە نیگاری ماسییەکی سەرسوڕهێنەر لە بنی ئاوی بوسفۆردا بکێشێت تاکو خوێنەری بەسەرهاتەکەمان لەو کاتەدا هەموو شتێک بە ڕەنگی پەمەییی تۆخ نەبینێت.

نیگاری دووەمیشمان پێویستە لەو نیگارە پڕ لە وەردەکاری و باش ڕێکخراوانەی شایەنی زەرافەتکاریی بەهزاد بن کە کۆشکی سوڵتان و پادشاکان، کۆبوونەوەی دیوەخان، پێشوازیکردن لە باڵیوزانی فەڕەنگ و ناوەوەی ماڵانی جەنجاڵ پێشان دەدەن، واتا حسێب بۆ گاڵتە و جووتواتاییی ناو نیگار بکرێت. دەبێت قازی ئەفەندی لە گۆشەیەکی نیگارەکە، بەدەستێکی، وەک ئەوەی بڵێ "ڕاوەستە"، نیشانەی "هەرگیز" و "نەخێر" بۆ من و بەرتیلی بۆ ئەو درێژکراوم بکات و بەدەستەکەی تری، بەشەرم و لە ڕوودامانەوە زێڕە ڤینیسیاییەکانی من بخاتە گیرفانی خۆیەوە. دەبێت ئەو شتەی لە ئاکامی ئەم بەرتیلە دەکەوێتەوە، هەمان سات لە نیگارەکەدا پێشان بدرێت، واتا پێویستە لە جێی قازیی ئوێسکودار، نیگاری شەهاب ئەفەندیی جێگری شافیعیی قازی بکشێرێت. مرۆڤ تەنیا لە سایەی لێهاتوویی نیگارکێشانی زیرەک لە ڕیزکردنی پەڕەدا دەتوانێت ئەو ڕووداوانەی بەدوای یەکدا دەقەومێن، لە هەمان نیگاردا بکێشێت. بەمجۆرە، بۆ نموونە، ئەو چاوەی لە پێشدا بەرتیل بەخشینەکەی من دەبینێت، کاتێک سەیر دەکات ئەوەی چوارمێردەکی لەسەر نیمدەری قازیدا دانیشتووە، جێگری قازییە، ئەگەر تەنانەت ئەم چیرۆکەشمان نەخوێنێتەوە، ئەوا کاتێک دەبینێت جێگری قازی دەمودەست دوو زێڕی ڤینیسیایی دەنێتە گیرفانییەوە،

تێ دەگات قازی ئەفەندی جێی خۆی بۆ جێگرە شافیعییەکەی چۆڵ کردووە تاکو شەکوورە تەڵاق بدات.

نیگاری سێیەمیش پێویستە هەمان جڤات پێشان بدات، بەڵام ئەمجار کاتێک دیوارەکان دەنەخشێندرێن، دەبێت نەخش و نیگاری باوی چینی، کە لک و چڵی تێک ئاڵاویان دەربازبوون دژوارتر دەکەن، بەکار بهێنرێت. مەرجیشە ئەمانە بە ڕەنگێکی تۆختر بۆیاخ بکرێن و هەوری ئاڵۆز و ڕەنگاوڕەنگ بەسەر جێگری قازییەوە بکێشرێت بۆ ئەوەی ڕوون بێتەوە گەمە و فرتوفێڵێک لەم چیرۆکەماندا هەیە. مەلا و براکەی، سەرباری ئەوەی بەجیا چوونە بەردەم جێگری قازی، بەڵام پێویستە پێکەوە لە نیگارەکەدا پێشان بدرێن. ئەوان دەستیان بە قسە کرد و گوتیان ماوەی چوار ساڵە مێردی شەکوورە لە شەڕ نەگەڕاوەتەوە؛ لەبەرئەوەی مێردی بەخێوی ناکات، ژنەکە بەدەست دەسکورتییەوە دەناڵێنێت؛ دوو منداڵە هەتیوەکەی برسی و چاو بەگریانن؛ بەهۆی بەشووبوونییەوە، هێشتا هیچ داخوازیکارێک پەیدا نەبووە ببێت بە باوکی هەتیوەکان و بگرە لەبەرئەوەی بەشووە، کەس ناتوانێت بێ ڕەزامەندیی مێردی قەرزی بداتێ. جووتە برا بەشێوەیەک قسەیان دەکرد بۆی هەبوو دیواری کەڕیش بێنێتە جووڵە و هەر لەوێدا بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە بڕیاری تەڵاقدانی شەکوورە بدا، بەڵام جێگری قازی مێشیش میوانی نەبوو و پرسیاری کرد سەرپەشتیاری شەکوورە کێیە؟ دوای تاوێک دوودڵی، هاتمە گۆ و گوتم: "باوکی بەڕێزی شەکوورە چاوشی و کاری باڵیۆزی بۆ سوڵتانمان دەکات و لە ژیاندایە."

جێگری قازی گوتی: "تا خۆی نەیاتە دادگا، بەهیچ جۆرێک بڕیاری جیابوونەوەی نادەم."

ئەمجار بەشپرزەیی گوتم: "زاوا ئەفەندی لە پێخەوی نەخۆشیدا گیانەڵایەتی. دوایین داخوازی لە خوا ئەوەیە کچەکەی تەڵاق بدرێت و منیش نوێنەرایەتیی ئەو دەکەم."

جێگر گوتی: "دوای تەڵاقدانی چ دەقەومێت؟ بۆچی پیاوێکی نیوەمردوو هێندە پەرۆشی جیاکردنەوەی کچەکەیەتی لە پیاوێک کە دەمێکە لە شەڕ سەری تێدا چووە و فەوتاوە؟ ها بڕوانە، ئەگەر کچە هەلێکی باشی شووکردنی هەبێت و زاوایەکی جێی



متمانە لە کایەدا بێت، ئەوا تێ دەگەم، چونکە بەمجۆرە باوکە بەئاسوودەیی سەر دەنێتەوە."

گوتم: "جێگر ئەفەندی، هەیە."

"کێ؟"

"من."

جێگری قازی گوتی: "چما دەبێت؟ تۆ نوێنەری سەرپەرشتیاریت؟ چ کارەیت؟"

"لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات کتێبچییەتی و نامەبەری و جێگریی دەفتەرداریم بۆ پاشایان کردووە. مێژوونامەیەکی شەڕەکانی عەجەمم بە ئەنجام گەیاندووە و پێشکێش بە سوڵتانمانی دەکەم. سەرم لە نەخش و نیگار دەردەچێت. منیش ماوەی بیست ساڵە بە ئاگری عەشقی ئەم کچە قرچەی سووتانم دێت."

"خزمی ئەوێت؟"

لەبەرئەوەی لەکن جێگری قازی لە دەمەساتێکی چاوەڕوان نەکراودا کەوتمە دۆخێکەوە خۆم بهاوێژمە بەردەمی و دەست و پێی ماچ بکەم و بەجارێک ژیانی خۆم وەک ئامێرێکی بێ ڕاز و نیاز دەخستە سەر مێز، زۆر شەرمم بەخۆمدا هاتەوە و بێدەنگ بووم.

"لەبری ئەوەی وەک چەوەندەر سوور هەڵگەڕێی، وەڵام بدەوە."

"کچی پوورمە."

"هەمم، تێ گەیشتم. ئایا دەتوانیت بەختەوەری بکەیت؟"

کاتێک ئەم پرسیارەی کرد، بەدەست ئاماژەیەکی بێ ئابڕووانەی کرد. با نیگارکێش نیگاری ئەم دزێوییە نەکێشێت. تەنیا با ڕادەی سووربوونەوەی ڕووم پێشان بدات و هیچی تر.

"داهاتێکی باشم هەیە."

جێگر ئەفەندی گوتی: "لەبەرئەوەی لەسەر مەزهەبی شافیعیم، تەڵاقدانی ئەم شەکوورە بەدبەختەی کە چوار ساڵە مێردی لە شەڕ نەگەڕاوەتەوە، هیچ ڕەهەندێکی تێدا نییە لەگەڵ کتێب و باوەڕی مندا ناکۆک بێت. ئەوا بڕیاری جیابوونەوەیم دا.

ئیدی ئەگەر مێردی لە شەڕیش بگەڕێتەوە، ناتوانێت داوای هیچ مافێکی لێ بکات."

نیگاری دواتر، واتا چوارەمیان، پێویستە پێشان بدات جێگری قازی بە مەرەکەبی ڕەش سوپای گوێڕایەڵی پیتەکان دەخاتە جووڵە و بڕیاری جیابوونەوە لە دەفتەردا تۆمار دەکات و دوای ئەوە، بەڵگەی بێوەژنیی شەکوورەی من و نەمانی هیچ تەگەرەیەک بۆ شووکردنەوەی مۆر دەکات و دەیداتە دەستم. بەڵام تیشکی ناواخنی ئەو کامەرانییەی من لەو کاتەدا هەستم پێ دەکرد، نە بەسوور بۆیاخکردنی دیوارەکانی دادگا و نە بەکێشانی چوارچێوەی نیگارەکە بەڕەنگی سووری خوێنین، دەرنابڕێت. بەناو ئاپۆرەی گەواهیدەرانی درۆزن و ئەو پیاوانەی بۆ بە تەڵاقدانی خوشک و کچ و پوورەکانیان لەبەردەم دەرگای قازیدا تۆپەڵیان بەستبوو، ڕام کرد و کەوتمە سەر ڕێگای گەڕانەوە.

کاتێک لە تەنگەی بوسفۆر پەڕیمەوە و چوومە گەڕەکی یاقوتلار، مەلا ئەفەندیی تێگەیشتوو و براکەیم لە کۆڵ خۆم کردەوە. مەلا مرخی خۆش کردبوو خۆی مارەی شەکوورەم لێ ببڕێت. لەبەرئەوەی لە کۆڵان دەمودەست تێ گەیشتم هەر کەسێک لە کۆڵان پێم دەگات، ئیرەیی بە کامەرانیی لە ڕادەبەدەرم دەبات و لە پشتەوە تەپکە و داوم بۆ دەنێرێتەوە، بە ڕاکردن ڕووم لە کۆڵانی شەکوورەی خۆم کرد. قەلەڕەشی شووم چۆنیان زانیبوو مردووییەک لە ژوورەوە هەیە تا بەوجۆرە بە سەربانەکانەوە باڵ ڕاوەشێنن و بەزم بگێڕن؟ لەبەرئەوەی تێروپڕ خەمم بۆ زاوام نەخواردبوو و تەنانەت فرمێسکیشم بۆ نەڕشتبوو، کزە لە هەناومەوە دەهات، بەڵام دەستبەجێ بە داخستنی بێ کەموکورتیی دەریوانەکانی ماڵ و دەرگا و بێدەنگی و بگرە بە دار هەنارەکەدا تێ گەیشتم هەموو شتێک بەڕێی خۆیدا دەچێت بەڕێوە.

ئێوە تێ دەگەن من لەو ساتەدا بە پەی پێبردنێکەوە بەخێرایی هەڵسوکەوتم کردووە. بەردێکم لە زەوی هەڵگرت و لە دەرگای حەوشەم گرت، بەڵام نەمپێکا. بەردێکیشم هەڵدایە ماڵەوە، کەوتە سەر سەربانەکە. بە هەڵچوونەوە کەوتمە بەردبارانکردنی ماڵەکە. لەو کاتەدا پەنجەرەیەک کرایەوە. ئەمە پەنجەرەی نهۆمی دووەم بوو، ئەو پەنجەرەیەی چوار ڕۆژ لەمەوبەر، ڕۆژی چوارشەم، لە نێوان لق و چڵی دار هەنارەکەوە شەکوورەم تێدا دیبوو. ئۆرهان لەوێدا دەرکەوت، لە درزی



دەریوانەکەوە گوێم لە دەنگی شەکوورە بوو جنێوی بە ئۆرهان دەدا، دواتریش خۆیم بینی. من و شۆخی خۆم تاوێک بە ئومێدەوە سەیری یەکدیمان کرد. چ خۆش و چ جوان بوو. ئاماژەیەکی بەواتای "چاوەڕێ بکە"ی کرد و دەریوانەکەی دادایەوە.

هێشتا زۆری مابوو بۆ ئێوارە؛ لە باخچە خاڵییەکە، شەیدای جوانیی دنیا و دار و کۆڵانە قوڕاوییەکە بووم و بەئومێدەوە چاوەڕێم کرد. هێندەی نەبرد خەیرییە وەک ئەوەی کەنیزەک نەبێت و خاتوونێکی ئەفەندی بێت، پۆشتە و پەرداخ و بە ڕووی داپۆشراوەوە هات. بێ ئەوەی لە یەکتر نزیک بینەوە، چووینە پشت دار هەنجیرەکانەوە.

پێم گوت: "هەموو شتێک تەواوە." ئەو نووسراوەی لە قازیم وەرگرتبوو، پێشانیم دا. گوتم: "شەکوورە تەڵاقی وەرگرت." لەبری ئەوەی بڵێم ئێستا لە گەڕەکی پشتەوە مەلایەک دەدۆزمەوە، گوتم: "مەلا دێت، با شەکوورە ئامادە بێت."

"شەکوورە خاتوون دەیەوێت ئەگەر کەمێکیش بووە کەژاوەی زەماوەند هەبێت. با خەڵکی گەڕەک بێن و نانی شایی بخۆن. مەنجەڵە پلاومان بە بادەم و قەیسی وشکەوە لێ ناوە."

لەوانەبوو بەزەوقەوە باس بکات چی تریشیان کولاندووە، بەڵام من قسەم پێ بڕی و گوتم: "ئەگەر شاییی ئەوەندە فراوان بێتەوە، هەواڵ دەگاتەوە حەسەن و پیاوەکانی، بەسەر شاییەکەدا دەدەن و ئابڕوومان دەبەن، مارەبڕینەکەمان لێ تێک دەدەن و ئێمەش هیچمان پێ ناکرێت و ڕەنجمان بە با دەچێت. دەبێت خۆمان بەتەنیا لە حەسەن و خەزووری نا، بگرە لە ئیبلیسی بکوژی زاوا ئەفەندیش بشارینەوە. دەترسن؟"

گوتی: "جا چۆن ناترسین؟" ئەمەی گوت و دەستی بەگریان کرد.

گوتم: "هیچ شتێک بە کەس نالێین. زاواش هەڵگرن و جلی نووستنی لەبەر بکەن، بیبەنە نوێنەوە و وەک مردوو نا، چەشنی ئەوەی نەخۆش بێت، درێژی بکەن. پەرداخ و شەرووب لە ژوور سەریەوە دانێن و دەریوانەی ژوورەکەی دادەنەوە. با چرا لە ژوورەکەی نەبێت بۆ ئەوەی شەرپەرشتیاری شەکوورە لە مارەبڕیندا باوکی نەخۆشی بێت. کەژاوەی زەماوەند نابێت، دوا سات سێ چوار هاوسێ بانگ بکەن و هیچی تر.

کاتێک ئەوانە بانگ دەکەن، دەڵێن ئەمە دوا ئارەزووی زاوا ئەفەندی بووە... ئەمە زەماوەندێکی شاد نا، چاو بەگریان دەبێت. ئەگەر ئەم کارەمان پێ نەبرێتە سەر، بڵاوەمان پێ دەکەن، تۆش سزا دەدەن. حاڵی بوویت؟"

بەدەم گریانەوە سەری بادا. پێم گوت سواری ئەسپە سپییەکەم دەبم، گەواهیدەران دێنم، زۆرم پێ ناچێت دەگەمەوە ماڵ، با شەکوورە ئامادە بێت، لەمەودا من دەبم بە گەورەی ماڵ و ئێستاش دەچم بۆ لای سەرتاش. هیچ کامێک لەم شتانەم پێشتر دانەڕشتبوو، بگرە لە کاتی قسەکردندا بەخەیاڵمدا دەهاتن. وەک ئەوەی لە هەندێک شەڕدا هەستم پێ دەکرد، باوەڕم وابوو بەندەیەکی زۆر خۆشەویستی خوام و دڵی پێم دەسووتێ و دەمپارێزێت و هەر لەم ڕووەشەوەیە کارم ڕاست دێنێت. هەر هێندەی جارێک لە هەناوی خۆتاندا هەستتان بەم متمانەیە کرد، هەرچی بەخەیاڵتاندا بێت و چ لە دڵتاندا ڕاست بێت، بیکەن و کردەوەشتان ڕاست دەردەچێت.

لە گەڕەکی یاقوتلارەوە بەرەو کەنداوی زێڕین چوار کۆڵانم بڕی. لە مزگەوتی یاسین پاشای گەڕەکی هاوسێمان مەلای ڕیش ڕەش و دەموچاو نوورانیم بینی کلکی گسکێکی بەدەستەوە گرتبوو و لە حەوشە قوڕاوییەکە سەگی بەرەڵای ڕاودەنا. دەردی خۆم بۆ گێڕایەوە و گوتم: "باوکی کچی پوورم لەوەدایە فەرمانی خوا بەجێ بهێنێت، بەڵام دەیەوێت بەر لە مردنی، من و کچەکەی زەماوەند بکەین. کچەکەی، لەبەرئەوەی مێردی لە شەڕ نەگەڕاوەتەوە، ئەمڕۆ لە قازیی ئوێسکودار تەڵاقنامەی وەرگرت." وەک وەڵام بۆ ناڕەزایی مەلا لەمەڕ ئەوەی ژنی تەڵاقدراو بۆ ئەوەی بتوانێت دیسان شوو بکاتەوە، پێویستە بەپێی شەرع مانگێک چاوەڕێ بکات، کاغەزی قازیم پێشان دا و گوتم: "مێردی شەکوورە لەبەرئەوەی چوار ساڵە ونە، بوار نەبووە بۆ ئاوسکردنی ژنەکەی و قازیی ئوێسکوداریش ئەم بەیانییە بۆ ئەم مەبەستە بڕیاری جیابوونەوەی داوە." دەمویست مەلا ئەفەندی دڵنیا بێت لەوەی هیچ تەگەرەیەک لەسەر ڕێی مارەبڕینەکەماندا نییە. بەڵێ، بووک بە خوێن خزمم بوو، بەڵام پورزایی ڕێگری مارەبڕین نەبوو؛ مارەیی پێشووی بەتەواوی کۆتای پێ هێندرابوو؛ جیاوازیی ئاینی و ئاست و سامانمان لە نێواندا نەبوو. ئەگەر ئەو زێڕانەی دەمویست پێشوەخت بۆی درێژ بکەم، وەرگرتبایە و لە شاییی ئاشکرای بەرچاوی هەموو دانیشتووانی گەڕەکدا



مارەی ببڕیبایە، خێرێکی بە هەتیوەکانی بێوەژنەکەش دەکرد. ئایا مەلا ئەفەندی حەزی لە پڵاوی تێکەڵ بە بادەم و قەیسیی وشک هەبوو؟

حەزی لێ بوو، بەڵام هێشتا نیگای لەسەر سەگەکانی بەردەرگای حەوشە بوو. جلوبەرگی شاییی دەپۆشی، دەستێکی بەقژ و ڕیش و کڵاوەکەیدا دەهێنا و دەهات بۆ مارەبڕینەکە. پرسیاری ماڵەکەی کرد، ناوونیشانم بۆ هەڵدا.

مارەبڕینێک دوازدە ساڵ داڵغەی پێوە لێ درابێت، چەندەش پەلەی لێ بکرێت، با بکرێت، چ لەوە خۆشتر هەیە زاوا هەموو شپرزەیی و مەترسییەک لەبیر بکات و خۆی بۆ دەستی دلۆڤان و چەنەبازیی شیرینی سەرتاشێک شل بکات و تەراشی شاییی بۆ بکرێت؟ دووکانی ئەو سەرتاشەی لاقەکانم لە خۆیانەوە منیان بۆ بردبوو، دەکەوتە دەروازەی لای بازاڕی کۆڵانی ماڵە وێرانەکەی گەڕەکی ئاکسەرایەوە، ئەو ماڵەی زاوای خوا لێخۆشبووم و پوورم و شەکوورە ساڵانێکی درێژی دوای منداڵیمان چۆڵیان کردبوو. پێنج ڕۆژ لەمەوبەر یەکەمجار دوای ساڵانێکی درێژ هاتبوومە ئێرە و چاوم بە چاوی یارۆی سەرتاش کەوتبوو. ئەمجار هەر ئەوەندەی چوومە ژوورێ، باوەشی پێدا کردم و لەبری ئەوەی وەک سەرتاشێکی ڕاستەقینەی ئەستەنبوڵی لێم بپرسێت ماوەی دوازدە ساڵی ڕابردوو لە کوێ خۆم شاردووەتەوە، قسەی هێنایە سەر دوایین ورتەورتی گەڕەک و ئەو ئەنجامەی ئاماژەیە بۆ ئەو شوێنەی هەموومان لە ئاکامی ئەم ڕێبوارییە واتادارەی ناومان لێناوە ژیان، پێی دەگەین.

ناتوانم بڵێم وا دەزانم دوازدە ساڵ نا، دوازدە ڕۆژ لەمەوبەر لێرە بووم. کەچی وەستامان چووبووە ساڵەوە، دەستەکانی خاڵیان لێ دەرهاتبوو و بە لەرینەوەی گوێزانەکەی دەستی بەسەر ڕوومەتمەوە دیار بوو بەزیادەوە خووی دابووە ئارەقخواردنەوە. شاگردێکی چاو سەوز و لێو جوان و پێست ئاڵیشی بۆ خۆی ڕاگرتبوو. شاگردەکە بە سەرسامی بۆ وەستای دەڕوانی. بەبەراورد لەگەڵ دوازدە ساڵ لەمەوبەردا، جۆرێک لە ڕێکوپێکی و خاوێنیش بەناو دووکانەکەوە دەبیندرا. ئەو سەتڵەی ئاوی کوڵاوی تێ کرد و بەو ئاوەی لە ژێرەوەی دەڕژا، بەوردی قژ و ڕووی منی شوشت، بە زنجیرێکی نوێ بە بنمیچەکەوە هەڵواسرابوو. لەگەنە گەورە و کۆنەکانی قەڵایی کرابوون، ئاگردانەکەی خاوێن و بێ ژەنگ بوو و گوێزانە دەسک

ئەقیقەکانی تیژ بوون. پشتەماڵێکی پاک و خاوێنی لەبەر بوو و دوازدە ساڵ لەمەوبەر لە خۆی ڕانەدەبینی شتی وا لەبەر بکات. بەخەیاڵمدا هات وەستا دوای ڕاگرتنی ئەم شاگردە شیرین و لەش نەرمەی کە باڵای لە گوێرەی تەمەنی درێژتر بوو، هەم دەستی بە دووکانەکەی و هەم بەخۆیدا هێناوە. بەخۆم نەبوو کەوتمە داڵغە لێدان لەوەی ژیانی هاوسەری بەتەنیا ماڵی پیاوی سەڵت نا، بگرە زیندووبوونەوە و فەرێکی نوێ بە کار و دووکانیشی دەدا و بەدەم ئەم خەیاڵانەوە خۆم ڕادەستی خۆشی و چێژی بۆندار و ئاوی گەرم و سابوونی سەرتاش کرد.

نازانم چەندێک کات تێ پەڕیبوو؛ بە پەنجەی پڕ لە ماریفەتی وەستای سەرتاش و بە گەرمیی ئەو ئاگردانەی بەجوانی دووکانی بچووکی ئەوی گەرم کردبوو، خاوبووبوومەوە. لە سۆنگەی ئەوەی وەک بڵێی دوای ئەو گشت چەرمەسەری و کوێرەوەرییە، ئەمڕۆ ژیان وەک شتێکی بێ بەرامبەر لەپڕ گەورەترین دیاریم پێشکێش دەکات، هەستی سوپاسکردنی یەزدانی مەزنم لەکن ورووژا و زۆر بەپەرۆش بووم بزانم ئەم دیارییە لەکام تای تەرازووی ڕازداری گەردوونی ئافرێندراوی خۆیەوە دەردەچێت. هەستم بە خەم و ئازاریش کرد بۆ زاوای بە مردوویی لە جێگەدا ڕاکشاوم لەو ماڵەی دوای کەمێکی تر دەبم بە سەرگەورەی. خەریک بووم بەدەم ئەم هەست و خەیاڵانەوە خۆم بۆ جووڵان ئامادە دەکرد، لەپڕ لەبەر دەرگای هەمیشە ئاوەڵای دووکانەکە هەستم بە هەبوونی جووڵەیەک کرد، ڕووم وەرگێڕا و بینیم شەوکەوت بوو.

بەشپرزەیی، بەڵام بە هەڵوێستێکی متمانە بەخۆبوونەوە کاغەزێکی بۆ درێژ کردم.

بێ ئەوەی هیچ شتێکی پێ بڵێم، بەدەم چاوەڕێکردنی خراپترین هەواڵەوە هەناوم بە بای سارد لەرزی و نامەکەم خوێندەوە:

"ئەگەر کەژاوەی زەماوەند نەبێت، شوو ناکەم. –شەکوورە."

قۆڵی شەوکەتم بەزۆر ڕاکێشا و لە باوەشم گرت. دەمویست بۆ شەکوورەی خۆم بنووسم: "سەر سەر و سەرچاوان خۆشەویستم." بەڵام کوا قەڵەم و مەرەکەب ڕێیان دەکەوێتە کن سەرتاشی نەخوێندەوار. بەمجۆرە، زۆر بەوریایی چرپاندم بە گوێی شەوکەتدا و بە دایکیم دەگوت: "باشە." بەهەمان چرپە پرسیاری باپیریشیم لێ کرد.



نووستووە."

ئێستا تێ دەگەم، ئێوەش لەگەڵ شەوکەتدا لە ڕووی مردنی زاوامەوە (هەڵبەتە شەوکەت گومان لە شتی تر دەکات) گومانم لێ دەکەن. جێگەی داخە، بەزۆر ماچم کرد. شەوکەوت بێ ئەوەی خۆشیی بە چارەمدا بێت، ڕۆیشت. لە کاتی زەماوەندەکەشدا جلی جەژنی پۆشیبوو و لە دوورەوە وەک دوژمن بۆمی دەڕوانی.

لەبەرئەوەی شەکوورە لە ماڵە باوانەوە بۆ ماڵی زاوا نەدەچوو، تەواو بەپێچەوانەوە، من وەک زاوا ڕێوی چووبوومە ماڵە باوانی شەکوورە، کەژاوەی زەماوەندیش بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ ئەم ڕەوشەدا بوو. بێگومان لە دۆخێکدا نەبووم وەک ئەوەی کەسانی تر دەیانکرد، منیش پۆشاک بکەمە بەر هاوڕێیانی دەوڵەمەند و خزم و ناسیاوانم و سواری ئەسپیان بکەم و لەبەر ماڵی شەکوورە دایانبەزێنم. بەڵام سەرباری ئەوەش، دوو هاوڕێی سەردەمی منداڵیم لەوانەی لەم شەش ڕۆژەی دوای گەڕانەوەم بۆ ئەستەنبوڵ تووشم هاتبوون (یەکێکیان وەک من بووبوو بە نووسیار و ئەوی تریان گەرماوێکی بەڕێوە دەبرد) و سەرتاشە دەلالەکەم، کە لە کاتی تەراشکردنمدا پیرۆزباییی لێ کردم و فرمێسک ڕژایە چاوانی، لەگەڵ خۆمدا هێنا؛ خۆیشم ئەسپە سپییەکەم، کە ڕۆژی یەکەم سواری بووبووم، بەدووی خۆمدا ڕاکێشا و وەک ئەوەی لەو ماڵە هەڵی بگرین و بیبەینە ماڵێکی تر و ژیانێکی دی، پێش دەرگامان لە شەکوورەی خۆم گرت.

خەیرییە دەرگای کردەوە و بەخشیشێکی چەورم دایێ. شەکوورە جلێکی بووکێنیی سوور و تارایەکی ئاودامانی پۆشیبوو. لەناو دەنگی گریان و هەنسک و ناڵین و (ژنێک بەسەر منداڵەکانیدا قیڕاند) و هاوار و ماشاڵای لە ژوورەوە هاتوو لە ماڵ هاتە دەرێ. ئەسپێکی سپیمان وەک یەدەک لەگەڵ خۆماندا هێنابوو شەکوورە بە هونەرەوە سواری بوو. سەرتاشەکە بەزەییی پێمدا هاتبووەوە و لەدوا ساتدا دەهۆڵوانێک و زوڕناژەنێکی پەیدا کردبوو. کاتێک ئەوان لە پێشمانەوە ئاوازێکی لەسەرەخۆی زەماوەندیان دەژەنی، کەژاوەی هەژار و خەمبار، بەڵام بەسەربەرزی، زەماوەندەکەمان کەوتە ڕێ.

هەر هێندەی ئەسپەکانمان وەخۆ کەوتن، تێ گەیشتم ئەم کەژاوەی زەماوەندە

شتێکە شەکوورە بە لێزانیی هەمیشەییی خۆیەوە بۆ مسۆگەرکردنی مارەبڕینەکە سازی داوە. لە سایەی کەژاوەی زەماوەندەکەماندا، ئەگەر لە دوا ساتیشدا بوایە، هەموو گەڕەک بە مارەبڕینەکەیان دەزانی و بەپێی ئەوەی بەمجۆرەش لەلایەن هەمووانەوە پەسەند دەکرا، هەر دژایەتییەک لە داهاتوودا لە بەرامبەر زەماوەندەکەماندا بکرایە، لاواز دەبوو. لەلایەکی ترەوە، بە ئاشکرا ڕاگەیاندنی نیازی زەماوەندکردنمان، گێڕانی بەزمی شایی وەک ئەوەی بمانەوێت پێشانی دوژمنانمان و مێردی شەکوورە و خێزانەکەی بدەین هیچ حسێبێکیان بۆ ناکەین، کاری ئێمەی هەر لە سەرەتاوە دەخستە مەترسییەوە. ئەگەر بەدەستی من بوایە، بێ ئەوەی بە کەس بڵێم و شایی بگێڕم، شەکوورەم مارە دەکرد و دەبووم بە مێردی و دواتر زەماوەندم ڕادەگەیاند.

کاتێک بەسەرپشتی ئەسپە سپی و نازدارەکەی ئەفسانە ئاسامەوە لە پێش کەژاوەی زەماوەندەوە بە کۆڵانەکانی گەڕەکدا ڕێم دەکرد، چاوەکانم بەترسەوە بەدوای حەسەن و پیاوانیدا دەگەڕان، چونکە لەوانە بوو هەر ساتێک لە کۆڵانێکەوە یان لە دەرگای حەوشێکی تاریکەوە دەرپەڕن و پەلامارمان بدەن. کەسانی بەساڵاچوو و پیاوانی پێگەیشتووی لە پێش دەرگا و بن دیواران ڕاوەستاوی گەڕەکم بینی بێ ئەوەی بزانن چ دەقەومێ و دوور لە بێ ڕێزی نواندن، بە سەرسامی سەیری کەژاوەی زەماوەندیان دەکرد. کەسانی نامۆم بینی ڕاوەستابوون و سڵاویان لێمان دەکرد. لە شوێن بازاڕێکی بچووکدا، کە تەواو بێ ویستی خۆمان پێیدا تێ پەڕین، وێڕای شادبوونی ئەو میوەفرۆشەی بێ ئەوەی زیاد لە بەهێ ڕەنگینەکانی و گێزەر و سێوەکانی دوور بکەوێتەوە، لەگەڵ ئێمە چوار پێنج هەنگاوی نا و گوتی: "بێچاوێنی بێت"؛ بە زەردەخەنەی بەقاڵێکی خەمگیندا؛ بە نیگای پڕ لە ڕەزامەندیی نانەوایەکدا کە سووتاویی سەر کولێرەکانی بە شاگردەکەی دەکڕاند، دەمودەست تێ گەیشتم شەکوورە زۆر وەستایانە پێوەندیی فسکەفسک و ورتەورتی خۆی خستبووە کار و بە ماوەیەکی کورت وەرگرتنی تەڵاق و شووکردنی خۆی بە منی بە گەڕەکدا بڵاو کردبووە و بەپەسەندکردنی دابوو. سەرباری ئەوەش، من بەرامبەر هەر هێرشێکی بێ تام و چاوەڕواننەکراو، بگرە بەرامبەر هەر قسە تێگرتن و وشەیەکی دزێو، لەسەر پێ بووم. بۆیە کاتێک لە بازاڕەکە دەرچووین، هیچ گازندەم نەکرد لە دەست ئەو ئاپۆڕەی



منداڵانەی بە هاوار و قیژە و گاڵتەکردنەوە کەوتبوونە شوێنمان و داوای بەخشیشیان دەکرد: لە پێکەنینی ژنانی ناو پەنجەرە و پشت تەلبەند و دەریوانەکانەوە حاڵی دەبووم نەشئە و هەرا و ژاوەژاو و جەنجاڵیی منداڵان، ئێمەی پاراستووە و واتای ڕازی بوون دەگەیەنێت.

بەردەوام چاوم بڕیبووە ئەو ڕێگایەی کەژاوەی زەماوەند دابوویە بەر و لە خوا بەزیاد بێت، لە ئەنجامدا پێچی کردەوە و ڕووی لە ماڵ کرد، بەڵام دڵم لەکن شەکوورە و خەمەکانی بوو. ڕاستییەکەی، ئەوەی بۆ من مایەی خەم بوو، بێ بەختییەکەی نەبوو کە ناچاری کردبوو ڕۆژی مردنی باوکی شوو بکات، بگرە بێ ڕازاوەیی و هەژاریی لە ڕادەبەدەری زەماوەندەکە بوو: ئەسپی هەوسار زیوین و زین نەخشێندراو؛ سواری ئەسپەکان پۆشاکی لە تووکی سەگی دەریا و ئاوریشم چندراو و بە داوی زێڕین نەخشێندراویان پۆشیبێت؛ باری سەدان ئەسپ و گالیسکە دیاری و باوڵی بووکێنی و بەدەیان کچە پادشا و کچە سوڵتان بەدوایەوە بن و ئاپۆڕەی ژنانی پیربووی حەرەمسەرا لە گالیسکەدا دانیشتبن و چیرۆکی دەوڵەمەندیی ڕۆژانی ڕابردوو بگێڕنەوە... ئەمانە شایەنی شەکوورەی من بوون. لە زەماوەندی سەرجەم کچانی دەوڵەمەندا تارایەکی سووری گەورە و لە ئاوریشم چندراو بۆ چاوەزار بەسەر بووکدا دەدرێت و چوار خوڵام بە دارەکانی دەستیان لەمدیو و ئەودیوی ئەسپی بووکەوە تاراکە ڕادەگرن، کەچی لە زەماوەندی ئێمەدا ئەو چوار خوڵامە نەبوون. خزمەتکارێکیش نەبوو میوە و پەڕەی زێڕین و زیوین و بەردی درەوشاوە و مۆمی گەورەی شایی بە داو خەملێندراو و ناهلی(*) هەڵگرتبێت و لە پێشەوە بە ورشەورش ڕێ بکات. لەبەرئەوەی کەژاوەی زەماوەند هیچ ڕێزی لە دەهۆڵکوت و زوڕناژەن نەدەگرت، ئەوان ناوبەناو بێدەنگ دەبوون، لەبەرئەوەی کەسێکیش نەبوو بڵێت: "لاکەون، لاکەون، بووک دێت"، کەژاوەی زەماوەندەکەمان تێکەڵ بە ئاپۆڕەی بازاڕ و ئەو خزمەتکارانەی لە کانیی مەیدان ئاویان پڕ دەکرد، دەبوو. منیش، لەبری شەرم،

(*) ناهل: داری خۆزگە و ئاوات، دارێک بووە بە لک و چڵەوە، بە خشڵ و زیو و شتی تری گرانبەها ڕازێنراوەتەوە و لە سەردەمی عوسمانیدا لە پێشەوەی کەژاوەی زەماوەند و خەتەنە سووران و هتددا ... هەڵگیراوە. – وەرگێڕ –

خەمێک دای دەگرتم و هێندەی نەمابوو فرمێسک لە چاوانم بێتە خوارەوە. کاتێک گەڕاینەوە و لە ماڵ نزیک بووینەوە، بوێرانە و لەپڕ بەسەرپشتی ئەسپەکەمەوە ئاوڕم دایەوە و سەیرێکم کرد، تێ گەیشتم شەکوورە لە پشت تارای پەمەیی بووکێنی و پەچەی سووری خوێنینەوە، لەبری خەمگین بوون بەم دەستکورتی و هەژارییەی شایەنی وی نەبوو، دڵخۆش بوو بەوەی بێ قەزا و بەلا گەیشتووینەتە کۆتای ڕێگا و ئەنجامی بەزمی زەماوەند. منیش دڵم ئاسوودە بوو. بەمجۆرە، وەک ئەوەی هەموو زاوایەک دەیکات، منیش بووکی جوانم، کە دوای کەمێکی تر مارەی دەکەم، لە ئەسپ داگرت و قۆڵم کرد بە قۆڵیدا. کیسەیەکی پڕ لە ئاکچەی پێشتر ئامادەکراوم لەسەرەخۆ و بۆ ئەوەی هەمووان بیبینن و چێژی لێ وەربگرن، بە چنگ بەسەریدا ڕژاند. کاتێک ئەو منداڵانەی هەر لە سەرەتای زەماوەندەکەوە بەدوامانەوە بوون، ئاکچەکانیان لە دەستی یەکتر دەفڕاند، من و شەکوورە چووینە حەوشەوە و بە بەردەڵانەکەدا تێ پەڕین. هەر هێندەی پێمان نایە ماڵەوە، بە سەرسوڕمانەوە هەستمان بە گەرمی و بۆنی گەنیوی تەرمەکە کرد.

دوای ئەوەی ئاپۆڕەی کەژاوەی زەماوەند لە ماڵەوە جێی خۆیان کردەوە، کاتێک بینیم شەکوورەش وەک پیران و ژنان و منداڵانی ماڵەوە (ئۆرهان لە سووچێکەوە بەگومانەوە بۆ منی دەڕوانی) وەک ئەوەی ئەم بۆنە بوونی نەبێت، هەڵدەسووڕا، تاوێک کەوتمە گومانەوە؛ بەڵام لەبەرئەوەی لە شەڕگەکان هێندە هەستم کردبوو بۆنی تەرمی ئەو کوژراوانەی پۆشاکیان ونجڕ ونجڕ و پێڵاو و پشتێنیان کراوە و دادڕاو، ڕوو و چاو لێوەکانیان لە چۆڵەوانی بووبوو بە خۆراکی قەل و داڵ، تا ڕادەی خنکان دەم و گەروو و سییان پڕ کردووم، دڵنیابووم لەوەی بە هەڵەدا نەچووم و دەمزانی بۆنێکی گەنیو دێت.

لە خوارێ، لە ئاشپەزخانە پرسیاری شوێنی زاوا ئەفەندی و هۆی ئەم بۆنەی هەموو ماڵەکەی داگرتبوو لە خەیرییە کرد و پێم گوت هەموو شتێک ڕوون دەبێتەوە. ئەمە گوتن نا، وڕێنەکردنێک بوو لەژێر لێوەوە. لەلایەکی ترەوە، هۆشم چووبووە سەر ئەوەی جاری یەکەمم بوو وەک خاوەن و سەردار لەگەڵ خەیرییەدا دەدوام.

بەدەم گریانەوە گوتی: "لەبەر ڕووناکیی دەستووری ئێوە، لە پێخەوەکەیدا ڕامان



کشاندووە، جلی نووستنمان لەبەر کردووە، لێفەمان داوە بەسەریدا، پەرداخی پڕ لە شەرووبمان لەژوور سەری داناوە. ئەگەر بۆنیشی دێت، ئەوا لەبەر گەرمیی ئاگردانەکەیە."

یەک دوو دڵۆپ فرمێسکی ڕژاندە ناو ئەو مەنجەڵەی گۆشتی مەڕی تێدا سوور دەکردەوە. سەرەتا بە گریانەکەیدا هەستم کرد زاوا ئەفەندی شەوانە ئەمی بردووەتە جێگاوە، بەڵام دواتر شەرمم بەم بۆچوونەی خۆمدا هاتەوە. ئەستەر بێدەنگ و لەخۆبایی لە گۆشەیەکی ئاشپەزخانەکە دانیشتبوو. دوای قوتدانی ئەو شتەی لە دەمیدا دەیجوو، هەستایە سەرپێ.

گوتی: "شەکوورە شاد بکە، نرخی بزانە."

لە ناخی خۆمدا ئەو دەنگی عوودەم بیست کە یەکەم ڕۆژی گەڕانەوەم بۆ ئەستەنبوڵ بە کۆڵانەکاندا ڕۆیشتبووم و گوێم لێ بووبوو. ئاوازی عوودەکە، زیاتر لە خەم، ژیانی تێدا بوو. دواتریش، کاتێک مەلا ئەفەندی لەو ژوورە نیوە تاریکەی زاوای بە جلی نووستنەوە تێدا ڕاکشابوو، مارەی شەکوورەی لە من بڕی، سەدای ئەو ئاوازە لە ناخمدا بوو.

لەبەرئەوەی خەیرییە پێشتر لە چاوترووکاندنێکدا هەوای ژوورەکەی گۆڕیبوو و مۆمەکەشی بە باشی لە گۆشەیەکی تیشکبڕ شاردبووەوە، زاوام بە جلی نووستنەوە کە مرۆڤ هەستی نەدەکرد نەخۆش نییە و لاشەیەکی بێ گیانە، لە مارەبڕیندا سەرپەرشتیاری شەکوورە بوو؛ سەرتاشی دۆستم و پیرێکی فرە لێزانی گەڕەکیش گەواهیدەر بوون. لە کاتی تەدارەکی مارەبڕیندا، کە بە ئاوات خواستن و ئامۆژگاریی مەلا و نزا و پاڕانەوەی هەمووان کۆتای پێ هات، پیاوێکی بەساڵاچووی زۆرزان خەمی تەندروستیی زاوامی لەبەر بوو و لەوەدا بوو بەگومانەوە سەری بەلای ویدا وەربگێڕێت، هەر ئەوەندەی مەلا مارەی بڕی و نەبڕی، لە شوێنی خۆم ڕاپەڕیم و دەستی وشکەوەبووی زاوام لە دەست گرت و تا هێزم تێدابوو، نەڕاندم:

"هیچ خەمتان نەبێت، ئەزبەنی، زاوای شیرینم. هەموو شتێک دەکەم بۆ ئەوەی شەکوورە و منداڵەکانی سکیان تێر بێت و پشتیان قایم بێت و لە ئارامی و خۆشەویستیدا بژین."

دوایش وا خۆم نواند وەک ئەوەی زاوام بیەوێت لە پێخەوی نەخۆشیدا و لەسەر سەرینەکەی چەند شتێکم بە گوێدا بچرپێنێت. بەسەرنج و ڕێزەوە گوێم لە دەمی نزیک خستەوە و وەک چۆن ئێمەی لاوانی ڕێزدار تووشی بەساڵاچووێکی بەڕێزی چاوەڕێی مردن دەبین و چەشنی ئەوەی ئیکسیرمان خواردبێتەوە، بەوپەڕی سەرنجەوە گوێ بۆ یەک دوو ئامۆژگاریی بەنرخی ئەنجامی ژیانێکی تەواو دەگرین، منیش بەوجۆرە هەر چاو و گوێیەکم کرد بە چوار و وام پێشان دا گوێم بۆ زاوام ڕاگرتبێت. مەلا ئەفەندی و پیاوە بەساڵاچووەکەی گەڕەک، پێیان وابوو زاوام لە نوێنی نەخۆشی و لە سەرەمەرگدا ئامۆژگاریم دەکات و بە نیگای خۆیان نیشانیان دا بەڕێز و ڕازیبوونەوە پێشوازییان کردووە لە ڕاستگۆیی و پەیوەستبوونی هەمیشەییی کاتی گوێگرتنم لە غەزوورم. ئومێدەواریشم ئیدی کەس وا بیر نەکاتەوە من پەنجەم لە کوشتنی زاوامدا هەبێت.

بە میوانەکانی ناو ژوورەکەم گوت پیاوە نەخۆشەکە دەیەوێت بەتەنیا بێت. بە چاوتروکاندنێک ژوورەکەیان چۆڵ کرد و بۆ خواردنی پڵاو و گۆشتی سوورەوەکراوی دەستکردی خەیرییە (ئێستا منیش بۆنی لاشەکە و زیرە و جاترەم لێ تێکەڵ دەبوو)، چوونە ژووری پیاوان لە تەنیشت. منیش چوومە هەیوان، کتومت وەک پیاوێکی خەمگین کە بەشپرزەیی بە ماڵی خۆیدا دەگەڕێت، بە بێ هۆشی دەرگای ژووری خەیرییەم خستە سەرپشت و بێ ئاگا لەخۆ چوومە ژوورەوە و بێ گوێدانە ئەو ژنانەی بە چوونە ژوورەوەی پیاوێک بۆ ناویان سەریان سوڕمابوو، بە نیگای شیرین بۆ شەکوورەم ڕوانی. ئەویش بەبینینی من ناوچاوانی لە کامەرانیدا درەوشانەوە. پێم گوت:

"شەکوورە، باوکت بانگت دەکات. مارەت برا، ئێستا دەبێت دەستی ماچ بکەی."

چوار پێنج ژن لەوانەی شەکوورە بۆ مسۆگەرکردنی ئاشکراییی زەماوەندەکە دوا سات لە دوویانی ناردبوو و چەند کچێکی گەنجیش کە بەڕاستگۆییی نیگاکانیاندا دیار بوو خزمی نزیک بن، پەشۆکان و وا خۆیان پێشان دا وەک ئەوەی بیانەوێت ڕووی خۆیان داپۆشن، بەڵام تێر و پڕ سەیریان کردم و لە تەوقی سەرەوە تا نووکی پێ پێوایانم.



زۆر دواتر، میوانەکان نانیان خوارد، گوێز و بادەم و باسووق و نوقڵی ئاکیدە(*) و مێخەکیان پەستایە دەمیان و هێشتا زۆر بەسەر نوێژی ئێوارەدا تێ نەپەڕیبوو، بڵاوەیان لێ کرد. فرمێسکەکانی شەکوورە تاوناتاوێ سەریان دەکرد و سەرەڕۆیی و شەڕی منداڵانیش لە ژووری ژناندا، خۆشییان لەو ناوە هەڵگرتبوو؛ لەناو ئێمەی پیاوانیش، من هیچ بەقسە و لاقرتێی میوانەکان پێ نەکەنیم و نقومبوونم لە بێدەنگییەکی خەمگیندا وا لێک درایەوە پەرۆشی نەخۆشیی خەزوورمم.

ئەو شتەی لەناو گشت ئەم چەرمەسەری و تەنگاوییەدا لە قوڵاییی مێشکم چەسپیوە، ئەوەیە کاتێک پێش نانخواردن لەگەڵ شەکوورە بۆ ماچکردنی دەستی باوکی چووینە ژووری زاوام، لە تاق بوونەوەماندا سەرەتا بەڕێزێکی ڕاستەقینەوە دەستی سارد و وشکهەڵاتووی پیاوە مردووەکەمان ماچ کرد. دواتر کشاینە سووچێکی تاریکی ژوورەکەوەوە و تێر و پڕ یەکترمان ڕامووسی. توانیبووم زمانی گەرموگوڕی ژنەکەم بینێمە ناو دەمم و تامی ئەو نوقڵی ئاکیدەیەی دەدا کە منداڵان بەردەوام لە دەمی دەنێن.

(*) نوقڵی ئاکیدە: یەکێک بووە لە کۆنترین جۆرەکانی نوقڵ و شیرینیی سەردەمی عوسمانی. – وەرگێڕ –

# 34

## من شەکوورەم

دوای ڕۆیشتنی هەمووان، پاش ئەوەی دوایین میوانانی شاییی خەمگینمان پێڵاویان لە پێ کرد، ڕووی خۆیان داپۆشی، منداڵەکانیان دوا دانە نوقڵی ئاکیدەیان نایە دەمیان و دایکانیان دایاننە پێش خۆیان و لە دەرگای حەوشە ئاودیو بوون، بێدەنگییەکی درێژ ئەو ناوەی داگرت. هەموومان لە حەوشە بووین و جگە لە باڵەفڕکێی چۆلەکەیەک نەبێت، کە لە دەولکەی نیوەپڕی قەراغ بیرەکە بە پارێزەوە ئاوی دەخواردەوە، هیچ دەنگێکی تر نەدەهاتە بەرگوێ. کاتێک ئەم مەلەش، کە پەڕە کورتەکانی سەری لەبەر ڕووناکیی ئاگردانەکە دەبریسکایەوە، لە تاریکیدا ون بوو، لە ناخمدا بەدەم ئازارەوە هەستم کرد باوکم لە ماڵە چۆڵەکەمان، ئەو ماڵەی پێ دەچێت ئاوێزانی تاریکی بێت، لەسەرەوە، لە پێخەوەکەیدا بە مردوویی ڕاکشاوە.

دواتر، بە ئاوازێک کە ئۆرهان و شەوکەوت زۆر باش دەزانن لە کاتی ڕاگەیاندنی شتێکدا بەکاری دەهێنم، گوتم: "منداڵینە، ئاوە وەرنە ئێرە."

هاتن.

"لەمەودوا قەرە باوکتانە. دەستی ماچ بکەن."

بە بێدەنگی و بەڕێزەوە دەستیان ماچ کرد. بە قەرەم گوت: "هەتیوە بێ بەختەکانم لەبەرئەوەی بێ باوک پێ گەیشتوون، نازانن چۆن گوێڕایەڵی باوک بن و بەدەم گوێگرتن لە قسەکانییەوە سەیری ناو چاوی بکەن و متمانەی پێ بکەن. بۆیە ئەگەر بێ ڕێزیت لەبەرامبەردا بنوێنن، دڕندەیی و خاوی و ڕەفتاری منداڵانەیان لێ



بوەشێتەوە، دەزانم سەرەتا دڵت فراوان دەبێت لە ئاستیاندا و ئەم ڕەفتارانەیان دەبووری بەوەی تەنانەت جارێکیش باوکی خۆیان نەدیوە و بیریان ناکەوێتەوە و بێ باوک پێ گەیشتوون."

شەوکەت گوتی: "من باوکم دێتەوە بیر."

گوتم: "ششش... گوێ بگرە. لەمەودوا قسەی قەرە بۆ ئێوە، لە سەرووی قسەی منیشەوەیە." ڕووم لە قەرە کرد و گوتم: "ئەگەر گوێیان لێ نەگرتی و بێ ڕێزییان پێت کرد، بچووکترین ئاماژەی بێ ڕەوشتی و شوومی و بەدفەڕی و بێ ئەدەبییان لێ دەرکەوت، سەرەتا هۆشیاریان بکەوە، پاشان بیانبوورە." ئەو ساتە وشەی دارکاریم بەخەیاڵدا هات، بەڵام لێی پەژیوان بوومەوە. "جێی من لە دڵی تۆدا هەرکوێیەک بێت، دەبێت جێی ئەوانیش ئەوێ بێت."

قەرە گوتی: "شەکوورە خاتوون، هەر تەنیا بۆ ئەوە نا ببم بە مێردت، بگرە بۆ ئەوەی ببم بە باوکی ئەم هەتیوە نازدارانەش، زەماوەندم لەگەڵتدا کرد."

"بیستتان؟"

خەیرییە لەلاوە گوتی: "پەروەردگارم، هەرگیز لە تیشکی خۆت بەسەرمانەوە کەم مەکەوە. خوایە بە دلۆڤانیی خۆت بمانپارێزە."

گوتم: "گوێتان لێ بوو، وا نییە؟ ئافەرین کوڕە جوانەکانم. مادام باوکتان هێندەی خۆش بوێن، ئەگەر ئێوە تەنانەت تاوێک بێ ویستی خۆشتان لە قسەی دەربچن، ئەو سەرەتا دەتانبوورێ."

قەرە گوتی: "دواتریش هەر دەیانبوورم."

گوتم: "بەڵام ئەگەر جاری سێیەمیش ئەمان هەمان شتیان کردەوە کە تۆ پێت گوتوون مەیکەن... ئەو کاتە مافتان کوتەکە. حاڵی بوون؟ قەرەی تازە بابتان زۆر توند و تیژە. لە شەڕی غەزەبی خوا و لە پەرێشانترین و خراپترین ئەو شەڕانەی باوکی خوا لێخۆشبووتان نەیتوانی لێیان بگەڕێتەوە، گەڕاوەتەوە. باپیریان زۆر ڕووی پێ داون و فرە هەڵی فڕاندوون. ئیدی باپیرتان گەلێک نەخۆشە."

شەوکەت گوتی: "من دەمەوێت بچم بۆ کن باپیرم."

"ئەگەر گوێڕایەڵ نەبن، قەرە جوان فێرتان دەکات چۆن تێ هەڵدان لە بەهەشتەوە هاتووە. ئەو کاتە، ئیدی باپیرتان ناتوانێت لە دەستی قەرە ڕزگارتان بکات وەک ئەوەی لە دەستی من دەری دەهێنان و دەیبردن. ئەگەر دەتانەوێت خۆتان لە هەڵچوون و تووڕەییی باوکتان بپارێزن، ئیدی نابێت شەڕ بکەن، هەموو شتێک لە نێوان خۆتاندا دابەش دەکەن، نابێت درۆ بکەن، نزای خۆتان دەکەن و ناخەون تا لەبەرکردن تەواو نەکەن، قسەی خراپ بە خەیرییە ناڵێن و گاڵتەی پێ ناکەن... حاڵی بوون؟"

قەرە چەمایەوە و پڕی دایە ئۆرهان و لە باوەشی کرد، بەڵام شەوکەت خۆی دوور ڕاگرت. لە ناخەوە ویستم لە ئامێزی بگرم و بگریم. هەتیوی داماو و خەمگینم، شەوکەتی بێکەس و بەستەزمانم، ئای شتێکی چەند جیاوازی لەم دنیا گەورە و فراوانەدا. تاوێک هەستم کرد منداڵێکم، وەک شەوکەت منداڵێکی تاک و تەنیام لە دنیایە و منداڵی و کلۆڵیی شەوکەت و منداڵیی خۆم لە ئەقڵمدا تێکەڵ بوون و مچوڕکێکم پێدا هات. کاتێک بیرم لە منداڵیی خۆم کردەوە، هاتەوە بیرم چۆن ئێستا ئۆرهان لە باوەشی قەرەدایە، منیش سەردەمانێک دەچوومە باوەشی باوکم، بەڵام بەپێچەوانەی ئۆرهانەوە، کە بەشێوەیەکی کاتی وەک میوەیەکی ڕانەهاتوو بەداری خۆی بەوێوە هەڵواسرابوو، من بەشادمانی لە باوەشی باوکم دەمامەوە و زۆر بەخۆیەوە دەنووساندم و وەک سەگ بۆنمان بە پێستی یەکترەوە دەکرد. هێندەی نەمابوو بدەمە پڕمەی گریان، بەڵام خۆم ڕاگرت و بێ ئەوەی لە خەیاڵمدا بێت، گوتم:

"دەی بزانم، بە قەرە بڵێن: بابە."

ئای شەوێکی چ سارد بوو و حەوشەکەمان چ بێدەنگ بوو. سەگەل زۆر لە دوورەوە بە دەرد و خەمەوە دەوەڕین. کەمێکی تریش کات تێ پەڕی، بێ ئەوەی هەست بکەین، بێدەنگی، وەک خونچەی تاریکی دەمی کردەوە و بڵاوبووەوە.

زۆر دواتر گوتم: "باشە منداڵینە، بابچینە ژووریٚ بۆ ئەوەی هەموو پێکەوە لێرە سەرمامان نەبێت."

من و قەرە وەک بووک و زاوا لەبەر ترسانمان لە بەتەنیا مانەوەی دوای شایی شەرممان دەکرد و دوودڵ بووین، بەڵام نەک هەر من و ئەو، بگرە منداڵەکان و خەیرییە و هەمووومان بەو شەرمەوە و وەک ئەوەی بچینە ماڵی تاریکی کەسێکی



ترەوە، بە دوودڵی چووینە ژوورەوە. لە ژووریٚ بۆنی تەرمی باوکم دەهات، بەڵام لەوە نەدەچوو کەس هەستی پێ کردبێت. کاتێک بێدەنگ بە پلیکانەکاندا سەردەکەوتین، ئەو سێبەرانەی ڕووناکیی مۆمەکانی دەستمان دروستی دەکردن و لە بنمیچەکەیان دەدا، وەک هەمیشە دەخوولانەوە و ئاوێزانی یەکتر دەبوون، جارێک گەورە دەبوونەوە و جارێکیش بچووک، بەڵام من پێم وابوو جاری یەکەمە شتی وا ڕوو دەدات. کاتێک لەسەرەوە، لە هەیوانەکە پێڵاومان دادەکەند، شەوکەت گوتی:

"بەر لەوەی بنووم، دەستی باپیرم ماچ بکەم؟"

خەیرییە گوتی: "پێش تۆزێک سەیرم کرد، تایەکی پیسی گرتووە و حاڵی زۆر خراپە. جنۆکە چووەتە لەشییەوە و بەباشی خۆی قایم کردووە. ئاگری نەخۆشییەکەی سەرتاپای جەستەی تەنیوە. بڕۆنە ژوورەکەتان با جێگەتان بۆ ڕابخەم."

بگرە بەدەم قسەکانییەوە کردبوونییە ژوورەوە. بەدەم جێگە ڕاخستن و سەرچەفکردنەوە و لێفە بڵاوکردنەوە، دەستی بۆ هەر شتێک دەبرد بەشێوەیەک باسی دەکرد وەک ئەوەی شتێکی دانسقە و بێ وێنە بێت و وا دەدوا چەشنی ئەوەی هەرکەسێک ئەمشەو لەم ژوورە نیوە ساردە و لەسەر ئەم سەرچەفە تازانە و لەژێر ئەم لێفە گەرمانەی دروستکراو لە پەڕی باڵندەدا بنوێت، وەک ئەوە وایە لە کۆشکی سوڵتان نووستبێت.

ئۆرهان لەسەر دەستشۆرەکەی دانیشتبوو. گوتی:

"خەیرییە، چیرۆکمان بۆ بگێڕەوە."

خەیرییە گوتی: "هەبوو نەبوو، سەردەمانێک پیاوێکی شین هەبوو. دۆستێکی ڕاستەقینەی جنۆکەشی هەبوو."

ئۆرهان گوتی: "پیاوەکە بۆچی شین بوو؟"

"خەیرییە، هەر نەبێت ئەمشەو چیرۆکێک مەگێڕەوە جنۆکە و پەری و خێوی تێدا بێت."

شەوکەت گوتی: "بۆچی نەیگێڕێتەوە؟ دایە، دوای خەوتنی ئێمە تۆ لە پێخەو دەردەچی و دەچیتە کن باپیرم؟"

گوتم: "باپیرتان، خوا بیپارێزێت، زۆر نەخۆشە. بێگومان شەو دەچمە لای بۆ

خزمەتکردنی. ئەدی دوایی مەگەر نایەمەوە ناو نوێنەکەمان."

شەوکەت گوتی: "با خەیرییە بچێتە کن باپیرم. مەگەر خەیرییە بە شەوان خزمەتی باپیرم ناکات؟"

خەیرییە لە ئۆرهانی پرسی: "تەواو بوو؟" کاتێک قوونی ئۆرهانی بە پارچەیەک پەڕۆ پاک دەکردەوە، سەیرێکی ئەوەی ناو دەستشۆرەکەی کرد و وەک بڵێی لەبەر بۆنەکەی نا، بگرە لەبەرئەوەی پاشەڕۆکەی ئۆرهانی بەکەم دەزانی، چارەی دا بەیەکدا. نیوە بێ هۆشبوونێکی شیرینیش ڕووی ئۆرهانی داگرتبوو. گوتم: "خەیرییە، دەستشۆرەکە بەتاڵ بکە و بیهێنەوە. با شەوکەت شەو لە ژوورەکە دەرنەچێت."

شەوکەت گوتی: "بۆچی بۆم نییە دەربچم؟ بۆچی نابێت خەیرییە چیرۆکێک بگێڕێتەوە جنۆکە و فریشتەی تێدا بێت؟"

ئۆرهان لەتاو ترس نا، زیاتر بەو گەشبینییە بێ ئەقڵانەیەی هەمیشە دوای گووکردن بە ڕوویەوە دەمبینی، گوتی: "چونکە ماڵەوە جنۆکەی تێدایە هەی بێ ئەقڵ."

"دایە، هەیە؟"

"ئەگەر لە ژووری دەربچن و بڵێن با سەیرێکی باپیرمان بکەین، ئەوا جنۆکە دەتاندۆزێتەوە."

شەوکەت گوتی: "قەرە لە کوێ جێی خۆی ڕادەخات؟ ئەمشەو لە کوێ دەنوێت؟"

گوتم: "من نازانم. خەیرییە جێگای بۆ ڕادەخات."

شەوکەوت گوتی: "دایە، تۆ دیسان لەگەڵ خۆمان دەخەوی. وا نییە؟"

"چەند جار بیڵێیمەوە. وەک هەمیشە لەگەڵ ئێوە دەنووم."

"هەتا هەتایە؟"

خەیرییە بە دەستشۆرەکەوە چووە دەرەوە. من نۆ نیگارەکەی ترم لە دۆڵابەکە، لەو شوێنەی لێم شاردبوونەوە، دەرهێنا. بکوژی نامەرد دوایین نیگاری دزیبوو و دەستی لەمانە نەدابوو. لەسەر نوێنەکەم دانیشتم و تێر و پڕ لەبەر ڕۆشنایی مۆمەکە سەیری نیگارەکانم کرد بۆ ئەوەی لە ڕازی ناویان بگەم. ئەم نیگارانە شتگەلێکی هێندە جوان بوون مرۆڤ دەیتوانی وەک بیرەوەرییە لەبیرکراوەکانی خۆی سەیریان بکات و لە



سەیرکردنیشدا، نیگارەکان کتومت وەک نووسین لەگەڵ کەسی سەیرکەردا قسە دەکەن.

بەدەم سەیرکردنی نیگارەکانەوە، هۆشم لای خۆم نەمابوو. ئۆرهان سەری نابوو بە لووتمەوە و بە بۆنی خۆشی سەریدا بۆم دەرکەوت ئەویش سەیری سوورە ناوازە و بەگومانەکە دەکات. وەک ئەوەی جاروبار دەمکرد، بەخەیاڵمدا هات مەمکم دەربهێنم و بێنمە دەمی بۆ ئەوەی بیمژێت. دواتر، ئەو کاتەی لە نیگاری مردنی ترسناکی بەردەمی ترسا و لە نێوان لێوە سوورەکانییەوە بە شیرینی هەناسەی دەدا، تاوێک ویستم ئۆرهان بخۆم.

"دەتخۆم، تێ گەیشتیت؟"

خۆی تەخت کرد و گوتی: "دایە، ئادەی ختووکەم بدە."

قیژاندم و گوتم: "هەستە لەوێ، هەستە هەی ئاژەڵ." ئەمەم گوت و زللەیەکم تێ سرەواند، چونکە لەسەر نیگارەکان پاڵکەوتبوو. سەیرم کرد نیگارەکان هیچیان لێ نەهاتووە، تەنیا نیگاری ئەسپەکە نەبێت کە لەسەرەوە بوو و کەمێک لۆچ بووبوو، بەڵام هەستی پێ نەدەکرا.

دوای ئەوەی خەیرییە بە دەستشۆرە بەتاڵەکەوە گەڕایەوە، من نیگارەکانم کۆکردەوە. لەوەدا بووم لە ژوورەکە دەربچم، شەوکەت بەشپرزەیی هاواری کرد:

"بۆ کوێ دایە، بۆ کوێ دەچیت؟"

"دێمەوە."

بە هەیواندا تێپەڕیم، سارد و سڕ بوو. قەرە لە هەمان ئەو جێیە، لەو گۆشەیەی بەدرێژاییی چوار ڕۆژ لەگەڵ باوکمدا دادەنیشت و باسی نیگار و نەخش و دیدگایان دەکرد، لەبەرامبەر نیمدەرە خاڵییەکەی باوکم دانیشتبوو. نیگارەکانم لەسەر کورسیی قورئانەکە و نیمدەرەکە خستە بەردەمی. لەپڕ ژوورەکە لەبەر ڕۆشناییی مۆمەکە پڕ بوو لە ڕەنگ؛ لە تیشکێک هەر دەتگوت تژەیە لە گەرمایی و زیندوویی سەرسوڕهێن؛ وەک بڵێی لە ناکاو هەموو شتێک کەوتە جووڵە.

بێدەنگ و بەڕێزەوە و بێ ئەوەی جووڵەمان لێوە بێت، ماوەیەکی درێژ سەیری

نیگارەکانمان کرد. ئەگەر کەمێکیش جوولابااین، ئەو هەوایەی لە ژوورەکەی بەرامبەرەوە دەهات و بۆنی مردنی هەڵگرتبوو، مۆمەکەی دەلەراندەوە و بەمجۆرە وا دەهاتە بەرچاو وەک ئەوەی نیگارە پڕ لە ڕاز و نیازەکانی باوکم سەما بکەن. ئەرێ ئەم نیگارانە لەبەرئەوەی بووبوونە هۆی کوشتنی باوکم، بەوجۆرە لەبەرچاوم گەورە بووبوونەوە؟ ئایا لەبەر نامۆییی ئەسپەکە، بێ وێنەییی ڕەنگە سوورەکە، نیگەرانیی دارەکە و خەمگینیی دوو عەبداڵەکە بوو وا من کەوتبوومە بەر کاریگەریی نیگارەکان، یاخۆ لەتاو ترسانم بوو لەو بکوژەی لە پێناویاندا باوکم و تەناتەت کەسانی تریشی کوشتبوو؟ دوای تاوێک، من و قەرە باش حاڵی بووین بێدەنگیی نێوانمان هێندەی نیگارەکان، لەوەشەوە سەرچاوە دەگرێت کەوا لە شەوی زەماوەندماندا پێکەوە بەتەنیا لە ژوورێکداین. هەردووکمان ویستمان قسە بکەین.

گوتم: "سبەینێ دوای ئەوەی لە خەو هەستاین، ئیدی دەبێت هەموو کەسێک بزانێت باوکی بەلەنگازم لە خەودا مردووە." تا چ ڕادەیەک ئەم قسانەم ڕاست بوون؟ وەک بڵێی وشەکانم لە ناخمەوە هەڵنەدەقولان.

قەرە بەهەمان نواندنی سەیرەوە گوتی: "سبەینێ هەموو شتێک باش دەبێت." ڕاستیی گوت، بەڵام بێ ئەوەی باوەڕی پێ هەبێت.

کاتێک بەئاستەم خۆی بزواند و ویستی لێم نزیک بکەوێتەوە، لە ناخەوە ئارەزووم دەکرد باوەشی پێدا بکەم و وەک چۆن سەری منداڵەکانم دەگرم، سەری ویش بخەمە ناو لەپی دەستەکانمەوە.

هەمان کات گوێم لێ بوو دەرگای ژووری باوکم کرایەوە و بەترس و واقوڕمانەوە لە شوێنی خۆم ڕاپەڕیم. غارم دا، دەرگام کردەوە و ڕوانیم: لەبەر ئەو ڕۆشناییییەی دزەی دەکردە هەیوانەکەوە، دەرگای ژووری بابم بە نیوەکراوەیی بینی و مچوڕکم پێدا هات. چوومە هەیوانە سارد و سڕەکە. لەبەرئەوەی ئاگردانی ژوورەکەی باوکم هێشتا دەسووتا، ژوورەوە بۆنی تەرمی لێ دەهات. تۆ بڵێی شەوکەت چووبێتە وێندەرێ، یاخۆ کەسێکی دی؟ تەرمی باوکم لەبەر تیشکی بەئاستەمی ئاگردانەکە بە ئاسوودەیی بە جلی شەوەوە ڕاکشابوو. بیرم کەوتەوە هەندێک شەو بەر لەوەی بخەوێت، لەبەر ڕۆشناییی مۆم "کتاب الروح"ی دەخوێندەوە و منیش پێم دەگوت:



"شەوێکی بەخێر بابە گیان." لەسەرەخۆ پەرداخەکەی لە دەستم وەردەگرت و دەیگوت: "خوا بەنیازی دڵی خۆت لەگەڵدا بکات جوانکیلەکەم." پاشان وەک سەردەمی منداڵی گۆنای ماچ دەکردم و لە نزیکەوە سەیری ناو چاوەکانی دەکردم. سەیرێکی ڕووی ترسناکی باوکم کرد و ترسام. هەم نەمدەویست سەیری ڕووی ڕووی باوکم بکەم و هەم وەک ئەوەی ئیبلیس دنەم بدات، دەمویست ببینم ڕووی تا چ ڕادەیەک ترسناک بووە.

زۆر نەبوو بەترسەوە گەڕابوومەوە ژوورە دەرگا شینەکە و قەرە شالاوی بۆم هێنا. پاڵێکم پێوەنا، بەڵام لەبەر تووڕەیی و هەڵچوون نەمدەزانی چ دەکەم. لەبەر تیشکی لەرزۆکی مۆمەکە یەکمان هێنا و برد، بەڵام ئەوەی کردمان، وەک بڵێی هێنان و بردنێکی ڕاستەقینە نەبوو، لاساییکردنەوەی هێنان و بردن بوو. پێمان خۆش بوو بەریەکدی دەکەوتین و دەستمان لە باسک و ڕان و سنگی یەکتر دەدا. شپرزەیی و شێواویی ئەقڵم لەو بارە دەروونییە دەچوو کە نیزامی لە شیرین و خەسرەودا باسی دەکات: ئەرێ کاتێک من کتومت وەک شیرین دەمگوت: "لێوم ماچ مەکە و ئازارم مەدە"، تۆ بڵێی قەرە، کە بە ئەندازەیەکی زۆر نیزامیی خوێندبووەوە، هەستی نەکردبێت من لە پشت ئەم وشانەمەوە "بیکە"م گوتووە؟

گوتم: "تا دۆزینەی ئەو ئیبلیسە و ئاشکرابوونی بکوژی باوکم، لەگەڵت ناچمە هەمان جێگەوە."

وەک بڵێی هەڵهاتبم، لە ژوورەکە دەرچووم و شەرمێک سەرتای جەستەی داگرتم، چونکە بە دەنگێکی زۆر بەرز قسەم کردبوو و دیار بوو ویستبووم دەنگم بگاتە خەیرییە و منداڵەکان. سەرباری ئەوەش، وەک ئەوەی بمەوێت باوکی داماوم و مێردی خوا لێخۆشبووشم، کە مەگەر هەر خوا بزانێت جەستەی لە چ خاکێکی نامۆ لەمێژە بووە بە تۆز، گوێیان لە هاوارەکەم بێت.

هەر هێندەی گەیشتمە کن منداڵەکان، ئۆرهان گوتی: "دایە، شەوکەت چووە هەیوان."

گوتم: "دەرچوویت؟" هەڵمەتم بۆ برد و ویستم زللەیەکی تێ بسرەوێنم.

شەوکەت خۆی هاویشتەی باوەشی خەیرییەوە و گوتی: "خەیرییە."

خەیرییە گوتی: "دەرنەچوو، تەواوی کات لە ژوورەوە بوو."

لەپڕ مچوڕکێکم پێدا هات و نەمتوانی سەیری ناو چاوانی بکەم. دەستبەجێ حاڵی بووم دوای ڕاگەیاندنی مردنی باوکم، منداڵەکان لەمەودوا بۆ خۆ ڕزگارکردن لە تووڕەیی و هەڵچوونی من، پەنا بۆ خەیرییە دەبەن و ڕازەکانی ئێمەی لەکن دەدرکێنن. ئەم کەنیزەکە ڕشکنەش سوود لەم هەلانە وەردەگرێت و دەسەڵاتی خۆیم بەسەردا دەسەپێنێت. کوشتنی باوکم بە ملی مندا دێنێت و سەرپەرشتیکردنی منداڵەکان دەکەوێتە دەستی حەسەن. دەیکات، بەڵێ. ئەم هەموو بێ ئابڕووییەی لەبەرئەوەیە دەچووە جێگەی باوکمەوە. ئیدی بۆچی لێتان بشارمەوە؛ بێگومان ئەوەی دەکرد. بزەیەکی شیرینم بۆ کرد. پاشان شەوکەتم لە باوەش گرت و ماچم کرد.

ئۆرهان گوتی: "دەڵێم شەوکەت چووە دەرەوە بۆ هەیوان."

"بچنە جێگەوە و بمخەنە نێوان خۆتانەوە با چیرۆکی چەقەڵی بێ کلک و جنۆکەی ڕەشتان بۆ بگێڕمەوە."

شەوکەت گوتی: "بەڵام تۆ بە خەیرییەت گوت چیرۆکێک نەگێڕێتەوە باسی جنۆکەی تێدا بێت. بۆچی خەیرییە بۆی نییە ئەمشەو چیرۆک بگێڕێتەوە؟"

ئۆرهان گوتی: "ئایا بە شاری بێکەسانیشدا تێ دەپەڕن؟"

گوتم: "تێ دەپەڕن. هیچ منداڵێکی ئەو شارە دایک و باوکیان نابێت. خەیرییە تۆ بڕۆ خوارێ و جارێکی تر دەرگاکان تاقی بکەوە. ئێمە لە نیوەی چیرۆکدا خەو دەمانباتەوە."

ئۆرهان گوتی: "من خەو نامباتەوە."

شەوکەت گوتی: "قەرە ئەمشەو لە کوێ دەنوێت؟"

گوتم: "لە ژووری نیگارکێشان. دەی باش خۆتان بە دایکتانەوە بنووسێنن با لە لێفەکەدا گەرممان بێتەوە. ئەم قاچە ڕچیوە هی کامتانە؟"

دوای ئەوەی دەستم بە گێڕانەوەی چیرۆک کرد، وەک هەمیشە دیسان یەکەم کەس ئۆرهان خەوی لێ کەوت و منیش دەنگی خۆم کز کرد. شەوکەت گوتی: "دوای ئەوەی من خەوم لێ دەکەوێت، تۆ لە جێگە دەرناچی. وا نییە دایکە؟"



"دەرناچم."

بەڕاستیش نیازێکی وەهام نەبوو. ڕاستییەکەی، دوای ئەوەی شەوکەت خەوی لێ کەوت، بەخەیاڵمدا هات چ کامەرانییەکە لە شەوی بووکێنیی شووی دووەممدا – سەرباری ئەوەی پیاوێکی کەشخە، ئاوەزیاو و ئارەزووداریش لە ژوورەوە بوو– لە پاڵ کوڕەکانم ڕاکشاوم: بەدەم ئەم بیرکردنەوانەوە خەویشم لێ کەوت بوو، بەڵام خەوەکەم ئاسوودە نەبوو. بەگوێرەی ئەوەی دواتر بیرم کەوتەوە، لەو جیهانە وەیشوومە و نائارامەی نێوان خەون و بێداریدا، سەرەتا لەگەڵ ڕۆحی هەڵچووی باوکم حسێبم کرد، دواتر لە خەیاڵی بکوژی نامەرد هەڵهاتم، چونکە دەیویست منیش بۆ لای ئەو ڕۆحە بنێرێت، بەڵام بکوژەکە کردی بە تەقوهوڕ و هەرا و زەنایەکی لە ڕۆحی بابیشم ترسناکتر و لە کۆڵم نەدەبووەوە. لە خەونمدا بەردی گرتەماڵمان و کێشای بە پەنجەرە و سەربانەکەدا. دواتر بەردی گرتە دەرگا و بگرە پێم وابوو بەزۆر پاڵی بە دەرگاوە دەنا. ئەو ڕۆحە خراپە، زەڕین یان کڕووزانەوەی ئاژەڵێکی لە شێوەی گریاندا لەدوای خۆیەوە دەرکرد. من دەنگەکەم بۆ نەبرایەوە سەر دەنگی هیچ ئاژەڵێک و ترپەی لێدانی دڵم زیادی کرد.

بەدەم ئارەقە دەردانەوە هۆشیار بوومەوە. ئایا لە خەونمدا گوێم لەو دەنگە سەیرە بووبوو، یاخۆ بەڕاستی دەنگەکە لە ماڵەوە هاتبوو و من هۆشیار بووبوومەوە؟ لەبەرئەوەی نەمتوانی تێ بگەم، خۆم نووساند بە منداڵەکانەوە و جووڵەم لەخۆم بڕی و کەوتمە چاوەڕێکردن. کاتێک دەمویست خۆم قایل بکەم بەوەی لە خەونمدا گوێم لە دەنگەکان بووە، دیسان هەمان ناڵینم بیست. ئەو ساتە شتێکی گەورە کەوتە حەوشەوە و زرمەی لێ هەستا. ئەرێ ئەویش بەرد بوو؟

زراوم تۆقی. بەڵام یەکسەر لەوە خراپتریش ڕووی دا: دەنگی تەقوهوڕ لە ماڵەوە دەهاتە گوێم. خەیرییە لەکوێ بوو، قەرە لە کام ژوور نووستبوو، لاشەی باوکی بەستەزمانم چۆن بوو؟ خوایە هەر خۆت بمانپارێزی. منداڵەکان وەک بەرخ نووستبوون.

ئەگەر پێش شووکردنەوەم بوایە، لە جێ هەڵدەستام، وەک پیاوی ماڵەوە بۆ دەستگرتن بەسەر دۆخەکەدا هەوڵم دەدا ترسی خۆم بڕەوێنمەوە و بەگژ جنۆکە و

ڕۆحەکاندا دەچوومەوە. بەڵام ئێستا تەنیا خۆم گرمۆڵە کردووە و باوەشم بە منداڵەکاندا کردووە. دەتگوت ئەم دنیایە کەسێکی تێدا نییە و کەسیش بەهانای خۆم و منداڵەکانەوە نایەت. لە چاوەڕوانی خراپەیەکدا مامەوە و لە خوا پاڕامەوە. دەرگای حەوشە بوو، وا نییە؟ بەڵێ.

لەپڕ و بێ ئەوەی خۆشم بیرم لێ کردبێتەوە چ دەکەم، هەستام، سەربەرگەکەم لەبەر کرد و تێم تەقاند.

لەسەر پلیکانەکان بەچرپە گوتم: "قەرە."

شتێکم کردبووە نووکی پێمەوە و بۆ خوارێ دادەبەزیم. ئەو مۆمەی لە چاو لێکنانێکدا بە پشکۆی ئاگردانەکە دام گیرساندبوو، هەر ئەوەندەی گەیشتمە بەردەلانەکە، کوژایەوە. بایەکی بەهێز هەڵی کردبوو، بەڵام ئاسمان ڕوون بوو؛ دوای ئەوەی چاوم ڕاهات، بینیم تریفەی نیوەمانگ حەوشەکەی بەتەواوی ڕووناک کردبووەوە. پەروەردگارم، دەرگای حەوشە لەسەرپشت بوو. لەو سەرمایە بەدەم هەڵلەرزینەوە مامەوە.

بۆچی چەقۆیەکم لەگەڵ خۆم هەڵنەگرتبوو؟ بگرە مۆمدان یان پارچە تەختەیەکیشم بەدەستەوە نەبوو. لەپڕ لە تاریکییەکەدا بینیم دەرگای حەوشە لەخۆیەوە جووڵا، زۆر دواتر، وەک بڵێی دوای ڕاوەستانی دەرگاکە، گوێم لە جیڕەی بوو. دێتەوە بیرم بەخۆم گوت دەڵێی لە خەونمدایە. بەڵام هۆشم لای خۆم بوو و دەمزانی لە حەوشە دەڕۆم بە ڕێوە.

کاتێک لە ماڵەوە، پێم وابێت لای خوارەوەی سەربانەکە بوو، گوێم لە خشپەیەک بوو، حاڵی بووم ڕۆحی باوکی داماوم لە دەرچوون لە جەستەی، دژواری دەچێژێت. هەستکردنم بەوەی ڕۆحی باوکم ئازار دەچێژێت، هەم نوقمی ئێش و هەم ئاسوودەی کردم. بەخۆم گوت ئەگەر هۆکاری ئەم هەموو تەقوهوڕ و خشپەیە باوکم بێت، کەواتە لەمەوە بەڵایەک بۆ من نایەت. لەلایەکی دی، ئازاری ڕۆحی باوکم، کە پەلەقاژێی بوو هەرچی زووتر دەربچێت و بەتەنیا بۆ ئاسمان بەرز بێتەوە، خەفەتێکی بێ ئەندازەی دامێ و لە خوا پاڕامەوە هاوکاریی باوکی شیرینم بکات. کاتێک بیرم کردەوە ڕۆحی باوکم هەر من نا، منداڵەکانیش دەپارێزێت، فێنکاییەک بە دڵمدا گەڕا. ئەگەر شای



دێوانیش لە پشت دەرگای حەوشەوە بێ و خۆی ئامادە بکات خراپەم بەرامبەر بکات، با لە ڕۆحی ئۆقرە لێبڕاوی باوکم بترسێت.

ڕێک لەو ساتەدا خەمێکم لێ نیشت و گوتم تۆ بڵێی ئەو شتەی ئۆقرەی لە باوکم بڕوە، قەرە بێت؟ ئایا باوکم خەریکە خراپەیەک بەرامبەر قەرە دەکات؟ ئەدی قەرە لە کوێیە؟ هەمان کات کەمێک لەودیو دەرگای حەوشەوە، لە کۆڵان قەرەم بینی و ڕاوەستام. لەگەڵ یەکێک قسەی دەکرد.

هەستم کرد کەسێک لە پشت دارەکانی ناو باخچە خاڵییەکەی ئەوبەری ڕێگا قسەی بۆ قەرە دەکرد. بۆم دەرکەوت خاوەنی ئەو ناڵینەی پێش کەمێک لە پێخەوەکەمدا گوێم لێ بوو، ئەم کەسە بوو و دەمودەستیش حاڵی بووم ئەمە حەسەنە. جۆرێک لە پاڕانەوە و گریان لە دەنگیدا هەبوو، بەڵام لە ئاوازێکی هەڕەشە ئامێزیش بێ بەش نەبوو. لە دوورەوە گوێم بۆ ڕاگرتن. لە شەوی بێدەنگدا کەوتبوونە سافکردنی حسێبی نێوان خۆیان.

هەمان کات حاڵیش بووم خۆم و منداڵەکانم لە ژیاندا تاک و تەنیا ماوینەتەوە. وام بیر دەکردەوە من قەرەم خۆش دەوێت، ڕاستییەکەی، تەنیا دەمویست خۆشم بوێت، چونکە لە دەنگی خەمگینی حەسەن و لە ئازارەکانیدا شتێک هەبوو دڵی منی داخ دەکرد و یەکسەریش لێی تێ گەیشتم.

دەیگوت: "سبەینێ قازی و یەنیچەرە و گەواهیدەر دێنم تا سوێند بخۆن کاکم زیندووە و هێشتا لە چیاکانی عەجەم شەڕ دەکات. مارەبڕینەکەتان ڕەوا نییە. ئێوە لە ژووری زینا دەکەن."

قەرە گوتی: "شەکوورە ژنی تۆ نەبوو، هاوسەری کاکی خوا لێخۆشبووت بوو."

حەسەن بەبڕوا بەخۆبوونەوە گوتی: "کاکم زیندووە. گەواهیدەر هەن دیویانە."

"لەبەرئەوەی چوار ساڵە لە شەڕ نەگەڕاوەتەوە، ئەم بەیانییە قازیی ئوێسکودار ئەوی لە شەکوورە جیا کردەوە. ئەگەر زیندووە، با گەواهیدەرانت پێی بڵێن ئیدی جیا کراوەتەوە."

حەسەن گوتی: "تا مانگێک تێ نەپەڕێت، شەکوورە ناتوانێت شوو بکاتەوە. ئەمە دژی ئاین و قورئانی پیرۆزە. باوکی شەکوورە چۆن بەم ڕەزالەتە ڕازی بوو؟"

قەرە گوتی: "زاوا ئەفەندی زۆر نەخۆشە. لەسەر جێی مردنە... مارەبڕینیش بەدەستووری قازی بووە."

حەسەن گوتی: "ئایا پێکەوە ژەهرتان دەرخواردی زاوات دا و ئەم کارەشتان بەدەستی خەیرییە ئەنجام دا؟"

"غەزوورم لە خەمی ڕەفتارەکانی تۆدایە لە بەرامبەر شەکوورە. ئەگەر کاکت بەڕاستی زیندوو بێت، ئەویش دەتوانێت لە بەدڕەوشتی و ڕەفتاری خراپت بپێچێتەوە."

حەسەن گوتی: "سەرلەبەری درۆیە. ئەمانە بیانووی دەستکردی شەکوورەن بۆ هەڵهاتن لە ماڵ."

لە ماڵەوە دەنگی قیژەیەک هات؛ ئەوەی دەیقیژاند، خەیرییە بوو. دواتر شەوکەتیش هاواری لێ بەرز بووەوە؛ بەسەر یەکدا دەیانقیژاند. منیش بەخۆم نەبوو بەترسەوە قیژاندم و بێ ئەوەی بزانم چ دەکەم، ڕام کرد بۆ ماڵەوە.

شەوکەت بە ڕاکردن بە پلیکانەکاندا هاتە خوارێ و دەرپەڕیە حەوشە. هاواری کرد: "باپیرم سارد و سڕە وەک بەفر. باپیرم مردووە."

پڕمان لەیەک دا و لە باوەشم گرت. خەیرییە هێشتا دەیقیژاند. قەرە و حەسەنیش ئەو قیژەیە و گشت شتەکانی تریان بیستبوو.

ئەمجار شەکەوت گوتی: "دایە، باپیرمیان کوشتووە."

هەمووان ئەمەیان بیست. ئایا حەسەنیش بیستبووی؟ خۆم بەباشی لە شەوکەت ئالآند. بێ ئەوەی شپرزە بم، دامە پێش بۆ ماڵەوە. خەیرییە لەسەر پلیکانەکان ڕاوەستابوو و باسی ئەوەی دەگێڕایەوە چۆن منداڵەکە لە خەو هەستاوە و بە موخەنەتی تێی تەقاندووە.

شەوکەت گوتی: "دایە، مەگەر نەتگوت جێمان ناهێڵیت؟" دەستی کرد بەگریان.

هۆشم لەکن قەرە بوو. لەوێ، لە شیپانەی دەرگای حەوشەدا ڕاوەستابوو. لەبەرئەوەی هۆشی لەکن حەسەن بوو، دەرگای بۆ پێوە نەدەدرا. ڕوومەتی شەوکەتم ماچ کرد، بەتوندی بەخۆمەوە نووساند، بۆنی گەردنیم کرد، هێورم کردەوە و خستمە





باوەشی خەیرییەوە. بەچرپە گوتم: "خەیرییە، هەردووکتان بچنە سەرێ."

چوونە سەرێ. گەڕامەوە بۆ لای دەرگای حەوشە. پێم وا بوو حەسەن ناتوانێت لەم شوێنەوە، چەند هەنگاوێک لە پشت دەرگاوە بمبینێت. ئایا لە باخچە تاریکەکەی ئەوبەرەوە جێگەی گۆڕیبوو و چووبووە پشت دارەکانی ناو تاریکاییی کۆڵانەکەوە؟ بەڵام منی دەبینی و کاتێک قسەی دەکرد، ڕووی قسەی لە منیش بوو. ئەوەی منی پەست دەکرد، ئەوە نەبوو لە تاریکیدا قسە لەگەڵ کەسێکدا بکەیت و ڕووی نەبینیت؛ ڕاستییەکەی، تا زیاتر من، ئێمەی تاوانبار دەکرد، من بە مافدارم دەزانی، وەک ئەوەی باوکیشم جاروبار دەیدا بەبەر گوێمدا، بۆم دەرکەوت هەمیشە ناڕاست و تاوانبار بووم و کاتێک بەئازارەوە پەیم بەوە برد عاشقی کابرای خاوەن ئەم قسانە بووم، دەهریتر دەبووم. پەروەردگارم، هەر خۆت فریام بکەوە. مەگەر ئەڤین لەبری گەیشتن بە ئازار چێشتنی ختوخۆڕایی، ڕێگایەکی باش نییە بۆ گەیشتن بە تۆ؟

حەسەن گوتی تۆ لەگەڵ قەرە یەکتان گرتووە و باوکتان کوشتووە. گوتی گوێی لە قسەی منداڵەکە بووە، هەموو شتێک وەک ڕۆژی ڕوون ئاشکرایە و ئەوەی ئێمە کردوومانە، تاوانێکی دۆزەخییە. دەیگوت سبەینێ دەچێتە کن قازی و گشت شتێکی بۆ دەگێڕێتەوە. ئەگەر من بێتاوان بم و دەستم بە خوێنی باوکم سوور نەبێت، ئەوا من و منداڵان دەباتەوە ماڵەوە و تا کاکی لە شەڕ دەگەڕێتەوە، باوکایەتیمان دەکات. ئەگەر تاوانباریش بم، ئەوا پیاوێک لە شەڕ بێت و ئامادە بێ خوێنی خۆی بدا و لەملاوە ژنەکەی بێ بەزەییانە لێی جیابێتەوە، ئەوا ئەو ژنە شایەنی هەموو سزایەکە. دوای ئەوەی ئێمە لەسەرەخۆ گوێمان لەم قسانە گرت، لەپڕ خامۆشییەک باڵی بەسەر دارەکاندا کێشا.

حەسەن بە هەڵوێستێکی تەواو جیاوازەوە گوتی: "ئەگەر ئێستا بە ئارەزووی خۆت بگەڕێیتەوە ماڵی مێردی ڕاستەقینەت و منداڵەکان هەڵبگری و بێ ئەوەی کەس چاوی لێ بێت، نەرم نەرم و بێدەنگ بۆ ماڵ بگەڕێیتەوە، ئەوا منیش نەخشەی ئەم زەماوەندە ساختەیە و ئەوەی ئەم ئێوارەیە لێرە بیستم و ئەو تاوانەی ئەنجامتان داوە و هەموو شتێک لەبیر دەکەم و لە گشت شتێکتان خۆش دەبم. شەکوورە، لەگەڵ تۆ، تەنیا بەدان بەخۆداگرتنەوە چاوەڕێی گەڕانەوەی کاکم لە شەڕ دەکەین."

ئەرێ سەرخۆش بوو؟ شتێکی هێندە منداڵانە لە دەنگیدا بوو، کە من خەمی ئەوەم بوو ئەو داخوازەی لە بەردەم مێردەکەمدا لێم دەکات، ببێتە هۆی سەر تیاچوونی.

لە نێوان دارەکانەوە بانگی کرد و گوتی: "تێ دەگەیت؟"

بەتەواوی نەمدەتوانی بزانم لە کوێی تاریکییەکەدایە. ئەی پەروەردگارم، فریای ئێمەی بەندەی گوناهکارت بکەوە.

"شەکوورە، دەزانم چونکە ناتوانی لەگەڵ بکوژی باوکت لەژێر هەمان بنمیچدا بژیت."

تاوێک بەخەیاڵمدا هات دوور نییە ئەو باوکمی کوشتبێت و ئێستاش گاڵتەمان پێ بکات. ئەم حەسەنە ئیبلیسێک بوو بۆ خۆی، بەڵام لەوانەشە بەهەڵەدا چووبم.

قەرە ڕووە و تاریکی گوتی: "گوێ بگرە حەسەن ئەفەندی، خەزوورم کوژراوە، ئەمە ڕاستە. نامەردێکی نارەسەن کوشتوویەتی."

حەسەن گوتی: "پێش زەماوەندەکە کوژرا، وا نییە؟ بۆیە کوشتتان چونکە دژی ئەم نەخشەی زەماوەندە و تەڵاقدانی هەڵبەستراو و گەواهیدەرانی درۆزن و فرت و فێڵەکانتان بوو. خۆ ئەگەر قەرەی بە پیاو بزانیبایە، چەندین ساڵ لەمەوبەر کچی خۆی دەدایێ، نەک ئەمڕۆ."

لەبەرئەوەی چەندین ساڵ لەگەڵ پیاوی خوا لێخۆشبووم و ئێمەدا ژیابوو، هێندەی خۆمان ڕابردوومانی دەزانی. لەوەش خراپتر، هەر شتێکی لە ماڵ لەگەڵ مێردمدا باسمان کردبێت و لەبیرمان کردبێت و ئێستاش دەمانەوێت لەبیری بکەین، حەسەن لەتاو ئیرەییی عەشق، ورد و درشتی بیر دەکەوتەوە. بەدرێژاییی ساڵان بیرەوەریی زۆرمان لەگەڵ وی و کاکیدا هەبوو، دەترسام ئێستا حەسەن هەڵیان بڕێژێت و منیش هەست بکەم قەرە چەند نامۆ و نوێ و دوورە.

قەرە گوتی: "گومانمان هەیە تۆ خەزوورمت کوشتبێت."

"ئێوە خۆتان بۆ ئەوەی ڕێی زەماوەندتان بۆ تەخت بێت، کوشتووتانە. ئەمە ئاشکرایە. هەرچی منم، هیچ هۆیەکم نییە بۆ کوشتنی."

قەرە گوتی: "بۆیە کوشتت تا ئێمە زەماوەند نەکەین. هەر ئەوەندەی بیستت مۆڵەتی



داوە شەکوورە تەڵاق وەربگرێت و شوو بە من بکات، ئەقڵی خۆتت لە دەست دا. ئاشکرایە تۆ لە زاوا ئەفەندی بەداخ بوویت، چونکە زاتی خستبووە بەر شەکوورە تا بۆ ماڵە باوان بگەڕێتەوە. دەتویست تۆڵەی ئەوەی لێ بکەیتەوە. دەتزانی تا ئەو لە ژیاندا بێت، بەهیچ جۆرێک شەکوورەت دەستگیر نابێت."

حەسەن بە پێداگرتنەوە گوتی: "درێژەی مەدەیێ، من گوێ لەم قسانە ناگرم. ئێرە زۆر ساردە. هەتا بەردم هاویشت و سەرنجی ئێوەم ڕاکێشا، لێرە ڕەق بوومەوە. ئەرێ ئەوە هیچ گوێتان لێ نەبوو؟"

من گوتم: "قەرە لە ژوورێ سەیری نیگارەکانی باوکمی دەکرد."

ئەرێ بە گوتنی ئەم قسەیە کارێکی چەوتم کردبوو؟

حەسەن بەو نواندنە دەستکردەی کە من بێ ویستی خۆم جاروبار لەگەڵ قەرەدا پێی دەدوێم، قسەی کرد: "شەکوورە خاتوون، تۆ ئەگەر وەک ژنی کاکم دەستی منداڵەکان بگری و بگەڕێیتەوە بۆ ماڵی ئەو ئەفسەری سوارە قارەمانەی هێشتا بەپێی شەرع مێردتە، ئەوا باشترین کار دەکەیت."

وەک ئەوەی بەناو شەودا بچرپێنم، گوتم: "نا، نا، حەسەن، نا."

"کەواتە لێپرسراویم بەرامبەر کاکم و پەیوەستبوونم پێوەی، لەسەرمی پێویست دەکات سبەی زوو بچمە کن قازی و ئەوەی لێرە بیستوومە، بۆی بگێڕمەوە، چونکە دەزانم دواتر حسێبم لێ دەخوازرێت."

قەرە گوتی: "ئاشکرایە حسێبت لێ دەخوازرێت. ئەو کاتەی تۆ دەچیتە لای قازی، منیش ئەم بەیانییە ڕای دەگەیەنم تۆ زاوای ئەفەندیی بەندەی خۆشەویستی سوڵتانمانت کوشتووە."

حەسەن بەئارامی گوتی: "باشە، وا بڵێ."

قیژاندم و هاوارم کرد: "هەردووکتان ئەشکەنجە دەدرێن، مەچنە کن قازی و چاوەڕێ بکەن. هەموو شتێک ڕوون دەبێتەوە."

حەسەن گوتی: "باکم لە ئەشکەنجە نییە. دوو جار ئەشکەنجە دراوم و هەر جارێکیش بینیم تەنیا بە ئەشکەنجەدان تاوانبار لە بێ تاوان جیا دەکرێتەوە.

ئەوانەی بوختان دەکەن با لە ئەشکەنجە بترسن. من باسی کتێب و نیگارەکانی زاوا ئەفەندیی داماو بۆ قازی و گەورەی یەنیچەرە و "شیخ الإسلام"یش دەگێڕمەوە. هەموو کەسێک باسی ئەو نیگارانە دەکات. چییان تێدایە؟"

قەرە گوتی: "هیچیان تێدا نییە."

"کەواتە هەر ئێستا سەیرت کردوون."

"زاوا ئەفەندی داوای کرد من کتێبەکە تەواو بکەم."

"باشە. خوا مەیلی لێ بێ، پێکەوە ئەشکەنجە دەدرێین."

هەردووکیان بێدەنگ بوون. دواتر لە باخچە خاڵییەکەوە گوێمان لە دەنگی پێ بوو. ئایا دەڕۆیشت، یان لە ئێمە نزیک دەکەوتەوە؟ نە توانیمان ببینین و نە زانیشمان چی کرد. ماندووبوونێکی بێ هۆ بوو ئەگەر بەو شەوە ئەنگوستە چاوە بەناو دڕکەزی و گژوگیا و تووتڕکی ئەوسەری باخچەکەدا ڕۆیشتبێت. ئەگەر بەناو دارەکاندا تێپەڕیبایە و لەبەردەم ئێمەشەوە پێچی بکردایەتەوە، هەر نەماندەبینی، بەڵام گوێمان لە هیچ دەنگی هەنگاوێک نەبوو لە ئێمە نزیک بکەوێتەوە. لەپڕ هاوارم کرد: "حەسەن." بەڵام دەنگی لێوە نەهات.

قەرە گوتی: "بێدەنگ بە."

هەردووکمان لەتاو سەرما هەڵدەلەرزین. بێ ئەوەی زۆر بمێنینەوە، دەرگاکانمان بەباشی کلۆم دا و چووینە ژوورەوە. منداڵان پێخەوەکەیان گەرم داهێنابوو. پێش ئەوەی خۆم بخزێنمە پەنایانەوە، جارێکی تریش سەیری باوکم کرد. قەرەش بەدیار نیگارەکانەوە دانیشت.



# 35

## من ئەسپم

بە ڕاوەستانی ئاسوودە و ئارامی ئێستامدا مەڕوانن، ڕاستییەکەی، چەندین سەدەیە من غار دەدەم. دەشتەکان تەی دەکەم، دەچمە شەڕەوە، کچی خەمگینی پادشاکان دەگوازمەوە و بە شوویان دەدەم و لە بەسەرهاتەوە بۆ مێژوو، لە مێژووەوە بۆ ئەفسانە، لە کتێبەوە بۆ کتێب، پەڕە بەپەڕە غارم پێ دەدرێت. هەڵبەتە لەبەرئەوەی لەو گشت بەسەرهات و چیرۆک و ئەو هەموو کتێب و شەڕەدا بەشدار بووم، هاوڕێیی قارەمانانی لە بەزین نەهاتوو و ئەڤیندارانی ئەفسانەیی و لەشکرە خەیاڵییەکانم کردووە و لەگەڵ سوڵتانە سەرکەوتووەکانمان لەم شەڕەوە بۆ ئەو شەڕ غارم داوە، فرە، هەر زۆر فرە نیگارم کێشراوە.

هەستێکی چۆنە هێندە زۆر نیگارت بکێشرێت؟

بێگومان شانازیی پێوە دەکەم، بەڵام دەشپرسم داخۆ ئەوەی هەمیشە نیگاری دەکێشرێت، منم؟ لەم نیگارانەشەوە ئاشکرا دەبێت شێوەی من لە سەری هەرکەسێکدا شتێکی ترە. بەدڵنیاییی هەست دەکەم سەرباری ئەوەش، تایبەتمەندییەکی هاوبەش و یەکبوونێک لە نێوان نیگارەکاندا هەیە.

لە ڕابردوودا برادەرانی نیگارکێش گێڕایانەوە و منیش گوێم لێ بوو: پادشای گاورانی فەڕەنگ بیر دەکاتەوە کچی دۆقی ڤینیسیا بخوازێت. بڕیاری خواستنی دابوو، بەڵام ئەی ئەگەر یارۆی ڤینیسایی خۆی هەژار و کچەکەی ناشیرین بێت؟ بە لێهاتووترین نیگارکێشی خۆی دەڵێت بڕۆ نیگاری کچ و ماڵ و موڵک و شتومەکی

دۆقی ڤینسیام بۆ بکێشە. ڤینیسیاییەکان نازانن نامەحرەم چییە: بەوەوە ناوەستن تەنیا کچەکانیان بخەنە بەردەستی نیگارکێش، بگرە دەرگای گەورەی مایین و کۆشک و سەراکانیشی بۆ دەخەنە سەرپشت. نیگارکێشی هونەربازیش نیگاری ئەو کچە و ئەو ئەسپە بەجۆرێک دەکێشێت هەر هێندەی چاوت پێ کەوت، بیناسیتەوە. کاتێک پادشای فەرەنگ لە حەوشەی کۆشک تەماشای نیگارەکانی لە ڤینیسیاوە هاتوو دەکات بۆ ئەوەی بڕیار بدات کچە بخوازێت یان چ بکات، بارگیرەکەی زەوقی هەڵدەستێت و هەوڵ دەدات سواری کۆڵی ماینی جوانی ناو نیگارەکە بێت و لێی بپەڕێت. ئەم ئاژەڵە فێ لێهاتووە بە ئامێرە زلەکەی خۆی چوارچێوەی نیگارەکەی لەتوپەت کردووە و مەیتەرەکان بەدژواری بۆیان جڵەو کراوە.

دەڵێن: ئەو شتەی کەڵە ئەسپی پادشای فەرەنگی هار کردووە، جوانیی ماینە ڤینیسیاییەکە نییە –بۆ جوانی، جوان بوو–، بگرە ئەوە بووە ماینێک بە نموونە وەرگیراوە و کتومت وەک ئەوەی ئەو ماینە بێت، نیگاری کێشراوە. ئێستا ئایا تاوانە ئەگەر نیگاری ماینێکی لەو جۆرە وەک ئەوەی نیگاری ماینێکی ڕاستەقینە بێت، بکێشرێت؟ لەم دۆخەی ئێستادا، وەک دەبینن جیاوازییەکی ئەوتۆم لەگەڵ نیگاری ئەسپەکانی تردا نییە.

ڕاستییەکەی، ئەوانەی سەرنج لە جوانیی ناوتەنگم و درێژیی لاقەکانم و لەخۆباییبوونی ئێستام بدەن، جیاوازیی منیان بۆ دەردەکەوێت. بەڵام ئەم جوانییانە ئاماژە نین بۆ من وەک ئەسپ، بگرە هێمان بۆ جیاوازیی هونەری ئەو نیگارکێشەی نیگاری منی کێشاوە. هەمووتان دەزانن لە ڕاستیدا ئەسپێک نییە کتومت لە من بچێت. من تەنیا نیگاری ئەو خەیاڵی ئەسپەم کە لە سەری نیگارکێشدایە.

تەماشام دەکەن و دەڵێن: ئەسپێکی چ جوانە، ئەوانە لە ڕاستیدا پەسنی نیگارکێش دەدەن، نەک من. ئەمە بەمەرجێک، هەر ئەسپێک لەوی تر جیاوازە و پێویستە بەر لە گشت کەسێک، نیگارکێش بەم شتە بزانێت. وەرن بڕوانن، هەرامەی هیچ کەڵە ئەسپێک لە هی ئەوی تر ناچێت. مەترسن، دەتوانن زۆر بەباشی لە نزیکەوە سەیری بکەن و تەنانەت بینێنە دەستی خۆشتان. ئەم ئامێرە بێچاوێنییەی من بیچم و چرچ و لۆچی تایبەت بەخۆی هەیە.



ئێمەی ئەسپ، لە کاتێکدا هەریەکەمان جیاواز لەوی تر لە دەستی خوای مەزن و گەورەترین شێوەساز هاتووینەتە دەرێ، ئیدی بۆچی دەستەی نیگارکێشان لەبەر نیگارمان دەکێشێن؟ بۆچی بێ ئەوەی ئاوڕ لە ئێمە بدەنەوە، هەزاران، دەیان هەزار نیگاری ئەسپ دەکێشن و خۆیانی پێوە با دەدەن؟ دیارە لەبەرئەوەی نیگاری جیهانی بەر دیدەی خوا دەکێشن، نەک ئەو جیهانەی خۆیان دەیبینین. ئایا ئەمە هاوبەش پەیداکردن بۆ خوا –دووربێ– و واتای ئەوە نییە بڵێی ئەوەی خوا دەیکات، منیش دەتوانم بیکەم؟ ئەوانەی بە بینینی چاوەکانیان قایل نابن و نیگاری ئەسپی ناو خەیاڵیان لە ڕووانەگەی ئەوەوە –ئەمە ئەسپی بەر چاوی خوایە–، هەزاران جار دەکێشن و ئەوانەی لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە نیگارکێشانی کوێر باشترین نیگاری ئەسپ لەبەر دەکێشن، ئایا بێ ئاینی و پێشبڕکێ لەگەڵ خوادا ناکەن؟

شێوازی نوێی نیگارکێشانی فەرەنگ بێ ئاینی نییە، تەواو بەپێچەوانەوە، گونجاوترین شتە لەگەڵ ئاینی ئێمەدا. دەستم دامێنتان، برایانی ئەرزەڕوومیم بەهەڵە لێم حاڵی نەبن: هەرگیز خۆشیم بەوەدا نایەت کاتێک گاورانی فەرەنگ بێ ئەوەی بزانن حەرام چییە، ژنانیان بە ئاشکرا و بەنیوە ڕووتی دەگەڕێنن؛ لە چێژی قاوە و کوڕی لووس و جوان تێ ناگەن؛ پیاوانیان بێ ڕیش و بێ سمێڵ دەسووڕێنەوە و بەپێچەوانەشەوە، وەک ژن قژیان درێژ دەکەن و دەڵێن حەزرەتی عیسا –دووربێ– هەمان کات خوایشە. تەنانەت زۆریش تووڕە دەبم لێیان و دەڵێم ئەگەر یەکێکیانم بەردەست بکەوێت، یەک جووتکەی توندی لێ دەدەم.

زۆریش لەو نیگارکێشانە بێزارم کە وەک ژن لە ماڵەوە دانیشتوون و ناچنە شەڕ و من ناشیرین پێشان دەدەن. لە نیگاردا وا پێشانم دەدەن کاتێک غار دەدەم هەردوو پێشووم لە یەک کاتدا بۆ پێشەوە درێژ کردووە. هیچ ئەسپێک ئاوا چەشنی کەروێشک ڕاناکات. ئەگەر لاقێکی پێشووم لە پێشەوە بێت، ئەوی تریان لە دواوەیە. هیچ ئەسپێک، وەک ئەوەی لە نیگارەکانی شەڕدا پێشان دەدرێت، کاتێک لاقێکی پێشووی بەتەواوی لەسەر زەوی بێت، ئەوی تریان چەشنی سەگێکی بەمەراق بۆ پێشەوە درێژ ناکات. بەپێچەوانەی ئەوەی چەشنی ئەوەی سێبەری یەکدی بن و بیست جار لەدووی یەک بەسەر هەمان قاڵبدا براون و نیگاریان کێشراوە،

ئەسپەکانی هیچ یەکینەیەکی سوپا لە هەمان کاتدا هەمان لاق بۆ پێشەوە درێژ ناکەن. وەک لە نیگارەکانماندا پێشان دەدرێت، لەبەرئەوەی کەس بە تەنگمانەوە نایەت گیای شینی پێش خۆمان دەماشینەوە و دەخۆین و هەرگیز ڕێکوپێک و بەزەرافەت ڕاناوەستین. ئەرێ بۆچی بەو ڕادەیە شەرم لە ئالیک و ئاو و تەرسی ئێمە دەکرێت؟ بۆچی لە کێشانی نیگاری ئەم هەرامە خوا پێداوەی من دەترسن؟ ئێ خۆ بەتایبەتی منداڵان و ژنان، ئەگەر کەسیان لێوە دیار نەبێت، زۆریان پێ خۆشە و تێر و پڕ سەیری دەکەن. جا چ زیانێکی هەیە؟ مەگەر مەلای ئەرزەڕوومی دژی ئەمەشە؟

گێڕایانەوە و گوتیان: سەردەمانێک لە شیراز پادشایەکی پیر و کەنەفت و ڕاڕا هەبووە. لەبەرئەوەی زراوی تۆقیوە دوژمنەکانی لە تەخت بیهێننە خوارێ و کوڕەکەی بخەنە شوێنی، شازادەی خۆی ناکات بە والی و ڕەوانەی ئەسفەهانی ناکات؛ لە ژوورێکی سووچی کۆشکدا زیندانی دەکات. شازادە سی و یەک ساڵ لە ژوورێکدا بە زیندانکراوی بەسەر دەبات و حەوشە و باخچەی لێوە دیار نابێت و لەناو کتێبدا گەورە دەبێت. دوای ئەوەی وادەی باوکی دێت و دەمرێت، ئەم هەر ئەوەندەی لەسەر تەخت دادەنیشێت، دەڵێت: "دەستم دامێننتان ئەسپێکم بۆ بێنن. بەردەوام نیگاریم لە کتێبەکاندا بینیوە و بەپەرۆشم بزانم شتێکی چۆنە." جوانترین ئەسپی بۆزی کۆشک و سەرای بۆ دێنن، پادشای نوێ کاتێک دەبینێت کونی لووتی ئەسپەکە لە دووکەڵکێش دەچێت و قوونێکی بێ ئەدەب و کەفەڵێکی قەبە و تووکێکی پێوەیە وەک تووکی ئەسپی ناو نیگارەکان نادرەوشێتەوە، تووشی خەیاڵشکان دەبێت و دەستوور دەدات هەرچی ئەسپی وڵات هەیە، بکوژرێت. ئەم هەڵمەتە دڵڕەقانەیە چل ڕۆژی تەواوی خایاندووە و دواجار چۆمەکانی وڵات خەم و خوێنیان پێدا ڕۆیشتووە. پادشای نوێ، وەک بەرئەنجامی دادپەروەریی خوا، لەبەرئەوەی لە بەرامبەر سوپای بەگی تورکمانی قەرەقۆیونلوی دوژمنی، بە پیادەیی دەمێنێتەوە، دەبەزێت و لەتوپەت دەکرێت و دەکوژرێت تا کەس دڵی لە خۆی دانەمێنێت و وەک ئەوەی لە کتێبەکاندا هەیە، نەڵێ تۆڵەی خوێنی ئەسپ نەکرایەوە.



# 36

## من ناوم قەرەیە

دوای ئەوەی شەکوورە لەگەڵ منداڵاندا چووە ژووری خۆی، ماوەیەکی درێژ گوێم بۆ دەنگ و تەقوهوڕی لە بڕانەوە نەهاتووی ناو ماڵەکە ڕاگرت. تاوێک شەکوورە و شەوکەت بە فسکەفسک دەستیان بە قسە کرد و دایکی بە شپرزەیی "شەش"ێکی لێ کرد و بێدەنگی کرد. هەمان کات لە بەردەڵانی لای بیرەکەوە گوێم لە خشپەیەک بوو، بەڵام درێژەی نەخایەند. دواتر سەرنجم خستە سەر نەورەسێکی هەڵنیشتوو لە سەربان، بەڵام ئەویش وەک هەموو شتێکی تر نوقمی بێدەنگی بوو. پاشان گوێم لە ناڵەیەکی هەڵقولاو لە قولاییی ناخەوە بوو، لەبەری ئەوبەری هەیوانەکەوە دەهات، حاڵی بووم: خەیرییە بوو لە خەونی خۆیدا دەگریا. ناڵینەکەی وەرگەڕایە سەر کۆکین؛ لەپڕ کۆکینەکەشی تەقییەوە و بڕایەوە و دیسانەوە ئەو کپی و بێدەنگییە بەدفەڕە دەستی پێ کردەوە. دوای کەمێک، پێم وابوو کەسێک لەو ژوورەی لاشەی زاوامی تێدا ڕاکشاوە، دەگەڕێت، لە شوێنی خۆم وشک بووم.

بەدرێژاییی ماوەی بێدەنگییەکە تەماشای نیگارەکانی پێش خۆمم دەکرد و خەیاڵم لەوە لێ دابوو چۆن زەیتوونی عاشق و پەپوولەی چاوجوان و زەڕکاری خوا لێخۆشبوو بۆیاخیان کردبوون. لە ناخەوە دەمویست منیش وەک ئەوەی زاوام هەندێک شەوان دەیکرد، ڕوو لە دانە بەدانەی نیگارەکان بکەم و بێژم "ئیبلیس"، "مردن"، بەڵام ترسێک ڕێی لێ دەگرتم. با ئەوەش بڵێم ئەم نیگارانە منیان بەتەواوی پەست کردبوو، چونکە سەرباری ئەو هەموو پێ داگرتنەی زاوام نەمتوانیبوو چیرۆکی شیاو بەخۆیان بۆ بنووسم. پێوەندیی کوشتنی زاوام بەم نیگارانەوە هێدی هێدی

وەک ڕاستییەکی دووربێت هەڵنەگر لە مێشکمدا دەچەسپی و لەبەرئەوەش هەستم بەترس و بێ ئۆقرەیی دەکرد: تەنیا بۆ ئەوەی لە شەکوورەوە نزیک بم، بەدەم گوێگرتن لە بەسەرهاتەکانی زاوامەوە وەک پێویست سەیری ئەم نیگارانەم کردبوو. باشە ئێستا دوای ئەوەی شەکوورە بووە بە ژنی من، چما سەرنجم لەم شتە سەیر و سەمەرانە داوە؟ دەنگێکی بێبەزەیی لە ناوەوە وەڵامی دامەوە و گوتی: "لەبەرئەوەی تەنانەت دوای نووستنی منداڵەکانیش، شەکوورە لە جێگە دەرنەهات و نەهاتە کنت." بەئومێدی ئەوەی شۆخی چاوڕەشم دێتە لام، لەبەر تیشکی مۆم ماوەیەکی درێژ سەیری نیگارەکانم کرد و بە پشوودرێژی چاوەڕێم کرد.

کاتێک سەرلەبەیانی بە قیژەی خەیرییە هۆشیار بوومەوە، پرم دایە مۆمدانەکە و دەرپەڕیمە هەیوان. تاوێک بیرم کردەوە حەسەن و ئەو پیاوانەی کۆی کردبوونەوە، دابێتیان بەسەر ماڵەکەدا و بەخەیاڵمدا هات نیگارەکان بشارمەوە. بەڵام هێندەی نەبرد حاڵی بووم خەیرییە بە فەرمانی شەکوورە دەستی بە هاوار و قیژە کردووە بۆ ئەوەی مردنی زاوا ئەفەندی بە منداڵەکان و هاوسێ و دراوسێ ڕابگەیەنێت.

کاتێک لە هەیوان لەگەڵ شەکوورە ڕووبەڕووی یەک بووینەوە، باوەشمان بەیەکدا کرد و یەکدیمان لە ئامێز گرت. منداڵانیش بە قیژە و هاواری خەیرییە لە پێخەو دەرپەڕیبوون و ڕاوەستابوون.

شەکوورە پێی گوتن: "باپیرتان مردووە. بە قوربانتان بم مەچنە ئەو ژوورە."

خۆی لە بن باڵم ڕاپسکاند و چووە کن باوکی و دەستی بەگریان کرد. منیش منداڵانم بردەوە ئەو ژوورەی لێوەی دەرچووبوون و گوتم: "جلوبەرگی بەرتان بگۆڕن، ئاوا ڕەق دەبنەوە." لە لێواری پێخەوەکە دانیشتم.

شەوکەت گوتی: "باپیرم شەو مرد، نەک بەیانی."

تاڵێکی درێژی پرچی جوانی شەکوورە پیتێکی لەسەر بالیفەکە کێشابوو و ئەو پیتە بە منی گوت: "واو". لێفەکە هێشتا گەرمایی شەکوورەی تێدابوو. ئێستا لەگەڵ دەنگی خەیرییەدا، دەنگی قیژە و هاواری ئەویشمان پێ دەگەیشت. لەبەرئەوەی توانای قیژە و هاواری وەک ئەوەی باوکی هەر ئێستا و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو مردبێت هێندە بەلای منەوە سەرسوڕهێن و درۆین بوو، هەستم کرد بەهیچ



کلۆجێک شەکوورە ناناسم و جنۆکەیەکی زۆر نامۆ بە من لە هەناویدایە. ئۆرهان بە نیگایەکەوە وەک ئەوەی داوای مۆڵەتی گریان بکات، گوتی: "من دەترسم."

من گوتم: "مەترسن. دایکتان بۆیە دەگری بۆ ئەوەی هاوسێ و دراوسێ بە مردنی باپیرتان بزانن و بێن."

شەوکەت گوتی: "جا ئەوا هاتن، چ دەبێت؟"

"ئەگەر بێن، لەبەرئەوەی باپیرتان مردووە، هەر ئێمە نا، ئەوانیش خەمبار دەبن و دەگرین. بەمجۆرە ئازارمان دابەش و سووکتر دەبێت."

شەوکەت هاواری کرد: "تۆ باپیرمت کوشت؟"

منیش هاوارم کرد: "ئەگەر دڵی دایکتان بشکێنی، منیش هیچ خۆشم ناوێیت."

وەک ئەوەی دوو کەس لە لێواری چۆمێکی خوڕ و بەهاژەدا بدوێن، هاوارمان دەکرد، نەک وەک ئەوەی منداڵێک لەگەڵ زڕباوکی خۆیدا قسە بکات. شەکوورە، بۆ ئەوەی هاوار و قیژەی لە گەڕەک باشتر ببیسترێت، لەو کاتەدا هاتبووە هەیوان، پاڵی بە تەختەکانەوە دەنا و دەیویست دەریوانەی پەنجەرەکە بکاتەوە.

کاتێک هەستم کرد ناتوانم وەک سەیرکەر چاوەڕێ بکەم، لە ژوورەکە چوومە دەرێ. پێکەوە پەنجەرەی هەیوانەکەمان سوار کرد و بە تەختەکەی ڕامانگرت. لەگەڵ دوایین پاڵ پێوەنانەدا دەریوانەکە کرایەوە و کەوتە حەوشەوە. تیشکی ڕۆژ و سەرما لە ڕوومانی دا و بۆ ساتێک سەرمان سوڕما. شەکوورە بەشێوەیەک دەیقیژاند و هاواری دەکرد وەک ئەوەی بیەوێت بانگ لە سەرانسەری دنیا بکات و دەستی کرد بەگریانێکی بەکوڵ.

مردنی زاوا ئەفەندی بە قیژە و هاوار بە سەرتاپای گەڕەک ڕاگەیەندرا و لە چاوی مندا وەرگەڕایە سەر ئازارێکی زۆر تاڵ و بەسۆتر لەوەی لەو ساتەدا هەستم پێ دەکرد. بەڕاستی بێ یان درۆ، گریانی ژنەکەم منیشی دڵتەنگ کرد. منیش بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو دەستم کرد بەگریان. ئایا بەڕاستی لەتاو خەمی خۆم دەگریام، یاخۆ لە ترسی ئەوەی نەبادا کوشتنی زاوام بخرێتە ئەستۆی من، وا خۆم پێشان دەدا وەک ئەوەی بگریم؟ نازانم.

شەکوورە هاواری دەکرد و دەیگوت: "وەی ڕۆ، ڕۆ، ڕۆ، ئاخ باوکەڕۆ، ڕۆۆۆۆۆ."

ئاوازی هەنسکەکانی منیش لە هەمان بابەت بوو، بەڵام نەمدەزانی بەتەواوی دەڵێم چی. خەڵکی گەڕەک لە ماڵان و لە نێوان دەرگا و پەنجەرەکانەوە سەیریان دەکرد و منیش لەو کاتەدا بەچاوی ئەوان خۆم دەبینی و پێم وا بوو کردەوەکانم ڕاستن. تا زیاتر دەگریام، لە گومانی ئەوەی ئایا ئازار و فرمێسکەکانم ڕاستن یاخۆ نا و دڵەڕاوکێی ئەوەی تاوانی کوشتنم بە ملدا بهێنن و تەنانەت لە ترسانم لە حەسەن و پیاوەکانیشی دادەشۆرام و ڕزگارم دەبوو.

شەکوورە هی خۆم بوو و وەک بڵێی بە هاوار و فرمێسکی چاو ئەمەم پیرۆز دەکرد. کاتێک ژنەکەم دەیقیژاند، من بەرەو خۆم ڕاکێشا و بێ ئەوەی گوێ بدەم بەوەی بەچاوی بە فرمێسکەوە لە منداڵان نزیک دەکەوتەوە، بە عەشقەوە گۆنایم ماچ کرد. سەرباری گریانەکەم هەستم کرد گۆناکانیشی وەک جێگە نەرم و خۆشەکەی، بۆنی دار بادەمەکانی سەردەمی منداڵیمانی لێ دەهات.

دواتر هەموومان، بە منداڵانیشەوە، چووینە کن تەرمەکە. وەک ئەوەی تەرمێکی دوو ڕۆژە نەبێ کە ئیدی بەتەواوی بۆنی دەهات و چەشنی ئەوەی کەسێک بێت لە سەرەمەرگدا، من "لا إله إلا الله"م گوت بۆ ئەوەی زاوام بەر لە مردنی دووبارەی بکاتەوە تا ئەمە دوا وتەی بێ و بچێتە بەهەشتەوە. ئێمەش دواتر وا هەڵسوڕاین وەک ئەوەی زاوام وای گوتبێت و سەیرێکی ڕووی تا ڕادەیەکی زۆر نەماوی و سەری پارچە پارچەیمان کرد و تاوێک بزەمان هاتێ. هەمان کات من دەستەکانم کردەوە و یاسینێکم خوێند، هەموو بێدەنگ بوون و گوێیان گرت. شەکوورە پارچە خامێکی پاکی هێنا، بەوردی و بەجوانی دەمی زاوامان پێ بەست، پێڵووی چاوە ساغەکەشیمان بە دلۆڤانی دادایەوە. بە هێمنی جەستەیمان وەرسووڕاند، لەسەر لای ڕاست پاڵمان خست و ڕووی نەماویمان بەشێوەیەک ڕووی لە ڕووگە بێت، وەرچەرخاند. شەکوورە سەرچەفێکی خاوێنی دا بەسەر باوکیدا.

بێدەنگیی دوای گریان و ئەوەشم پێم خۆش بوو منداڵەکان بەوردبینیی بیرمەندێکەوە سەیری سەرلەبەری ڕووداوەکەیان دەکرد. دواجار وەک کەسێکی خاوەن ژنێکی ڕاستەقینە و منداڵ و ئاگردان و ماڵی خۆم هەستم دەکرد و ئەمەش بیرکردنەوەیەکی پتەوتر بوو لە کۆی ترسەکانی مردن.



نیگارەکانم کۆکردەوە، دانەدانە کردمنە هەگبەی دەستنووسەکانەوە و لەگەڵ خۆمدا بردمن، سەڵتە ئەستوورەکەم پۆشی و بەپڕتاو لە ماڵ دەرچووم. هاوسێ و دراوسێ قیژە و هەرای ئێمەیان بیستبوو و بەخۆشی دەهاتن بۆ چێژ وەرگرتن لە بەخشینەوەی خەم و ئازار. لەناو ئەوانەدا، من پوورێکی پیر و نەوە چڵمنەکەیم، کە حاڵی زاری دەیگوت بەزم قەوماوە و خۆشحاڵ بوو، وێڵ کرد و ڕێک و ڕاست چوومە مزگەوتی گەڕەک.

ئەو کونە مشکە بچووکەی مەلا بە "ماڵ" ناوی دەبرد، وەک لە زۆربەی مزگەوتە بەنواندن و تازە بنیاتنراوەکاندا دەبینرا، بە بەراورد لەگەڵ گومەزی زەبەلاح و حەوشەی فراوان و ورشەدار، جێگایەک بوو تا ڕادەی شەرم پێداهاتنەوە بچووک. مەلاش، وەک ئەوەی بووبوو بەباو، ماڵەکەی لەو کونە مشکە بچووک و ساردەوە بەرەو ناو مزگەوتەکە فراوان کردبووەوە و چاوپۆشیی کردبوو لەوەی ژنەکەی جلی بەنێوان دوو دار شابەڕووی ئەوسەری حەوشی مزگەوتدا هەڵواسیبوو. دوای ڕزگاربوونم لە پەلاماری دوو سەگی بەرەڵا، کە پێ دەچوو هێندەی مەلا ئەفەندی بووبن بە خاوەنی حەوشی مزگەوت و لە کوڕەکانی مەلا، کە بە تێڵاوە سەگەکانیان ڕاو دەنا، لەگەڵ مەلا چووینە گۆشەیەکەوە.

پاش ئەوەی دڵنیابووم دڵگران بووە لەوەی دوای تەقەڵاقدانەکەی دوێنێ مارەبڕینەکەمان بەو نەسپاردووە، لە ڕوویدا هێمایەکم بینی دەیگوت: "خێرە، چ بووە دیسان."

"زاوا ئەفەندی ئەم بەیانییە مرد."

بەدلۆڤانی گوتی: "خوا ڕەحمی پێ بکات و جێگای بەهەشت بێت." باشە بۆچی من وشەی "ئەم بەیانییە"م لە قسەکانم زیاد کرد؟ ئایا قسەیەکم نەکردبوو بەختخۆڕایی بمخاتە ژێر گومانەوە؟ دانەیەکی ترم لەو زێڕانەی دوێنێ دابوومێ، نایە دەستی. پێم گوت پێش بانگدان سەڵەوات بخوێنێت و براکەی بکات بە دەلاڵ و دەستبەجێ سەرانسەری گەڕەک ئاگادار بکاتەوە.

گوتی: "براکەم هاوڕێیەکی نیوەکوێری هەیە، من و ئەو پێکەوە زۆر جوان مردوو دەشۆین."

جا چ لەوە باشتر بوو زاوا ئەفەندیمان بەدەستی نیوەکوێرێک و نیمچە بوودەڵەیەک بشووشتبایە؟ پێم گوت نیوەڕۆ نوێژی مردوو دەخوێندرێت و ئاپۆڕەی زۆر لە کۆشک، نیگارخانە، دەرسخانە و شوێنە فرە بەرزەکانەوە دێن. هیچ شتێکم لێ زیاد نەکرد بێتە هۆی ڕوونکردنەوەی حاڵی ڕوو و سەری پارچە پارچە کراوی زاوا ئەفەندیم، چونکە لەمێژ بوو بڕیارم دابوو ئەم پرسە لە شوێنی بڵنددا چارەسەر بکەم.

لەبەرئەوەی سوڵتانمان بەدواداچوونی پارەی ئەو کتێبەی بە زاوامی سپاردبوو، خستبووە ئەستۆی گەورەی خەزنەداران، پێویست بوو لە پێشدا هەواڵی مردنی زاوا بە ئەو بگەیەنم. بەمەبەستی ئەوەی بتوانم بگەمە کۆشک، چوومە کن وەستایەکی ڕایەخ. کابرا لەلایەنی باوکی خوا لێخۆشبوومەوە خزممان بوو و هەر لە سەردەمی منداڵیی منەوە لە دروومانخانەی بەرامبەر دەروازەی سۆغوک چەشمەدا کاری دەکرد. دەستی بەخاڵ داپۆشراویم ماچ کرد. بە پاڕانەوە و لالانەوەوە پێم گوت هەر چۆنێک بووە دەبێت گەورەی خەزنەداران ببینم. کۆمەڵێک شاگردی سەر ڕووتاوە قوماشی ئاوریشمی ڕەنگاوڕەنگیان لە کۆشیاندا دووتوێ کردبوو و پەردەیان دەدروو. دوای ئەوەی ماوەیەک لای ئەوان ڕای گرتم، خستمیە دوای یاریدەری گەورەی بەرگدرووان و حاڵی بووم بۆ کاری پێوان و حسێب بۆ کۆشک دەچێت. کاتێک لە سۆغوک چەشمەوە چوومە مەیدانی ئالای و بە پێش نیگارخانەی ئەیاسۆفیادا تێ نەپەڕیم، لەوە ڕزگارم بوو لەم ساتەدا نیگارکێشەکانی تر لە تاوانەکە ئاگادار بکەمەوە.

مەیدانی ئالای بەردەوام شوێنێکی کپ و بێدەنگ بوو، کەچی ئێستا وا هەستم کرد پڕ بێ لە ژاوەژاو. لەبەر دەرگای لێپرسراوی سکالا وەرگرتن، لەو شوێنەی سکالاکەران ڕۆژانی کۆبوونەوەی دیوان ڕیزیان لەبەردەمدا دەبەست و لەپاڵ کۆگاکانیشدا کەسێک نەبوو. سەرباری ئەوەش پێم وابوو لە دارتاشخانە، نانەواخانە، پەنجەرەی ژووری نەخۆشان، گەوڕەکان، لە ئەسپ و مەیتەری پێش دەرگای دووەم کە بورجی قوولەداری بەسەرەوە بوو و من بە سەرسامییەوە بۆم دەڕوانی و لەناو دار سەرووەکانەوە ژاوەژاوێکی بەردەوام دەبیستم. ئەم شپرزەیییەی خۆمم گەڕاندەوە بۆ ترسی تێپەڕبوونی دوای تاوێکی ترم بە دەرگای دووەم، بە "باب السلام"دا.



لەبەر دەرگا، نە توانیم سەرنج لەو گۆشەیە بدەم کە دەگوترا جەلادەکان هەردەم لەوێ ساز و ئامادەن، نە توانیشم شپرزەییی خۆم لەو دەرگاوانانە بشارمەوە کە چاوێکیان لە تۆپە قوماشەکەی دەستم کرد. تۆپە قوماشەکەم بۆیە هەڵگرتبوو، تا وا بزانرێت هاوکاریی بەرگدرووی ڕابەرم کردووە.

هەر ئەوەندەی چووینە مەیدانی دیوانەوە، هەموو لایەک لە بێدەنگیدا نوقم بوون. تەنانەت دەمتوانی لە دەمارەکانی تەوێڵ و ملیشمدا هەست بە بەرزبوونەوەی ترپەی دڵم بکەم. لە هاتوچۆکەرانی کۆشک و لە زاوامەوە زۆر وەسپی ئەم شوێنەم بیستبوو و ئێستاش وەک باخچەیەکی ڕەنگاوڕەنگ و ڕازاوەی بەهەشت لە بەردەممدا بوو. بەڵام هەستم بە کامەرانیی کەسێک نەدەکرد چووبێتە بەهەشتەوە، بگرە هەستم بە ترس و ڕێز دەکرد و ئێستا باش تێ دەگەیشتم سوڵتانمان کۆڵەکەی جیهانە و هەستم دەکرد منیش کۆیلەیەکی زۆر سادەی ئەوم. کاتێک بەسەرسامی بۆ مەلی تاوسی چینەکەری ناو سەوزایی، پەرداخی زێڕینی بە زنجیر بەستراو بە کانیی خوڕەخوڕکەر و ئەو چاوشانەی دیوانم دەڕوانی کە بەرگی ئاوریشمینیان پۆشیبوو و بێدەنگ دەڕۆیشتن و دەتگوت پێ بە زەویدا نانێن، لە هەناوی خۆمدا هەستم بەجۆشی توانای یارمەتیدانی سوڵتان کرد. نیگارەکانی کتێبە نهێنی و نیوەناچڵ ماوەکەی سوڵتانمانم نابووە بن هەنگڵم و سوور بووم لەسەر تەواو کردنی کتێبەکە. زەق زەق سەیری قوولەی دیوانم دەکرد و زۆر لە نزیکەوە سەیرکردنی، لە سەرسامی زیاتر، ترسی دەخستە دڵی مرۆڤەوە. خۆیشم نەمدەزانی بەتەواوی چ دەکەم و لەدووی بەرگدرووەکەی پێشمەوە هەنگاوم دەنا.

لاوێکی دەرگاوان درابووە پاڵمان و لەگەڵ ویدا بە ترسێکی وەک ترسی ناو خەونەکان و بێ ئەوەی نقەمان لێوە بێ بە باڵەخانەی دیوەخان و خەزێنەدا تێ پەڕین. هەستێکی وا لە هەناومدا بوو وەک ئەوەی بڵێی پێشتریش لێرە بووبم و ئەم شوێنەم بینیبێت.

لە دەرگایەکی فراوانەوە چووینە ژوورێکەوە بە ژووری دیوانی کۆن ناو دەبرا. لەژێر قوبەیەکی گەورەدا بڕێک وەستام بینی کە قوماش، پارچە پێست، کالانی زیوینی شمشێر و سندووقی گەوهەریان لەبەردەستدا بوو و چاوەڕێیان دەکرد. دەستبەجێ

تێ گەیشتم ئەمانە گورزچێکەر، جزمەدروو، زیوکەر، وەستای قەدیفە، نیگارکێشانی سەر ددانی فیل و سازتاشی عوود بەدەستی سەر بە تاقمی پیشەکارانی سوڵتانمانن. هەموان بەبیانووی وەک حسێبی کاری ڕۆژانە، کرینی کەرەسە و چوونەوە ژوورەوە بەمەبەستی پێوان بۆ ئەندەروون، لە بەردەم دەرگای ژووری گەورەی خەزنەداراندا کۆبووبوونەوە. بێ مۆڵەت وەرگرتن، چوونە ژوورەوە بۆ ئەندەروون قەدەغە بوو. خۆشحاڵ بووم بەوەی هیچ نیگارکێشێکم لەنێو چاوەڕێکەراندا نەبینی.

ئێمەش کشاینە گۆشەیەکەوە و کەوتینە چاوەڕێ بوون. ناوبەناو گوێمان لە دەنگی بەرزی نووسیاری خەزێنە دەبوو لەبەر هەبوونی هەڵەیەک لە حسێبدا داوای دووبارە کردنەوەی وشەیەکی دەکرد، دواتریش گوێمان لە دەنگی وەستایەکی کلیل بوو بەڕێزەوە وەڵامی دایەوە. دەنگەکان زۆر بەئاستەم لە چرپە تێ دەپەڕین. دەنگی شەقەی باڵی ئەو کۆترانەی لە حەوشە دەفڕین و دەنگدانەوەی فڕینیان لە گومەزەکەدا، لە دەنگی گازندەی پارە و کەرەسەی ئێمەی پیشەکاران بەهێزتر دەبیسترا.

کاتێک نۆرە هاتە سەر من و چوومە ژووری بچووک و گومەزداری گەورەی خەزنەداران، لەوێ تەنیا نووسیارێکم بینی. دەمودەست گوتم بابەتێکی گرینگم هەیە دەمەوێت بیبەمە خزمەتی گەورەی خەزنەداران و گوتم کتێبێک کە سوڵتانمان ڕای سپاردووە و زۆر بایەخی پێ دەدات، لە نیوەدا ڕاوەستاوە. نووسیاری خەزێنە لەبن لێوەوە نووزەیەکی کرد، دیار بوو شتگەلێکی لەو بارەیەوە بیستبوو، چاوەکانی کردبووە و منیش نیگارەکانی کتێبەکەی زاوامم پێشان دابوو. کاتێک بینیم لەبەر نامۆیی و کاریگەریی نیگارەکان ئەقڵی سەروبن بوو، ناو و ناسناو و کاری زاوام گوت و لێم زیاد کرد لە سۆنگەی ئەم نیگارانەوە کوژراوە. هەموو شتێکم بەخێرایی دەگوت، چونکە زۆر باش دەمزانی ئەگەر بێ گەیشتن بە سوڵتانمان لە کۆشک بگەڕێمەوە، دەگوترا من ئەو شتە ترسناکەم بەسەر زاوام داهێناوە.

دوای ئەوەی نووسیار ڕۆیشت هەواڵ بە گەورەی خەزنەداران بگەیەنێت، ئارەقەی ساردم دەردا. لە زاوامم بیستبوو گەورەی خەزنەداران هەرگیز لە سوڵتانمان جیا نابێتەوە و جاربەجار بەرماڵی بۆ ڕادەخات و هەندێک جاریش هەڵگری ڕازەکانیەتی.



تۆ بڵێی ئێستا لەبەر خاتری من لە ئەندەروون دەربچێت و بێت؟ زۆریش باوەڕم نەدەکرد هەواڵبەرێک لە دووی نێردرابێت بۆ ئەندەروونی دڵی کۆشک. ئایا حەزرەتی سوڵتانمان لە کوێیە؟ تۆ بڵێی لە کۆشکی سەر کەناری دەریا دابەزیبێت، یاخۆ لە حەرەمسەرا بێت؟ ئەدی بڵێی گەورەی خەزنەدارانیش لەگەڵ وی بێت؟

زۆر دواتر بانگ کرامە ژوورێ؛ با بڵێم خافڵگیر کرابووم و لەبەرئەوەش ترسم بەخەیاڵدا نەهات. بەڵام کاتێک نیشانەی سەرسوڕمان و ڕێزی سەر ڕووی وەستای قەدیفەی ناو دەرگای ژوورەکەم بینی، پەشۆکام. دوای چوونە ژوورەوەشم، تاوێک ترسام و پێم وانەبوو دەتوانم هیچ بڵێم. سەرپۆشێکی نەخشێندراوی لەوانەی تەنیا ئەو و وەزیرەکان دەیانتوانی بیپۆشن، بەسەرەوە بوو؛ گەورەی خەزنەداران بوو. ئەو نیگارانەی نووسیار لە منی وەرگرتبوو، لەسەر مێزێک دایناوون و سەیری دەکردن. وەک ئەوەی بەدەستی خۆم کێشرابن، ترسام. دامەنی کەواکەیم ماچ کرد.

گوتی: "کوڕم، زاوات مردووە، یان من بەهەڵە بیستوومە؟"

تاوێک، نازانم لەتاو شپرزەیی بوو یاخۆ لە سۆنگەی هەستکردن بەتاوانەوە، نەمتوانی وەڵام بدەمەوە و تەنیا بە سەر بەڵێم بۆ کرد. هەمان کات شتێکی بەلای منەوە چاوەڕێنەکراو ڕووی دا: دڵۆپێک فرمێسک لە چاوم هات و بە بەرچاوی نیگای پڕ لە تێگەیشتن و سەرسامیی گەورەی خەزنەدارانەوە، هێدی هێدی بە ڕوومەتمدا هاتە خوارێ. ئایا بوونم لە کۆشک و هاتنی گەورەی خەزنەداران لەلایەن سوڵتانمانەوە و قسە کردنی لەگەڵم، هێندە نزیکبوونم لە سوڵتانمانەوە و هەموو ئەم شتانە منی سەرسام کردبوو؟ نازانم. دڵۆپی تری فرمێسکی تریش لە چاوم هات و لەدووی یەک دەڕژان و ئیدی شەرمیشم لەبەر هەڵگیرابوو.

گەورەی خەزنەداران گوتی: "کوڕم، چەندی دەتەوێت، بگری."

بەدەم هەنسکدانەوە گریام. پێم وابوو لە دوازدە ساڵی ڕابردوودا تەمەنم هەڵکشابوو و گەیشتبوومە دۆخی کەماڵ. بەڵام کاتێک مرۆڤ هێندە لە سوڵتان و دڵی دەوڵەتەوە نزیک دەبێت، دەستبەجێ تێ دەگات منداڵێکە لەو گۆڕەی. باکیشم نەبوو لەوەی وەستایانی زیو و قەدیفە لە دەرەوە گوێیان لە هەنسکەکانم بێت: ئیدی حاڵی بووم دەتوانم هەموو شتەکان بۆ گەورەی خەزنەداران بگێڕمەوە.

بەمجۆرە، چۆنم بە دڵدا هات بۆم گێڕایەوە. کاتێک دەمبینی زەماوەندم لەگەڵ شەکوورە، دژوارییەکانی کتێبەکەی خەزوورم، ڕازی نیگارەکانی بەردەستمان، هەڕەشەکانی حەسەن و تەرمی زاوام دێنە بەرچاوی گەورەی خەزنەداران، من ئاسوودە دەبووم. لەبەرئەوەی بەتەواوی هەبوونی خۆمەوە باوەڕم وابوو بە دادوەریی بێ سنوور و دلۆڤانیی سوڵتانی جیهانپەنامان نەبێت، ناتوانم لەم داوەی تێی کەوتووم دەربچم، هەموو شتێکم دەگێڕایەوە. تۆ بڵێی پێش ئەوەی لێم تێ بگات و ڕادەستی ئەشکەنجەدەران و جەلادەکانم بکات، بەسەرهاتەکەم بەڕاستی بۆ سوڵتانی کۆڵەکەی جیهانمان بگوازێتەوە؟

گەورەی خەزنەداران گوتی: "با هەر ئێستا هەواڵی مردنی زاوا ئەفەندی لە نیگارخانە ڕابگەیەنرێت. با هەموو دەستە و تاقمی نیگارکێشان بەشداری لە ناشتنیدا بکەن."

سەیرێکی ڕووی کردم بۆ ئەوەی بزانێت چ نارەزاییەکەم لە بەرامبەر ئەمەدا هەیە. ئەم بایەخ پێدانە متمانەی پێ داوم و گومانی خۆم لەبارەی ئەوەی کێ و بۆچی زاوا ئەفەندی و زەریف ئەفەندیی زەڕکاری کوشتووە، ڕوون کردەوە. هێمام کرد بۆ پیاوەکانی مەلای ئەرزەڕوومی و گوتم بەبیانووی ئەوەی سازی تێدا لێ دەدرێت و سەمای لێ دەکرێت، پەلاماری تەکییەکان دەدەن. کاتێک بینیم گەورەی خەزنەداران بەگومانەوە دەڕوانێت، ویستم گومانەکانی تری خۆیشمی بۆ باس بکەم: بۆم ڕوون کردەوە لەوانەیە بانگکردنی من لەلایەن زاوامەوە بۆ ئەوەی نەخش و نیگار بۆ کتێبەکەی بکێشم، هەم لەبەر پارە و هەم لەبەر شەرەفی کارەکە، لەناو دەستە و تاقمی نیگارکێشان زەوینەی بۆ بۆڕبۆڕین و ئیرەیی بردنێک، کە نەیانتوانیوە خۆیانی لێ ببوێرن، خۆش کردبێت. پێم گوت پێ دەچێت نهێنی بوونی کارەکە لەنێو خۆیدا بووبێت بەهۆی وەگەڕخستنی ئەو گشت نەفرەت و قین و تەپکە و داوە. بەڵام تا من زیاتر لەسەر گوتنی ئەم شتانە بەردەوام دەبووم، کتومت وەک ئەوەی ئێستا ئێوە هەستی پێ دەکەن، بەشپرزەیی هەستم دەکرد گەورەی خەزنەدارانیش بەجۆرێک لە جۆرەکان لێم کەوتووەتە گومانەوە. پەروەردگارم، با هەموو شتێک ئاشکرابێت، داوای هیچی ترت لێ ناکەم.

بێدەنگییەک هاتە ئاراوە. گەورەی خەزنەداران بە هەڵوێستێک، وەک ئەوەی بێژی



لەبری من شەرم لە قسەکانم و چارەنووسم بکات، نیگای لەسەر من هەڵگرت و لە نیگارەکانی سەر مێزەکەی بڕی.

گوتی: "ئەمانە نۆ دانەن. ئەمە بەمەرجێک ئێمە لەسەر کتێبێکی دە نیگاری لەگەڵ زاوادا ڕێک کەوتبووین. زۆر زیاتر لەوەی لەم نیگارانەدا بەکار هێنراوە، کاغەزی زێڕی لە ئێمە وەرگرتبوو."

گوتم: "هەبێت و نەبێت بکوژی بێ ئاین لە ماڵەوە ئەو نیگارەی دوایی، کە ئاوێکی زێڕی زۆری بەسەردا کرابوو، دزیوە."

"نەمانزانی خۆشنووس کێیە."

"زاوای خوا لێخۆشبووم هێشتا دەقی کتێبەکەی تەواو نەکردبوو. بۆ ئەوەی تەواوی بکەم، چاوەڕووانی هاوکاریی من بوو."

"کوڕم، تۆ دەڵێی تازە بۆ ئەستەنبوڵ گەڕاویتەوە."

"هەفتەیەک لەمەوبەر، سێ ڕۆژ دوای کوژرانی زەریف ئەفەندی گەیشتمەوە ئەستەنبوڵ."

"بۆچی مەگەر زاوای ئەفەندیت ساڵێک بوو نیگاری کتێبێکی هێشتا نەنووسراوی بەکێشان دەدا؟"

"بەڵێ."

"ناوەڕۆکی کتێبەکەی بۆ تۆ باس کردبوو؟"

"دەیگوت ئەو شتانەی سوڵتانمان دەیانخوازێت: کتێبێکی وەهایە کاتێک هەزار ساڵی تەواو بەسەر کۆچی پێغەمبەرماندا تێ دەپەڕێت و ساڵنامەی ئیسلامی ساڵی هەزارەیەم پیشان دەدات، ترسی هێز و دەوڵەمەندیی ئالی عوسمانی شمشێر و سەروەریی ئیسلام دەخاتە دڵی دۆقی ڤینیسیاوە. بڕیار بوو ئەم کتێبە چیرۆک و نیگاری بەنرخترین شتەکانی دنیای ئێمە، ئەو شتانەی هەرگیز دەستبەرداریان نابین، لەخۆ بگرێت. کتومت چەشنی ئەوەی لە کتێبی دانایانیشدا هەیە، وا نیاز بوو نیگارێکی سوڵتانمانیشمان بخرێتە دڵی کتێبەکەوە. لەبەرئەوەی سوود لە شێوازی وەستایانی فەرەنگیش وەردەگیرا، چاوەڕێ دەکرا کاتێک دۆقی ڤینیسیا چاوی بە کتێبەکە دەکەوت، ویستی سەرمامی و دۆستایەتی لەکن بورووژایە."

ئامـاژەی بۆ نیگارەکـان کـرد و گـوتی: "ئـەمـانە دەزانم، بـەڵام ئایا بەنرخـتـرین و بنەڕەتیترین شتەکانی ئالی عوسمان ئەم سەگ و دارانەن؟"

"زاوای خوا لێخۆشبووم دەیگوت کتێبەکە دەوڵەمەندیی سوڵتانمان خۆی نا، هێزی مانەوەی و خەمی شاراوەی پێشان دەدات."

"نیگاری سوڵتانمان؟"

"نەمـبینیـوە. کێ دەزانێت، ئێستا دەبێت لەو شوێنە بێ کە بکوژی بێ ئاین لێی شاردووەتەوە، لە ماڵەکەی بێت."

زاوای خوا لێخۆشبووم ئێستا کەوتبووە بارێکەوە وەک ئەوەی لە بەرامبەر ئەو زێڕەی وەرگری گرتبوو، کتێبی داواکراوی ئامادە نەکردبوو، لەبری ئەوە کۆمەڵێک نیگاری بەکێشان دابوو و ئێستا بێ نرخ دەهاتنە بەرچاوی گەورەی خەزنەداران. ئایا گەورەی خەزنەداران وەک کەسێک بۆ منی دەڕوانی ئەو کابرا هیچ لەباردا نەبوو و جێی متمانە نەبووەم بۆ ئەوە کوشتووە تا بتوانم کچەکەی بهێنم، یان بۆ نموونە پەڕە زێڕینەکانی بفرۆشم؟ لەبەرئەوەی بە نیگاکانیدا هەستم کرد خەریکە دەفتەرم دەپێچرێتەوە، بەدوایین هەوڵ و پەشۆکانەوە قسەم کرد و ڕوونم کردەوە زاوام پێی گوتووم لەوانەیە یەکێک لەو وەستای نیگارکێشانەی ئەو کاری دابوونێ، زەریف ئەفەندیی بێچارەی کوشتبێت. باسی ئەوەم کرد چۆن زاوام لە زەیتوون و لەقلەق و پەپوولە کەوتووەتە گومانەوە، بەڵام زۆر درێژەم نەدایێ. نە بەڵگەی تەواوم هەبوو و نە متمانەشم بەخۆم بوو. هەستیشم دەکرد گەورەی خەزنەداران ئێستا وەک نامەردێکی بوختانکار و بوودەڵەیەک، کە لە پاشملە قسە دێنێت و دەبات، بۆم دەڕوانێت.

گەورەی خەزنەداران گوتی پێویست بوو ئەوە لە نیگارخانە بشارینەوە کە زاوا بە مردنی ئاسایی نەمردووە و من ئەمەم وەک نیشانەی سەرەتای دەست پێکردنی هاوکاری لەگەڵ مندا بینی و پێم خۆش بوو. نیگارەکان لەکن گەورەی خەزنەداران مانەوە؛ گاڤێک لەژێر نیگای وردی دەرگاوانانـدا لە دەروازەی "باب السلام"ەوە دەرکەوتم، ئەو دەروازەیەی پێش کەمێک لێوەی هاتبوومە ژوورێ و وەک ئەوەی چووبێتمە بەهەشتەوە وەجۆش کەوتبووم، وەک کەسێک دوای ساڵانێکی درێژ بۆ ماڵی خۆی بگەڕێتەوە، ئاسوودە بووم.



# 37

## من زاواتانم

تەدارەکی ناشتنم کتومت ئەوەی ئارەزووم دەکرد، زۆر ڕێکوپێک بەڕێوەچوو. گشت ئەو کەسانەی دەمویست بێن، هاتن. لەو وەزیرانەی لە سەروبەندی مردنمدا لە ئەستەنبوڵ بوون، حاجی حوسێن پاشا قوبرسی و تۆپاڵ باقی پاشا بە ئەمەکەوە یادی ئەو خزمەتە زۆرانەیان کردووە کە سەردەمانێک پێشکێشم کردبوون. هاتنی دەفتەردار قرمزی مەلەک پاشا، کە لە ڕۆژی مردنی مندا هەم ئەستێرەی فرە لە دەرەوشانەوەدا بوو و هەم بەخراپە باسی دەکرا، جمووجووڵی خستە حەوشی ساکاری مزگەوتی گەڕەکی ئێمەوە. بەتایبەتی کاتێک بینیم مستەفا ئاغای سەرۆک چاوش هاتووە، هەر زۆر شادمان بووم. ئەگەر ژیابام و لە ژیانی چالاکی دەوڵەتدا بەردەوام بام، ئێستا منیش لە پلە و پایەی ئەودا دەبووم. کەمالەدین ئەفەندیی تەزکەرەنووس؛ چاوشەکانی دیوان، ئەوانەی هەریەکەیان یان هاوڕێی گیانی بەگیانی یان دوژمنم بوو؛ سەرت سالم ئەفەندیی گەورەی نامەنووسان کە هێشتا وەک هەمیشە بە گەشبینییەوە بزەی سەر لێوی دەپارێزێت؛ کارمەندانی دیوان، ئەوانەی پێشووەخت لە ژیانی چالاکی دەوڵەت کشابوونەوە؛ هاوڕێیانی دەرسخانەم؛ کەسانێکی تر کە بەپەرۆش بووم بزانم چۆن و لە کوێ هەواڵی مردنی منیان زانیوە؛ خزم و کەسوکار و لاوان، جڤاتێکی زۆر فراوان و بەویقار و بەرچاویان پێک هێنابوو.

شانازیم بە جڤات و ئەمەکداری و خەمەکانیانەوە دەکرد. هاتنی هەریەک لە حازم ئاغای گەورەی خەزنەداران و سەرگەورەی دەستەی پاسەوانانی کۆشک پێشانی دا

حەزرەتی سوڵتانمان لە ناخەوە بۆ مردنی من خەمگین بووە. تۆ بڵێی ئەمە واتای ئەوە بێ هەوڵی زۆر دەدات و ئەشکەنجەدەران دەخاتە جووڵە بۆ دۆزینەوەی ئەو نامەردەی بکوژم؟ نازانم. بەڵام ئێستا دەبینم ئەو نەفرەتییە لەگەڵ نیگارکێشان و خۆشنووسانی تردا لە حەوشە نیشانەی ئازارێکی بەویقار و ئەوپەڕی بەسۆ بە ڕوویەوەیە و سەیری دارەمەیتەکەم دەکات.

دەستم دامێنتان وا تێ نەگەن ڕقم لە بکوژی خۆم هەستابێت و بەدوای تۆڵە سەندنەوەوە بم، یان لەبەرئەوەی بە ناپاکی و بێ بەزەییانە کوژراوم، ڕۆحم هەراسان بێت. ئێستا من لە ئاستێکی تەواو جیاوازدام و ڕۆحیشم، لەبەرئەوەی دوای چێشتنی چەرمەسەریی چەندین ساڵە بەڕووی دنیاوە ئێستا خۆی دۆزیوەتەوە، فرە ئاسوودەیە.

دوای ئەوەی ڕۆحی بەئازارم بەشێوەیەکی کاتی لە جەستەم، کە بە زەبری پێداکێشانی قوتووی مەرەکەبەکە نوقمی خوێن بووبوو، دەرچوو و تاوێک لە تیشکدا لەرزی، دوو فریشتەی جوان و دەم بەپێکەنین لەو تیشکە جوانەدا و کتومت وەک ئەوەی چەندین جار لە "كتاب الروح"دا خوێندبوومەوە، هێدی هێدی نزیک بوونەوە و وەک ئەوەی ئیدی من بەتەنیا ڕۆحێک نەبم، بگرە هێشتا جەستەیەکم هەبێت، دەستیان دایە بن پیلم و بەرزیان کردمەوە. ئای وەک ئەوەی لە خەونی کامەراندا دەبینرێت، چەند خێرا و بەنەرمی و بێ هەژان بەرز بووینەوە. بە دارستانی ئاگریندا تێ پەڕین، لە ڕووباری تیشک پەڕینەوە، چووینە دەریای تاریکی و چیای بەفر و سەهۆڵبەندانەوە. هەریەک لەمانە ماوەی هەزاران ساڵی دەخایەند، بەڵام بەلای منەوە هێندەی چاو نوقاندنێک کورت بوو.

ئا بەمجۆرە، بەناو جڤاتی جۆراوجۆر و بوونەوەری سەیر و سەمەرە و ئەو لیتاو و هەورانەدا تێ پەڕین کە جمەیان دەهات لە مەگەز و باڵندەی لە ژمارە نەهاتوو و هەر حەوت چینی ئاسمانمان بڕی. لە هەر چینێکی ئاسمان، فریشتەی هەرە پێشەوە لە دەرگای دەدا. کاتێک پرسیار دەکرا "ئەوە کێیە؟"، ئەویش بەهەموو ناو سیفەتەکانمەوە پێناسەی منی دەکرد، لێی زیاد دەکرد و دەیگوت: "بەندەیەکی باشی خوایە." منیش فرمێسکی شادی لە چاوانم دەهات، بەڵام دەمزانی لەوانەیە هێشتا



هەزاران ساڵمان مابێت بۆ ڕۆژی هەڵسانەوە، بۆ ئەو ڕۆژەی کەسانی بەهەشتی و دۆزەخیی تێدا جودا دەکرێنەوە، چونکە هەموو شتێک بەکەمێک گۆڕانکاریی بچووکەوە، وەک ئەوەی "غزالي" و "الجوزية" و زایانانی تر لە پەڕەکانی نووسراو لە سەرەمەرگدا باسیان کردووە، دەچووە پێش. ئەو بابەتانەی لە کتێبەکاندا بێ چارەسەرکردن مابوونەوە، یان ئەو شتانەی وەک ڕازی تاریک هێشترابوونەوە و دەگوترا تەنیا مردوو دەتوانێت بیانزانێت، ئێستا یەک بەیەک بە تیشکی هەزار ڕەنگ دەبریقانەوە و ڕۆن دەبوونەوە.

باشە چۆن باسی ئەو ڕەنگانەی لە نێوان سەرجەم ئەم بەرزبوونەوە شاهانەیەدا بینیم، بکەم؟ بینیم سەرانسەری گەردوون لە ڕەنگ ئافرێندراوە و هەموو شتێک ڕەنگە. وەک چۆن هەستم دەکرد ئەو هێزەی من لە هەموو شتەکانی تر دادەبڕێت، لە ڕەنگ دروست بووە، ئێستاش حاڵی دەبووم ئەو شتەی منی لە ئامێز گرتووە و بە سەرانسەری گەردوونەوە دەمبەستێتەوە، هەر ڕەنگە. ئاسمانی ڕەنگ نارنجی، جەستەی جوانی ڕەنگ سەوزی وەک ڕەنگی گەڵای داران، هێلکەی ڕەنگ قاوەیی و ئەسپی ئەفسانەییی ڕەنگ شینی وەک ڕەنگی ئاسمانم بینی. گشت شتێک وەک شتی ناو ئەو نیگار و داستانانە بوو کە ساڵانێکی زۆر بە چێژەوە سەیرم کردبوون و لەبەرئەمەش، هەم هەموو شتێکم بە سەرسامی و شەیدابوونەوە دەبینی و هەم وەک ئەوە وابوو بینراوەکانم بەجۆرێک لە جۆرەکان لە بیرەوەرییەکانی خۆمەوە دەربچن. حاڵی بووم ئەو شتەی بیرەوەریم پێی دەگوت پارچەیەکی سەرتاپای دنیایە و سەرانسەری گەردوونیش، لەبەر ئەو زەمانە بێ سنوورەی بە ڕوومدا کراوەتەوە، لە داهاتوودا، سەرەتا دەبێت بە ئەزموونم و دواتریش بە بیرەوەریم. کاتێک لەم ئاهەنگی ڕەنگانەدا گیانم سپارد، ئەوەش تێ گەیشتم بۆچی وەک ئەوەی لە کراسێکی تەنگ هاتبمە دەرێ، ئاسوودە بووم: لەمەوپاش هیچ شتێک بۆ من قەدەغە نابێت و زەمانێک و شوێنێکی بێ سنوورم هەبوو تا بتوانم لە گشت کات و شوێنێک بژیم.

هەر هێندەی هەستم بەمە کرد، بە ترس و کامەرانییەوە پەیم برد بە نزیکیم لە (ئەو). لەو کاتەدا بەنەوازییەوە هەستم بە هەبوونی ڕەنگێکی سووری لەگەڵ هیچ شتێکی تر بەراورد نەکراودا کرد.

بە ماوەیەکی کورت هەموو شتێک نوقمی ڕەنگی سووری تۆخ بوو. جوانیی ئەم ڕەنگە لە هەناوم و لە سەرانسەری گەردووندا ڕەنگی دەدایەوە. تا هێدی هێدی زیاتر لێی نزیک دەبوومەوە، لە خۆشیاندا لە ناخەوە گریانم دەهات. شەرمم لە خۆم کرد کە لەپڕ و بە جەستە و سەری هێشتا خەڵتانی خوێنمەوە دەچمە خزمەت (ئەو). لایەکی تری ئەقڵم وەک ئەوەی لە کتێبەکانی مردندا خوێندبوومەوە، پێمی دەگوت (ئەو) خۆی ئیزرائیل و فریشتەکانی تری بەدووتدا ناردووە تا بچیتە خزمەتی.

تۆ بڵێی بتوانم (ئەو) ببینم؟ پێم وابوو لەتاو هەڵچوون و شپرزەییی هەناسەم بۆ نادرێت.

ئەو شتەی نزیک دەکەوتەوە و هەموو شوێنێکی دابووە بەر و سەرانسەری گەردوونی لە خۆیدا دەنواند، سوورێکی تا بڵێی دانسقە و جوان بوو. بیرکردنەوە لەوەی ببم بە پارچەیەک لێی و بەو ئەندازەیە نزیک بوونم لە (ئەو)ەوە، ڕەوتی فرمێسکی چاوانمی خێراتر کرد.

بەڵام تێ گەیشتم زیاتر لێم نزیک ناکەوێتەوە. حاڵی بووم پرسیاری منی لە فریشتەکان کرد، ئەوانیش پەسنیان دام. (ئەو)یش منی وەک بەندەیەکی پابەندی فەرمووده و قەدەغەکانی خۆی بینی و خۆشی ویستم.

لەپڕ، بە گومانێک، شادیی هەڵچووی هەناوم و فرمێسکی سەرکردووم ژەهراوی بوو. بۆ ڕزگاربوون لەم گومانە، بە تاوانباری و بەپشووی سوارەوە پرسیم:

"لە بیست ساڵی دواییی ژیانمدا کەوتمە ژێر کاریگەریی ئەو نیگاری گاورانەی لە ڤینیسیا دیبوومن. بگرە ماوەیەک دەمویست نیگاری خۆیشم لەسەر شێوازی ئەوان بکێشرێت، بەڵام لەمە ترسام. پاشان نیگاری گەردوونەکەت و بەندەکانت و سوڵتانی سێبەرتم لە دنیا لەسەر شێوازی گاوراندا بەکێشان دا."

دەنگی خۆی نا، بەڵام لە ناخی خۆمدا وەڵامەکەیم بیر کەوتەوە:

"ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواش هەر هی خۆمە."

لەتاو هەڵچوون و شپرزەیی خۆم بۆ ڕانەگیرا.

"باشە، واتای هەر هەمووی، گشت ئەم شتانە... ئەم دنیایە چییە؟"



لە هەناوی خۆمدا گوێم لە "نهێنی"، یان "خۆشت بوێ" بوو، بەڵام تەواو دڵنیا نەبووم کامیان بوو.

لە نێوانی نزیکبوونەوەی فریشتەکانەوە لێم، حاڵی بووم ئێستا لەم چینە بەرزەی ئاسماندا بڕیارێک لەبارەی منەوە دراوە، بەڵام پێکەوە لەگەڵ ڕۆحەکانی تری پێش دەیان هەزار ساڵ مردوو، تا ڕۆژی هەڵسانەوە، تا ئەو ڕۆژەی بڕیاری دواییمان لەبارەوە دەدرێت، لە بەرزەخ دەمێنینەوە. پێشڤەچوونی شتەکان بەو چەشنەی لە کتێبەکاندا نووسرابوو، منی دڵخۆش دەکرد. کاتێک بۆ خوارەوە دادەبەزیم، لە کتێبەکانەوە بیرم کەتەوە پێویستە لە وادەی ناشتنمدا بگەمەوە جەستەی خۆم.

بەڵام لە خوا بەزیاد بێ دەمودەست تێ گەیشتم دووبارە چوونەوەم بۆ ناو جەستەم، مەجازێکی ئەدەبییە. ئاپۆڕەی مردوونێژانی مایەی شانازی و ویقاری من، دوای خوێندنی نوێژ دارەمەیتی منیان نایە سەرشان و دەستبەجێ بەرەو گۆڕستانی کوچک تەپەجیکی نزیک لەوێ شۆڕ بوونەوە. ئاپۆڕەکە سەرباری ئەوەی خەمگین بوو، چ ڕێکوپێکیش بوو، لە سەرەوە ئەوانم وەک تەڵە داوێکی باریک و زراڤ دەبینی.

با شتێک لەبارەی شوێنی خۆمەوە ڕوون بکەمەوە: وەک لەو فەرموودەیەی نێردراوی خواشدا ئاشکرایە کە دەڵێت: "ڕۆحی باوەڕمەند باڵندەیەکە لەبەری داری بەهەشت دەخوات"، دوای مردن، ڕۆح بە ڕووی ئاسمانەوە دەسووڕێتەوە. چەشنی ئەوەی "أبو عمر بن عبدالباري" بانگەشەی بۆ کردووە، ئەم فەرموودەیە بەواتای ئەوە نییە ڕۆح شێوەی مەل لەخۆ بگرێت، یان تەنانەت ببێت بە مەل، بگرە هەروەک چۆن "الجوزية" زۆر بە جوانی ڕوونی کردووەتەوە، فەرموودەکەی پێغەمبەر بەواتای ئەوەیە ڕۆح لەو شوێنانە دەبێت کە باڵدار تیایاندا دەگەڕێت. ئەو شوێنەی من لێوەی دەڕوانم و مامۆستایانی ڕوانگەپەرستی ڤینیسیایی حەز دەکەن بە (گۆشەی بینین) ناوی ببەن، لێکدانەوەکەی "الجوزية" پشتڕاست دەکاتەوە.

لەو شوێنەوەی منی لێم، بۆ نموونە، هەم دەتوانم ئاپۆڕەی مردوونێژان، کە ئێستا چوونە گۆڕستانەوە، وەک تەڵە داوێک ببینم و هەم وەک ئەوەی چاو لە نیگارێک بکەم، دەتوانم بەچێژەوە سەیری بەلەمێک بکەم کەوا لە کۆتای کەنداوی زێڕینەوە بەرەو سەرایبورنو دەسووڕێتەوە، چارۆکەکانی بە هەڵمژینی با ئاوساون و ئەویش بە

کەیفەوە خێرا دەبێت. لەبەرئەوەی لە شوێنێکی هێندەی منارەیەک بەرزەوە تەماشام دەکرد، سەرتاپای دنیا وەک کتێبێکی دانسقە دەچوو و منیش یەک بەیەک پەڕەکانیم هەڵدەدایەوە.

بەڵام بەبەراورد لەگەڵ کەسێک ڕۆحی لە جەستەی جیا نەبووبێتەوە و هاتبێتە ئەم بەرزاییە، من دەمتوانی زیاتر ببینم. من ئێستا لەیەک کاتدا هەموو ئەم شتانەم دەبینی: ئەو منداڵانەی لە بۆشاییی نێوان باخچەکانی پشت گۆڕستانی ئوێسکوداری بەری لێواری ئەوبەرەوە گەمەی کەری درێژیان دەکرد؛ خۆش خزان و بەرەوپێشەوە چوونی کەڵەکی حەوت جووتی گەورەی نووسیاران بە ئاوی تەنگەی بوسفۆردا کاتێک دوازدە ساڵ و سێ مانگ لەمەوبەر باڵیۆزی ڤینیسیامان لە کۆشکی قەراغ ئاو هەڵگرت و بردمان بۆ ئەوەی "صدر الأعظم" ڕاغیب پاشای کەچەڵ پێشوازیی لێ بکات؛ ئەو ژنە قەڵەوەی لە بازاڕی لەنگەی نوێ وەک ئەوەی ساوایەکی شیرەخۆری لە ئامێز گرتبێت، باوەشی بە کەلەرمێکی گەورەدا کردبوو؛ خۆشحاڵیم بە مردنی ڕەمەزان ئەفەندیی چاوشی دیوان هات و پێم وابوو بە مردنی ئەو ڕێگەم بۆ خۆش بووە؛ سەیرکردنی کراسە سوورەکانی باوەشی دایکی دایکم لە کاتێکدا لە حەوشە جلی شۆراوی هەڵدەواسی؛ ڕاکردنم بە کۆڵانە دوورەکان گاڤێک دایکی خوا لێخۆشبووی شەکوورە بۆ لەدایکبوونی وی دەستی بە هێڵنج هێنانەوە کردبوو و من ماڵی مامانەکەم لێ تێک چووبوو؛ شوێنی ئەو پشتوێنە سوورەی چل ساڵ لەمەوبەر ونم کردبوو (وەسفی دزیبووی)؛ باخچەیەکی دانسقەی زۆر ڕازاوە لە شوێنێکی فرە دوور کە بیست ساڵ لەمەوبەر جارێک لە خەونمدا دیبووم و خوا یار بێت لە داهاتوودا پێشانم دەدات پارچەیەک بووە لە بەهەشت؛ ئەو سەر و لووت و گوێیانەی کاتێک عەلی بەگی سەرگەورەی بەگانی گورجستان یاخیبوونی قەڵای گۆریی تێک شکاندبوو، بڕیبوونی و ناردبوونی؛ شەکوورەی شۆخم گاڤێک لە ژنانی هاوسێ جیا دەبێتەوە، سەیری ئاگردانی حەوشە دەکات و بۆ من دەگری.

کتێب و زایانی کۆن دەڵێن ڕۆح چوار نیشتمانی هەیە:

١– سکی دایک ٢– دنیا ٣– ئەو بەرزەخەی ئێستا منی لێم ٤– بەهەشت یان دۆزەخ کە مرۆڤ دوای قیامەت دەیگاتێ.



لە بەرزەخیش، زەمانی ڕابردوو و ڕانەبردوو لە هەمان کاتدا دەردەکەوێت و تا ئەو کاتەی ڕۆح لەناو بیروەرییەکانی خۆیدا بمێنێتەوە، سنوورێک بۆ شوێن نامێنێتەوە. بەڵام مرۆڤ تەنیا ئەو کاتەی لە زیندانی زەمان و شوێن دێتە دەرێ، تێ دەگات ژیان کراسێکی تەنگە. جێی داخە هیچ کەسێک پێش مردن ناتوانێت تێ بگات هەروەک چۆن ڕۆحێکی بێ جەستە لە دنیای مردوان هۆکاری کامەرانیی ڕاستەقینەیە، جەستەیەکی بێ ڕۆحیش لە دنیای زیندوان بەختەوەریی هەرە گەورەیە. لەبەرئەوە بە دڵتەنگی سەیری شەکوورەی خۆم کرد کاتێک لە تەدارەکی بەشکۆی ناشتنمدا لە ماڵەوە خۆی بۆ من لەتوپەت دەکرد و لە ختوخۆڕایی بۆم دەگریا و لە خوای گەورە پاڕامەوە لە بەهەشت ڕۆحێکی بێ جەستە و لە دنیاش جەستەیەکی بێ ڕۆح بە ئێمەومانان بدات.

# 38

## من مامۆستا عوسمانم

ئێوە دەزانن ئەو پیرە کۆنانەی جوامێرانە ژیانی خۆیان بە هونەر بەخشیوە و چوونەتە ساڵەوە، کەسانێکی چۆنن. لە هەموو کەسێک تووڕە دەبن. باڵابەرز و زراڤن و ئێسکیان بەدەرەوەیە. دەخوازن بەشی پاشماوەی کۆتاییی ژیانیان، وەک دووبارەی بەشی زۆری بەسەربردووی ژیانیان بچێت. یەکسەر گڕ دەگرن و هەڵدەچن و گازندەیان لە هەموو شتێک هەیە. گشت لغاوێک دەخەنە دەستی خۆیان و هەموو کەس ناچار دەکەن نەفرەتیان لێ بکات. هیچ کەسێک و هیچ شتێک بەگەن ناکەن. من یەکێکم لەوان.

وەستای وەستایان "نوراللە" سەلیم چەلەبی، کە من هێشتا شاگردێکی شازدە ساڵان بووم شەرەفی ئەوەم بەرکەوت شان بەشانی وی لە هەمان نیگارخانە نیگار بکێشم، کاتێک بوو بە هەشتا ساڵی، کەسێکی وابوو (بەڵام بە ئەندازەی من تووڕە نەبوو). وەستا ساری عەلیش کە سی ساڵ لەمەوبەر بە خاکمان سپارد، هەر وابوو (ئەویش هێندەی من باریک و درێژ نەبوو). ئەو تیری ڕەخنانەی ئەو سەردەمانە لە پشتەوە لە مامۆستایانی ئەفسانەییی بەڕێوەبەرانی نیگارخانەکان دراوە، لەبەرئەوەی دەزانم ئێستا لە پشتی منیش دەچەقێنرێت، دەخوازم ئێوە بزانن هەندێک لەو قسە و ورتەورتانەی لەمەڕ ئێمە دەکرێن، هیچ بناخەیەکیان نییە.

١- لەبەرئەوەی بەڕاستی هیچ شتێکی نوێ نییە شایەنی بەگەن کردن بێت، ئێمە هیچ شتێکی نوێ بەگەن ناکەین.



٢- لەبەرئەوەی زۆرینەی خەڵک ساویلکەن، ئێمە مامەڵەی ساویلکەیان لەگەڵدا دەکەین، نەک لە سۆنگەی ئەوەی بەهۆی لاوازیی دەماری مێشکمان، بەختەڕەشیمان یان بەهۆی کەموکورتییەکی ترەوە زیانمان پێ گەیشتبێت. (سەربارى ئەوەش، خۆ ئەگەر ڕەفتارمان لەگەڵیاندا باش بووایە، بۆ ئێمە بە پیاوەتی و ئاقڵی دادەندرا).

٣- تێکەڵکردنی ناو و ڕووەکان لای من، جگە لەو نیگارکێشانەی لە سەردەمی نیگارکێشیانەوە بە ئەڤینەوە خۆشم ویستوون و پەروەردەم کردوون، لە خەڵەفانمەوە نییە، لەبەرئەوەیە ئەم ناو و ڕووانە تا ڕادەی شییان بۆ لەبیرکردن، لە ڕەنگ و درەوشانەوە بێ بەشن.

لە تەدارەکی ناشتنی تەرمی زاوادا کە لە ڕووی بوودەڵەیی و گەمژەییی خۆیەوە خوا زوو گیانی لێ سەندەوە، هەوڵم دا ئەوە لە بیر خۆم ببەمەوە کاتێک خوا لێخۆشبوو سەردەمانێک منی ناچار کردبوو لاساییی مامۆستایانی فەڕەنگ بکەمەوە و لەو ڕووەوە تاڵاوی ئازاری بە گەردوومدا کردبوو. لە گەڕانەوەشدا بەمجۆرە بیرم کردەوە: کوێری و مردن، کە دوو چاکەی خوان، بۆ منیش فرە دوور نین. بێگومان بەهەمان ئەو ئەندازەیەی نیگارەکانی دەستکردی من خۆشی بە چاوانتان دەدا و خونچەی بەختەوەری لە دڵتاندا دەپشکوێنێت، یادیشم دەکرێتەوە. بەڵام دەمەوێت دوای مردنم ئەم شتەش بزانن: هێشتا زۆر شت هەن لە کۆتاییی ژیان و لە پیربوونمدا زەردەخەنە بخەنە سەر لێوم. بۆ نموونە:

١- منداڵان. (ئەوان سەرلەبەری ڕێسا و بنەماکانی دنیا کورت دەکەنەوە.)

٢- بیرەوەریی شیرین. (کوڕانی بەدەو، ژنان، بەجوانیی نێگارکێشان، دۆستایەتی.)

٣- ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ شاکارەکانی مامۆستایانی کۆنی هەراتیدا. (ئەمە بۆ نەزان ڕوون ناکرێتەوە.)

سادەترین واتای گشت ئەمانە بەمجۆرەیە: ئێستا من سەرۆکی نیگارخانەی سوڵتانمانم، بەڵام ئیدی وەک جاران کاری دانسقە و شاهانەی تێدا ناکرێت. دەبینم کار بەرەو خراپتربوونیش دەچێت؛ هەموو شتێک دەبڕێتەوە و تەواو دەبێت. سەرباری ئەوەی تەواوی ژیانمان بەعەشقەوە بەم کارە داوە، کەچی بەئازارەوە هەست دەکەم

ئێمە لێرە زۆر بەدەگمەن دەتوانین بگەینە جوانکارییەکانی مامۆستایانی کۆنی هەراتی. پەسەندکردنی ئەم ڕاستییانە بە بێ فیزی و لەخۆباییبوون، ژیان ئاسان دەکات. ئاشکرایە بێ فیزی شتێکە ژیان سادەتر دەکات، بۆیە لە دنیای ئێمەدا فەزیلەتێکی هێندە پەسەندکراوە.

بەهەمان بێ فیزییەوە خەریک بووم نیگارێکی ناو جەژننامەی بەسەرهاتی شاییی خەتەنە سوورانی شازادەکانمانم ڕاست دەکردەوە. نیگارەکە هێنانی دیاریی بەگی بەگانی میسری بۆ مندالّی خەتەنەکراو پێشان دەدا: شمشێرێکی ورد خەملّێندراو بە یاقووت و زومڕود و فەیرووزە و تالّ و بەندی زێڕین لەسەر قوماشی قەدیفەی سوور. ئەسپێکی ڕەسەنی عەرەبی، زنجیری هەوساری لە زێڕ و زەنگۆڵەی لە گەوهەر و بەردی زەبەرجەرد بوو. ناوچەوان قەش، تووکی لە زیو درەوشاوەتر و سەرکێش و پۆزبلّند و لە برووسکە خێراتر بوو. زینی سەر پشتی ئەسپەکەش بەداوی زێڕکفت و قەدیفەی سوور و بە سوورمەیەکی نیگاری خۆری بە یاقووت لەسەر کێشراو خەملّێندرابوو. خۆم ناوەڕۆکی نیگارەکەم ڕێک خستبوو و فلّچەم بە ڕاست و چەپیدا دەهێنا. ئەسپ و شمشێر و شازادە و ئەو بالّیۆزانەشی سەیری ئەوانیان دەکرد، بە شاگردەکان بۆیاخم کردن. بەلاّم ڕەنگی وەنەوشەییم لە چەند گەلاّیەکی دار چناری ناو مەیدانەکە دا. کوژەکەکانی بالّیوزی خانی تەتەرم بە ڕەنگی زەرد بۆیاخ کرد. لەوەدا بووم تۆزقالّێک ئاوی زێڕ بەسەر لغاوی ئەسپەکەدا بڕێژم، لە دەرگا درا. دەستم هەڵگرت.

خولاّمێکی دەرگاوان بوو. گەورەی خەزنەداران لە کۆشکەوە لەدووی ناردبووم. چاوەکانم کەمێک دەیەشان. زەڕەبینەکەم لە گیرفانی کەواکەم دەرهێنا، لە چاوم کرد و لەگەڵ کوڕەدا بەڕێ کەوتم.

چەند خۆشە دوای ماوەیەکی درێژ لە کارکردن، بە کۆڵانەکاندا بسووڕێیتەوە. دنیا وەک ئەوەی دوێنێ لەلایەن خواوە ئافرێندرابێت، تەواو نوێ و سەرسوڕهێن دەکەوتە بەرچاو.

سەگێکم بینی، لە هەموو نیگاری سەگێک واتادارتر بوو. ئەسپێکم بینی، وەستایانی نیگارکێشم دەتوانن نیگاری ئەسپی لەو واتادارتر بکێشن. لە مەیدانی



ئەسپان، دار چنارێکم بینی؛ ئەو دارە بوو کە پێش کەمێک لە نیگارەکەدا گەلاّکانیم بە ڕەنگی وەنەوشەیی بۆیاخ دەکرد.

ماوەی دوو سالّ بوو نیگاری بەزمەکانی تێپەڕبوو بە مەیدانی ئەسپمدا دەکێشا، بۆیە چوونم بۆ ئەوێ و ڕۆیشتنم پیایدا، وەک ئەوە وابوو مرۆڤ بچێتە ئەو شوێنەی نیگاری کێشاوە و پیایدا تێ پەڕێت. لە کۆلاّنێک با دەدەینەوە؛ ئەگەر لە نیگارێکی فەڕەنگیدا بین، لە چوارچێوە و نیگارەکە دەردەچین و دەڕۆین؛ خۆ ئەگەر لە نیگارێکی لەوانەی ئێمەدا بین کە لەسەر شێوازی مامۆستایانی هەرات دەیانکێشین، دێینە ئەو شوێنەی خوا دەمانبینێت؛ ئەگەر لە نیگارێکی چینیدا بین، هەرگیز دەرناچین، چونکە نیگاری چینی بێ ئەوەی کۆتاییی پێ بێت، هەر درێژ دەبێتەوە و دەڕوات.

خولاّمی دەرگاوان منی نەدەبرد بۆ ئەو ژوورەی دیوانی کۆن کە لەوێ لەگەڵ گەورەی خەزنەداراندا بەیەک دەگەیشتین بۆ قسەکردن لەمەڕ: بەخشینی کرێی کەڵکەبوو، ئەو دیارییانەی نیگارکێشانی ئێمە بۆ سولّتانمان ئامادەیان دەکردن، کتێب، هێلکەی نەخشێندراوی وشترمڵ، تەندروستی و ئاسوودەییی نیگارکێشان، بۆیاخی پێویست، دابینکردنی پەڕەی زێڕ و کەرەسەی تر، گازندە و داخوازی سادە، ویست و نەشئە و داخواز و چەژی سولّتانی جیهانپەنامان، ئاو و هەوا، چاوانی من، زەڕەبینەکانم، ئازاری پشتم، زاوای نامەردی گەورەی خەزنەداران و پشیلە خالّدار و پلّنگ ئاساکەی. بە بێدەنگی چووینە باخچەی تایبەت. بەناو ڕیزێک داری لە ئێمەش کپتردا و وەک ئەوەی تاوانێک ئەنجام بدەین، نەرم و نیان بەرەو دەریا شۆڕ بووینەوە. لە کۆشکی یالی نزیک دەکەوتمەوە، لەوەدا بووم بەخۆم بلّێم کەواتە سولّتانم لەوێیە و دەیبینیم، لە ڕێ دەرچووین. چوار پێنج هەنگاومان نا، لە دەرگای پشتوێنەداری بالّەخانەیەکی لە بەرد بنیاتنراوی پشت لەنگارگای بەلەمەکانەوە چووینە ژوورێ. بۆنی نان لە نانەواخانەی پاسەوانانی کۆشکەوە دەهات. من پیاوانی پاسەوانی کۆشکم بە پۆشاکی سووریانەوە بینیبوو.

گەورەی خەزینەداران و سەرگەورەی پاسەوانانی کۆشک لەهەمان ژووردا: فریشتە و ئیبلیس.

سەرگەورەی پاسەوانان، کە لە باخچەی کۆشک مرۆڤ بۆ سولّتانمان

هەڵدەواسێت، ئەشکەنجەی دەدا، دەیخاتە بەر لێپرسینەوە، دارکاریی دەکات، چاوی دەردێنێت و فەلاقەی دەکات، ڕووخۆشانە بۆم پێ دەکەنی. دەتگوت هاونشینێکی وردیلەی خۆم، کە ناچار ماوم لە ژووری خانێک لەگەڵیدا بمێنمەوە، بەسەرهاتێکی شیرینم بۆ دەگێڕێتەوە.

بەڵام گەورەی خەزنەداران دەستی بە گێڕانەوە کرد، نەک سەرگەورەی پاسەوانان: بەنواندنێکی شەرماوییەوە گوتی: "ئەفەندیمان ساڵێک لەمەوبەر دەستووریان بە من فەرموو زۆر بە نهێنی کتێبێک ئامادە بکرێت تا ببێت بە بەشێک لە دیارییەکانی شاندێکی باڵیۆزان. لە سۆنگەی ئەم نهێنیبوونەوە، هەروەک چۆن نەیویست ئەرکی نووسینی کتێبەکە بە مامۆستا لوقمانی گەورەی شانامەچییان بسپێرێت، لەبەرئەوەی شەیدای هونەری تۆش بوو، نەیویست تۆ لەم کارەدا بەشدار بیت. سوڵتانمان سەرقاڵبوونی زۆری ئێوە بە چەژننامەی بەسەرهاتی خەتەنە سوورانی شازادەکانەوە بەرز دەنرخاند."

لەگەڵ چوونە ژوورەوەمدا، بەترسێکی مردن هێنەوە بەخەیاڵمدا هات نامەردێک زمانی لێم دابێت و بە گوتنی ئەم نیگارە کفری تێدایە و ئەوی تریان هەجووتان دەکات، کاری لە سوڵتانمان کردبێت و بێ گوێدانە تەمەنم، دووچاری ئەشکەنجە ببمەوە. لەبەرئەوەی سوڵتانمان ڕاسپاردەی کتێبی بە من نا، بە کەسێکی تر دابوو، گەورەی خەزنەداران دەیویست دڵم بداتەوە، بۆیە قسەکانی لەو کاتەدا لەکن من لە هەنگوین شیرینتر بوون. خۆم بەسەرهاتی کتێبەکەم بەزیادەوە دەزانی، سەرباری ئەوەش لە دەمی گەورەی خەزنەدارانەوە گوێم بۆ ڕاگرت، بەڵام شتێکی نوێم لێ هەڵنەکڕاند. لە قسە و قسەڵۆکەکانیش ئاگادار بووم: بێگومان بە مەلا نوسرەتی ئەرزەڕوومی و کێشمەکێشی ناو نیگارخانەشەوە.

هەر بۆ ئەوەی پرسیارێک بکەم، شتێکم پرسی کە خۆم وەڵامیم دەزانی: کێ کتێبەکە ئامادە دەکات؟

گەورەی خەزنەداران گوتی: "وەک دەزانن زاوا ئەفەندی." چاوی بڕییە ناو چاوانم و لێی زیاد کرد: "بە مردنی ئاسایی نەمردووە، کوژراوە. ئایا دەزانن؟"

وەک منداڵێک بەسادەیی گوتم: "نەمزانیبوو." بێدەنگ بووم.



گەورەی خەزنەداران دەیگوت: "سوڵتانمان زۆر، هەر زۆر ڕقی هەستاوە."

ئەم گێژ و ساویلکەیەی زاوا ئەفەندیی پێ دەگوترا، کەسێکی ئەقڵ نیوەناچڵ بوو. لەبەرئەوەی لە زانست زیاتر، خۆبردنە پێشەوە و لە ئەقڵ زیاتر، هەوەسی هەبوو، نیگارکێشان بە پێ ڕابواردن و پێکەنینەوە لەبارەیەوە دەدوان. لە بەرێکردنی تەرمەکەشیدا هەستم کرد ئەم ماستە موویەکی تێدایە. تۆ بڵێی چۆن کوژرابێت؟

گەورەی خەزنەداران گێڕایەوە: زۆر دڵڕەقانە.

"خوایە بمانپارێزی. کێ"؟

گەورەی خەزنەداران گوتی: "فەرمانێکی سوڵتان هەیە، دەخوازێت ئەم کتێبەش وەک چەژننامەکە بە زووترین کات تەواو بکرێت..."

سەرگەورەی پاسەوانان گوتی: "فەرمانێکی تریشی هەیە، ئەگەر ئەو بکوژە قێزەون و ئیبلیسە دڵ ناپاکە لەناو دەستە و تاقی نیگارکێشاندایە، دەخوازێت بدۆزرێتەوە. سزایەکی زۆر توندی دەدات تا ببێت بە پەند بۆ هەمووان و هیچ کەسێکی تر تەنانەت بەخەیاڵیش بیر لە تێکدانی کتێبی سوڵتانمان و کوشتنی نیگارکێشانی نەکاتەوە."

سەرگەورەی پاسەوانان، وەک ئەوەی بزانێت سزای سوڵتانمان بۆ تاوانبار چییە، لەپڕ هەڵچوونێک لە ڕوویدا دەرکەوت.

حاڵی بووم سوڵتانمان پێش کەمێک و لە هەمان کاتدا ئەم ئەرکەی بەم دوو کەسە بەخشیوە و ناچاری کردوون پێکەوە بۆ شتێک کار بکەن کە لە ئێستاوە ناتوانێت نەفرەتی خۆی لێ بشارێتەوە و لەبەرئەوە، من لە شەیدابوون زیاتر، هەستم بە خۆشەویستی کرد بەرامبەر بە سوڵتان. خولامێک قاوەی هێنا، دانیشتین.

سەرگەورەی پاسەوانان گوتی: "زاوا ئەفەندی برازایەکی هەیە خۆی پەروەردەی کردووە و سەر لە نەخش و کتێب دەردەکات: قەرە." پرسیاری کرد داخۆ من دەیناسم. بێدەنگ بووم. درێژەی دایێ و گوتی: "ماوەیەکی کورت لەمەوبەر، لە سەر بانگهێشتنی زاوای، لای سەرحەت پاشای سەر سنووری عەجەمەوە بۆ ئەستەنبوڵ گەڕاوەتەوە (سەرگەورەی پاسەوانان بە نیگایەک کە هێمای بۆ گومان دەکرد، سەیرێکی کردم)، لە ئەستەنبوڵ زۆر بەباشی خۆی لە زاوای نزیک خستووەتەوە و بەسەرهاتی کتێبەکەی بەردەستی زاوا ئەفەندیی بۆ ئاشکرا بووە. دەڵێت دوای

کوژرانی زەریف ئەفەندی، زاوا گوتوویەتی گومانی لەو وەستا نیگارکێشانە هەیە کە لە نیوەی شەودا بۆ کتێبەکە دەچنە کنی. نیگاری دەستکردی ئەم مامۆستا نیگارکێشانەی بۆ کتێبەکە بینیوە: بانگەشەی ئەوەی کردووە بکوژی زاوا یەکێکە لەمانە و ئەو نیگارەی سوڵتانیشی دزیوە کە زۆرترین زێڕی تێدا بەکار هێنراوە. ئەم لاوە، ماوەی دوو ڕۆژ کوژرانی زاوای لە کۆشک و لە گەورەی خەزنەداران شاردووەتەوە." بەهۆی ئەوەی قەرە لەو ماوەیەدا بەدەستوبرد و بەشێوەیەکی نەگونجاو لەگەڵ شەریعەت مارەی کچی زاوای لە خۆی بڕیبوو و لەماڵیان گیرسابووەوە، هەردووکیان گومانیان لێی هەبوو.

گوتم: "ئەگەر ماڵ و شوێنی کاری وەستایانی نیگارکێشم بپشکێنرێت و پەڕە ونبووەکە لای یەکێکیان بدۆزرێتەوە، ئەو کاتە دەردەکەوێت ماف بەلای قەرەوەیە. بەڵام ئەگەر ئەوان هێشتا ئەو منداڵە خۆشەویستانە و نیگارکێشە دەست بە پەرجووانەم بن کەوا لە دەمی شاگردییانەوە دەیانناسم، دەستیان ناچێتە کوشتنی هیچ کەسێک."

سەرگەورەی پاسەوانان بەتەوسەوە ئەو ناسناوانەی من بە نیگارکێشانم دابوو، بەکار دەهێنا و گوتی: "تا ئەوپەڕی ماڵ و کون و شوێنی کار و ئەگەر هەیانبێت، دووکان و هەموو شوێنێکی زەیتوون و لەقلەق و پەپوولە دەپشکنین. هی قەرەش..." پاشان نیشانەیەکی بێ چارەیی کەوتە سەر ڕووی. "لە خوا بەزیاد بێت، مۆڵەتمان لە قازی ئەفەندی وەرگرتووە لە کاتی لێپرسینەوە لەم پرسە دژوارەدا پەنا بۆ ئەشکەنجە ببەین. قازی گوتی لەبەرئەوەی کوژرانی کەسێکی تری نزیک لە دەستە و تاقمی نیگارکێشان لە شاگردەکانەوە تا وەستاکان گشت نیگارکێشان دەخاتە ژێر گومانەوە، ئەشکەنجە یاساییە."

بە بێدەنگی بیرم کردەوە: ١- بەگوتنی ئەوەی ئەشکەنجە یاساییە، ئاشکرا دەبێت فەرمانەکە لە سوڵتانمانەوە دەرنەچووە. ٢- بەگوێرەی ئەوەی قازی سەرجەم نیگارکێشان دەخاتە ژێر گومانەوە؛ منیش تاوانبار دەکەن، چونکە وەک سەرۆکی دەستەی نیگارکێشان نەمتوانیوە تاوانباری نێوانمان دەستنیشان بکەم و ڕادەستی بکەم. ٣- حاڵی دەبم دەیانەوێت بەر لە ئەشکەنجەدانی پەپوولە و زەیتوون و لەقلەقی خۆشەویست و ئەوانی تری دەستەی نیگارکێشانی ژێر دەسەڵاتی من کە لەم



ساڵانەی دواییدا ناپاکییان لێ کردبووم، بە ئاشکرا یان بێدەنگی ڕەزامەندیی منیش وەربگرن.

گەورەی خەزنەداران گوتی: "لەبەرئەوەی سوڵتانمان بەتەنیا جەژننامەکە نا، بگرە خوازیارە ئەم کتێبە نیوەناچڵ ماوەش وەک پێویست تەواو بکرێت، دەترسین ئەشکەنجە زیان بەدەست و چاو و هونەری نیگارکێشان بگەیەنێت." ڕووی لە من کرد: "وا نییە؟" سەرگەورەی پاسەوانان بە دەنگێکی زبر گوتی: "لە ڕابردوودا هزرێکی لەو جۆرە هەبوو. زەڕەنگەرێکی خشڵکار کاری چاککردنەوەی دەکرد، ئیبلیس فریوی دابووو و وەک منداڵ دڵی چووبووە فنجانێکی دەسک یاقووتی نەجمیە سوڵتانی خوشکی سوڵتانمان: خوشکی سوڵتانمان زۆر دڵی بە فنجانەکەوە بوو و لە خەمدا نقوم بووبوو. لەبەرئەوەی دزییەکە لە کۆشکی ئوێسکودار کرابوو، سوڵتانمان ئەم ئەرکەی بە من سپارد. دەمزانی نەجمیە سوڵتانیش وەک سوڵتانمان دلۆڤانانە بۆ هونەر و چاو و قامکی وەستایانی زەڕەنگەر و خشڵکارانی دەڕوانی. دەستبەجێ فەرمانم دا وەستایانی خشڵکار ڕووت بکرێنەوە و بخرێنە شەختە و بۆقی ناو حەوزێکی بەستووەوە. فەرمانم دا جاروبار دەربهێنرێن و بەشێوەیەک زیانیان پێ نەگات، بەڵام زۆر توند ڕوو و دەستیان قامچیڕێژ بکرێت. ئەو خشڵکارەی ئیبلیس چووبووە بن کلێشەیەوە، دوای ماوەیەکی کورت ددانی بە تاوانەکەیدا نا و بە سزای خۆی ڕازی بوو. وەستایانی تری خشڵکار لەبەرئەوەی ناخیان پاک بوو، سەرباری ئاوی تەزیو و سەرما و ئەو هەموو قامچیڕێژکردنە، چاو و پەنجەی هیچ کامیان سەقەت نەبوو. بگرە سوڵتان پێی گوتم خوشکی زۆر ڕازی بووە و خشڵکارانیش لەبەرئەوەی تۆوی خراپی ناویان پاک کراوەتەوە، بەکەیفێکی زیاترەوە کار دەکەن."

دڵنیا بووم لەوەی ڕەفتاری سەرگەورەی پاسەوانان لەگەڵ مامۆستایانی نیگارکێشی من زۆر توندتر دەبێت لە مامەڵەی لەتەک وەستایانی خشڵکاردا. با ڕێزیش لە چێژی سوڵتانمان بۆ کتێب چێکردن بگرێت، بەڵام ئەویش چەشنی زۆر کەسی تر پێی وابوو نەخش و بەتایبەتیش نیگار شتێکە لە سنووری بێ ئاینی نزیک دەبێتەوە و شتێکی ناپێویستی شایەن بە سزادانە و بگرە بەجۆرێک لە ژنایەتیی دادەنا و سووکایەتیی پێ دەکرد. بەمەبەستی دنەدان و تووڕەکردنم گوتی: "لە کاتێکدا ئێوە هێشتا بەتەواوی هێزتانەوە لەسەر کارن، نیگارکێشانی دەلالتان

دەستیان کردووە بە تەپکە و داونانەوە بۆ ئەوەی بزانن دوای ئێوە کێ دەبێت بە گەورەی نیگارکێشان."

ئایا ورتەورتێک کە من لێی بێ ئاگا بووم و داونانەوەیەکی نوێ لە ئارادا بوو؟

خۆم ڕاگرت و بێدەنگ بووم. ڕقم لە گەورەی خەزنەداران هەستابوو، چونکە بەدزی منەوە ئامادەکردنی کتێبی بە خوا لێخۆشبووی ئەقڵ نیوەناچڵ سپاردبوو. لە نیگارکێشانی بێ ئەمەکم پەست بووم، چونکە بەمەبەستی ئەوەی بچنە دڵەوە و چوار پێنج ئاکچەی زیاتریان دەست بکەوێت، بەنهێنی نیگاری ئەو کتێبەیان کێشاوە. گەورەی خەزنەدارانیش بەزیادەوە هەستی بەم ڕق هەستان و پەستبوونەم کردبوو.

دەمەساتێک هەستم کرد خەیاڵم چووە بۆ ئەوەی گەلۆ دەبێت چ جۆرە ئەشکەنجەیەک لە نیگارکێشەکانم بکەن. لە ئەشکەنجەی لێپرسینەوەدا پێستی مرۆڤ ناگروون، چونکە کارێکە لێگەڕانەوەی نییە. وەک یاخیبووانیش لەسەر مێخزنجیر دایان نانیشێنن، چونکە ئەمە بۆ مردنە تاکو ببێت بە پەند. خۆ ناشکرێت قرچ و هوڕ بکەونە گیان ئەم نیگارکێشانە و باسک و ڕان و پەنجەیان بشکێنن. هێندەی ئەوەی لەو مرۆڤە یەک چاوانەشەوە کە بەزۆری لە کۆڵانەکانی ئەستەنبوڵ بەرچاوم دەکەوتن، تێ گەیشتبووم، دەرهێنانی چاویش، وەک ئەوەی لەم ڕۆژگارەدا بەزۆری ئەنجام دەدرێت، بێگومان شایەنی نیگارکێشان نییە. بەمجۆرە، کاتێک نیگارکێشانی خۆشەویستم هێنایە بەرچاوی خۆم لە نێوان گوڵە سەوسەنی ئاویی ناو ئەستێڵی تەزیوی گۆشەیەکی دوورەدەستی باخچەی تایبەتدا هەڵدەلەرزن و بە نەفرەتەوە سەیری یەکتر دەکەن، ویستم تاوێک لە دڵەوە بکەنم. بەڵام کاتێک هێنامە پێش چاوی خۆم ئەگەر گۆشتی ئەستووری زەیتوون بە شیشی سوورەوەکراو داخ بکرێت، چ قیژەیەکی لێ هەڵدەسێت و پێستی جەستەی لە زنجیردراوی پەپوولەی نازدارم چۆن سیس دەبێتەوە، پێچێک بە هەناومدا هات. بگرە نەمتوانی پێشبینی بکەم پەپوولەی دەلالم کە زۆر جاران بە هونەر و ئەڤینی خۆی فرمێسکی لە چاوی من هێناوە، ئێستا وەک شاگردێکی دز بۆ فەلاقەکردن درێژ بکرێت. بەسەرسامی لە شوێنی خۆم وشک بووم.

ئەقڵی پیربووم، ساتێک بە ئەفسوونی بێدەنگیی خۆی کپ بوو. سەردەمانێک هەموو شتێکمان لەبیر دەکرد و پێکرا بە ئەڤینەوە نیگارمان دەکێشا.



گوتم: "ئەوانە وەستاترین نیگارکێشەکانی سوڵتانمانن. دەستیان بۆ مەبەن."

گەورەی خەزنەداران بە دڵخۆشی لە جێگای خۆی هەستا، کاغەزێکی تۆماری لەسەر مێزێکی ئەوسەری ژوورەکە هەڵگرت و هێنای، لە پێشم داینا و وەک ئەوەی ژوورەکە تاریک بێت، دوو مۆمدانی هێنایە تەنیشتمەوە و گڕی مۆمە گەورەکانی سەریان شەپۆلی دەدا. ئەمانە ئەو نیگارانە بوون.

چۆن باسی ئەو شتەتان بۆ بکەم کە لە کاتی گێڕانی زەڕەبینەکەم بەسەریاندا بینیمن؟ لە ناخەوە پێکەنینم دەهات، بەڵام نەک لەبەرئەوەی مایەی پێکەنین بن، پەست دەبووم، بەڵام نەک لەبەرئەوەی شتگەلێک بن شایەنی بەهەند وەرگرتن بن. دەتگوت زاوا ئەفەندی بە وەستایانی نیگارکێشی منی گوتووە بەشێوەیەک نیگار بکێشن چەشنی ئەوەی ئێوە خۆتان نەبن و کەسانێکی تر بن. هەر دەتگوت پاڵەپەستۆی خسووەتە سەریان بیرەوەریی نەبووی خۆیان بەبیر بهێننەوە و بیر لە داهاتوویەک، کە هیچ کاتێک خۆشیان نەیانەوێت تێیدا بژین، بکەنەوە و نیگار بکێشن. ئەوەی باوەڕ پێکردنی مەحاڵ بوو، ئەوە بوو بۆ ئەم شتە تووڕەهاتە یەکتریان کوشتووە.

گەورەی خەزنەداران گوتی: "کاتێک سەیری ئەم نیگارانە دەکەن، دەتوانن پێمان بڵێن قەڵەمی کام نیگارکێش بەکام نیگاردا هێنراوە؟"

بەڕق هەستانەوە گوتم: "بەڵێ. ئەم نیگارانەتان لە کوێ دۆزیوەتەوە؟"

گەورەی خەزنەداران گوتی: "قەرە خۆی هێنایانی و ڕادەستی کردن. دەیەوێت خۆی و زاوای خوا لێخۆشبووی بێتاوان دەربخات."

گوتم: "لە لێپرسینەوەدا ئەشکەنجەی بدەن، بۆ ئەوەی بزانین زاوا ئەفەندیمان چ نهێنیی تری هەیە."

سەرگەورەی پاسەوانان بەگەشییەوە گوتی: "پیاوێکمان لە دوایدا ناردووە. لە دوای خۆیشی، کون و قوژبنی ماڵی زاوای نوێ دەپشکنرێت."

دواتر، تیشکی ڕووناکییەکی سەیر و ترس و شەیدا بوون بە ڕووی هەردووکیانەوە دیاری دا. بەرزەپێ ڕاست بوونەوە.

بێ ئەوەی بەر بکەمە دواوە، حاڵی بووم حەزرەتی سوڵتانی جیهانپەنامان هاتوونەتە ژوورێ.

# 39

## من ناوم ئەستەرە

وەی پێکەوە گریان چ خۆشە. کاتێک خزم و خوێش و ناسیاو و دۆست و گشت ژنان لە پرسەی باوکی شەکوورە گیانم لە ماڵەوە کۆبووبوونەوە و دەگریان، منیش تا بۆم کرا خۆم کوتا و فرمێسکم ڕشت. جاروبار پاڵم بە کچێکی جوانی تەنیشتمەوە دەدا، بەنەرمی خۆمان دەهەژاند و دەگریاین. ناوبەناویش بە ژیانی کلۆڵ و مەینەتییەکانی خۆم دڵتەنگ دەبووم و لە ئاستێکی تەواو جیاوازدا فرمێسکم هەڵدەوەراند. ئەگەر هەفتەی جارێک وا بگریم، هاتوچۆی ڕۆژ تا ئێوارەم لە کۆڵانان بۆ پەیداکردنی پارووی ژیان و قەڵەویی خۆم و بەسووک تەماشاکردنم لەبەر جوولەکە بوونم، لەبیر دەکەم و دەبم بە ئەستەرێکی لە گشت کاتێک چەنەبازتر.

هێندەی ئەوەی لە ئاپۆڕەدا لەبیرم دەچێت من مەڕێکی ڕەشم، ئەوەندەش حەزم لە بۆنە و تەدارەک و ئاهەنگە، چونکە پڕ بە سکی خۆم دەخۆم. لە جەژندا ڕۆحم بەسەر پاقلاوە، گیراوەی پوونگ، نانی بە بادەم و باسووقەوە دەردەچێت؛ لە ئاهەنگی خەتەنە سووراندا حەزم لە پلاوی بە گۆشت و بۆرەکی فنجانییە؛ لە ڕمبازییەکانی سوڵتاندا لە مەیدانی ئەسپ تامەزرۆی خواردنەوەی خۆشاوی گێلاسم؛ لە شایی و زەماوەندەکاندا ئالوودەی خواردنی هەموو شتێکم؛ لەدوای ناشتنی مردوانیش بۆ ئەو حەلوا بەکونجی و بەهەنگوین و بەمسکانە دەبوورێمەوە کە هاوسێ و دراوسێ دەینێرن.

بە بێدەنگی چوومە هەیوانەکە، پێڵاوم لە پێ کرد و چوومە خوارێ. پێش ئەوەی ڕوو



لە ئاشپەزخانە بکەم، دەنگێکی سەیر لە دەرگای نیوەکراوەی ژووری تەنیشت پشتیرەکەوە هات. لەپڕ دوو هەنگاوم نا و سەیرێکی ژوورەم کرد. بینیم شەوکەوت و ئۆرهان کوڕی یەکێک لەو ژنانەی لەسەرەوە دەگرین، بە گوریس بەستووەتەوە و بە فلچە کۆنەکانی خوا لێخۆشبوو بۆیاخ بە سەروچاویدا دێنن. شەوکەوت زللەیەکی لەبن گوێی کوڕەکە سرەواند و گوتی: "ئەگەر هەوڵی ڕاکردن بدەیت، ئاوا لێت دەدەین."

بە دەنگی هەرە نەرم و درۆزنانەی خۆم گوتم: "جگەرگۆشەکەم، ئەوە نابێت ئازاری یەکدی نەدەن و بەخۆشی یاری بکەن؟"

شەوکەت نەڕاندی و گوتی: "تۆ هەقت نەبێت."

خوشکی بچووک و قژ زەرد و ترساوی کوڕە تێ هەڵدراوەکەشم لایان بینی و نازانم بۆچی خۆم لەگەڵ ویدا بەراورد کرد. ئەستەر، هەموو شتێک لەبیر بکە.

لە ئاشپەزخانە خەیرییە بەگومانەوە بۆمی ڕوانی.

گوتم: "هێند گریاوم هەردوو چاوم وەک دوو کانی وشک بوون. لە ڕای خوا کەمێک ئاوم بدێ."

بە بێدەنگی دایمێ. پێش ئەوەی بیخۆمەوە، سەیری ناوچاوانی لەبەر گریان هەڵئاوساویم کرد.

گوتم: "دەگوترێت زاوا ئەفەندیی بەستەزمان بەر لە مارەبڕینی شەکوورە مردووە. خۆ دەمی ئەو خەڵکە توورەکە نییە تا گرێ بدرێت. بگرە دەڵێن بە مردنی ئاسایی نەمردووە."

دەمەساتێک بەئاشکرا سەیری نووکی پێیەکانی خۆی کرد. دوایی سەری بەرز کردەوە و بێ ئەوەی سەیری من بکات، گوتی: "خوا لە بوختان بمانپارێزێت."

جووڵەی یەکەمی بەواتای "ئەم قسەیەت ڕاستە" دەهات. ئاستی قسەکانیشی وای لە مرۆڤ دەکرد هەست بکات لە ناچاری کراون.

لەپڕ وەک هاوڕازێک بەچرپە گوتم: "چ قەوماوە؟"

بەڵام خەیرییەی دوودڵ تێ گەیشتبوو هیچ هیوایەکی نەماوە بۆ ئەوەی دوای مردنی

زاوا ئەفەندی باڵادەستی بەسەر شەکوورەدا بنوێنێت. هەر ئەویش بوو پێش کەمێک لەسەرەوە لە هەمووان بەکوڵتر دەگریا.

گوتی: "ئێستا من چیم بەسەر دێت؟"

بەخووی هەواڵ گەیاندنەوە گوتم: "شەکوورە تۆی فرە خۆش دەوێت." سەری یەک بەیەکی قاپە ڕیزکراوەکانی نێوان کوپەی دۆشاو و کۆپەی ترشیاتم هەڵدایەوە، ناوبەناو بە نووکی پەنجە لەتێکم لە یەکێکیان هەڵدەگرت و تامم دەکرد، هەندێکیشیانم تەنیا بۆ لووتم دەبرد و تەنیا بۆنم دەکرد. دانە بەدانە لێم پرسی کێ کام قاپی حەلوای ناردووە.

خەیرییە یەک بەیەک دەستی بە ژماردن کرد: "ئەمە هی قاسم ئەفەندیی قەیسەرییە، ئەوە هی ئەو گەورەی شاگردانەیە کە ماڵیان دوو کۆڵان لە پشت نیگارخانەوەیە. ئەویشیان حەمدیی چەپەوانەی کلیلچی ناردوویەتی، ئا ئەمیشیان قاپی بووکی ئەدرنەییە..." شەکوورە قسەی پێ بڕی:

"ئەرێ ئەوە قەلبییەی ژنی زەریف ئەفەندیی خوا لێخۆشبوو نە بۆ سەرەخۆشی هات و نە هەواڵی ناردووە و نە حەلوا."

لە دەرگای ئاشپەزخانەوە بەرەو بەردەلانی بەردەم پلیکانەکان دەچوو. کاتێک تێ گەیشتم دەیەوێت دوور لە چاوی خەیرییە لەگەڵ مندا بدوێت، دوای کەوتم.

شەکوورە گوتی: "زەریف ئەفەندی هیچ دوژمنایەتییەکی لەگەڵ باوکمدا نەبوو. ئێمە لە ڕۆژی ناشتنی ویدا حەلوای خۆمان دروست کرد و ناردمان. دەمەوێت بزانم چ ڕووی داوە."

من لە بیرکردنەوەی شەکوورە تێ گەیشتم و گوتم: "هەر ئێستا دەچم، پرسیار دەکەم و ڕوونی دەکەمەوە."

لەبەرئەوەی درێژەم نەدایێ، ماچی کردم. هەوای ساردی حەوشە دەچووە جەستەمانەوە، ئێمەش باوەشمان بەیەکدا کرد و بێ ئەوەی بجووڵێین، وا ماینەوە.

دوایی دەستم بە پرچی شەکوورەی شۆخمدا هێنا.

گوتی: "ئەستەر، دەترسم."



گوتم: "مەترسە گیانەکەم، لە هەر کارێکدا خێرێکیش هەیە. بڕوانە چۆن دواجار شووت کرد."

گوتی: "بەڵام نازانم داخۆ کارێکی ڕاستم کردووە یاخۆ نا. بۆیە نەمهێشت هیچ لێم نزیک بکەوێتەوە. شەوم لە تەنیشت باوکی کلۆڵمەوە بەسەر برد."

چاوەکانی زۆر داچەقاند و وەک ئەوەی بڵێ "حاڵی دەبیت؟" لە چاوانی منی بڕی.

گوتم: "حەسەن دەڵێت مارەبڕینەکەت بەلای قازییەوە هیچ نرخێکی نییە. ئەم هەواڵەی بۆت ناردووە."

ئەگەرچی شەکوورە "ئیدی نابێت"یشی گوت، کەچی یەکسەر کاغەزە بچووکەکەی وەرگرت و دەستی بەخوێندنەوەی کرد. بەڵام ئەمجار پێمی نەگووت چی خوێندووەتەوە.

مافی خۆی بوو، چونکە ڕاستە لە حەوشە باوەشمان لەیەک دابوو و ڕاوەستابووین، بەڵام تەنیا نەبووین: ئەم بەیانییە دەریوانەی پەنجەرەی هەیوان لەبەر هۆیەکی نەزانراو کەوتبووە خوارەوە، دارتاشێکی گاڵتەجار لەسەرێ دەریوانەکەی چاک دەکردەوە و هەم سەیری ئێمە و هەم تەماشای ژنانی شین و شەپۆڕکەری ژوورەوەی دەکرد. هەر لەو کاتەدا کوڕی هاوسێیەکی دڵسۆز لە دەرگای حەوشی دا و گوتی :"حەلوا هاتووە." خەیرییەش لە ماڵ دەرچوو و بە ڕاکردن دەچوو دەرگا بکاتەوە.

شەکوورە گوتی: "کاتێکی باش بەسەر ناشتنیدا تێ پەڕیوە. هەست دەکەم ئێستا ڕۆحی باوکی بەلەنگازم بۆ دواجار و بەمەرجی هەرگیز نەگەڕانەوە لە جەستەی جیا دەبێتەوە و بۆ ئاسمان بەرز دەبێتەوە."

لە باوەشم دەرچوو، ڕووی کردە ئاسمانی گەش و تاوێکی درێژ پاڕایەوە. لەپڕ هەستم کرد هێندە دوورم لە شەکوورە و پێی نامۆم، ئەگەر هەورێک بوومایە بەو ئاسمانەوە کە ئەو سەیری دەکات، جێی سەرسوڕمان نەدەبوو لام. شەکوورەی شۆخم هەر هێندەی لە خوێندنی نزاکانی بووەوە، چاوەکانی ماچ کردم.

گوتی: "ئەستەر، تا بکوژی باوکم لە ژیاندا بێت، لەم دنیایە نە ئاسوودەیی بۆ خۆم هەیە و نە بۆ کوڕەکانم."

پێم خۆش بوو ناوی مێردەکەی نەهێنا.

"برۆ ماڵی زەریف ئەفەندی، بۆنی دەمی ژنەکەی بکە و بزانە بۆ حەلوای بۆمان نەناردووە. بێ دواکەوتن هەواڵم پێ بگەیەنەوە."

گوتم: "هیچ قسەیەکت هەیە بۆ حەسەن؟"

لەبەر ئەم پرسیارەم نا، لەبەرئەوەی لە کاتی پرسیندا نەمتوانی سەیری ڕووی بکەم، هەستم بەشەرم کرد. بۆ ئەوەی شەرمەکەم پەردەپۆش بکەم، خەیرییەم ڕاگرت، سەری قاپەکەم هەڵدایەوە. گوتم: "واخ، حەلوای بڕوێشی فستقدارە" و پارچەیەکی بچووکم نایە دەمم و گوتم: "نارنجیشیان تێ کردووە."

بەوەی بینیم شەکوورە وەک ئەوەی هەموو شتێک بە ڕێی خۆیدا بڕوات، زەردەخەنەیەکی شیرینی بۆ کردم، دڵخۆش بووم.

بوخچەکەم هەڵگرت، دوو هەنگاو ڕۆیشتم و نەڕۆیشتم، لەو پەڕی کۆڵان قەرەم بینی. تازە تەرمی خەزووریان ناشتبوو. بە لووتبەرزیی زاوای نوێدا بۆم دەرکەوت لە ژیانی خۆی زۆر ڕازییە. بۆ ئەوەی نەبمە هۆی لە دەستدانی خۆشی و نەشئەکەی، لە ڕێ لام دا و چوومە بێستانێکەوە، بە باخچەی ماڵی جوولەکەی هەڵواسراوی برای یارە خۆشەویستەکەی موشێ هامۆنی پزیشکی جوولەکەی ناودارا تێ پەڕیم. ئەم باخچەیەی بۆنی مردنی لێ دێت، لە هەر تێپەڕبوونێکم پیایدا هێندە خەمم دەداتێ، لە بیرم دەچێت ئیدی پێویستە کڕیارێکی بۆ بدۆزمەوە و بیفرۆشم.

هەمان بۆنی مردنی ناو باخچەکە لە ماڵی زەریف ئەفەندیش دەهات، بەڵام شوێنەواری دڵتەنگیی پێوە دیار نەبوو. وەک ئەستەرێک، کە سەری بە هەزاران ماڵدا کردووە و سەدان بێوەژنی ناسیوە، دەزانم ئەو ژنانەی زوو مێردیان دەمرێت، یان دەکەونە بەر ئەفسوونی تێکشکان و خەمگینی، یاخۆ هەڵچوون و یاخیبوون (شەکوورەی خۆم لە هەردووکیاندا بەشی خۆی وەرگرتووە). قەلبییە خاتوون ژەهری هەڵچوونی نۆشیبوو و هەر لەوێدا حاڵی بووم ئەمە کاری من خێراتر دەکات.

قەلبییە خاتوونیش وەک ئەو ژنە لەخۆباییانەی پێیان وایە ژیان دڵڕەقانە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردوون، بەڕاستی گومانی دەکرد ئەوەی لە ڕۆژی خراپدا دەرگای دەکوتێ، بۆیە دێتە ماڵی بۆ ئەوەی بەزەییی پێدا بێتەوە، لەوەش خراپتر، بۆ



ئەوەی لە ڕەوشی پڕ لە ئازاری ئەم بڕوانێت و بەدزییەوە خۆشیی بە حاڵی خۆیدا بێت. بۆیە هەرگیز لە بەرامبەر میواندا قسەی خۆشی بە زاردا نەدەهات، بێ ئەوەی مەبەستی بێ دڵی میوان ڕابگرێت و لە نەبوونی قسەدا دابمێنێت و شەش و بێش بکات، ڕاستەوخۆ دێتە سەر کرۆکی بابەت. ئەرێ بەم دەمەو نیوەڕۆیە و لە کاتێکدا قەلبییە دەیویست عەسرە خەوێک بکات، ئەستەر بۆچی دەرگای کوتابوو؟ لەبەرئەوەی دەمزانی هیچ بایەخێک بەباشترین ئاوریشمی بە کەشتی لە چینەوە هاتوو و دەسماڵی لە بورساوە هاتوو نادات، بێ ئەوەی وا بنوێنم بوخچەکەم دەکەمەوە، یەکسەر بە گوڕەگوڕ هاتمە سەر کرۆکی مەبەست و خەمی شەکوورەی چاو بە فرمێسکم بۆ گێڕایەوە. گوتم: "خەیاڵی ئەوەی بێ مەبەست دڵی قەلبییە خاتوونی هاوچارەنووسی خۆی شکاندبێت، دەبێتە خەمێکی سەرباری خەمانی تر بۆ شەکوورەی کلۆڵ."

قەلبییە خانم بەنواندنێکی لە خۆباییانەوە ددانی پێدا نا لە شەکوورەی نەپرسیوەتەوە، بۆ سەرەخۆشی و پرسە نەهاتووە و بگرە بە دڵیدا ختوورەی نەکردووە حەلوایەک دروست بکات و بینێرێت. بێگومان شادبوونێکیش لە پشت لەخۆباییبوونەکەیەوە هەبوو و نەیدەتوانی بیشارێتەوە: هەستکردن بە دڵگرانییەکەی. ئەستەری ئاوەزیاوتان ئا لەم خاڵی لاوازییەوە دەستی پێ کرد و هەوڵی دا بچێتە سەر هۆیەکانی تووڕەیی قەلبییە و ئەو ڕووداوانەی قەومابوون.

زۆری پێ نەچوو قەلبییە ئاشکرای کرد لەپای ئەو کتێبەی خەریکی ئامادەکردنی بووە، لە زاوا ئەفەندی پەست بووە. گوتی پیاوی خوا لێخۆشبووی ئەو کاری بۆ بەدەستهێنانی چوار پێنج ئاکچەی زیاتر نەکردووە، بگرە لەبەرئەوەی زاوا ئەفەندی پێی گوتووە ئەم کتێبە لەسەر فەرموودەی سوڵتانە، ئەویش ڕازی بووە. بەڵام دوای ئەوەی مێردی خوا لێخۆشبووی دەبینێت ئەو پەڕە نەخشێندراوانەی کە زاوا ئەفەندی کێشانی زەڕکارییەکانی بەئەم دەسپێرێت، هێدی هێدی لە نەخش دەردەچن و ڕەپ و ڕاست دەبن بە نیگار و لەبەرئەوەی ئەم نیگارانەش بێ ئاینی و خوانەناسی و بگرە نیشانەی کفریش لەخۆ دەگرن، ئۆقرەی لێ دەبڕێت و لە نێوان ڕاست و هەڵەدا تیادەمێنێت. بەڵام لەبەرئەوەی ژنێکی زۆر بەهۆشتر و وردبینتر بوو لە زەریف

ئەفەندی، بەپارێزەوە لێی زیاد کرد: گشت ئەم گومانانە بەجارێک نا، لەبەرەوە دەستی پێ کردبوو و لەبەرئەوەی زەریف ئەفەندی هیچ کاتێک دووچاری کفرێکی ئاشکرا نەبووبوو، بێ ئۆقرەییی خۆی وەک بەدگومانی لێک دابووە و بەردێکی نابووە سەری. ئاشکرایە زەریف ئەفەندیی خوا لێخۆشبوو هیچ کاتێک وتارەکانی مەلا نوسرەتی ئەرزەڕوومیی لە کیس خۆی نەدەدا و لە کاتی خۆیدا نوێژی نەکردایە، ئۆقرەی لەبەر دەبڕا. لەبەرئەوەی وەک سۆفی پابەندی ئاینی خۆی بوو، هەروەک چۆن دەیزانی هەندێک لە هەرچی و پەرچیی نیگارخانە گاڵتەی پێ دەکەن، لەوەش ئاگادار بوو ئەم گاڵتە بێ ڕەوشتانە لە ئیرەییبردن بە هونەر و پیشەکەیەوە سەرچاوە دەگرێت.

دڵۆپێک فرمێسکی گەش و گەورە لە چاوی گەشی قەلبییەوە ڕژا و بە ڕوومەتیدا هاتە خوارێ. ئەستەری نیازپاکیش بڕیاری دا لە نزیکترین هەلدا پیاوێکی باشتر لە مێردی خوا لێخۆشبووی بۆ بدۆزێتەوە.

قەلبییە بەپارێزەوە گوتی: "خوا لێخۆشبوو زۆر لەکن من دەردەدڵی خۆی نەدەکرد. ئەو بەڵایانەی بەسەرمان هاتبوون، لە ئەقڵی خۆمدا بەراوردم کردن و گەیشتمە ئەو باوەڕەی هەموو شتێک لە چارەی نیگارەکانی زاوا ئەفەندییەوە، کە ئەم لە دوا شەوی ژیانیدا سەری لێ دابوو، بەسەر ئێمە هاتووە."

ئەمە جۆرێک بوو لە بیانووهێنانەوە. منیش لە وەڵامدا گوتم کێ دەزانێت، لەوانەیە زاوا ئەفەندیش بەدەستی هەمان "نامەرد" کوژرابێت و خاڵی چارەنووس و دوژمنی هاوبەشی شەکوورە و قەلبییەم خستەوە بیری. دوو منداڵی سەرزلیش لەلاوە بەوردی بۆ منیان دەڕوانی و ئەمەش ڕەوشی شەکوورە و قەلبییەی بەیەک دەچوواند. بەڵام لۆجیکی دەلاڵیی بێ بەزەییی ناو هەناوم، دەمودەست بیری خستمەوە: شەکوورە جوانتر، دەوڵەمەندتر و ڕازدارترە. چیم بە دڵدا هات گوتم:

"شەکوورە دەڵێت ئەگەر قەباحەتێکم هەبوایە، داوای بووردنم دەکرد. خوازیارە ببیت بە خوشک و هاوچارەنووسی و بیر لەمە بکەیتەوە و هاوکاریی بکەی. ئایا خوا لێخۆشبوو زەریف ئەفەندی کاتێک دوایین شەو لە ماڵ چووە دەرێ، بەتۆی گوت جگە لە زاوا ئەفەندی دەچێتە دیداری کەسێکی تریش؟ ئایا بەخەیاڵتدا نەهات چاوی بە



کەسێکی تر بکەوێت؟"

گوتی: "تەنیا ئەوەندەم لە زەریفی داماوم هەڵکڕاند."

لە قوتوویەکی حەسیری سەرداخراو کە دەرزیی نەخش و پارچە قوماش و دەنکە گوێزێکی گەورەی تێدابوو، کاغەزێکی قەدکراوی دەرهێنا و بۆی درێژ کردم.

کاتێک کاغەزە زبرە چەند قات نووشتێندراوەکەم وەرگرت و لە نزیکەوە تێم ڕوانی، کۆمەڵێک دیمەنم بینی مەرەکەبیان بە ئاودا بڵاو بووبووەوە. لەوەدا بووم بزانم ئەم دیمەنانە لە چ دەچن، قەلبییە بیری منی خوێندەوە:

گوتی: "ئەوانە ئەسپن. چەندین ساڵ بوو خوا لێخۆشبوو زەریف ئەفەندی تەنیا زەڕکاریی دەکرد، نیگاری ئەسپی نەدەکێشا و کەسیش داوای لێ نەدەکرد نیگاری ئەسپ بکێشێت."

ئەستەری پیرتان سەیری نیگاری ئەسپە بەپەلەپرووزێ کێشراوەکان و مەرەکەب بڵاوەبووی ناو ئاوی دەکرد و هیچیشی لێ حاڵی نەدەبوو.

گوتم: "ئەگەر ئەم کاغەزە هەڵبگرم و بۆ شەکوورەی ببەم، فرەی پێ خۆش دەبێت."

قەلبییە لووتبەرزانە گوتی: "شەکوورە ئەگەر ئەم کاغەزەی دەوێت، با خۆی بێ بۆ ئێرە."

# 40

## من ناوم قەرەیە

لەوانەیە تا ئێستا حاڵی بووبن: بۆ کەسانی وەک من، واتا بۆ کەسێکی وەک منی مەکۆی خەم کە دواجار ئەڤین و ئازار، بەختەوەری و پەرێشانی دەکات بەبیانووی تەنیاییەکی هەتا هەتایی، لە ژیاندا نە شادمانیی گەورە و نە خەمی گران پەیدا نابێت. من ناڵێم کاتێک ڕۆحی کەسانی دی بەم هەستانە ژێر و ژوور دەبێت، ئێمە ناتوانین بەهیچ جۆرێک لێیان تێ بگەین؛ تەواو بەپێچەوانەوە، بە زیادەوە لەو کەسانەی لە قوڵاییی ئەم هەستانەدا دەژین، تێ دەگەین. ئەو شتەی ناتوانین لێی حاڵی بین، شپرزەیییەکی سەیرە کە لەو ساتەدا لە ڕۆحی خۆماندا هێلانە دەکات. ئەم شپرزەیییە کپە، ئەقڵ و دڵمان ڕەش دەکات و جێی ئەو شادمانی و دڵگرانییە دەگرێتەوە کە دەبوو لە ڕاستیدا هەستمان پێ بکردایە.

لە خوا بەزیاد بێ باوکی شەکوورەم ناشت، بە هەڵەداوان لە گۆڕستانەوە گەڕامەوە ماڵ و بۆ ئەوەی سەرەخۆشی لە شەکوورە بکەم، باوەشم پێدا کرد. پاشان، ژنەکەم خۆی هاویشتە سەر نیمدەر و دەستی کرد بە گریانێکی بەکوڵ. منداڵەکانیشی بەچاوی دوژمنەوە بۆمیان دەڕوانی. منیش لە جێی خۆم وشک بووم. خەمی ئەو، سەرکەوتنی من بوو؛ لەپڕ بە خەون و خەیاڵی تافی لاویمەوە ژنم هێنابوو، لە باوکی، کە منی بەکەم دەزانی، ڕزگاریم هاتبوو و بووبووم بە سەرگەورەی ماڵ؛ جا کێ باوەڕی بە فرمێسکەکانی من دەکرد؟ نەخێر، باوەڕتان هەبێت وانەبوو؛ هەر بەڕاستیش دەمویست خەفەت بخۆم، بەڵام نەمدەتوانی، چونکە باوکی خۆم نا، بەڵکو



هەردەم زاوام ڕۆڵی باوکایەتیی بۆ من گێڕابوو. سەرباری ئەوەش، لەبەرئەوەی مەلای کارزانی بشۆری تەرم دەمی خۆی بۆ ڕانەگیرابوو، قسەی پاشملەی لە جۆری ئەوەی زاوا بە مردنی ئاسایی نەمردووە، هەروەک چۆن لە کاتی خوێندنی نوێژی مردوودا لە حەوشی مزگەوت هەستم پێ کرد، بەناو خەڵکی گەڕەکیشدا تەشەنەی کرد. بۆیە بۆ ئەوەی توانای نەگریانم بەخراپی لێک نەدرێتەوە، دەمویست خەمگین بێمە بەرچاو؛ ئێوە دەزانن قوڵترین هەست ئەوەیە مرۆڤ لەوە بترسێت بە دڵڕەق ناو ببرێت.

بەمەبەستی ئەوەی کەسانی وەک من لە جڤات قاو نەدرێن، پوورانی هۆشیار هەردەم بیانوویەکیان هەیە و دەڵێن: "کابرا لە ناخەوە دەگری." جا منیش لە ناخەوە دەگریام و سەرم لە هاوسێیانی کارزان و خزمانی دوور سوڕمابوو چۆن دەیانتوانی ئاوا زۆرەی گریانیان بێت. کاتێک هەوڵم دەدا بۆ ئەوەی نەکەومە بەرچاوان، خۆم لە گۆشەیەک بشارمەوە و بزانم داخۆ دەتوانم وەک سەرگەورەی ماڵ هەڵسوکەوت بکەم و جڵەوی دۆخەکە بگرمە دەست، لە دەرگا درا. دەمەساتێک پێم وابوو حەسەنە و شڵەژام، بەڵام ڕازی بووم بەوەی هەر چۆنێک بووە لەم دۆزەخە چاو بە فرمێسکە ڕزگارم بێت.

خولامێکی دەرگاوان بوو لە کۆشکەوە هاتبوو. منیان بۆ کۆشک بانگ کردووە. حەپەسام.

کاتێک لە حەوشەوە چوومە دەرێ، ئاکچەیەکم لە زەوی، لە قوڕەکەدا دۆزییەوە. ئایا لەبەرئەوەی لە کۆشکەوە داوام کرابوو، بەو ئەندازەیە دەترسام؟ بەڵێ، دەترسام؛ بەڵام ڕازی بووم بەوەی لە دەرەوە، لەبەر سەرما و لە کۆڵان، لەناو ئەسپ و سەگ و دار و مرۆگەلدا بووم. چەشنی ئەو خەیاڵپەرستانەی پێش ئەوەی ڕادەستی جەلاد بکرێن، لەگەڵ دەرگاوانی زینداندا نوقمی گفتوگۆیەکی خۆش لەبارەی خۆشییەکانی ژیان و واقەواقی ناو گوڵ و هەوری ئاسمانەوە دەبن و پێیان وایە بەمجۆرە دڵڕەقیی دنیا شیرین دەکەن، گوتم با منیش دەروازەی هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەم خولامە دەرگاوانەی بەدوای مندا هاتوو بخەمە سەرپشت، بەڵام منداڵێکی چارەگران و ڕووترش و کپ دەرچوو. کاتێک بەپێش مزگەوتی ئەیاسۆفیادا تێ پەڕین و بەشەیدابوونەوە بینیم دار سەررووە باریک و زراڤەکان بەنازداری بە ئاسمانی تەمومژاویدا هەڵکشابوون، گشت

مووی لەشم بوون بە نەشتەر؛ بەڵام نەک لەبەر ترسی دوای ئەو هەموو ساڵە هێنانی شەکووره و پاشان مردن، بگرە لەبەرئەوەی پێش ئەوەی بچینە نوێنەوە و بە کامی دڵ سەرجێیی بکەین، بەدەست ئەشکەنجەدەرانی کۆشکەوە بەنارەوایی گیان بسپێرم.

بەرەو دەروازەی ناوەڕاست نەچووین. من بەترسەوە سەیری قوولەکانی ئەم دەروازەیەم دەکرد و ئەشکەنجەدەران و جەلادانی دەست چاپووک ڕێک لە پشتیەوە کاری خۆیان ڕادەپەڕاند. ڕوومان لە دەروازەی دارتاشخانە کرد. کاتێک بەناو کۆگاکاندا تێ پەڕین، پشیلەیەک لە نێوان لاقەکانی ئەسپێکی ڕەنگ خەنەییدا خۆی دەلێستەوە و بگرە ئاوڕیشی نەدایەوە سەیرێکمان بکات: پشیلەکەش وەک ئێمە بەزیادەوە گیرۆدەی چەپەڵیی خۆی بوو.

دوو کەسی پۆشاک سەوز و وەنەوشەیی، کە نەمزانی پیاوی کێن، لە پشت کۆگاکانەوە بە بێدەنگی منیان لە خولامی دەرگاوان وەرگرت، خستمیانە ژوورێکی تاریکی ماڵێکی بچووکەوە و بەبۆنی تەختەکانیدا بۆم ئاشکرا بوو تازە بنیات نراوە و دەرگایان لەسەرم قفڵ دا. لەبەرئەوەی دەمزانی قایمکردن لە ژوورێکی تاریک یەکێکە لە پێکهێنەکانی تەدارەکی ترساندنی پێش ئەشکەنجەدان، ئومێدی ئەوەم لا پەیدا بوو سەرەتای کار بە فەلاقە دەست پێ بکەن و بیرم لەوە دەکردەوە درۆیەکی چۆن بهۆنمەوە بۆ ئەوەی خۆم لەم گرفتە دەرباز بکەم. پێ دەچوو لە تەنیشتیشەوە جەنجاڵییەک هەبێت؛ لەوێوە دەنگی هەرا و زەنا دەهات.

بێ هیچ گومانێک کەسانێکتان تێدا هەیە سەیری زمانی گاڵتەجاڕانەم دەکەن و بیرتان دەڕوات بۆ ئەوەی من وەک کەسێک نادوێم کە خەریکە بۆ ئەشکەنجەدان بەکێش دەکرێت. ئەوە بوو پێم گوتبوون من باوەڕم وایە بەندەیەکی بەختیاری خوام. ئەگەر ئەو مەلانەی بەخت، کە دوای چەندین ساڵ کوێرەوەری و مەینەتی چێشتن لە دوو ڕۆژی ڕابردوودا بەسەرمەوە نیشتوونەتەوە بەس نەبێت بۆ سەلماندنی ئەمە، خۆ دەبێت ئەو ئاکچەیەی کاتی لە حەوشە هاتنە دەرەوەم دۆزیمەوە، حیکمەتێکی هەبێت.

لە کاتێکدا چاوەڕێی ئەشکەنجەم دەکرد، بە ئاکچەکە دڵی خۆم دایەوە و ئیدی بەتەواوی باوەڕم وابوو دەمپارێزێت. ئەم نیشانەی بەختەی لە خواوە هاتووم ناو لەپم و دەستم پێدا هێنا و چەند جارێک ماچم کرد. ئەو کاتەی منیان لە تاریکی دەرهێنا



و بردیانمە ژوورەکەی تەنیشتەوە و سەرگەورەی پاسەوانان و ئەشکەنجەدەری کەچەڵی کرواتیم بینی، تێ گەیشتم ئاکچەکەش پارە ناکات. کەواتە ئەو دەنگە بێ بەزەیییەی لە ناوەوەڕا دەیگوت ئاکچەکەی گیرفانت خوا نەیناردووە، بگرە یەکێکە لەو ئاکچانەی دوو ڕۆژ لەمەوبەر بەسەر شەکوورەدا ڕژاندبووت و منداڵان نەیانتوانیبوو بیقۆزنەوە، ڕاستی دەکرد. بەمجۆرە، کاتێک خۆم ڕادەستی ئەشکەنجەدەر کرد، هیچ خەیاڵێک بتوانم متمانەی پێ بکەم و هیچ چڵێک بتوانم دەستی پێوە بگرم، نەمابوو.

بگرە هەستیشم پێ نەکردووە: چاوەکانم دەستیان کردبوو بە هەڵڕشتنی فرمێسک. ویستم بپاڕێمەوە، بەڵام وەک ئەوەی خەون ببینم، دەنگم دەرنەچوو. من شەڕ و مردن و ساتەکانی کوشتن و ئەشکەنجەدانم لەپای سیاسەت لە دوورەوە دیبوو و ئەو سەردەمانە دەمزانی مرۆڤ بۆی هەیە هەر ساتێک بفەوتێ، بەڵام ئەمە هیچ بەسەر خۆم نەهاتبوو. وەک ئەوەی لە جلەکانم ڕووت دەکرامەوە، دنیایان لەبەر دادەکەندم.

هێلەک و کراسەکەیان داکەندم. یەکێک لە جەلادەکان لەسەرم دانیشت، چۆکی لە شانم قایم کرد. ئەوی تریشیان، بەجووڵەی ورد و زەریف و بەئەزموونی ژنێکی چێشت لێنەرەوە قەفەسێکی کردە سەرم و هێدی هێدی دەستی کرد بەقایمکردنی برغووەکانی هەردوولای. قەفەس نەبوو، مەنگەنەیەک بوو لە هەردوولاوە دەستی کردبوو بە جەڕاندنی سەرم.

تا هێزم تێدا بوو هاوارم کرد. پاڕامەوە، بەڵام بە کۆمەڵێک وشەی بۆ تێگەیشتن نەشیاو. گریام، زیاتریش لەبەرئەوەی دەمارەکانم خاو بووبوونەوە.

ڕاوەستان و پرسیان داخۆ من زاوا ئەفەندیم کوشتووە؟

هەناسەیەکم هەڵکێشا: نەخێر.

جارێکی تر دەستیان کردەوە بە بادانی برغووەکان. دێشێت.

دیسان پرسییان: نەخێر. کێ؟ نازانم.

کەوتمە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی بڵێم من کوشتوومە، بەڵام دنیا بەشێوەیەکی جوان و نەرم و نیان بەدەوری سەرمدا دەخوولایەوە. دڵساردبوونەوەیەک هەناومی داگرت. لە خۆم پرسی داخۆ لەگەڵ ئازاردا ڕادێم؟ من و جەلادەکانم تاوێک بەمجۆرە ماینەوە. هیچ شوێنێکم ئازاری نەبوو، ئەوە نەبێت دەترسام.

بێدەنگییەکی درێژ، زۆر درێژ هاتە ئاراوە.

لەوسەری ژوورەکە عوسمان ئەفەندیی گەورەی نیگارکێشانم بینی. چوومە کنی و دەستیم ماچ کرد.

گوتی: "خەم مەخۆ کوڕی خۆم. ئەوە تاقییان کردیتەوە."

یەکسەر لەوێ تێ گەیشتم دوای زاوام، باوکێکی نوێم بۆ خۆم دۆزیوەتەوە.

سەرگەورەی پاسەوانان گوتی: "سوڵتانمان فەرمانی فەرمووە ئێستا ئەشکەنجە نەدرێیت. بەگونجاویان زانی لە دۆزینەوەی بکوژی نیگارکێشان و کتێب ئامادەکەراندا هاوکاریی مامۆستا عوسمانی گەورەی نیگارکێشان بکەی. لە ماوەی سێ ڕۆژدا سەیری نیگارەکانی دەستکردی خۆیان دەکەن، لەگەڵیاندا دەدوێن و ئەو چەپەڵە دەدۆزنەوە. سوڵتانمان زۆر بە گازندەیە لە ورتەورتی زماندرێژان لەبارەی کتێبەکانی خۆی و نیگارکێشانەوە. وەک سوڵتانمان دەستووری فەرمووە، من و حازم ئاغای گەورەی خەزنەدارانیش بۆ دۆزینەوەی ئەو نامەردە هاوکاریتان دەکەین. یەکێکتان لە خوا لێخۆشبوو زاوا ئەفەندییەوە نزیکن، گوێتان لە قسەکانی ڕاگرتووە؛ دەزانن ئەو نیگارکێشانەی بەشەو هاتوون، چۆن کاریان کردووە و بەسەرهاتی کتێبەکە دەزانن. ئەوی ترتان وەستایەکی گەورەیە و شانازی بەوەوە دەکات کەوا سەرجەم نیگارکێشانی تاقمی خۆی وەک ناو لەپی خۆی دەناسێت. ئەگەر لە ماوەی سێ ڕۆژدا، نەک تەنیا ئەو بەرازە، بگرە ئەو پەڕە ونبووەش نەدۆزنەوە کە باسی بووە بەویردی سەر زمانی خەڵکی، سوڵتانی دادپەروەرمان فەرمانی فەرمووە، کوڕم قەرە ئەفەندی، تۆ لە پێشدا بخرێیتە بەر لێپرسینەوەی بە ئەشکەنجەوە. گومانیشمان نییە دواتر نۆرە دێتە سەر مامۆستایانی دەستەی نیگارکێشان."

من لە نێوان دوو دۆستی دێرینی یەکتردا کە ساڵانێکی درێژ بوو هاوکاری یەکدی بوون، لە نێوان مامۆستا عوسمانی گەورەی نیگارکێشان و حازم ئاغای گەورەی خەزنەداران کە ڕاسپاردەی خۆی دەدایێ و فەرمانی دەدا لە خەزێنە کەرەسە و پارەی بۆ تەرخان بکرێت، هیچ ئاماژەیەکی نهێنی و بەتیلەی چاو تێگەیاندنێکم نەبینی.

سەرگەورەی پاسەوانان گوتی: "هەموو کەسێک دەزانێت کاتێک تاوانێک لە قاوش



و ژوور و یەکینەکانی سوڵتانمان ئەنجام دەدرێت، تا یەکینە بکوژ نەدۆزێتەوە و ڕادەستی نەکات، تەواوی ئەندامان تاوانبار دەکرێن. خۆ ئەگەر یەکینەیەکیش نەتوانێت پەنجە بخاتە سەر بکوژی ناوخۆی و بیدات بەدەستەوە، ئەوا ئەندامانی یەکینە لە سەرەوە تا خوارەوە، بە مامۆستاکانیشەوە، وەک بکوژ تۆمار دەکرێن و سزا دەدرێن. بۆیە مامۆستا عوسمانی گەورەی نیگارکێشانمان هەر چاوێکی دەکات بە چوار، بەچاوە تیژەکانی لە سەرجەم پەڕەکان دەکۆڵێتەوە، پەردە لەسەر ئەو ئیبلیسی و فێڵ و فیتنە و دووزمانییەی نیگارکێشانی بەگژ یەکدیدا کردووە، هەڵدەداتەوە، تاوانبار ڕادەستی دادپەروەریی بێ کەموکورتیی سوڵتانی جیهانپەنامان دەکات و بەمجۆرەش یەکینەی خۆی پاکژ دەکاتەوە. بۆیە داوای هەرچییەکی کردبێت بۆمان هێناوە و فەرمانیش دەدەین بۆی بهێنن. پیاوەکانم لە ماڵی یەک بەیەکی نیگارکێشان پەڕە نەخشێندراوەکانی کتێبەکە کۆ دەکەنەوە و دەیهێنن."

# 41

## من مامۆستا عوسمانم

پاش ئەوەی سەرگەورەی پاسەوانان و گەورەی خەزنەداران فەرمانەکانی سوڵتانمانیان دووبارە کردەوە و ڕۆیشتن، هەر هەردووکمان لە ژوورەکە ماینەوە. بێگومان قەرە لەبەر فێڵی ئەشکەنجە و ترس و ئەشکی چاوان ماندوو و خەمگین بوو. چەشنی منداڵێک بێدەنگ بوو. بێ ئەوەی خۆمی تێ بگەیەنم، هەستم کرد خۆشم دەوێت.

سێ ڕۆژ کاتم هەبوو بۆ وردبوونەوە لەو پەڕانەی پیاوانی سەرگەورەی پاسەوانان لە ماڵی خۆشنووسان و وەستایانی نیگارکێش کۆیان کردبووەوە و هێنابوویان و دەبوو لەو ماوەیەدا نیگارکێشەکانم دەستنیشان بکەم. ئێوە ئاگادارن کاتێک یەکەمجار نیگارەکانی کێشراو بۆ کتێبەکەی زاوا ئەفەندیم بینی، کە قەرە بۆ ئەوەی بێ تاوانیی خۆی بسەلمێنێت، بۆ حازم ئاغای گەورەی خەزنەدارانی هێنابوو، چۆن هێڵنجم دا. پێویستە قەبوڵ بکرێت ئەو پەڕانەی ڕادەیەکی زۆر هێڵنج و نەفرەت لای نیگارکێشێکی قاڵبووی ناو ئەم کارە دەورووژێنێت، بێگومان کۆمەڵێک شتی تریان تێدایە ناکرێت فەرامۆش بکرێن، چونکە تەنیا هەر هونەری خراپ هێڵنجمان پێ نادات. بەمەراقێکی ئا لەو جۆرەوە سەرلەنوێ دەستم کردەوە بەسەیرکردنی ئەو نۆ نیگارەی کە ساویلکەی خوا لێخۆشبوو بەو نیگارکێشانەی بە شەوان دەچوونە کنی، بەکێشانی دابوون.

لەسەر کاغەزێکی خاڵی، وەک نیگارەکانی دی لە چوارچێوە و زەڕکاریی زەریفی



داماودا دارێکم بینی. هەوڵم دا بەخەیاڵمدا بێ ئەم دارە لە چ چیرۆکێک و لە کام جڤاتەوە هاتووە. ئەگەر داوای کێشانی نیگاری دارێک لە نیگارکێشانم، پەپوولەی خۆشەویست و لەقلەقی ئاوەزیاو و زەیتوونی فێڵباز بکەم، بەر لە هەموو شتێک ئەم دارە وەک بەشێک لە چیرۆکێک دەهێننە بەرچاوی خۆیان تا بەئاسوودەیی نیگاری بکێشن. ئەگەر بەوردی سەرنج لەو دارە بدەم، دەتوانم بە لک و چڵ و گەڵاکانیدا بزانم نیگارکێش خەیاڵی لە کام چیرۆک لێ داوە. بەڵام ئەم دارە، دارێکی داماو و تەنیا بوو؛ لە پشتیشەوە هێڵێکی ئاسۆی باش بەرز کراوە هەبوو. هێڵەکە، دارەکەی تەنیاتر پێشان دەدا و شێوازی مامۆستایانی کۆنی دەهێنایەوە بیری مرۆڤ. بەڵام هیچ شتێکی تر لەو بۆشاییەدا نەبوو کە بەهۆی بەرزکردنەوەی هێڵی ئاسۆوە پەیدا بووبوو. بەمجۆرە، داخوازی کێشانی نیگاری دارێک تەنیا لەبەرئەوەی دارە لەسەر شێوازی مامۆستایانی فەڕەنگ لەگەڵ داخوازی لە سەرەوە بینینی دنیا لەسەر شێوازی مامۆستایانی عەجەم تێکەڵ بەیەکتر بووبوون و نیگارێکی خەمگین هاتبووە ئاراوە و نە بە نیگاری فەڕەنگ و نە بە نیگاری عەجەم دەچوو. بەخۆم دەگوت دەبوو دارێکی ئەو شوێنەی کۆتاییی دنیای لێ دێت، بەمجۆرە بوایە. بەڵام نیگارکێشانی من و ئەقڵی خوا لێخۆشبووی گەمژە و تەختە ناتەواو لە هەوڵیاندا بۆ تێکەڵکردنی دوو شێوازی جیاواز، شتێکی بێ بەش لە هونەریان دروست کردبوو. ئەوەی منی پەست دەکرد، وەرگرتنی ئیلهامی نیگارەکە لە دوو دنیای جیاوازەوە نەبوو، بگرە ئەم بێ هونەرییەی بوو.

کاتێک سەیری نیگارەکانی تریشم دەکرد، نیگاری ئەسپە ئەفسانەیی و بێ کەموکورتییەکە و ژنە مل خوارەکە، هەستم بەهەمان شت کرد. هەڵبژاردنی بابەت و ئەم دوو عەبداڵ یان ئیبلیسەش ڕقی منیان ئەستوور دەکرد. ئاشکرایە نیگارکێشانی من ئەم نیگارانەیان خزاندووەتە کتێبەکەی سوڵتانمانەوە. جارێکی تریش شەیدانی توانای خوای مەزن بووم لەپای ئەوەی بەر لە تەواوبوونی کتێبەکە گیانی زاوای کێشابوو. هیچ ئارەزووشم نەدەکرد ئەم کتێبە بەئەنجام بگەیەنم.

بۆچی بەدەستی خۆم بوو بە نیگاری ئەو سەگە پەست نەبم کە لە سەرەوە نیگاری کێشراوە و وەک ئەوەی برامان بێت، لەبەر لووتمان ڕاوەستاوە و لە نزیکەوە

سەیرمان دەکات؟ لە لایەک سەرسام بووم بەشێوەی ڕاوەستانی ئاساییی ئەم سەگە، بە جوانیی ناو نیگاکانی لە کاتێکدا لووتی لە زەوییەوە دەژەند و بەتیلەی چاو بە هەڕەشەوە بۆ ئێمەی دەڕوانی، بە سپیەتیی لە ڕادەبەدەری کەڵبەکانی و بەکورتی، بە هونەری نیگارکێشی بکێشی ئەم نیگارە (لەوەدا بووم پێشبینی بکەم قەڵەمی کام نیگارکێش بەم نیگارەدا هێندراوە). لەلایەکی ترەوە، هەرگیز نەمدەتوانی چاوپۆشی بکەم لەوەی ئەم هونەرە بۆ خزمەتی لۆجیکی ویستێکی توڕەهات بەکار بهێنرێت. ئارەزووی لاساییکردنەوەی مامۆستایانی فەڕەنگ، تەنانەت فەرمانی سوڵتانیشمان بۆ دروستکردنی کتێبێک وەک دیاریی بۆ دۆق لەسەر شێوازێکی لەبار تا خەڵکی ڤینیسیا بتوانن لێی تێ بگەن، پاساو نەبوو بۆ هەوەسی ناو نیگارەکان.

عەشقی ڕەنگی سووری نیگارێکی جەنجاڵ کە یەکسەر زانیم هەریەکە لە نیگارکێشانم قەڵەمێکیان بە گۆشەیەکیدا هێناوە، منی ترساند. دەستێک، نەمزانی دەستی کێیە، بەپەیڕەوکردنی دەسەڵاتی لۆجیکێکی نهێنی، سوورێکی سەیری لە نیگارەکە دابوو و ئەو دنیایەی نیگارەکە پێشانی دەدا، بەهێمنی لە سووردا نقوم دەبوو. تاوێک پێشانی قەرەم دا کێ دار چناری ناو ئەم نیگارە قەرەباڵغە (لەقلەق)، کەشتی و مالان (زەیتوون) و فڕین و خونچە (پەپوولە)ی کێشاوە و هەریەکەیان بەدەستی کام نیگارکێشم کێشراون.

قەرە گوتی: "کەسێکی وەک ئێوە، مامۆستایەکی گەورەی نیگارکێشی سەرۆکی چەندین ساڵەی دەستەی نیگارکێشان، هەڵبەتە هونەری دانە بەدانەی نیگارکێشان، میزاجی قەڵەمی هەریەکەیان و خووی فڵچەکانیان دەناسنەوە. بەڵام ئەو کاتانەی کتێبپەروەرێکی سەیری وەک زاوام نیگارکێشانی ناچار کردووە بەپەیڕەویکردن لە شێوازگەلی نوێ و نەزاندراو نیگار بکێشن، ئایا ئێوە چۆن نیگارکێشانی خۆتان دەناسنەوە و چۆن دڵنیا دەبن کێ کام نیگاری کێشاوە؟"

بەدەم گێڕانەوەی بەسەرهاتێکەوە وەڵامم دایەوە و گوتم: "سەردەمانێک سوڵتانێکی کتێب و نیگارپەروەری فەرمانڕەوای ئەسفەهان هەبوو تاک و تەنیا لە قەڵای خۆیدا دەژیا. ئەمە سوڵتانێکی بەهێز، خاوەن دەسەڵات و زیرەک، بەڵام بێ بەزەیی بوو. ئەو کتێبانەی خۆی بە نیگارەوە بەئامادەکردنی دەدان و کچەکەی لێ دەربچێت، هیچی



تری خۆش نەدەویست. ئەم سوڵتانە لە خۆشویستنی کچەکەیدا گشت سنوورێکی بەزاندبوو و کارێکی وای کردبوو ئەو دوژمنانەی دەیانگوت سوڵتان عاشقی کچی خۆی بووە، بە ناهەق دانەنرێن. بەئەندازەیەک لووتبەرز و دڵپیس بوو لەوانەبوو جارڕی شەڕی لەدژی ئەو شازادە و سوڵتانانەی دراوسێ بدایە کە نوێنەریان دەنارد و داخوازیی کچەیان بۆ خۆیان دەکرد. هیچ پیاوێکی شایانی بۆ کچەکەی پێ نەدەدۆزرایەوە و کچەی لە پشت چل دەرگاوە قایم کردبوو و چل قفڵی لێ دابوو، چونکە ئەویش لە ڕووی باوەڕێکی باوەوە لە ئەسفەهان پێی وا دەبێت ئەگەر پیاوانی تر کچەکەی ببینن، ئەوا جوانییەکەی دەپووکێتەوە. ڕۆژێک دوای تەواوبوونی کتێبی شیرین و خەسرەو کە خۆی بە ڕاسپاردنی دابوو و نیگارەکانی لەسەر شێوازی هەراتی کێشرابوون، ورتەورتێک بە ئەسفەهاندا تەشەنە دەکات: دەگوترێت ئەو شۆخە کزەی لە نیگارێکی جەنجاڵی ناو پەڕەکاندا دەبینرێت، کچی سوڵتانی دڵپیسە. سوڵتان بەر لەوەی ورتەورتەکان بەگوێی بگاتەوە، گومان لەم نیگارە نهێنیدارە دەکات و ئەمجار دوای ئەوەی بەدەستی لەرزۆکەوە پەڕەکانی کتێبەکە هەڵدەداتەوە، بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە حاڵی دەبێت نیگاری جوانیی کچەکەی کێشراوە. بەگوێرەی بانگەشەکان، کچی سوڵتانی قایمکراو لە پشت چل دەرگای کلۆمدراو خۆی نا، بگرە جوانییەکەی کتومت وەک ئەو خێوانەی لە گیانی خۆیان بێزار دەبن، شەوێک لە ژوورەکان دەرچووە، لە ئاوێنەکاندا ڕەنگی داوەتەوە و بە کونی قفڵەکاندا تێ پەڕیوە و وەک تیشکێک و دووکەڵێکی هیچ نەبیندراو گەیشتووەتە بەرچاوی یەکێک لەو نیگارکێشانەی لە شەودا کاریان کردووە. نیگارکێشی لاو و وەستا نەیتوانیوە چاو لەسەر ئەم جوانییەی لە وزەی ئەقڵ بەدەرە هەڵگرێت، خۆی بۆ ڕانەگیراوە و لە گۆشەی نیگارێکدا، کە ئەو کاتە خەریکی کێشانی دەبێت، دەیکێشێت. نیگارەکە ئەو ساتەی پێشان داوە کاتێک شیرین لە سەیرانێکی دەشت و چۆڵەوانی نیگاری خەسرەو دەبینێت و عاشقی دەبێت."

قەرە گوتی: "وەستام، ئەفەندیم، ئەمە ڕێکەوتێکی گەورەیە، چونکە ئێمەش زۆر حەزمان لەو جڤاتەی ئەو چیرۆکەیە."

گوتم: "ئەمانە چیرۆک نین، بگرە بەسەرهاتی ڕاستەقینەن. گوێ بگرە:

نیگارکێشمان نیگاری کچی سوڵتانی وەک شیرینی شۆخ نەکێشاوە، بگرە وەک یەکێک لە یاوەر و هاودەمانەی عوود دەژەنن و خوان دەڕازێننەوە، کێشاویەتی، چونکە ئەو ساتە نیگاری ئەو یاوەری کێشاوە. بەو شێوەیە جوانیی شیرین لە پەنای جوانیی یاوەرەکە کاڵ بووەتەوە و پارسەنگی نیگارەکە تێک چووە. کاتێک سوڵتان لە نیگارەکەدا کچی خۆی دەبینێت، دەخوازێت نیگارکێشی هونەربازی نیگار بدۆزێتەوە. بەڵام نیگارکێشی فێڵباز لەبەرئەوەی لە کاردانەوەی سوڵتان دەترسێت، نیگاری یاوەرەکە و کچی سوڵتانی بە شێوازێکی نوێ کێشاوە و نازانرێت نیگارکێش کێیە. شوێن قەڵەم و هونەری زۆرێک نیگارکێشی تریش بەو نیگارەوە دەبێت."

"باشە، سوڵتان چۆن لە ڕێی نیگارەکەوە بۆی ئاشکرا بووە کام نیگارکێش نیگاری کچی ئەوی کێشاوە؟"

"بە سەیرکردنی گوێیەکانیدا."

"بە سەیرکردنی گوێی کێدا؟ گوێی کچە، یاخۆ نیگاری گوێی کچە؟"

"ڕاستییەکەی هیچ کامیان. سەرەتا بە پەی پێبردنێک سەرجەم کتێب و پەڕە و نیگاری دەستکردی نیگارکێشانی خۆی لە پێش خۆی بڵاو دەکاتەوە و سەیری گوێیەکان دەکات. هەمان ئەو شتە دەبینێت کە چەندین ساڵ بووە زانیویەتی: نیگارکێشانی سوڵتان هونەریان لە چ ئاستێکدا بووبێت، هەریەکەیان بەپێی خۆی نیگاری گوێی کێشاوە. ڕوویێک ئەوان دەیانکێشا، سا ڕووی سوڵتانێک، منداڵێک، شەڕوانێک تەنانەت دووربێت ڕووی لە پشت پەردەوە نەشاراوەی پێغەمبەر، یاخۆ دووربێت ڕووی ئیبلیس بووایە، هیچ جیاوازیی نەبوو. هەر نیگارکێشێک، لە هەموو دۆخێکدا هەمیشە نیگاری گوێی وەک واژۆیەکی نهێنی لە نیگاردا بەهەمان شێوە دەکێشا."

"بۆچی؟"

"کاتێک مامۆستایانی نیگارکێش نیگاری ڕوو دەکێشن، تەواوی سەرنجی خۆیان دەخەنە سەر دەربڕین، وێکچوون یان نەچوونی ڕووەکە لە کەسێک، مەبەستیانە ڕووەکە بگاتە بەرزترین ئاستی جوانی و لەگەڵ قاڵبە کۆنەکاندا گونجاو بێت. کاتێکیش نۆرە دێتە سەر گوێ، نە لە نیگارکێشانی ترەوە دەدزن، نە لاسایی



قاڵبێکی تر دەکەنەوە و نە سەیری گوێیەکی ڕاستەقینە دەکەن، چونکە لە کاتی کێشانی نیگاری گوێدا هیچ بیر ناکەنەوە، بایەخی پێ نادەن و لەسەر ئەو شتەی دروستی دەکەن، ڕاناوەستن. بەوجۆرە قەڵەمی خۆیان لەبەر دەگەڕێنن."

قەرە گوتی: "ئەدی مەگەر گشت مامۆستایانی مەزن نیگاری دانسقەی خۆیان بێ سەیرکردنی ئەسپ و دار و مرۆڤ لەبەر ناکێشن؟"

من گوتم: "ڕاستە، بەڵام ئەمە لەبەرکردنێکە دوای چەندین ساڵ بیرکردنەوە و لەسەر ڕاوەستان و مێشک ماندووکردن بەدەست هاتووە. لەبەرئەوەی بەدرێژاییی ژیانی خۆیان ژمارەی تەواو نیگاری ئەسپ و ئەسپیان دیوە، زۆر باش دەزانن ئەسپی زرت و زیندووی بەردەمیان زیان بە بیرۆکەی بێ کەموکورتیی ئەسپی ناو سەریان دەگەیەنێت. قەڵەمی مامۆستایەکی نیگارکێش بەدرێژاییی ژیانی نیگاری دەیان هەزار ئەسپی کێشابێت، دواجار بەباشی شایەنی کێشانی نیگاری ئەو ئەسپە دەبێت کە خوا پێشبینیی کردووە و ئەمەشی لە نێوان ڕۆح و ئەزموونەکانی خۆیەوە بۆ دەردەکەوێت. ئەو ئەسپەی دەستی نیگارکێش بەجارێک کێشاویەتی، بە هونەر و ئازار و زانستەوە کێشراوە و ئەسپێکە نزیک لە ئەسپی خوا. بەڵام گوێیەکی کێشراو بەدەستێکی بێ ئەزموون، بەدەستێک هیچ بیر نەکاتەوە و نەزانێت چ دەکات و بێ سەرنجدانی گوێی کچی سوڵتان کێشرابێت، هەمیشە دەبێت بە کێماسی. جا ئەمە لەبەرئەوەی کێماسییە، لەکن هەر نیگارکێشێک بەشێوەیەکی جیاواز دەبێت، واتە دەبێت بەجۆرێک لە واژۆ."

دەنگی تەقوهوڕ و جووڵەیەک هات. پیاوانی سەرگەورەی پاسەوانان ئەو پەڕانەی لە ماڵی خۆشنووسان و نیگارکێشانم کۆیان کردبووەوە، دەبردە ژووری کۆنی نیگارخانە.

ویستم قەرە بهێنمە پێکەنین و گوتم: "ڕاستییەکەی، گوێ، کێماسییەکی مرۆڤە. شتێکە هەم لای هەموو کەسێک وەک یەک وایە و هەم جوداشە: قرێژییەکی تەواو."

"ئەو نیگارکێشەی بە واژۆ خۆی بەدەستەوە داوە، چی بەسەرهاتووە؟"

بۆ ئەوەی قەرە لەوە زیاتر دڵگران نەبێت، نەمگوت: "کوێر کراوە." گوتم: "لەگەڵ کچی سوڵتاندا زەماوەندی کردووە. لەو ڕۆژەوە ئەم شێوازە بۆ دەستنیشانکردنی

نیگارکێش بەکار دەهێنرێت و لەناو زۆرێک لە خان و پادشا و سوڵتانی خاوەن نیگارخانەدا بە –شێوازی یاوەر– ناو دەبرێت و وەک ڕازێک دەشاردرێتەوە تا ئەگەر نیگارکێشانیان نیگاریان کێشا و نەخشیان کرد و دواتر نکوڵییان لێ کرد، یەکسەر بناسرێنەوە. خاڵی گرینگی کارەکە بریتییە لە دۆزینەوەی ئەو وردەکارییانەی لە دڵی نیگارەکەدا نین و بایەخیان پێ نەدراوە و بەخێرایی کێشراون و هەمیشە دووبارە دەبنەوە. ئەمانە بۆیان هەیە گوێ، دەست، گیا، گەڵا، یاڵ یان چوارپەل و تەنانەت سمی ئەسپ بن. بەڵام وریا بە، نابێت نیگارکێش بزانێت ئەم تایبەتمەندییەی بووە بە واژۆی نهێنی بۆی. بۆ نموونە سمێڵ نابێت؛ چونکە زۆربەی نیگارکێشان دەزانن نیگاری سمێڵ بەگوێرەی شێوازی خۆیان دەکێشن و نیگاری سمێڵ واژۆیەکی نیوە ئاشکرایە. بەڵام برۆ دەبێت، چونکە کەس سەرنجی لێ نادات. ئێستا وەرە با بزانین کام لە نیگارکێشان فڵچە و قەڵەمی خۆیان بە نیگارەکانی زاوای خوا لێخۆشبوودا هێناوە.

بەمجۆرە، پەڕەکانی دوو کتێبمان، کە یەکێکیان بەنهێنی و ئەوی تریان بەئاشکرا دروست دەکرا، چیرۆک و بابەتیان جیاواز بوو و بەشێوازی جیاواز دەنەخشێندران، واتا کتێبەکەی خوا لێخۆشبوو زاوا ئەفەندی و ئەو جەژننامەیەی باسی شایی خەتەنە سوورانی شازادەمانی دەکرد و لەژێر چاودێریی مندا ئامادە دەکرا، لە تەنیشت یەکەوە دانا و لەگەڵ قەرە زەرەبینەکەی منمان بەسەریاندا دەهێنا و تەماشامان دەکردن:

١– لە پەڕەی جەژننامەدا، سوڵتانمان لە کۆشکی تەنیا بۆ ئەو مەبەستە بنیات نراوەوە، سەیری تێپەڕبوونی کەژاوەی خەتەنە سووران دەکات. ئێمە سەرەتا لە باوەشی وەستایەکی پێستەکاری نێوان ئەو پێستەکارانەی بەبەردەم سوڵتانماندا تێ دەپەڕین و سەڵتەیەکی سووری لەبەر کردبوو و پشتوێنێکی وەنەوشەیی بەستبوو، سەرنجمان لە دەمی کراوەی پێستی ڕێوییەک دا. دانە بەدانەی کەڵبەی ڕێوییەکە و کەڵبەکانی ئەو بوونەوەرە شوومەی نیو ئیبلیس و نیوە دێوی ناو نیگارەکەی زاوا، کە پێم وابوو لە سەمەرقەندەوە هاتووە، بەهەمان دەست، بە قەڵەمی زەیتوون کێشرابوو.



٢– لە ڕۆژێکی پڕ لە بەزمی شاییی خەتەنە سووراندا و لەژێر ئەو پەنجەرەی سوڵتانمان سەیری مەیدانی ئەسپی لێوە دەکات، دەستەیەک لە شەڕوانانی بریندارانی شەڕ و هەژاری سەر سنوور بە جلوبەرگی شڕ و دڕاوەوە پێشان درابوون. یەکێک لەناو ئەوانەدا گوتوویەتی: "سوڵتانم، ئێمە وەک شەڕوانانی قارەمانی تۆ کاتێک لە پێناوی ئایندا لە بەرامبەر گاوراندا شەڕ دەکەین، بە دیل گیراین. تەنیا بەدانانی خزمێکمان یان برایەکمان وەک بارمتە و بۆ ئەوەی سەرانە پەیدا بکەین، ئازاد کراین. بەڵام دوای گەڕانەوەمان بۆ ئەستەنبوڵ بینیمان هەموو شتێک زۆر گران بووە و هەرچەند دەکەین پارەی ڕزگارکردنی خزمە بە بارمتە گیراوەکانمان پێ کۆ ناکرێتەوە و پێویستمان بە کۆمەکی تۆ هەیە؛ یان زێڕمان بدێ، یان دیل، بۆ ئەوەی بیانبەین و لەگەڵ برایانی بارمتەماندا بیانگۆڕینەوە و ڕزگاریان بکەین." نینۆکی پێی ئەو سەگە تەوەزەلەی لەو ساتەدا لە گۆشەیەکەوە بە تاکە چاوی کراوەی سەیری سوڵتانمان و بریندارانی لێقەوماو و بەستەزمانمان و باڵیۆزانی عەجەم و تەتەری ئامادەی مەیدانی ئەسپ دەکات، لەگەڵ نینۆکی ئەو سەگەی لە کتێبەکەی زاوادا گۆشەی جڤاتی پڕ کردووەتەوە و بەسەرهاتی ئاکچە پێشان دەدات، ئاشکرایە بەهەمان قەڵەم، بەدەستی لەقلەق کێشراوە.

٣– جادووبازێکی کەچەڵ و هێلەک وەنەوشەیی و سک ڕووتی لەوانەی لە بەردەم سوڵتانمان تەقڵە لێ دەدەن و هێلکە بەسەر تەختەدا دەبەن، کاتێک لە قەراغەوە چۆکی ناوەتە سەر فەرشێکی سوور و دەف دەژەنێت، قامکەکانی کتومت لە پەنجەی ئەو ژنە دەچوون کە لە کتێبەکەی زاوادا سینییەکی بە دەستەوە گرتبوو (زەیتوون).

٤– دەستەی ئەو چێشت لێنەرانەی لە مەنجەڵێکی گەورەی سەر ئاگردانێکی ناو گالیسەکەیەکی پێچکەداردا دۆڵمەی کەلەرمیان بە گۆشت و پیازەوە دەکوڵاند و گالیسکەکەیان بەپاڵ پێوەنان بە پێش سوڵتانماندا تێ دەپەڕاند، بەردی شینی ئەو خاکە وەنەوشەییەی وەستایانی چێشت لێنەر بە مەنجەڵەکانەوە بەسەریدا دەڕۆیشتن، لەگەڵ بەردی سووری ئەو خاکە شینە تێرەی کە شتە نیمچە

تارماییيەکەی ناو ئەو نیگارەی زاوا ناوی مردنی لێ نابوو، بەئاستەم پێی پێدا دەنێت، بەهەمان قەڵەم کێشراون (پەپوولە).

٥- پەیکبەرانی تەتەر هەواڵ دێنن و جارِ دەدەن سوپای پادشای عەجەم کەوتووەتە خۆ بۆ پەلامارێکی نوێ بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی. باڵیۆزی عەجەمیش هەمیشە هەوڵ دەدات سوڵتانی جیهانپەنامان قایل بکات بەوەی پادشای عەجەم دۆستە و جگە لە برایەتی، هیچ هەستێکی تری لە بەرامبەر سوڵتانمان نییە. لەپڕ کۆشکی ڕازاوەی باڵیۆز تەخت دەکرێت و گسکی لێ دەدرێت. پیاوانی ئاوکێش ڕایان کردبوو بۆ دامرکاندنەوەی ئەو تۆزەی لە نێوان هەڵچوون و ڕوخانەکەوە لە مەیدانی ئەسپ بەرز بووبووەوە و کۆمەڵێک پیاوی مەشکە لە کۆڵیش فریا کەوتبوون بۆ ئەوەی بە ڕژاندنی ڕۆنی کەتان بەسەریاندا ئەو ئاپۆڕەیە هێور بکەنەوە کە دەیویست پەلاماری باڵیۆز بدات. شێوەی هەڵگرتنی پێی ئاوکێشان و پیاوانی مەشکەی پڕ لە ڕۆنی کەتان لە کۆڵ لە کاتی ڕاکردندنیاندا، لەگەڵ شێوەی هەڵگرتنی پێی ئەو سەربازانەی لە نیگارە بە سوور کێشراوەکەدا ڕادەکەن، بەهەمان دەست کێشراون (پەپوولە).

زەڕەبینی دەستم لە ڕاستەوە بۆ چەپ و لەم نیگارەوە بۆ ئەو نیگار دەبرد و هەرچەندە خۆم بەتەواوی جڵەوی گەڕان لە دووی نیشانەم گرتبووە دەست، بەڵام ئەم دەستنیشانکردنەی کۆتایی هی من نا، هی قەرە بوو کە لە ترسی ئەشکەنجە و بەئومێدی شادبوون بە ژنەکەی لە ماڵەوە، هەر چاوێکی کردبوو بە چوار. وردبوونەوە لەسەر -شێوازی یاوەر- لە نۆ نیگارەکەی پاشماوەی زاوای خوا لێخۆشبووی و شوێن پەنجەی نیگارکێشانمان بە نیگارەکانەوە و دواتر شیکردنەوەی زانیارییەکان، هەموو کاتی دوای نیوەڕۆی بردین.

زاوای خوا لێخۆشبووی قەرە هیچ پەڕەیەکی بە قەڵەم و هونەری یەک نیگارکێش نەسپاردبوو، هەرسێ مامۆستای نیگارکێشم جێ دەستیان بە نیگارەکانەوە دیار بوو. ئەمەش بەڵگە بوو بۆ ئەوەی نیگارەکان ماڵە و ماڵیان پێ کراوە و ئەم هاتوچۆیەش چڕوپڕ بووە. کاتێک، جگە لە نیگارکێشانی ناسراوی خۆم، هەستم بەهەبوونی جێی دەستێکی پێنجەمی نەزان بە نیگارەکانەوە کرد، بیرم کردەوە



بکوژی نامەرد چەند بێ توانا بووە و لەوەدا بووم هەڵچم، بەڵام باش بوو قەرە بەشێوەی بۆیاخکردنی بەپارێزدا جێ دەستی زاوای خۆی دەستنیشان کرد و بەمەش لە گەڕان بەدوای جێ دەستی هەڵەدا ڕزگارمان بوو. بەگومانی من، زەریف ئەفەندیی کلۆڵ جاروبار فلچەی بە دیوار و گەڵا و هەورەکاندا هێنابوو و هەمان ئەو زەڕکارییانەی بۆ جەژننامەی ئێمەی کردبوو، کتومت وەک خۆی بۆ کتێبەکەی زاواشی کردبوو (بەڵێ، بێگومان دڵم شکابوو). بە وەلاوەنانی زەریف ئەفەندی، بێ چەند و چوون ئاشکرا دەبوو تەنیا جێ پەنجەی سێ لە وەستایانی نیگارکێشی هەرە لێهاتووم بە نیگارەکانەوە دیارە. ئەمانە سێ هونەرباز و جگەرگۆشەی خۆم بوون و لە سەردەمی شاگردییانەوە بە ئەڤینەوە پێم گەیاندبوون: زەیتوون، پەپوولە، لەقلەق...

قسەکردن لەمەڕ هونەر و وەستایی و خووی هەریەکەیان بەئومێدی لە دۆزینەوەی ئەو شتەی بۆی دەگەڕێین، هاوکاریمان بکات، بەتەنیا قسەکردن نییە لەبارەی ئەوانەوە، قسەکردنە لەبارەی ژیانی خۆیشمەوە:

## خەسڵەتەکانی زەیتوون

ناوی ڕاستەقینەی وەلیجانە. ناشزانم ئەگەر ناسناوی تری جیاواز لەوەی من پێم داوە هەبێت، چونکە نەمدیوە واژۆی خۆی خستبێتە سەر هیچ شتێک. لە سەردەمی شاگردیی خۆیدا ڕۆژانی سێشەم دەهات و منی لە ماڵەوە دەبرد. زۆر بەخۆی دەنازێت؛ ئەگەر بتوانێت خۆی دابگرێتە خوارەوە بۆ ئاستی واژۆکردن، ئەوا خوازیارە ببینرێت و بناسرێت، ئەمەش بەواتای نەشاردنەوەی واژۆکەی دێت. خوا بەزیادەوە لێهاتوویی پێ داوە. لە زەڕکارییەوە بگرە بۆ هێلکێشان، هەموو شتێکی لە دەست دێت و باشترین کار دەکات. ئەو لێهاتووترین نیگارکێشی نیگارخانەی منە لە کێشانی نیگاری دار و ڕووی ئاژەڵ و مرۆڤدا. پێم وابێت وەلیجان دە ساڵان بوو کاتێک باوکی ئەمی هێنایە ئەستەنبوڵ. باوکی، پەروەردەی بەردەستی سیاوشی نیگارکێشی ڕووی نیگارخانەی پادشای سەفەوی بوو لە تەورێز و زنجیرەی مامۆستایانی ئەو تا مەگۆلەکان درێژ دەبێتەوە. لەژێر کاریگەریی مەگۆل-چیندایە و وەک پیرە وەستایانی سەد و پەنجا ساڵ لەمەوبەری نیشتەجێی سەمەرقەند و بوخارا و هەرات ڕووی ئەڤیندارانی لاو بە نەریتی چینی لەسەر شێوەی مانگ دەکێشێت. نە

له سەردەمی شاگردی و نه له دەورانی وەستایەتیدا نەمتوانی توێکڵی ئەو گوێزە سەختەی خۆی تێ خزاندبوو، بشکێنم. خوازیار بووم لەو شێواز و نموونەی مامۆستایانی مەگۆل-چین-هەراتی حەشاردراو له قولاییی ڕۆحی خۆیدا بێتە دەرێ و تەنانەت ئەگەر پێویست بێت، لەبیریان بکات. کاتێک ئەمانەم پێ دەگوت، ئەو دەیگوت وەک زۆربەی ئەو نیگارکێشانەی نیگارخانە و وڵاتە و وڵاتیان کردووە، لەبیری چووە و بگرە هەر فێریشیان نەبووە. نرخی زۆربەی نیگارکێشان دەگەڕایەوە بۆ ئەو قاڵبە دانسقانەی لە سەری بیرەوەریی خۆیاندا شاردبوویانەوە، بەڵام ئەگەر وەلیجان ئەمەی لەبیر خۆی ببردایەتەوە، دەبوو بە نیگارکێشی گەورەتر. ئەو شتانەی له مامۆستاکانییەوە فێر بووە و له قولایی ڕۆحیدا وەک تاوان شاردوویەتییەوە، بێ ئەوەی خۆی پێی بزانێت، دوو سوودی هەیە: ١- ئەمە هەستی تاوانباری و نامۆیی پێ دەدا و ئەم هەستەش کاملبوونێک بە هونەری نیگارکێشی لێهاتوو دەدا. ٢- کاتێک تەنگاو دەبێت، ئەو شتەی دەڵێت لەبیرم کردووە، دەکەوێتەوە بیری و یەکێک له قاڵبە کۆنەکانی هەرات بەکار دەهێنێت و لە بابەتێکی نوێ و مێژوویێکی نوێ و جڤاتێکی بە ئێمە نائاشنادا دەردەکەوێت. لەبەرئەوەی دوو چاوی باشی پێوەیە، ئەو شتانەی له قاڵبە کۆنەکان و له وەستایانی دێرینی شا تەهماسپەوە فێریان بووە، دەزانێت بە ئاهەنگەوە لە نیگاری نوێدا بیانگونجێنێت. نیگاری هەرات و نەخشی ئەستەنبوڵ بە گونجانەوە لەسەر دەستی ئەو ئاوێتەی یەکتر دەبن.

وەک ئەوەی لەگەڵ سەرجەم نیگارکێشانمدا دەیکەم، جارێکیان بێ ئەوەی پێشتر ئاگاداری بکەمەوە، دام بەسەر ماڵەکەیدا. بەپێچەوانەی من و زۆر مامۆستای نیگارکێشی ترەوە، لەو گۆشەیەی لێی دادەنشیت و کاری دەکرد، بۆیاخەکانی، فڵچەکانی، مۆرەکانی له گوێچکە ماسی هەڵکۆڵدراوی و مێزەکەی، هەر هەمووی بەسەریەکدا ڕژابوون و پەرش و بڵاو و له قرێژیدا نقوم بوون. ئەمە ڕازێک بوو بەلای منەوە: بەڵام ئەو بگرە شەرمیشی لەم حاڵە نەکرد. ئەوە نەبێت بۆ بەدەست هێنانی چوار پێنج ئاکچەی زیاتر له دەرێ کاری نەدەکرد. دوای گێڕانەوەی ئەم شتانە، قەرە ڕوونی کردەوە زاوای خوا لێخۆشبووی گوتویەتی لە هەموو کەسێک زیاتر زەیتوون هەوەسی لە شێوازی مامۆستایانی فەڕەنگ بووە و خۆی لەگەڵدا گونجاندووە. تێ دەگەیشتم بەبۆچوونی ئەو گەمژە خوا لێخۆشبووە ئەمە مایەی شانازیکردن بووە.



دەمزانی دەستنیشانکردنێکی هەڵەش بوو. نازانم ئەگەر زەیتوون زیاتر لەوەی پێوەی دیارە، بەنهێنی پابەندی مامۆستایانی کۆن و سەردەمی ژیانی بەهزاد و ئەو شێوازانەی هەرات بێت کە لە سیاوشی وەستای باوکی و موەزەفەری وەستای سیاوشەوە پێی گەیشتووە. بەڵام ئەمە وای لێ کردووم هەردەم بیر بکەمەوە شتی تری شاراوە و نهێنی لەکن زەیتووندا هەیە. ئەو بێدەنگترین، داخراوترین، تاوانبارترین، ناپاکترین و قرێژترین (ئەمانەم له ناخەوە گوت) نیگارکێشی ناو نیگارکێشانی منە. کاتێک باس دێتە سەر ئەشکەنجەی سەرگەورەی پاسەوانان، پێش هەموو کەسێک، ئەوم بەخەیاڵدا دێت. (هەم دەمەوێت ئەشکەنجە نەدرێت و هەم دەخوازم بدرێت.) چاوانی وەک چاوی جنۆکە دەچن؛ هەموو شتێک دەبینێت، هەست پێ دەکات، تەنانەت کێماسییەکانی منیش؛ بەڵام بەپارێزێکی نابەجێوە دەچێتە گشت قاڵبێکەوە و بەدەگمەن دەم دەکاتەوە و هەڵەکانمان پێشان دەدات. قرێژە، بەڵێ، بەڵام بەبۆچوونی من بکوژ نییە. (ئەمەشم بە قەرە نەگوت.) باوەڕی بەهیچ شتێک نییە. باوەڕی بە پارەش نییە، بەڵام بەترسەوە کۆی دەکاتەوە. سەرجەم بکوژان بەپێچەوانەی بۆچوونی باوەوە لەناو باوەڕمەندانەوە پەیدا دەبن نەک لەناو بێ باوەڕانەوە. هەمووان دەزانن نەخش دەروازەیە بۆ مەیدانبازی لەگەڵ نیگاردا و نیگاریش دەرزاوەیە بۆ مەیدانبازی دووربێت لەگەڵ خوادا. بەم واتایە، زەیتوون له ڕووی بێ باوەڕیی خۆیەوە نیگارکێشێکی ڕاستەقینەیە. بەڵام ئێستا بیر دەکەمەوە لێهاتوویی زەیتوون له پەپوولە و تەنانەت لەقلەقیش کەمترە. خوازیار بووم زەیتوون کوڕی من بوایە. ئەمەم بۆیە گوت بۆ ئەوەی قەرە ئیرەیی بە زەیتوون ببات؛ بەڵام ئەو تەنیا چاوە ڕەشەکانی هەڵهێنایەوە و و بە سەرنجێکی منداڵانەوە سەیری کرد. ئەو ساتە پێم گوت کاتێک زەیتوون بەڕێبازی قەڵەمی ڕەش کاری دەکرد و دانە بەدانەی شەڕوانان، نیگاری ڕاوچییان، دیمەنی پڕ لە لەقلەق و قاز و قولینگی بە نەریتی چینی، کوڕانی شۆخی شیعرخوێن و عوودژەنی دانیشتووی ژێر سێبەری دارانی بۆ دەفتەری نیگار دەکێشا و نیگاری خەمی ئەڤینداراني ئەفسانەیی، تووڕەییی پادشایەکی خەمگین و شمشێر بەدەست و ترسی سەر ڕووی قارەمانێکی هەڵهاتوو لە هێرشی ئەژدیهای دەکێشا، هونەرمەندێکی بێ وێنە بوو.

قەرە گوتی: "لەوانەبوو کێشانی دوایین نیگار، کە ڕوو و شێوەی دانیشتنی

سوڵتانمان وەک فەرەنگەکان بەوردی پێشان دەدات، بەو بسپێردرایە."

ئایا دەیویست سەرم لێ بشێوێنێت؟

گوتم: "ئەگەر وا بوایە، دوای کوشتنی زاوا، زەیتوون چ پێویستی بەبردنی نیگارێک بوو کە خۆی پێی دەزانی؟ یاخۆ بۆچی بۆ بینینی ئەو نیگارە زاوا بکوژێت؟"

تاوێک پێکەوە بیرمان کردەوە.

قەرە گوتی: "چونکە کێماسییەک لەو نیگارەدا هەیە، یاخۆ لەبەرئەوەی لە شتێک پەشیمان بووەتەوە و ترساوە. یان..." کەمێک بیری کردەوە: "یان دوای ئەوەی زاوای داماوی کوشتووە، ئایا نیگارەکەی بۆ ئەوە نەبردووە تا زیانێک بگەیەنێت، یان وەک بیرەوەرییەک لای خۆی بیپارێزێت، یاخۆ شتێکی بێ هۆ بکات؟ زەیتوون نیگارکێشێکی گەورەیە و بێگومان ڕێز لە نیگاری جوان دەگرێت."

من تووڕە بووم و گوتم: "باسی ئەوەمان کرد زەیتوون نیگارکێشێکی گەورەیە، بەڵام هیچ کام لەم نیگارانەی زاوا جوان نین."

قەرە چاوەترسانە گوتی: "هێشتا دوایین نیگارمان نەبینیوە."

## خەسڵەتەکانی پەپوولە

بە حەسەن چەلەبیی باروتخانە ناسراوە، بەڵام ئەو هەمیشە بەلای منەوە پەپوولەیەکە. ئەم ناوەی، هەمیشە منداڵیی جوان و لاویی ئەوم بیر دەخاتەوە: بەئەندازەیەک جوانە، ئەوەی سەیری دەکات، باوەڕ بەچاوانی خۆی ناکات و دەخوازێت جارێکی تر سەیری بکاتەوە. پەرجووێکە من هەرگاف پێی سەرسامم: بارتەقای جوانییەکەی، لێهاتوویشە. وەستای ڕەنگە، ئەمە بەهێزترین لایەنی ئەوە؛ هەر دەڵێی بۆ چێژی ڕەنگکردن دێت و دەچێت و بە ئەڤینەوە نەخش دەکات. بەڵام بە قەرەم گوت پەپوولە بەرزەفڕ و بێ ئامانج و دوودڵیشە. بە هزری دادپەروەر بوونیشەوە لێم زیاد کرد: نیگارکێشێکی ڕاستەقینەیە و بەدڵ نیگار دەکێشێت. ئەگەر نەخش بۆ ئەقڵ، بۆ بانگکردنی ئاژەڵی ناو ناخمان، یاخۆ بۆ پیاهەڵدانی شکۆی سوڵتانمان نەبێت، بگرە بۆ خۆشیی چاو بکشێرێت، ئەوا پەپوولە نیگارکێشێکی ڕاستەقینەیە. وەک ئەوەی لە وەستایانی چل ساڵ لەمەوبەری



قەزوینەوە دەرسی وەرگرتبێت، هێڵی فراوان، ئاسوودە، بەختەوەر و بازنەیی دەکێشێت، چاوەترسانە ڕەنگە بریقەدار و بێگەردەکانی لێ دەدات و هەردەم بازنەیەک لە نەزمی شاراوەی نیگاری ئەودا هەیە، بەڵام من پێم گەیاندووە، نەک ئەو وەستا قەزوینییانەی کە لەمێژە مردوون و لێ بوونەتەوە. ڕەنگە لەم سۆنگەیەوە بێ وەک کوڕی خۆم و بگرە زیاتریش لە کوڕی خۆم خۆشم دەوێت، بەڵام هەرگیز ناتوانم شەیدای بم. لە سەردەمی منداڵی و سەرەتای تافی لاویی ئەودا، وەک ئەوەی لەگەڵ هەموو شاگردەکاندا کردوومە، بە دەسکی قەڵەم و ڕاستە و بگرە بە تەختەش لێم داوە، بەڵام لەم سۆنگەیەوە نییە ڕێزی ناگرم. چونکە بە ڕاستە زۆر دارکاریی لەقلەقیشم کردووە، بەڵام ڕێزیشی لێ دەگرم. بەپێچەوانەی باوەوە، دارکاریی دەستی وەستا جنۆکەی هونەر و ئیبلیسی ناو هەناوی شاگردی لاو چاوترسێن ناکات، بگرە بۆ ماوەیەک دوای دەخات. ئەگەر ئەمە دارکاریکردنێکی باش و ڕەوا بێت، ئەوا جنۆکە و ئیبلیس دواتر هار دەبن و نیگارکێشی پێگەیشتوو بۆ کار هان دەدەن. دارکاریکردنی پەپوولە لەسەر دەستی من، ئەوی کردووە بە نیگارکێشێکی بەختەوەر و گوێڕایەڵ.

دواتر دیسان بە پێویستم زانی لەکن قەرە بە شان و باڵای پەپوولەدا هەڵدەم: گوتم نەخشی پەپوولە بەڵگەیەکی باشە بۆ ئەوەی کە نیگاری ئەو کامەرانییەی شاعیر لە مەسنەویی خۆیدا پرسیاری دەکات، تەنیا بە هونەری ڕەنگێکی بەهرەی خوایی مەیسەر دەبێت. کاتێک ئەمە تێ گەیشتم، حاڵیش بووم سەقەتی لە پەپوولەدا چییە: ئەو دەمەساتی بێ باوەڕییەی جامیی شاعیر بە "شەوی تاریکی ڕۆح" ناوی دەبات، لەودا نییە. وەک ئەوەی نیگارکێشک بێت و لە بەهەشت بە کامەرانی نیگار بکێشێت، بە باوەڕ و بە بەختەوەرییەوە و بەنیازی کێشانی نیگاری شادەوە دەست بە کار دەکات و هەر بەڕاستی ئەو نیگارە شادەش دەکێشێت. گەمارۆدانی قەڵای دۆپیۆ لەلایەن سوپاکانمانەوە، ماچکردنی پێی سوڵتانمان لەلایەن باڵیۆزی هەنگارستانەوە، دەرچوونی پێغەمبەرمان بۆ حەوت نهۆمی ئاسمان بە سواری بوراق: هەڵبەتە هەریەکێک لەمانە ڕووداوێکی شادە، بەڵام هەریەکەیان لەسەر دەستی پەپوولە وەردەگەڕێتە سەر شادییەکەی ڕاستەقینە و باڵ دەگرێت و لە پەڕەی نیگار دێتە

دەرێ. لە نیگارێکدا من فەرمانی کێشانیم پێ دابێت، ئەگەر بەزیادەوە هەست بە تاریکاییی مردن یان بەهەند وەرگرتنی کۆبوونەوەی دیوان بکرێت، من بە پەپوولە دەڵێم : "بە ئارەزووی خۆت ڕەنگی بکە" و بەوجۆرە ئەو ئەتەک و گەڵا و ئاڵا و دەریایانەی وەک ئەوە دێنە بەرچاو تا ئەو ساتە خۆڵی مردوویان بەسەردا کرابێت، دەستبەجێ بە بایەک دەکەونە شەپۆل لێدان. جاروبار بیر دەکەمەوە خوا دەخوازێت دنیا بەو شێوەیە ببینرێت کە پەپوولە نیگاری دەکێشێت و فەرمانی داوە ژیان شادی بێت. ئەمە دنیایەکە ڕەنگەکان تیایدا بەگونجانەوە شیعری بێ کێماسی بۆ یەکتر دەخوێننەوە و زەمانی تێدا ڕاوەستاوە و هیچ کاتێک ئیبلیسی پێ ناگات.

بەڵام پەپوولە خۆیشی دەزانێت ئەمە کەمە. هەندێک بەگوێی ئەویاندا چرپاندووە – بەڵێ، لەسەر ماف بوون– لە نەخشی ئەودا هەموو شتێک وەک ڕۆژانی جەژن شادە، بەڵام لە قوڵایی بێ بەشە. شازادەگەلی منداڵ و ژنانی خەڵەفاوی حەرەمسەرای ڕوو لە مردن چێژ لە نیگاری وی وەردەگرن، نەک ئەو پیاوانەی لە چەقی ژیاندا ڕادەوەستن و ناچارن بەرەنگاری خراپەکاری ببنەوە. پەپوولەی داماو لەبەرئەوەی زۆر باش ئاگای لەم قسە و قسەلۆکانەی دژ بەخۆیەتی، هەندێک جار تەنیا لەبەرئەوەی جنۆکە و ئیبلیسیان هەیە، ئیرەیی بە نیگارکێشانی خوار ئاستی خۆی و بێ هونەر دەبات. بەڵام ئەو شتەی ئەو بە ئیبلیسی و جنۆکەییی دەزانێت، زۆربەی جار خراپەی پەتی و ئیرەیی پێبردنە.

من لێی زیز دەبم، چونکە لە کاتی نیگار نەخشاندندا لەبری ئەوەی لەو دنیا شاهانەیەدا ون و شاد بێت، بەخەیاڵی ئەوەی نیگارەکانی بەدڵی کەسانێکی تر دەبن، شاد دەبێت. تەنانەت لە بیرکردنەوەی لەو پارانەشی وەریان دەگرێت، زویر دەبم. پێ ڕابواردنێکی تری ژیان: فرە نیگارکێشی تری خوار ئاستی لێهاتوویی ئەو هەن نیگار دەکێشن و لە ئەو زیاتر دەچنە قوڵاییی پیشەی خۆیانەوە.

پێداویستیی پڕکردنەوەی ئەم سەقەتییە، پەپوولەی خستووەتە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی بیسەلمێنێت خۆی بۆ نەخش بەخت کردووە. وەک نیگارکێشانی مێشک بچووکی وەک مێشکی مەل و ئەوانەی نیگاری بەئاستەم بەچاوی ڕووت بیندراو لەسەر نینۆک و دەنکی برنج دەکێشن، تامەزرۆی کاری بچووک و زراڤە. جارێک لێم



پرسی داخۆ ئالوودەبوونی ئەم تەماحەی وا بووە بەهۆی کوێربوونی زۆر لە نیگارکێشان لە تەمەنێکی زوودا، لەبەر شەرم کردنیەتی لەو بەهرە زۆرەی خوا بەزیادەوە پێی داوە؟ تەنیا نیگارکێشانی بێ بەهرە و ئەوانەی دەیانەوێت بەئاسانی ناوبانگ دەربکەن و خۆیان لەبەرچاوی سەردارانی سەرقەویدا شیرین بکەن، دەدەنە دوای مەراقی وەک کێشانی نیگاری دانە بەدانەی گەڵای دار لەسەر دەنکی برنج.

کێشانی نەخش و نیگار بۆ چاوی کەسانی تر نەک بۆ چاوی خۆی و ئەم پێداویستیی خۆ لەبەر دڵان شیرینکردنەی کە چەندی دەکات ناتوانێت تیایدا سەرکەوتوو بێت، پەپوولەی لە هەموو کەسێک زیاتر کردووە بە کۆیلەی دڵخۆشکردن. لەبەرئەوە، پەپوولەی ترسنۆک بۆ قایم کردنی پشتی خۆی، خوازیاریشە ببێت بە گەورەی نیگارکێشان. قەرە ئەم بابەتەی کردبووەوە:

گوتم: "بەڵێ، دەزانم دەستی کردووە بە نەخشە دارشتن و پاشقول لێگرتن بۆ ئەوەی لە پاش مردنم جێم بگرێتەوە."

"ئایا دەتوانێت لەم سۆنگەیەوە برایانی نیگارکێشی بکوژێت؟"

"لەوانەیە، چونکە مامۆستایەکی گەورەیە، بەڵام بەمە نازانێت و کاتێکیش نیگار دەکێشێت، دنیای بۆ لەبیر ناکرێت."

هەر هێندەی ئەمەم گوت و نەگوت، ئەوەش حاڵی بووم دەمەوێت دوای مردنم پەپوولە بکرێت بە سەرۆکی نیگارخانە. متمانەم بە زەیتوون نییە. باوەڕم وایە لەقلەقیش لە ئاکامدا و بێ ئەوەی خۆی پێی بزانێت، دەبێت بە ئامێر بۆ شێوازەکانی فەرەنگ. کاتێک بیر دەکەمەوە پەپوولە لە دەستی دێت مرۆڤ بکوژێت، خەمگین دەبم، بەڵام ورە و توانای ئەو بۆ خۆ شیرینکردن، شتێکی پێویستە بۆ بەڕێوەبردنی نیگارخانە و ڕازیکردنی سوڵتان لە هەمان کاتدا. تەنیا هەستاریی پەپوولە و بڕوابوونی ئەو بە ڕەنگ دەتوانێت ببێت بە لەمپەر بۆ ئەو هونەرە تەفرەدەری بینەران کە نیگاری کاردیناڵەکانی فەرەنگ، پردەکانیان، بەلەمەکانیان، مۆمدانەکانیان، دێر و گەورەکانیان، گا و پێچکەکانیان، وەک ئەوەی هەمان بەهایان لای خوا هەبێت بە سێبەر و گشت وردەکارییەکانییەوە دەکێشێت و وەک نیگار نا، وەک شتی ڕاستەقینە پێشانی دەدات.

"وەک ئەوەی لەگەڵ نیگارکێشانی ترتان دەکرد، ئایا هیچ ڕێک کەوتووە لە ناخافڵ بدەن بەسەر ماڵی ئەویشدا؟"

"هەر کەسێک سەیری نیگارەکانی بکات، بۆی دەردەکەوێت پەپوولە زۆر باش دەزانێت بەدڵ حەز بکات و خەمبار بێت و لە یەکەم نیگاشەوە بەهای ئەڤین تێ دەگات. بەڵام وەک گشت ڕەنگپەروەرانی تر دەکەوێتە بەر شنەبای هەوەس و بەئاسانی دەگۆڕێت. لە سۆنگەی ئەوەی فرە حەزم لەو پەرجووی هونەر و هەستیاریی ڕەنگەیە کە خوا پێی داوە، لە تافی لاویەتی زۆر چاودێریم کرد و بە هەموو شتێکی دەزانم. بێگومان نیگارکێشانی تر دەمودەست ئیرەیی بەم ڕەوشانە دەبەن و زیان بە پێوەندیی وەستا–شاگرد دەگات و دژوار دەبێت. پەپوولە چرکەساتی ئەڤینی زۆری هەیە کە تیایاندا هەرگیز لە پرتە و بۆڵەی کەسانی تر نەترساوە. ماوەیەک لەمەوبەر دوای ئەوەی کچی جوانی بەقاڵی گەڕەکی خواست و هێنای، هەم دڵم نەهات و هەم بواریشم نەبوو بچمە سەردانی."

قەرە گوتی: "دەگوترێت لەگەڵ لایەنگرانی مەلای ئەرزەڕوومی دەدات و دەستێنێت. جەژننامەکانی ئێمە لە چێشت لێنەرەوە بۆ کەڵەکچی، لە ئەهلی تەریقەتەوە بۆ لۆتی، لە وەستای کەبابەوە بۆ ئاسنگەر، نیگاری گشت کەسێک لە خۆ دەگرێت و شەڕنامەکانیشمان شەڕ و چەک و ساتی ئاسایی و دەمی خوێنڕژاندن پێشان دەدەن. بەڵام بەبیانووی ئەوەی سوختەکانی مەلای ئەرزەڕوومی هار دەکات و پێچەوانەی ئاینە، قەدەغە دەکرێت و دەڵێن بەگەڕانەوە بۆ کتێب و قاڵبەکانی مامۆستایانی کۆنی عەجەم، پەپوولە لەم کارە سوودمەند دەردەچێت."

بێ بەزەییانە گوتم: "ئەگەر تەنانەت بەهونەر و سەرفرازیشەوە بگەڕێینەوە سەر نیگارە دانسقەکانی پاشماوەی سەردەمی تەیمووری لەنگ و خۆمان بخزێنینە ناو ئەو ژیان و وردەکارییانەی پیشەشەوە کە لەقلەقی هەرە ئاوەزیاو لە دوای من درێژەی پێ دەدات، دواجار سەرلەبەری فەرامۆش دەکرێت، چونکە هەموو کەس دەخوازێت لەسەر شێوازی فەرەنگ نیگار بکێشێت."

ئایا بڕوام بەم قسە ڕق هەستێنانە هەبوو؟

قەرە لەسەرەخۆ گوتی: "زاواشم وای گوتبوو، بەڵام ئەو گەشبین بوو."



## خەسڵەتەکانی لەقلەق

بینیم بەناوی شێوەسازی گوناهبار مستەفا چەلەبی واژۆی کرد، چونکە بێ ئەوەی سەری خۆی بە مەسەلەکانی وەک –شێوازێکم هەیە، نییە؛ دەبێت هەمبێت؛ ئەگەر هەمبێت، پێویستە بە واژۆ بیخەمە ڕوو؛ وەک مامۆستایانی کۆن بیشارمەوە؛ بێ فیزی پێویستی بەواژۆکردن هەیە، نییە–یەوە بجەڕێنێت، بەدەم زەردەخەنە و بەهەستکردن بە سەرکەوتنەوە واژۆی خۆی دەکات.

چاونەترسانە ملی ئەو ڕێگایەی گرت کە من نابوومە بەری و ئەو شتانەی بینی کەوا کەسی تر نیگاری نەکێشابوون و ئەم خستنیە سەر کاغەز. ئەویش کتومت وەک من، فوو پێوەکردنی وەستای شووشە بە کەرەسەی تواوەی ناو فڕنەوە و وەرسووڕانی بۆ دروستکردنی سوراحیی شین و شووشەی سەوز، قاڵب و دەرزی و چەرمی ئەو پینەدۆزانەی تەواوی هۆشی خۆیان خستووەتە سەر ئەو پێڵاو و جزمانەی دەیدروون، ئەو کەوانەیەی جۆلانەیەکی بە ئەسپی مەیدانی ڕۆژی جەژن بەجوانی دەیکێشێت، ئەو پەستەرەی تۆو دەهاڕێت و ڕۆن دەردەکات، تەقینی تۆپەکانی ڕوو لە دوژمنمان، لوولە و برغووی تفەنگەکانمانی بینی و بێ ئەوەی بڵێ وەستایانی کۆنی سەردەمی تەیمووری لەنگ و نیگارکێشانی ئەفسانەییی تەورێز و قەزوین سازشیان نەکردووە و نەیانکێشاوە، نیگاری هەمووی کێشا. یەکەم نیگارکێشی موسڵمانیشە بۆ سازدانی ئامادەکاری بۆ شەڕنامەیەک کە دواتر دەنەخشێندرێت، چووەتە شەڕ و بۆ کێشانی نیگاری قەڵاکانی دوژمن، تۆپ، سوپا، ئەسپی بریندار خوێن لەبەر ڕۆیشتوو، تەرم و ئەوانەی لە گیانەڵادان، بە کەیفەوە سەرنجی داوە و سپوساغ گەڕاوەتەوە.

بەر لە شێوازی، بە بابەتیدا و پێش بابەتی، بە تێڕوانینیدا بۆ ئەو وردەکارییانەی کەس بایەخیان پێ نادات، من ئەو دەناسمەوە. دەتوانم ڕێکخستن و ڕیزکردنی پەڕە و بۆیاخکردنی بچووکترین وردەکاریی نیگارێکی بە ویژدانێکی ئاسوودەوە پێ بسپێرم. بۆیە بەڕاستی دوای من، سەرۆکایەتیکردنی نیگارکێشان مافی ئەوە. بەڵام زۆر تەماحکار و خۆ بەزلزانە و فرە بەچاوێکی نزم سەیری نیگارکێشانی تر دەکات و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کاری ئەو هەموو خەڵکەی پێ ڕایی نەکرێت و گشتیان

ڕاوبنێت. ئەگەر بەدەستی ئەو بێت، پێویستە هەر خۆی بە لێهاتوویی خۆی سەرجەم نیگارەکانی نیگارخانەمانی بکێشایە. خۆ ئەگەر بخوازێت، لە دەستی دێت. مامۆستایەکی گەورەیە. کاری خۆی دەزانێت. خۆی خۆش دەوێت. چەند بەختەوەرە.

جارێک لە ڕۆیشتنی لە ناکاومدا بۆ ماڵەکەی، بەسەر کارەوە بینیبووم: پەڕەی نەخشێندراو بۆ کتێبی سوڵتانمان و بۆ من، پەڕەی بە پەلەپرووزێ نەخشێندراوی پۆشاکنامە بۆ کتێبی توڕەهاتی ئەو گەڕۆکە گەمژانەی فەڕەنگ کە بەچاوی سووک بۆ ئێمە دەڕوانن، پەڕەی نیگارێکی سێ پەڕەیی نەخشێندراو بۆ پاشایەکی خۆ بەشت زان، چەند نیگارێک بۆ دەفتەری نیگار یان تەنانەت بۆ کەیفی خۆی... هەر هەمووی –بەنیگارێکی ئابڕووبەرانەی جووتبوونیشەوە– لەو گۆڕەی، لەسەر مێز و سندووقی بچووک و نیمدەرەکان بوون. لەقلەقی بالآبەرز و زراقم وەک هەنگ کاری دەکرد، لەم نیگارەوە بازی دەدا بۆ ئەو نیگار و گۆرانی دەگوت. شاگردەکەی خەریکی بۆیاخ تێکەڵکردن بوو و ئەمیش بە دوو قامکی دەستی کە دەهێنایە سەر شێوەی مقەست، گازێکی شیرینی لە گۆنای دەگرت. گاڵتەیەکی تێکەڵ بە نیگارەکە دەکرد و پێشانی ئێمەی دەدا و بەسەرسامی بۆ خۆی لە قاقای پێکەنینی دەدا. ئەو، وەک نیگارکێشانی ترم کە بە هاتنی من پەیڕەوییان لە دابی ڕێزنواندن دەکرد و دەستیان لە کار هەڵدەگرت، کاری ڕانەدەگرت، بگرە تەواو بەپێچەوانەوە، شادمانانە بەدەستوبرد و لێوەشاوەیی (لە هەمان کاتدا کاری هەشت نۆ نیگار دەکات) بەهرەی خواپێداوی و ئەو هونەرەی پێشان دەدا کە لە ئەنجامی کاری بەردەوامەوە بەدەستی هێنابوو. ئێستاش، هەست دەکەم بەدزییەوە بیر لەوە دەکەمەوە ئەگەر بکوژی نامەرد یەکێک بێت لە سێ وەستا نیگارکێشەکانم، دەڵێم خوا بکەم لەقلەق بێت. لە سالآنی شاگردیدا، کاتێک ڕۆژانی هەینی لەبەر دەرگا دەمبینی، هێندەی بینینی پەپوولە، بە بینینی ئەو دڵخۆش نەدەبووم.

لەبەرئەوەی نالۆجیکانە ڕێزی لە گشت جۆرە وردەکارییەکی سەیر و سەمەرە دەگرت (ئەو شتانەی بەچاو نابینرێن)، هەڵوێستی ئەو لە نیگاردا وەک هەڵوێستی مامۆستایانی فەڕەنگ دەچێت. بەڵام لەقلەقی تەماحکاری من بەپێچەوانەی نیگارکێشانی فەڕەنگەوە، ڕووی یەک بەیەکی مرۆگەل تایبەت و وەک شتی جیاواز نابینێت و جودا نیگاریان ناکێشێت. پێم وابێت لەبەرئەوەی بەدزی و بەئاشکرا ڕقی



لە گشت کەسێکە، هێندە بایەخ بە ڕووی مرۆڤ نادات. زاوای خوا لێخۆشبوو کێشانی نیگاری سوڵتانامانی بەو نەسپاردبوو.

تەنانەت لە کێشانی بەدەربەستترین بابەتیشدا، تا سەگێکی بەگومانی لە دوورەوە سەیرکەری ڕووداو نەخاتە گۆشەیەکی نیگارەوە و تا نیگاری سواڵکەرێکی تێدا نەکێشێت، کە بە چەپەڵی و پەرێشانی خۆی لە بەهای دەوڵەمەندی و ورشە و بریسکانەوەی تەدارەک کەم دەکاتەوە، دڵی ئاو ناخواتەوە. بەئەندازەی گاڵتەکردن بەو نیگارەی کێشاویەتی و بە بابەت و بەخۆی، بڕوای بەخۆی هەیە.

قەرە گوتی: "کوشتنی زەریف ئەفەندی و فڕێدانی بۆ ناو بیر، وەک ڕووداوی یوسف دەچێت کاتێک براکانی ئیرەییی پێ دەبەن و دەیخەنە بیرەوە. کوژرانی زاواشم هاوشێوەیە لەگەڵ مردنی لەناکاوی خەسرەو لەسەر دەستی ئەو کوڕە گەنجەی چاوی لە شیرینی ژنی جحێڵی باوکی بڕیبوو. هەموو کەسێک دەڵێت لەقلەق شێت و شەیدای کێشانی نیگاری شەڕ و مردنی خوێناوییە."

"ئەو کەسەی پێی وایە دەبێت نیگارکێش وەک ئەو بابەتە بچێت کە نیگاری کێشاوە، هیچ شتێک لە من و لە وەستایانی نیگارکێشم تێ نەگەیشتووە. ئەو شتەی دەماندات دەستەوە، بابەتگەلێک نین کەسانی تر بە ئێمەیان سپاردبێت –ئاشکرایە ئەو بابەتانە هەردەم وێک دەچن–، بگرە هەستارییەکی نادیارە و لە کاتی نزیک بوونەوەمان لە بابەتەکان دەیخەینە نیگارەوە: ئەو ڕووناکییەی وەک ئەوەی لەناو نیگارەوە دزە بکات، دێتە بەرچاو؛ ئەو شەرم یان هەڵچوونەی لە ڕیزکردنی مرۆڤ و ئەسپ و داردا لەسەر پەڕەکان پەی پێ دەبرێت؛ ئەو خەم و ئارەزووەی دار سەروو لە کشانیدا بەرەو ئاسمان دەری دەبڕێت؛ ئەو کاتەی بە ئەڤینێکی چاو کوێرکەرانەوە فەخفووریی سەر دیواری ناو نیگار دەنەخشێنین، هەستی پشتبەستن بە خوا و پشوودرێژیی تێ دەخەین... نیشانە شاراوەکانی ئێمە ئەمانەن: نەک ئەو ئەسپە ڕاوەستاوانەی کە مرۆڤ پێی وایە یەکتر دووبارە دەکەنەوە. کاتێک نیگارکێش نیگاری هەڵچوون و تیژڕەویی ئەسپ دەکێشێت، هەڵچوون و تیژڕەویی خۆی ناکێشێت؛ هەوڵ دەدات بێ کێماسیترین نیگاری ئەسپ بکێشێت و ڕەنگەکانی ئەڤینی خۆی لە بەرامبەر دەوڵەمەندی و بەدیهێنەری دنیا و جۆرێک لە ئەڤینی ژیان پێشان بدات و هیچی تر.

42

## من ناوم قەرەیە

لەگەڵ عوسمانی مامۆستای مەزن پەڕەی کۆمەڵێک کتێبێمان خستبووە بەردەم خۆمان. هەندێک لە کتێبەکان دەقیان بۆ نووسرابوو، بڕێکیان بەتەواوی ئەنجام درابوون، بەشێکیان ڕەنگ نەکرابوون و هەشیان بوو، سا لەبەر هەر هۆیەک بێت، بە نیوەچڵی مابوونەوە. دوا نیوەڕۆیەکی تەواومان بەقسەکردن لەمەڕ پەڕەی کۆمەڵە کتێبی مامۆستایانی نیگارکێش و کتێبەکەی زاوام و بەدەم دروستکردنی خشتەی هەڵسەنگاندنەوە بۆیان بەسەر برد. وامان زانی پیاوانی بەڕێز، بەڵام ڕەفتار وشکی سەرگەورەی پاسەوانان، دوای هێنانی ئەو پەڕانەی لە بەسەرداDان و پشکنینی ماڵی مامۆستایان و خۆشنووساندا کۆیان کردبوونەوە (هەندێک لە تابلۆکان هیچ پێوەندییان بە دوو کتێبەکەی ئێمەوە نەبوو، بڕێکیش لە پەڕەکان بەڵگەیەکی تر بوون بۆ ئەوەی بەشێک لە نیگارکێشان لە پێناوی چوار پێنج ئاکچە بەنهێنی کاری چەپەڵیان بۆ دەرەوەی کۆشک کردووە)، ئیدی پێیان لێرە بڕاوە و چی دی نایەنەوە، بەڵام یەکێکی لە هەموویان زیاتر بەخۆ باوەڕ لە مامۆستای گەورە نزیک کەوتەوە و کاغەزێکی لە پشتوێنەکەی دەرهێنا.

سەرەتا وام زانی داخوازینامەی باوکێکە لەو باوکانەی خوازیارن کوڕەکانیان بکەن بە شاگرد و بۆ گەیاندنی داخوازینامەیەک، خۆیان بە زۆرێک لە سەرانی نیگارخانە و گەورەی تاقمی نیگارکێشان دەگەیەنن. لەبەرئەوە خۆم تێ نەگەیاند. بە سەرنجدان لە تیشکێکی لاوازی لە دەرەوە هاتوو حاڵی بووم خۆری هەڵهاتووی



سەرلەبەیانیی ئەمڕۆ ئاوا بووە. بۆ ئەوەی پشوویەک بە چاوەکانم بدەم، ئەو جووڵەیەم دەکرد کە مامۆستایانی کۆنی شیرازی دەیانگوت ئەگەر نیگارکێش بخوازێت لە تەمەنێکی بچووکدا کوێر نەبێت، دەبێت بیکات و بێ ئەوەی هیچ خاڵێکم لێوە دیار بێت، هەوڵم دەدا لە خۆمەوە سەیری دوورایی بکەم. لەو کاتەدا بوو کاغەزە ڕەنگ شیرینەکەی دەستی مامۆستام ناسییەوە کە ئەو بە نیگایەکی پڕ لە سەرسوڕمانەوە سەیری دەکرد و شێوەی نووشتاندنەوەکەی، دڵی منی خستبووە ترپەترپ. کتومت دانەیەک بوو لە نامانەی شەکوورە بە ئەستەردا بۆ منی دەنارد. هێندەی نەمابوو چەشنی گەمژەیەک بڵێم "ئەمە چ ڕێکەوتێکە". سەرباری ئەوەش، وەک نامەی یەکەمی شەکوورە، نیگارێکی کێشراو لەسەر کاغەزی زبریشی لەگەڵ بوو.

مامۆستا عوسمان کاغەزی نیگارەکەی بۆ خۆی لادایە لاوە. نامەکەشی دایە دەستی من و منیش ئەو ساتە بەشەرمەوە تێ گەیشتم لە شەکوورەوە بۆم هاتووە.

"قەرەی ئەفەندیم، ئەستەرم ناردە لای قەلبییەی ژنی بێوەژن کەوتووی خوا لێخۆشبوو زەریف ئەفەندی تا بۆنی دەمی بکات. لەوێ، ئەم کاغەزە نەخێشندراوەی بۆ تۆم ناردووە، پێشان دابوو. دواتر خۆم چوومە ماڵی، خۆم لە دەوری گێڕا و لەبەری پاڕامەوە و بەئومێدی ئەوەی سوودی هەبێت، توانیم ئەم کاغەزەی لە دەست دەربهێنم. ئەو کاتەی زەریف ئەفەندیی داماو لە بیر دەرهێنراوە، ئەم کاغەزەی پێ بووە. قەلبییە سوێند دەخوات و دەڵێت کەس مێردی خوا لێخۆشبووی ئەوی ڕانەسپاردووە بۆ کێشانی نیگاری ئەسپ. ئەی کە وابێت کێ ئەم نیگارەی کێشاوە؟ پیاوانی سەرگەورەی پاسەوانان ماڵەوەیان پشکنی، لەبەر ئەوەی کاری ئەم ئەسپە بەپەلەیە، بۆیە بۆم ناردی. منداڵان دەستت ماچ دەکەن. هاوسەرت شەکوورە."

وەک ئەوەی لە باخچەیەک بەبایەخەوە سەیری دوو گوڵی سووری دانسقە بکەم، دوو جاری تر بەڕێزەوە دوو وشەی کۆتاییی نامەکەی شۆخی خۆم خوێندەوە. دواتر منیش چاوم لە کاغەزەکە نزیک خستەوە. مامۆستا عوسمان بە زەڕەبینەکەی دەستی بەوردی بۆی دەڕوانی: یەکسەر بۆم دەرکەوت ئەو بیچمانەی مەرەکەبیان بڵاو بووەتەوە، نیگاری ئەسپن لەسەر ڕێبازی مامۆستایانی دێرین و بۆ ڕاهێنانی دەست

بەجارێک دەکێشرێت.

مامۆستا عوسمان لە کاتێکدا بە بێدەنگی نامەکەی شەکوورەی دەخوێندەوە، پرسی: "کێ ئەمەی کێشاوە؟"

پاشان هەر خۆی وەڵامی دایەوە و گوتی: "بێگومان هەمان ئەو نیگارکێشەی نیگاری ئەسپی کتێبەکەی زاوای خوا لێخۆشبووی کێشاوە."

ئایا تا ئەو ڕادەیە دڵنیا بوو لە قسەی خۆی؟ خۆ جارێ هیچ دڵنیا نەبووین لەوەی داخۆ کێ نیگاری ئەسپی ناو کتێبەکەی کێشاوە. نیگاری ئەسپی ناو هەر نۆ پەڕەکەمان دەرهێنا و بەوردی کەوتینە سەرنج لێدانیان.

ئەمە نیگاری ئەسپێکی خەنەییی جوان و سادە بوو و مرۆڤ لە سەیرکردنی تێر نەدەبوو. ئایا بەڕاستم بوو کاتێک دەمگوت مرۆڤ لە سەیرکردنی تێر نەدەبوو؟ ئەو کاتانەی لەگەڵ زاوام و دواتریش بەتەنیا بەدیار ئەم نیگارانەوە دەمامەوە، کاتێکی زۆرم هەبوو بۆ ڕامان لەم ئەسپە، بەڵام هەڵوێستەم نەکردبوو لە ئاستی. ئەسپێکی جوان، بەڵام سادە بوو: بەئەندازەیەک سادە بوو تەنانەت نەمانتوانی بزانین بەدەستی کێ کێشراوە. خەنەییەکی تێر نەبوو، لە بابەتی خەنەییی زەردباو بوو و سوورایییەکی نادیاریش لە ڕەنگە خەنەیییەکەیدا بەدی دەکرا. لەبەرئەوەی ئەم ئەسپەم ئەوەندە لە کتێب و نیگاری تردا دیبوو، مرۆڤ حاڵی دەبوو نیگارکێش بێ ئەوەی بیر کردبێتەوە و لێی ورد بووبێتەوە، لەبەر کێشاویەتی.

تا ئەو کاتەی زانیمان ڕازێکی لە خۆیدا شاردووەتەوە، بەهەمان چاو سەیری ئەسپەکەمان کرد. ئێستاش جوانییەکم تێدا بینی وەک دووکەڵ لە پێش چاوم دەلەرزی و هێزێکم تێدا بینی خرۆشی ژیان و فێربوون و لە ئامێزگرتنی هەموو شتێکی دەورووژاند. تاوێک، وەک ئەوەی لەبیرم چووبێت یارۆ بکوژێکی نامەردە، لە خۆمم دەپرسی: "ئەو نیگارکێشە دەست بەپەرجووە کێیە نیگاری ئەم ئەسپەی بەوجۆرە کێشراوە کە خوا دەیبینێت؟" ئەسپەکە وەک ئەوەی ئەسپێکی ڕاستەقینە بێت، لە بەردەمم بوو، بەڵام بە گۆشەیەکی تری ئەقڵم دەمزانی ئەوە نیگارێکە و ئەفسوونی تیامان لە نێوان ئەم دوو بیرکردنەوەیەدا، هەستی سەرتاپاگری و بێ کێماسیبوونی لە کنم دەورووژاند.



تاوێک نیگاری ئەو ئەسپانەی بۆ ڕاهێنانی دەست کێشرابوون و مەرەکەبیان بڵاو بووبووەوە، لەگەڵ نیگاری ئەسپی ناو کتێبەکەی زاوامان بەراورد کرد و دەمودەست حاڵی بووین بەهەمان دەست کێشراون: نەسرەوتن لە شێوازی وەستانی ئەسپەکان بەدی دەکرا، نەک ئارامی: لەخۆبایی، بەهێز و زەریف بوون. سەرسام بووم بە نیگاری ئەسپی ناو کتێبەکەی زاوام.

گوتم: "ئەم ئەسپە هێندە جوانە مرۆڤ دەخوازێت یەکسەر کاغەزێک بخاتە بەردەستی خۆی و نیگاری ئەسپێکی وەک ئەمە و دواتریش نیگاری گشت شتێک بکێشێت."

مامۆستا عوسمان گوتی: "خۆشترین قسە و ئاوڕ لێدانەوە بەلای نیگارکێشەوە ئەوەیە پێی بڵێی نیگارەکانت لەکن ئێمەش خرۆشی نیگارکێشان دەورووژێنێت. بەڵام ئێستا ئێمە با لەبری هونەری ئەو ئیبلیسە، بەدوای خۆیدا بگەڕێین. ئایا زاوای خوا لێخۆشبوو هیچ گوتبووی ئەم ئەسپە نیگاری چیرۆکێکی چۆنە؟"

"نەیگوتبوو. بەبۆچوونی ئەو، ئەسپێک بوو لەو ئەسپانەی لە سەرجەم وڵاتانی ژێر قەڵەمڕەوی سوڵتانی ئەفەندیماندا دەژیان. ئەسپێکی جوانە: ئەسپێکی ئالی عوسمانە. شتێکە دەوڵەمەندی و وڵاتانی موڵکی سوڵتانمان پێشانی دۆقی ڤینیسیا دەدات. بەڵام لەلایەکی ترەوە، وەک ئەوەی بەگشت ئەو شتانەوە دیارە کە مامۆستایانی فەڕەنگ نیگاریان دەکێشن، مەرج بوو ئەم ئەسپە لە ئەسپی بەر چاوی خوا زیندووتر بوایە و ئەسپێکی دیاری ئەستەنبوڵ بوایە بە پشتیر و مەیتەرەوە تا دۆقی ڤینیسیا بڵێت ئالی عوسمان بەو پێیەی نیگارکێشانیان لە گۆشەنیگای ئێمەوە دەڕوانن و لەسەر شێوازی ئێمە نیگار دەکێشن، دەستیان کردووە بەلاسایکردنەوەمان. مەبەست لەم هەنگاوەش ئەوەیە دۆقی ڤینیسیا هێز و دۆستایەتیکردنی سوڵتانمان پەسەند بکات. کاتێک مرۆڤ دەستی کرد بەوەی نیگاری ئەسپێک بە شێوازێکی جیاواز بکێشێت، تەواوی دنیاش بە شێوازێکی جیاواز دەبینێت. بەڵام ئەم ئەسپە سەرباری نامۆیی و سەمەرەییی خۆی، لەسەر ڕێبازی مامۆستایانی کۆن کێشراوە."

قسەکردنی زۆرمان لەبارەیەوە، یەکسەر ئەم ئەسپەی لەبەر چاوی من

سەرنجڕاکێشتر و بەنرختر کرد. دەمی کەمێک داچەقاندبوو و زمانی لە نێوان ددانەکانیەوە دیار بوو. چاوانی دەدرەشانەوە. ڕانەکانی بەهێز و جوان بوون. ئایا ئەو شتەی نیگارێک دەکات بە ئەفسانە، نیگارەکە خۆیەتی، یاخۆ ئەو شتانەی لەبارەیەوە دەگوترێن؟ مامۆستا عوسمان هێدی هێدی زەڕەبینی بەسەر نیگاری ئەسپەکەدا دەگێڕا.

لە ناخەوە گوتم: "ئەم ئەسپە دەیەوێت چ بڵێت؟ بۆچی ئەم ئەسپە هەیە؟ بۆچی ئەم ئەسپە، ئەم ئەسپە چییە؟ بۆچی ئەم ئەسپە منی دەهێنایە جۆش و خرۆش؟"

مامۆستا عوسمان گوتی: "سوڵتان و پادشا و پاشایانی کتێبدۆست کتومت وەک ئەوەی لە ڕێی کتێبی ڕاسپاردەی خۆیانەوە دەیکەن، لە ڕێی نیگاریشەوە هێز و دەسەڵاتی خۆیان پێشان دەدەن و ئەم کارانەیان لەکن جوانە، چونکە ئاوی زێڕی بەکار هێندراو تیایاندا و ڕەنجی تا ڕادەی کوێربوونی نیگارکێشان، بەڵگەی دەوڵەمەندیی ئەوانە. جوانیی نیگار، گرینگە وەک زێڕی بەکار هێندراو تیایدا، چونکە چەشنی هونەری نیگارکێش دەگمەنە و بەڵگەیە بۆ شتێکی گرانبەها. ئەوانەشی سەیری نیگارەکە دەکەن و کتێبەکە ئەمدیو و ئەودیو دەکەن، لە ڕووی بابەتەوە و لەبەرئەوەی نیگاری ئەسپەکە وەک ئەسپ دەچێت، ئەسپی خوا، یان بەڕاستی ئەسپی خەیاڵە، بەجوانی دەزانن و هۆی ئەم هەستی بەڕاستی زانینە بۆ هونەر دەگێڕنەوە. بۆ ئێمەش، جوانیی نیگار بە پڕواتایی و بەزەرافەت دەست پێ دەکات. دوای ئەوەی بۆمان دەرکەوت لەم ئەسپەدا، جگە لە ئەسپەکە خۆی، جێ پەنجەی بکوژ و نیشانەی ئیبلیسیش هەیە، بێگومان ڕادەی واتای نیگارەکە زیاتر بوو. شتێکی تریش هەیە، مرۆڤ دەبێت نیگارەکە نا، ئەسپی نیگارکێشراو بەجوان بزانێت. پێویستە چەشنی ئەسپێک سەیری نیگاری ئەسپەکە بکرێت، نەک وەک سەیرکردنی نیگارێک."

"ئەگەر وەک ئەوەی بۆ ئەسپێک بڕوانن سەیری نیگارەکەتان بکردایە، چیتان دەبینی؟"

"دەتوانم لە گەورەییەکەی بڕوانم و بڵێم ئەسپی میدیلی(*) نییە، لە ملی درێژ و

(*) ئەسپی میدیلی: ڕەگەزێکی ئەسپە بە باڵای کورتی و یاڵی درێژ و بەهێزیدا دەناسرێتەوە.
– وەرگێڕ –



کەوانەییی بڕوانم و بڵێم ئەسپێکی باشە بۆ غاردان و لە تەختاییی پشتی بڕوانم و بڵێم ئەسپێکی گونجاوە بۆ گەشتی درێژ. لەوانەیە قولی نازداری واتای ئەوە بگەیەنێت وەک ئەسپی عەرەب چوست و جەربەزە بێت، بەڵام ئەسپی عەرەبی نییە، چونکە جەستەی درێژ و زەبەلاحە. بەپێی قسەی فەدلانی زانای بوخاراییی لە بەیتارنامەی سەبارەت بە ئەسپی شیاودا، زەرافەتی لاقەکانی پێشاندەری ئەوەیە ئەگەر جۆگەلەی بێتە پێش، ئەسپەکەمان ناسڵەمێتەوە، بێ ترس و بەئاسانی باز دەدات و لێی دەپەڕێتەوە. ئەو بەیتارنامەیە لەسەر دەستی فیوزیی پزیشکی ئاژەڵانی کۆشک بە زمانێکی خۆش وەرگێڕاوە و پڕە لە وتەی جوان سەبارەت بە ئەسپی شیاو. من سەرلەبەری ئەو وتانەم لەبەرە و دەتوانم بۆ ئەم ئەسپە خەنەییەی بەردەم خۆمان بەکاریان بهێنم: ئەسپی باش ئەو ئەسپەیە ڕوویێکی جوانی هەبێت، چاو مامزی و گوێیەکانی بەوێنەی گەڵای قامیش و نێوان هەردوو گوێی فراوان بێت؛ ددان ورد، ناوچەوان خڕ، برۆ وشک، باڵابەرز، پرچ درێژ، ناوقەد تەنگ، لووت و شان بچووک و پشت پان بێت؛ کوڵم داگرتوو، بەژن بەرز، سنگ فراوان، کلک پان و نێوان ڕانەکانی گۆشتن بێت؛ لەخۆبایی و زەریف بێ و وا بڕوات بەڕێوە وەک ئەوەی سڵاو لە هەردوولا بکات."

بەسەرسامی سەیری نیگارەکەم کرد و گوتم: "ئەمە ڕێک ئەسپە خەنەییەکەی ئێمەیە."

مامۆستا عوسمان بەهەمان زەردەخەنەی شەرمنەوە گوتی: "تێ گەیشتین ئەسپەکەمان کامیانە، بەڵام چ جێی داخە بەدەردی دۆزینەوەی نیگارکێشەکەی ناخوات، چونکە دەزانم هیچ نیگارکێشێکی ئاوەزیاو لە کێشانی نیگاری ئەسپدا سەیری ئەسپی ڕاستەقینە ناکات. بێگومان نیگارکێشانی من، نیگاری ئەسپ لەبەر و بە هەڵمەتێک دەکێشن. بەڵگەشم بۆ ئەم قسەیەم ئەوەیە لە سەری سمەوە دەستیان بە کێشانی هێڵەکانی تری دەرەوەی ئەسپ کردووە."

چەشنی ئەوەی بووردن بخوازم، گوتم: "بۆچی مەگەر لە لاقەکانەوە دەست پێ ناکرێت تا ئەسپەکە پێی لە زەوی بێت؟"

"وەک ئەوەی جەمالەدینی قەزوینی سەبارەت بە نیگاری ئەسپ گوتوویەتی، ئەگەر

مرۆڤ هەموو ئەندامی جەستەی ئەسپی لەبەر نەبێت، ناتوانێت نیگاری ئەسپێک، ئەگەر لە لاقییەوە دەستی پێ کردبێت، بەتەواوی بەئەنجام بگەیەنێت. ئاشکرایە ئەگەر مرۆڤ بیر بکاتەوە و بیری خۆی بهێنێتەوە، لەوەش گاڵتەجاڕانەتر، ئەگەر سەیری ئەسپێکی ڕاستەقینە بکات و نیگاری بکێشێت، سەرەتا مل و دواتریش لە ملەوە بەرەو جەستەی دەکێشێت. دەڵێن هەندێک نیگارکێشی فەڕەنگ هەن نیگارێکی ئەوتۆ، واتا بە دوودڵی نیگاری بارگیرێکی سادە و بینراو لە کۆڵان تاقی دەکەنەوە و بە شێواوی دەیکێشن و بە بەرگدروو و قەسەبەکانی دەفرۆشن. نیگارێکی لەو چەشنە ئیدی باسی واتای دنیا و جوانکاریی ئافرێندراوی خوا ناکات. بەڵام دڵنیام تەنانەت ئەوانیش دەزانن نیگاری ڕاستەقینە بە هاوکاریی ئەو شتەی چاو لەو کاتەدا دەیبینێت، نا، بگرە بەڕاهاتنی دەست و بیرهێنانەوە دەکێشرێت. نیگارکێش هەمیشە بەسەر کاغەزی خۆیەوە تەنیایە، بۆیە بەردەوام پێویستی بە بیرهێنانەوە هەیە. ئێستا هیچ شتێکی ترمان لە دەست نایەت ئەوە نەبێت –شێوازی یاوەر– بخەینە کار بۆ دۆزینەوەی واژۆی شاراوەی ناو نیگاری ئەسپەکەمان، ئەو نیگارەی بەجووڵەی خێرا و بەهونەری دەست، لەبەر کێشراوە. تۆش بەباشی سەیری ئەمە بکە."

چەشنی ئەوەی لە نەخشەیەکی زۆر ورد کێشراوی سەر پارچە پێستێک لە گەنجینەیەک بگەڕێت، هێدی هێدی زەڕەبینی بەسەر ئەسپە دانسقەکەدا دەهێنا.

وەک قوتابییەک چۆن بۆ ئەوەی جێی ڕەزامەندیی مامۆستای خۆی بێ یەکسەر دەکەوێتە بەر شپرزەییی دۆزینەوەیەکی نوێ، گوتم: "بەڵێ، دەتوانین ڕەنگەکانی بەرگی ڕەخت و زینەکەی لەگەڵ بەرگی زینی ناو نیگارەکانی تردا بەراورد بکەین."

"مامۆستایانی نیگارکێشی من هیچ کاتێک فلّچە بەم نەخشانەدا ناهێنن. ئەوە شاگردەکانن نەخشی پۆشاک و ڕایەخ و بەرگ و ڕەشماڵی ناو نیگارەکان دەکێشن. لەوانەشە خوا لێخۆشبوو زەریف ئەفەندی کێشابیەتی. واز لەوە بێنە."

بەشپرزەییی گوتم: "گوێیەکانی؟ گوێی ئەسپەکانیش..."

"نەخێر. ئەمانە گوێی گەلا قامیشیی ئاشنا بە ئێمەن و لەو قاڵبانەی لە سەردەمی تەیمووری لەنگەوە بۆمان ماونەتەوە، لایان نەداوە."



خەریک بوو بڵێم: "هۆنینەوەی پرچی یاڵ و شانەکردنی تاڵ بەتاڵی"، بەڵام لەبەرئەوەی حەزم لەم گەمەی وەستا و شاگردە نەبوو، بێدەنگیم هەڵبژارد. خۆ ئەگەر شاگردیش بم، دەبێت سنووری خۆم بزانم.

مامۆستا عوسمان وەک پزیشکێک کە دوومەڵی پەتایەک پێشانی پزیشکێکی تر دەدات و دەنگێکی بەگازندە، بەڵام وردبینانەی لێ دەردەچێت، دەیگوت: "سەیری ئێرە بکە. دەبینیت؟"

ئێستا زەڕەبینەکەی دەستی هێنابووە سەر سەری ئەسپەکە و لە ڕووی نیگارەکەی دوور دەخستەوە و هێدی هێدی لە خۆمانی نزیک دەکردەوە. سەرم نزیک کردەوە تا ئەو شتەی زەڕەبینەکە گەورەی دەکردەوە، بەباشی ببینم.

لووتی ئەسپەکە شتێکی سەیر بوو. کونی لووتی.

مامۆستا عوسمان گوتی: "بینیت؟"

پێویست بوو چاوم بەتەواوی بخەمە بەرامبەر زەڕەبینەکە تا دڵنیا بم لەو شتەی دیبووم. کاتێک مامۆستا عوسمانیش هەمان شتی کرد، لە بەرامبەر زەڕەبینەکە، کە ئێستا بەباشی لە نیگارەکە دوورخرابووەوە، ڕوومەتمان بەریەک کەوت. هەستکردن بە ڕەقیی ڕیشی وشک هەڵهاتوو و گۆنای چرچەوەبووی مامۆستا عوسمان لەسەر گۆنام، تاوێک ترساندمی.

بێدەنگییەک پەیدا بوو. وەک بڵێی لەناو نیگاری بستێک لەولای چاوی ماندووی منەوە شتێکی شاهانە دەقەوما و ئێمەش بەڕێز و بەسەرسامییەوە دەبووین بە بینەری ڕووداو.

زۆر دواتر توانیم بەچرپە بڵێم: "ئەو شتەی ناو لووتی چییە؟"

مامۆستا عوسمان بێ ئەوەی چاو لەسەر نیگارەکە هەڵبگرێت، گوتی: "لووتی بەشێوەیەکی ناقۆڵا کێشاوە."

"دەستی نیگارکێش وەرچەرخاوە؟ ئایا ئەمە سەقەتییە؟"

هێشتا سەیری ئەم جۆری کێشانە نامۆ و بێ وێنەیەی لووتیمان دەکرد.

مامۆست عوسمان بە دەنگێکی گاڵتەجاڕانەوە گوتی: "ئایا ئەو شتەی هەموو

کەسێک، بە گەورە نیگارکێشانی چینیشەوە، لاساییی فەرەنگەکان دەکەنەوە و شێوازی پێ دەڵێن، ئا ئەمەیە؟"

وام زانی ئەوەی گاڵتەی پێ دەکات، زاوای خوا لێخۆشبوومە، بۆیە دڵگران بووم: "زاوای خوا لێخۆشبووم دەیگوت کێماسی ئەگەر لە لێنەهاتوویی یان کەم هونەرییەوە نا، بەڵام لە قوڵاییی ڕۆحی نیگارکێشەوە بێتە دەرێ، ئەوە ئیدی شێوازە."

چ لە نیگارکێش و چ لە ئەسپەکە خۆیەوە یان لە چییەوە دەبێت با ببێت، جگە لەم لووتە، هیچ نیشانەیەکی تر نەبوو بۆ دۆزینەوەی ئەو نامەردەی بکوژی زاوام، چونکە نەک هەر لە دەستنیشانکردنی کونی لووتی نیگاری ئەو ئەسپە مەرەکەب پەرشبووانەی لە گیرفانی زەریف ئەفەندیی بەستەزماندا دۆزرابووەوە، بگرە لە هەڵبژاردنی لووتەکانیشدا دژواریمان دەکێشا.

کاتێکی زۆرمان بەسەر برد بۆ دۆزینەوەی ئەو نیگاری ئەسپانەی نیگارکێشانی خۆشەویستی مامۆستا عوسمان ئەم سالانەی دوایی بۆ کتێبی جۆراوجۆر کێشابوویانن و بۆ گەڕان بەدوای کێماسی لە لووتدا. لە کۆی دووسەد و پەنجا نیگاری پێشاندەری جڤات و کەژاوەی تێپەر بوو بەپێش سوڵتانمادا، کە بۆ جەژننامەی ڕوو لە تەواوبوون کێشرابوون، بەدەگمەن نیگاری ئەسپ هەبوو، بۆیە پیاو ڕەوانەی بارەگای نیگارخانە کران بۆ هێنانی هەندێک کتێبی نموونە و بڕێک کتێبی قاڵب تازە تەواوکراو. بڕێکی تر نێردران بۆ ئەندەروون و حەرەمسەرا – بێگومان هەر هەمووی بەدەستووری سوڵتانمان– بۆ هێنانی هەرچی کتێبی شاراوە و قفڵ لەسەر قفڵ لێدراوی ناو گەنجینە.

لە سەر پەڕەکانی دەستنووسی زەفەرنامەیەکی لە ژووری شازادەیەکی گەنجەوە هێندراو، لە نیگارێکی دووپەڕەییی پێشاندەری تەدارەکی بەخاک سپاردنی سوڵتان سلێمانی قانوونی، کە لە کاتی گەمارۆدانی زیگەتڤاردا کوژرابوو، سەرەتا سەیری ئەسپێکی خەنەییی ناوچەوان قەش و ئەسپێکی تری بۆزی چاو مامزیی ڕاکێشەری گالیسەکەی تەرم و ئەو ئەسپە خەمگینانەمان کرد کە بۆ تەدارەکی ناشتنی تەرمی سوڵتان سلێمان زین و ڕەختی بەزێڕ نەخێشندراو و سەرزینی شاهانەیان لێ نرابوو. هەمیشە پەپوولە و زەیتوون و لەقلەق ئەم نیگارانەیان کێشابوو. چ



گالیسکەی پێچکە گەورەی دارەمەیت ڕابکێشن، یان چ بەچاوی تەڕەوە سەیری جەستەی سەرداریان لەژێر قوماشێکی سووری تێردا بکەن و سڵاوی لێ بکەن، بەهەمان وەستانی زەریفی وەرگیراو لە مامۆستایانی کۆنی هەرات –لاقێک بەزرافەت لە پێشەوە و لاقەکەی تر لە تەنیشتەوە چەسپاو– ڕاوەستابوون. گشت بەژن درێژ و کەوانەیی، کلک گرێدراو، یاڵ هەڵپاچراو و شانەکراو بوون، بەڵام ئەو کێماسییەی ئێمە بۆی دەگەڕاین، لە لووتی هیچ کامیاندا نەبوو. ناتەواوییەکە لە لووتی هیچ یەکێک لەو سەدان ئەسپەشدا نەبوو کە بەشداری ڕێوشوێنی بەخاکسپاردن بووبوون و لە سەر گردەکانی دەوروبەر فەرماندەی سەربازی و زانا و مامۆستایانیان لێ سوار بووبوون و سڵاویان لە دارەمەیتی خوا لێخۆشبوو سوڵتان سلێمان دەکرد.

کەمێک لە خەمی ئەم تەدارەکە خەمگینەی بەخاکسپاردن دەربازی ئێمەش بوو. مامۆستا عوسمان و نیگارکێشانی وی ڕەنجێکی زۆریان ڕژاندبووە ئەم کتێبانەوە و کاتێک ئێمە دەمانبینی دڕاوە، یان ژنانی حەرەمسەرا و شازادەکان لە کاتی جووتبوونیان هێڵیان بەگشت شوێنێکیدا هێناوە و شتیان لەسەر نووسیوە، دڵگران دەبووین. لەژێر دارێکی جێ ڕاوگەی باپیری سوڵتانمان بە دەستنووسێکی خراپ نووسرابوو: "حەزرەتی ئەفەندیم، بەپشووی ئەم دارەوە تۆم خۆش دەوێت و چاوەڕێت دەکەم." ئا بەم هەستە ئاڵۆز و پڕ لە خەمەوە ئەم دەست و ئەو دەستمان بەو کتێبە ئەفسانەییانە کرد کە بەقسە بەسەرهاتی دروستکردنی یەک بەیەکیانم بیستبوو، بەڵام بەبینین نەمدیبوون.

لە بەرگی دووەمی هونەرنامەدا کە شوێن قەڵەمی هەرسێ نیگارکێشی پێوە دیار بوو، بەسەدان ئەسپی شین و خەنەیی و بۆز و ڕەنگی تری ژێر ئەفسەرانی بەشان و شەوکەتی قەڵغان بەدەست و شمشێر هەڵکێشراومان بینی بە زرێپۆش و تەواوی کەرەسەی تاقمەوە، خش و هوڕ لە پشت تۆپە زرمە لێ هەستاوەکان و ڕیزەکانی پیادەوە لە گردە پەمەییەکان ئاودیو دەبوون. بەڵام لووتی هیچ یەکێک لەو ئەسپانە ناقۆڵا نەبوو. مامۆستا عوسمان بەدەم سەیرکردنی پەڕەیەکی نیگاری دەروازەی هومایۆن و مەیدانی ئالای، ئەو شوێنەی ئێمە لەو کاتەدا لێ بووین، گوتی: "ئەرێ ناقۆڵایی چییە؟" سەیری نیگارێکمان کرد بچووک بوو بەئەندازەی جێکردنەوەی نەخۆشخانەی لای ڕاست و ژووری پێشوازیکردن و دارەکانی حەوشە لە چوارچێوەی

خۆیدا و گەورە بوو هێندەی بایەخ پێدانی ئەقڵی ئێمە، بەڵام ئەو نیشانەیەی بۆی دەگەڕاین لە لووتی ئەسپی ڕەنگ جۆراوجۆری ژێر دەرگاوان و چاوش و نووسیارەکانی دیوانی ناو نیگارەکەدا نەبوو. سەیری نیگاری ئەو دەمەمان کرد کاتێک یاوز سوڵتان سەلیمی باپیرە گەورەی سوڵتانمان لە سەروبەندی پەلاماردانی میرنشینی دولقەدردا لە قەراغ چەمی کوسکون ڕەشماڵ هەڵدەدات، ڕاو دەکات و تاژیی کلک سوور بە کارمامزی کەفەڵ بڵند و کەروێشکی ترساوەوە دەنێت و پڵنگێکمان بینی سوڵتان خەڵتانی خوێنی کردبوو و پێستی وەک گوڵ دەمی کردبووەوە. ئەو نیشانەیەی ئێمە عەودالی بووین، نە بەئەسپە خەنەیی و ناوچەوان قەشەکەی سوڵتانەوە و نە بەئەسپی ژێر ئەو بازەوانانەوە بوو کە باز لەسەر دەست و ئامادە لە پشت گردە سوورەکانی بەرامبەرەوە ڕاوەستابوون.

تا تاریکاییی سەر لە ئێوارە نیگاری سەدان ئەسپی دەستکردی پێنج ساڵی ڕابردووی زەیتوون و پەپوولە و لەقلەقی نیگارکێشانی مامۆستا عوسمانمان بینی: ڕەوە ئەسپی خەنەییی خاڵدار و ڕەش و زەردی گوێ جوانی محەمەد گیراریی فەرمانڕەوای قرم؛ ڕەوێک ئەسپی شینی بۆز و ڕەنگ خۆڵەمێشی لەوانەی لە شەڕگە لە پشت گردەکانەوە تەنیا ملیان دەبینرێت؛ ئەسپەکانی حەیدەر پاشا کاتێک لە تونس قەڵای "خلق الواد" لەژێر دەستی گاورانی ئیسپانی دەردێنێت و ڕەوە ئەسپی ڕەنگ سووری خەنەیی و سەوزی فستقیی یەکێک لەو ئیسپانییانەی لە کاتی هەڵهاتنی لە دەستی ئەم، بەسەر ڕوودا دەکەوێت؛ ئەسپێکی ڕەش کە وای لە مامۆستا عوسمان دەکرد بڵێ "ئەمەم بەسەردا تێ پەڕیوە، تۆ بڵێی کێ لە کەڵلەی دابێ و کێشابیەتی؟"؛ ئەسپێکی سوور بەڕێزەوە گوێ قوڵاغ بووبوو و گوێی ڕاگرتبوو بۆ دەنگی عوودی دەستی خولامێکی دانیشتووی ژێر دارێک؛ شەودێز، ئەسپی شەرمن و زەریفی وەک شیرینی خاوەنی کاتێک شیرین لەبەر تریفەی مانگەشەو لە گۆلدا خۆی دەشوات و ئەم چاوەڕێی دەکات؛ ئەو ئەسپە لەشسووکانەی جریدبازان سواریان دەبن؛ ئەسپی گەردەلوول و مەیتەری جوان کە نازانم بۆچی وای لە مامۆستا عوسمان دەکرد بڵێت "لە تافی لاویمدا زۆرم خۆشەویست و ئێستا فرە ماندوو بووم"؛ ئەسپێکی زێڕینی لە ڕەنگی ڕۆژ کە خوا بۆ خۆپاراستن لە هێرشی بتپەرستان بۆ حەزرەتی ئەلیاسی ناردبوو، بەڵام لە نیگارەکەدا باڵەکانی بەهەڵە بە



حەزرەتی ئەلیاسەوە لکێندرابوون؛ ئەسپی ڕەسەنی ئەندام ڕاکشاو و تەن زەلام و سەر بچووک و ڕەنگ بۆزی سوڵتان سلێمانی قانوونی، کە لەبەرئەوەی پێشتر سێ کوڕی جوانەمەرگ بووبوون، کوڕی ماوەی لەگەڵ خۆی بردبووە ڕاو و بەچاوی پڕ لە خەمەوە سەیری شازادەی خوێن شیرینی دەکرد؛ ئەسپی تووڕە؛ ڕەوە ئەسپ لە کاتی غاردا؛ ئەسپی شەکەت و ماندوو؛ ئەسپی جوان؛ ئەسپی بایەخ پێنەدراو؛ ئەو ئەسپانەی هیچ کاتێک لەم پەڕانە دەرناچن؛ ڕەوە ئەسپێک وەک ئەوەی بیانەوێت لە بێزاریی ئەم پەڕانە بێنە دەرێ، چوارچێوەیان دەدڕی و بازیان دەدا.

ئەو واژۆیەی ئێمە بۆی دەگەڕاین، لە لووتی هیچ کامیاندا نەبوو.

سەرباری ئەو هەستی بێزاری و خەمەی باڵی بەسەرماندا کێشابوو، خرۆشی هەناومان کەمی نەدەکرد: یەک دوو جار ئەسپمان لەبیر کرد و نوقمی جوانیی نیگارەکانی بەردەستمان و ئەو ڕەنگانە بووین کە لەپڕ مرۆڤ دیل دەکەن. مامۆستا عوسمان، لە سەرسوڕمان زیاتر، بەخرۆشی یادکردنەوە سەیری نیگارەکانی دەکرد، ئەگەرچی هەر خۆی زۆربەیانی ئامادە کردبوو و کێشابوو و چاوی پێدا گێڕابوونەوە. جارێکیان ئاماژەی کرد بۆ گیا وەنەوشەیییەکانی دامێنی سوورە چادری شەڕی سوڵتان سلێمانی باپیرە گەورەی سوڵتانمان و گوتی: "ئەمە هی قاسمی قاسم پاشاییە. هەرگیز نەبوو بە مامۆستا، بەڵام ماوەی چل ساڵ ئەم گژوگیا پێنج گەڵاییی و یەک گوڵییانەی لە جێی خاڵیی نیگاردا کێشا. دوو ساڵ لەمەوبەر مرد و بڕایەوە. لەبەرئەوەی لە هەموو کەسێک باشتر نیگاری ئەم وردیلە گیایەی دەکێشا، من هەمیشە بەوم دەسپارد." کەمێک بێدەنگ بوو، پاشان مامۆستام گوتی: "حەیف، حەیف." بەسەرتاپای جەستەم هەستم کرد بەم قسەیە کۆتایی بە کۆمەڵێک شت هاتووە و پەردە بەسەر چاخێکدا دادراوەتەوە.

خەریک بوو دەوروبەر تاریک دادەهات، لەپڕ ژوورەکە پڕ بوو لە ڕووناکی و هەست بە جووڵەیەک دەکرا: دڵی وەخورپە کەوتووم یەکسەر لە هەموو شتێک حاڵی بوو: فەرمانڕەوای دنیا، حەزرەتی سوڵتانمان لەناکاو هاتبوونە ژوورێ. خۆم فڕێ دایە بەر پێی. چمکی کەوایەکەیم ماچ کرد. سەرم دەسووڕایەوە. نەمدەتوانی سەیری ناوچاوانی بکەم.

بەڵام بگرە ئەوان لەمێژ بوو لەگەڵ مامۆستا عوسمانی گەورەی نیگارکێشان

سەری قسەیان دامەزراندبوو. قسەکردنیان لەگەڵ ئەو کەسەی پێش کەمێک لە تەنیشت یەکەوە دانیشتبووین و سەیری نیگارمان دەکرد، هەناوی منی پڕ دەکرد لە ئاگری شانازی. توانای باوەڕکردنم نەبوو، بەڵام حەزرەتی سوڵتانمان لە شوێنی دانیشتنی کەمێک لەمەوبەری من دانیشتبوون و کتومت وەک من بەوردی گوێیان بۆ قسەکانی مامۆستام ڕاگرتبوو. هەم چاویان لە گەورەی خەزنەداران و گەورەی بازەوانان و چەند یاوەرێکی تری بە من نائاشنا خافڵ نەدەکرد و هەم زۆر بەوردی سەیری نیگاری سەر پەڕە کراوەکانی دەکرد. هەرچی غیرەتم هەبوو کۆم کردەوە و تاوێک، با لە تەنیشتیشەوە بووبێت، دوور و درێژ سەیری ڕوو و چاوانی سوڵتانی فەرمانڕەوای دنیام کرد. ئای خوایە چەند جوان بوو. چەند ڕاست و ڕەوان و ڕێکوپێک بوو. ئیدی دڵیشم بەجۆشەوە لێی نەدەدا. ڕێک لەو ساتەدا بۆ منی ڕوانی و نیگامان یەکانگر بوو. لەتاو پەشۆکانی خۆم، بەشێک لە قسەکانیم لە دەست دا.

"... زۆر خەمگین بووم، هەریەکە لەم تابلۆیانەی ئەو بە ئامادەکردنی داون، شاکارێکە بۆ خۆی و ئەمەش دڵدانەوەیەکە بۆ مرۆڤ. ئەو گاوری ڤینیسیاییە ئەمانە ببینێت، سەری سووڕ دەمێنێت و لە ئەقڵی من دەترسێت. ئیدی کاتی ئەوە هاتووە بە لووتی ئەم ئەسپەدا بزانن ئەو نیگارکێشە نەفرەتییە کێیە. ئەگەر نا، ئەشکەنجەدانی سەرجەم وەستایانی نیگارکێش ناڕەوایە، بەڵام پێویستە."

مامۆستا عوسمان گوتی: "حەزرەتی سوڵتانی جیهانپەنام، ئەگەر هەریەک لە مامۆستایانی نیگارکێشم بێ ئەوەی بیر لە هیچ چیرۆکێک بکاتەوە و بەخێرایی نیگاری ئەسپێک لەسەر کاغەزێکی خاڵی بکێشێت، لەوانەیە بۆمان ڕوون بێتەوە و بتوانین حاڵی بین ئەم قەڵەم وەرچەرخانە کاری کێیە."

سوڵتانمان زۆر ئاقڵانە گوتی: "بێگومان، ئەگەر ئەمە لووتێکی ڕاستی نەبێت و ئاکامی وەرچەرخانی قەڵەم بێت."

مامۆستا عوسمان گوتی: "سوڵتانم، ئەگەر جاڕ بدرێت ئێوە فەرمانتان داوە هەر ئەمشەو پێشبڕکێیەک بۆ ئەمە ساز بکرێت: شەو لە دەرگای یەک بەیەکی نیگارکێشانتان بدرێت و داوایان لێ بکرێت هەریەکەیان بەدەستوبرد و لەسەر کاغەزێکی خاڵی نیگاری ئەسپێک بۆ ئەم پێشبڕکێیە بکێشێت..."



سوڵتانمان، بە نیگایەک کە "گوێت لێ بوو؟"ی لێ بەدی دەکرا، بۆ سەرگەورەی پاسەوانانی ڕوانی: "ئایا دەزانن مەیلم لە کام چیرۆکی پێشبڕکێی نیزامیی شاعیرە؟"

بەشێکمان گوتی: "دەزانین"، برێکمان گوتی: "کامیان؟" و ئەوانی تریشمان وەک من بێدەنگ بوون.

سوڵتانی شۆخم گوتی: "حەزم لە چیرۆکی شاعیرانی پێشبڕکێکەر و لە چیرۆکی ئاوێنەداری پێشبڕکێی نیگارکێشانی چین و ڕۆم نییە؛ هەرە زیاد حەزم لە چیرۆکی ئەو پزیشکانەیە کە پێشبڕکێ دەکەن کامیان لە پێشدا ئەوی تر بمرێنێت."

هەر ئەوەندەی ئەمەی گوت، لەپڕ ئێمەی جێ هێشت و دەرچوو و ڕۆیشت تا فریای نوێژی ئێوارە بکەوێت.

دواتر، گاڤێک بانگی ئێوارە دەدرا و پاش ئەوەی بەنیمچە تاریکی لە دەروازەکانی کۆشک دەرچووم، بەکامەرانی خەیاڵم چووبووە سەر شەکوورە و منداڵان و ماڵەکەمان و ئەو دەمەی بەهەنگاوی خێرا بەرەو گەڕەک دەگەڕامەوە، بەترسەوە ئەو چیرۆکی پێشبڕکێی پزیشکانەم بیر کەوتەوە:

یەکێک لەو دوو پزیشکەی لەبەردەم سوڵتانەکان دەکەونە پێشبڕکێوە، ئەوەیان کە هەمیشە بە پۆشاکی پەمەییەوە نیگاری دەکێشرێت، لە ژەهرێکی بەهێزی فیلکوژ دەنکۆڵەیەکی سەوزی دروست کردووە و داویەتی بە پزیشکەکەی تر. ئەویش سەڵتەیەکی شینی کەوەیی پۆشیوە و سەرەتا دەنکۆڵە ژەهراوییەکەی قووت داوە و بەدوای ویدا دەنکۆڵەیەکی دژە ژەهری هەر لەوێدا گیراوەی نۆشی گیان کردووە و بەزەردەخەنەی شیرینیدا ئاشکرایە هیچی لێ نەهاتووە. سەرباری ئەوەش، ئێستا نۆرەی هاتووە کارێک بەسەر دژبەرەکەی بێنێت بۆن بەمردنەوە بکات. هێدی و لەسەرەخۆ و بەدەم چێشتنی تامی ئەوەی ئێستا نۆرەی دەستوەشاندنی هاتووە، گوڵێکی پەمەیی لە باخچەکە کردووەتەوە و لە لێوی خۆی نزیک خستووەتەوە و بەسرتە و بێ ئەوەی کەس گوێی لێ بێت، شیعرێکی نەزانراوی بەسەردا خوێندووە. دواتر بەجووڵەی زۆر بەخۆباوەڕەوە ئەم گوڵەی بۆ پزیشکی پۆشاک پەمەیی درێژ کردووە بۆ ئەوەی بۆنی بکات. ئەم گوڵە جگە لە بۆنەکەی، هیچ خەسڵەتێکی تری

نەبووە، بەڵام پزیشکی پۆشاک پەمەیی بەئەندازەیەک لە هێزی شیعری خوێندراو بەسەر گوڵەکەدا نیگەران بووە، هەر هێندەی لە لووتی نزیک خستووەتەوە و بۆنی کردووە، لە ترساندا کەوتووە و مردووە.



# 43

## پێم دەڵێن زەیتوون

پێش نوێژی ئێوارە بوو، لە دەرگا درا، کردمەوە: یەکێک لە پیاوانی سەرگەورەی پاسەوانان لە کۆشکەوە هاتبوو. نەوجەوانێکی خاوێن، جوان، لێو بەزەردەخەنە و ڕێکپۆش بوو. قوتیلەکەیەک، کە لەبری ڕۆناککردنەوە، سێبەری بەسەر ڕوویەوە دروست کردبوو و کاغەز و تەختەی نووسینی بەدەستەوە بوو و یەکسەر دەستی بەگێڕانەوە کرد: سوڵتانمان فەرمانی داوە، پێشبڕکێیەک ڕێک خراوە بۆ ئەوەی بزانرێت کێ لە مامۆستایانی نیگارکێش بە هەڵمەتێک جوانترین نیگاری ئەسپ دەکێشێت. فەرمان دراوە هەر ئێستا لە زەوی دانیشم، ئەم کاغەزە بخەمە سەر تەختە و تەختەش بخەمە سەر ئەژنۆم و لەو شوێنەی پێشانم دەدرێت، لە چوارچێوەی نیگاردا، بەخێرایی جوانترین نیگاری ئەسپی دنیا بکێشم.

میوانم هێنایە ژوورێ. بە قەڵەمبازێک چووم باریکترین قەڵەمی لە مووی گوێی پشیلە دروستکراو و مەرەکەبی خۆم هێنا. لە زەوی دانیشتم و دەمەساتێک کپ بووم. تۆ بڵێی فرت و فێڵ و گەمەیەک لەم کارەدا هەبێت بەنرخی سەر و گیانم تەواو بێت؟ لەوانەشە، بەڵام ئەدی مەگەر سەرجەم ئەفسانەکانی مامۆستایانی دێرینی هەراتیش بەم هێلە باریک و زراڤەی نێوان مردن و جوانی نەکێشراوە؟

هەناوم پڕ بوو لە چێژی نەخشاندن، بەڵام وەک بێژی چەشنی گشت مامۆستایانی دێرین لە نیگارکێشان ترسام و خۆم ڕاگرت.

کەمێک سەیری کاغەزەکەم کرد و چاوەڕێم کرد تا ڕۆحم لە نیگەرانی دابماڵرێت و

هێز و سەرنجی خۆم گرد بکەمەوە و تەنیا بیر لەو ئەسپە جوانە بکەمەوە کە بەنیازی کێشانی نیگاری بووم.

سەرلەبەری ئەو نیگارانەی ئەسپ، کە تا ئەم ڕۆژە کێشابوومن و دیبوومن، بەپێش چاومدا دەستیان بە تێپەڕین کردبوو. بەڵام دانەیەکیان بێ کێماسیترینی هەموویان بوو. ئەو نیگاری ئەسپەی کەس بۆی نەکێشرابوو، ئێستا من دەمکێشا. بڕیاردەرانە هێنامە بەرچاوی خۆم؛ گشت شتێکی تر سڕایەوە، هەروەک بڵێی بۆ تاوێک خۆم و دانیشتنم لێرە و بگرە نیگارکێشانیشم لەبیر چوو. دەستم لە خۆیەوە قەڵەمی کردبوو بە قوتووی مەرەکەبدا و ڕێک بەئەندازەی قەڵەم مەرەکەبی هەڵگرتبوو. دەی دەستم، ئێستا ئەو ئەسپە دانسقەیەی پێش چاوت بکە بەڕاست. دەتگوت من و ئەسپ ئاوێتەی یەکتر بووین، لەوەدا بووین لەم دنیایە جێی خۆمان بکەینەوە.

لەپڕ و بەگومانێکەوە لە کاغەزی خاڵیی چوارچێوە تێگیراودا بەدوای ئەو جێیەدا گەڕام. لە خەیاڵی خۆمدا ئەسپەکەم خستە ئەوێوە و لەپڕ:

بەڵێ، وەک ئەوەی هێشتا خۆم بیرم نەکردبێتەوە، دەستم لە خۆیەوە جووڵا و بڕیاردەرانە، بڕوانە چەند جوانە، لە نووکی لاقی ئەسپەکەوە دەستی پێ کرد، دەستبەجێ پێچی کردەوە و ناوتەنگی باریک و جوانی بڕی و بەرەو ژوور هەڵکشا. کاتێک بەهەمان بڕیاردانەوە لای چۆکی بایدایەوە و بەخێرایی گەیشتە ژێر سنگی، لەپڕ نەشئەم گرت، ئا لێرەوە پێچ بکەوە و بە سەرکەوتنەوە ڕوو لە سەرێ بکە: ئای سنگی چەند جوان چێ بوو، سەری باریک بووەوە و بوو بە مل، ڕێک وەک ئەسپەکەی پێش چاوم. بێ ئەوەی قەڵەم لەسەر کاغەز هەڵبگرم، لە گۆنایەوە بەرەو خوار دابەزیم و گەیشتمە دەمی بەهێزی و بەکەمێک بیرکردنەوەوە بەکراوەیی کێشام. چوومە دەمییەوە و گوتم "ئێرە بەمجۆرەیە، ئەی ئەسپ دەمی خۆت زیاتر داچەقێنە" و زمانی جوانیم هێنایە دەرێ. لەسەرەخۆ بەدەوری لووتیدا –دووڵی مەنوێنە– سووڕامەوە. ئەو کاتەی بەرێکی هەڵدەکشامە سەرێ، تاوێک سەیری سەرتاپایم کرد و کاتێک بینیم هێڵەکەم ڕێک وەک ئەوەی ناو خەیاڵی خۆم کێشاوە، لەبیرم چوو نیگار دەکێشم و دەتگوت خۆم نا، بگرە دەستم ئەو گوێیانە و ئەو لاربوونەوە بێ وێنەیەی ملی کێشاوە. گاڤێک لەبەر و دەستوبرد نیگاری زینەکەیم دەکێشا، دەستم لە خۆیەوە



ڕاوەستا و لە قوتوو مەرەکەبی بۆ قەڵەمەکەم هەڵگرت. زۆریش دڵخۆش بووم بەکێشانی پشت و گۆشتی توورت و بەرز و ئەستووری و هەناوم پڕ بوو لەم نیگارەی دەستکردی خۆم. تاوێک هەستم کرد لە شانی ئەم ئەسپەی ناو نیگاری دەستکردی خۆمەوە ڕاوەستاوم. بەچێژەوە دەستم بەکێشانی کلکی کرد، ئەمە ئەسپی شەڕوانان و ئەسپی غاردان بوو. کلکیم کرد بە گرێ و بەشادمانی بەرەو ژوور هەڵکشام: کاتێک کلک و کەفەڵیم دەکێشا، پێم وابوو لە سەر سمت و کونی قنگی خۆم هەستم بە فێنکیەکی خۆش کرد و بەهەمان کەیفخۆشی، نەرمەی جوانی پشتی و بەخێرایی و بەحەزەوە سمی پاشووی چەپی بۆ دواوە درێژکراویم کێشا. شەیدای دەستم بووم، چونکە کتومت ڕاوەستانی زەریفی ناو خەیاڵی خۆمی بە دەستی چەپی دابوو و بە نیگاری ئەسپەکەی دەستکردی خۆم سەرسام بووم.

دەستم هەڵگرت، چاوانی خوێنینی، بەڵام خەمگینی و کەمێک بە دووڵی و بەخێرایی کونە لووتەکانی و سەرپۆشی زینەکەیم کێشا؛ وەک ئەوەی بەخۆشەویستییەوە دەستیان پێدا بهێنم، تاڵ بەتاڵ مووی یاڵیم بەشانەکراوی کێشا، لغاوم لێ بەست، پەڵەیەکی سپیم لەسەر ناوچەوانی کێشا و قەشم کرد. بەزەوق و بەپێوان، بەڵام بەقەوارەی گەورە گون و کێریشم بۆ کێشا تا هەموو شتێکی تەواو بێت.

من کاتێک نیگاری شاهانەی ئەسپێک دەکێشم، خۆم دەبم بەو ئەسپە.

## 44

# پێم دەڵێن پەپوولە

پێم وابێت کاتی نوێژی ئێوارە بوو. کەسێک لەبەر دەرگا بوو: گێڕایەوە: سوڵتانم فەرمانی پێشبڕکێی داوە. سەر دڵ و سەر سەرم سوڵتانم، جا لە من بترازێت، کێی تر هەیە جوانترین نیگاری ئەسپ بکێشێت؟

کاتێک زانیم دیسان پێویستە بێ بەکارهێنانی بۆیاخ و بە ڕێبازی قەڵەمی ڕەش نیگار بکێشرێت، تۆزێک دوودڵ بووم. بۆچی ڕەنگ بەکار ناهێنین؟ ئایا لەبەرئەوەیە من باشترین ڕەنگ گرەوەم؟ کێ بڕیار دەدات کام نیگار باشترین نیگارە؟ بۆنی دەمی نەوجەوانی ناوشان پان و لێو پەمەیی و جوانی لە کۆشکەوە هاتووم کرد و هەستم کرد مامۆستا عوسمانی گەورەی نیگارکێشان لە پشت ئەم کارەوەیە. بێ هیچ گومان و ڕاڕاییەک، مامۆستا عوسمان بە هونەری من دەزانێت و لەناو سەرجەم وەستایانی نیگارکێشدا منی لە هەموویان زیاتر خۆش دەوێت.

بەمجۆرە، ئەو کاتەی نیگام لە کاغەزە خاڵییەکە بڕیبوو، شێوەی وەستان و نیگا و نواندنی ئەسپەکە هاتە پێش چاوم و دەمزانی هەردووکیان، سوڵتانمان و مامۆستا عوسمانیش، ئەمەیان بەدڵ دەبێت. ئەم ئەسپە پێویستە بەگوڕ و نەسرەوت بێ وەک ئەسپەکانی دەستکردی دە ساڵ لەمەوبەری مامۆستا عوسمان، بەڵام گران و سەنگین بێ چەشنی ئەو ئەسپانەی هەردەم سوڵتانمان دڵی پێوەیانە. دەبێت هەردوو چەپۆکی بەرز کردبێتەوە تا هەردووکیان سەبارەت بە جوانییەکەی هاوڕا بن. تۆ بڵێی چەند دانە زێڕ بە خەڵات بدرێت؟ میر موسەوێر ئەم نیگارەی چۆن دەکێشا؟ ئەدی بەهزاد چۆنی دەکێشا؟



لەپڕ وەک بروسکە شتێک بە ئەقڵمدا هات و هەتا من هەوڵم دا بزانم چییە، دەستی بەرازم پڕی بە قەڵەمدا کردبوو و بگرە دەستی کردبوو بەکێشانی دەستی چەپی ئەو ئەسپە دەگمەنەی بەخەیاڵی کەسی تردا نەهاتوو. دوای ئەوەی دەفەی شانیم گەیاندە جەستەی، بەبوێری و خێرایی و چێژەوە دوو کەوانەم کێشا. ئەگەر بتاندیبا، دەتانگوت ئەم هونەربازە نیگارکێش نییە، خۆشنووسە. دەستم گوێڕایەڵی کەسی نەدەکرد و لە خۆیەوە دەجوولا و منیش وەک ئەوەی دەستی کەسێکی تر بێت، بەسەرسامی تەماشام دەکرد. ئەم کەوانە بێ وێنانە بوون بە ورگی خڕپن و خڕیلە و سنگی پتەو و ملی قوو ئاسای ئەسپی بێ هاوتام و ئیدی لەبەرەوە حسێبی تەواوبوو بۆ نیگارەکە دەکرا. وای چەند دەست بە هونەرم، بینیم دەستم لە خۆیەوە بەدەوری دەمی کراوە و لووتیدا سووڕاوەتەوە و ناوچەوان و گوێیەکانی ئەسپی بەختەوەر و بەهێز و ئاقڵی کێشاوە. دواتر، ئای دایە بڕوانە، چەند جوانە، وەک ئەوەی پیتێک بنووسم، کەوانێکی ترم کێشا، چ بەختەوەرییەکە؛ هێندەی نەمابوو پێ بکەنم. لە کەوانەی ملی ئەسپە ڕاوەستاوەکەمەوە تا زینەکەی دابەزیم. دەستم زینەکەی دەکێشا؛ بەشانازییەوە سەیری شێوەی وەدەرکەوتووی جەستەی قەڵەو و خڕپنی ئەسپەکەم کرد و ڕێک وەک جەستەی خۆم دەچوو: هەمووان شەیدای ئەم ئەسپە دەبن. پێشبینیی ئەو قسە شیرینانەی سوڵتانمانم کرد کە لە کاتی بردنەوەی خەڵاتەکەدا دەیانکات: کیسەیەک زێڕم دەداتێ، کاتێکیش هێنامە پێش چاوی خۆم چۆن لە ماڵەوە دانە بەدانە دەیانژمێرم، لە ناخەوە ئارەزووم لێ بوو پێ بکەنم. لەو ساتەدا بە تیلەی چاوم بینیم دەستم زینەکەی تەواو کرد و قەڵەمەکەم چوو بە قوتووی مەرەکەبدا و دەرچوو، پاشان بەدەم پێکەنینەوە و وەک ئەوەی گاڵتەیەک بکەم، پشتی ئەسپەکەم کێشا. بەخێرایی بەدەوری کلکیدا سووڕامەوە. کەفەڵیم وەک قوونی شیرینی نەوجەوانێکی تاس و لووس، کە ئارەزووم دەکرد ئەو ساتە بینێیمە ژێرم، بەحەز و بەویستی بەدەستهێنانەوە، چەند شیرین و خڕ کێشا. گاقێک من پێ دەکەنیم، دەستی ئاوەزیاوم پاشووەکانی تەواو کرد و قەڵەمەکەم ڕاوەستا: بوو بە جوانترین ئەسپی لەسەر پاشووان ڕاوەستاوی ئەم دنیایە. هەستێکی شادی هەناومی داگرت؛ بەشادمانی بیرم دەکردەوە چۆن ئەسپەکەم بەگەن دەکەن و من وەک

هونەرمەندترین نیگارکێش، بگرە هەر لە ئێستاوە وەک گەورەی نیگارکێشان ڕادەگەیەنن. بەڵام هەمان کات و لەپڕ حاڵی بووم ئەم گەمژانە ئاوەهاش دەڵێن: چەند چاپوک و یاریبازانە کێشاویەتی. کەوتمە دڵەڕاوکێ و گوتم تەنیا لەبەر ئەم هۆیە نیگارەکەم وەرناگرن. بەمجۆرە، یاڵ و کونی لووت و ددان و مووەکانی کلک و سەرپۆشی زینی ئەسپەکەم بەوردی و بەجوانی نەخشاند تا ببینن چ ڕەنجێکم لەم نیگارەدا داوە. دەکرا لەم باری وەستانەدا، لای پشتەوە گەڵ و گونی ئەسپەکە ببینرێت، بەڵام گوتم نەبادا ژنان خەیاڵی پێوە لێ بدەن، نەمکێشا. بە لەخۆباییبوونەوە سەیری ئەسپەکەم کرد: هەستاوەتە سەرپێ، چەشنی گەردەلوول نەسرەوتە، بەهێز و بەگوڕە، لەوە دەچوو بایەک هەڵی کردبێت و هێڵە بازنەییەکانی وەک پیتەکانی نووسینێک خستبێتە جووڵەوە، بەڵام ئارامیش بوو. هەروەک چۆن بەشان و باڵی بەهزاد و میر موسەویردا هەڵدەدەن، ستایشی بکێشی ئەم نیگارەش دەکەن و منیش دەچمە ڕیزی ئەوانەوە.

من کاتێک نیگارێکی شاهانەی ئەسپ دەکێشم، دەبمە نیگارکێشێکی تری بکێشی نیگارێکی شاهانەی ئەسپ.



# 45

## پێم دەڵێن لەقلەق

دوای نوێژی ئێوارە بوو، لەوەدا بووم دەرچم و بڕۆم بۆ قاوەخانە؛ گوتیان کەسێک لەبەر دەرگایە. خێرە. چووم: کەسێک لە کۆشکەوە هاتبوو؛ گێڕایەوە. باشە: جوانترین ئەسپی دنیا. ئێوە پێم بڵێن بۆ هەر دانەیەک چەند ئاکچە دەدەن تا من پێنج شەش دانە لە جوانترین ئەسپی دنیاتان بۆ بکێشم.

بەڵام بەپارێزەوە ڕەفتارم کرد و وام نەگووت، نەوجەوانی ڕاوەستاوی ناو شیپانەی دەرگام هێنایە ژوورێ. بیرم کردەوە: جا خۆ جوانترین ئەسپی دنیا هەبوونی نییە تا من نیگاری بکێشم. من دەتوانم نیگاری ئەسپی شەڕ، ئەسپی کەتەی مەگۆلی، ئەسپی ڕەسەنی عەرەبی، ئەسپی لە خوێندا گەوزاوی قارەمانان و تەنانەت نیگاری بارگیری بەدبەختی ڕاکێشی گالیسکەی بەرد و گوێزەوەی بەرد بۆ بیناسازی بکێشم، بەڵام کێ بەمانە دەڵێت جوانترین ئەسپی دنیا؟ بێگومان یەکسەر حاڵی بووم سوڵتانمان بەگوتنی "جوانترین ئەسپی دنیا" دانسقەترین و دەگمەنترینی ئەو ئەسپانەی دەوێت کە پێشتر لە وڵاتی عەجەمدا هەزاران جار بەتەواوی ڕێسا و قاڵب و وەستاییەوە نیگاریان کێشراوە. بۆچی؟

هەڵبەتە ئەمەشیان لەبەرئەوەیە تا من نەتوانم کیسەیەک زێڕ ببەمەوە. ئەگەر پێم بڵێن نیگاری ئەسپێکی ئاسایی بکێشە، نەبوونی توانای کەسانی تر بۆ پێشبڕکێ لەگەڵ ئەسپەکانی مندا، شتێکی زانراوە. تۆ بڵێی کێ سوڵتانمانی فریو دابێت؟ سەرباری گشت پرتە و بۆڵە و قسە و قسەڵۆکی بەرچاوتەنگان، سوڵتانمان دەزانێت

من هونەرمەندترین نیگارکێشم و حەز لە نیگاری دەستکردی من دەکات.

دەستم، وەک ئەوەی بیەوێت سەرجەم ئەم حسێبانە بنێتە لاوە، لەپڕ بەهەڵچوونەوە کەوتە جووڵە و لە نووکی پێیەوە دەستم پێ کرد و بەهەڵمەتێک نیگاری ئەسپێکی ڕاستەقینەم کێشا. ئێوە ئەم ئەسپانە لە کۆڵان و لە شەڕەکان دەبینن. ماندوو، بەڵام گورجوگۆڵ... دواتر و بەهەمان هەڵچوونەوە نیگاری ئەسپی ئەفسەرێکی سوارەشم کێشا، جوانتریش دەرچوو. هیچ کام لە نیگارکێشانی نیگارخانە ناتوانن شتی وا جوان بکێشن. خەریک بووم دانەیەکی تریش لەبەر بکێشم، بەڵام ئەو کوڕەی لە کۆشکەوە هاتبوو، گوتی: "دانەیەک بەسە."

لەوەدا بوو پڕ بداتە کاغەزەکە و بڕوا، من ڕام گرت، چونکە وەک ناوی خۆم دەمزانی ئەو نامەردانە نەیاندەهێشت کیسەیەک زێڕ بۆ ئەم ئەسپانە بدرێت.

ئەگەر بەشێوازی خۆم بیکێشم، ناهێڵن کیسەیەک زێڕم بدرێتێ. خۆ ئەگەر ئەم کیسە زێڕەش وەرنەگرم، ئەوا لەمەودوا ناوبانگم لەکەدار دەبێت. بیرێکم کردەوە. بە کوڕەم گوت: "ڕاوەستە." چوومە ژوورێ، دوو زێڕی قەڵب و بریقەداری ڤینیسیاییم هێنا و خستمە دەستی کوڕەی لە کۆشکەوە هاتوو: ترسا و چاوەکانی داچەقاند. گوتم: "تۆ لاوێکی شێر ئاسای."

دەفتەرێکی قاڵبم هەبوو لە هەموو کەسێکم دەشاردەوە و بەدزییەوە جوانترینی ئەو نیگارانەم تێدا کێشابووەوە کە بەدرێژاییی ساڵانی ڕابردوو بینیبوومن. ئەم دەفتەرەم هێنا و نامە بەردەمم. وەکو تریش، ئەگەر دە زێڕ بدەی بە جەزمیی بستەباڵای سەرۆکی گەنجینە، ئەوا ئەو ناپیاوە باشترین دار و ئەژدیها و مەل و ڕاوچی و شەڕوانانی سەر پەڕەی کتێبە نهێنی و قفڵدراوەکانی گەنجینەت بۆ دەگرێتەوە و دەیداتە دەستت. ئەم دەفتەرەم شاکارێکە لەو گۆڕەی، بەڵام نەک بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت لە نەخش و نیگاردا دنیای ئەمڕۆ ببینن، بگرە بۆ ئەوانەی خوازیارن مامۆستایانی دێرین و داستانە کۆنەکانیان بیر بکەوێتەوە.

پەڕەکانم تێکەڵی یەکتر دەکرد و پێشانی کوڕەی لە کۆشکەوە هاتووم دەدا و باشترینی ئەسپەکانم هەڵبژارد. بە دەرزییەکەی دەستم کونم لەسەر هێڵەکانم دروست کرد و بەخێرایی بەسەریدا تێ پەڕیم. کاغەزێکی خاوێنم خستە ژێر



قاڵبەکەوە. بڕێکی زۆر تۆزی خەڵوزم بەسەردا کرد، کەمێک ڕام وەشاند بۆ ئەوەی بەباشی بچێتە ژێریەوە. قاڵبەکەم لابرد. تۆزی خەڵوزەکە خاڵ بەخاڵ، لەسەر کاغەزەکەی ژێرەوە تەواوی شێوەی ئەسپەکەی دەرخستبوو. بە بینینی خۆشحاڵ بووم.

دەستم دایە قەڵەم. ئەو ساتە بە ئیلهامێکی هەڵقوڵاو لە ناخەوە و بەجووڵەی خێرا و بڕیاردەرانە خاڵەکانم بەجوانی و زەریفی بەیەک گەیاند. بۆیە کاتێک سک و ملی جوان و لووت و پشتیم کێشا، لە ناخەوە بەخۆشویستنەوە هەستم پێ دەکرد. گوتم: "ئەوەتا. جوانترین ئەسپی دنیا. هیچ کام لە گەمژەکانی تر ئەم نیگارەیان بۆ ناکێشرێت."

سێ دانە زێڕی تری قەڵبم دا بە کوڕەی لە کۆشکەوە هاتوو تا ئەویش باوەڕ بکات و نەخەڵەتێ بۆ سوڵتانمانی بگێڕێتەوە من بە چ ئیلهامێک ئەم نیگارەم کێشاوە. ناڕاستەوخۆش تێم گەیاند ئەگەر کیسەیەک زێڕم دەست بکەوێت، زێڕی زیاتری دەدەمێ. سەرباری ئەوەش، ژنەکەم بە دەمی داچەقیوەوە بۆمانی دەڕوانی و کوڕەش خەیاڵی لەوە دابوو بتوانێت جارێکی تر بیبینێتەوە. زۆر کەس هەن پێیان وایە بەکێشانی نیگارێکی باشی ئەسپ دەبن بە نیگارکێشی باش. ئەمە بەمەرجێک تەنیا کێشانی باشترین نیگاری ئەسپ بەس نییە بۆ ئەوەی ببی بە باشترین نیگارکێش، بگرە پێویستە سوڵتانمان و گەمژەکانی دەوروبەریشی بخەیتە سەر ئەو باوەڕەی کە تۆ باشترین نیگارکێشی.

تەنیا ئەو دەمە دەبم بەخۆم، کاتێک نیگارێکی شاهانەی ئەسپ دەکێشم.

# 46

## دواجار پێم دەڵێن بکوژ

ئایا توانیتان بەشێوازی کێشانی نیگاری ئەسپەکەدا حاڵی ببن من کێم؟

هەر هێندەی بیستم داوام لێ کراوە نیگاری ئەسپێک بکێشم، تێ گەیشتم پێشبڕکێ لە ئارادا نییە و دەیانەوێت لە ڕێی کێشانی نیگاری ئەسپێکەوە دەستنیشانم بکەن. ئاگادار بووم لەوەی ئەو نیگاری ئەسپانەی لەسەر کاغەزێکی زبر بۆ گەرمکردنی دەست کێشابوومن، لەسەر لاشەی زەریف ئەفەندیی بەلەنگاز جێ مابوو. بەڵام هیچ چەوتی و شێوازێکم نەبوو تا بتوانن لە ڕێی سەیرکردنی نیگارەکانی ئەسپی دەستکردی خۆمەوە بمدۆزنەوە و بزانن من کێم. بۆ دڵنیایی، لەمە دڵنیا بووم، بەڵام سەرباری ئەوەش، لە کاتی کێشانی نیگاری ئەسپەکەدا شڵەژام. ئایا کاتێک ئەسپەکەی زاوام کێشابوو، شتێکی وام کردبوو بمدات بەدەستەوە؟ ئێستا دەبوو نیگارێکی جیاواز بکێشم. ئەمجارە بیرم لە شتی تەواو جیاواز کردەوە، "خۆم ڕاگرت" و نەبووم بەخۆم.

بەڵام من بۆخۆم کێم؟ ئایا من کەسێک بووم دەمویست لە پێناوی پەسەندکردنی شێوازی نیگارخانە، شاکارەکانی ناخی خۆم بشارمەوە؟ ئایا کەسێک بووم بتوانم ڕۆژێک لە ڕۆژان بە سەرکەوتنەوە نیگاری ئەسپەکەی هەناوی بکێشم؟

تاوێک بەترسەوە هەستم بەهەبوونی نیگارکێشەکەی هەناوم کرد. دەتگوت ڕۆحێکی تر لە ناخمەوە سەیرم دەکات، شەرمم لێ کرد.

دەمزانی لە ماڵەوە خۆم بۆ ڕاناگیرێت، بۆیە ڕووم لە دەرێ کرد و بەپەلە بە کۆڵانە





تاریکەکاندا ڕۆیشتم. شێخ عوسمان بابا لە بەسەرهاتی خۆیدا نووسیویەتی ئەگەر ئەوداڵی ڕاستەقینە بخوازێت ئیبلیسی هەناوی لە دوای خۆی بەجێ بهێڵێت، پێویستە بەدرێژاییی تەمەن بەڕێوە بێت و لە هیچ شوێنێک زیاد نەمێنێتەوە. بەڵام دوای شەست و حەوت ساڵ لەم شار و ئەو شار کردن، لە هەڵهاتن لە دەستی ئیبلیس پرووزەی لێ بڕاوە و خۆی داوەتە دەستی. ئەم تەمەنە، تەمەنی کوێربوونی نیگارکێشان، گەیشتن بە تاریکاییی خوایی، بوون بەخاوەنی شێوازێکی نەویستراو و هەمان کات، تەمەنی ڕزگاربوونە لە سەرجەم نیشانەکانی شێواز.

چەشنی ئەوەی منەی شتێک بکەم، لە بازاڕی مریشک فرۆشان و مەیدانی چۆڵی بازاڕی دیلفرۆشان و بەناو بۆنی خۆشی دووکانی شۆربا و نۆکفرۆشاندا سووڕامەوە. بەپێش سەرتاشخانە و ئوتووخانەی دەرگا داخراو و خاڵۆیەکی نانەوادا کە بە سەرسوڕمانەوە بۆ منی دەڕوانی و پارەی دەژمارد و بە بەردەم دووکانی بەقاڵێکدا کە بۆنی مسک لە ترشی و ماسیی سوێرکراوی دەهات، تێ پەڕیم. تەنیا لەبەرئەوەی نیگام چووە سەر ڕەنگەکانی، چوومە دووکانێکی عەتاری و بینیم خاوەنەکەی لە ژوورەوە هێشتا بەتەرازوو خەریکی کێشانی چەند شتێک بوو. لەوێ، چەشنی ئەوەی لە دڵەوە بۆ مرۆڤ دەڕوانم، بەسەرسامی لەبەر ڕۆشناییی چرایەک سەیری جەواڵی قاوە، جەنجەفیل و دارچینی، قوتووی ڕەنگاوڕەنگی بنێشت، فەردەی زیرە و ڕەشکە و کونجی و جافەرانم کرد و ڕاستەوخۆ بۆنیان لە مێزەکەوە دەگەیشتە لووتم. جاروبار خوازیارم هەموو شتێک ببەم بۆ دەمم و لەسەر کاغەزێکی خاڵی نیگاری گشت شتێک بکێشم.

چوومە ئەو شوێنەی پێشتر هەفتەی ڕابردوو دووجار گەدەی خۆم لێ پڕ کردبوو و خۆم ناوم لێ نابوو ئاشخانەی خەفەتباران –ڕاستییەکەی، دەبوایە بمگوتبایە ئاشخانەی بێ نەوایان–. دەرگای ئەم شوێنە، بۆ ئەو کەسانەی پێی دەزانن، تا نیوەی شەو کراوەیە. ژوورەوە چەند کەسێکی لە سزای هەڵواسین هەڵهاتوو، یەک دوو داماو لە بەرگی ئەسپدزاندا، چەند نامۆیەک، کە لەتاو بەدبەختی و نائومێدی وەک ئەفیۆنکێشان چاویان لەسەر ئەم دنیایە هەڵگرتبوو و بۆ بەهەشتەکانی تریان دەڕوانی، دوو سواڵکەر، کە تەنانەت نەیاندەتوانی خۆیان لەگەڵ نەریتی شوێنەکە ڕابهێنن و ئەفەندییەکی لێ بوو. کابرای ئەفەندی خۆی لەم گشت جەنجاڵییە دابڕیبوو

و خۆی خزاندبووە گۆشـەیەکـەوە. سـڵاوێکی ناسکم لە چێشت لێنەری حـەڵەبی کـرد. قـاپەکـەم پڕ کـرد لە دۆڵمەی کـەلەرم بەگۆشت، ماسـتم بەسـەردا کـرد و یەک دوو چنگ بیبەری سوورم خستە سەری و لە تەنیشت کابرای ئەفەندییەوە دانیشتم.

هەر شـــەوەی تـەمی دڵگرانـی و خـــەمــێکم لێ دەنیـــشـــێت. برایان، برایان، ژاراوی دەبین، دەڕزێـین، دەمـــرین، تا زیاتـر بژین، دەتوێینەوە، تـا بیناقـــاقـــامـــان نوقـــمی پەرێشـانـی دەبین. هەندێک شـەوان لە خـەونمدا دەبینم لە بیرەکـە هـاتووەتە دەرێ و دوام کـەوتووە، بەڵام ئێمـە گلێکی زۆرمـان بەسـەردا کـرد و ناتوانێت لە گۆڕدا ڕاست بێتەوە.

ئەرێ ئەمـە نیشـانـەیەکی لە خـواوە نێردراو بوو بۆ من ئـەو دەمـەی یارۆی ئەفـەندی لووتی لە شـۆرباکەی ژەنیبوو و من پێم وابوو سـەرتاپای دنیای لەبیر کردووە، کـەچی دەرگـای دەمەتەقێی خسـتە سـەرپشت؟ گـوتم بەڵێ، گۆشـتەکـە جوان جنراوە و دۆڵمـە کەلەرمـەکەم زۆر بەتامە. پرسـیم: گوتی تازە دەرسـخـانـەی بیسـتیی تەواو کردووە و بە ناوونیـشـانـی نووسـیـار لەکن عـارف پاشـا دامـەزراوە. لێم نەپرسـی بۆچی بەم کـاتەی شـەو لە کۆشکی پاشـا، مـزگەوت، یان لـە مـاڵەوە لـە پێخـەوی ژنەکـەیدا نییـە و لەم ئاشـخـانەیەی چەتە و ڕێگرانی سـەڵت و زگورتییـانە. ئەو لێی پرسیم خـەڵکی کوێم و کـێم. منیش تاوێک بیـرم کـردەوە و گـوتم: "من ناوم بەهزادە. لە هـەرات و تەورێزەوە هـاتووم. شاهـانەترین نیگار و باوەڕ پێنەکـراوترین شاکارم کێشاوە. چەندین سـەدەیە لە گشت نیگارخانەیەکی مـوسڵمانی عـەجەمستان و عـەرەبسـتان دەگوترێت: کـاتێک لێی دەڕوانی، وا دەزانی ڕاستییە وەک نیگاری بەهزاد."

بێگومـان ئەمـە کـرۆکی مـەبەست نەبوو. نیگاری من شـتێک دەنەخشـێنێت کـە ئەقڵ دەیبینێت، نەک چاو. نیگاریش، وەک دەزانن، کـەیف و سـەفـایەکی سازکـراوە بۆ چاو. ئەم دوو بیرۆکەیە لێک بدەن، دنیای منتان بۆ دێتە ئاراوە. واتا:

ئەلیف: نیگار بەرجەستەکردنی بینراوەکانی ئەقڵە بۆ بەزم و سەفای چاو.

لام: ئەو شـتـەی چاو لە دنیـا دەیبـینێت، بەئەندازەی خـزمـەتکردنـی ئەقڵ دەچێـتـە نیـگارەوە.

میم: کەواتە جـوانی بریتییـە لەوەی چاو لە دنیـا سـەرلەنوێ ئەو شـتـانە بدۆزێتەوە کـە



ئەقڵ لە خۆیەوە دەیانزانێت.

من ئەم لـۆجـیکەم لە ناکـاو لـە قـوڵاییی ڕۆحی خـۆم دەرهێنا، بەڵام ئایا ئـەفـەندیی تازەدەرچووی دەرسخانەی بیستی لێی تێ گەیشت؟ نەخێر، چونکە ماوەی سێ ساڵ لەبەر پێی مامۆستای دەرسخانەی گەڕەکی قەراغ شار کە ڕۆژی بە بیست ئاکچە – لەم ڕۆژگارەدا بیست نان بەم پارەیە دەکڕێت– دەرس دەڵێتەوە، دانیشتووە و هێشتا نازانێت بەهـزاد کێیە. ئاشکرایە مـامۆسـتـا ئەفـەندیی بیـسـتیش نەیزانیـوە بەهزاد کێیە. باشە، با باسی بکەم.

گوتم:

"من نیگاری گشت شتێکم کێشاوە، گشت شتێک. دانیشتنی پێغەمبەرمان پێکەوە لەگەڵ هەر چوار یارانیدا لەبەردەم میـحرابی سـەوزی مزگەوت؛ دوایی لە کـتێـبێکی تردا چوونـی نێـردراوی خـوا بـەسـواریی بوراق لە شـەوی مـیـعـراجدا بۆ بەهەشـتی نـهـۆمی حـەوتەم؛ ئەسکـەندەر، کـاتێک لە ڕێی چین بۆ تـرسـانـدنی ئەو جـانـەوەرەی بە گـێـژەڵۆکـە دەریای هێناوەتـە سـەر شـەپۆل لێـدان، دەهـۆڵی پەرسـتگای قـەراغ دەریا دەدزێت؛ سوڵتانێک، ئەو کاتەی بەدەم گوێگرتن لە دەنگی عوودەوە لە حەوزدا سـەیری مـەلەی شـۆخـانـی ڕووت و قـووتـی حـەرەمـسـەرا دەکـات و دەسـتـپـەڕ لێ دەدات؛ زۆرانبازێکی نەوجەوان کاتێک دەڵێت سەرجەم فێڵەکانی وەستام دەزانم و دەیبەزێنم، وەسـتـاشـی بەدوایین فێڵ کە فێری ئەوەی نەکردووە، دەیبـەزێنێت و لە پێش سـوڵتـان دەیدات بـە زەویدا؛ لەیلا و مـەجنوونی منداڵ، چاخـێک لـە دەرسـخـانەیەکی دیوار بەوردی نەخشـێنراو لە تەنیشت یەکەوە لەسـەر چۆک دانیشتوون و قـورئانی پیرۆز دەخوێنن و دڵیان دەچێتە یەک؛ لە ئەڤیندارانی هەرە شەرمنەوە بۆ بێ ئابڕووترینیان کە دەکەن و دەکۆشن ناتوانن چاو ببڕنە ناو چاوی ئەڤیندارانی خۆیان؛ بەرد لـەسـەر بەردی بنیـاتنانی کۆشک و سـەراکان، سزادانی تاوانباران بە ئەشکەنجەدان، فڕینی هەڵۆ، کەروێشکی گاڵتەچی، پڵنگی ناپاک، داری سەروو و چنار و ئەو قەلەباچکانەی هەمیشە بە سەریانەوە دەمکێشا، مردن، شاعیرانی پێشبڕکێکەر، خوانی سەرکەوتن و کەسانی وەک تۆ کە لەسەر خوان جگە لە شۆربا شتێکی تر نابینن."

نووسیاری بەپارێز چی دی نەدەترسا و بگرە منی بە قۆشمە دەزانی و پێ دەکەنی.

گوتم: "مامۆستای بەڕێزت فێری کردووی و دەیزانی. لە بوستانی سەعدیدا بەسەرهاتێک هەیە فرە حەزم لێیە. ئەها دارا شا کاتی ڕاو خۆی لە ئاپۆڕەی دەوروبەری دادەبڕێت و بەمەبەستی گەڕان دەچێت بۆ سەر گرد و تەپۆلەکەکان. لەو کاتەدا پیاوێکی نەناسراو و ترسناک لە بەردەمیدا قووت دەبێتەوە. پادشا دەشڵەژێت، ڕێک ئەو دەمەی بەسەر ئەسپەوە دەست دەداتە تیر و کەوان، کابرای ڕدێن بزنانی دەپاڕێتەوە و دەڵێت پادشام ڕاوەستن و تیرەکەتان مەهاوێژن، چۆن منتان نەناسییەوە؟ مەگەر من ئەو مەیتەرە دڵسۆز و ڕاستگۆیەتان نیم کە بەسەدان ئەسپ و تاینی سەربازتان پێم سپاردووە؟ ئەدی مەگەر زۆر جاران منتان نەبینیوە؟ من ڕووی یەک بەیەکی سەد ئەسپی ئێوە بەخوو و ڕەفتار و ڕەنگیانەوە دەناسمەوە. باشە چۆن زەینتان ناچێتەوە سەر کۆیلەیەک لە کۆیلەکانی ژێر دەستی خۆتان، کەسێکی وەک من کە ئەو هەموو جارە یەکدیمان بینیوە؟"

کاتێک من نیگاری ئەم جڤاتە دەکێشم، نیگاری ئەو ئەسپە ڕەش و خەنەیی و سپییانەی مەیتەر بەدلۆڤانی بۆیان دەڕوانێت، هێندە بەختەوارانە و بەئاسوودەیی لە دەشتێکی سەوزی بەهەشتیی بە گوڵ داپۆشراودا دەکێشم، تەنانەت گەمژەترین خوێنەریش دەرسی ئەم چیرۆکەی سەعدی تێ دەگات: جوانی و ڕازی ئەم دنیایە، تەنیا کاتێک دەردەکەوێت ئەگەر بەخۆشەویستی و بایەخ پێدان و دلۆڤانی بۆی بڕوانی. ئەگەر دەتانەوێت لە بەهەشتی شوێنی ژیانی ماین و ئەسپی بەختەوەریدا بژین، ئەوا هەر چاوێکتان بکەن بەچوار و بەسەرنجەوە لە ڕەنگ و وردەکاری و خۆشییەکانی ئەم دنیایە بڕوانن و ببیینن.

شاگردی پێگەیشتووی بەردەستی مامۆستای بیست ئاکچەیی هەم چێژی لە قسەکانم وەردەگرت و هەم لێشم دەترسا. دەیویست کەوچکەکەی دانێت و لە دەستم ڕابکات، بەڵام یەخەم بەرنەدا.

گوتم: "بەهزادی مامۆستایان لەو نیگارەدا پادشا و مەیتەر و ئەسپەکانی بەجۆرێک کێشاوە، دوای تێپەڕبوونی سەد ساڵیش هێشتا کەس لە لاساییکردنەوەیان تێر نەبووە. هەر یەکێک لەو ئەسپانەی ئەو لە خەیاڵ و دڵی خۆیەوە هێنابوونی و کێشابوونی، بوو بە قاڵب. سەدان نیگارکێش –منیش لەناویاندا– نیگاری ئەو ئەسپانە لەبەر دەکێشین. ئایا تۆ هەرگیز نیگاری ئەسپت بینیوە؟"



"ڕۆژێک، لە دووتوێی کتێبێکی ئەفسووناویدا، کە مامۆستایەکی گەورەی زانای زانایان دابووی بە مامۆستای خوا لێخۆشبووی من، نیگاری ئەسپێکی باڵدارم بینی."

ئاشکرایە ئەم گێژ و وێژە لەگەڵ مامۆستای خۆی کتێبی "عجائب المخلوقات"ی بەهەند وەرگرتووە. ئایا سەری بنێمە مەنجەڵی شۆرباکە و لێرە بیخنکێنم، یاخۆ لێی گەڕێم بەپێوەنانەوە باسی ئەو نیگاری ئەسپە بکات –کێ دەزانێت لەبەرگیراوەیەکی چەند خراپیشە– کە تاکە نیگارێکە لە ژیانیدا بینیویەتی؟ ڕێگای سێیەمم دیتەوە، کەوچکم دانا و دەرپەڕیمە دەرەوەی ئاشخانە. دوای ڕێکردنێکی دوور و درێژ چوومە تەکیە چۆڵکراوەکە و هەستێکی ئاسوودەیی هەناومی داگرت. دەوروبەری خۆم سڕی و خاوێن کردەوە و بێ ئەوەی هیچ شتێکی تر بکەم، گوێم بۆ بێدەنگی ڕاگرت.

پاشان ئاوێنەکەم لە شوێنی شاردنەوەی دەرهێنا و نام بە کورسیی قورئانەکەوە. نیگارێکی دوو پەڕەیی و تەختەی کارم نایە باوەشم. هەوڵم دا لەو شوێنەوەی لێی دانیشتبووم، ڕووی خۆم لە ئاوێنەکەدا ببینم و بە قەڵەمی ڕەژوو نیگاری ڕووم بکێشم. پشوودرێژانە ماوەیەکی درێژ کارم کرد. دوای کاتێکی زۆر سەرنجم دا ڕووی سەر کاغەزەکە دیسان وەک ڕووی خۆم ناچێت و هەناوم پڕ بوو لە خەم و حەسرەت و ئاو زایە چاوانم. ئەرێ نیگارکێشانی ڤینیسیایی، کە زاوا بەو شیرینییە باسی دەکردن، چۆن ئەم کارەیان دەکرد؟ بیرم کردەوە و گوتم ئەگەر تاوێک خۆم بخەمە جێی یەکێک لەوان و بەهەستی ئەوانەوە نیگار بکێشم، لەوانەیە بتوانم نیگاری خۆم بەشێوەیەک لە خۆم بچێت، بکێشم.

دواتر، هەم نیگارکێشانی فەڕەنگ و هەم زاوام بەنەفرەت کرد، ئەوەی کێشابووم، سڕیمەوە و دیسانەوە سەیری ئاوێنەم کرد و دەستم کردەوە بە نیگارکێشان.

زۆر دواتر، سەرەتا خۆم لە کۆڵانەکان و پاشان لەم قاوەخانە ڕیسوا و پەرێشانەدا بینییەوە. بگرە نەمدەزانی چۆن گەیشتوومەتە ئێرە. کاتێک چوومە ژوورەوە، لەپای تێکەڵبوونم بەم نیگارکێش و خۆشنووسە پەرێشانانە بەئەندازەیەک شەرمم بە خۆمدا هاتەوە، ناوچەوانم لە ئارەقە نیشت.

هەستم دەکرد سەیرم دەکەن، باشە ئەوەتا دەبینم یەکتر ڕادەگرن و ئاماژەم بۆ

دەکەن و پێ دەکەنن. هەوڵم دا ئاسایی بم و لە گۆشەیەکدا دانیشتم. لەلایەکی ترەوە، چاوانم بۆ مامۆستایانی نیگارکێشی تر و ئەو برا خۆشەویستانەم دەگەڕا کە سەردەمانێک پێکەوە شاگردیمان بۆ مامۆستا عوسمان کردبوو. دڵنیام ئەوانیش هەریەکەیان نیگارێکی ئەسپی کێشاوە و ئەو گەمژانە پێشبڕکێکەیان بەهەند وەرگرتووە و کەوتوونەتە پەلەقاژەوە.

هێشتا چیرۆکبێژی ئەفەندی دەستی بە گێڕانەوەی بەسەرهات نەکردبوو. بگرە هێشتا نیگاریشی هەڵنەواسیبوو. ئەمەش ناچاری کردم لە نزیکەوە تێکەڵ بەئاپۆڕەی ناو قاوەخانەکە بم.

باشە، با ڕاستیتان پێ بڵێم: وەک هەموو کەسێک، گاڵتە دەکەم، بەسەرهاتی بێ پەردە دەگێڕمەوە، لەگەڵ دۆستانم بەپڕتاو یەکدی ماچ دەکەین، وشەی جووتواتایی و تۆێکڵدار و ڕەوانبێژی دەخەمە توێی قسەکانمەوە، پرسیاری لاوانی گەورەی شاگردەکان دەکەم، منیش چەشنی گشت کەسانی تر بێ بەزەییانە دوژمنانی هاوبەش دەرزی ئاژن دەکەم و کار دەگەیەنمە سنووری دەستبازی و ماچکردنی گەردن. کاتێک من ئەم هەموو شتەم دەکرد، ئاگاداریش بووم لەوەی بەشێکی ڕۆحم بێ بەزەییانە نووزەی لە خۆی بڕیبوو. ئەمەش ئازارێکی تاڵی دەگەیاندمێ، ئازارێک، خۆڕاگرتن لە بەرامبەریدا مەحاڵ بوو.

سەرباری ئەوەش، توانیم بە ماوەیەکی کورت کێری خۆم و کێری ئەوانەی لە پاشملە باسمان دەکردن، بە قەڵەم، قامیش، ستوونەکانی قاوەخانە، شمشاڵ، تۆخماخ، دەسکە پیازی ئەستوور، منارە، شیرینیی قامکی شەکراوی، داری پینووس(*) و دوو جاریش بە سەرانسەری دنیا بچوێنم. توانیشم سمتی ئەو کوڕە جوانانەی باسمان دەکردن، بە نارنج، هەنجیر، پاقلاوە، بالیف و شارە مێروولەیەکی زۆر بچووک بشوبهێنم. هەرچی دەم هەراشترین خۆشنووسانی هاوتەمەنیشم بوون توانییان بەهەمان ماوە زۆر نەزانانە و بێ متمانە بەخۆکردن هەرامەی خۆیان تەنیا بە دیرەکی کەشتی و ڕەوتی بارهەڵگر بچوێنن. درێژەم دایێ و بە هێما و بە ئاماژە هاتمە سەر باسی قامیشی لە کارکەوتووی نیگارکێشانی بەسالاچوو، لێوی ڕەنگ

(*) داری پینووس: جۆرێکە لە دار لە خێزانی سنەوبەر. – وەرگێڕ –



گێلاسیی شاگردانی نوێ، ئەو وەستا خۆشنووسانەی (وەک من) پارەی خۆیان لە شوێنێک (بێ ئابڕووترین شوێنمان گوت) دەشارنەوە. باسم کرد ئەم شەرابەی دەیخۆمەوە، لەبری گەلای گوڵ، ئەفیۆنی تێ کراوە. ئاماژەم کرد بۆ دوایین مامۆستایانی تەورێز و شیراز و تێکەڵکردنی قاوە و شەراب لە حەڵەب و خۆشنووسان و شۆخە کوڕانی ئەوێ.

جاری وا هەبوو پێم وابوو یەکێک لە دوو ڕۆحەکەی هەناوم دواجار سەردەکەوێت و ئەوی تر لەدوای خۆی بەجێ دەهێڵێت و منیش دەتوانم دواجار لایەنە کپ و ناحەزەکەی خۆم لەبیر بکەم. ئەو کاتە بەزم و ڕەزمی ڕۆژانی جەژنی سەردەمی منداڵیم بیر دەکەوتەوە، ئەو بەزمانەی وەک خۆم لەگەڵ هەمووان تیایدا بەشدار دەبووم. بەڵام بێدەنگییەک لە هەناومدا هەبوو و سەرباری ئەم گشت گاڵتە و جەفەنگە، منی لە ناوەڕاستی ئەم ئاپۆڕەیە تاک و تەنیا دەهێشتەوە.

کێ ئەم ڕۆحە بێدەنگ و بێ بەزەییەی –ئەوە ڕۆح نەبوو، جنۆکە بوو– من تاق دەخاتەوە و لە جڤات دەرم دەپەڕێنێت، خستبووە هەناومەوە؟ ئیبلیس؟ بەڵام ئەم ڕۆحە بەو بەدڕەوشتییانە نا کە ئیبلیس دەیانخوازێت، بگرە تەواو بەپێچەوانەوە، تەنیا بەبێدەنگیی هەناوم و بە بێگەردترین بەسەرهاتی ڕۆح هارژووێن ئاسوودە بێت و دادەساکێت.

بەنیازی دانی ئەو ئاسوودەییە پێم، لەژێر کاریگەریی شەرابدا دوو چیرۆکم گێڕایەوە. شاگرد خۆشنووسێکی بالابەرزی مەلوول، بەڵام پێست سپی، چاوە سەوزەکانی لە چاوانم بڕیبوو و زۆر بە سەرنجەوە گوێی بۆ ڕاگرتبووم.

## دوو چیرۆک سەبارەت بە کوێری و شێواز کە نیگارکێش بۆ دڵدانەوەی تەنیاییی ڕۆحی خۆی گێڕایەوە:

### ئەلیف

کێشانی نیگاری ئەسپ بەدەم سەیرکردنی ئەسپەوە، بەپێچەوانەی بۆچوونی باوەوە، داهێنانی مامۆستایانی فەڕەنگ نییە، بگرە یەکەمجار بیرۆکەی جەمالەدینی مامۆستای قەزوینی بوو. پاش ئەوەی ئوزوون حەسەنی خاقانی ئاکقۆیونلو قەزوین دەخاتە ژێر قەڵەمڕەویی خۆیەوە، مامۆستا جەمالی بەسالاچوو هەر بەوەندەوە

ناوەستێ بەکەیفەوە بچێتە نیگارخانەی خاقانی سەرکەوتوو، بگرە پێی دەڵێت خوازیارە لەگەڵیدا بچێتە شەڕ و نیگاری جڤاتی ئەو شەڕانەی بەچاوی خۆی مێژوویان دەبێنێت، بکێشێت. بەمجۆرە، ئەم مامۆستا گەورەیە، کە ماوەی شەست و دوو ساڵ بێ ئەوەی شەڕی دیبێت، نیگاری ئەسپ و ئەسپسواری و شەڕی کێشابوو، بۆ جاری یەکەم دەچێتە شەڕ. بەڵام بەر لەوەی پێک هەڵپژانی توند و بەهەرا و زەنای ئەسپە بە ئارەقە تەڕبووەکان ببینێت، بە تۆپێکی هەڵدراو لە ڕیزەکانی دوژمنەوە، هەم کوێر دەبێت و هەم هەردوو دەستی لە مەچەکەوە لە دەست دەدات. ئاشکرایە مامۆستای بەتەمەن چەشنی مامۆستایانی گەورە و ڕاستەقینە، کوێریی بە خەڵاتێکی خوایی زانیوە و چاوەڕێی کردووە. لە دەستدانی دەستەکانیشی بە سەقەتییەکی گەورە دانەناوە و گوتوویەتی بیرەوەریی نیگارکێش بەپێچەوانەی قسەی ئەوانەی پێ دادەگرن و دەڵێن لە دەستدایە، لە ئەقڵ و لە دڵدایە و ئێستا دوای کوێربوون، ئەو نیگار و دیمەن و ئەسپە بێ کێماسی و ڕەسەنانەی خوا فەرمانی بینینیانی پێ دەدا، دەبینێت. بەمەبەستی دابەشکردنی ئەم شاکارانە لەگەڵ نەخشپەروەراندا، شاگرد خۆشنووسێکی بالابەرزی مەلوول، بەڵام پێست سپی و چاو سەوز پەیدا دەکات. ئەو ئەسپە نایابانەی لە تاریکایی خواییدا دێنە پێش چاوی، بەو شێوەیەی بیتوانیایە قەڵەمی بەدەستەوە بگرتایە و خۆی نیگاریانی بکێشایە، بۆ شاگردەکەی دەگێڕێتەوە و بەدەستی ئەو بەکێشانیان دەدات. دوای مردنی مامۆستا، خۆشنووسی شۆخ سێسەد و سێ چیرۆکی کێشانی نیگاری ئەسپ، کە هەریەکەیان لە دەستی چەپییەوە دەستی پێ کراوە، بە ناوونیشانی نەخش و ڕەوت و ئەڤینی ئەسپ لە سێ بەرگدا کۆ دەکاتەوە و سەردەمانێک لە هەر وڵاتێک سێبەری دەسەڵاتی ئاکقۆیونلوی بەسەرەوە بووبێت، زۆر حەزی پێ کراوە و منەی کراوە، نووسین و لاساییکردنەوەی جۆراوجۆری دەرچووە، نیگارکێشان و شاگرد و فێرخوازان بەش بەشیان لێ لەبەر کردووە، وەک کتێبی بەردەست کەڵکی لێ وەرگیراوە، بەڵام دوای سڕینەوە و گسکدان لە دەوڵەتی ئاکقۆیونلوی ئوزوون حەسەن و پاش بالادەستبوونی نەخشی هەراتی لە سەرانسەری وڵاتی عەجەمدا، سێ کتێبەکە لەبیر دەچنەوە. بێگومان هێزی لۆجیکێکی بەهێز لەوەدا هەیە کاتێک کەمالەدین ڕەزای هەراتی لە کتێبێکی خۆیدا



بەناوی ئەسپەکانی کوێر، بەتوندی ڕەخنەی لەم سێ کتێبە گرتووە و بەپێویستی زانیوە بسووتێنرێن و بانگەشەی کردووە: ئەو ئەسپانەی جەمالەدینی قەزوینی لە کتێبەکانی خۆیدا باسیان لێوە دەکات، هیچ کامیان نابن بە ئەسپی خوایی؛ لەبەرئەوەی بێگەرد نین؛ لەبەرئەوەی مامۆستای بەساڵاچوو، دوای بینینی جڤاتی ڕاستەقینەی شەڕ، با تەنیا جارێک و بۆ تاوێکیش بووبێت، باسی ئەو ئەسپانەی گێڕاوەتەوە. لەبەرئەوەی سوڵتان محەمەد فاتیح گەنجینەی ئوزوون حەسەنی ئاکقۆیونلو بەتاڵان دەبات و دەیهێنێتە ئەستەنبوڵ، پێویستە مرۆڤ تووشی سەرسوڕمان نەبێت تاک و تەرای ئەم سێسەد و سێ چیرۆکەی ئەسپ لە هەندێک کتێبدا لە ئەستەنبوڵ ببینێت و تەنانەت ببینێت بڕێک لە نیگاری ئەسپەکان بەو شێوەیەی لەم چیرۆکانەدا پێشان دەدرێت، کێشراوە.

## لام

لە هەرات و شیراز، کوێربوونی وەستای نیگارکێش لەپای کاری زۆر لە گەلاڕێزانی تەمەندا، بەتەنیا وەک نیشانەیەکی ورەی نیگارکێش چاوی لێ نەدەکرا، بگرە هەمان کات دەبوو بە مایەی شانازی بۆی و دەگوترا خوا پاداشتی ڕەنج و هونەری ئەو مامۆستا نیگارکێشە گەورەیەی داوەتەوە. بۆیە سەردەمانێک لە هەرات بەچاوی گومانەوە سەیری بڕێک لە مامۆستایانی کۆن، لەوانەی سەرباری هەڵکشانی تەمەنیان کوێر نەدەبوون، دەکرا. ئەمە پاڵی بەزۆر مامۆستای گەورەوە ناوە لە پیریی خۆیاندا هەڵوەدای کوێربوون بن. هەندێک لەوانە خۆیان کوێر کردووە و لەبری ئەوەی بۆ پادشایەکی تر کار بکەن یان ناچار بن شێواز بگۆڕن، ملی ڕێی مامۆستایانی ئەفسانەییی خۆ کوێرکردوویان گرتووەتە بەر و سەردەمانێکی درێژ بەسەرسامی و شەیدایی یادیان کراوەتەوە. ئەبو سەعیدی کوڕەزای میران شای نەوەی تەیمووری لەنگ، دوای گرتنی تاشقەند و سەمەرقەند نیگارخانەیەکی دامەزراندووە و تیایدا فرە زیاتر ڕێزی لە نەریتی کوێربوون گرتووە وەک لە کوێربوون خۆی و بەم کارەی دەروازەی دنیایەکی نوێی خستووەتە سەرپشت. نیگارکێشی پیر قەرە وەلیی سەرچاوەی سروشی ئەبو سەعید، پێی گوتووە ئاشکرایە نیگارکێشی نابینا لە تاریکیدا ئەسپەکانی خوا دەبینێت و هونەری ڕەسەن ئەوەیە نیگارکێشی بینا و

چاوساغ بتوانێت لە ڕوانگەی کوێرەوە سەیری دنیا بکات. بە تەمەنی شەست و حەوت ساڵی، سەرەڕای ئەوەی چاوانی تا کۆتایی لەسەر کاغەزێکی کراوە دەبێت، بێ ئەوەی بیر لە کاغەزەکە بکاتەوە و هیچ ببینێت، نیگارێکی ئەسپێک بە نووکی قەڵەمیدا دێت و دەکێشێت و بەمەش قسەکەی خۆی دەسەلمێنێت. میران شایش لە کۆتاییی ئەم تەدارەکی نیگارکێشانەدا وەک هاوکارییەک بۆ مامۆستای ئەفسانەیی، فەرمانی داوە موزیکژەنانی کەڕ عوود بژەنن و چیرۆکبێژانی لاڵیش چیرۆک بگێڕنەوە. دواتر نیگاری ئەسپی نایابی دەستکردی قەرە وەلی ماوەیەکی درێژ لەگەڵ نیگارەکانی تری ئەسپی مامۆستای گەورەدا بەراورد دەکات و دەبینێت هیچ جیاوازییەک لە نێوانیاندا نییە. لەبارەی ئەم دۆخەوە، کە بووە بەهۆی دووڵیی میران شا، مامۆستای ئەفسانەیی گوتوویەتی نیگارکێشی خاوەن هونەر چاوی کراوە بێ یاخۆ نوقاو، هەمیشە لە ڕوانگەی خواوە ئەسپ دەبینێت. بەبۆچوونی وی، ئەگەر قسە بێتە سەر مامۆستایەکی گەورەی نیگارکێش، هیچ جیاوازییەک لە نێوان کوێر و چاوساغدا نییە: دەست بەردەوام هەمان نیگاری ئەسپی دەکێشا، چونکە ئەو ڕۆژگارە، داهێنانی فەرەنگ، کە شێوازی پێ دەڵێن، پەیدا نەبووبوو. ئەسپەکانی مامۆستای گەورە قەرە وەلی ماوەی سەد و دە ساڵ لەلایەن سەرجەم نیگارکێشانی موسڵمانەوە لاسایی کرانەوە. بۆ خۆیشی، دوای دۆڕانی ئەبو سەعید و ڕووخاندنی نیگارخانەکەی، لە سەمەرقەندەوە دەچێتە قەزوین. دوای دوو ساڵ، بەتاوانی ئەوەی ویستوویەتی بۆ نیازی خراپ ئایەتی "ئایا کوێر و چاوساغ دەبن بەیەک"ی قورئانی پیرۆز پوچەڵ بکاتەوە، سەرەتا کوێر دەکرێت و پاشان لەسەر دەستی سەربازەکانی نیزام شای نەوجەوان دەکوژرێت.

لەوانە بوو چیرۆکی سێیەمیشم بگێڕابایەوە و باسی خۆ کوێرکردنی بەهزاد، بڕیاری بۆ هەرگیز دوورنەکەوتنەوەی لە هەرات، بۆچی هیچ نیگاری نەکێشابوو کاتێک بەزۆر بۆ تەورێز برابوو، پابەندبوونی بەشێوازی نیگارخانەوە و فرە ئەفسانەی تریش، کە لە مامۆستا عوسمانم بیستبوون، بۆ شاگرد خۆشنووسە چاو جوانەکە بکردایە، بەڵام هۆشم چووبووە سەر چیرۆکبێژی ئەفەندی. ئەرێ لە کوێوە دەمزانی ئەم ئێوارەیە بەسەرهاتی ئیبلیس دەگێڕێتەوە؟



لە ناخەوە ویستم بڵێم: "ئەوەی یەکەمجار –من–ی بەزماندا هاتووە، ئیبلیسە. ئیبلیس خاوەنی شێوازە. هەر ئەویشە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای لەیەکتر دابڕیوە."

چاوانم لێک نا و نیگاری ئیبلیسم وەک ئەوەی لە دڵمەوە دەرچوو، لەسەر کاغەزە هەرزان بەهاکەی چیرۆکبێژ کێشا. کاتێک من نیگارەکەم دەکێشا، چیرۆکبێژ خۆی و شاگردی، نیگارکێشانی تر و فزوولییەکان پێ دەکەنین و منیان تاو دەدا.

ئایا بەڕای ئێوە من شێوازێکم هەیە، یاخۆ ئەمە کاریگەریی شەرابەکەیە؟

# 47

## من ئیبلیسم

من حەزم لە بۆنی بیبەری سووری سوورەوەکراو لە ڕۆنی زەیتووندا، بارینی باران بەسەر دەریای مەند لە گزنگی بەیاندا، دەرکەوتنی لەناکاوی ژنێک لە پەنجەرەی کراوەدا، بێدەنگی، بیرکردنەوە و پشوودرێژییە. متمانەم بەخۆم هەیە و بێ باکم لەو شتانەی زۆربەی کات لەبارەی منەوە دەگوترێن. بەڵام ئەم ئێوارەیە هاتمە ئەم قاوەخانەیە تا برایانی نیگارکێش و خۆشنووسم لەمەڕ چەند قسەیەکی پاشملە و درۆ و دەلەسە و ورتەورتەوە وشیار بکەمەوە.

بێگومان دەزانم، تەنیا لەبەرئەوەی منم دەدوێم، ئێوە ئامادەن ڕێک باوەڕ بەپێچەوانەوەی قسەکانم بکەن. بەڵام بەشی ئەوە ئاقڵن بزانن پێچەوانەی تەواوی قسەکانی من گشت کاتێک ڕاست نین و بەئەندازەی ئەوەش هەستیارن بەتەواوی گوێ بۆ قسەکانم ڕابگرن تا تووشی خەیاڵشکان نەبن. ئێوە دەزانن پەنجا و دوو جار ناوم لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە و ناوم یەکێکە لەو ناوانەی زۆرترین ئاماژەی پێ دراوە.

باشە، با لە کتێبی خوا، لە قورئانی پیرۆزەوە دەست پێ بکەین. ئەوەی لەوێدا لەبارەی منەوە گوتراوە، سەرلەبەری ڕاستە. دەمەوێت بزانن کاتێک ئەم قسەیە دەکەم، بێ فیزیم نواندووە، چونکە پرسی شێوازیش لە ئارادایە. بچووک پێشاندانی من لە قورئانی پیرۆزدا، هەمیشە ئازاری داوم. ئەم ئازارە شێوازی ژیانی منە. من لێرە ئەمە تاوتوێ ناکەم.



بەڵێ، خوا لە پێش چاوی ئێمەی فریشتەگەل مرۆڤی ئافراند. پاشان داوای لێ کردین کڕنۆشی بۆ ببەین. بەڵێ، وەک لە سوورەتی "الأعراف"دا نووسراوە، سەرجەم فریشتەکان کڕنۆشیان برد، بەڵام من ناڕازی بووم. بەبیرم هێنایەوە ئادەم لە گڵ و منیش لە مادەیەکی بەنرختر، وەک هەمووتان دەزانن، لە ئاگر ئافرێندراوم. کڕنۆشم بۆ مرۆڤ نەبرد. خواش منی بە "ڕێ لێ بزربوو" دانا.

گوتی: "لە بەهەشت دەرچووە دەرێ. مافت نییە لێرە گەورەیی بنوێنیت."

گوتم: "تا قیامەت و هەستانەوەی مردووان مۆڵەتی ژیانم بدێ."

دایمێ. منیش گوتم تەواوی ئەو ماوەیە کار دەکەم بۆ بەلاڕێدابردنی نەوەی ئادەم، چونکە من لە سۆنگەی کڕنۆشنەبردنمەوە بۆ ئەو سزا دراوم. ئەویش گوتی ئەوانەی لە ڕێیان دەردەکەیت، ڕەوانەی دۆزەخیان دەکەم. خۆتان ئاگادارن ئێمە لەسەر ئەم کارەمان لەدژی یەکتر بەردەوامین. هیچ شتێکی زیاترم نییە بیخەمە سەر ئەم بابەتانە.

کەسانێک بانگەشە دەکەن ئەو کاتە پەیمانێک لە نێوان خوای مەزن و مندا داڕێژرابێت. بەپێی ئەم لۆجیکە، من سەر لە بەندەکانی خوا دەشێوێنم و لە تاقیکردنەوەیاندا هاوکاریی خوا دەکەم: ئەوانەی باشن، بڕیاری باش دەدەن و لە ڕێ لانادەن، ئەوانەشی خراپن، خۆیان ڕادەستی نەوس دەکەن، تاوان ئەنجام دەدەن و دەچنە دۆزەخ. ئەگەر هەموو کەسێک بچوایە بەهەشت، کەس ترسی نەدەما و کاری دنیا و دەوڵەت تەنیا بەنیازی باش ڕایی نەدەبوو. ئەوەی من کردم، زۆر گرینگ بوو، چونکە لەم دنیایەدا خراپە هێندەی باشە و خێریش بەئەندازەی شەڕ پێویستە. ئازاری شاراوەی من بریتی بوو لە "خراپ"بوونی من و هەرگیز وەرنەگرتنی مافی خۆم، ئەمە سەرباری ئەوەی نەزمی خوا لە سایەی مندا (مەگەر بۆچی مۆڵەتی پێ دابووم تا قیامەت بژیم؟) و بەدەستووری خوای مەزن پێک هاتبوو. کەسانی وەک هەلاجی مەنسوور و ئەحمەد غەزالیی برای ئیمام غەزالیی ناودار تا کۆتاییی ژیانیان لەبەر ڕووناکیی ئەم لۆجیکە لە بەرژەوەندیی مندا هەڵسوڕاون و بە نووسین و بەقسە کاریان گەیاندووەتە سنوورێک کە تاوانەکانی من بەو پێیەی بەدەستوور و ویستی خوا ئەنجام دەدرێن، ویستی خوایە و چاکە و خراپەش بوونی نییە، چونکە گشت

شتێک لە خواوەیە و تەنانەت منیش بەشێکم لە خوا.

هەندێک لەو بێ ئەقڵانە سزای خۆیان وەرگرت و لەگەڵ کتێبەکانیاندا سووتێنران و کوژران، چونکە بێگومان چاکە و خراپە هەیە، کێشانی سنوورێک لە نێوان ئەم دووانەدا ئەرکی هەموومانە، من -دووربێت- خوا نیم و منیش ئەو قسە قۆڕانەم نەخزاندووەتە مێشکی ئەو بێ ئەقڵانەوە، بگرە ئەوان خۆیان بیریان لەو شتانە کردبووەوە.

ئەمەش دەمهێنێتە سەر نارەزاییی دووەمم: من سەرچاوەی سەرجەم خراپە و تاوانەکانی دنیا نیم. زۆربەی مرۆگەل، بێ ئەوەی من هانم دابن و لەخشتەم بردبن و ڕاڕام کردبن، لەبەر تەماح و شەهوەت و بێ بڕیاری و نامەردیی خۆیان و بەشی هەرە زۆریشیان لە گەمژەییی خۆیانەوە تاوان و گوناە ئەنجام دەدەن. هەوڵی بڕێک لە سۆفییانی خوێندەوار بۆ داماڵینی من لە سەرجەم تاوان و گوناهەکانم، چەند کارێکی توڕەهاتە، دانانی منیش بە سەرچاوەی هەموو تاوانێک بەو ئەندازەیە پێچەوانەی قورئانی پیرۆزە. ئەوە من نیم ئەو میوە فرۆشەی قوڵی کڕیاری خۆی دەبڕێت و سێوی ڕزیوی پێ دەفرۆشێت، هەر منداڵێکی درۆزن، هەر کەسێکی سالووسکار، هەر پیرێکی بینەری خەیاڵی بێ ئابڕوو و هەر لاوێکی دەستپەڕ لێدەر فریو دەدەم. بگرە خوای مەزن لەم دووانەی دواییياندا هیچ خراپەیەک نابینێت ببێتە هۆی بیرکەوتنەوەی من. بێگومان من زۆر هەوڵ دەدەم بۆ ئەوەی گوناهی گران ئەنجام بدرێت، بەڵام بڕێک مەلا دەنووسن تەنانەت ئەو کەسانەی دەمیان داچەقاندووە و باوێشک دەدەن، ئەوانەی دەپژمن، تەنانەت ئەوانەی دەشترن، من لەخشتەم بردوون. ئەم شتانە وا دەگەیەنن ئەو کەسانە هیچ لە من نەگەیشتوون.

دەتوانن بڵێن جا با تێ نەگەن، ئەوسا تۆ دەتوانیت ئاسانتر فریویان بدەیت. ڕاستە، بەڵام منیش شکۆیەکەم هەیە و پێویستە بیرتانی بخەمەوە هەر ئەمەشە نێوانی منی لەگەڵ خوای مەزن تێک داوە. سەرباری ئەوەی لە دەیان هەزار کتێبدا نووسراوە کە من دەچمە هەموو بەرگێکەوە و بەتایبەتیش لە شێوەی ژنی جوانی هەوەس بزوێندا ڕێ بە باوەڕمەندان دەگرم، ئایا برایانی نیگارکێشم لێرە دەتوانن پێم بڵێن بۆچی هێشتا نیگاری من وەک بوونەوەرێکی ترسناکی دەموچاو ئاوڵاوی،



خوار و خێچ، شاخدار و کلکدار دەکێشن؟

بەمجۆرە هاتینە سەر کرۆکی پرسی بنەڕەتیمان: نەخش. ئاپۆڕەیەک کە کۆڵانەکانی ئەستەنبوڵیان پڕ کردووە و لەلایەن مەلایەکەوە، ناوەکەی ناڵێم بۆ ئەوەی نەبادا دواجار دڵتان بیەشێت، دنە دەدرێن و دەڵێن بانگدان بە مەقامەوە، کۆبونەوە لە تەکیە و زیکرکردن لە باوەشی یەکتردا و لە هۆش خۆچوون بەدەم گوێگرتن لە دەنگی سازەوە و قاوەخواردنەوە، پێچەوانەی فەرموودەی خوایە. هەندێک لەو نیگارکێشانەی لەو ئاپۆڕەیە دەترسن و ئێستا لێرە لەناوماندان، بیستم گوتوویانە نیگارکێشان لەسەر شێوازی فەرەنگی، بەفیتی من دەکرێت. بەسەدان ساڵە درۆی لە ژمارە نەهاتوو بەدەمی منەوە کراوە، بەڵام هیچ کامیان هێندەی ئەمە دوور نەبووە لە ڕاستییەوە.

با بگەڕێینەوە بۆ دەسپێکی هەموو شتەکان. لەبەرئەوەی هۆشی گشت کەسێک دەچێتە سەر ئەوەی من میوەی قەدەغەم دەرخواردی حەوا داوە، هەموو کەسێک دەسپێکی ڕاستەقینە لەبیر دەکات. نەخێر، سەرەتا لەو خاڵەشەوە دەست پێ ناکات کاتێک خوای مەزن منی بە ڕێ لێبزربوو دانا. دەسپێکی سەرجەم شتەکان بۆ خاڵێک دەگەڕێتەوە؛ ئەو، مرۆڤی پێشانی من و فریشتەکانی تر دا و ویستی کڕنۆشی بۆ ببەین، کاتێک فریشتەکانی تر کڕنۆشیان بۆ مرۆڤ برد، بڕیارێکی زۆر بەجێی من هەبوو:

## من کڕنۆش بۆ مرۆڤ نابەم.

ئایا بەڕای ئێوە ڕەوایە دوای ئافراندنی من لە ئاگر پێم بڵێت:

کڕنۆش ببە بۆ مرۆڤی ئافرێندراو لە کەرەسەیەکی بێ نرختر؟ براکانم، با ویژدانتان سەرپشک بێت و پێم بیڵێن. باشە، دەزانم هیچ شتێک لێرە لە نێوان خۆماندا نامێنێتەوە و (ئەو)یش گوێی لە گشت چرپەیەکە و خەمی ئەوەتانە ڕۆژێک دێت حسێبتان لێ بخوازێت و لەو ڕووەوە دەترسن. کەوابوو ناپرسم بۆچی ویژدانی پێتان داوە و دەڵێم هەقی خۆتانە بترسن و ئەم پرسیارەم و جیاوازیی نێوان ئاگر و گڵ لە بیر خۆم دەبەمەوە. بەڵام شتێک هەیە هەرگیز لە بیری ناکەم، بەڵێ بە شانازییەوە بیرم دەکەوێتەوە:

## من کڕنۆشم بۆ مرۆڤ نەبرد

ئەمە لە حاڵێکدا مامۆستایانی نوێی فەڕەنگ ئێستا ڕێک ئەم شتە دەکەن. نیگاری گشت شتێک وەک خۆی، نیگاری بەگ، قەشە، بازرگانانی دەوڵەمەند، تەنانەت ڕەنگی چاوی ژنان، پێستی خاویان، کەوانەی بێ هاوتای لێوانیان، سێبەری جوانی نێوان مەمکانیان، چرچ و لۆچی ناوچەوانیان، ئەنگوستیلەی قامکیان و مووی قێزەونی دەرپەڕیو لە گوێیانەوە دەکێشن و هەر بەوەندەشەوە ڕاناوەستن، بگرە وەک ئەوەی مرۆڤ بوونەوەرێکی شایەنی کڕنۆش بۆبردن بێت، ڕێک لە چەقی نیگارەکانی خۆیاندا جێگیری دەکەن و ئەم نیگارانە وەک بت بۆ پەرستن بە دیواردا هەڵدەواسن. ئایا مرۆڤ بوونەوەرێکی هێندە گرینگە تا بەو هەموو وردەکارییەکەوە، بە سێبەریشیەوە، نیگاری بکێشرێت؟ ئەگەر ماڵەکانی گەڕەکێک لە نیگاردا وەک هەڵەی بینینی چاوی مرۆڤ تا دەچێت بچووکتر بکێشرێت، ئایا بەواتای ئەوە نییە لەبری خوا، مرۆڤ دەخرێتە چەقی دنیاوە؟ خوای گەورە و بەدەسەڵات ئەم شتانە باشتر دەزانێت. بەڵام پێم وابێت ئێستا لاتان ڕوونە شتێکی چەند تووڕەهاتە کاتێک بانگەشەی ئەوە دەکرێت من بیرۆکەی ئەم نیگارانەم دابێ، منێک کە کڕنۆشبردنم بۆ مرۆڤ ڕەت کردووەتەوە و لەو ڕووەوە ئازار و تەنیایی زۆرم چێشتووە و لەبەرچاوی خوا کەوتووم و جنێوم پێ دراوە. بڕێک مەلا نووسیویانە و هەندێک پێشنوێژ گوتوویانە سەرجەم منداڵان بەهۆی منەوە دەستپەڕ لێ دەدەن و هەر منم هەموو کەس بە تڕین دەدەم. ئەم قسانە زیاتر دەچنە ئەقڵەوە وەک لەو قسە تووڕەهاتانەی لە بارەی نیگارەوە دەدرێتە پاڵم.

دەمەوێت لەمبارەیەوە دوایین شت بڵێم، بەڵام ڕووی قسەم لەو مرۆڤانەیە نییە کە لەبەر خولیای تەوش و تووڕەهات هەمیشە خەڵەفاون و ئالوودەی هەوەسی خۆدەرخستن و شەهوەت و پارەن. تەنیا خوای مەزن بە ئەقڵی بێ سنووری خۆی لە من تێ دەگات: مەگەر تۆ نەبووی کارێکی وات کرد فریشتەکان کڕنۆش بۆ مرۆڤ ببەن و هەر خۆت نەبووی مرۆڤت فێری لەخۆ باییبوون کرد؟ ئێستاش خۆیان ئەو شتانەی لە فریشتەکانی تۆوە فێری بوون، دەکەن و کڕنۆش بۆ یەکدی دەبەن و خۆیان دەخەنە چەقی دنیاوە. گشت کەسێک، تەنانەت بەندە هەرە ڕاستگۆکانیشت دەیانەوێت لەسەر شێوازی فەڕەنگی نیگاریان بکێشرێت. ئەنجامی ئەم بەخۆ شەیدابوونە، بەم نزیکانە وەردەگەڕێتە سەر لەبیرکردنی تۆ و من ئەمە وەک ناوی خۆم دەزانم. پاشانیش، هەرچی تاوانی لەبیرکردنی تۆ هەیە، دەیخەنە ئەستۆی منەوە.

چۆن بۆتان باس بکەم، بەئەندازەی ئەوەی پێشبینی دەکرێت، من باکم بەم هەموو شتە نییە؟ بێگومان بەپێشاندانی ئەوەی سەدان ساڵە سەرباری بەردەبارانکردنم بێ بەزەییانە، جنێو پێدان و بەنەفرەتکردن و تووک لێکردنم، هێشتا سپوساغم و لەسەر پێی خۆم ڕاوەستاوم. ئەگەر دوژمنانی هەڵچوو و ڕووکەشم، ئەوانەی بەهۆ و بێ هۆ جنێوبارانم دەکەن، بیریان بکەوتبایەوە خوای مەزن مۆڵەتی داوە تا قیامەت بژیم، ئەوا کاری هەموومان ئاسان دەبوو. خۆ ئەو تەمەنەی ئەوان دەتوانن لە خوای وەربگرن، بەئاستەم شەست حەفتا ساڵ تێ دەپەڕێنێت. دەشزانم ئەگەر بڵێم هەر هیچ نەبێت قاوە بخۆنەوە بۆ ئەوەی تەمەنتان درێژ بێت، هەندێکتان دەڵێن "مادام ئیبلیس ئەمەی دەوێت، با ئێمە تەواو پێچەوانەکەی بکەین" و ئەوانە هەرگیز قاوە ناخۆنەوە، یان خوار دەبنەوە و هەوڵ دەدەن قاوە بەسەر قوونی خۆیاندا بڕێژن.

پێ مەکەنن. کاکڵ نا، ڕواڵەتی بیر گرینگە. نەک نیگارکێش چی کێشاوە، بگرە شێوازی نیگارکێش گرینگە. بەڵام پێویستە ئەمانەش هیچ کاتێک ئاشکرا نەبن. دەمویست لە کۆتاییدا چیرۆکێکی ئەڤین بگێڕمەوە، بەڵام وەدرەنگ کەوتووین. مامۆستای چیرۆکبێژ کە ئەمڕۆ لەبری من قسەی کرد، بەڵێنی دا سبەی نا، دووسبەی، شەوی چوارشەم، کاتێک نیگاری ژنێک بە دیواردا هەڵدەواسێت، بەزمانی شیرینی خۆی ئەو چیرۆکی ئەڤینەمان بۆ بگێڕێتەوە.

# 48

## من شەکوورەم

لە خەونمدا باوکم بینی، شتێکی پێم دەگوت و من لێی حاڵی نەدەبووم. خەونێکی ترسناک بوو؛ هەشیار بوومەوە. شەوکەت و ئۆرهان لە هەردوولاوە توند باوەشیان پێدا کردبووم و لەبەر گەرمیی ئەوان، ئارەقەم دەردابوو. شەوکەت دەستی نابووە سەر سکم. ئۆرهانیش سەری تەڕبووی خۆی بە سنگمەوە نابوو. سەرەڕای ئەوەش، بێ ئەوەی ئەوان هەشیار بکەمەوە، توانیم لە نوێن و لە ژوورەکە دەربچم.

هەیوانم بڕی و بەکپی دەرگای ژووری قەرەم کردەوە. لەبەر ڕووناکیی مۆمدانەکەی دەستم، خۆی نا، پێخەوی سپیی ویم بینی چەشنی مردوویەکی کفنکراو لەو ژوورە تاریک و ساردەدا ڕاکشابوو. دەتگوت تیشکی مۆمدانەکەی دەستم دەکات و دەکۆشێت ناتوانێت بگاتە نوێنەکەی.

کاتێک زیاتر دەستم نزیک کردەوە، لەبەر تیشکی ڕەنگ نارنجیی مۆمەکە، ڕووی ماندوو و ڕیش دەرهاتوو و شانە ڕووتەکانی قەرەم بینی. بەباشی لێی نزیک بوومەوە، ئەویش چەشنی ئۆرهان، وەک کرم لوولی خواردبوو و خەوتبوو و هێمای کچێکی نووستوو بەسیمایەوە دیار بوو.

بەخۆم گوت: "ئەمە مێردی منە." هێندە دوور بوو لێم و پێم نامۆ بوو، هەستم کرد پەژیوانییەک هەناومی داگرت. ئەگەر خەنجەرێکم بەدەستەوە بوایە، دەمکوشت. نەک لەبەرئەوەی بەڕاستی دەمویست بیکوژم، تەنیا لەبەرئەوەی وەک ئەوەی هەموومان بەمنداڵی کردوومانە، بیرم دەکردەوە چۆن دەبێت ئەگەر بیکوژم. نە باوەڕم بەوە



هەبوو ساڵانێک بەیادی منەوە ژیابێت و نە باوەڕیشم بەهێمای بێگەردی زارۆکانەی سەر ڕووی هەبوو.

نووکی پێی خاوسم لە شانی ژنی و هەشیارم کردەوە. بەبینینی من، زیاتر لەوەی بکەوێتە بەر کاریگەری و جۆش و خرۆش، ڕێک وەک خۆم دەمویست، ئەگەر بۆ تاوێکیش بێت، ترسا. پێش ئەوەی بەتەواوی خەو بەری بدات، پرسیم:

"باوکم بینی لە خەونمدا. شتێکی زۆر ترسناکی پێ گوتم: تۆ کوشتووتە..."

"کاتێک باوکت کوژرا، مەگەر ئێمە پێکەوە نەبووین؟"

گوتم: "منیش ئەمە دەزانم، بەڵام تۆ دەتزانی باوکم بەتەنیا لە ماڵەوە دەمێنێتەوە."

"نەمدەزانی. تۆ منداڵەکانت لەگەڵ خەیرییەدا ڕەوانە کرد. تەنیا خەیرییە و لەوانەیە ئەستەریش پێی زانیبێت. خۆیشت باشتر دەزانی کێی تر پێی زانیبێت."

"جاروبار هەست دەکەم دەنگێک لە ناخمەوە دەیەوێت پێم بڵێت بۆچی گشت شتێک بەئاقاری خراپەدا چووە و خوازیارە ڕازی ئەم هەموو بەڵا و نەگبەتییەم بۆ بدرکێنێت. دەمیش دەکەمەوە تا ئەو دەنگە بێتە دەرێ، بەڵام وەک ئەوەی خەون ببینم، دەنگ لە قوڕگم دەرناچێت. تۆش چیدی ئەو قەرە باش و بێگەردەی ناسیاوی سەردەمی منداڵیم نیت."

"خۆیشت و باوکیشت ئەو قەرە بێگەردەتان قاو دا."

"ئەگەر بۆ تۆڵەسەندنەوە لە باوکم منت خواستبێت، ئەوا تۆڵەت کردەوە. بەڵام ڕەنگە لەم سۆنگەیەوە بێ منداڵەکان هیچ تۆیان خۆش ناوێت."

گوتی: "دەزانم." بەڵام ئەمەی بەخەمەوە نەگوت. "شەو، پێش ئەوەی بنووم و کاتێک تۆ لە خوارەوە بوویت، ئەوان کە منیش بتوانم گوێم لێ بێت، دەیانگوت: قەرە، قەرە، درزی قوونم قەرە."

لە پێشدا گوتم: "لێت بدانایە." بەڕاستیش دەمویست لێی بدانایە. بەڵام دوایی بەشپرزەیی گوتم: "دەستیان لێ بەرز بکەیتەوە، دەتکوژم."

گوتی: "ئا وەرە جێگەوە، ڕەق بوویتەوە."

"لەوانەیە هەرگیز نەیەمە ئەو جێگەیەوە. لەوانەیە هەردووکمان بەم زەماوەندە

کارێکی چەوتمان کردبێت. دەڵێن ئەو مارەبڕینە بەتاڵە. شەو پێش خەوتنم گوێم لە دەنگی پێی حەسەن بوو. لەبیرت نەچێت، کاتی ژیانم لەگەڵ پیاوی خوا لێخۆشبوومدا، سالانی ساڵ گوێم لە دەنگی پێی حەسەن بووە. منداڵەکان خۆشیان دەوێت. بێ بەزەییەشە. شمشێرێکی سووری هەیە. خۆتی لێ بپارێزە."

شتێکی فرە سەخت و ماندووم لە نیگای قەرەدا بینی و حاڵی بووم ناتوانم بیترسێنم.

گوتم: "شادمانتر و خەمگینتری هەردووکمان هەر تۆی. من بۆ ئەوەی بەدبەخت نەبم و منداڵەکانم بپارێزم، کەللەڕەقی دەنوێنم. تۆش بۆ خۆسەلماندن کەللەڕەقی دەکەیت، نەک لە سۆنگەی خۆشویستنی منەوە."

بەدوور و درێژی بۆی گێڕامەوە تا چ ڕادەیەک منی خۆش دەوێت و بەردەوام لە کاروانسەرا خاڵییەکان و لە چیا ڕووتەڵەکان و لە شەوانی بەفربارینداا بیری لە من کردووەتەوە. ئەگەر ئەمانەی نەگوتایە، منداڵەکانم لەو خەو هەڵدەستاند و هەر بەو شەوە دەگەڕاینەوە ماڵی مێردی پێشووم. لەبەرئەوەی لە ناخەوە بۆم هاتبوو، لەپڕ گوتم:

"جاروبار پێم وایە مێردی پێشووم بۆی هەیە هەر ئان و ساتێک بگەڕێتەوە. ترسی ئەوەم نییە نیوەی شەو لەگەڵ تۆ لە ژوورێکدام و منداڵەکانم پێ بزانن، ترسی ئەوەم هەیە هەر هێندەی چووینە باوەشی یەکترەوە، ئەو لە دەرگا بدات."

لە دەرەوە، لای دەرگای حەوشەوە، قیژە و هاواری پشیلەی بەشەڕ هاتوو هات. دواتر بێدەنگییەکی درێژ هاتە ئاراوە. تاوێک وام زانی هەنسک دەدەم. نەدەمتوانی مۆمدانەکەی دەستم بخەمە سەر مێزەکە و نەدەمتوانی بگەڕێمەوە ژوورەکەم بۆ کن منداڵەکانم. بەخۆمم گوت تا بەتەواوی قایل نەبم دەستی لە کوشتنی باوکمدا نییە، ئەم ژوورە بەجێ ناهێڵم.

بە قەرەم گوت: "بەچاوی سووک بۆمان دەڕوانی. لەو کاتەوە منت هێناوە، لووتت کردووە بە ئاسماندا. لەبەر نەگەڕانەوەی مێردم، دڵت پێمان دەسووتا. ئێستاش لەبەر مردنی باوکم بەزەییت پێماندا دێتەوە."

بەوردی گوتی: "شەکوورە خاتوون، خۆیشت دەزانی ئەمانە ڕاست نین. گشت



شتێک بۆ تۆ دەکەم." پێم خۆش بوو بەمجۆرە دەستی بە قسان کرد.

"کەوابوو لە نوێنەکەت وەرە دەرێ و وەک من بەپێوە ڕاوەستە."

بۆچی گوتبووم چاوەڕێی شتێکم؟

بەشەرمەوە ئاماژەی کرد بۆ لێفەکە و جلی خەوتنی بەری و گوتی:

"ناتوانم."

مافی خۆی بوو. بەڵام سەرباری ئەوەش، لەبەرئەوەی بەقسەی نەکردم، تووڕە بووم. گوتم: "پێش کوشتنی باوکم وەک پشیلەیەکی شیر ڕشتوو خۆت بەم ماڵەدا دەکرد. ئێستاش کاتێک دەڵێی شەکوورە خاتوون، خۆیشت باوەڕت بەم قسەیەت نییە و پێ دەچێت بتەوێت ئێمەش بزانین باوەڕت پێ نییە."

لەبەر هەڵچوونم نا، لەتاو سەرما، وەک ئەوەی شەختەیان بە ڕان و پشت و ملمەوە نابێت، دەلەرزیم.

گوتی: "وەرە جێگەمەوە و ببە بە ژنم."

گوتم: "نامەردی بکوژی باوکم چۆن دەدۆزرێتەوە؟ ئەگەر دۆزینەوەی کاتێکی درێژ بخایەنێت، مانەوەی من لەگەڵ تۆ لەم ماڵەدا ڕاست نابێت."

"لە سایەی تۆ و ئەستەردا، مامۆستا عوسمان گشت سەرنجی خۆی خستووەتە سەر ئەسپەکان."

"مامۆستا عوسمان دوژمنی خوێنخۆری باوکی خوا لێخۆشبووم بوو. باوکم ئێستا کاتێک بەبانانەوە دەبینێت بۆ دۆزینەوەی بکوژی وی، ناچاری هاوکاریی مامۆستا عوسمانین، ئازار دەچێژێت."

لەپڕ لە جێگە دەرپەڕی و ڕووی لە من کرد. منیش نەمتوانی تەنانەت خۆم لە جێی خۆم بجووڵێنم. بەڵام بەپێچەوانەی بۆچوونی منەوە، مۆمی مۆمدانەکەی دەستی منی بەدەست کوژاندەوە و ڕاوەستا. تاریکیی ئەنگوستەچاو هەموو شوێنێکی داپۆشی.

بەچرپە گوتی: "باوکت ئیدی هەرگیز ناتوانێت بمانبینێت. هەردووکمان تەنیاین. شەکوورە، ئێستا پێم بڵێ: پاش ئەوەی لە دوای دوازدە ساڵ گەڕامەوە ئێرە، تۆ وات لێ کردم هەست بکەم منت خۆش دەوێت و دەتوانیت لە دڵی خۆتدا جێگەم بکەیتەوە.

دواتر زەماوەندمان کرد. بەڵام لەو کاتەوەی زەماوەندمان کردووە، خۆت لە خۆشویستنی من دەدزیتەوە."

بەچرپە گوتم: "لە ناچاری شووم پێت کرد."

بێبەزەییانە هەستم دەکرد هەر وشەیەکم، فزوولی گوتەنی، وەک بزمار لە جەستەی، کە لەو تاریکییەدا ڕێک لە بەرامبەرم ڕاوەستابوو، دەچەقی.

دیسان بەچرپە گوتم: "ئەگەر حەزم لێت بوایە، بە منداڵی خۆشم دەویستی."

گوتی: "ئەی شۆخی ناو تاریکی، لە کونی دیوارەوە سەیری گشت نیگارکێشانی هاتوچۆکەری ماڵی خۆتان کردووە و ناسیوتن. پێم بڵێ بە بۆچوونی تۆ بکوژ کامیانە؟"

خۆشحاڵ بووم بەوەی هێشتا دڵگەش بوو. مێردم بوو.

"سەرمامە."

نایەتەوە بیرم ئەمەم گوتبێت. دەستمان کرد بە ڕاموسانی یەکتر. کاتێک هێشتا لە تاریکیدا مۆمدانەکەم بەدەستەوە بوو، زمانی نەرمی قەدیفە ئاسایم نایە دەمم. فرمێسکەکانم، قژم، جلوبەرگی نووستنم، لەرزینم و هەموو شتێک، تەنانەت جەستەی ئەویش جوان بوو. نووساندنی لووتم بەو سەرمایە بە ڕوومەتی گەرمی ئەوەوە و گەرمبوونەوەشی خۆش بوو، بەڵام شەکوورەی ترسنۆک خۆی ڕاگرت و لە کاتی ماچ و موچدا خۆی لەبیر نەکرد و بیری لە مۆمدانەکەی دەستی و باوکی بە بان سەرانەوە و مێردی کۆنی و منداڵانی لە جێگەدا نووستووی کردەوە.

بەدەم قیژاندنەوە گوتم: "کەسێک لە ماڵەوەیە." پاڵم بە قەرەوە نا و چوومە هەیوان.



# 49

## من ناوم قەرەیە

لە تاریکاییی بەرەبەیاندا، بێ ئەوەی کەس بمبینێت، بێدەنگ وەک میوانی کەتنباز لە ماڵ دەرچووم و دوور و درێژ بە کۆڵانە قوڕاوییەکاندا ڕۆیشتم. لە حەوشی مزگەوتی بایەزید دەستنوێژم گرت و چوومە مزگەوتەوە و نوێژم دابەست. بەساڵاچوویەک بە هونەرێکەوە، کە مەگەر مرۆڤ بە چل ساڵ بتوانێت بەدەستی بخات، بەدەم نوێژکردنەوە درێژەی بە خەوتنیش دەدا. جگە لە ئەو و مەلا ئەفەندی، کەسی تر لە ژوورەوەی مزگەوت نەبوو. هەروەک چۆن جاری وا هەیە لە خەونی شەوان و بیروەریی ناشادماندا هەست دەکەین خوا بۆ ساتێک سەرنجی لێمان داوە و ئێمەش بەئومێدی ئەو کەسەی بەکەیفەوە سکاڵانامەیەک دەگەیەنێتە دەستی سوڵتان، داوای شتێکی لێ دەکەین: منیش لە خوا پاڕامەوە ماڵێکم بداتێ پڕ بێت لە کەسانێک منیان خۆش بوێت.

کاتێک گەیشتمە ماڵیان، هەستم کرد مامۆستا عوسمان بە هەفتەیەک لە هزری مندا هێدی هێدی جێی زاوای خوا لێخۆشبوومی گرتووەتەوە. لە زاوام چەپتر و دوورتر بوو بۆ من، بەڵام باوەڕی کتێب نەخشاندنی مامۆستا لە هی زاوام قوڵتر بوو. مامۆستا عوسمان بە کەسێک نەدەچوو ساڵانێکی درێژ لەناو نیگارکێشاندا بای ترس و شەیدایی و ئەڤینی هەڵکردبێت، بگرە زیاتر لە دەروێشێکی بەستەزمان دەچوو.

کاتێک ئەو بە پشتی کەمێک کۆماوەوە بەسەر ئەسپەوە بوو و منیش بەپشتی

تۆزێک چەماوەوە لە تەنیشت ئەسپەکەوە ڕێم دەکرد و لە ماڵی مامۆستاوە بۆ کۆشک دەچووین، پێ دەچێت وەک دەروێشی پیــــر و مـــــوریدی لاوی ناو نیگارە هــەرزان بەهاکانی خەملێنەری چیرۆکە دێرینەکان چووبین.

لە کۆشک، سەرگەورەی پاسەوانان و پیاوەکانیمان لە خۆمان بەکەیفتر و ئامادەتر بینی. لەبەرئەوەی سوڵتانمان دڵنیا بوو لەوەی ئێمە سەرلەبەیانیی ئەمرۆ سەیری نیگارەکانی ئەسپی دەستکردی هەرسێ مامۆستای نیگارکێش دەکەین و نیگاری بەپەلە کێشراوی بکوژی نارەسەن دەدۆزینەوە، فەرمانیان دابوو تەنانەت بێ پرس پێکردنی خۆیان، ئەو نامەردە ئەشکەنجە بدرێت. بەمجۆرە، ئێمەیان نەبرد بۆ کانی و حەوزی بەردەم جەلاد تا هەمووان ببینن و پەندی لێ وەربگرن، بگرە براینە ماڵێکی بچووک و پەرپووتی گۆشەی ئەوپەڕی باخچەی تایبەت. بۆ لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەی نهێنی و ڕووداوەکانی هەڵواسین، ئەم ماڵە بەباشتر دەزانرا.

لاوێکی زەریف و ناسک، کە بۆ ئەوە نەدەشیا پیاوی سەرگەورەی پاسەوانان بێت، بەجووڵەی بەخۆباوەڕەوە سێ پەڕەی لەسەر مێزێک دانا.

کاتێک مامۆستا عوسمان دەستی بۆ دەرهێنانی زەڕەبینەکەی برد، دڵم دەستی بە ترپەترپ کرد. زەڕەبین و چاوی، کە هەمیشە لە هەمان دوورییەوە ڕای دەگرت، ڕێک وەک ئەوەی هەڵۆیەک بێت و بە زەرافەت بەسەر کێڵگەیەکدا بفڕێت، هێدی هێدی بەسەر هەر سێ نیگاری شاهانەی ئەسپدا گێڕا. چەشنی هەڵۆیەک مامزێکی نێچیری دیبێت، تاوێک لەسەر لووتی ئەسپەکان خاوی دەکردەوە، بەڵام بێ ئەوەی ڕەوتی خۆی تێک بدات.

دواتر بە خوێنساردییەوە گوتی: "نییە."

سەرگەورەی پاسەوان گوتی: "چی نییە؟"

منیش وام دەزانی مامۆستای گەورە کارەکە بەهەند وەردەگرێت و هەر لە یاڵەوە تا سم، لە هەر خاڵێکی ئەسپەکان ورد دەبێتەوە.

مامۆستا عوسمان گوتی: "بکوژی نارەسەن هیچ جێ پەنجەیەکی لەدوای خۆی جێ نەهێشتووە. لەم نیگارانەوە ڕوون نابێتەوە داخۆ کێ نیگاری ئەسپی خەنەیی کێشاوە."



زەڕەبینەکەی ئەوم هەڵگرتەوە و سەیری کونە لووتی ئەسپەکانم کرد: مامۆستام لەسەر ماف بوو. شتێکی هاوشێوەی ئەو کونە لووتە سەیرەی ئەسپی خەنەیی کێشراو بۆ کتێبەکەی زاوام، لەو سێ ئەسپەدا نەبوو.

لەو کاتەدا هۆشم چووە سەر ئەشکەنجەدەرانی ڕاوەستاو لە دەرەوە بە ئامێرێکەوە و من هەرچەندی کردم سەرم لە چۆنیەتیی بەکارهێنانی ئەو ئامێرە دەرنەچوو. کاتێک هەوڵم دەدا لە درزی دەرگاوە سەیریان بکەم، بینیم یەکێکیان وەک ئەوەی جنۆکە دەستی لێ وەشاندبێت، بەرەو پاش ڕای کرد و لەپشت دار توویەکەوە خۆی مەڵاس دا.

ئا لەو دەمەدا بوو سوڵتانی کۆڵەکەی جیهانمان وەک تیشکێکی ڕووناککەرەوەی بەرەبەیانی خۆڵەمێشی خۆی بەژووردا کرد. مامۆستا عوسمان دەستبەجێ بۆی ڕوون کردەوە نەیتوانیوە هیچ شتێک لەم نیگاری ئەسپانە هەڵکرێنێت. سەرباری ئەوەش، کۆڵی نەدا تا سەرنجی سوڵتانمانی لەم نیگارانەی ئەسپی شاهانەدا ڕاکێشایە سەر هەستانەوەی سەر هەردوو لاقی یەکێک لە ئەسپەکان و جوانکاری و زەرافەتی وەستانی ئەویتریان و شکۆ و ویقاری ئەسپی سێیەم، کە تەنیا لە کتێبە زۆر دێرینەکاندا دەبینرێت. هەمان کات پێشبینی کرد دانە بەدانەی نیگاری ئەسپەکان بەدەستی کام نیگارکێش کێشراوە. ئەو لاوەی لە شەودا دەرگا بەدەرگا بەسەر ماڵی نیگارکێشاندا گەڕابوو، پێشبینییەکەی مامۆستا عوسمانی پشتڕاست کردەوە.

مامۆستا گوتی: "سەرتان سووڕ نەمێنێت ئەگەر نیگارکێشانم وەک ناو لەپی دەستی خۆم بناسم. بەڵام سەرم لەوە سوڕماوە چۆن هێڵێکی بە من نامۆ لە دەستی یەکێک لەو نیگارکێشانەی وەک ناو لەپی دەستی خۆم دەیانناسم، دەرچووە. هیچ ناتەواویی نیگارکێشێک بێ بناخە نییە."

سوڵتانمان گوتی: "واتا؟"

"حەزرەتی سوڵتانی جیهانپەنا و خاوەن شکۆ، بەبۆچوونی من، ئەم واژۆ نهێنییەی لە لووتی ئەم ئەسپە خەنەییەدا دەیبینن، کێماسییەکی بێ واتا و تورەهاتی نیگارکێش نییە، بگرە شتێکە ڕیشەی بۆ کۆن دەگەڕێتەوە، بۆ نیگاری تر، بۆ

شێوازگەلی تر و لەوانەیە بۆ ئەسپی تریش. ئەگەر پەڕەی ئەو کتێبە دانسقانەی تەمەنیان سەدان ساڵە و ئێوە لە گەنجینە و لە ژێرزەمینی بە قفڵ لەسەر قفڵ کلۆمدراو و لە سندووقی ئاسندا شاردووتانەتەوە، هەڵبدەینەوە، لەوانەیە بۆمان ڕوون بێتەوە ئەو شتەی ئەمڕۆ ئێمە بە هەڵەی دەزانین، شێواز بێت و دەتوانین بیبەینەوە سەر قەڵەمی یەکێک لە سێ نیگارکێشەکانمان."

سوڵتان بە سەرسوڕمانەوە گوتی: "دەتەوێت بچیتە گەنجینەی ئەندەروون؟"

مامۆستام گوتی: "بەڵێ."

ئەمە داخوازێک بوو هێندەی داخوازی چوونە ژوورەوەی حەرەمسەرا بێ پەروا بوو. هەمان کات ئەمەشم بۆ ڕوون بووەوە: باڵەخانەکانی حەرەمسەرا و گەنجینە وەک ئەوەی لە دوو گۆشەی هەرە دڵگیری حەوشی ئەندەروونی بەهەشتیی کۆشکی سوڵتانمان بنیات نرابوون، بەهەمان شێوە لە دوو گۆشەی هەستیاری ڕۆحی سوڵتانماندا جێیان گرتبوو.

هەوڵم دا بە سیمای جوانی سوڵتانماندا، کە تازە بوێریم دابووە بەر خۆم سەیری بکەم، بۆم دەربکەوێت چ دەقەومێت، کەچی ئەوان لەناکاو ڕۆیشتن. ئایا بەڕێزیان تووڕە و دڵگران بوون؟ تۆ بڵێی لەبەر ئەم بێ ئابڕووییەی مامۆستام هەر هەموومان، تەنانەت گشت نیگارکێشانیش سزا نەدرێین؟

گاڤێک سەیری سێ نیگاری ئەسپەکەی پێش خۆمم دەکرد، هێنامە بەرچاوم جارێکی تر شەکووره نابینم و بێ ئەوەی سەرجێیی لەگەڵدا بکەم، دەکوژرێم. ئەم ئەسپە دانسقانە، سەرباری گشت جوانییەکانیان، ئێستا من پێم وابوو لە جیهانێکی زۆر دوورەوە دەرچووبن و هاتبن.

هەروەک چۆن بە منداڵی وەرگرتنی مرۆڤ لە ئەندەروون و گەورە بوون و پێگەیشتن و بەسەربردنی ژیانی لە دڵی کۆشکدا واتای بوون بە کۆیلەی سوڵتانمان و مردن لە پێناوی ویدا دەگەیەنێت، لەو بێدەنگییە ترسناکەدا زۆر باش ئەوەم بە ئەقڵمدا هات کە کێشانی نیگاریش واتای بوون بە کۆیلەی جوانییەکانی خوا و مردن لەو پێناوەدا دەگەیەنێت.

زۆر دواتر، کاتێک پیاوەکانی سەرگەورەی پاسەوانان ئێمەیان دایە پێش بۆ



سەرەوە بەرەو دەرگای ناوەڕاست، مردنم لە خەیاڵ بوو؛ بێدەنگیی مردن. بەڵام کاتێک بە "باب السلام"ی شوێنی هەڵواسینی دەیان پاشادا دەرباز بووین، پێ دەچوو دەرگاوانان ئێمەیان هەر نەبینیبێت. نە مەیدانی دیوان، کە دوێنێ دەمگوت بەهەشت خۆیەتی و بەبینینی ئاوی چاوم داهاتبوو، نە قوولە و نە تاوسەکانیش نەیانجوولاندم. حاڵی بووم زیاتر دەبرێینە ژوورەوە، بۆ ناو ئەندەروونی دڵی نهێنیی سوڵتانمان.

بەمجۆرە، بە دەرگای وادا تێ پەڕین تەنانەت وەزیرانی پایەبڵندیش ناتوانن بێ مۆڵەت ڕووی تێ بکەن. چەشنی منداڵێک چووبێتە داستانێکەوە، بۆ ئەوەی چاوم بەو شاکار و جانەوەرانەی لە بەردەمم قووت دەبنەوە، نەکەوێت، چاوم لە زەوی هەڵنەدەبڕی. تەنانەت نەمتوانی سەیری ژووری پێشوازیش بکەم. سەرباری ئەوەش تاوێک چاوم لای کرد بەلاوە و نیگام چووە سەر دیوارەکانی حەرەمسەرا و دار چنارێکی سادەی هاوشێوەی هەر دارێکی تر و پیاوێکی باڵابەرز. کابرا سەڵتەیەکی پرشنگداری لە ئەتڵەسی شین دووراوی لەبەردا بوو. بە نێوان ستوونە بەرزەکاندا تێ پەڕین. لەبەردەم دەرگایەکی گەورە و ڕازاوە و گومەزداری گران ڕاوەستاین. چەند ئاغایەکی سەڵتە دروەشاوە لە شیپیانەی دەرگاکەدا ڕاوەستابوون و یەکێکیان خۆی بەسەر قفڵەکەدا چەماندبووەوە.

گەورەی خەزنەداران چاوی بڕییە ناو چاومان و گوتی: "چ بەختەوەرن لەبەرئەوەی حەزرەتی سوڵتانمان دەستووری داوە ببرێنە ئەندەروون. سەیری کتێبی هیچ کەس نەدیوو و پەڕەی زێڕین و نیگاری لە وزەی ئەقڵ بەدەر دەکەن و وەک ڕاوچی لە شوێنپێ دەگەڕێن. سوڵتانم فەرمانی دا بیرتان بخەمەوە سێ ڕۆژ مۆڵەتی بە مامۆستا عوسمان داوە و ڕۆژی یەکەم تێ پەڕی. مامۆستا لە ماوەی دوو ڕۆژدا، تا نیوەڕۆی پێنجشەم، نارەسەنی ناو نیگارکێشان دەدۆزێتەوە و پێمان دەڵێت. خۆ ئەگەر بۆی نەدۆزرایەوە، ئەوا سەرگەورەی پاسەوانان بە ئەشکەنجە لەم کارە دێتە دەرێ."

بۆ ئەوەی هیچ کلیلێکی تری تێ نەخرێت، کونی قفڵەکە مۆر کرابوو. سەرەتا زەرفی مۆری سەر قفڵە هەڵواسراوەکەیان لابرد. کێخوای خەزێنە و دوو ئاغا بەئاماژەی سەر ڕایان گەیاند مۆر لە جێی خۆی بووە. مۆر دڕێندرا، کاتێک کلیل کرا

به کوندا، له بێدەنگییەکدا کە هەموومان سەرنجمان دابوویێ، قفڵ کرتەی لێوە هات و کرایەوە. ڕووی مامۆستا عوسمان بەجارێک ڕەنگی خۆڵەمێشیی لێ نیشت. کاتێک تاکێکی دەرگای تەختەی نەخشێندراو خرایە سەرپشت، دەتگوت تیشکێکی ڕەشی پاشماوەی زەمانێکی زۆر دێرین لە ڕووی مامۆستای دا.

گەورەی خەزنەداران گوتی: "لەخۆڕا نییە سوڵتانم داوای گەورەی نووسیاران و دەفتەردارانی تۆمارکەری شتومەکی کردووە. پارێزەری کتێبیش مردووە و کەسێکی تر نییە لەبری ئەو کاری کتێب ڕایی بکات. بۆیە سوڵتانمان دەستووری دا تەنیا جەزمی ئاغا لەگەڵتاندا بێتە ژوورێ."

ئەمە گرگنێکی چاو دەرەوشاوە بوو. تەمەنی، لایەنی کەم حەفتا ساڵی دەنواند. سەرپۆشی سەری وەک بابڕکی کەشتی دەچوو و لە خۆی ناقۆڵاتر بوو.

"جەزمی ئاغا حسێبی ماڵی خۆی بۆ ژوورەوە دەکات. لە هەموو کەس باشتر بە شوێنی کتێبەکان و گشت شتێکی تر دەزانێت."

بستەبالای بەسالاچوو لەخۆبایی نەبوو. چاوی بە مەقاڵەیەکی پایە زیوین و دەستشۆرێکی دەسک بە گەوهەر خەملێندراو و بەو قوتیلکە و مۆمدانانەدا دەگێڕایەوە کە لاوانی نەزانی گەنجینە دەیانگواستنەوە.

گەورەی خەزنەداران گوتی دیسان دەرگامان لەسەر دادەخرێت و بە مۆری حەفتا ساڵەی یاوز سوڵتان سەلیم قفڵ دەدرێت. دوای نوێژی ئێوارە، بەئامادەبوونی ئاپۆڕەی ئاغایان و بەبەرچاوی ئەوانەوە سەرلەنوێ مۆر هەڵدەگیرێت و دەرگا دەکرێتەوە. داوای کرد ئاگامان لە خۆمان بێت "بەهەڵە" شتێک نەکەوێتە جلوبەرگ و پۆشاک و گیرفان و پشتوێنەکانمانەوە، چونکە لە دەرچووندا تا سەر دەرپێکانمان دەپشکێندرێت.

بەنێو ئاغایانی ڕیزبوودا چووینە ژوورێ. ژوورەوە سارد و سڕ بوو. دوای ئەوەی دەرگا داخرا، لەپڕ تاریکی باڵی بەسەر گشت شتێکدا کێشا و هەستم بە بۆنی کەڕوو و تۆز و شێ کرد و بۆنەکە گەروومی تۆزاندەوە. ئەو ناوە بەسەریەکدا شێوابوو؛ شتومەک، سندووق، کڵاوزێ و هەموو شتێک بەسەریەکدا ڕژابوون و تۆپەڵ بووبوون. هەستێکی وام لەکن درووژا وەک ئەوەی لە زۆر نزیکەوە سەیری



شەڕێکی گەورە بکەم.

چاوانم لەگەڵ ڕووناکییەکی سەیر ڕاهاتن کە لە نێوان قەفەسی ئاسنینی ئەستووری پەنجەرەکانی سەرەوە، لەو پلیکانانەی بەدرێژاییی دیوارە بەرزەکان هەڵواسرابوون و دەگەیشتنە نهۆمی ناوەڕاست و لە درزی تەختەی شوێنی گەڕانی نهۆمی دووەمەوە لە هەموو شوێنێکی دەدا. ئەم ژوورە لەبەر ڕەنگی قوماشی قەدیفە و ڕایەخ و کلیم سوور دەچووەوە. بە نەوازییەوە هەستم بەئەو چوونە شەڕ و شەڕ و خوێنڕشتن و شار تالانکردن و کۆتاییی ئەو گەنجینانە کرد کە لە پێناوی ئەم گشت دەوڵەمەندییە و کەڵەکەکردنی ئەم شتومەکانە کرابوو.

بستەبالای بەسالاچوو وەک ئەوەی لەبری من بدوێت، گوتی: "ترسان؟ هەرکەسێک جاری یەکەم بێتە ژوورێ، دەترسێت. شەوانە، ڕۆحی ئەم شتومەکانە بەسرتە دەدوێن."

ئەوەی مایەی ترس و سام بوو، بێدەنگیی شاراوەی ناو ئەم شتومەکە زۆرانە بوو. گوێمان لە کرتەی مۆرەکە بوو کاتێک لە قفڵی دەرگای پشتمانەوە درا و بێ ئەوەی جووڵەمان لێوە بێت، بەسەرسامی تەماشامان دەکرد.

شمشێر، ددانی فیل، سەڵتە، مۆمدانی زیوین و ئالای لە ئەتڵەس دروستکراوم بینی. قوتووی لە گەوهەر چێکراو، سندووقی ئاسنین، گوڵدانی دەستکاری چین، کەمەربەند، ساز، زرێ، بالیفی ئاوریشمین، تۆپی پێشاندەری دنیا، جزمە، پێستە، شاخی کەرکەدەن، هێلکەی نەخشێندراوی وشترمڵ، تفەنگ، تیر و کەوان، گورز، دۆلاب و دۆلاب و دیسان دۆلابم بینی. گشت جێیەک تژە بوو لە قوماش، فەرش و ئەتڵەس و دەتگوت ئەمانە تۆپ تۆپ و بەگرانی لە نهۆمە بەتەختە داپۆشراوەکانی سەرەوە، لە درزی نەخش و نیگاری تەختەییی دەوری پلیکانەکانەوە، لە دۆلابی ناو دیوار و لە تاقی هەڵکۆڵدراوی ناوەڕاستی دیوارەکانەوە بەسەرماندا دەڕژێن. تیشکێکی بێ وێنەی پێشتر لە هیچ شوێن نەدیوم دەیدا لە قوماش، قوتوو، سەڵتەی سوڵتانی، شمشێر، مۆمی پەمەیی و گەورە، مێزەر، بالیفی بەمرواری نەخشێندراو، زینی بەداوی زێڕین خەملێندراو، چەقۆی دەسک ئەڵماس، گورزی دەسک بەیاقووت ڕازێندراوە، کڵاو، شانە، سەعاتی سەمەرە، ئەسپی هەڵکۆڵدراو لە ددانی فیل و

پەیکەری فیل، نێرگەلەی سەر بەئەڵماس، کشاوی لە گەوهەر داتاشراو، شانەی ئەسپ، تەزبیحی دەنک گەورە، کڵاوخوودی یاقووت و پیرۆزە تێگیراو، مەسینە و خەنجەر. ئەم تیشکە لاوازەی دزەکردوو لە پەنجەرەکانی سەرەوە، کتومت وەک ئەو تیشکی هەتاوەی لە ڕۆژێکی هاویندا لە کلاوڕۆژنەی گومەتی مزگەوتێکەوە دێتە ژوورێ، گەردیلەی تۆزی ناو ژووره نیوه تاریکەکەی ڕووناک دەکردەوە، بەڵام ئەمە تیشکی هەتاو نەبوو. لە سایەی ئەم تیشکە نامۆیەدا دەتگوت هەوا بووە بە شتێکی بەرجەستە و لە سۆنگەی ئەم تیشکەوە وا دەهاتە بەرچاو وەک ئەوەی سەرجەم کالاکانی ئێرە لە هەمان کەرەسە دروست کرابن. پاش ئەوەی هەموومان پێکەوە ماوەیەکی تریش بووین بە بینەری کپی و خامۆشیی ژوورەکە، حاڵی بووم ئەو شتەی ڕەنگی سووری ژوورە ساردەکەی کز دەکرد و گشت شتومەکەکانی دەخستە هەمان بەرگی ڕازدارەوە، لە تیشک زیاتر، تۆزێک بوو هەموو شوێنێکی داپۆشیبوو. ئەو شتەی ئاپۆڕەی ئەم گشت کالایانەی ترساکتر دەکرد، ئاوێتەبوونی چاو بوو لەگەڵ ئەو شتە سەیر و نادیارانەی کەوا لە نیگای دووەم و سێیەمیشدا ئاشکرا نەدەبوون چین. شتێکم دەبینی و وام دەزانی سندووقە، پاشان دەمگوت مێزە و دواتریش دەگەیشتمە ئەو باوەڕەی ئامێرێکی نامۆی فەرەنگ بێت. وام دەزانی سندووقی گەوهەری ناو سەڵتە و شانەی بەپەلە دەرهێنراو لە سندووقەکان، کشاوێکی سەرنجڕاکێشی نێردراوی چاری مۆسکۆیە.

جەزمی ئاغا وەک لەسەری ڕاهاتبوو، مەقاڵەکەی لەناو ئاگردانی دیوارەکە دانا.

مامۆستا عوسمان بەچرپە گوتی: "کتێبەکان لە کوێن؟"

بستەباڵا گوتی: "کام کتێبانە؟ ئەوانەی لە عەرەبستانەوە هێنراون، قورئانی کوفی، ئەوانەی حەزرەتی یاوز سوڵتان سەلیم خانی بەهەشتنشین لە تەورێزەوە هێناونی، کتێبی ئەو پاشایانەی لە دار دراون و دەست بەسەر ماڵ و موڵکیاندا گیراوە، ئەو دەستنووسانەی باڵیۆزی ڤینیسیا بەدیاری بۆ باپیری سوڵتانمانی هێناوە، یاخۆ ئەو کتێبانەی کرستیانی کە مێژوویان بۆ سەردەمی سوڵتان محەمەد فاتیح دەگەڕێتەوە؟"

مامۆستا عوسمان گوتی: "ئەو کتێبانەی سی ساڵ لەمەوبەر شا تەهماسپ بەدیاری بۆ حەزرەتی سوڵتانمانی ناردووە."



بستەباڵا ئێمەی بردە بەردەم دۆڵابێکی تەختەی گەورە. مامۆستا عوسمان دوای ئەوەی دەرگای دۆڵابی کردەوە و چاوی بە دەستنووسەکان کەوت، ئۆقرەی لێ بڕا. دەستنووسێکی کردەوە، ناوونیشانەکەی خوێندەوە و پەڕەکانی هەڵدایەوە. منیش لەگەڵ ئەودا بەسەرسامی سەیری پەڕەکان و نیگاری خانانی چاوماسیمان کرد و دانە بەدانەی نیگاری هەریەک لەوانەش بەبایەخ پێدانێکی فرەوە کێشرابوون.

مامۆستا عوسمان بەدەم خوێندنەوەی دەستنووسەکەوە گوتی: "جەنگیز خان، چاتای خان، تولوی خان، کوبیلای خانی فەرمانڕەوای چین." ئەو دەستنووسەی داخست و دانەیەکی تری بەدەستەوە گرت.

نیگارێکی جوانی لە وزەی ئەقڵ بەدەر کەوتە پێش چاومان، نیگارێکی پێشاندەری ئەو جڤاتەی کاتێک فەرهاد بەهێزی ئەڤینی خۆی، شیرینی دڵداری و ئەسپەکەی دەداتە دوای خۆی و بە ئازارەوە ڕای دەکێشێت. تاوێری شاخەکان و هەور و گەڵا و لک و چڵی سێ دار سەرووی ڕەسەنی گەواهیدەری ئەڤینی فەرهاد بۆ پێشاندانی سەودایی و خەمی هەردوو دڵدار، بەدەستێکی خەمگین و لەرزۆک و هێندە بەئازار کێشرابوو، کە خەم و تامی فرمێسکی گەڵا وەریوەکانی پەڕییەوە بۆ من و مامۆستا عوسمانیش. ئەم جڤاتە دڵتەزێنە، وەک ئەوەی مامۆستایانی گەورە دەیانکرد، ئاماژە نەبوو بۆ پێشاندانی هێزی بازووی فەرهاد، بگرە بۆ ئەوە نەخشێندرابوو تا پێشانی بدات ئازاری ئەڤین لە یەک کاتدا لە سەرانسەری دنیادا هەستی پێ دەکرێت.

مامۆستا عوسمان دەستنووسەکەی دانایەوە شوێنی خۆی و دانەیەکی تری دەرهێنا و گوتی: "ئەمە یەکێکە لە لاساییکردنەوەکانی بەهزاد و هەشتا ساڵ لەمەوبەر لە تەورێز کراوە."

ئەمە نیگارێک بوو دۆستایەتیی دژواری پشیلە و مشکی ناو کەلیلە و دیمنەی دەخستە ڕوو. لە کێڵگە، مشکی بەستەزمانی گیرخواردووی نێوان شالاوی سمۆرەی سەر زەوی و باڵندەی کولەماری ئاسمان، ڕزگاربوونی خۆی لە دەستی پشیلەی بێچارەی ناو داوی ڕاوچیدا دەبینێت. ڕێک دەکەون: پشیلە چەشنی دۆستێکی خۆی، بە دلۆڤانی مشکە دەلێسێتەوە. مشکەش بەپارێزەوە پشیلە لە داو ڕزگار دەکات. بەر لەوەی فریا بکەوم و بتوانم لە هەستیاریی نیگارکێش بگەم، مامۆستا

دەستنووسەکەی خستەوە تەنیشت ئەوانی تر و بێ بیرکردنەوە پەڕەی کتێبێکی تری کردەوە. ئەمە نیگارێکی جوانی ژنێکی ڕازدار و پیاوێک بوو. ژنە دەستێکی بەشێوەیەکی جوان کردبووەوە و پرسیاری شتێکی دەکرد. دەستەکەی تریشی لەسەر سەربەگە سەوزەکەیەوە خستبووە سەر ئەژنۆی. پیاوەکەش ئاوڕی دابووە و بەسەرنجەوە گوێی بۆ قسەی ژنە ڕاگرتبوو. ئیرەییم بە نزیکی و ئەڤین و دۆستایەتیی نێوانیان برد و بەچێژەوە تەماشام کرد.

مامۆستا عوسمان ئەویشی دانا و پەڕەی کتێبێکی تری هەڵدایەوە. سوارەی هەردوو لەشکری ئێران و توورانی دوژمنی لەمێژینەی یەکتر، تەواوی زرێ و خوودە و ئەژنۆوانە و تیر و کەوان و تیردانیان پۆشیبوو و سواری ئەسپی جوان و ئەفسانەییی تا گرێمل لە زرێ هەڵکێشراو بووبوون. چەند جوان لە چۆڵێکی ڕەنگ وەک ڕەنگی تۆزی زەوی بەڕیز لەبەرامبەر یەک ڕاوەستابوون و ڕووی ڕمە نووک ڕەنگاوڕەنگ نەخشێندراوەکانیان کردبووە یەکدی و پێش ئەوەی بکەونە هێرشبردن بۆ کوشتنی یەکتر، پشوودرێژانە سەیری شەڕی فەرماندەکانی خۆیان دەکرد، ئەو فەرماندانەی بۆ بەرەنگاربوونەوەی لایەنی بەرامبەر چووبوونە مەیدان. خەریک بووم بەخۆمم دەگوت چ ئەمڕۆ کێشرابێت و چ سەد ساڵ لەمەوبەر، چ جڤاتێکی شەڕ بێت یاخۆ ئەڤین، ئەوەی نیگارکێشی باوەڕ پتەو دەیکێشێت و پیشانی دەدات، شەڕ کردنیەتی لەگەڵ خۆیدا، کەواتە ئەوەی نیگارکێش کێشاویەتی، پشوودرێژیی خۆیەتی. لەو دەمەدا مامۆستا عوسمان گوتی: "ئەمەش نییە" و دەستنووسە گرانەکەی داخستەوە.

لە دەفتەرێکی نیگاردا، نیگاری دیمەنێکی فراوانمان بینی، دیمەنێک کە تا دەچوو درێژ دەبووەوە و شاخەکانی ناوی لە پشت پەلە هەورەکانەوە وون دەبوون. بیرم کردەوە ئەم نیگارە لەو جۆرانەیە کاتێک مرۆڤ نیگاری ئەم دنیا بکێشێت و وەک نیگاری ئەو دنیا پیشانی بدات. مامۆستا عوسمان چیرۆکی ئەوەی گێڕایەوە چۆن ئەم نیگارە چینییە لە بوخاراوە بۆ هەرات و لە هەراتەوە بۆ تەورێز و لە تەورێزەوە بۆ کۆشکی سوڵتان چووەتە کتێبی جۆراوجۆرەوە و لێیان دەرچووە و بەرگی دڕێنراوە و دواتر لەگەڵ نیگاری تردا بەرگی تێ گیراوەتەوە و باسی گریمانەی هاتنی نیگارەکەی لە چینەوە بۆ ئەستەنبوڵ کرد.





بڕێک نیگاری شەڕ و مردن یەک لەیەک ترسناکتر و باشتر کێشراومان بینی: ڕۆستەم لەگەڵ شا مازندەراندا؛ ڕۆستەم هێرش دەباتە سەر لەشکری ئەفراسیاو؛ ڕۆستەم وەک شەڕوانێکی نەناسراو و ڕازداری زرێپۆش... لە دەفتەرێکی تری نیگاردا چەند سوپایەکی نامۆ بە ئێمە و بڕێک جەستەی بێبەزەییانە لەتوپەتکراوی کاتی شەڕمان بینی، خەنجەری لە خوێندا سووربوو و شەڕوانمان بینی وەک پیاز وردورد یەکتریان دەجنی. کێ دەزانێت چەندەمین هەزار جار بوو مامۆستا عوسمان سەیری ئەم نیگارانەی دەکرد: نیگاری خۆشووشتنی شیرین لەبەر تریفەی مانگ لە گۆلدا و سەیرکردنی لەلایەن خەسرەوەوە؛ نیگاری بوورانەوەی هەردوو ئەڤیندار لەیلا و مەجنوون کاتێک دوای ماوەیەکی درێژ سەرلەنوێ یەکدی دەبیننەوە و نیگاری شادمانیی هەڵهاتنی سەلمان و ئابساڵ لە دەست دنیا و ژیانیان لە دوورگەیەکی بەختەوەری پڕ لە دار و گوڵ و گوڵزار و جریوەی مەل. وەک مامۆستایەکی ڕاستەقینە و گەورەش، تەنانەت تا پەنجەی نەخستبایەتە سەر کێماسی و ناتەواویی خراپترین نیگار و پیشانی منی نەدا، جا با ئەو کێماسییە لە لاوازیی نیگارکێشەوە بووبێت یان بەهۆی دەمەتەقێی خۆبەخۆی نێوان ڕەنگانەوە بێت، دەستی هەڵنەدەگرت: کاتێک شیرین و خەسرەو لە زمانی یاوەرانەوە گوێیان بۆ بەسەرهاتی شیرین ڕاگرتبوو، کام نیگارکێشی بەدبەخت و نیازخراپ ئەو کوندەبەبووە شوومەی خستبووە سەر ئەو لکی دارەی کە نەدەبوو بەهیچ جۆرێک بخرێتە سەری؟ ئەو دەمەی ژنانی میسر بەدەم سەیرکردنی یوسفی بەدەوەوە نارنجی شیرین پاک دەکەن و قامکی خۆیان دەبڕن، کێ ئەو کورە شۆخەی بە پۆشاکی ژنانەوە خزاندووەتە ڕیزی ژنانەوە؟ ئەو نیگارکێشەی نیگاری بە تیر کوێربوونی ئەسفەندیاری کێشاوە، ئایا دەیتوانی پێشبینی بکات خۆیشی لە ئاکامدا کوێر دەبێت؟

ئەو فریشتانەی ساتی بەرزبوونەوەی حەزرەتی پێغەمبەرمان دەورەیان داوە، ئەو بەساڵاچووە پێست بۆر و شەش باڵ و ڕیش درێژەی هەسارەی زوحەلی دەنواند و ڕۆستەمی کۆرپەلەمان بینی لەژێر نیگای دایکی و دایەنەکانیدا بەئاسوودەیی لە لانکەی گەوهەرڕێژکراودا نووستبوو. مردنی بەئازاری دارا لە باوەشی ئەسکەندەردا، چوونەوە ژوورەوەی بەهرام گوێر و کچە شازادەی ڕووس بۆ ژووری سوور،

تێپەڕبوونی سیاوش بە ئەسپێکی ڕەشی واژۆی شاراوە لە لووتدا نەبوو بە ئاگرێکدا و تەدارەکی ماتەمینی ناشتنی خەسرەوی بەدەستی کوڕی خۆی کوژراومان بینی. مامۆستا عوسمان بەدەم هەڵبژاردنی دەستنووسەکان و دانانەوەیانەوە بەپەلە، جاروبار نیگارکێشێکی دەناسییەوە و پێشانی منی دەدا. واژۆیەکی بەشەرمەوە شاراوەی ناو گوڵان، گۆشەی وێرانەیەک، یان لە گۆشەی بیرێکی تاریکی شوێنی خۆشاردنەوەی جنۆکەدا دەیدۆزییەوە و دەری دەهێنا. پاشان سەیری واژۆکان و ناونیشانەکانی دەکرد و ڕوونی دەکردەوە کێ چی لە کێوە وەرگرتووە. بەمەبەستی ئەوەی چەند نیگارێکمان بکەوێتە بەرچاو، ماوەیەکی درێژ پەڕەی چەند دەستنووسێکی ئەمدیو و ئەودیو کرد. جاروبار بێدەنگییەکی درێژ دەهاتە ئاراوە و تەنیا دەنگی بەئاستەمی هەڵدانەوەی پەڕەکانمان دەبیست. هەندێک جاریش مامۆستا عوسمان دەنگی "یا"ی لێ بەرز دەبووەوە و منیش لەبەرئەوەی نەمدەزانی سەری لە چی سوڕماوە، بێدەنگ دەبووم. نیگارەکانی دەکردەوە و دەیخستە بەردەمم و بیری دەهێنامەوە کە نەزمی هەندێک لەم پەڕانە و ڕیز کردنی دار و سوارەکانمان لە دەستنووسی تر و جڤاتی تری چیرۆکی دیی تەواو جیاوازدا دیوە. نیگاری ناو دەستنووسێکی یەکێک لە پێنج خشتەکییەکانی نیزامی، کە ئەو دەیگوت سەردەمی شا ڕەزای کوڕی تەیمووری لەنگ، واتا نزیکەی دووسەد ساڵ لەمەوبەر بەئەنجام گەیەندراوە، لەگەڵ نیگاری ناو دەستنووسێکی تردا، کە دەیگوت حەفتا هەشتا ساڵ بەر لە ئێستا لە تەورێز بە دروستکردن دراوە، بەراورد دەکرد و لە منی دەپرسی لۆجیکی ئەمە لە چیدایە، کە نیگارکێشان بێ ئەوەی یەکتریان بینیبێت، هەمان نیگاریان کێشاوە؟ دواتریش هەر خۆی وەڵامی دەدایەوە و دەیگوت:

"نیگارکێشان بریتییە لە بیرهێنانەوە."

دەستنووسە کۆنەکانی دەکردەوە و دای دەخستن، لە بەرامبەر شاکارەکاندا خەم دای دەگرت (چونکە چی دی کەس بەمجۆرە نیگاری نەدەکێشا) و لە ئاست بێ تواناییەکانیشدا خۆشحاڵ دەبوو (چونکە لە ڕاستیدا سەرجەم نیگارکێشان برا بووین.) و ئەو شتەی نیگارکێش بیری دەکەوتەوە، نیگاری کۆنی دار، فریشتە، سەیوان، پڵنگ، ڕەشماڵ، ئەژدیها و شازادە لێوبەبارەکانی پێشان دەدا و ئاماژەی



دەکرد بۆ: سەردەمانێک خوا دنیای لە بێوێنەترین دۆخیدا بینیوە و باوەڕی بەجوانیی ئەم شتەی بەر چاوی خۆی هێناوە و بۆ بەندەکانی خۆی جێ هێشتووە. کاری ئێمەی نیگارکێش و ئەوانەی سەیری نیگار دەکەن، ئەوەیە ئەم دیمەنەی خوا بینیویەتی و بۆ ئێمەی جێ هێشتووە، بەبیر بهێنینەوە. گەورەترین وەستایانی هەر نەوەیەکی نیگارکێشان سەرتاپای ژیانی خۆیان لەسەر داناوە و تا کوێر بوون کاریان کردووە و گەورەترین هەوڵ و ئیلهامیان خستووەتە کار بۆ گەیشتن بەو شاکارەی کە خوا گوتوویەتی "ببینن" و کاریان کردووە بۆ کێشانی نیگاری. کارێک ئەوان کردوویانە، وەک ئەوە دەچێت مرۆڤ بیرەوەرییە زێڕینەکانی خۆی بیر بکەوێتەوە. بەڵام جێی داخە تەنانەت گەورەترین مامۆستایانیش کتومت وەک بەساڵاچوانی شەکەت و ماندوو و ئەو نیگارکێشانەی بەهۆی کاری وزە پڕووکێنەوە کوێر بوون، چەند ڕەهەندێکی کەم نەبێت، نەیانتوانیوە ئەو نیگارە شاکارە بەبیر خۆیان بهێننەوە. ئەمەش هۆکار بوو بۆ ئەوەی نیگارکێشان سەرباری نەبینینی بەرهەمی یەکدی و بگرە هەبوونی مەودای سەدان ساڵ لە نێوانیاندا، نیگاری دارێکی مامۆستایانی کۆن، مەلێک، نیگاری شازادەیەک لە کاتی خۆشووشتن لە گەرماو و کچێکی ڕاوەستاوی ناو چوارچێوەی پەنجەرەیان دەکێشا و جاروبار ئەم نیگارانە وەک پەرجووێک لەیەک دەچوون.

زۆر دواتر، پاش ئەوەی تیشکی سووری ناو ژووری گەنجینە کەمێک تاریک داهات و ئاشکرا بوو هیچ کام لەو کتێبانەی شا تەهماسپ بەدیاری بۆ سوڵتانمانی ناردبوو، لە دۆڵابدا نەبوو، مامۆستا عوسمان هەمان لۆجیکی بەبیر هێنایەوە:

"جاروبار باڵی مەلێک، شێوەی لکاندنی گەڵا بەدارەوە، پێچ و پەنای لێواری گوێسوانەیەک، شێوەی ڕاوەستانی هەور لە هەوادا و زەردەخەنەی ژنێک، لە وەستاوە بۆ شاگرد، پشتاوپشت پێشان دەدرێت، بۆ فێرکردن دەگوترێتەوە، لەبەر دەکرێت و بەسەدان ساڵ دەشاردرێتەوە. مامۆستای نیگارکێش لەبەرئەوەی ئەم وردەکارییانە لەسەر دەستی مامۆستای خۆی فێر بووە و باوەڕی وایە قاڵبە، بەئەندازەی باوەڕهێنانی بە نەگۆڕیی قورئانی پیرۆز، باوەڕی بە نەگۆڕیی قاڵب هەیە و وەک لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز لە مێشکی خۆیدا هەڵی دەکۆڵێت و هەرگیز لەبیری

ناکات. بەڵام پێویستە لەبیرمان نەچێت ئەم لەبیرنەچوونە بەواتای ئەوە نییە وەستای نیگارکێش بەردەوام دەست بۆ ئەم وردەکارییانە ببات و بەکاریان بهێنێت. جاروبار نەزمی ئەو نیگارخانەیەی نیگارکێش بینایی چاوی خۆی تێدا لە دەست دەدات و خوو و ڕەوشتی ئەو وەستا سەرکێشەی لە تەنیشتییەوە نیگار دەکێشێت و کەیفی ڕەنگ و بەزمەکانی سوڵتان، بوار نادەن نیگارکێش ئەم وردەکارییانە بکێشێت، بۆیە نیگاری باڵی مەلێک، یان زەردەخەنەی ژنێک..."

منیش گوتم: "یاخۆ لووتی ئەسپێک.."

مامۆستا عوسمان بێ ئەوەی پێ بکەنێت، گوتی: "یاخۆ لووتی ئەسپێک.. مامۆستایانی مەزن ئەمانە وەک ئەوەی لە قووڵایی ڕۆحیاندا حەشار دراوە، ناکێشن، بگرە بەپێی داوونەریتی ئەو نیگارخانەیەی نیگارکێش لەو کاتەدا کاری تێدا دەکات، چەشنی ئەوانی تر نیگار دەکێشێت. حاڵی دەبیت؟"

لە شیرین و خەسرەوی نیزامیدا کە تا ئێستا سەیری ژمارەیەکی زۆر لە دەستنووسەکانیمان کردبوو، لە پەڕەیەکی نەخشێندراو و پێشاندەری شیرین لەسەر تەخت، نووسراوێکی لەسەر بەرد هەڵکۆڵراوی سەر دیواری کۆشکم خوێندەوە: خوای گەورەم، هێز و دەسەڵات و وڵاتی کوڕی تەیموور خانی سەرکەوتوو و خاقانی دادپەروەر و سوڵتانی ڕەسەنزادەمان بپارێزە بۆ ئەوەی هەم بەختەوەر بێت ( لەسەر بەردی لای چەپ نووسرابوو) و هەم دەوڵەمەند بێت (لەسەر بەردی لای ڕاست نووسرابوو.)

زۆر دواتر پرسیم: "لە کوێ ئەو نیگارانە دەدۆزینەوە کە نیگارکێشان تیایاندا لووتی ئەسپیان وەک ئەوەی لە بیرەوەرییاندا هەیە، کێشاوە؟"

مامۆستا عوسمان گوتی: "پێویستە دەستنووسی ئەو شانامە شاکارەی شا تەهماسپ بەدیاری ناردوویەتی، بدۆزینەوە. پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ئەو سەردەمە جوان و کۆن و ئەفسانەییانەی کاتێک خوا تێکەڵ بە نیگار دەبوو. هێشتا سەیری زۆر کتێبی تر دەکەین."

بیرم کردەوە ئامانجی بنەڕەتیی مامۆستا عوسمان پەیداکردنی دۆزینەوەی ئەسپی لووت ناقۆڵا نەبوو، بگرە دەیەوێت تا بۆی دەکرێت سەیری ئەم نیگارە شاکارانەی



دوور لە چاوان پارێزراوی گەنجینە بکات. ئەوەندە ئۆقرەم لێ بڕابوو بۆ دۆزینەوەی بیانوو بەمەبەستی گەیشتن بە شەکوورەی لە ماڵەوە چاوەڕێ کردووم، نەمدەویست باوەڕ بکەم مامۆستای گەورە دەخوازێت تا بۆی دەلوێت ماوەیەکی درێژتر لەم ژوورە سارد و ڕچیوەی گەنجینە بمێنێتەوە.

بەمجۆرە، بە ڕێپێشاندانی بستەبالای بەسالاچوو، دۆلاب و سندووقی ترمان کردەوە و بەردەوام بووین لەسەر سەیرکردنی نیگارەکان. جاروبار لەم نیگارە وێکچووانە بێزار دەبووم، نەمدەویست جارێکی تر سەیری هاتنی خەسرەو بکەم کاتێک دێتە بن پەنجەرەی کۆشکی شیرین بۆ بینینی، بگرە بێ ئەوەی سەیری لووتی ئەسپەکەی خەسرەو بکەم، لە مامۆستا دوور دەکەوتمەوە و هەوڵم دەدا لەپەنای مەقاڵەکە خۆم گەرم بکەمەوە، یان دەرگای بەسەریەکدا کراوەی ژوورەکانی گەنجینەم دەکردەوە و بەڕێز و بەسەرسامی بەناو قوماشی ترسناک، زێڕ، دەستکەوتی شەڕ و چەک و کۆمەڵی زرێدا دەڕۆیشتم. جاروباریش لەبەرئەوەی مامۆستا دەنگێکی لێ بەرز دەبووەوە، یاخۆ بەدەست جووڵەیەکی دەکرد، خەیاڵم دەچوو بۆ ئەوەی دواجار لە دەستنووسێکدا شاکارێکی نوێ، یان، بەڵێ، ئەسپێکی لووت ناقۆڵا پەیدا بووبێت و بەڕاکردن خۆم دەگەیاندێ. مامۆستا لەسەر ڕایەخێکی ئوشاقی پاشماوەی سەردەمی سوڵتان محەمەد فاتیح خۆی گرمۆڵە کردبوو و دانیشتبوو. کاتێک لە نێوان دەستە کەمێک لەرزۆکەکانیدا سەیری پەڕەیەکم کرد، لووتم بە نیگارێکدا تەقییەوە تا ئەو ساتە هەرگیز نەمدیبوو؛ نیگاری ئیبلیس گاڤێک بەدزییەوە سەردەکەوێتە سەر کەشتیی حەزرەتی نوح.

سەیری بڕێک نیگاری ئەو سەدان پادشا، قڕاڵ، سوڵتان و فەرمانڕەوایانەمان کرد کە هەر لە زەمانی تەیمووری لەنگەوە تا سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانوونی لەسەر تەختی دەوڵەتی جۆراوجۆر دانیشتبوون و لەم نیگارانەدا بەکامەرانی و خۆشحاڵی لەناو ئاسک و شێر و کەروێشکدا ڕاویان دەکرد. لە نیگارێکدا بینیمان یارۆیەکی بێ ئابڕوو تەختەی لە قاچی دواوەی حوشترێک بەستووە و کردوویەتی بە پلیکانە و خۆی بە ئاژەڵی بەستەزمانەوە ناوە. تەنانەت ئیبلیسیش لەتاو ئەم بێ ڕەوشتییە پەنجەی خۆی گەستوە و شەرم دای گرتووە. لە کتێبێکی عەرەبیی لە ڕێی بەغداوە هاتوودا

بینیمان بازرگانێک دەستی بە قاچی باڵندەیەکی ئەفسانەیییەوە گرتووە و بەسەر دەریاکاندا دەفڕێت و سەیریان دەکات. لە پەڕەی یەکەمی دەستنووسی دوای ئەوەدا، کە لە خۆیەوە کرایەوە، ئەو جڤاتەم بینی کاتێک شیرین سەیری نیگاری هەڵواسراوی خەسرەو بە لقی دارەوە دەکات و عاشقی دەبێت. من و شەکوورە زۆر حەزمان لەو جڤاتانە دەکرد. نیگاری لوولە کاغەز و تۆپ و مەلی جێگیرکراوی سەری پشتی فیلێک و نیگارێکمان بینی شێوەی کاری ناوەوەی سەعاتێکی ئاڵۆزی لە پەیکەری بچووکی عەرەبی دروستکراو پێشان دەدات و کاتمان بیر کەوتەوە.

بۆم نابڕێتە سەریەک گەلۆ چەندی تر لە دەستنووسێکەوە بۆ یەکێکی تر و لە نیگارێکەوە بۆ دانەیەکی دی بەوجۆرە سەیرمان کرد. دەتگوت زەمانێکی زێڕینی هەمیشە نەگۆڕ و ڕاوەستاوی دەرچوو لەو نیگارانەی ئێمە تەماشامان دەکردن، ئاوێتەی ئەو زەمانە بووە کە ئێمە لە ژووری کەڕووگرتوو و شێداری گەنجینە بەسەرمان دەبرد. ئەو پەڕانەی بەدرێژاییی سەدان ساڵ بەدەم داهاتنی کوێراییی نیگارکێشانەوە لە نیگارخانەی ئەو گشت پادشا و شازادە و خان و سوڵتانانە کێشرابوون، ئێستا دەتگوت دوای ئەو ماوە درێژەی شاردنەوەیان لە سندووقدا، خوودە، شمشێر و خەنجەری دەسک ئەڵماس، زرێ و فنجان و عوودی نازدار و تۆز لێنیشتووی لە چینەوە هاتوو، بالیف و کلیمی بەمرواری خەملێندراو، کە بەڕاستیش هاوشێوەیمان لە نیگارەکاندا دیبوو و هەروەها ئەسپی جۆراوجۆری دەوروبەرمان دەخاتە جووڵە و گیانیان بەبەردا دەکات.

"ئێستا بۆم ڕوون دەبێتەوە هەزاران نیگارکێش بەدرێژاییی سەدان ساڵ هەرگاڤ هێدی هێدی و بەنهێنی هەمان نیگاریان کێشاوە و نیگاری گۆڕانی نهێنی و لەسەر خۆی دنیایان بۆ دنیایەکی تر کێشاوە."

ددانی پێدا دەنێم نەمتوانی بەتەواوی تێ بگەم مامۆستای گەورە دەیەوێت چی بڵێت. بەڵام ئەو سەرنجدانەی مامۆستام لەو هەزاران نیگارەی بەدرێژاییی دووسەد ساڵی ڕابردوو لە بوخارا و هەراتەوە بۆ تەورێز و بەغدا و تا ئەستەنبوڵ کێشرابوون، ئیدی مەبەستی دۆزینەوەی نیشانەی ناقۆڵای لووتی ئەسپەکانی زۆر تێ پەڕاندبوو. ئێمە تەدارەکی شەیدابوونێکی بەخەم بارگاویکراومان بۆ ئیلهام و هونەر و



پشوودرێژیی سەرجەم ئەو مامۆستایانەی چەندین سەدە بوو لەم سەرزەوینە نەخش و نیگاریان دەکێشا، دەگێڕا.

بۆیە گاڤێک دەمی نوێژی ئێوارە دەرگای ژووری گەنجینە کرایەوە، مامۆستا عوسمان پێمی گوت هیچ داخوازێکی نییە بۆ چوونە دەرەوە و ئەگەر تا بەرەبەیان لێرە لەبەر تیشکی مۆم و قوتیلکە سەیری نیگار بکات، ئەوسا دەتوانێت ئەرکی پێسپێردراو لەلایەن سوڵتانمانەوە بەتەواوی ڕاپەڕێنێت. یەکەم شت بەخەیاڵمدا هات مانەوەمان بوو لەگەڵ وی و -کابرای بستەبالا- لێرە و ئەمەشم پێ گوت.

دەرگا کرایەوە و کاتێک مامۆستام ئەم بڕیارەی بەو ئاغایانەی لە دەرەوە لە چاوەڕوانیی ئێمەدا ڕاوەستابوون، ڕاگەیاند و ویستی مۆڵەت لە گەورەی خەزنەداران وەربگرێت، من دەمودەست پەژیوان بوومەوە. تاسەی شەکوورە و ماڵم کردبوو. بیرم دەکردەوە چۆن خۆی و منداڵەکان شەو بەتەنیا بەسەر دەبەن و چۆن دەریوانەی تازە چاککراوی پەنجەرەکان توند دادەخەن و هەر دەتگوت لەسەر تۆپەڵە دڕک دانیشتووم.

لە نێوان تاکێکی کراوەی دەرگای ژووری گەنجینەوە، دار چناری تەڕ و گەورەی باخچەی ئەندەروونم بینی وەک ئەوەی لە تەمێکی تەنکدا نقوم بووبن. دوو کوڕی گەنجی خزمەتکاریش لەو باخچە کامەرانەدا وەک کەڕان بە ئاماژەی دەست دەدوان تا دەنگیان نەگاتە سوڵتانمان و ئارامیی لێ نەشێوێت. جووڵەی دارەکان و دوو کوڕەکەش منیان بۆ ژیانی نایابی دەرەوە بانگ کرد، بەڵام من بە هەستی شەرم و خۆ بەتاوانبارزانینەوە لە جووڵە کەوتم.

# 50

## ئێمە دوو عەودالین

باپیرانی حەزرەتی سوڵتانمان بەدرێژاییی سەدان ساڵ دەستیان بەسەر سەدان وڵاتدا گرتووە و تالانیان کردوون و گەنجینەی خۆیان پڕ کردووە. قسە و قسەڵۆکی سەبارەت بە هەبوونی نیگاری هەردووکمان لەنێوان پەڕەی لە چین و سەمەرقەند و بوخاراوە هاتووی ناو دەستنووسی دەفتەرێکی نیگاری نهێنیترین گۆشەی ئەو گەنجینەیە، بەئەگەری زۆر لە ڕێی جەزمی ئاغای بستەبالاوە بەناو دەستەی نیگارکێشاندا تەشەنەی کردووە. بۆیە پێمان وایە ئەگەر ئێمەش ئیدی بەسەرهاتی خۆمان بەشێوازی خۆمان بگێڕینەوە، ئەوا خوا یار بێت، کەسێک لەناو ئاپۆڕەی هەڵبژێردراوی تۆپەڵبوو لەم قاوەخانە دڵگیرە، زیز نابێت.

سەد و دە ساڵ بەسەر مردنی ئێمە و چل ساڵ بەسەر داخستنی تەکیەکانماندا بەبیانووی ئەوەی وارگەی زەندیق و هێلانەی ئیبلیس و هێنانەوەیان بۆ سەر ڕێی ڕاست مەحاڵە و ئاشکرایە لایەنگری عەجەمە، تێ پەڕی. بەڵام بڕوانن واین لە پێش چاوتان. بۆچی؟ چونکە لەسەر شێوازی فەرەنگ نیگارمان کێشراوە، بۆیە، وەک لەم نیگارەشدا دەبینرێت، ئێمەی عەودالْ هەردووکمان، ڕۆژێک لەم وڵاتەی سوڵتانمان لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر دەچووین.

پێ خاوس و سەرکۆت و نیوەڕووت بووین و هەریەکەمان هێلەکێک و پێستێکی ئاسکی پۆشیبوو. هەریەکەمان پشتوێنێکی لە پشت کردبوو و گۆچانێکی سەرشکاوی بەدەستەوە بوو. توێشوومان بەزنجیر بە ملمانەوە هەڵواسیبوو.



یەکێکیشمان تەورێکی بۆ داربڕین و ئەویتریشمان کەوچکێکی پێ بوو بۆ خواردنی هەر شتێکی خوا بە توێشووەکەمانی بدایە.

ئێستا من و دۆستی نازدار و خۆشەویست و برای خۆم سەرقاڵی دەمەتەقێی باوی خۆمان بووین: کێ لە پێشدا کەوچک بەدەستەوە بگرێت و لە خواردنی ناو توێشووەکە بخوات؟ ئێمە کاتێک هێشتا "نا، من لە پێشدا و نەخێر تۆ لە پێشدا"مان دەکرد، گەڕیدەیەکی سەرنجڕاکێشی فەرەنگ ئێمەی لە شوێن حەوانەوەی لێوی کانییەک ڕاگرت. دوو سکەی زیوینی ڤینیسیاییی دا پێمان و دەستی کرد بە کێشانی نیگارمان.

فەرەنگە و سەرسوڕهێنە: وەک ئەوەی ڕەشماڵی سوڵتانمان بین، ئێمەی لە ناوەڕاستی کاغەز جێگیر کرد و کاتێک بەم حاڵە نیوەڕووتەمانەوە نیگارمانی دەکێشا، یەکسەر شتێک بەئەقڵمدا هات و بە هاوڕێی گیانی بە گیانی خۆیشم گوت. بۆ ئەوەی وەک دوو هەژاری ڕاستەقینە و دوو دەروێشی سواڵکەر و قەلەندەر بکەوینە بەرچاوان، ڕەشاییی چاومان بردە ناوەوە و سپێنەی چاومان هێنایە دەرێ و وەک کوێر دەمانڕوانی. ئێمە وەک دەروێش لەم دۆخەدا سەیری دنیای دەرەوەمان نەدەکرد، بگرە بۆ دنیای ناو سەری خۆمانمان دەڕوانی و لەبەرئەوەی سەری هەریەکەمان لێوانلێو بوو لە ڕاز و نیاز، دیمەنی ناوەوە زۆر دڵگیرتر بوو.

لەپڕ دیمەنی دەرەوە زیاتر تێک چوو، چونکە گوێمان لێ بوو مەلا ئەفەندییەک بەدەم هاوارەوە بانگی دەکرد.

دەستمان بە دامێنتان ئێستا با ئەمە بەهەڵە لێک نەدرێتەوە. هەفتەیەک لەمەوبەر لەم قاوەخانە دڵگیرەدا گوتمان مەلا ئەفەندی و ئەمەش بەهەڵە لێک درایەوە. ئەم مەلا ئەفەندییە، وەک حەزرەتی مەلا نوسرەت خۆجەی ئەرزەڕوومی نییە، مەلا خوسرەتی باوک نادیاریش نییە. ئەو مەلا سیواسییەش نییە کە لەگەڵ ئیبلیسدا لەسەر دار سواری یەکتر دەبوون. ئەوانەی گشت شتێک بەهەڵە لێک دەدەنەوە، گوتوویانە ئەگەر جارێکی تر لە بەرامبەر حەزرەتی مەلا ئەفەندیدا زماندرێژی بکرێت، ئەوا زمانی چیرۆکبێژی ئەفەندی دەبڕین و قاوەخانەکەی بەسەردا دەڕووخێنین.

سەد و بیست ساڵ بەر لە ئێستاش، ئەم مەلا ئەفەندییەی باسی دەکەین، لەبەر

نەبوونی قاوە، دووکەڵی تووڕەیی و هەڵچوون لە کەپوویەوە دەهاتە دەرێ و دەیگوت: "بۆچی نیگاری ئەمانە دەکێشیت هەی گاوری فەرەنگ؟ ئەم قەلەندەرە ڕیسوایانە دزی دەکەن، دەگەڕێن و سواڵ دەکەن، ئەفیۆن دەکێشن، شەراب دەخۆنەوە، سواری یەکتر دەبن و بەحاڵی نیوەڕووتیاندا دیارە نازانن نوێژ و نزا و ماڵ و خێزان و وڵات چییە و مایەی شەرمەزارین بۆ دنیا. لە کاتێکدا ئەم وڵاتەی ئێمە تژەیە لە جوانی، تۆ بۆچی نیگاری ئەم پەرێشانییە دەکێشیت، بۆ ئەوەی ببێت بە مایەی خراپە بۆمان؟"

یارۆی گاور گوتی: "نەخێر، چونکە نیگاری حاڵی پەرێشانیی ئێوە پارەی زیاتر دەکات." ئێمەی عەوداڵی ناو ئەم نیگارە سەرمان سوڕما لە ئاقڵیی کابرای نیگارکێش.

مەلا ئەفەندی گوتی: "ئەگەر پارەی زۆر بکات، ئایا ئیبلیسیش جوان پێشان دەدەیت؟" هەوڵی دا یارۆی فەرەنگ بۆ ناو گفتوگۆیەکی فێڵبازانە بەکێش بکات، بەڵام وەک لەم نیگارەشمانەوە دەردەکەوێت، نیگارکێشی فەرەنگی هونەرمەندێکی ڕاستەقینە بوو، هۆشی لای پرتە و بۆڵەی بێ تام نەبوو، لای بەرهەم و پارە بوو و مەلا ئەفەندیی فەرامۆش کرد.

بەمجۆرە کابرای گاور نیگاری ئێمەی کێشا، نیگارەکەی نایە پێستەبەندی پشت ئەسپەکەی و بۆ وڵاتی خۆی گەڕایەوە. بەڵام لەبەرئەوەی لەشکری سەرکەوتووی عوسمانی ئەو شارەی لێوار ڕووباری تووناشی گرت و بە تاڵانی برد، ئێمە هەڵتەک هەڵتەک گەڕاینەوە بۆ ژووری گەنجینە لە ئەستەنبوڵ. لەوێش بەدەم سەیرکردنمانەوە لەبەرمان گیرایەوە و لە دەفتەرێکی نهێنییەوە هاتینە سەر کتێبێکی تر و دواجار گەیشتینە ئەم قاوەخانە کامەرانە. ئەم شوێنەی وەک ئیکسیر خواردنەوە قاوەی لێ دەخورێتەوە، قاوەیەک کە ڕۆح بەڕۆح دەدا. ئێستا:

## ڕاگەیاندنێکی کورت سەبارەت بە نیگار، مردن و جێگەمان لە دنیا

ئەو مەلا ئەفەندییە قۆنیاییەی تۆزێک لەمەوبەر باسمان کرد، لە جێیەکی کتێبێکیدا، کە ئامۆژگارییەکانی خۆی تێدا کۆ کردووەتەوە و نووسیوونی، وای فەرمووە: قەلەندەران زیادەی دنیان، چونکە مرۆگەل لە دنیا بەسەر چوار چیندا



دابەش دەکرێن: ١- بەگ ٢- بازرگان ٣- جووتیار ٤- پیشەکار. قەلەندەران لەناو هیچ کام لەمانەدا نین، کەواتە زیادەن.

هەروەها فەرموویەتی: "ئەمانە بەردەوام بەجووتە دەسووڕێنەوە و هەمیشە پرتە و بۆڵەی ئەوەیانە کامیان لە پێشدا بە تاکە کەوچکی دەستیان نان بخوات." ئەمە هێمایەکە بۆ کرۆکی مەبەستیشیان، بۆ ئەوەی کێ لە پێشدا سواری ئەوی تریان بێت. ئەوانەی نازانن، بێ ئەوەی تێ بگەن، پێ دەکەنن. بەقوربانتان بین با ئەمە بەهەڵە لێک نەدرێتەوە: حەزرەتی مەلاش لەبەرئەوەی لەگەڵ ئێمە و سەرجەم کوڕانی شۆخ و دەستەی شاگرد و نیگارکێشان ڕێبواری هەمان ڕێگا بوو، لە ڕازی ئێمە تێ گەیشتبوو.

## بەڵام ڕازی بنەڕەتی

ئەمەیە: گاوری فەرەنگ لە کاتی کێشانی نیگاری ئێمەدا هێندە شیرین بۆمانی دەڕوانی، خۆیمان خۆش ویست و بەکێشانی نیگارمان لەسەر دەستی وی، خۆشحاڵ بووین. بەچاوی ڕووتەوە بۆ دنیای دەڕوانی و نیگاری شتێکی بەرچاوی خۆی دەکێشا، بۆیە کارێکی چەوتی دەکرد. بەمجۆرە نیگاری ئێمەی لە ڕاستیدا چاوساغی وەک ئەوەی کوێر بین، دەکێشا، بەڵام ئێمە گوێمان پێ نەدا. ئێستا زۆر ڕازین. بەقسەی مەلا ئەفەندی بێت، ئێستا ئێمە لە دۆزەخین، بەبۆچوونی هەندێک کەسانی بێ باوەڕیش، لاشەی ڕزیوین و لە دیدی ئێوەی نیگارکێشانی ئاقڵی تۆپەڵبووی ئێرەشەوە نیگارین و لەبەرئەوەی نیگاریشین، وەی چ جوانە، دەڵێی زیندووین و لە بەردەمتانداین. دوای یەکتربینینمان لەگەڵ مەلا ئەفەندی، لە قۆنیاوە بەرەو سیواس سێ قۆناغ و هەشت گوندمان بەدەم سواڵکردنەوە بڕی، هەتا شەوێک بەفر و سەرمایەکی سەخت زۆری بۆمان هێنا و ئێمەی عەوداڵ باوەشمان بەیەکدا کرد و نووستین و ڕەق بووینەوە و مردین. پێش ئەوەی بمرم، لە خەونمدا بینیم نیگارم دەکێشرێت و دوای هەزاران ساڵ ژیان بەسەر بردن، نیگارم چووە بەهەشت.

# 51

## من مامۆستا عوسمانم

لە بوخارا بەسەرهاتێکی پاشماوەی سەردەمی عەبدوڵا خان هەیە. دەگوترێت ئۆێزبەک خان فەرمانڕەوایەکی ڕاڕا بووە. ئەگەرچی لاریی نەبووە لەوەی هەمان کات قەڵەمی چەند نیگارکێشێک بە نیگارێکدا بهێنرێت، بەڵام هەرگیز حەزی نەکردووە نیگارکێشان پەڕەی یەکتر ببینن و لاساییی یەکدی بکەنەوە، چونکە ئەگەر تاوانێک بەدەستی نیگارکێشان ئەنجام بدرایە، ئیدی ئەگەری دەستنیشانکردنی نیگارکێشی تاوانبار لە نێوان دوو نیگارکێشی لاساییکەرەوەی یەکتردا مەحاڵ دەبوو. لەوەش گرینگتر، ئەو نیگارکێشانەی دزییان لە یەکتر دەکرد، دوای ماوەیەک، لەبری ئەوەی خۆیان ماندوو بکەن و لە تاریکیدا بەدوای بیرەوەرییەکانی خوادا بگەڕێن، لەسەر شانەوە سەیری کەسی تەنیشتی خۆیان دەکرد و ئەوەی دەیانبینی، تەمەڵ و تەوەزەلانە دەیانکێشایەوە. ئۆێزبەک خان بەکامەرانی و ڕووی خۆش پێشوازیی لە دوو وەستای نیگارکێشی هەڵهاتووی شەڕ و دەستی پادشایانی زۆردار کردووە. یەکێک لە نیگارکێشەکان لای باشوورەوە، لە شیرازەوە و ئەوی تریان لای ڕۆژهەڵاتەوە، لە سەمەرقەندەوە هاتووە. بەڵام سەیرکردنی نیگاری یەکتر لەم دوو هونەربازە ناوداره قەدەغە دەکات و دوو ژووری نیگارکێشانی ئەمپەڕ و پەوپەڕی گۆشەی کۆشکیان پێ دەدا. بەمجۆرە، ئەم دوو مامۆستا گەورەیە بەدرێژاییی سی و حەوت ساڵ و چوار مانگ وەک ئەوەی گوێ بۆ داستان ڕابگرن، لە خانەوە گوێیان لێ دەبێت لە کام خەسڵەتدا لەیەکتر جیاوازن و لە چ ڕوویەکەوە تا ڕادەی سەرسوڕمان



وەک یەک دەچن و سوێیان دەبێتەوە بۆ بینینی نیگاری یەکتر. پاش ئەوەی خانی ئۆێزبەک چەشنی کیسەڵ تەمەنێکی درێژ بەسەر دەبات و دەمرێت، هەریەک لە دوو نیگارکێشانی بەساڵاچوو ڕادەکات بۆ ژووری ئەوی دی بەمەبەستی بینینی نیگارەکانی. دواتر، کاتێک کتێبەکانی یەکتر دەنێنە باوەش و لەمسەر و ئەوسەری نیمدەرێک دادەنیشن و سەیری ئەو نیگارانەی خۆیان دەکەن، کە لە ڕێی داستانەکانی عەبدوڵا خانەوە پێیان ئاشنا بوون، تووشی خەیاڵشکان دێن، چونکە نیگارەکان ئەفسانەیی نین وەک ئەوانەی ئەمان چیرۆکەکانیان لە خانەوە بیستووە، بگرە چەشنی ئەو نیگارانەی لەو ساڵانەی دواییدا بینیبوویان، بێ تایبەتمەندی و بێ تیشک و تەمومژاوی دەبن. هەردوو مامۆستای گەورە پاش ماوەیەکی کورت بەیەکجاری بیناییی چاوان لە دەست دەدەن و دوای کوێربوونشیان هێشتا تێ ناگەن تەمومژەکە لە داهاتنی کوێراییی چاوی خۆیانەوە سەرچاوەی گرتووە. هەتا لە ژیاندا دەبن، پێیان وا دەبێت لەخشتە براون و بە باوەڕێکەوە کە خەیاڵ لە نیگار فرە جوانترە، دەمرن.

کاتێک بەنیوەی شەو لە ژووری تەزیوی گەنجینەدا بە پەنجە ڕچیوەکانم پەڕەی ئەو کتێبانەی چل ساڵ بوو خەیاڵم لێ دابوون، هەڵدەدایەوە و سەیرم دەکردن، من لە قارەمانەکانی ئەو بەسەرهاتە زۆردارانەیەی بوخارا زۆر کامەرانتر بووم. کتێبی وا هەبوون من بەدرێژاییی ژیان تەنیا داستانیانم بیستبوو و ئێستا کاتێک بەر لە کوێربوون و مردنم بەدەستمەوە دەگرتن، جۆشم دەهاتێ و گاڤێک دەمبینی ئەو پەڕانەی هەڵیان دەدەمەوە، زۆر شاهانەترن لەو داستانانەی پێشتر لە بارەیانەوە بیستوومن، لەبن لێوەوە دەمگوت: "سوپاس، سوپاس، سوپاس خوایە."

بۆ نموونە، کاتێک شا ئیسماعیل هەشتا ساڵ لەمەوبەر لە ڕووبار دەپەڕێتەوە و بە نووکی شمشێر هەرات و سەرانسەری خۆراسان لە ئۆێزبەکەکان دەسێنێتەوە، سام میرزای برای دەکات بە والیی هەرات. ئەویش بۆ بەپیرۆزکردنی ئەم شادمانییە، فەرمانی دروستکردنی کتێبێک دەدات، داستانێکی لە جۆری ئەوەی لە کۆشکی میر خەسرەو لە دەلهی بیستوویەتی، دەگێڕێتەوە و دەستوور دەدات کتێبی "پێکگەیشتنی ئەستێرەکان" سەرلەنوێ بنووسرێتەوە و نیگاری بۆ بکێشرێت. وەک ئەوەی لە

داستانەکانەوە بیستبووم، نیگارێکی ناو ئەم کتێبە دوو فەرمانڕەوا پێشان دەدات لە لێواری ڕووبارێک بەیەک دەگەن و سەرکەوتن و بەیەکگەیشتنی خۆیان لە یەکتر پیرۆز دەکەن. سەروچاوی ئەم دوو فەرمانڕەوایە هەم وەک کەیقوبادی سوڵتانی دەلهی و بوغرا خانی باوکی و فەرمانڕەوای بەنگال دەچوو -کتێبەکە لەبارەی ئەوانەوە بوو-، هەم لە شا ئیسماعیل و میرزا سامی برای دەچوو و هەر ئەمانیش هۆکاری سەرلەنوێ دروستکردنەوەی کتێبەکە بوون. کاتێک بەتەواوی دڵنیا بووم ئەگەر هەریەکێک لە چیرۆکەکان بخەمە خەیاڵی خۆم و سەیری نیگارەکان بکەم، ئەوا لە ڕەشماڵی سوڵتاندا ڕووی پاڵەوانەکانی ئەو چیرۆکەی خەیاڵم لێ داوە دەبینم، سوپاسی خوای خۆم کرد لەپای ڕەخساندنی هەل بۆم بۆ بینینی ئەم پەڕە پەرجووانە.

شێخ محەمەدی مامۆستای گەورەی ئەو سەردەمە ئەفسانەیییە، نیگاری بەندەیەکی هەژاری کێشاوە و شەیدایی و خۆشەویستیی ئەم بەندەیە لە بەرامبەر سوڵتانی خۆی گەیشتووەتە ئاستی ئەڤین. کاتێک سوڵتان بەسەر پشتی ئەسپەوە یاریی گۆوانێ دەکات، ئەم بەئومێدی ئەوەی ئێ ئەمە خوایە تۆپ ڕوو لە من بکات و منیش هەڵی گرمەوە و بیدەم بە سوڵتان، پشوودرێژانە چاوەڕێ دەکات. هەر بەڕاستیش نیگارەکە وا کێشراوە کاتێک تۆپەکە لە یارۆ نزیک دەبێتەوە، ئەم هەڵی دەگرێتەوە و دەیدات بە سوڵتان. ڕەوشی پەرێشانی ئەو بەندەیەی تۆپەکەی بەدەستەوەیە و چەندی هەوڵ دەدات ناوێرێت سەیری ڕووی سوڵتان بکات، بە تێگەشتنێکی فرە ناسک و قوڵەوە کێشراوە و پێشاندەری ئەو ئەڤین و شەدایی و خۆ ڕادەستکردنە ڕەوایەیە کە بەندەیەکی هەژار لە بەرامبەر خانێکی گەورە، سوڵتانێکی مەزن، یاخۆ شاگردێکی نۆلاو و شۆخ لە بەرامبەر مامۆستای خۆیدا هەستی پێ دەکات و منیش لە ژیانی خۆمدا زۆرم لە بارەیەوە بیستووە. کاتێک مرۆڤ سەیری ئەم پەڕەیە دەکات، وەک ئەوەی منیش لە قوڵاییی ناخەوە هەستم پێ دەکرد، تێ دەگات گەورەترین کامەرانیی ئەم دنیایە چەندە لەوەدایە ببیت بە مامۆستای شاگردی گەنج و جوان و تێگەیشتوو، هێندەش لەوەدایە تا ڕادەی کۆیلایەتی، شاگردیی وەستایەکی گەورە بکەیت. خەمگین بووم بۆ ئەو کەسانەی نەیاتوانیبوو بەشی خۆیان لەم مافە وەربگرن.



ئەو دەمەی من پەڕەم هەڵدەدایەوە و بەوردی و بەلەز سەیری هەزاران مەل، ئەسپ، سەرباز، ئەڤیندار، حوشتر، دار و پەڵە هەورم دەکرد، بستەباڵای کامەرانی گەنجینە وەک پادشایەکی سەردەمانی کۆن هەلی پێشاندانی دەوڵەمەندیی خۆی بۆ ڕەخسابوو و بێباکانە وەسپی دەکرد و کتێبی نوێی لە سندووقەکان دەردەهێنا و دەیخستە بەردەمی من. لەناو ئەم کتێبە شاکارانە و دەستنووسە ئاساییانە و دەفتەری نیگاری تێکەڵ و پێکەڵانەدا، دوو کتێب لە دوو گۆشەی جیاوازی سندووقێکی ئاسنەوە دەرچووبوون. یەکێکیان بەڕەنگی گێلاسی ڕزیو و لەسەر شێوازی شیراز بەرگی تێ گیرابوو. بەرگی ئەوی تریشیان لە هەرات بە کاریگەریی شێوازی چینی وارنیشی تاریکی لێ درابوو. پەڕەکانی ئەم دوو کتێبە نازدارە زۆر لەیەک دەچوون، بۆیە سەرەتا وای بۆ چووم لەبەر یەکتر گیرابنەوە. بەدەم هەوڵدانەوە بۆ زانینی ئەوەی کامیان ڕەسەنە و کامیان لاساییکردنەوەیە، لە ناوونیشانیاندا سەیری ناوی خۆشنووسەکانم کرد، بەدوای ئەو واژۆ شاراوانەدا گەڕام کە دەمتوانی بیانبینم و دواجار بەدەم مچوڕکەیەکەوە تێ گەیشتم ئەم دوو کتێبە ئەفسانەیییە، دوو دەستنووسی نزامین و لەسەر دەستی شێخ عەلی تەورێزی بۆ جیهان شای خاقانی قەرەقۆیونلو و ئوزوون حەسەنی خاقانی ئاکقۆیونلو ئامادە کراون. شای قەرەقۆیونلو، بەمەبەستی ئەوەی نەبادا هاوشێوەیەکی بەرگی یەکەم بۆ کەسێکی تر دروست بکات، گەورە مامۆستای نیگارکێش کوێر دەکات، بەڵام مامۆستای مەزن پەنا بۆ خاقانی ئاکقۆیونلو دەبات و بەکوێری و لەبەر، دانەیەکی باشتر لە بەرگی یەکەمی بۆ چێ دەکات. لە کتێبە ئەفسانەیییەکانەوە بینیبووم نیگاری دووەم، ئەوەی بە کوێری دەکێشرێت، سادەتر و بێگەردترە، بەڵام ڕەنگەکانی نیگاری یەکەم زیندووتر و پڕترن لە ژیان. بە ئەمەشدا بیرم کەوتەوە بیرەوەریی کوێران سادەییی بێبەزەییانەی ژیان دەخاتە ڕوو، بەڵام زیندووبوونی ژیان دەکوژێت.

وەستایەکی ڕاستەقینە و گەورەم و لەبەرئەوەی خوای بینەر و پێزانی گشت شتێکیش بێگومان ئەمە دەبینێت، دەزانم خۆیشم ڕۆژێک لە ڕۆژان کوێر دەبم، بەڵام ئایا ئێستا ئەمەم دەوێت؟ لەبەرئەوەی لە تاریکاییی بێ وێنە و بەسامی ژووری گەنجینە هەست دەکرا خوا زۆر نزیک بێت، من چەشنی کەسێک سزای هەڵواسینی

بۆ براببێتەوە و بیەوێت پێش پەڕاندنی سەری، جارێکی تر سەیری دیمەنی دەوروبەری بکات، بە خوای بڵند و گەورەم گوت: "با سەرجەم ئەم نیگارانە ببینم و چاوم لە بینینیان تێر بێت."

وەک حیکمەتێکی خوایی، لەو پەڕانەی هەڵم دەدانەوە، زۆر بەچڕی داستان و مەتەڵی کوێری دەکەوتە بەرچاوم. شێخ عەلی ڕەزای شیرازی لە نیگاری جڤاتی بەناوبانگی چوونی شیرین بۆ سەیران لە دەشت و دەر و بینینی نیگاری خەسرەو بە لکی دار چنارەوە و عاشقبوونی، دانە بەدانەی گەڵاکانی دارەکەی بەشێوەیەک کێشاوە سەرانسەری ئاسمانی گرتووەتەوە. لە وەڵامی گەمژەیەکدا کە سەیری نیگارەکەی بکردایە و بیگوتبایە دار چنار نا، بگرە کچی جوان بابەتی سەرەکیی ئەم نیگارەیە، عەلی ڕەزای شیرازی بۆ ئەوەی بە لەخۆ باییبوونەوە بیسەلمێنێت کە بابەتی سەرەکیی نەخش ئەڤینی کچی جوانکیلە نییە، بگرە ئەڤینی نیگارکێش خۆیەتی، هەوڵی دابوو هەمان دار چنار بەسەرجەم گەڵاکانییەوە لەسەر دەنکی برنج بکێشتەوە. حەوت ساڵ و سێ مانگ دوای دەستبەکاربوون، مامۆستای گەورە کوێر بوو و تەنیا توانیی نیوەی کار بەئەنجام بگەیەنێت. داری سەر دەنکە برنجەکە نا، بەڵام ئەگەر ئەم واژۆیەی وا بە لەخۆباییبوونەوە خراوەتە ژێر پێی جوانی یاوەرە خوێن شیرینەکانی شیرین، سەرم لێ تێک نەدات، کەواتە ئێستا من نیگاری شاهانەی داری سەر کاغەزی مامۆستای کوێرم لەبەردەستدایە. لە پەڕەیەکی تریشدا کوێرکردنی ئەسکەندەر بە تیری نووک دووسەری ڕۆستەمم بینی. نیگارکێش وەک ئەوەی ئاشنای شێوازی هندستان بێت، بەشێوەیەکی ڕەنگین و ورشەدار ئەم نیگارەی کێشاوە و کارێکی وای کردووە سەیرکردنی کوێری خولیای هەرگاڤ و خواستی شاراوەی نیگارکێشی دانسقە وەک سەیری شایی و بەزم بێتە بەرچاوی سەیرکەری نیگار.

چۆن کەسێک ساڵانێکی درێژ داستانی ئەم گشت نیگار و دەستنووسانەی بیستبێت و بەجۆشەوە بخوازێت بەچاوی خۆی سەیریان بکات، منیش بەشپرزەیی بەساڵاچوویەکی دەرککردوو بەوەی دوای ماوەیەکی کورت بەیەکجاری توانای بینین لەدەست دەدات، تەماشام دەکرد. قوماشەکانی ژووری گەنجینە بەهۆی ڕەنگی تۆز و





لەبەر ڕووناکیی نامۆی مۆمی ناو مۆمدانەکان ڕەنگێکی سووری تاریکی گرتبوو و من یەکەم جارم بوو ئەم ڕەنگەم دەبینی. کاتێک لەوێ دەنگێکی سەرسوڕمانم لێ بەرزدەبووەوە، قەرە و بستەباڵا جاروبار دەهاتنە لام و لەسەر شانمەوە سەیری پەڕەی شاکاری بەردەستی منیان دەکرد. منیش خۆم بۆ ڕا نەدەگیرا، دەمگێڕایەوە و دەمگوت:

"ئەمە سوورە، هەمان سووری میرزا بابا ئیمامیی مامۆستای گەورەی تەورێزی و ئەو ڕازی ئەم ڕەنگەی لەگەڵ خۆیدا بردە گۆڕەوە. لێواری ڕایەخەکە و نیشانەی قزڵباشی بەکڵاوی شای سەفەوییەوە و بڕوانن، لەم پەڕەیەشدا سکی شێرێک و لێرەشدا سەڵتەی ئەم کوڕە نازدارەی پێ بۆیاخ کردووە. ئەم ڕەنگە سوورە جوانە، جگە لە ڕژاندنی خوێنیان، خوا ڕاستەوخۆ پێشانی بەندەکانی خۆی نەداوە، بەڵام بەمەبەستی ئەوەی هەوڵ بدەین و بیدۆزینەوە، لە هەناوی مێرووی دەگمەن و لە نێوان تاشەبەرددا شاردوویەتییەوە. بەچاوی ڕووتیش، تەنیا لە قوماشی دەستکردی مرۆڤ و نیگاری بەرهەمی مامۆستایانی مەزندا دەبینرێت." ئەمەشم لێ زیاد دەکرد: "سوپاس بۆ خوا لەپای ئەوەی ئێستا ئەم ڕەنگە پێشانی ئێمە دەدات."

زۆر دواتر، دیسان خۆم بۆ ڕانەگیرا و گوتم: "سەیری ئەمە بکەن." نیگارێکی شاهانەم پێشان دان. نیگارێک بوو بۆ ئەوە دەشیا بخرێتە هەر کتێبێکی غەزەلەوە کە باس لە ئەڤین، دۆستایەتی، بەهار و کامەرانی بکات. سەیری دارەکانی بەهارمان کرد و بینیمان بەگشت ڕەنگی خۆیانەوە چرۆیان کردووە. تەماشای دار سەرووی ناو باخچەی بەهەشت و بەختەوەریی دڵدارانی ناو ئەو باخچانەمان کرد و بینیمان شەرابیان دەنۆشی و شیعریان دەخوێندەوە. لە ژووری سارد و سڕی گەنجینەدا، لەبری بۆنی کەڕوو و تۆز، هەستمان بە بۆنی گوڵی بەهار و بۆنی پێستی نەرم و نیانی عاشقانی بەختەوەر کرد. گوتم: "بڕوانن، نیگارکێش چەند لە دڵەوە نیگاری باسکی ئەڤینداران، پێی خاوس و جوانیان، زەرافەتی وەستانیان و شادمانیی پۆلە مەلی هەڵفڕیوی دەوروبەریانی کێشاوە. کەچی دار سەرووەکەی پشتەوەی چەند قەبە کێشاوە. ئەمە نیگاری لوتفیی بوخارایییە. ئەم نیگارکێشە لەبەر سەرکێشی و شەڕانگێزیی خۆی، هەموو نیگارێکی بە نیوەچڵی جێ هێشتووە و لەبەرئەوەی

دەیگوت کوا بزانم چی لەم نیگارە تێ دەگەن، لەگەڵ پادشا و خانان لێی دەبوو بەهەرا و نەیدەتوانی لە هیچ شارێکدا بمێنێتەوە. ئەم مامۆستا گەورەیە بەدەم شەڕەوە لە کۆشکی پادشایەکەوە دەچێتە کۆشکی یەکێکی تر و ئەم شار و ئەو شار دەکات و هیچ فەرمانڕەوایەک نەیدەتوانی بۆ کتێب ئامادەکردن داڵدەی بدات و ڕای بگرێت. ئەمیش دواجار پێوەندی دەکات بە نیگارخانەی بەگێگی گومناوی فەرمانڕەوای ناوچەیەکی شاخاویی ڕووت و ڕەجاڵەوە و دەڵێت – ڕەنگە وڵاتەکەی بچووک بێت، بەڵام خان لە نیگار تێ دەگات –. بیست ساڵی کۆتاییی ژیانی لەوێ ڕادەبوێرێت. تا ئەم ڕۆژگارەش مایەی دەمەتەقێ و گەپجاڕییە داخۆ زانیویەتی یان نەیزانیوە کە خانی گومناو کوێر و نابینا بووە."

ماوەیەکی درێژی دوای نیوەشەو گوتم: "ئایا ئەم پەڕەیە دەبینن؟" ئەمجار هەردووکیان بە مۆمدانەکانی دەستیانەوە بە قەڵەمبازێک خۆیان گەیاندە من. "ئەم کتێبە لە هەراتەوە تا ئێرە، لە سەردەمی نەوەی تەیمووری لەنگەوە تا ئەمڕۆ، لە ماوەی سەد و پەنجا ساڵدا دە خاوەنی گۆڕیوە." هەرسێکمان پێکەوە بە زەڕەبینەکەی من، واژۆ و دەقی بەدیاری پێشکێش کردن و ڕستەی مێژووی سەر کون و قوژبنی بەرگی ناوەوە و ناوی ئەو سوڵتانانەی لە ژیانی ڕاستەقینەدا یەکتریان کوشتبوو و ناوەکانیان لەسەر بەرگی کتێبەکە خزێندرابوونە پاڵ یەک و تەنیشت یەکەوە، گەورە کردەوە و خوێندمانەوە: "ئەم کتێبە، بەهاوکاریی خوا لە ساڵی هەشسەت و چل و نۆی کۆچی لە هەرات، لەسەر دەستی خۆشنووس سوڵتان وەلیی کوڕی موزەفەری هەراتی، بۆ "عصمت الدنیا"ی هاوسەری محەمەد جوکیی برای سەرفرازی بایسونگوری فەرمانڕەوای جیهان تەواو کراوە." خوێندمانەوە: ئەم کتێبە دواتر کەوتووەتە دەستی سوڵتان خەلیلی ئاکقۆیونلو، لەویشەوە بۆ یاقوب بەگی کوڕی، لەمیشەوە بۆ سوڵتانەکانی ئوێزبەک لە باکور. هەر یەکێک لەم سوڵتانانە ماوەیەک بەکامەرانی گەمەی بە کتێبەکە کردووە، یەک دوو نیگاری لێ دەرهێناوە، یەک دوویەکی تری لێ زیاد کردووە، هەر لە یەکەم خاوەنییەوە ڕووی جوانی ژنانی خۆیان لە نیگارەکان داوە و بەشانازییەوە ناوی خۆیان لەسەر بەرگەکەی نووسیووە. کاتێک سام میرزای برای شا ئیسماعیل شاری هەرات دەگرێت، کتێبەکە دەکەوێتە دەست



وی، ئەویش دەقێکی پێشکێشکردنی جودای لەسەر دەنووسێت و بەدیاری دەینێرێت بۆ کاکی. شا ئیسماعیلیش کتێبەکە دەباتە تەورێز و لەوێ فەرمان دەدات ئامادە بکرێت بۆ دیاری و دەستوور دەدات دەقی پێشکێشکردنیشی لەسەر بنووسرێت. پاشان یاوز سوڵتان سەلیمی بەهەشتنشین لە شەڕی چاڵدێران شا ئیسماعیل تێک دەشکێنێت و کۆشکی هەشت بەهەشت لە تەورێز تاڵان دەکات و کتێبەکە لەگەڵ شەڕوانانی سوڵتانی سەرکەوتوودا بیابان و چیا و ڕووبار دەبڕێت و دێتە ئەم ژووری گەنجینەیە لە ئەستەنبوڵ.

ئەرێ قەرە و بستەباڵا تا چ ڕادەیەک هاوبەشی سەرنج و جۆش و خرۆشەکانی منی بەساڵاچوو بوون؟ تا زیاتر دەستنووسی ترم دەکردەوە و پەڕەکانیم هەڵدەدایەوە، لە ناخی خۆمدا هەستم بە خەم و حەسرەتی هەزاران نیگارکێش دەکرد لەوانەی لە سەدان شاری گەورە و بچووک لە خزمەتی پادشایانی زۆردار و خان و بەگانی خوو و ڕەوشت لە یەکتر جیاواز تا کوێراییی چاوانیان داهاتووە، نیگاریان کێشاوە و هونەریان پێشان داوە. کاتێک بەشەرمەوە پەڕەی کتێبێکی پریمیتیڤی پێشاندەری شێواز و ئامێرەکانی ئەشکەنجەم هەڵدەدایەوە، هەستم بە تێ هەڵدانەکانی سەردەمی شاگردیی هەموومان، لێدانی ڕوومەتمان بە پشتی ڕاستە تا سووربوونەوە و لێدانی سەری تاشراومان کرد بە مۆری مەڕمەڕ. من نازانم ئەم کتێبە چەپەڵە لە گەنجینەی عوسمانیدا چی دەکات؟ ئاشکرایە گاورانی گەڕۆک، لەبری ئەوەی ئەشکەنجەی ژێر چاودێریی قازی وەک شێوازێکی ناچاری بۆ سەپاندنی دادپەوەریی خوا لە دنیا ببینن، بۆ ئەوە بەکاری دێنن تا بۆ هاوئاینیانی خۆیانی بسەلمێنن ئێمە چەند زۆردار و دڵڕەقین و هەندێک نیگارکێشی بێ ڕەوشتی ئێمەش لە بەرامبەر چوار پێنج زێڕ لە دەستیان دێت ئەم نیگارە بێ بەهایانەیان بۆ بکێشن. بەڵام من هەستم بەشەرم کرد لەپای ئەو چێژە چەپەڵەی نیگارکێش کە لە کاتی کێشانی نیگاری هەموو ئەم شتانەدا هەیبووە و من ئێستا پەیم پێ دەبرد: فەلاقە، دارکاریکردن، لە چوارمێخەدان، هەڵواسین، هەڵواسینی سەربەرەوخوار، لە قولاپدان، دانیشاندن لەسەر مێخزنجیر، خستنە ناو تۆپ و فڕاندن، خنکاندن، ملپەڕاندن، خستنە بەر سەگی برسی، قامچیڕێژکردن، خزاندنە جەواڵەوە، لە مەنگەنەدان، لە ئاوی سارد

هەڵکێشان، قژ ڕنینەوە، شکاندنی پەنجە، گروونی لەسەرخۆی پێست، لووت شکاندن و چاو دەرهێنان. تەنیا مامۆستایانی ڕاستەقینەی وەک ئێمە، کە بەدرێژاییی ساڵانی شاگردیمان فەلاقە کراوین، هەر لە خۆوە تێمان هەڵدراوە، بەر زللە دراوین بۆ ئاسوودەکردنی دڵی مامۆستایەک کە هێڵی چەوتی کێشاوە و تووڕە بووە، بەمەبەستی کوشتنی ئیبلیسی هەناومان و گۆڕینی بۆ جنۆکەی نیگارکێشان چەندین سەعات بە تێلا و ڕاستە لێمان دراوە، ئەو چێژە قوڵە لە کێشانی نیگاری فەلاقە و ئەشکەنجە وەردەگرین و دەتوانین وەک بۆیاخکردنی فرفرۆکەی منداڵ، بە ڕەنگی گەش و بە باق و بریق بۆیاخیان بکەین.

ئەوانەی ئاوڕێک لە دنیای ئێمە دەدەنەوە، ڕێک وەک ئەوانەی دوای سەدان ساڵ لە کتێبەکاندا سەیری نیگارەکانی دەستکردی ئێمە بکەن و لە دوورەوە و بێ حاڵیبوونی تەواو سەرنجیان لێ بدەن و خوازیار بن نزیک ببنەوە و لێیان تێ بگەن، بەڵام پشووکورتیشن، مەگەر هەر ئەوان بتوانن پەی بەو شەرم و کامەرانی و ئازارە قووڵە و چێژی چاوە ببەن کە من لە کاتی سەیرکردنی نیگارەکان لەم ژوورە ساردەی گەنجینەدا هەستی پێ دەکەم، بەڵام باوەڕیش ناکەم بتوانن بەتەواوی لێی تێ بگەن. کاتێک قامکی پیری لەتاو سەرما هەست لێبڕاوم پەڕەکانیان هەڵدەدایەوە، زەڕەبینی دەسک گەوهەر و ڕەنجکێشم و چاوی چەپم وەک ئەوەی لەقلەقێکی کۆچەری بێت و گشت دنیا گەڕابێت، بێ سەرسوڕمان، بەڵام بە شەیدابوونەوە سەیری دیمەنی ژێر خۆیان دەکرد و شتی نوێیان دەخوێندەوە و تێپەڕ دەبوون. لەو پەڕانەوەی ساڵانێکی درێژ پێشانی ئێمە نەدرابوون و داستانی هەندێکیانم بیستبوو، حاڵی بووم کام نیگارکێش لە کێوە فێری چی بووە؛ ئەو شتەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن شێواز، لە کام نیگارخانە و لە سایەی کام پادشادا قاڵبی گرتووە؛ کام مامۆستای ئەفسانەیی لە خزمەتی کێدا کاری کردووە؛ یان بۆ نموونە، من خۆم دەمزانی پەڵە هەوری سەر شێوازی چینی بەهۆی کاریگەریی چینەوە لە هەراتەوە هاتووە و لە سەرانسەری وڵاتی عەجەمدا بڵاوبووەتەوە، بەڵام کاتێک زانیم لە قەزوینیش بەکار هێنراوە، جاروبار و خۆبەخۆی خۆم "وای"ەکم لێ بەرز دەبووەوە، بەڵام ئەو ئازارەی لە شوێنێکی قوڵتری هەناومدا هەستم پێ دەکرد و ئەو خەم و شەرمەی توانای ئەوەم نییە ئێوەی تێدا بکەم بەهاوبەش، پێوەندیی هەبوو بە: ئەو ئازارانەی نیگارکێشانی



شۆخ و ڕوو وەک مانگ –لە سەردەمی شاگردییاندا ڕووی زۆربەیان لەسەر دەستی مامۆستاکانیان دەشێوێندرا–، چاو چەشنی چاوی ئاسک و بەژن وێنەی چڵی ڕەیحان لە پێناوی نیگار دەیانکێشا؛ سووکایەتی پێکردنیان؛ ئەو جۆش و ئومێدەی هەستیان پێ دەکرد؛ چەکەرەکردنی ئەڤین لە نێوان ئەمان و مامۆستاکانیاندا؛ ئەڤینی هاوبەشی نیگار و لەبیرچوون و ئەو کوێرییەی لە کۆتاییی ساڵانی تەمەندا پێی دەگەیشتن.

لەبەرئەوەی ساڵانێکی درێژ بوو نیگاری شەڕ و خۆشیم بۆ سوڵتانمان دەکێشا، بەو خەم و شەرمەوە چوومە دنیای هەستە جوان و زراڤەکانەوە و ڕۆحم خەریک بوو بە بێدەنگی لەبیری دەکرد کە دەکرێت نیگاری ئەم دنیایە بکێشرێت. لە دەفتەرێکی نیگاردا کوڕێکی لێو سوور و قەد باریکم بینی، ئەویش وەک ئەوەی من لەو ساتەدا دەمکرد، کتێبێکی نابووە باوەشی و ئەو شتەم بیرکەوتەوە کە سەرجەم پادشایانی ئالوودەی زێڕ و دەسەڵات لە بیری دەکەن: گشت جوانییەک هی خوایە. لە پەڕەی دەفتەرێکی نیگاری تردا نیگاری دوو دڵداری گەنجی لە ڕادەبەدەر جوان و عاشقی یەکترم بینی بەدەستی مامۆستایەکی لاوی ئەسفەهانی کێشرابوو. بەدەم هەڵڕشتنی فرمێسکەوە سەیرم کرد و ئەڤینی شاگردە جوانەکانی خۆم بۆ نیگار بیرکەوتەوە. کچەی شۆخ، لێو گێلاسی و چاو بادەمی و لووت بچووک و بەژن وەک چڵی ڕەیحان بوو. کوڕەش، پێ بچووک وەک کچە، پێست ئاڵ و باریکەڵانە بوو. بە بایەخەوە قۆڵی خۆی هەڵکردبوو و پێستی بازووی، سەرەتا ئارەزووی ماچ و دواتریش مردنی دەورووژاند. بۆ پێشاندانی هێزی ئەڤین و پابەندبوونی بە کچەوە، بە ئاگر سێ نیشانەی بچووک و قووڵی ئەڤینی لەسەر مەچەکی جوانی کێشابوو و پێشانی کچەی دەدا. کچەش وەک ئەوەی سەیری سێ گوڵی جوان بکات، بەسەرسامی بۆی دەڕوانین.

ترپەی دڵم بەشێوەیەکی سەیر زیادی کرد. چین چین ئارەقە لە تەوێڵم نیشت. لە ساڵانی سەرەتای شاگردیشمدا، شەست ساڵ لەمەوبەر، کاتێک سەیری ئەو نیگارە بێ ئەدەب و نیوەڕووتانەم دەکرد کە لە تەورێزەوە دەهێندران و بەشێوازی قەڵەمی ڕەش و سپی دەکێشران و کوڕی جوانی پێست مەڕمەڕی و کچی بەژن زراڤ و مەمک بچووکیان پێشان دەدا، بەهەمان شێوە جەستەم لە ئارەقە دەنیشت. پاش

یەکەم هەنگاوم بەرەو وەستایی و چەند ساڵێک دوای ژنهێنانم، کوڕێکی ڕوو فریشتەیی و چاو بادەمی و پێست جوانی گوڵ ئاسا بۆ شاگردی هێنرابووە نیگارخانە. ئێستا، ئەو قوڵاییی بیرکردنەوە و ئەڤینی نیگارەم بیر دەکەوێتەوە کە ئەو دەمە لە کاتی سەیرکردنی ئەو کوڕەدا هەستم پێ کردبوو. تاوێک بەهێزەوە هەستم کرد نیگارکێشان پێوەندیی بەشەرم و خەمەوە نییە، بگرە پەیوەستە بە خواستێکەوە کە من بیرم لێ دەکردەوە؛ هونەری وەستای نیگارکێش دەسپێک خواستی خۆی وەردەگەڕێنێتە سەر ئەڤینی خوا و ئەڤینی خواش وەردەگێڕێتە سەر ئەڤینی ئەو دنیایەی کە خوا دەیبینێت. بۆیە وام دەزانی سەرجەم ئەو ساڵانەی بەدانیشتنەوە تەختەی نیگارکێشم نابووە باوەشم و کووڕیی پشتم دەرپەڕاندبوو و بەسەرم بردبوو، گشت ئەو تێ هەڵدانانەی بۆ فێربوونی هونەر خواردبووم، سووربوونم لەسەر ئەوەی لە نیگارکێشاندا خۆم کوێر بکەم و گشت ئەو ئازارەی نیگارکێشان، کە هەم خۆم چێشتبووم و هەم دەرخواردی خەڵکی ترم دابوو، وەک سەرکەوتنی چێژێکی شاد بەسەر بردووە. وەک سەیرکردنی شتێکی تابوو، ماوەیەکی درێژ بێدەنگ و بەهەمان چێژەوە بۆ ئەم نیگارەم ڕوانی. زۆر دواتر، هێشتا هەر تەماشام دەکرد، دڵۆپێک فرمێسک لە چاوم ڕژا، بە گۆنامدا هاتە خوارێ و تێکەڵ بەڕیشم بوو.

کاتێک بینیم یەکێک لە مۆمدانانەی هێدی هێدی لە ژووری گەنجینە دەگەڕان، بەرەو من دێت، دەفتەری نیگارەکەم داخست و لە گۆترە یەکێک لەو دەستنووسانەم کردەوە کە پێش کەمێک بستەبالا لە تەنیشتمەوە دای نابوو. ئەمەش دەفتەرێکی نیگاری بەتایبەت بۆ پادشایان ئامادەکراو بوو: لە لێواری سەوزاییییەک دوو ئاسکی دڵداری یەکترم بینی ڕەوێک چەقەڵ ئیرەییییان پێ دەبردن. ئەو پەڕەیەم هەڵدایەوە: نیگاری ڕەوێک ئەسپی خەنەیی و شێم بینی و لە دڵی خۆمدا گوتم مەگەر هەر مامۆستایانی دێرینی هەرات بتوانن نیگاری وا بیکێشن. چەند جوانن. ئەو پەڕەیەشم هەڵدایەوە: نیگاری نووسیارێکم بینی بەمتمانە بەخۆبوونەوە دانیشتبوو: نیگارێکی حەفتا ساڵە بوو. دیاربوو نەمدەتوانی بەڕوویدا بزانم کێیە، چونکە وەک گشت کەسێک دەچوو. خەریک بووم بڵێم هەوای نیگارەکە و بۆیاخکردنی ڕیشی کابرای دانیشتوو بەچەند ڕەنگێک چەند شتێکی هێنایەوە بیرم. لێدانی دڵم خێراتر بوو، دەستە دانسقەکەی ناو نیگارەکەم ناسییەوە، دڵم بەر لە خۆم پەی پێ بردبوو،



تەنیا ئەو دەیتوانی دەستێکی هێندە جوان بکێشێت. نیگارەکە دەستکردی مامۆستای گەورە بەهزاد بوو. وا هەستم کرد تیشکێکی دەرچوو لە نیگارەکەوە لە ڕووی منی دابێت.

ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر، چەند جارێک نیگاری دەستکردی مامۆستای گەورە بەهزادم دینبوو، بەڵام لەوانەیە لەبەرئەوەی بەتەنیا خۆم نا، بگرە ساڵانێک لەمەوبەر لەگەڵ مامۆستایانی تردا سەیرم کردووە، یاخۆ لەبەرئەوەی تەواو دڵنیا نەبووین نیگاری بەهزادی مەزن بێت، هەرگیز وەک ئێستا چاوم ڕەشکە و پێشکەی نەکردبوو.

وەک بڵێی تاریکیی ئەنگوستەچاوی ژووری گەنجینەی بۆن کەڕوواوی بەم نیگارە ڕووناک بووەوە. ئەم دەستە جوان کێشراوە، لەگەڵ ئەو باسکە جوان و دەگمەنەی نیشانەی ئەڤینی لەسەر داخ کراوە و کەمێک لەمەوبەر بینیم، لە سەرمدا یەکیان گرت. سوپاسی خوام کرد لەپای ئەوەی پێش کوێربوونم، ئەم جوانکارییانەی پێشان داوم. لە کوێوە دەزانم بەم زووانە کوێر دەبم؟ نازانم. قەرە مۆمدانێکی بەدەستەوە بوو و لێم نزیک کەوتەوە و سەیری پەڕەکەی بەردەستی منی کرد. تاوێک هەستم کرد دەتوانم ئەم پەی پێبردنەم بەو بڵێم، بەڵام شتێکی ترم لە دەم دەرچوو.

"سەیری جوانیی ئەم دەستە بکە. کاری بەهزادە."

وەک ئەوەی دەستی نەرم و پێستی قەدیفەییی شاگردێکی منداڵی جوانکیلە بگرم، لەوانەی لە تافی لاویمدا هەریەکەیانم بەجۆرێک خۆش دەویست، دەستم هەر لە خۆیەوە دەستی قەرەی گرت. دەستی تەخت و ساغڵەم بوو؛ لە دەستی من گەرمتر بوو؛ ئەو جێیەی ماسوولکەکانی مەچەکی و قۆڵی بەیەک دەگەیشتن، وەک من ئارەزووم دەکرد، تەنک و پان بوو. لە گەنجیمدا، بەر لەوەی ناولەپی دەستی شاگردێکی منداڵ بگرم و فێری بکەم چۆن قەڵەم بەدەستەوە بگرێت، بەخۆشەویستییەوە چاوم لە چاوی ترساو و جوانی دەبڕی. بەهەمان شێوە بۆ قەرەشم ڕوانی. گڕی مۆمەکانی ناو مۆمدانی دەستیم لە گلێنەی چاوەکانیدا بینی. گوتم: "سەرجەم ئێمەی نیگارکێشان براین، بەڵام ئێستا کۆتایی بەگشت شتێک دێت."

"چۆن؟"

مامۆستایەکی گەورە لەوانەی تەمەنی خۆی بە خاقانێک، بە شازادەیەک داوە و لە نیگارخانەی ئەودا بەرێبازی مامۆستایانی دێرین شاکاری ئافراندووە و تەنانەت هەوڵی داوە نیگارخانە شێوازێکی تایبەت بەخۆی هەبێت، کاتێک خانی داڵدەدەر لە گشت شەڕەکاندا دەدۆڕێت، لەبەرئەوەی ئەم دەزانێت ئەو سەرداره نوێیانەی لە دوای ڕەوە سەربازی تالانکەری دوژمنەوە دێنە شارەوە، نیگارخانەکەی تێک دەدەن، بەرگی کتێبەکانی دەدڕن و پەڕەکانی دەشێوێنن، ئەو شتە بچووکانەی لە داهێنانی خۆی بوون و لە نەخشدا باوەڕی پێیان هەبووە و چەشنی منداڵی خۆی خۆشی دەویستن، دوژمن سووکایەتیی پێ دەکات و خراپی دەکات، چۆن لەو کاتەدا دەیەوێت کوێر بێت و دەڵێت: "ئێستا کۆتایی بەگشت شتێک دێت"، منیش قسەکەی خۆم بەهەمان جۆر کردبوو. بەڵام پێویست بوو بەجۆرێکی تر ئەمە بۆ قەرە بگێڕمەوە.

گوتم: "ئەم نیگارە کاری شاعیری گەورە عەبدوڵا هاتفییە. ئەمە شاعیرێکی فرە پایە بڵند بووە. کاتێک شا ئیسماعیل دەچێتە هەراتەوە، هەموان سالووسی و مامەحەمەییی بۆ دەکەن، بەڵام ئەو لە جێی خۆی ناجووڵێت. شا ئیسماعیلیش پێ بەپێی ئەو تا ماڵەکەی لە دەرەوەی شار دەڕوات. ئێمە لە ڕووی هاتفیی بەدەستی بەهزاد کێشراوەوە نا، بە نووسینەکەی ژێریدا تێ دەگەین ئەمە نیگاری هاتفییە. وا نییە؟"

قەرە بەچاوانی جوانی بۆ منی ڕوانی و گوتی: "بەڵێ."

گوتم: "کاتێک بۆ دەموچاوی شاعیری ناو نیگارەکە دەڕوانین، دەبینین ڕووێکە وەک هەموو سیمایەکی تر. عەبدوڵا هاتفیی خوا لێخۆشبوو ئەگەر ئێستا لێرە بوایە، نەماندەتوانی بەسەیرکردنی ڕووی لەم نیگارەدا بیناسینەوە، بەڵام دەمانتوانی بەسەرجەم نیگارەکەدا بیناسینەوە: شتێکی وا لە هەوای نیگارەکە و وەستانی هاتفی و ڕەنگەکان و زەرکاری و ئەو دەستە جوانەی دەستکردی مامۆستا بەهزاددا هەیە کە دەستبەجێ وا لە مرۆڤ دەکات بە ئەقڵیدا بێت ئەمە نیگاری شاعیرێکە، چونکە لەم نیگارەماندا، واتا پێش شێوە کەوتووە. ئێستا ئەگەر بەلاساییکردنەوەی مامۆستایانی فەرەنگ و ئیتاڵی دەست بکرێت بەکێشانی نیگار بۆ ئەو کتێبەکەی کە سوڵتانمان زاوای خوا لێخۆشبووی ڕاسپاردبوو بۆ ئامادەکردنی، تەواوی ئەم دنیای



واتایە کۆتاییی پێ دێت و دنیای شێوە دەست پێ دەکات بە شێوازی فەرەنگ..."

قەرە بەزبری گوتی: "زاوای خوا لێخۆشبووم کوژراوە."

وەک ئەوەی بەرێزەوە دەست بەدەستی بچووکی شاگردێکی لاودا بێنم، کە چاوەڕێ دەکرێت لە داهاتوودا شاکار بئافرێنێت، دەستی قەرەم لە دەستی خۆمدا گوشی. ماوەیەک بە بێدەنگی و ڕێزەوە سەیری شاکارەکەی بەهزادمان کرد. دواتر قەرە دەستی لە دەستم دەرهێنا. گوتی:

"سەیری لووتی ئەسپە خەنەیییەکانی پەڕەی پێشووترمان نەکرد و بەزوویی بازمان دا بەسەریدا."

گوتم: "هیچی تێدا نەبوو." بۆ ئەوەی بشیبینێت، پەڕەکەی پێشووترم هەڵدایەوە: هیچ شتێکی نائاسایی لە کونی لووتی ئەسپەکاندا نەبوو.

قەرە وەک منداڵ پرسی: "کەی ئەسپە لووت ناقۆڵاکان دەدۆزینەوە؟"

بەڵام کاتێک من و بستەباڵا لە کاتی نێوان نیوەشەو و بەرەوبەیاندا شانامەی ئەفسانەییی شا تەهماسپمان لەژێر قوماشی ئاوریشم و ئەتڵەسی سەوزی ناو سندووقێکی ئاسندا دۆزییەوە، قەرە لەسەر ڕایەخێکی سووری ئوشاق خۆی لوولدابوو، سەری نابووە سەر بالیفێکی قەدیفەی بە مرواری نەخشێندراو و خەوی لێ کەوتبوو. دوای ئەو گشت ساڵە، هەر هێندەی چاوم بە کتێبی ئەفسانەیی کەوت، یەکسەر ناسیمەوە. بۆ من ڕۆژ تازە دەستی پێ دەکرد.

ئەم کتێبە هێندە گەورە و گران بوو کە من و جەزمی ئاغا بەزۆر بەرزمان کردەوە و گواستمانەوە. بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر لە دوورەوە چاوم بە بەرگەکەی کەوتبوو. کاتێک دەستم بۆ برد، لێم ڕوون بووەوە چەرمەکە تەختەی تێدایە. پێش بیست و پێنج ساڵ، کاتێک سوڵتان سلێمانی قانوونی دەمرێت، شا تەهماسپ هێندە خۆشحاڵ دەبێت بە ڕزگاربوون لەو سوڵتانەی سێ جار تەورێزی داگیر کردبوو، لەگەڵ باری چەندین حوشتر دیاری، دەستنووسێکی دانسقەی قورئانی پیرۆز و ئەم کتێبە، کە جوانترین کتێبی گەنجینەی خۆی دەبێت، بۆ سوڵتان سەلیمی جێگرەوەی سوڵتان سلێمانی قانوونی دەنێرێت. کتێبەکە لە پێشدا لەگەڵ شاندێکی سێ سەد کەسیی عەجەم دەچێتە جێڕاوگەی زستانەی سوڵتانی نوێ لە ئەدرنە. کاتێک لەگەڵ

دیارییەکانی تر بەسەر پشتی حوشتر و هێسترەوە بۆ ئەستەنبوڵ دەهێنرێتەوە، پێش ئەوەی ببرێتە گەنجینە و قفڵی لەسەر دابخرێت، قەرە مەمیی گەورەی نیگارکێشان و ئێمەی سێ مامۆستای گەنجی وی، هەر چوارمان چووین بۆ سەیرکردنی. ئەو ڕۆژە ئێمەش چەشنی ئەو ئەستەنبوڵییانەی بۆ سەیرکردنی فیلی لە هندستانەوە هاتوو، یان زەڕافەی لە ئەفریقاوە هاتوو بۆ کۆشک دەچن، ڕوومان لە کۆشک کرد و لە ڕێگا لە مامۆستا قەرە مەمیم بیست مامۆستای گەورە بەهزاد بەپیری لە هەراتەوە چووەتە تەورێز، بەڵام لەبەرئەوەی کوێر بووە، دەستی لەم کتێبە نەداوە.

ئەو سەردەمە، سەیرکردنی کتێبێک بە دووسەد و پەنجا نیگاری گەورەوە، بۆ ئێمەی نیگارکێشانی عوسمانیی شەیدای کتێبێکی ئاساییی حەوت هەشت نیگاری وەک ئەوە وابوو سەرجەم دانیشتوانی ناو کۆشکێکی شاهانە نووستبن و ئێمە بەناویدا بگەڕێین. چەشنی ئەوەی سەیری باخچەکانی بەهەشت، کە بەچەرجوویێک بۆ ماوەیەکی کورت هاتبێتە بەرچاومان، بە نەوازییەکی بێدەنگەوە و بێ ئەوەی ورتەمان لە دەم بێتە دەر، سەیری پەڕە لە ڕادەبەدەر جوانەکانی کتێبەکەمان کرد.

بەدرێژاییی بیست و پێنجساڵی دوای ئەو ڕۆژە باسی ئەم کتێبەی لە گەنجینە قفڵ لەسەر داخراوەمان کرد.

دوای بیست و پێنج ساڵ، وێنەی ئەوەی دەرگای زەبەلاحی کۆشکێک بکەمەوە، بەرگی ئەستووری شانامەی ئەفسانەییم هەڵدایەوە، بەڵام بەدەم هەڵدانەوەی پەڕەکانییەوە، کە هەریەکەیان خشەیەکی خۆشی لێوە دەهات، لەبری سەرسام بوون، هەستێکی خەمگین لە ناخمدا چەکەرەی کرد.

١- لەبەر قسە و قسەڵۆکی سەبارەت بەوەی سەرجەم نیگارکێشانی ئەستەنبوڵ شتیان لە پەڕەکانی ئەم کتێبە دزیوە و بەکاریان هێناوە، نەمدەتوانی هۆشی خۆم بخەمە سەر نیگارەکان.

٢- لەبەرئەوەی تەواوی سەرنجی خۆم خستبووە سەر ئەوەی بەڵکو لە گۆشەیەکدا چاوم بەدەستێکی کێشراو بەدەستی مامۆستا بەهزاد بکەوێت، نەمدەتوانی هۆشی خۆم بخەمە سەر ئەو شاکارانەی (تاهموراس چەند بڕیاردەرانە و بەزەرافەتەوە گورزی لە سەری ئەو ئیبلیس و دێوانە دەوەشاند کە دەبوو دواتر لە سەردەمی ئاشتیدا فێری ئەلفوبێ و زمانی یۆنانی و زمانی تری جۆربەجۆریان بکردایە.) لە هەر پێنج شەش پەڕەیەکی کتێبەکەدا جارێک دەردەکەوتن.

٣- کونی لووتی ئەسپەکان و هەبوونی قەرە و بستەباڵا ئاستەنگ بوون لەبەردەم قوڵبوونەوەی تەواومدا لەو شتانەی دەمبینین.

پێش ئەوەی پەردەی ڕەشی قەدیفەیی، کە وەک چاکەی خوا لە سەرجەم نیگارکێشانی گەورە نزیک دەبێتەوە، بەسەر چاوم دابدرێتەوە، من لە ئەنجامی هەلڕەخساندنێکی جوامێرانەی خواوە توانیم تێری دڵ سەیری ئەم کتێبە ئەفسانەیییەم بکەم. ئەمە بەقەد ئەوەی بەختەوەرییەکی گەورە بوو بۆ من، هێندەش مایەی خەم بوو بۆم، چونکە زیاتر بە ئەقڵ سەیرم دەکرد، نەک بەدڵ. ژووری گەنجینە تا دەهات وەک گۆڕ دەچوو و تا ئەو دەمەی تیشکی بەیانی خۆی پێدا دا، من سەرجەم دووسەد و چل نۆ (پەنجا نەبوو) نیگارەکەی ناو ئەم کتێبە شاکارەم بینی. بە ئەقڵ تەماشام کرد؛ با هەروەک زانایانی عەرەبی خولیاداری ئەقڵ، جیایان بکەمەوە و باسیان بکەم.

١- لەناو ئەم ئەسپانەدا چاوم بە ئەسپێک نەکەوت کونی لووتی هاوشێوەی نیگارەکەی بکوژی نامەرد بێت: ڕەوە ئەسپێکی جۆراوجۆر کاتێک ڕۆستەم لە کاتی ڕاونانی ئەسپدزاندا لە تووران دەیانبینێت؛ ئەو ئەسپە دانسقانەی شا فەرەیدوون گاڤێک سوڵتانی عەرەب مۆڵەت نادات و ئەمان بە مەلە لە ئاوی دیجلە دەپەڕنەوە؛ ئەو ئەسپە بۆزانەی لە دوورەوە بە خەمباری سەیر دەکەن چۆن توور ناپیاوانە و نامەردانە ئیرەجی برای سەردەبڕێت، چونکە باوکیان وڵاتی ڕۆمی دووری دابوو بە یەکێک لە کوڕەکانی و وڵاتی چینی دوورتریشی دابوو بە کوڕێکی تری، بەڵام وڵاتی خۆش و دڵگیری ئێرانی بۆ ئیرەجی کوڕی هەرە بچووکی دانابوو. بۆیە توور ئیرەییی پێ برد و بەو دەردەی برد؛ ئەسپەکانی سوپای قارەمانی ئەسکەندەر، سوپای پشتئەستوور بە سوارەی هەزارا(*) و میسری و بەربەر و عەرەب و نوقمی زرێ و قەڵغانی ئاسن و شمشێری لە شکاننەهاتوو و خوودەی درەوشاوە؛ ئەو ئەسپە ئەفسانەیییەی کەنار گۆلێکی سەوز بەشێوەیەکی

(*) هەزارا: گەلێکە لە ئەفغانستان. - وەرگێڕ -

چاوەڕواننەکراو و بە دادپەروەریی خوا شا یەزدگورد دەکوژێت. ئەم شایە لەبەرئەوەی بەرەنگاری ئەو چارەنووسە بووبووەوە کە خوار بۆی نووسیبوو، بەردەوام خوێن لە لووتی دەڕۆیشت و ئەو ڕۆژە چووبووە لێواری گۆل بەئومێدی ئەوەی ئاوەکەی چاکی بکاتەوە؛ لەم سەدان ئەسپە ئەفسانەییی و ڕاستەقینەیەدا، کە سەرجەمیان بەدەستی شەش حەوت نیگارکێش کێشرابوون، ئەو نیشانەیەم نەدۆزییەوە؛ بەڵام لە ڕۆژێک زیاتر کاتم هەبوو بۆ ئەوەی چاو بە کتێبەکانی تری گەنجینەدا بگێڕم.

٢- بانگەشەیەک لە ئارادا هەیە و ماوەی بیست و پێنج ساڵی ڕابردوو بەردەوام بابەتی قسە و قسەڵۆکی ناو وەستایانی نیگارکێش بووە: نیگارکێشێک بەدەستووری سوڵتان چووەتە ئەم گەنجینە هیچ کەس پێ نەگەیشتووە، ئەم کتێبە شاکارەی دۆزیوەتەوە، کردوویەتییەوە، لەبەر تیشکی مۆم و لە دەفتەری نموونەییدا زۆر ئەسپ، دار، هەور، گوڵ، مەل، باخچە و جڤاتی شەڕ و ئەڤینی لەبەر گرتووەتەوە و دواتر بەکار هێنراوە... هەر کاتێک نیگارکێشێک شتێکی دانسقە و لە وزەی ئەقڵ بەدەری بکێشایە، ئەوانی تر لەتاو ئیرەیی پێبردن ئەم بانگەشەیەیان بۆ دەکرد. کەمێکیش مەبەستیان بوو ناوی بزڕێنن و سووکی بکەن و بڵێن ئەم نیگارە لە تەورێزەوە هاتووە و کاری عەجەمە. ئەو سەردەمانە تەورێز ولاتی سوڵتانمان نەبوو. کاتێک ئەم بوختانە بۆ من دەکرا، هەستی هەڵچوونێکی ڕەوا و شانازییەکی شاراوەم لە کن دەورووژا و کاتێک بۆ کەسانی تریش کراوە، من باوەڕم پێ کردووە. ئێستا بە خەمگینی و بەشێوەیەکی سەیر دەمبینی ئێمە، ئەو چوار نیگارکێشەی بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر تەنیا جارێک سەیری ئەم کتێبەمان کردووە، لە بیرەوەریی خۆماندا هەڵمان گرتووە و بەدرێژاییی ئەو ماوەیە لە مێشکی خۆماندا هێناومانە و بردوومانەوە و بیری خۆمان خستووەتەوە و لە کتێبەکانی سوڵتانەکاندا نیگاریمان کێشاوەتەوە. خەفەتم بۆ دڵڕەقیی ئەو سوڵتانە ڕاڕایانە نەدەخوارد کە ئەم کتێبە، یان کتێبی تریشیان لە گەنجینەی خۆیان دەرنەدەهێنا و نەیاندەخستە پێش چاوی ئێمە، بگرە بەرکەوتەی ئەوە بووم دنیای نەخش و نیگاری ئێمە چەند سنووردار بوو. چ مامۆستایانی گەورەی هەرات



و چ مامۆستایانی نوێی تەورێز و سەرجەم نیگارکێشانی عەجەم، بەبەراورد لەگەڵ ئێمەی نیگارکێشانی عوسمانیدا، نیگاری بێ کێماسیتر و شاکاریان کێشاوە.

تاوێک بیرم کردەوە شتێکی باش دەبێت ئەگەر دوای دوو ڕۆژی تر خۆم و سەرجەم نیگارکێشانم ئەشکەنجە بدرێین. بە نووکی قەڵەمتاشەکەم دڵڕەقانە چاوانی ڕوویێک لەو ڕووانەم هەڵکۆڵی کە لە نیگارەکەی بەردەممدا پێش ئەوانی تر کەوتە بەردەستم. ئەمە چیرۆکی زانایەکی عەجەم بوو سەیری تەختەی دامە و ئەو داشانەی دەکرد کە باڵیۆزی هندستان هێنابوونی و فێری یاریی شەترەنج بووبوو و یەکسەر دوای فێربوونیشی، لە کابرای هندستانی بردبووەوە. درۆی عەجەم. چاوی یەک بەیەکی ئەوانەی گەمەی شەترەنجیان دەکرد و پادشا و پیاوانی بینەری گەمەکەشم هەڵکۆڵی. پەڕەکانم بۆ دواوە هەڵدایەوە و چاوی یەک بەیەکی ئەو پادشایانەی دڵڕەقانە شەڕیان دەکرد و چاوی سەربازانی زرێپۆشی سوپا ڕازاوەکان و چاوی ئەو سەرانەی بڕابوون و لە زەوی کەوتبوون، بێبەزەییانە هەڵکۆڵی. دوای ئەوەی ئەم کارەم لە سێ پەڕەدا کرد، قەڵەمتاشم نایەوە پشتوێنەکەم. دەستەکانم وەلەرزین کەوتبوون، بەڵام هەستم نەدەکرد زۆر خراپ بم. لە ماوەی پەنجا ساڵی ژیانی نیگارکێشیمدا تووشم بووبوو بە تووشی دەیان شێتەوە لەوانەی ئەم کارە سەمەرەیەیان کردبوو. ئایا ئێستا من تێ دەگەیشتم ئەوان لە کاتی کردنی ئەو کارەدا هەستیان بەچی کردووە؟ دەمویست لەو چاوانەوەی هەڵم کۆڵیبوون، خوێن بڕژایەتە نێوان پەڕەکانی کتێبەکەوە.

٣- ئەمەش دەمگەیەنێتە سەر ئێش و دڵدانەوەی کۆتاییی تەمەنم. شا تەهماسپ ماوەی دە ساڵ نیگارکێشانی عەجەمی خستبووە کار و ئەم کتێبە نازدارەی پێ ئامادە کردبوون، بەڵام قەڵەمی مامۆستای گەورە بەهزادی پێدا نەهێناوە و دەستە جوانەکانی نیگاریان لە هیچ شوێنێکیدا نەکێشاوە. ئەمە پشتڕاستی دەکردەوە ئەو کاتەی بەهزاد لە هەراتی لەبەرچاو کەوتووەوە چووەتە تەورێز، کوێر بووە. بەمجۆرە جارێکی تریش بە خۆشحاڵییەوە تێ گەیشتم مامۆستای گەورە پاش ئەوەی بەدرێژاییی تەمەنی کاری کردووە و گەیشتووەتە پلەی بێ

کێماسیبوونی مامۆستایانی کۆن، خۆی بەدەستی خۆی کوێر کردووە تا
نیگارەکانی تێکەڵ هیچ نیگارخانە و خواستی هیچ پادشایەک نەبێت.

قەرە و یارۆی بستەبالا لەو ساتەدا دەستنووسێکی ئەستووریان کردەوە و خستییانە بەردەمم.

بێ ئەوەی کەللەڕەقی بنوێنم، گوتم: "نەخێر ئەمە نییە. ئەمە شانامەیەکی مەگۆلییە: کاتێک ناواخنی ئەسپی سوارەی لە ئاسن دروستکراوی سوپای ئەسکەندەر پڕ لە نەوت دەکرێت، ئاگریان تێ بەردەدرێت، وەک چرا دەگیرسێن و لە کونی لووتیان ئاگر دێتە دەرێ و هێرش دەکەنە سەر دوژمن."

سەیری ئەم سوپا لە ئاسن دروستکراوەی ناو ئاگرمان کرد و بینیمان لەسەر شێوازی نیگاری چینی کێشراوە.

گوتم: "جەزمی ئاغا، ئێمە دواتر لە سەلیمنامەدا نیگاری ئەو دیارییانەمان کێشا کە بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر باڵیۆزانی عەجەم لەگەڵ ئەم کتێبەی شا تەهماسپدا هێنابوویان..."

یەکسەر دەستنووسی سەلیمنامەی دۆزییەوە و هێنای و لەبەردەستم دای نا. لە بەرامبەر ئەو پەڕەیەی پێشکێشکردنی دیارییەکانی تری باڵیۆزان بە سوڵتانی خوا لێخۆشبوو پێشان دەدات و بە ڕەنگی درەوشاوە بۆیاخ کراوە، لەناو ئەو دیارییانەی ناوی یەک بەیەکیان نووسرابوو، چاوانم لە خۆیانەوە شتێکیان دۆزییەوە کە پێشتریش خوێندبوومەوە، بەڵام وەک بڵێی لەبەرئەوەی باوەڕم پێ نەکردووە، لە بیرم کردبوو:

دەرزیی پەڕەمووچی زێڕین و دەسک لە فەیرووزە و سەدەفی نەخشێندراو،
ئەو دەرزییەی بەهزادی مامۆستای مامۆستایان و سەر بە مامۆستایانی
دێرین بۆ کوێرکردنی خۆی بەکاری هێناوە.

لە بستەبالام پرسی دەستنووسی سەلیمنامەی لەکوێ دۆزیوەتەوە. لە تاریکیی تۆزاویی ناو ژووری گەنجینەدا پێچاوپێچ بەناو سندووق و قوماش و کۆمەڵە ڕایەخ و بەژێر پلیکانەکاندا ڕۆیشتین. بینیم سێبەرەکانمان جارێک گەورە و جارێک بچووک دەبووەوە و بەسەر قەڵغان و ددانی فیل و پێستی پڵنگدا دەڕۆیشت. لە یەکێک لە



ژوورەکانی تری نوقمی هەمان ڕەنگی قوماشی سوور و قەدیفە، لە تەنیشت ئەو سندووقە ئاسنەی شانامەمان تێدا دۆزیبووەوە، لەناو کتێبی تر، سەرپۆشی خەمڵێندراو بە تاڵی زیوین و زێڕین، بەردی خاوی سەیلان و خەنجەری دەسک یاقووت، هەندێک لە دیارییەکانی شا تەهماسپ، ڕایەخی ئاوریشمی ئەسفەهانی و تاقمێکی شەترەنجی لە ددانی فیل دروستکراوم بینی و نیگام چووە سەر قوتوویەکی قەڵەم و بە ئەژدیهای چینی و لق و پۆپی دار و خۆری لە گەوهەر نەخشێندراوی سەریدا یەکسەر ئاشکرا دەبوو پاشماوەی سەردەمی تەیمووری لەنگە. قوتووەکەم کردەوە، دەرزیی پەڕەمووچی زێڕین و دەسک بە فەیرووزە و گەوهەر نەخشێندراوی لەگەڵ سووکەبۆنێکی کاغەزی سووتاو و بۆنی گوڵ لێ دەرچوو. دەرزییەکەم هەڵگرت، وەک سێبەر گەڕامەوە بۆ شوێنی خۆم.

دوای ئەوەی بەتەنیا مامەوە، ئەو دەرزییەی مامۆستا بەهزاد چاوی خۆی پێ کوێر کردبوو، لەسەر پەڕەی هەڵدراوەی شانامەدا دانا و سەیرم کرد. نەک بینینی بەهزاد، بگرە بینینی ئەو دەرزییەی خۆی پێ کوێر کردبوو و هەر شتێکی تر ئەو دەستی پەرجوویی خۆی پێوەدابێت، مچووڕکەی بە مندا دەهێنا.

ئایا بۆچی شا تەهماسپ ئەم دەرزییە ترسناکەی لەگەڵ کتێبەکەدا بەدیاری بۆ سوڵتان سەلیم ناردبوو؟ تۆ بڵێی لەبەرئەوەی بووبێت کە لە منداڵیی خۆیدا دەرزی نیگارکێشیی لە بەهزاد وەرگرتبوو، لە تافی لاویدا دەستی نیگارکێشانی گرتبوو، لە پیریدا شاعیران و نیگارکێشانی لە خۆی دوور خستبووەوە خووی دابووە خواپەرستی؟ ئایا هەر لەم ڕووەشەوە ڕازی بووە ئەم کتێبە شاکارەی لەدەست دەربچێت، ئەگەرچی گەورەترین مامۆستایان ماوەی دە ساڵ کاریان تێدا کردبوو؟ ئایا ئەم دەرزییەی لەگەڵ کتێبەکەدا بۆ ئەو مەبەستە ناردبوو تا گشت کەسێک بزانێت کۆتاییی نیگارکێش بریتییە لە خۆ کوێرکردنی ئارەزوومەندانە، یاخۆ وەک ئەوەی ماوەیەک باو بوو دەگوترا ئەوەی جارێک پەڕەکانی ئەم کتێبە دانسقەیە ببینێت، ئیدی نایەوێت لە دنیادا چاوی بە شتێکی تر بکەوێت؟ بەڵام چەشنی ئەوەی زۆربەی فەرمانڕەوایان لە پیریی خۆیاندا دەیکەن، پادشا بەهۆی ئەوەی لە ترساندا پەژیوان بووەتەوە لەو ئەڤینەی لە تافی لاویدا بۆ نیگار هەیبووە، ئیدی ئەم کتێبە

شاکارێک نەبووە بەلای ئەوەوە.

ئەو چیرۆکانەم بیرکەوتەوە کاتێک نیگارکێشانی بەختڕەش لە پیریدا تووشی خەیاڵشکان دەبن و دەیگێڕنەوە: کاتێک لەشکری جیهان شای قەرەقۆیونلو لەوەدا دەبێت بچێتە شاری شیرازەوە، گەورەی نیگارکێشانی ئەفسانەیی "إبن حسام" دەڵێت: "من بەشێوەیەکی تر نیگار ناکێشم." ئەمە دەڵێت و بەدەستی یەکێک لە شاگردەکانی، چاوانی خۆی بە داخکردن دەدات. وەستایەکی بەساڵاچووی عەجەم، لەوانەی کاتێک سوپای یاوز سوڵتان سەلیم لەشکری شا ئیسماعیلی تێک شکاند و چووە تەورێزەوە و کۆشکی هەشت بەهەشتی تالان کرد لەگەڵ کۆمەڵێک نیگارکێشی تر هێنانییە ئەستەنبوڵ، بەپێی ئەو ورتەورتەی دواتر بڵاوبووەوە، لە ڕێگا بە نەخۆشی نا، بگرە لەبەرئەوەی گوتبووی ناتوانم بە شێوازی عوسمانی نیگار بکێشم، بە داوودەرمان خۆی کوێر کردبوو. منیش لە ساتەکانی تووڕەبوونمدا بەمەبەستی ئەوەی بۆ نیگارکێشانم ببێت بە نموونە، باسی خۆ کوێرکردنی بەهزادم دەگێڕایەوە.

باشە هیچ ڕێگایەکی تر نییە؟ ئەدی ئەگەر مامۆستای نیگارکێش لە پەناوە شێوازە نوێیەکان پەسەند بکات، ئایا ناتوانێت سەرجەم نیگارخانە و شێوازی مامۆستایانی کۆن کەمێک ڕزگار بکات؟

دەرزییە پەڕەمووچەکە فرە بەجوانی باریک کرابووە و ڕەشاییەک بە نووکی زۆر تیژیەوە بوو، بەڵام چاوی ماندووم بۆی نەبرایەوە سەریەک داخۆ خوێنە یان شتێکی ترە. زەرەبینەکەم لێ نزیک خستەوە و بەهەمان خەمی سەیرکردنی جڤاتێکی ئەڤینەوە دوور و درێژ سەیرم کرد. هەوڵم دا بیهێنمە پێش چاوی خۆم بەهزاد ئەم کارەی چۆن کردووە. وەک دەگوترا، مرۆڤ یەکسەر کوێر نابێت، بگرە کتومت وەک ئەوەی لە بەساڵاچووانی لەخۆوە کوێر بوو دەقەومێت، دوای چەند ڕۆژێک و هەندێک جاریش چەند مانگێک ئەوسا تاریکیی قەدیفەیی بەسەر چاواندا دادەدرێتەوە.

لە چوونمدا بۆ ژووری ئەودیو دیبووم؛ هەستام و سەیرم کرد، لەوێ بوو؛ ئاوێنەیەکی دروستکراو لە ددانی فیل، قەراغ بادراو و چوارچێوە ئەستوور و وەک گوڵ بەشێوازی نووسینی درێژ ڕازێندرابووەوە. لە شوێنی خۆم دانیشتم و لە ئاوێنەدا سەیری چاوانم کرد. گڕی مۆمدانی زێڕین چەند جوان لە گلێنەی چاوانمدا





شەپۆلی دەدا، ئەو چاوانەی شەست ساڵ بوو نەخش و نیگارم پێ دەکێشان و سەیری نیگارم پێ دەکردن.

جارێکی تریش بە ئارەزووەوە لەخۆم پرسی داخۆ مامۆستا بەهزاد ئەم کارەی چۆن ئەنجام داوە؟

بێ ئەوەی گلێنەی چاوانم لەسەر ئاوێنە هەڵبگرم، دەستەکانم وەک دەستی ژنێک خوازیار بێت کل لە چاو بکات، لە خۆیانەوە دەرزییەکەیان دۆزییەوە. چەشنی ئەوەی مرۆڤ سەری هێلکەی وشترمڵی داندراو بۆ بۆیاخکردن کون بکات، بێ دوودڵینواندن و بوێرانە و بە ئارامی و بەهێزەوە دەرزیم لە بیلبیلەی چاوی ڕاستم چەقاند. لە ناخەوە خۆم خواردەوە، لەبەرئەوە نا هەستم بە کارەکەم کردبوو، بگرە لەبەرئەوەی بینیم بەئەندازەی چواریەکی پەنجەیەک دەرزییەکەم بە چاومدا کرد و دەرم هێنا.

لە بەیتە شیعری خەملێنەری چوارچێوەی ئاوێنەکەی ناو دەستمدا، شاعیر هیوای جوانیی بەردەوام و ڕووناکیی لە برانەوەنەهاتووی بۆ سەیرکەری ئاوێنە و بۆ ئاوێنە خۆیشی، تەمەنێکی سەرمەدیی دەخواست.

بەدەم پێکەنینەوە هەمان شتم بەسەر چاوی چەپیشم هێنا.

ماوەیەکی درێژ بێ ئەوەی جووڵەم لێوە بێت، چاوەڕێم کرد. سەیری دنیام کرد. سەیری گشت شتێک.

وەک من بۆی چووبووم ڕەنگەکانی دنیا ڕەش نەبوونەوە، بگرە وەک بڵێی هێدی هێدی بەیەکدا چوون. بەڵام هێشتا کەم و زۆر هەموو شتێکم دەبینی.

دوای تاوێک، تیشکی لاوازی ڕۆژ دای لە نێوان قوماشە ڕەنگ سووری تۆخ و ڕەنگ خوێنینەکانی ژووری گەنجینە. گەورەی خەزنەداران و پیاوانی دیسان بەگێڕانی هەمان تەدارەک مۆریان هەڵگرت و قفڵ و دەرگایان کردەوە. جەزمی ئاغا دەستشۆر و چرا و مەقاڵەی گۆڕی، نانی گەرم و تووی وشکی بۆمان هێنا و پێمانی گوت لەناو کتێبەکانی سوڵتانماندا بەردەوام دەبین لەسەر گەڕان بەدوای ئەسپی لووت ناقۆڵادا.

جا چ لەوە خۆشتر هەیە مرۆڤ سەیری جوانترین نیگارەکانی دنیا بکات و هەوڵ بدات دنیای بەر چاوی خوای بیر بکەوێتەوە؟

# 52

## من ناوم قەرەیە

بەیانی، دوای ئەوەی گەورەی خەزنەداران و ئاغایان بە تەدارەک دەرگایان کردەوە، چاوانم بەتەواوی بەڕەنگی سووری قەدیفەییی ژووری گەنجینە ڕاهاتبوو، بۆیە کاتێک تیشکی سەرلەبەیانیی زستان لە حەوشەی ئەندەروونەوە خۆی بە ژوورێدا کرد، وا هاتە بەرچاو وەک ئەوەی شتێکی ترسناک بێت و بۆ خاپاندنی بینەر دروست کرابێت. منیش کتومت وەک مامۆستا عوسمان لە جێی خۆم نەجوولام: وەک بڵێی ئەگەر جوولە بکەم، ئەوا هەوای بەکەڕوو و تۆزاوی و بەدەست لە گرتن هاتووی ژووری گەنجینە و ئەو بەڵگانەی بۆیان دەگەڕاین، لە دەرگاوە دەردەچوون و هەڵدەهاتن.

مامۆستا وەک ئەوەی یەکەمجاری بێت سەیری شتێکی شاهانە بکات، بەسەرسامی بۆ ئەو تیشکەی دەڕوانی کە لە نێوان سەری ئاغایانی بە دوو ڕیز ڕاوەستاوی ناو شیپانەی دەرگاوە لە ژوورەوەی دەدا.

شەویش، کاتێک سەیری نیگارەکانی دەکرد و پەڕەکانی شانامەی شا تەهماسپی هەڵدەدایەوە، من لە دوورەوە بەوردی بۆم دەڕوانی و دەمبینی هەمان هێمای سەرسوڕمان ناوبەناو لەسەر ڕووی دەردەکەوت. سێبەری ئەو بەسەر دیوارەکەوە جاروبار لەرەیەکی لەسەرەخۆی دەکرد، بەپارێزەوە سەری لە زەرەبینی دەستی نزیک دەخستەوە، وەک ئەوەی خۆی بۆ درکاندنی ڕازێک ئامادە بکات، نەرمە نیشانەیەک دەکەوتە سەر لێوەکانی و دواتریش بەدەم سەیرکردنی نیگارێکەوە بەسەرسامی، لێوەکانی لەخۆوە دەکەوتنە جووڵە.



پاش داخستنی دەرگا، بەدەم بێ ئۆقرەیییەکی بەردەوام ڕوو لە زیاد بوونەوە و بە نائارامی ئەمسەر و ئەوسەر بەنێوان ژوورەکاندا هاتم و چووم و بەشپرزەیی بیرم چوو بۆ ئەوەی کە لە کتێبەکانی گەنجینەوە زانیاریمان دەستگیر نابێت و کات بەش ناکات. لەبەرئەوەی دەرکم کردبوو مامۆستا عوسمان وەک پێویست سەرنجی خۆی نەداوەتە ئەم کارە، نیگەرانییەکانی خۆمم بۆ گێڕایەوە.

وەک مامۆستایەکی ڕاستەقینەی ڕاهاتوو لەسەر دەستهێنان بە سەری شاگردەکانیدا، بەشێوەیەکی جوان دەستی گرتم. گوتی: "کەسانی وەک ئێمە، جگە لە هەوڵدان بۆ بینینی دنیا بەو شێوەیەی خوا دەیبینێت و پەنابردن بۆ خوا نەبێت، هیچ چارەیەکی ترمان نییە. تەنانەت لە هەناویشمدا هەست دەکەم ئەم دوو شتە لێرە، لەناو ئەم نیگار و شتومەکانەدا لەیەکتر نزیک دەبنەوە. چەندەی مرۆڤ لەوە نزیک بێتەوە دنیا بەشێوەی بینینی خوا ببینێت، ئەوەندەش دادپەروەریی ئەومان لێ نزیک دەکەوێتەوە. بڕوانە ئەو دەرزییەی کە مامۆستا بەهزاد خۆی پێ کوێر کرد..."

کاتێک ئەو بەسەرهاتی دڵڕەقانەی دەرزییەکی دەگێڕایەوە، بۆ ئەوەی باشتر ببینم، زەرەبینەکەم لێ نزیک خستبووەوە و بەوردی سەیری نووکی ئەم شتە ناجۆرەم کرد و تەڕییەکی پەمەییم پێوە بینی.

مامۆستا عوسمان گوتی: "گۆڕینی هونەر و ڕەنگ و شێواز بەلای مامۆستایانی کۆنەوە پرسی ویژدان بوو، چونکە ئەوان سەرتاپای ژیانی خۆیان لەو پێناوەدا دەدا. ئەوان بە بێ ڕەوشتیان دەزانی وەک ئەوانەی ئەمڕۆ دنیا بەشێوەیەک ببینن چەشنی ئەوەی ڕۆژێک پادشای ڕۆژهەڵات و ڕۆژێکی تر فەرمانڕەوای ڕۆژئاوا دەڵێت: بیبینە."

چاوەکانی، نە سەیری چاوانی منیان دەکرد و نە پەڕەکەی بەردەستی. وەک بڵێی سەیری سپییەتیی شوێنێکی دووری دوای دواوە، شوێنێکی مرۆڤ هەرگیز پێنەگەیشتووی دەکرد. لە پەڕەکەی شانامەی بەردەستیدا هەردوو لەشکری ئێران و تووران بەتەواوی هێزی خۆیانەوە پێکدا هەڵپژابوون، ئەسپ شانیان نابووە بەیەکەوە، ڕمی شەڕوانانی سوارە زرێیان کون دەکرد و جەستەی شەڕڤانان لەتوپەت دەبوو، سەر و قۆڵیان دەپەڕی، جەستەی دوولەتکراو لە زەوی کەوتبوون و لە خوێندا

گەوزابوون، خوێن بەرچاوی شەڕوانانی پاڵەوانی گرتبوو و بە نەشئە و ڕەنگی ئاهەنگەوە شمشێریان هەڵکێشابوو و یەکدییان دەکوشت.

"ئەو مامۆستا گەورانەی سەردەمی کۆن کە ناچار دەکران دوای شێوازی لایەنی سەرکەوتوو بکەون و لاسایی نیگارەکانیان بکەنەوە، پاش ئەوەی لە پێناوی پاراستنی شەرەفیان قارەمانانە کاری خۆکوێردنیان بە دەرزی ئەنجام دەدا و پێش ئەوەی تاریکایی ڕوونی خوا وەک خەلاتێک بڕژێتە چاوانیانەوە، نیگارێکیان دەخستە بەردەستی خۆیان و چەندین سەعات، بگرە جاری وا هەبوو چەندین ڕۆژ بێ پسانەوە تەماشایان دەکرد. لەبەرئەوەی مامۆستایانی قارەمان بێ ئەوەی سەری خۆیان هەڵبڕن، چەندین سەعات سەیریان دەکرد و هێدی هێدی بەرچاویان تاریک دەبوو و بەرەو کوێربوون دەچوون، دنیا و واتای ئەم نیگارانە، کە جاروبار خوێنی ڕژاو لە چاوانیان دەڕژایە سەریان و پەڵەی لەسەر دەنەخشاند، بەئەسپایی جێی خراپەی هەناویانی دەگرتەوە. وەی چ بەختەوەرییەکە. ئایا دەزانی حەزم دەکرد تا گەیشتن بە تاریکایی کوێربوون سەیری چ نیگارێک بکەم؟"

وا دەهاتە پێش چاو وەک بە تێپەڕبوونی کات گلێنەی چاوی بچووکتر و سپێنەکەی فراوانتر ببێتەوە. وەک ئەوانەی هەوڵ دەدەن بیرەوەرییەکی سەردەمی منداڵیان بیر بکەوێتەوە، چاوانی بڕیبووە شوێنێکی دوور، وەک بڵێی شوێنێکی دەرەوەی ژووری گەنجینە.

"ئەو جڤاتەی بەڕێبازی مامۆستایانی کۆنی هەراتی کێشراوە و خەسرەو پێشان دەدات کاتێک بە سواریی ئەسپ دێتە بناوانی کۆشکی شیرین و بە ئەڤینی شیرین لە ناخەوە قرچەی سووتانی دێت و چاوەڕێ دەکات."

لەوانە بوو وەک پێدا هەڵدانێک بۆ کوێربوونی مامۆستایانی کۆن، بەهەوای خەمگینی شیعرێکەوە باسی ئەو نیگارەم بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام من لەپڕ قسەم پێ بڕی و گوتم: "مامۆستای گەورەم، ئەفەندیم، شتێک، کە بەردەوام دەمەوێت سەیری بکەم، ڕووی نازداری جانانی منە. سێ ڕۆژە زەماوەندم لەگەڵدا کردووە. ماوەی دوازدە ساڵ بەتاسەوە بیرم لێ کردەوە. ئەو جڤاتەی کاتێک شیرین نیگاری خەسرەو دەبینێت و عاشقی دەبێت، بەردەوام ئەوم بیر دەخاتەوە."



هێما یان حەزێک بە ڕووی مامۆستا عوسمانەوە بوو و بۆی نەشاردرایەوە، بەڵام پێوەندیی بە بەسەرهاتی من و جڤاتی شەڕە خوێناوییەکەی بەردەمیەوە نەبوو. دەتگوت چاوەڕێی مزگێنییەک دەکات کە لەسەرەخۆ نزیک دەبێتەوە. دوای ئەوەی بەتەواوی دڵنیابووم نامبینێت، لەپڕ دەرزیی پەڕەمووچەکەم هەڵگرت و لەوێ دوورکەوتمەوە.

لە شوێنێکی ژووری سێیەمی گەنجینە، لە گۆشەیەکی تاریکی ئەوەی تەنیشت گەرماوەکە، جێیەک هەبوو بەسەدان سەعاتی گەورە و سەمەرەی لێ کەڵەکە کرابوو. ئەمانە دیاریی پادشا و فەرمانڕەوایانی فەرەنگ بوون و دوای ماوەیەکی کورت لە ناردنیان، تێک دەچوون و پەکیان دەکەوت. چوومە ئەوێ و زۆر وردتر سەرنجم لەو دەرزییە دا کە مامۆستا عوسمان دەڵێت بەهزاد خۆی پێ کوێر کردووە.

لەبەر ڕووناکیی سووری ڕۆژ، ئەو تیشکەی لە چوارچێوەی زێڕینی سەعاتە تۆزاوی و تێکچووەکان و جامی کریستاڵیان و ئەڵماسەکانیانی دەدا و دەشکایەوە، نووکی زێڕینی بە شلەیەکی پەمەیی داپۆشراوی دەرزییەکە، تاوناتاوێک دەبریسکایەوە. ئایا بەهزادی مامۆستای ئەفسانەیی بەڕاستی بەم ئامێرە چاوی خۆی کوێر کردبوو؟ تۆ بڵێی مامۆستا عوسمان ئەم کارە ترسناکەی بەهزادی بەسەر خۆی هێنابێت؟ ڕۆژئاواییەکی بەرازی بەقەد پەنجەی دەستێک و بەڕەنگی جۆراوجۆر بۆیاخکراوی لکێندراو بە خوولەکژمێری یەکێک لە سەعاتە گەورەکانەوە، وەک بڵێی بەنیگا پێی گوتم: "بەڵێ." دیار بوو ئەمە گاڵتەیەکی پادشای هابسبورگ و سەعاتچییە ژیرەکەی بوو. هەر جارێک سەعات چەند بوایە، ئەم پیاوەی کڵاوی عوسمانیی لەسەر نرا و سەری دەردەهێنا و ئەوەندە جارە خۆی دەلەراندەوە و بەمجۆرە شادیی دەخستە دڵی سوڵتان و ژنەکانی حەرەمسەرایەوە.

سەیری زۆر کتێبی ئاساییم کرد: وەک ئەوەی بستەباڵا ڕای گەیاندبوو، ئەم کتێبانە بەشێک بوون لە شتومەکی ئەو پاشایانەی سەریان پەڕێندرابوو و دەست بەسەر موڵک و سامانیاندا گیرابوو. ئەوەندە پاشا خنکێندرابوون، ئەم دەستنووسانە هیچ کۆتاییان پێ نەدەهات. بستەباڵا بەخۆشحاڵییەکی بێ بەزەییانەوە گوتی ئەو پاشایەی بە سامان و هێز مەست دەبێت و لەبیری دەچێت لە کۆیلەیەک زیاتر هیچی

تر نییە و کتومت وەک سوڵتان و پادشاکان ڕادەسپێرێت بەناوی خۆیەوە کتێبی بۆ ئامادە بکرێت و بە ئاوی زێڕ بنەخشێندرێت، هەر لە زووەوە شایەنی ئەوەیە سەری بپەڕێندرێت و دەست بەسەر سامان و موڵکیدا بگیرێت. تەنانەت لەم کتێبانەشدا، کە هەندێکیان دیوانی بە نەخش و نیگار بوون و ئەوانی تریان دەفتەری نیگار بوون، هەرکاتێک دەگەیشتمە نیگاری ئەو جڤاتەی شیرین تیایدا چاوی بە نیگاری خەسرەو دەکەوێت و عاشقی دەبێت، ڕادەوەستام و تێر تێر سەیرم دەکرد.

نیگاری ناو نیگارەکە، واتە ئەو نیگارەی خەسرەو کە شیرین لە کاتی سەیرانی دەشت و دەردا تەماشای دەکات، هیچ کاتێک ڕوون و ئاشکرا نەبوو. ئەمەش لەبەرئەوە نەبوو بڵێی نیگارکێشان شتێکی بچووکی وەک نیگاری ناو نیگاریان وەک پێویست بەباشی نەکێشابوو، چونکە زۆربەی ئەو نیگارکێشانەی نیگارەکەیان کێشابوو، هێندە وردەکار بوون تەنانەت لەسەر نینۆک و دەنکی برنج و تەنانەت تەڵی قژیش نیگاریان دەکێشا. ئێ کەوابوو بۆچی ڕوو و چاوی خەسرەوی قۆزیان هێندە ڕوون نەکێشابوو تا بناسرێتەوە؟ کاتێکی دوای نیوەڕۆ، لەوانەشە بۆ لەبیرکردنی بەدبەختیی خۆم بووبێت، بەدەم بیرکردنەوە لەوەی ئەم پرسیارانە لە مامۆستا عوسمان بکەم، لە خۆمەوە پەڕەکانی دەستنووسێکی پەرپووتم هەڵدەدایەوە. لە نیگارێکی سەر قوماشی پێشاندەری بەزمی شاییدا، ئەسپێک سەرنجی ڕاکێشام. لەپڕ ترپەی لێدانی دڵم شێوا.

لەوێ، لە بەردەمم ئەسپێکی لووت ناقۆڵا هەبوو. بووکێکی نازداری بەسەر پشتی خۆیەوە دەگواستەوە و بۆ منی دەڕوانی. وەک بڵێی ئەم ئەسپە ئەفسووناوییە خوازیارە ڕازێکم بۆ بدرکێنێت. وەک لە خەوندا بم ویستم هاوار بکەم، بەڵام دەتگوت دەنگم دەرناچێت.

هەر ئەوەندەی دەستم دایە کتێبەکە، بەناو شتومەک و سندووقەکاندا بۆ کن مامۆستا عوسمان ڕام کرد و پەڕەکەم لە بەردەمیدا کردەوە.

سەیری نیگارەکەی کرد.

کاتێک ڕووناکیم بە ڕوویەوە نەبینی، ئۆقرەم لێ بڕا و گوتم: "کونی لووتی ئەسپەکە کتومت وەک ئەو ئەسپە وایە کە بۆ کتێبەکەی زاوام کێشراوە."



زەڕەبینەکەی دەستی هێنایە سەر ئەسپەکە. چاوی خۆی بەڕادەیەک هێندەی نەمابوو لووتی لە پەڕەکە بکەوێت، لە نیگار و زەڕەبینەکە نزیک خستەوە.

خۆم لە بەرامبەر درێژبوونەوەی بێدەنگی پێ ڕانەگیرا و گوتم: "وەک دەبینن ئەمە ئەسپێک نییە بەڕێباز و شێوازی ئەسپی ناو کتێبەکەی زاوام کێشرابێت، بەڵام لووتی هەمان شتە. نیگارکێش هەوڵی داوە دنیا بەشێوەی بینینی چینییەکان ببینێت." کەمێک بێدەنگ بووم. "بەزمی زەماوەندێکە. هەر دەڵێی نیگاری چینییە، بەڵام نیگارکێش چینی نییە، کەسێکە وەک ئێمە."

ئێستا مامۆستام وا خۆی دەنوواند وەک ئەوەی زەڕەبینی خستبێتە سەر نیگارەکە و لووتیشی نابێتە سەر زەڕەبینەکەی. نەک تەنیا چاوی، بگرە سەر و سەرجەم ئەندامەکانی لەشی و پشتی چەماوە و تەواوی هێزی شانەکانی بۆ بینین خستبووە کار. بێدەنگییەکی درێژ هاتە کایەوە.

زۆر دواتر بەدەم هەناسەدانەوە گوتی: "لووتی ئەسپەکە بڕاوە."

سەرم نا بەسەری ئەوەوە. ماوەیەکی درێژ لە ڕکێفی یەکتر سەیری کونە لووتەکەمان کرد. لەپڕ بەخەمباری هەستم کرد نەک هەر لووتی ئەسپکە بڕاوە، بگرە مامۆستا عوسمانیش لە بینیندا دژواری دەبینێت.

"دەبینن، وا نییە؟"

گوتی: زۆر کەم. تۆ باسی ئەسپەکەم بۆ بکە."

بە خەمگینی گوتم: "بە من بێ ئەمە بووکێکی خەمگینە، سواری ئەسپێکی بۆزی لووت بڕاو بووە، لەگەڵ پارێزەرانی نامۆ بەخۆی و هاوڕێیانی ڕێگە بۆ شووکردن دەڕوات. پیاوەکان بە ڕوویان، هێمای وشکی دەموچاویان، ڕیشی ڕەش و ترسناکیان، پێکدادانی چارەیان، سمێڵی بابڕ و ڕیشی تێکئاڵقاویان، ئێسکی ئەستووریان، جبەی سادە و تەنکیان، پێڵاوی زراڤیان، سەرپۆشی لە پێستی ورچیان، تەور و شمشێری دەستیاندا وا دێنە بەرچاو لە تورکمانەکانی ئاکقۆیونلوی "ماوراء النهرین" بن. ئەم بووکە بەپێی ئەوەی لەگەڵ یاوەرانی بەشەو لەبەر تیشکی قوتیلکە و مەشخەڵدا ڕێ دەکات، ڕێگایەکی درێژی لەبەرە و لەوانەشە کچە شازادەیەکی خەمگینی چینی بێت."

مامۆستا عوسمان گوتی: "یان نیگارکێش بۆ سەلماندنی بێ کەموکورتیی جوانی بووک وەک نەریتی چینی بۆیاخی سپیی لە ڕووی داوە و چاوانیشی وەک چاوی چینی نەخشاندووە و ئێستا ئێمە پێمان وایە چینییە."

گوتم: "هەر کێیەکە با ببێت، من بەزەییم بەم بووکە خەمگینەدا دێتەوە کە بەم نیوەشەوە و لە ناوەڕاستی ئەم بیابانە بە یاوەریی پاسەوانانی نامۆ بە بووکی بۆ وڵاتێکی نامۆ و بۆ زاوایەکی هەرگیز نەدیتووی دەبرێت." دواتر یەکسەر پرسیم: "چۆن بە کونی لووتی بڕاوی ئەسپەکەی ژێر ئەودا حاڵی دەبین نیگارکێشەکەی لەمەڕ ئێمە کێیە؟"

مامۆستا عوسمان گوتی: "پەڕەکانی دەفتەری نیگارەکە هەڵدەوە و وەسپی ئەو نیگارانەم بۆ بکە کە دەیانبینیت."

پێش کەمێک، کاتێک من پڕم دایە دەستنووسەکە و بە ڕاکردن هێنام، بستەبالام بینی لە سەر دەستشۆرەکەی دانیشتبوو، بەڵام ئێستا هاتبووە کن ئێمە و من پەڕەکانم هەڵدەدایەوە و هەرسێکمان سەیرمان دەکرد.

کچانی شۆخی چینیمان بینی لەسەر شێوازی بووکی خەمگینمان نیگاریان کێشرابوو و لە باخچەیەک کۆبووبوونەوە و عوودێکی سەیریان دەژەند.

ڕیزە ماڵی چینی، کاروانی خەمباری سەر ڕێی دوور و درێژ، داری چۆڵەوانی و دیمەنی بیابانمان بینی هێندەی بیرەوەریی کۆن، جوان بوو. ڕیزەداری پێچاوپێچی بەنەریتی چینی کێشراو، گوڵانی بەهاری بەهەموو هێزی خۆیانەوە پشکوتوو و لەسەر چڵی دارانیش بولبولی دڵشاد و شۆخ و شەنگمان بینی. شازادەگەلمان بینی بەشێوازی خۆراسانی لە ڕەشماڵدا دانیشتبوون و باسی شیعر و شەراب و ئەڤینیان دەکرد. باخچە و بەگی قۆز و پۆشتەمان بینی هەریەکەیان بازێکی شاهانەی نابووە سەر قۆڵی و بەسەرپشتی ئەسپی ڕەسەنەوە بۆ ڕاو دەچوون. دواتر، وەک بلێی ئیبلیسێک بەناو پەڕەکاندا تێ پەڕی و ئێمەش هەستمان کرد زۆربەی جار خراپەی ناو نیگار لە سۆنگەی ئاقڵییەوە ئەنجام دراوە. ئایا نیگارکێش ڕەهەندێکی گاڵتەئامێزی تێکەڵ بەجووڵەی ئەو شازادە پاڵەوانە کردبوو کە بە ڕمی زەبەلاحی خۆی ئەژدیهای دەکوشت؟ ئەرێ چەژی لە هەژاری و دەسکورتیی ئەو دێهاتییە کلۆڵ



و داماوانە وەرگرتبوو کە لە پێش شێخ دادەنیشتن و چاوەڕێی شەفایان لێ دەکرد؟ ئایا ئەو دەمانە زیاتر چەژی لەوە وەردەگرت کاتێک نیگاری چاوی خەمگینی سەگی لەیەکتر سواربوو و پێکەوە نووساوی دەکێشا، یاخۆ گاڤێک ئیبلیسانە بە ڕەنگێکی سوور دەمی داچەقیوی ئەو ژنانەی بۆیاخ دەکرد کە بەدەم پێکەنینەوە سەیری سەگە نووساوەکانیان دەکرد؟ دواتر ئیبلیسەکانی نیگارکێش خۆیشیمان بینی: ئەم بوونەوەرە سەمەرانە وەک ئەو جنۆکە و دێوانە دەچوون کە مامۆستایانی کۆنی هەرات و نیگارکێشانی شانامەش زۆر جاران کێشابوویان، بەڵام هونەری نیگارکێشی قۆشمە کارێکی وای کردبوو بوونەوەرەکان خراپکارانەتر، هێرشبەرانەتر و زیاتر وەک مرۆڤ بنوێنن. ئیبلیسی ترسناکمان بینی شێوەیان بە مرۆڤ دەچوو، بەڵام جەستەیان خواروخێچ بوو و چەندین بست شاخیان هەبوو و کلکیان وەک کلکی پشیلە دەچوو. پێکەنینمان بەمە هات. هەر هێندەی من پەڕەکانم هەڵدایەوە، ئیبلیسی ڕووت و قووتی برژانگ ئەستوور، ڕوو خڕ، چاو ئەبڵەق، ددان تیژ، نینۆک درێژ و پێست وەک پێستی پیران چرچ و لۆچ دەستیان کرد بە شەڕ و زۆران، ئەسپێکی کەتەیان دزی تا بیکەن بە قوربانی بۆ خوای خۆیان، تەقڵەیان لێ دەدا و سەمایان دەکرد، داریان دەبڕی، پڕیان بە سوڵتانی جواندا کرد و بە تەخت و تاراجەوە فڕاندیان و کەوتنە گرتنی ئەژدیها و تالانکردنی گەنجینە. ئەم دەستنووسە قەڵەمی نیگارکێشی جۆراوجۆری پێدا هێندرابوو. کاتێک من حاڵی بووم قەڵەمی ڕەشی هەمان نیگارکێشی خاوەن نیگارەکانی ئیبلیس، نیگاری دەروێشی قەلەندەری سەرتاشراو، پۆشاک پەرپووت، زنجیر لە مل و گۆچان بەدەستیشی کێشاوە، مامۆستا عوسمان دانە بەدانەی خاڵە وێکچووەکانی پێم دووبارە کردەوە و بەوردی گوێی بۆم ڕاگرت.

پاشان گوتی: "بڕینی لووتی ئەسپ نەریتێکی سەدان ساڵەی مەگۆلە بەمەبەستی ئەوەی ئەسپ باشتر هەناسە بدات و درێژتر غار بدات. سوپاکانی هۆلاکۆ خان بە ئەسپەکانی خۆیان سەرانسەری وڵاتانی عەرەب و عەجەم و چینیان گرت و کاتێک چوونە بەغداوە، سەرجەم خەڵکی شاریان دایە بەر شمێشر و تالانیان کرد و هەرچی کتێب هەبوو خستیانە دیجلەوە. خۆشنووسی بەناوبانگ و دواتریش نیگارکێش "إبن

شاکر" بەمەبەستی هەڵهاتن لە شار و لە دەست ڕەشەکوژی، لاسایی کەسانی تری نەکردەوە و بەرەو باشوور نەچوو، بگرە ڕووی لە باکور کرد، لەو شوێنەی سوارەی مەگۆلی لێوە هاتبوو. ئەو سەردەمە بەبیانووی ئەوەی قورئانی پیرۆز قەدەغەی کردووە، لە کتێبدا نیگار نەدەکێشرا و نیگارکێشانیش بەهەند نەدەگیران. ئێمە لە گەورەترین ڕازی پیشەی خۆماندا، واتە بینینی دنیا لە بانیژەی منارەوە و هەبوونی هەمیشەییی هێڵی ئاسۆ چ بە شاراوەیی و چ دیار و لە بۆیاخکردنی گشت شتێکدا هەر لە هەورەوە بۆ مێروو بە ڕەنگی زیندوو و گەشبین، قەرزداری پیر و مامۆستای گەورەمان" إبن شاکر"ین. بیستوومە مامۆستامان لە ڕێبوارییی دوور و درێژی خۆیدا، کە تا ناو جەرگەی سوپاکانی مەگۆل درێژەی کێشاوە، لە ڕۆیشتنیدا بەرەو باکور سەیری لووتی ئەسپەکانی کردووە. دوای ئەوەی بە ساڵێک بێ گوێدانە سەرما و گەرما خۆی گەیاندبووە سەمەرقەند، لەوێ دەستی کردبوو بە کێشانی نیگاری ئەسپ بۆ نەخشاندنی کتێب. بەڵام ئەوەندەی من بینیبووم و بیستبووم، لووتی هیچ ئەسپێکی ئەو نەبڕابوو، چونکە ئەسپی ئەفسانەیی و بێ کێماسی بەلای ئەمەوە ئەسپی بەهێز و سەرکەوتووی مەگۆل نەبووە، بگرە ئەسپ عەرەبیی نازدار بووە. ئەم بەگەورەیی ئەسپی مەگۆلی بینیوە، بەڵام ئەسپی ڕەسەنی عەرەبی بەشێک بوو لە سەردەمی پڕ کامەرانیی تافی لاوی و لە دوای خۆی جێی هێشتوون. لەبەرئەوە لووتی ناقۆڵای ئەسپی نیگارکێشراو بۆ کتێبی زاوات، نە ئەسپی مەگۆل و نە ئەم شێوازەشی بیر خستمەوە کە مەگۆلەکان لە خۆراسان و سەمەرقەند جێگیریان کردبوو."

مامۆستا عوسمان بەدەم گێڕانەوەوە جاروبار سەیری کتێبەکە و ناوبەناویش سەیری منی دەکرد، بەڵام وەک ئەوە وابوو ئێمە نا، بگرە شتەکانی ناو خەیاڵی خۆی ببینێت.

"جگە لە بڕاویی کونی لووت و نیگاری چینی، شتێکی تری لە ڕێی سوپاکانی مەگۆلەوە بە وڵاتی عەجەم و تەنانەت بە ئێرەش گەیشتوو، ئیبلیسەکانی ناو ئەم کتێبەیە. ئێوە دەزانن ئەوانە باڵیۆزی خراپەکارین و لەلایەن هێزی تاریکی شاراوەوە ڕەوانە کراون، پڕ دەدەنە ژیانی ئێمەی مرۆڤ و ئەو شتانەی بەلامانەوە گرینگن و



دەمانبەن بۆ ژێرزەوینی تاریکی و مردن. هەور، دار، شتومەک، سەگ، کتێب و گشت شتێکی تری ئەو دنیای ژێرزەوینە ڕۆحێکی هەیە و دەدوێت."

پیری بستەباڵا گوتی: "بەڵێ، خوا بەبان سەرەوە ئاگای لێیە هەندێک لەو شەوانەی دەرگام لەسەر قفڵ دەدرێت، نەک بەتەنیا ئەم سەعاتانە و قاپ و دەوریی چینی و ئەم کاسە کریستاڵانەی وا هەر لە خۆیانەوە زرنگەیان دێت، بگرە ڕۆحی سەرجەم ئەم تفەنگ و شمشێر و قەڵغان و خوودە خوێناوییانە ئۆقرەیان لێ دەبڕێت و دەست بە قسەکردنێکی وا دەکەن کە ئەم ژووری گەنجینەیە لە تاریکیدا وەردەسووڕێتە سەر مەیدانی شەڕێکی مەحشەری."

مامۆستا عوسمان گوتی: "ئەو دەروێشە قەلەندەرانەی نیگارەکانیان دەبین، ئەم باوەڕەیان لە خۆراسانەوە هێنایە وڵاتی عەجەم و لەوێشەوە بۆ ئەم ئەستەنبوڵەی ئێمە. کاتێک یاوز سوڵتان سەلیم شا ئیسماعیلی تێک شکاند و کۆشکی هەشت بەهەشتی بەتاڵان برد، بەدیعوزەمان میرزای نەوەی تەیمووری لەنگ ناپاکیی لە شا ئیسماعیل کرد و بەخۆی و دەروێشە قەلەندەرەکانییەوە هاتە ناو عوسمانییەکانەوە. کاتێک یاوز سوڵتان سەلیمی بەهەشتنشین بە تۆفان و بەناو بەفری زستاندا بۆ ئەستەنبوڵ گەڕایەوە، سەرباری دوو ژنی پێست سپی و چاو بادەمیی ناو دەستەی ژنانی شا ئیسماعیلی لە شەڕی چاڵدێران دۆڕاو، سەرجەم ئەم کتێبانەشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. کتێبەکان، پاشماوەی مەگۆل و ئێلخانی و جەلایر و قەرەقۆیونلوی خاوەنانی پێشووی تەورێز و ئەو کتێبانە بوون کە پادشای دۆڕاو لە پەلامار بۆ سەر ئۆیزبەک و عەجەم و تورکمان و نەوەکانی تەیمووری لەنگدا بەتاڵانی بردبوون و لە کونجی کتێبخانەی کۆشکی هەشت بەهەشتی ئاخنیبوون. تا ئەو کاتەی سوڵتانمان و گەورەی خەزنەداران لێرە دەرم دێنن، من سەیری ئەم کتێبانە دەکەم."

ئەو نیشان نەپێکانەی لای کەسانی کوێر بەدی دەکرا، ئیدی لە نیگای ئەمیشدا دەبیندرا؛ زەرەبینە دەسک گەوهەرینەکەی بۆ سەیرکردن نا، بگرە لەبەرئەوەی لەسەری ڕاهاتبوو، بەدەستەوە دەگرت. کەمێک بێدەنگ بووین. بستەباڵا وەک ئەوەی گوێی بۆ مەتەڵێک ڕاگرتبێت، گوێی بۆ سەرجەمی ئەم چیرۆکە ڕادێرابوو. مامۆستا عوسمان بەوردی وەسپی بەرگی دەستنووسێکی بۆ کرد و داوای لێ کرد بۆی

بهێنێت. دوای ڕۆیشتنی بستەبالا، بە ساویلکەیی لە مامۆستام پرسی:

"ئەدی دەبێت کێ نیگاری ئەسپەکەی ناو کتێبی زاوامی کێشابێت؟"

گوتی: "هەردوو ئەسپەکە کونی لووتیان بڕاوە، بەڵام وەک گوتم چ لە سەمەرقەند بێ و چ لە "ماوراء النهرين"، نیگاری ئەم ئەسپە لەسەر شێوازی چینی کێشراوە. ئەسپە جوانەکەی ناو کتێبی زاوای تۆش، وەک ئەسپە شاکارەکانی مامۆستایانی هەراتی لەسەر شێوازی عەجەم کێشراوە. ئەسپێکی هێندە جوانە مرۆڤ بەدەگمەن شێوەی لەم دنیایەدا دەبینێت. ئەوە ئەسپێکی ناو نیگارە، ئەسپی مەگۆلی نییە."

بەچرپە گوتم: "بەڵام کونی لووتی وەک ئەسپێکی ڕاستەقینەی مەگۆلی بڕاوە."

"چونکە ئاشکرایە دوای پاشەکشەی مەگۆلەکان و دەست پێکردنی سەردەمی تەیمووری لەنگ و کوڕانی ئەو، تا دووسەد ساڵ لەمەوبەریش مامۆستایانی نیگارکێش لە کاتی کێشانی نیگاری ئەسپدا لە هەرات یان لەژێر کاریگەریی بینینی ئەسپی مەگۆلیدا بوون و هێناویەتیانەوە بیری خۆیان و کێشاویانە. جا وەستای بکێشی ئەم نیگارە یان ئەوەتا کەوتووەتە ژێر باندۆری نیگاری یەکێک لەو مامۆستایانە و نیگارێکی شاکاری ئەسپی بە کونە لووتی بڕاوەوە کێشاوە. کەس نەیدەزانی بۆ چ پادشایەک کێشراوە و کام پەڕەی کێژان کتێب بووە: بەڵام دڵنیام ئەو کتێبە و ئەو نیگارە لە کۆشکێک، کێ دەزانێت، لەوانەیە زۆر بەدڵی یارێکی نازداری پادشا بووبێت لە حەرەمسەرا و وەسپی کرابێت و سەردەمێک بووبێت بە داستان. لەبەرئەوەی بەمجۆرەیە، دڵنیام سەرجەم نیگارکێشانی ئاسایی ئیرەییان بەم ئەسپە لووت بڕاوە بردووە، تا بۆیان کراوە باسیان کردووە و پیایاندا هەڵداوە، لاساییان کردووەتەوە و لەبەریان گرتووەتەوە. بەوشێوەیە، کونی لووتی ئەسپەکەش لەگەڵ ئەسپی دانسقەدا خۆی بووە بە قاڵب و لە بیرەوەریی نیگارکێشانی ئەو نیگارخانەیەدا هەڵکۆڵدراوە و لەبەر کراوە. دوای ساڵانێکی درێژ و پاش ئەوەی سەردارانی ئەو نیگارکێشانە لە شەڕدا دۆڕاون، کتومت چەشنی ئەو ژنە خەمگینانەی ڕوو لە حەرەمسەرای تر دەکەن، ئەمانیش پادشا و شازادەی نوێیان بۆ خۆیان دۆزیوەتەوە. کاتێکیش شار و وڵاتیان گۆڕیوە، لووتی بەزەرافەت بڕاوی ئەسپیی هەڵکۆڵدراوی ناو بیرەوەریی خۆیشیان لەگەڵ خۆیاندا بردووە. ئەم لووتە



بڕاوەی نووستووی ناو گۆشەیەکی بیرەوەریی زۆربەی نیگارکێشان، لەوانەیە لەبەر شێواز و مامۆستای تری نیگارخانەکانی تر، هیچ کاتێک بوار بەکێشانی نەدرابێت و دواجار لەبیر کرابێت. بەڵام بڕێک لە نیگارکێشانی تر لەو نیگارخانانەی بنەیان لێ خستووە، هەر بەکێشانی نیگاری ئەسپی لووت بەزەرافەت بڕاوەوە نەگیرساونەتەوە، بگرە دەیانگوت لەبەرئەوەی –مامۆستایانی کۆن وایان دەکرد–، ئەم هونەرەیان فێری شاگردە جوانەکانی خۆیشیان دەکرد. بەمجۆرە، تەنانەت دوای چەندین سەدە لە کشانەوەی مەگۆلەکان و ئەسپە لووت بڕاو و بەهێزەکانیان لە وڵاتانی عەرەب و عەجەم و دەست پێکردنی ژیانێکی نوێ لەو شارانەی مەگۆلەکان سووتاندبوویان و تالانیان کردبوون، هەندێک نیگارکێش باوەڕیان وابووە ئەمە قاڵبە و درێژەیان داوە بەکێشانی نیگاری ئەسپ بە کونی بڕاوی لووتەوە. لەوەش دڵنیام هەندێکیان بێ ئەوەی ئاگایان لە شەڕوانانی سوارەی مەگۆل و کونی لووتی بڕاوی ئەسپەکانیان بێت، گوتوویانە – ئەمە قاڵبە – و چەشنی نیگارکێشەکەی لەمەڕ خۆمان نیگاری ئەسپیان کێشاوە."

بەهەستێکی سەرسوڕمانەوە گوتم: "مامۆستای ئەفەندیم، –شێوازی یاوەر–تان بەڕاستیش وەک ئومێدەواربوون، ئەنجامی دا بەدەستەوە. هەر نیگارکێشێک واژۆیەکی نهێنیشی هەیە."

بە لەخۆ بایبوونەوە گوتی: "هەر نیگارکێشێک نا، هەر نیگارخانەیەک. تەنانەت هەموو نیگارخانەیەکیش نا. لە هەندێک نیگارخانەی بەدبەخت، کتومت وەک ئەوەی لە هەندێک خێزانی نەگبەتدا ڕوو دەدات، ساڵانی ساڵ لە هەر سەرێک دەنگێک دەردەچێت و کەس تێ ناگات شادمانی لە گونجانەوە و گونجانیش لە شادمانییەوە سەرچاوە دەگرێت. بەشێک هەوڵ دەدات بەشێوازی چینی، هەندێک بە تورکمانی، بڕێک بە شیرازی و تاقمێکیش بەشێوازی مەگۆلی نیگار بکێشێت. بۆیە وەک ژن و پیاوی نامراد ساڵانێکی درێژ بە شەڕ دێن و تەنانەت نابن بە خاوەن شێوازی هاوبەشیش."

ئێستا بەئاشکرا لە خۆ بایبوون سیمای داپۆشیبوو و نیگای مرۆڤێکی کەللەڕەقی خوازیاری کۆکردنەوەی گشت هێزەکان لە دەستی خۆیدا جێی ئەو هێمای –پیری

خەمبار و دڵسووتاو–ەی گرتبووەوە کە سەردەمێکی درێژ بوو من بە ڕوویەوە دیبووم.

گوتم: "مامۆستام، ئێوە ماوەی بیست ساڵ نیگارکێشی، خاوەن خوو و خولیای جیاوازی هەر چوارگۆشەی جیهانتان لێرە لە ئەستەنبوڵ لە کەشێکی گونجاودا یەک خست و شێوازی عوسمانییتان داهێنا."

ئەو سەرساماییەی پێش تۆزێک لە قوڵاییی دڵمدا هەستم پێ کردبوو، ئێستا کاتێک ڕووبەڕوو قسەم لەگەڵدا دەکرد، بۆچی وەرگەڕابووە سەر دووڕوویی؟ ئایا ئەو کەسەی ئێمە شەیدای هونەر و وەستای ئەوین، پێویستە بەباشی لە هێز و دەسەڵات بکەوێت و کەمێک بەلەنگاز بێت تا ئێمە بتوانین لە ناخەوە هەستی خۆمانی بۆ دەربڕین؟

گوتی: "ئەرێ ئەو بستەباڵایە چی بەسەرهات؟"

وەک کەسێکی خاوەن هێز لەوانەی مامەحەمەیی و پیاهەڵدانیان پێ خۆشە، بەڵام بەئاستەم بیریان دەکەوێتەوە کە نابێت پێیان خۆش بێت، ئەم قسەیەی کرد: بۆ ئەوەی بوو پێشانی بدات خوازیاری گۆڕینی بابەتە.

بەچرپە گوتم: "سەرباری ئەوەی مامۆستایەکی گەورەی داستان و شێوازەکانی عەجەمن، دنیایەکی نیگارکێشیی جیاوازی شایەن بە شکۆ و هێزی عوسمانییتان ئافراند. ئێوە بوون هێزی شمشێری عوسمانی، ڕەنگە گەشبینەکانی سەرکەوتن، سەرنجی حەزی شتومەک و ئامێر و سەربەستیی ژیانێکی خۆشگوزەرانترتان هێنایە ناو نیگارەوە. مامۆستام، گەورەترین شەرەفی ژیانی من ئەوەیە لێرە لەگەڵ ئێوە سەیری شاکارەکانی مامۆستایانی کۆنی ئەفسانەیی بکەم..."

ماوەیەکی درێژ لەسەر ئەم ڕیتمە بەچرپە قسەم بۆ کرد. دۆخی پەرش و بڵاوی ژووری گەنجینەی هاوشێوەی مەیدانێکی چۆڵکراوی شەڕ و نزیکبوونەوەی جەستەمان لە تاریکیی سارددا، چرپەکانی منی وەردەگەڕاندنە سەر جۆرێک لە متمانە.

دواتر، چەشنی کوێر هێماکانی سەر ڕووی خۆی پێ جڵەو نەکرێت، لە چاوانی مامۆستا عوسماندا نیگای کەسێکی نقومبووی ناو چێژ بەدەرکەوت. بەنەفرەتێک، کە هەندێک جار لە دڵەوە و ناوبەناویش لە بەرامبەر کوێراندا هەستی پێ دەکەم، مچوڕکم پێدا هات و دوور و درێژ بە شان و باڵی وەستای پیرمدا هەڵدا.



بە قامکە ساردەکانی، دەستی گرتم، دەستی بە مەچەکمدا هێنا و پاشان دەستی لە ڕووم دا. هەستم کرد هێز و پیریی ئەو لە پەنجەکانیەوە بۆ من پەڕییەوە. بیرم لە شەکوورە کردەوە و دەمزانی لە ماڵ چاوەڕێم دەکات.

پەڕەی کراوەمان لەبەردەست بوو و بێ ئەوەی جووڵە بکەین، تاوێک وەستاین. دەتگوت پیاهەڵدانەکانی من و شەیدابوونی ئەو بەخۆی و دڵسووتاوییەکەی، هەردووکمانی ماندوو کردووە و پشوومان دەدا. شەرمێک لە نێوانماندا هەبوو.

دیسان پرسی: "بستەباڵا چیی بەسەرهات؟"

دڵنیا بووم ئەو گرگنە چەپەڵە خۆی لە گۆشەیەکدا مەڵاس دابوو و چاودێریی ئێمەی دەکرد. وەک ئەوەی بە نیگاکانم بەدوای ئەودا بگەڕێم، شانەکانم بۆ لای ڕاست و چەپ وەرچەرخاند، بەڵام زۆر بەسەرنجەوە چاوم لە چاوانی مامۆستا عوسمان بڕیبوو. ئایا کوێر بوو، یاخۆ دەیویست خۆی و کەسانی تریش بەکوێربوونی خۆی قایل بکات؟ هەندێک لە مامۆستایانی کۆنی بێ هونەر و بێ توانای شیرازی، بەمەبەستی ئەوەی لە پیریدا ڕێزیان لێ بگیرێت و سەرنەکەوتنیان لە ژیاندا بە ڕوویاندا نەدرێتەوە، لاساییی کوێریان کردووەتەوە.

گوتی: "دەمەوێت لێرە بمرم."

بە مالووسیکردنەوە گوتم: "مامۆستای گەورەم، ئەفەندیم، لەم ڕۆژگارە خراپەدا کە نرخ بۆ نیگار دانانرێت و لەبری ئەوە ڕێز لە پارەی لە نیگار بەدەست هاتوو دەیگرێت و بایەخ بە مامۆستایانی کۆن دانانرێت و گرینگی بە کەسانی لاساییکەرەوەی فەرەنگ دەدرێت، من زۆر باش لە قسەکانتان حاڵی دەبم و ئەمەش وا دەکات فرمێسک لە چاوانمدا کۆ بێتەوە. بەڵام پاراستنی نیگارکێشانیشتان لە دوژمنانیان ئەرکی سەر شانی ئێوەیە. تکایە پێم بڵێن چ ئەنجامێکتان لە –شێوازی یاوەر–ەوە وەگیرکەوت؟ ئەو نیگارکێشەی نیگاری ئەو ئەسپەی کێشاوە، کێیە؟"

"زەیتوون."

ئەمەی بەشێوەیەک درکاند بگرە هەلی سەرسوڕمانی بۆ من نەهێشتەوە.

کەمێک بێدەنگ بوو.

بەئارامی گوتی: "بەڵام لەوەش دڵنیام زەیتوون نە زاوای تۆی کەشتووە و نە زەریف ئەفەندیی داماو. شیمانەی ئەوەی زەیتوون نیگاری ئەسپەکەی کێشابێت، لەوەوە دەردەخەم کە ئەو لە گشت کەسێک زیاتر پابەندی مامۆستایانی کۆنە، ئەو لە هەمووان زیاتر لە نزیکەوە و لە دڵەوە شارەزای داستان و شێوازەکانی هەراتە و بنەداری وەستاکانی وی تا سەمەرقەند درێژ دەبێتەوە. دەزانم تۆ ناپرسیت باشە بۆچی ئەم کێماسییەی لووتمان لەو ئەسپانەی تردا نەبینی کە چەندین ساڵە زەیتوون دەیانکێشێت؟ من گوتبووم جاری وا هەیە سەرباری ئەوەی وردەکارییەک، باڵی مەلێک و وەستانی گەڵایەک بە دارەوە، لە وەستاوە بۆ شاگرد، نەوە دوای نەوە لە بیرەوەریدا دەپارێزرێت، بەڵام بەهۆی شەڕانگێزی و وشکیی وەستای نیگارکێش و لەبەر چەژی سوڵتان و کەش و هەوای نیگارخانە هەرگیز ناکەوێتە ڕوو. کەواتە ئەمە ئەو ئەسپەیە کە زەیتوونی خۆشەویست لە سەردەمی منداڵیدا ڕاستەوخۆ لە مامۆستایانی عەجەمەوە فێری بووە و هەرگیز لەبیری نەکردووە. هاتنە ئاراوەی ئەم ئەسپە بۆ کتێبی زاوای گەمژە، گەمەیەکی بێ بەزەییانەی خوایە لە بەرامبەر من. مەگەر هەر هەموومان وەک پێویست مامۆستایانی کۆنی هەراتمان بە نموونە و پێشەنگ وەرنەگرتووە؟ کتومت وەک ئەوەی چۆن نیگارکێشی تورکمان نیگاری ژنی شۆخ دێنێتە بەرچاوی خۆی، ئایا ئێمەش کاتێک باس هاتبێتە سەر نیگاری جوان، بیرمان لە شاکارەکانی مامۆستایانی کۆنی هەراتی نەکردووەتەوە؟ گشتمان شەیدای مامۆستایانی کۆنی هەراتین. لە پشت سەرجەم نیگارکێشانی گەورەوە هەراتی بەهزاد و لە پشت هەراتیشەوە ئەسپەکانی مەگۆل و چین هەیە. زەیتوونێک هێندە گرێدراوی داستانەکانی هەرات بێت، بۆچی دەبێت زەریف ئەفەندیی داماوی کوشتبێت، ئەو زەریف ئەفەندییەی لەویش زیاتر پەیوەستی شێوازە کۆنەکان بوو و بگرە کوێرانە دابوویە دووی؟

گوتم: "کێ؟ پەپوولە؟"

گوتی: "لەقلەق. دڵم ئەمەشم پێ دەڵێت، چونکە شارەزای تەماحیم و دەزانم لەبەر لێهاتوویی لەخۆی بایی بووە. گوێ بگرە بۆ ئەمە: بەئەگەری زۆر زەریف ئەفەندیی بەستەزمان بەدەم ئەنجامدانی زەڕکارییەوە وا حاڵی بووە کتێبەکەی زاوات بە




لاساییکردنەوەی شێوازەکانی فەڕەنگ بێ ئاینی و کفر و خوانەناسی لەخۆ دەگرێت و لەمە ترساوە. لەلایەک، لەبەرئەوەی بەشی ئەوە بێ ئەقڵ بووە تا گوێ بداتە گاڵەگاڵ و قسەی پڕوپووچی مەلای ئەرزەڕوومی –زەڕکاران لە نیگارکێشان زیاتر لە خواوە نزیکن، بەڵام مخابن وەڕەسکەر و گەمژەن–، لەلایەکی دیش، لەبەرئەوەی زانیویەتی کتێبەکەی زاوای بوودەڵەت کارێکی نهێنی و گەورەی سوڵتانمانە، ترس و گومانی لەکن تێکەڵ بووە: ئایا بڕوا بە سوڵتانی خۆی بکات، یان بە مەلای ئەرزەڕوومی؟ من ئەم جگەرگۆشەیەی خۆم وەک ناولەپی خۆم دەناسی و ئەگەر کاتێکی تر بوایە، دەهاتە کن منی مامۆستای خۆی و دەردی هەناوی خۆی بۆم هەڵدەڕشت. بەڵام لەبەرئەوەی بە مێشکی بچووکی خۆی زۆر باش حاڵی بووە کە ئەنجامدانی زەڕکاری بۆ کتێبەکەی زاوات بەلاساییکردنەوەی فەڕەنگان بەواتای ناپاکیکردنە لە من و لە نیگارخانە، منەی کەسێکی تری کردووە و لەبەرئەوەی شەیدای هونەری لەقلەقی فێڵباز و تەماحکار بوو، لە باوەڕ پێکردندا کەوتووەتە هەڵەوە و بە ئەقڵ و بە ئاکاریشی سەرسام بووە و دەردی دڵی خۆی بۆ هەڵڕشتووە. من زۆر جار دیومە لەقلەق سوودی لەم شەیدابوونە وەرگرتووە و زەریف ئەفەندیی بەکارهێناوە. سا ئیدی بزانە چ دەمەقاڵێیەک لە نێوانیاندا ڕووی داوە و لەقلەق ئەوی کوشتووە. بەهۆی ئەوەی زەریف ئەفەندی پێشتر ترسی خۆی لای پیاوانی ئەرزەڕوومی درکاندووە، ئەوانیش بۆ ئەوەی بە تۆڵەسەندنەوە هێزی خۆیان پێشان بدەن، زاوای تۆ، زاوای شەیدا و سەوداسەری فەڕەنگیان بە لێپرسراوی کوشتنی هاوڕێکەی خۆیان زانیوە و کوشتوویانە. ناتوانم بڵێم ئەمە زۆر خەمگینی کردم. زاوات ساڵانێکی زۆر لەمەوبەر سوڵتانمانی لە خشتە برد و بەدەستی نیگارکێشێکی فەڕەنگی –ناوی سەبستیانۆ بوو– نیگاری سوڵتانمانی وەک ئەوەی پادشای گاوران بێت، بەکێشان دا. دواتر ئەو نیگارە قرێژەی وەک نموونەیەک خستە بەردەمی من و ناچاری شتێکی چەپەڵ و شکۆ بریندارکەری کردم بۆ ئەوەی سەیری بکەم و وەک خۆی بیکێشمەوە. منیش لە ترسی سوڵتانمان بێ شەرەفانە لاساییی ئەو نیگارەی لەسەر شێوازی گاوران کێشراوم کردەوە. ئەگەر نەمکردایە، ئەوا لەوانە بوو بۆ کوشتنی زاوات خەمبار بوومایە و ئەمڕۆ بەخۆ بکەوتبام بۆ دۆزینەوەی ئەو نامەردەی کۆتاییی بە ژیانی هێنابوو. بەڵام

خەمی من زاوای تۆ نییە، نیگارخانەکەمە. بەهۆی زاواتەوە، وەستایانی نیگارکێشم، ئەوانەی هەریەکەیانم بە ئەڤینەوە لە منداڵانی خۆم زیاتر خۆشویستووە و ماوەی بیست و پێنج ساڵ بە لەرزەلەرز پێم گەیاندوون، ناپاکییان لە من و لە سەرجەم نەریتەکانی نیگارکێشانمان کرد و بەبیانووی ئەوەی ئیدی سوڵتانمان وای دەوێت، دەستیان کرد بەلاساییکردنەوەی مامۆستایانی فەرەنگ. ئێمەی میللەتی نیگارکێشان، ئەگەر لە پێشدا ببین بە کۆیلەی هونەر و پیشەی خۆمان، نەک کۆیلەی سوڵتانی کار پێدەرمان، ئەوا بەهەشت بۆ خۆمان مسۆگەر دەکەین. ئێستا دەمەوێت تەنیا سەیری ئەم کتێبە بکەم."

ئەم وتەیەی کۆتایی چەشنی پاشایەکی ماندوو دەبری، پادشایەک، لێپرسراویەتیی دۆڕانی شەڕی خرابێتە ئەستۆ و لەوەدا بێت سەری بپەڕێندرێت. بستەباڵا کتێبێکی نابووە بەردەستی و ئەم پەڕەکانی هەڵدایەوە و بە دەنگێکی تووڕەوە فەرمانی پێ دا پەڕەی مەبەستی بۆ بدۆزێتەوە. بەم دەنگەی پڕ لە تاوانبارکردنەوە یەکسەر بووبووەوە بە گەورەی نیگارکێشانی ناسراو لە نیگارخانە.

دوور کەوتمەوە و بەناو بالیفی بە مرواری نەخشێندراو و تفەنگی قۆناغ گەوهەرین و لوولە ژەنگاوی و دۆڵابدا کشامەوە گۆشەیەک و لە دوورەوە سەیری مامۆستا عوسمانم کرد. کاتێک گوێم بۆ ئەو ڕاگرتبوو، گومانێک بە هەناومدا دەهات و دەچوو و ئێستا ئەو گومانە سەرتاپای جەستەمی داگرتبوو: زۆر بەجوانی خەیاڵم چوو بۆ ئەوەی ئەم سەرەتا زەریف ئەفەندیی داماو و دواتریش زاوامی بە کوشتن دابێت بۆ ڕاگرتنی لاساییکردنەوەی فەرەنگ لە کتێبی سوڵتانماندا و لەم ڕووەوە خۆم تاوانبار کرد لەپای ئەو هەستی شەیدابوونەی پێش تۆزێک بەرامبەر بە مامۆستا عوسمان هەمبوو. لەلایەکی ترەوە، بمەوێت و نەمەوێت زۆر ڕێزیشم هەبوو بۆ ئەو مامۆستا گەورەیەی کە بەهەموو هەستەوە لە نیگارەکەی بەردەستی خۆیدا نقوم بووبوو و چاوانی چ کوێر بن و چ نیوەکوێر، وا دەهاتە بەرچاو وەک ئەوەی بە گنج و لۆچی پێستی ڕووی، سەیری نیگارەکەی بەردەمی بکات. کاتێک باش لەوە گەیشتم ئەو بۆ پاراستنی شێوازی کۆن و نەزمی نیگارخانە و ڕزگاربوون لە کتێبەکەی زاوام و بۆ ئەوەی سەرلەنوێ ببێتەوە بە دەلالی تاقانەی سوڵتان، نەک تەنیا یەکێک لە



نیگارکێشانی خۆی، بگرە ئامادە بوو منیش بەئاسانی بخاتە بەر ئەشکەنجەی سەرگەورەی پاسەوانان، هێزی خەیاڵی خۆم بەدوور و درێژی خستە کار بۆ ئەوەی بتوانم خۆم لەو ئەڤینەی بە دوو ڕۆژ منی پابەندی ئەو کردبوو، ڕزگار بکەم.

کاتێکی زۆر تێ پەڕیبوو و سەرم لێ تێک چووبوو. تەنیا بۆ هێورکردنەوەی ئیبلیسەکانی هەناوم و بڵاوە پێکردنی سەرنجی جنۆکە بێ ئۆقرەکان، چەندین پەڕەی دەستنووسی بە نیگار نەخشێندراوم لە سندووقەکان دەرهێنا و لە خۆمەوە ماوەیەکی درێژ سەیرم کردن.

ئای چ کەسانێکی زۆر، چ پیاو، چ ژن، دەستیان نابووە دەمی خۆیان. ئەم جووڵەیە لە ماوەی دووسەد ساڵی ڕابردوودا هەر لە سەمەرقەندەوە تا بەغدا لە سەرجەم نیگارخانەکان وەک نیشانەی سەرسوڕمان بەکارهێندرابوو: کاتێک کەیخەسرەوی قارەمان لەلایەن دوژمنانییەوە تەنگی پێ هەڵدەچنرێت و کەڵەکوان ڕازی نابێت لەگەڵ خۆیدا هەڵی بگرێت و ئەم بەیارمەتی خوا بە ئەسپە ڕەشەکەی لە ڕووباری جەیهوون دەپەڕێتەوە، کەڵەکوانی نامەرد و سەوڵ لێدەرەکەی بەسەرسوڕمانەوە دەستیان ناوەتە دەمی خۆیان. گاڤێک شیرین بە پێستی جوانی وەک تریفەی مانگەوە لە گۆلی زیو ڕەش هەڵهاتووی دێریندا خۆی دەشوات و خەسرەو یەکەمجار جوانییەکەی دەبینێت، لەتاو سەرسامی پەنجە دەنێتە دەمی خۆی. ئەوانەی وردتر و ماوەیەکی درێژتر سەیرم کردن، ژنانی حەرەمسەرای قامک لەناو دەم بوون لە دەرگای نیوە کراوەی کۆشک و پەنجەرەی کەس پێنەگەیشتووی قولەی قەڵا و پشت پەردەوە دەکەوتنە بەرچاو: دوای ئەوەی تەژاڤ لە شەڕی دژ بە ئێرانییەکان تێک دەشکێت و تاجی خۆی ون دەکات و لە مەیدانی شەڕ هەڵدێت، ئەسپی نووی جوانی جوانان و گوڵی تەژاڤ لە پەنجەرەی حەرەمسەرا بە خەم و سەرسامییەوە پەنجەی ناوەتە دەمی و سەیری دەکات و بە چاوانی لە من دەپاڕێتەوە و دەڵێت مەهێڵە بکەوێتە دەستی دوژمن. ئەو دەمەی یوسف لەپای بوختانی "دەستی بۆ ئابڕووم درێژ کرد" دەستگیر دەکرێت و بۆ ژووری زیندان دەبرێت، زولەیخای بوختانچی لە پەنجەرەدا قامکی ناوەتە دەمی جوانی، بەڵام لەبەر سەرسوڕمان نا، بگرە بە ئیبلیسی و بۆ هەوەس بزواندن. کاتێک دوو ئەڤینداری بەختەوەر، بەڵام خەمگینی ناو هەڵبەستێک لە

باخچەیەکی بەهەشت ئاسا بەهێزی ئەڤین و شەراب لە هۆش خۆیان چوون، یاوەرێکی نیازخراپ قامکی ناوەتە دەمی سووری و سەریان دەکات، بەڵام لەبەر ئیرەیی پێبردن، نەک بەهۆی سەرسوڕمانەوە.

سەرباری ئەوەی ئەم جووڵەیە قاڵبێکی نەخشێندراوە لە دەفتەری نموونە و لە مێشکی سەرجەم نیگارکێشاندا، قامکی درێژ هەر جارەی بە زەرافەتێکەوە دەچێت بە دەمی ژنی جواندا.

تۆ بڵێی بینینی ئەم نیگارانە تا چ ڕادەیەک دڵی منیان دابێتەوە؟ بەرەبەری ڕۆژ تاریکبوون چوومە کن مامۆستا عوسمان و وام گوت:

"مامۆستام، ئەفەندیم، کاتێک دەرگا کرایەوە، من بە دەستووری ئێوە لە گەنجینە دەڕۆم."

گوتی: "خێرە. هێشتا شەوێک و چێشتەنگاوێک کاتمان هەیە. چ زوو چاوانت لە سەیرکردنی جوانترین نیگارەکانی دنیا تێر بوو!"

گاڤێک ئەمەی گوت، سەری لەسەر پەڕەکەی بەردەستی هەڵنەبڕی، بەڵام ئەو لێڵییەی لە بیلبیلەی چاوانیدا بەدی دەکرا، بەڵگەی هێدی هێدی کوێربوونی بوو.

بوێرانە گوتم: "ڕازی کونی لووتی ئەسپەکەمان بۆ ئاشکرا بوو."

گوتی: "ها. بەڵێ. ئیدی سوڵتانمان و سەرگەورەی پاسەوانان دەزانن چ دەکەن. لەوانەشە لە هەموومان خۆش بن."

ئایا ناوی لەقلەقی وەک بکوژ دەدانێ؟ من لە ترساندا ئەمەم هەر نەپرسی، چونکە ترسی ئەوەم هەبوو مۆڵەتی چوونەدەرەوەم نەدات. لەوەش خراپتر، لەبەرەوە باوەڕم دەکرد منیش تاوانبار دەکات."

گوتی: "ئەو دەرزییە پەڕەمووچەی بەهزاد خۆی پێ کوێر کرد، ون بووە."

گوتم: "پێ دەچێت بستەبالا هەڵی گرتبێت و خستبێتیەوە شوێنی خۆی. ئەم پەڕەیەی ئێوە سەیری دەکەن، چ جوانە."

ڕووی وەک ڕووی منداڵێک گەشایەوە، بزەیەک کەوتە سەر لێوی و گوتی: "ئەمە ئەو نیگارەیە کاتێک خەسرەو بەشەو بەسواری ئەسپ دێتە دامێنی کۆشکی شیرین و بە



ئەڤینی ئەو لە ناخەوە قرچەی سووتانی دێت و چاوەڕێ دەکات. بەشێوازی مامۆستایانی کۆنی هەراتی کێشراوە."

ئێستا وا دەیڕوانی وەک ئەوەی نیگارەکە ببینێت، بەڵام تەنانەت زەڕەبینەکەشی بەدەستەوە نەگرتبوو.

"ئایا تۆ جوانیی وەدەرکەوتووی یەک بەیەکی گەڵای دارانی وەک گوڵی بەهاران و ئەستێرەی شەوان کە دەڵێی لە تاریکاییی شەودا لە خۆیانەوە دادەگیرسێن، نابینیت؟ ئەدی پشووی بێ فێزیی بەکارهێندراو بۆ نەخشاندنی دیوارەکان و زەرافەتی بەکارهێنانی ئاوی زێڕ و گونجاندنی سەرجەم نیگارەکە دەبینیت؟ ئەسپی چەلەنگی خەسرەو، هێندەی ژنێک زراڤ و شۆخە. ملی شیرینی خۆشەویستی لە پەنجەرەی سەرەوەدا خوارە، بەڵام لە ڕوودا بەخۆنازە. نیگارکێش وردەکارانە و بە ئەڤینەوە نیگارەکەی بۆیاخ کردووە و هەر دەڵێی هەردوو عاشق لەو تیشکەی لە ڕەنگەکان و هۆنینەوەی نیگار و پێستی خۆیانەوە دەردەچێت، بۆ هەتا هەتایە لەوێ دەمێننەوە. دەبینیت، ڕووی سەریان تا ڕادەیەک لە یەکترە، بەڵام ڕووی نیوەی جەستەشیان لە ئێمەیە، چونکە دەزانن ئەو شتەی تێیدا ڕاوەستاون نیگارە و لە ئێمەشەوە دیارە. بۆیە هەرگیز هەوڵ نادەن کتومت هاوشێوەی ئەو شتانە بن کە ئێمە بەردەوام دەیانبینین. تەواو بەپێچەوانەوە، ناڕاستەوخۆ تێمان دەگەیەنن ئەوان لە بیرەوەریی خواوە هاتوونەتە دەرێ. ئەمەش وای کردووە لەوێ، لەو نیگارەدا زەمان ڕابووەستێ. گێڕانەوەی بەسەرهات بە نیگارەوە هەرچەندیش خێرا بێت، ئەوان وەک کچی گەنجی شەرمن و ڕێزداری باش پەروەردەکراو، بێ ئەوەی بەدەست و قۆڵ و جەستەی نازدار و تەنانەت چاویشیان جووڵەیەکی نەشیاو بکەن، تا کۆتایی لەوێدا دەمێننەوە. هەموو شتێکی ناو شەوی شینی تێر لەگەڵ ئەوان لە جووڵە دەکەون: باڵندەی ئاسمان هەم چەشنی دڵی ئەڤیندارانی بەپەلە بەشپرزەیی بەتاریکایی و بەناو ئەستێرەکاندا دەفڕێت و هەم لەو دەمەساتە بێ وێنەیەدا، وەک ئەوەی بەئاسمانەوە لکابێت، تا کۆتایی لەوێدا دەمێنێتەوە. وەستایانی دێرینی هەرات کاتێک هەستیان دەکرد وا خەریکە تاریکیی قەدیفەییی خوا وەک پەردەیەک بەسەر چاویاندا دادەدرێتەوە، زۆر باش دەیانزانی ئەگەر ماوەی چەندین هەفتە بێ ئەوەی

جووڵە بکەن، سەیری نیگارێکی لەم جۆرە بکەن و دواتر کوێر ببن، ئەوا دواجار ڕۆحیان ئاوێتەی زەمانی ناکۆتاییی نیگارەکە دەبێت."

کاتێک لەگەڵ بانگی ئێوارەدا بەهەمان بەزم و جەنجاڵی دەرگای گەنجینە کرایەوە، مامۆستا عوسمان هێشتا لە پەڕەکەی بەردەستیدا سەیری مەلی جووڵە لە خۆبڕیوو و ڕاوەستاوی ئاسمانی دەکرد. بەڵام ئەوانەی هەستیان بە ڕەنگی کاڵی گلێنەکانی چاوانیان دەکرد، کتومت وەک چۆن دەبینن کوێر لە گۆشەیەکی هەڵەوە دەست بۆ قاپی بەردەمی خۆی دەبات، حاڵی دەبوون ئەویش بەشێوەیەکی سەیر و نامۆ بۆ پەڕەکەی بەردەستی خۆی دەڕوانی.

چاوشەکانی قاوشی گەنجینە لەبەرئەوەی وایان زانی مامۆستا عوسمان جارێ لە ژوورێ دەمێنێتەوە و جەزمی ئاغا لەبەر دەرگایە، منیان بەوردی نەپشکنی و نەیانتوانی بگەنە دەرزییە پەڕەمووچەکەی ناو دەرپێیەکەم. دوای ئەوەی لە دەروازەکانی کۆشکەوە هاتمە کۆڵانەکانی ئەستەنبوڵ، چوومە پەنایەکەوە و ئەو شتەی ترسناکەی مامۆستا بەهزادی کوێر کردبوو، لە دەرپێیەکەم دەرهێنا و خستمە پشتوێنەکەمەوە. وەک ئەوەی ڕابکەم بە کۆڵانەکاندا ڕۆیشتم.

سەرمای ژوورەکانی گەنجینە هێندە چووبووە ناخمەوە، هەوای دەرەوەم پێ خۆش بوو و وام دەزانی هەوایەکی خۆشی سەرەتای بەهار لە کۆڵانەکاندا هەڵی کردووە. کاتێک بەپێش دووکانی بەقاڵ، سەرتاش، بۆنفرۆش، میوەفرۆش و ڕەژووکەریانی ئێسکیخاندا، کە یەک بەیەک دادەخران، تێ پەڕیم، هەنگاوم خاو کردەوە و لەو دووکانە گەرمانەی قوتیلکە ڕووناکی دەکردنەوە، بەوردی سەیری بەرمیل و سەرپۆش و گێزەر و مەرکانەم دەکرد.

کۆڵانی ماڵی زاوام –ئەوە هیچ هێشتا نەمدەگوت "کۆڵانی خۆم"، تەنانەت هێشتا نەمدەتوانی بە کۆڵانی شەکوورەش ناوی بهێنم–، دوای ماوەیەکی دوو ڕۆژی، نامۆتر و دوورتر هاتە بەرچاوم. بەڵام لە خۆشیی ئەوەی بە سپوساغی گەیشتبوومەوە شەکوورەی خۆم و بەگوێرەی ئەوەی ئیدی دەکرا بگوترێت بکوژ دۆزراوەتەوە، لۆجێکی ئەوەی دەمتوانی ئەمشەو بچمە نوێنی گیانی گیانانمەوە، منی ئەوەندە لە گشت دنیا نزیک دەخستەوە، کاتێک دار هەنارەکە و دەریوانە چاککراوەکە و



داخراوەکەم بینی، بەزۆر خۆم ڕاگرت بۆ ئەوەی نەبم بەو جووتیارەی لەمبەری چەمەوە بۆ ئەوبەر بانگ دەکات، چونکە دەمویست هەر ئەوەندە شەکوورەم بینی، بە: "ئاشکرا بوو بکوژی نامەرد کێیە" دەست بە قسان بکەم.

دەرگای حەوشەم کردەوە. ئایا لەبەر جیرەی دەرگا بوو، یاخۆ لە بێباکیی ئەو چۆلەکەیەی بەسەر دەولکەی بیرەکەوە بوو و ئاوی دەخواردەوە، یان بەهۆی تاریکیی ماڵەکەوە بوو، نازانم، بەڵام بەدەرک پێکردنی گورگانەی پیاوێکی دوازدە ساڵ بەتەنیا ژیاوەوە یەکسەر حاڵی بووم کەس لە ماڵ نییە. ئەگەرچی مرۆڤ بە ئازارەوە تێ دەگات تاک و تەنیایە، بەڵام سەرباری ئەوەش سەرجەم دەرگا و دۆڵابەکان دەکاتەوە و دادەخات و تەنانەت سەرقاپی مەنجەڵەکانیش هەڵدەداتەوە و دادەنێتەوە. منیش هەروام کرد. بگرە سندووقەکانیشم کردەوە و سەیرم کردن.

تەنیا شتێکی بەدرێژاییی گشت ئەو بێدەنگییە گوێم لێ بوو، ترپەی دڵی خێرا وەلێدان کەوتووم بوو. وەک بەساڵاچوویێک ئاردی بێژابێت و کاری خۆی بە ئەنجام گەیاندبێت و هێڵەکی بەدیواردا هەڵواسیبێت، کاتێک شمشێری خۆمی لە دوورترین سندووقدا شاراوەم دەرهێنا و لە پشتم بەست، تاوێک هەستم بەدڵنەوایی کرد. بەدرێژاییی ئەو ساڵانەی بە قەڵەمی خۆم کارم پەیدا کردبوو، شمشێری دەسک لە ددانی فیل دروستکراوم بەردەوام ئاسوودەییی دەروونی و هاوسەنگیی (هاوسەنگیی ڕۆیشتنیش) پێ دابووم. ئێمە پێمان وایە کتێب دڵدانەوەیە بۆ بەدبەختیی مرۆڤ، بەڵام چینێکی تر دەخاتە سەر ناشادیمان.

دابەزیمە حەوشە. چۆلەکەکە فڕیبوو. وەک ئەوەی لە کەشتییەکی لێواری نقومبوون دەربچم، ماڵم بۆ بێدەنگیی تاریکیی باڵکێشاو جێ هێشت و دەرچووم.

دڵم ئێستا زیاتر متمانەی بەخۆی بوو و پێی دەگوتم ڕاکە، بڕۆ بیاندۆزەوە. ڕام کرد. بەڵام سەرباری ئەوەش، لە شوێنە جەنجاڵەکان و لەو حەوشی مزگەوتانەی من بۆ قەدبڕ پیایاندا تێ پەڕیم، سەگەل لەبەرئەوەی بەزمیان دۆزیبووەوە، بەکلکبادانەوە دوام کەوتبوون و هەر کاتێک ژمارەیان زیادی دەکرد، من هەنگاوەکانم خاو دەکردەوە.

# 53

## من ناوم ئەستەرە

خەریک بووم بۆ نانی ئێوارە نیسکێنەم لێ دەنا کاتێک نەسیم گوتی: "یەکێک لەبەر دەرگایە." گوتم: "با بنی شۆرباکە نەسووتێت" و دوای ئەوەی کەوچکم دایە دەستی، دەستی پیریم نایە ناولەپی دەستم و دوو جار کەوچکم بەناو مەنجەڵەکەدا هێنا و برد، چونکە ئەگەر پێشانی نەدەیت، ئەوا بۆی هەیە چەندین سەعات کەوچک لە شۆرباکەدا ڕابگرێت و هیچ تێکی نەدات.

کاتێک قەرەم لەبەر دەرگادا بینی، تەنیا دڵم پێی سووتا. شتێکی وا بەڕوویەوە دیار بوو مرۆڤ دەترسا پرسیاری لێ بکات چ قەوماوە.

گوتم: "تۆ مەیە ژوورێ، ئێستا من خۆم دەگۆڕم و دێمە دەرێ."

جلە پەمەیی و زەردەکانم پۆشی، ئەوانەی بۆ بەزمەکانی ڕەمەزان و خوانی دەوڵەمەند و شاییی درێژخایەن نەبێت، لەبەریان ناکەم. بوخچەی جەژنانەم هەڵگرت و بە نەسیمی داماوم گوت: "دوای هاتنەوەم شۆرباکەم دەخۆم."

دووکەڵکێشەکانی گەڕەکی جوولەکانیش وەک مەنجەڵە هەژارەکانیان بەئاستەم دووکەڵی لێ بەرز دەبووەوە و هێشتا لەگەڵ قەرە کۆڵانێکی گەڕەکمان نەبڕیبوو، من پێم گوت:

"مێردی پێشووی شەکوورە لە شەڕ گەڕاوەتەوە."

تا لە گەڕەک دەرچووین قەرە بێدەنگ بوو. ڕووی، لە درەنگانی ئێوارێدا خۆڵەمێشی دەینواند.



زۆر دواتر پرسی: "لە کوێن؟"

بەمجۆرە حاڵی بووم شەکوورە و منداڵەکانی لە ماڵ نین. گوتم: "لە ماڵی خۆیانن."
لەبەرئەوەی مەبەست لەم قسەیە ماڵی پێشووی شەکوورە بوو، یەکسەر هەستم کرد دڵی قەرە چزەی لێوە هات و داغ بوو، بۆیە بە وشەی دووەم دەرگایەکی ئومێدم خستە سەرپشت: "پێم وابێت."

چاوی بڕییە ناو چاوانم و پرسی: "تۆ مێردە لە شەڕ گەڕاوەکەیت بینی؟"

"من نەئەوم بینیوە و نەدیومە شەکوورە ماڵ بەجێ بهێڵێت."

"لەکوێوە زانیت ماڵیان جێ هێشتووە؟"

"لە ڕووی تۆوە."

بەشێوەیەکی بڕیاردەرانە گوتی: "هەموو شتێکم بۆ بگێڕەوە."

ئەم ئەستەرە بۆ ئەوەی ببێت بە ئەستەرێک بتوانێت مێرد بۆ دەیان کچی خەیاڵپەرستی چاو لە پەنجەرە و گوێ لە دەرگا بدۆزێتەوە و بە دڵی ئاسوودەوە دەرگای دەیان ماڵ بکوتێ، پێویست بوو هیچ کاتێک هەموو شتێک نەگێڕێتەوە. بەڵام قەرە هێندە خەمبار بوو توانای تێگەیشتنی ئەمەی نەبوو.

گوتم: "حەسەنی برای مێردی پێشووی شەکوورە. چووەتە ماڵتان –کاتێک گوتم ماڵتان، بینیم دڵخۆش بوو–، بە شەوکەتی گوتووە باوکتان خەریکە لە شەڕ دەگەڕێتەوە، لای عەسر دەگاتە ماڵ و ئەگەر منداڵەکانی و دایکیان لە ماڵەوە نەبینێت، زۆر دڵتەنگ دەبێت. ئەگەرچی شەوکەت هەواڵەکەی بە شەکوورە گەیاندووە، بەڵام ئەو بەپارێزەوە هەڵسوکەوتی کردووە و نەیتوانیوە بگاتە بڕیارێک. بەرەبەری عەسر شەوکەت لە ماڵ هەڵهاتووە و پەنای بۆ مامی و باپیری بردووە."

"تۆ ئەمانە لە کوێوە دەزانیت؟"

مەگەر شەکوورە پێی نەگوتوویت ماوەی دوو ساڵە حەسەن سەرقاڵی نەخشەکێشان و فڕوفێڵە بۆ بردنەوەی شەکوورە بۆ ماڵی پێشووی؟ ماوەیەک حەسەن نامەی بە مندا بۆ شەکوورە دەنارد."

"ئایا شەکوورە هیچ وەڵامی دەدایەوە؟"

بەشانازییەوە گوتم: "گشت جۆرە ژنێکی ئەستەنبوڵ دەناسم، کەسیان وێنەی شەکوورە بە ماڵ و مێرد و ئابڕووی خۆیەوە پەیوەست نییە."

"بەڵام ئێستا من مێردی ئەوم."

لە دەنگیدا هەست بە بێ متمانەییی پیاوان دەکرا و ئەمەش هەمیشە من دڵتەنگ دەکات. شەکوورە بچوایەتە هەر لایەک، لە لایەکەی تر هەڵوەشانەوە دەستی پێ دەکرد.

"حەسەن لە کاغەزێکدا نووسیبووی شەوکەت بەمەبەستی چاوەڕێکردنی باوکی بۆ ماڵ گەڕاوەتەوە، بەهۆی ئەو باوکە نوێ و مێردە درۆینەی شەکوورە بە مارەبڕینێکی پووچ شووی پێ کردووە، شەوکەت ناشادە و ناگەڕێتەوە. نامەکەی دا بە من بۆ ئەوەی بیگەیەنم بە شەکوورە."

"شەکوورە چی کرد؟"

"بەدرێژاییی شەو تاک و تەنیا لەگەڵ ئۆرهانی بەستەزماندا چاوەڕێی تۆی کرد."

"ئەدی خەیرییە؟"

"خەیرییە چەندین ساڵە لە هەل دەگەڕێت بۆ ئەوەی ژنە جوانەکەی تۆ لە کەوچکێک ئاودا بخنکێنێت. هەر بۆ ئەو مەبەستەش دەچووە پێخەوی زاوای خوا لێخۆشبووەوە. حەسەن کاتێک بینی شەکوورە شەوان بەتەنیا و بەترسی بکوژ و خێوەوە بەسەر دەبات، نامەیەکی تری بە مندا بۆی نارد."

"چی نووسیبوو؟"

"سوپاس بۆ خوا لەپای ئەوەی ئەم ئەستەرە کلۆڵە خوێندەواریی نییە. کاتێک سەردارانی توورە و باوکانی ڕق هەستاو ئەم پرسیارە دەکەن، من وایان پێ دەڵێم: من نامەکەم بۆ ناخوێندرێتەوە، تەنیا دەتوانم لە کاتی خوێندنەوەی نامەکاندا ڕووی کچانی جوان بخوێنمەوە."

"چت خوێندەوە؟"

"بێچارەیی."

ماوەیەکی درێژ هیچ قسەمان نەکرد. کوندەبەبوویەکم بینی لەسەربانی کڵێسایەکی بچووکی ڕۆمی هەڵنیشتبوو و چاوەڕێی هاتنی شەوی دەکرد. منداڵانی چڵمنی



گەڕەکم بینی بە پۆشاک و بوخچەکەم پێ دەکەنین. سەگێکی گەڕم بینی لەبەر داهاتنی شەو، بەدەم خۆ خوراندنەوە بەخۆشحاڵی لە گۆڕستانی پڕ لە دار سەرووەوە بەرەو گەڕەک دەهاتە خوارێ.

دواتر بانگی قەرەم کرد و گوتم: "هێدی بە. من ناتوانم وەک تۆ بەم هەورازەدا سەربکەوم. بەم بوخچەیەی دەستمەوە بۆ کوێم دەبەیت؟"

"پێش ئەوەی تۆ من ببەیت بۆ ماڵی حەسەن، من تۆ دەبەمە کن پیاوانی جوامێر، ئەوانەی بوخچەکەت دەکەنەوە و دەسماڵی گوڵدار و پشتوێنی ئاوریشم و کیسەی پارەی بە تاڵی زیو نەخشێندراو بۆ یارە نهێنییەکانیان دەکڕن."

ئەمە شتێکی باش بوو قەرە هێشتا بتوانێت بەم حاڵە شڕەی خۆیەوە گاڵتە بکات، بەڵام یەکسەر ڕەهەندی ڕاستیی ناو گاڵتەکەیم بینی: "ئەگەر لەشکرێک کۆ بکەیتەوە، من هەرگیز ناتبەم بۆ ماڵی حەسەن. من بەبینینی شەڕ و تێ هەڵدان زارەترەک دەبم."

گوتی: "ئەگەر تۆ ئەو ئەستەرە ئاقڵەی هەرگاف بیت، نە شەڕ دەبێت و نە تێ هەڵدان."

لە ئاکسەرای تێ پەڕین و لە پشتەوە چووینە سەر ڕێگایەک کە بەرەو باخەکانی سەوزە دەچوو. قەرە لە سەرەوەی ئەو ڕێگا قوڕاوییە، لە گەڕەکێکی سەردەمانێک خۆشگوزەرانی بەخۆوەدیو، چووە سەرتاشخانەیەکی هێشتا دانەخراوەوە. شاگردێکی ڕوو پاک و دەست ناسک لەبەر ڕووناکیی چرا وەستای تراش دەکرد و بینیم قەرە لەگەڵ وەستادا دەستی بە قسان کرد. هێندەی پێ نەچوو کابرای سەرتاش و شاگردە جوانەکەی و دوو پیاوی تر لە ئاکسەرای دایانە پاڵمان. شمشێر و تەوریان بەدەستەوە بوو. لە لاکۆڵانێکی گەڕەکی شازادەباشیشدا، قوتابییەکی شمشێر بەدەست هاتە ڕیزمانەوە. ئەمەیان بەهیچ جۆرێک چەقۆکێشیی لێ نەدەوەشایەوە.

گوتم: "بە نوێژی نیوەڕۆ لە شاردا پەلاماری ماڵ دەدەن؟"

قەرە بەنواندنێکەوە، کە زیاتر لە خۆ ڕازیبوونی پێوە دیار بوو وەک لە گاڵتە، گوتی: "بەڕۆژ نا، بەشەو."

گوتم: "هێندە متمانەت بەخۆت نەبێت لەبەرئەوەی لەشکرێکی پیاوت کۆکردووەتەوە. با یەنیچەرە نەبێن سوپایەک ساز و تەیار بە چەکەوە دەسوورێتەوە."

"کەس نایبینێت."

"دوێنێ پیاوانی ئەرزەڕوومی لە پێشدا چوونەتە سەر مەیخانەیەک و دواتریش لە ساغرقاپی هێرشیان کردووەتە سەر تەکیەی جەڕاح و دەستیان بەهەر کەس گەیشتووە، دارکارییان کردووە. پیاوێکی پیر تەختە بەر سەری کەوتووە و مردووە. لەوانەیە لە شەوی ئەنگوستەچاودا بەوانتان بزانن."

"چووبوویتە ماڵی زەریف ئەفەندیی داماو و خوات لێ ڕازی بێ ئەو نیگاری ئەسپە مەرەکەب بڵاوبووەوانەت بینیبوو و هەواڵت بە شەکوورە گەیاندبوو. دەگوترێت زەریف ئەفەندی سەر و سەودای لەگەڵ پیاوانی ئەم مەلا ئەرزەڕوومییەدا زۆر خۆش بووە."

گوتم: "ئەگەر لەو ماڵە کەمێک دەمم کردبێتەوە، بیرم لەوە کردووەتەوە لەوانەیە سوودێکی بۆ شەکوورەی کڵۆڵم هەبێت. من خۆم بەمەبەستی پێشانی قوماشی تازەی بە کەشتیی لە فلاماندەرستانەوە هاتوو چوومە ئەوێ. نەک بۆ ئەوەی خۆم تێکەڵی کاری شەرعی و سیاسیی ئێوە بکەم، چونکە ئەقڵی جوولەکانە و دەستەوستانی من سەر لەو کارانە دەرناکات."

"ئەستەر خاتوون، تۆ زۆر ژیریت."

"مادام وام، با ئەمەشت پێ بڵێم: پیاوانی ئەم مەلا ئەرزەڕوومییە هارتر دەبن و زۆرداریی زیاتر دەنوێنن. لێیان بترسن."

کاتێک چووینە کۆڵانی پشت چارشی قاپی، لە ترساندا لێدانی دڵم زیادی کرد. لق و چڵ و پۆپی ڕووت و تەڕی دار شابەڕوو و تووەکان لەبەر تریفەی مانگەشەودا دەدرەوشانەوە. بایەک، وەک ئەوەی جنۆکە و خێو فوویان پێدا کردبێت، ڕیشووی قەراغ بوخچەکەمی لەراندەوە و فیکەی لە دارەکان هەستاند و بۆنی ئاپۆڕەی ئێمەی گەیاندە سەرجەم سەگەلی لە بۆسەدا نووستووی گەڕەک. هەر هێندەی ئەوان بەتاک و بەجووت دەستیان بە وەڕین کرد، من ماڵەکەم پێشانی قەرە دا. تاوێک سەیری سەربانی تاریک و دەریوانە داخراوەکانیمان کرد. قەرە پیاوەکانی خۆی لە دەوروبەری ماڵەکە، بێستانە چۆڵەکە، هەردوولای دەرگای حەوش و پشت دار



هەنجیرەکانی دواوە جێگیر کرد.

گوتم: "لەم ناوە سواڵکەرێکی پەرێشانی تەتەر هەیە. کوێرە، بەڵام لە موختار باشتر دەزانێت کێ هاتوچۆی کۆڵان دەکات. چەشنی مەیموونە بێ ئابڕووەکانی سوڵتان، بەردەوام خەریکی دەستپەڕ لێدانە. ئەگەر دەستی لێ نەدەن و هەشت نۆ ئاکچەی بدەنێ؛ هەموو شتێک دەدرکێنێت."

لە دوورەوە بینیم قەرە لە پێشدا پارەی دایە کابرای تەتەر و دوایی شمشێری خستە سەر گرێملی و تەنگاوی کرد. پاشان نازانم چۆن وا کەوتەوە، شاگردی سەرتاشەکە، کە من پێم وابوو چاودێریی ماڵەکە دەکات، بەدەسکی تەور کەوتە لێدانی یارۆی تەتەر. کەمێک سەیرم کرد و بەخۆم گوت ئێستا کۆتاییی پێ دێت، بەڵام کابرای تەتەر دەستی بەگریان کرد. بە هەڵەداوان خۆم گەیاندنێ، کابرای تەتەرم بەزیندوویی لە دەستی ڕزگار کرد.

شاگردی سەرتاشەکە دەیگوت: "جنێوی بە دایکم دا."

قەرە گوتی: "دەڵێت حەسەن لە ماڵ نییە. ئایا قسەی ئەم کوێرە ڕاستە؟" لەوێدا نامەیەکی نووسی و بۆمی درێژ کرد: "بیگرە و بیبە بۆ ماڵ، بۆ حەسەن. ئەگەر ئەو لە ماڵ نەبوو، بیدە باوکی."

بەدەم وەرگرتنی نامەکەوە گوتم: "هیچت بۆ شەکوورە نووسیوە؟"

قەرە گوتی: "ئەگەر بەجیا نامەی بۆ بنووسم، پیاوانی ئەم ماڵە هارتر دەبن. پێی بڵێ بکوژی نامەردی باوکیم دیوەتەوە."

"بەڕاست؟"

"تۆ بڵێ."

یارۆی تەتەر هێشتا دەگریا و دەینالاند، لێی تووڕە بووم و کپم کردەوە. گوتم: "ئەو کارانەی بۆ تۆم کردووە، لەبیریان مەکە." حاڵی بووم گشت ئەم شتانە درێژ دەکەمەوە بۆ ئەوەی لەوێ نەڕۆم.

باشە بۆچی من لووتم لەم هەموو کارانەوە ژەنیبوو؟ دوو ساڵ لەمەوبەر ژنێکی بوخچەگێڕ لە ئەدرنەقاپی بەڵێن بە پیاوێک دەدات ژنێکی بۆ بدۆزێتەوە، بەڵام دوای ئەوە ژنە شوو بە پیاوێکی تر دەکات، هەردوو گوێی ژنەی بوخچەگێڕیان بڕیبوو و

کوشتبوویان. دایکی دایکم هەموو جارێک پێی دەگوتم تورکەکان زۆر جاران بێ هۆ و لە خۆڕا مرۆڤ دەکوژن. شۆربای نیسکێنەکەم هاتە بەرچاو و پێشبینیم کرد ئێستا نەسیمی خۆم لەماڵەوە دانیشتووە و دەیخوات. ئەگەرچی لاقەکانم دەیانویست بۆ دواوە بگەڕێنەوە، بەڵام بیرم کردەوە شەکوورە لەوێ بێت و چووم بۆ ماڵەکە. حەزیش هەناومی دەکرۆشت.

"بوخچەگێڕ: ئاوریشمی لە چینەوە هاتووم هەیە بۆ جلوبەرگی جەژن."

هەستم کرد تیشکی ڕەنگ نارنجیی دزەکردوو لە درزی دەریوانەکانەوە وەجووڵە کەوت. دەرگا کرایەوە. باوکی ڕێزداری حەسەن منی بردە ژوورێ. ماڵەوە چەشنی ماڵی خواپێداوان گەرم بوو. شەکوورە لەگەڵ منداڵەکانیدا لەبەر ڕووناکیی چرایەک لە دەوری خوانێک دانیشتبوو. هەر کە منی بینی، هەستایە سەرپێ.

گوتم: "شەکوورە، مێردەکەت هاتووە."

"کامیان؟"

گوتم: "تازەکەیان. خۆی و پیاوانی چەکداری ئابلۆقەی ماڵیان داوە. ئامادەن بۆ شەڕ لەگەڵ حەسەندا."

خەزووری ڕێزدار گوتی: "حەسەن لە ماڵ نییە."

"وەی لە دەورت گەڕێم، باشتر کە لە ماڵ نییە." وەک ئەوەی نێردراوێکی پۆزبڵند و لەخۆبایی بم و بڕیاری بێ بەزەییبانەی سوڵتان بگەیەنم، نامەکەم دایێ و گوتم: "ئا ئەمە بگرە و بیخوێنەوە."

خەزووری ڕێزدار دەستی بە خوێندنەوەی نامەکە کرد. شەکوورە گوتی: "ئەستەر، وەرە شۆربای نیسکت بدەمێ تا گەرم بیتەوە."

دەسپێک گوتم: "حەزم لێ نییە." هیچ حەزم بە قسەکانی نەکرد، چونکە بۆنی ئەوەیان لێ دەهات ئەم ماڵەی بەگەن کردبێت، بەڵام کاتێک حاڵی بووم دەیەوێت بەتەنیا بمبینێت، کەوچکم هەڵگرت و دوای کەوتم.

بەچرپە گوتی: "بە قەرە بڵێ هەمووی لە چارەی شەوکەتەوە ڕووی دا. دوێنێ بەترسی بکوژەوە بەدرێژاییی شەو بەتەنیا لەگەڵ ئۆرهاندا چاوەڕێم کرد. ئۆرهان شەو تا بەیان دەلەرزی. منداڵەکانم لەیەک دابڕابوون. کام دایک لە منداڵی خۆی



دادەبڕێت. دوای ئەوەی قەرە بۆ ماڵ نەگەڕایەوە، هەواڵم بۆ هات ئەشکەنجەدارانی سوڵتانمان هێناویانەتە ئاخاوتن و دەستی لە کوشتنی باوکمدا هەیە."

"کاتێک باوکت کوژرا، مەگەر قەرە لەگەڵ تۆدا نەبوو؟"

شۆخی خۆم چاوانی ڕەش و گەورە و جوانی کردەوە و گوتی: "ئەستەر، دەستم دامێنت، هاوکاریم بکە."

"پێم بڵێ بۆچی گەڕایتەوە ئێرە تا تێ بگەم و هاوکاریت بکەم."

گوتی: "بۆچی پێت وایە دەزانم بۆچی گەڕاومەتەوە؟" تاوێک وا خۆی نوواند وەک ئەوەی بگری. گوتی: "قەرە لە شەوکەت تووڕە بوو. کاتێکیش حەسەن گوتی باوکی ڕاستەقینەی منداڵەکان گەڕاوەتەوە، باوەڕم پێ کرد."

بەڵام لە چاوانییەوە حاڵی بووم درۆ دەکات و ئەویش لە حاڵیبوونی من تێ گەیشت. بەچرپە گوتی: "بەقسەی حەسەن فریوم خوارد." هەستم کرد دەیەوێت من لەمەوە تێ بگەم کە حەسەنی خۆش دەوێت. بەڵام ئایا شەکوورە حاڵی دەبوو کەوا لەبەرئەوەی شووی بە قەرە کردووە، زیاتر بیر لە حەسەن دەکاتەوە؟

دەرگا کرایەوە، خەیرییە هاتە ژوورەوە و نانێکی بەدەستەوە بوو تازە لە تەنوور دەرهاتبوو و بۆنی مسکی لێ دەهات. بە بینینی من هیچ خۆشحاڵ نەبوو و یەکسەر لە ڕوویدا بینیم ئەم دەعبا بەستەزمانە نە بەکەڵکی فرێدان دێت و نە فرۆشتن و لەدوای مردنی ئەنیشتە ئەفەندی، وەک بەڵایەک بە میرات بۆ شەکوورە ماوەتەوە. گاڤێک شەکوورە بە نانی گەرمەوە گەڕایەوە کن منداڵەکانی، کرۆکی ڕاستی حاڵی بووم: چ باوکی ڕاستەقینەیان، چ حەسەن و چ قەرە بێت، ئەوەی شەکوورە بۆی دەگەڕا و پێی نەدەدۆزرایەوە، مێردێک نەبوو ئەم خۆشی بوێت؛ کاری دژوار، پەیداکردنی باوکێک بوو بتوانێت ئەم منداڵە ترساو و چاو لەبەر ترس داچەقاوانەی خۆش بوێت. شەکوورە ئامادە بوو بە نیازی پاکەوە هەموو مێردێکی باشی خۆش بوێت.

بێ ئەوەی هیچ بیر بکەمەوە، گوتم: "ئەو شتەی دەتەوێت، بەدڵ بۆی دەگەڕێیت. ئەمە لە کاتێکدا پێویستە بە ئەقڵ بڕیار بدەیت."

گوتی: "هەر ئێستا لەگەڵ منداڵەکاندا بۆ لای قەرە دەگەڕێمەوە، بەڵام چەند

مەرجێکم هەیە." کەمێک بێدەنگ بوو. "هەڵسوکەوتی لەگەڵ شەوکەت و ئۆرهاندا باش دەبێت. نابێت لەبەر پەناهێنانم بۆ ئێرە حسێبم لێ بخوازێت و پابەندی مەرجەکانی شووکردنم -خۆی دەزانێت- دەبێت. دوێنێ شەو منی بەتەنیا لە ماڵ بۆ بکوژ و دز و شوومی و حەسەن بەجێ هێشت."

"هێشتا بکوژی باوکتی نەدۆزیوەتەوە، بەڵام داوای لێ کردم پێت بڵێم دۆزیویەتییەوە."

"بچەمەوە لای؟"

من هێشتا فریا نەکەوتبووم وەڵام بدەمەوە، خەزووری پێشوو، کە لەمێژ بوو لە خوێندنەوەی نامەکە بووبووەوە، گوتی: "بە قەرە ئەفەندی بڵێن کوڕەکەم لە ماڵ نەبێت، ناتوانم خۆم بخەمە ژێر بەرپرسیاریەتیی گەڕاندنەوەی بووکی خۆم بۆ کن وی."

بۆ گێچەڵ پێکردن، بەڵام بە دەنگێکی نەرم گوتم: "کام کوڕ؟"

گوتی: "حەسەن." لەبەرئەوەی پیاوێکی ڕێزدار بوو، شەرمی کرد. "دەگوترێت کوڕی گەورەم لە وڵاتی عەجەم دەگەڕێتەوە. گەواهیدەر هەن."

گوتم: "حەسەن ها لە کوێ؟" دوو کەوچکم لە شۆرباکەی شەکوورە خوارد.

بە حاڵی منداڵانەی پیاوانی باش و گەمژەی درۆنەزانەوە گوتی: "چووە بۆ کۆکردنەوەی نووسیاران و بارهەڵگران و پیاوانی بەڕێوەبەرایەتیی گومرک. پاش ئەو ڕەفتارانەی دوێنێ پیاوانی ئەرزەڕوومی نواندیان، ئەمشەو یەنیچەرەکانیش لە گەڕەک و کۆڵانەکانن."

من لە ڕۆیشتنمدا بەرەو دەرگا گوتم: "ئێمە هیچمان نەبینی. ئایا ئەمە دوا قسەت بوو."

بەمەبەستی چاوترساندن ئەمەم لە خەزوور پرسی، بەڵام شەکوورە زۆر جوان تێ گەیشت من پرسیارم ئاڕاستەی ئەو کردووە. ئایا بەڕاستیش هێندە سەری لێ شێوابوو، یاخۆ ڕازێکی شاراوەی هەبوو، بۆ نموونە چاوەڕێی گەڕانەوەی حەسەن و پیاوەکانی دەکرد؟ ڕاستییەکەی، خۆشحاڵ بووم کاتێک لە نیگەرانی و دوودڵیی شەکوورە حاڵی بووم.



شەوکەت بوێرانە گوتی: "ئێمە قەرەمان ناوێت. تۆش جارێکی تر مەیە ئێرە هەی قەڵەو."

گوتم: "بەڵام کێ ئەم سەرپۆشی ڕیشوودار و دەسماڵی بە گوڵ و مەل خەملێندراوانەی دایکت حەزیان لێ دەکات و ئەو کراسە سوورانەی تۆ حەزیان لێ دەکەیت، بۆ دایکی جوانت دێنێت؟" بوخچەکەم لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا جێ هێشت: "تا دێمەوە، بیکەنەوە و سەیر بکەن. چیتان ویست لەبەری بکەن و بە خۆتانیەوە بکەن. هەرچیتان بەدڵ بوو، ببڕن و بیدروون."

لە دەرچوونمدا خەمێکم لێ نیشتبوو: هیچ کاتێک چاوانی شەکوورەم وا بەپڕی نەدیبوو. هەر هێندەی بە سەرمای دەرەوە ڕاهاتم و نەهاتم، قەرە شمشێر بەدەستەوە منی لە ڕێگای قوڕاوی ڕاگرت.

گوتم: "حەسەن لە ماڵ نییە. لەوانەیە چووبێتە بازاڕ بۆ کڕینی شەراب بەمەبەستی پیرۆزکردنی گەڕانەوەی شەکوورە. لەوانەشە وەک ئەوان دەیانگوت، هاکا بەخۆی و پیاوەکانییەوە گەڕایەوە. ئەوسا دەبێتە شەڕتان، چونکە ئەو شێتە. جا ئەگەر ئەو شمشێرە سوورەی بەرز بکاتەوە."

"شەکوورە چی گوت؟"

خەزووری گوتی نییە، نابێت، بووکی خۆم نادەمەوە. بەڵام تۆ لەو نا، لە شەکوورە بترسە. ئەگەر لە من دەپرسیت، ژنی مێشک جەنجاڵت، دوو ڕۆژ دوای کوژرانی باوکی حاڵی بوو هەم لە ترسی بکوژ و هەڕەشەی حەسەن و هەم بەهۆی ئەوەی تۆ بێ ئاگادارکردنەوە ون بوویت و دیار نەمایت، ناتوانێت شەوێکی تر لە هەمان ماڵ بەسەر ببات و بۆ ماڵە خەزووران گەڕاوەتەوە. پێشیان گوتووە تۆ دەستت هەیە لە کوشتنی باوکیدا... بەڵام گەڕانەوەی مێردی پێشووی شەکوورە و شتی تری لەو بابەتە لە ئارادا نییە. وا دیارە شەوکەت و باوکی حەسەن بڕوایان بە درۆکەی حەسەن کردووە... شەکوورە نیازی گەڕانەوەی بۆ لای تۆ هەیە، بەڵام چەند مەرجێکیشی هەیە."

چاوم بڕییە ناو چاوانی قەرە و مەرجەکانم بۆ ژمارد. وەک ئەوەی لەگەڵ نێردراوێکی ڕاستەقینەدا بدوێت، یەکسەر بەنواندنێکی فەرمییەوە مەرجەکانی

پەسەند کرد.

گوتم: "منیش مەرجێکم هەیە. ئێستا دیسان دەچمەوە ئەو ماڵە." تەختەکانی پەنجەرەی پشتەوەی خەزوورم پێشان دا.

"دوای کەمێک پەلاماری ئەوێ و دەرگا بدەن. کاتێک من هاوارم کرد، ئێوە دەست هەڵدەگرن. ئەگەر حەسەن هات، بێ سڵەمینەوە شەڕ بکەن."

بێگومان گشت ئەم قسانە وتەی نێردراوێک نەبوو بخوازێت زیان بەخۆی بگەیەنێت، بەڵام ئەم ئەستەرە خۆی لە هەموو شتێک هەڵدەقورتێنێت. هەر هێندەی بانگم کرد "بوخچەگێڕ"، ئەمجار دەرگا دەمودەست کرایەوە. ڕاستەوخۆ لەبەردەم خەزوور قووت بوومەوە.

گوتم: "سەرانسەری گەڕەک، قازیی ئەمبەر و گشت کەسێک دەزانن شەکوورە لەمێژە جیابووەتەوە و بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا دیسان شووی کردووەتەوە. کوڕە لە زووەوە مردووەکەت ئەگەر تەنانەت زیندووش بێتەوە و لە بەهەشت لای حەزرەتی موساوە بگەڕێتەوە، ئیدی لە شەکوورە جیابووەتەوە، پارە ناکات. ژنی بەشوو دەفڕێنن و لێرە دەستی بەسەردا دەگرن. قەرە ویستی پێتان بڵێم پێش قازی، خۆی و پیاوەکانی سزاتان دەدەن."

خەزوور زراقانە گوتی: "کارێکی هەڵە دەکات. ئێ خۆ ئێمە شەکوورەمان نەفڕاندووە. من، لە خوا بەزیاد بێت، باپیری ئەم منداڵانەم. حەسەن مامیانە. کاتێک شەکوورە بەتەنیا مایەوە، چ بکات؟ پەنای بۆ ئێمە هێنا. ئەگەر مەیلی لێ بێت، دەتوانێت هەر ئێستا لەگەڵ منداڵەکانیدا بگەڕێتەوە. بەڵام لەبیرت نەچێت، ئێرە ماڵی خۆیەتی، ئەو ماڵەی منداڵەکانی تێدا هێناوەتە جیهانەوە و بە کامەرانی پەروەردەی کردوون."

بێ بیرکردنەوە گوتم: "شەکوورە، ئایا دەتەوێت بگەڕێیتەوە ماڵی باوکت؟"

لەبەر قسەی ماڵی کامەران دەستی بەگریان کردبوو. گوتی: "باوک نییە." یان من وەهام بیست؟ منداڵەکانی، لە پێشدا دامەنی کراسەکەیان گرت، دواتر دایان نیشاند و خۆیان بە سنگیەوە نووساند؛ گشتیان لەیەک ئاڵان و گرمۆڵە بوون و دەستیان بەگریان کرد. ئەم ئەستەرە هەرگیز گەمژە نەبووە: زۆر باش حاڵی دەبووم شەکوورە



دەیویست بەگریان هەردوولا ڕازی بکات و هیچ لایەک هەڵنەبژێرێت، بەڵام حاڵیش بووم لە دڵەوە دەگری، چونکە منیش دەستم بەگریان کردبوو. دوای تۆزێک سەیرم کرد خەیرییەی ماریش دەگریا.

خەزووری ڕێزدار و چاو سەوز تاکە کەسێک بوو لەو ماڵە نەدەگریا. ئەوەی دەرەقەتی هات، هێرشی قەرە و پیاوەکانی بوو و ساتێک بوو دەستی پێ کردبوو. دەست کرا بە لێدانی تەختەی پەنجەرە و پاڵ پێوەنان بە دەرگاوە. دوو کەس پاڵیان بە دەرگاوە دابوو، بە شتێکی وەک سەری بەران پیایاندا دەکێشا و پاڵیان پێوە دەنا، هەر لێدانێکیان لە ماڵەوە وەک زرمەی تۆپ دەنگی دەدایەوە.

بە زات وەرگرتن لە فرمێسکەکانم بە خەزوورم گوت: "تۆ پیاوێکی بەڕێز و خاوەن ئەزموونیت، دەرگا بکەوە و بڵێ شەکوورە دێت تا ئەو سەگە هارانەی دەرەوە ڕاوەستن."

"ئەگەر تۆ بیت لە جێی من، ژنێکی بێکەس هانای بۆت هێنابێت و سەرباری ئەوە بووکیشت بێت، ئایا فڕێی دەدەیتە کۆڵان بۆ بەردەم ئەو سەگانە؟"

گوتم: "خۆی دەیەوێت بڕوات. لووتم لەبەر گریان گیرابوو، بە دەسماڵە وەنەوشەیییەکەم سڕیم."

گوتی: "کەوابوو دەتوانێت دەرگا بکاتەوە و دەربچێت و بڕوات."

لەتەنیشت شەکوورە و منداڵەکانییەوە دانیشتم. لەبەر زرم و کوتی ئەوانەی شانیان لە دەرگا قایم کردبوو، هەر جووڵەیەکی نوێ دەبوو بەبیانوو بۆ هەڵڕشتنی فرمێسکی زیاتر: منداڵەکان دەستیان کرد بەگریانێکی قایمتر. بەڵام ئێمە هەردووکمان دەمانزانی حسێب بۆ کوتانی توند و ماڵوێرانکەری دەرگا و هاوار و هەڕەشەکانی دەرەوە دەکەین و بۆ کات بەدەستخستن دەگرین.

گوتم: "شەکوورەی شۆخم، خەزوورت مۆڵەتی دا، قەرەی مێردت دەستبەجێ هەموو مەرجەکانتی پەسەند کرد، بە ئەڤینەوە چاوەڕێت دەکات، ئیدی تۆ چ کارێکت نییە لەم ماڵەدا. جلی دەرەوە بپۆشە، پەچەکەت دادەوە، بوخچە و منداڵەکانت هەڵگرە، دەرگا بکەوە و با ئیدی هێدی هێدی بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکەت."

ئەم قسانەم فرمێسکی منداڵەکانی خێراتر کرد. چاوانی شەکوورەشی کردەوە.

گوتی: "لە حەسەن دەترسم، چونکە بەپێی خۆم هاتمە ئێرە. دوایی تۆڵەی سەخت و ترسناک دەبێت. دڕندەیە."

گوتم: "ئەمە هەرگیز شووکردنی نوێت هەڵناوەشێنێتەوە. چارەت نەماوە، بێگومان پەنا بۆ شوێنێک دەبەیت. مێردەکەت لە هەموو شتێکت خۆش بووە و پێشوازیت دەکات. حەسەنیش، چۆن چەندین ساڵە بە دەممانەوە گرتووە، بەهەمان شێوە ڕاییی دەکەین." بزەیەکم بۆ کرد.

گوتی: "من خۆم دەرگا ناکەمەوە، چونکە ئەگەر وابێت، کەواتە بە ئارەزووی خۆم گەڕاومەتەوە."

گوتم: "گیانەکەم شەکوورە، منیش نایکەمەوە. تۆش دەزانیت ئەگەر من بیکەمەوە، واتا لووتم لە کاری ئێوەوە ژەنیوە. سەختتر تۆڵەی ئەمەم لێ دەکەنەوە."

لە چاوانیدا بینیم بە مافدارم دەزانێت لە قسەکانمدا. گوتی: "کەواتە هیچ کەسێک ناتوانێت دەرگا بکاتەوە. با بیشکێنن و بێنە ژوورەوە و بەزۆر بمانبەنەوە."

یەکسەر تێ گەیشتم ئەمە باشترین چارەسەرە بۆ شەکوورە و منداڵەکانی، ترسام و گوتم: "بەڵام ئەگەر وابێت، خوێن دەڕژێت. ئەگەر قازی نەیەتە نێوانەوە، خوێن دەکەوێتە ئەم کارەوە و سەندنەوەی تۆڵەی خوێن چەندین ساڵ درێژە دەخایەنێت. کەسێک بخوازێت بەسەربەزی بژی، هەرگیز لەوە خۆش نابێ دەرگای ماڵی بشکێندرێت و پێ بنرێتە ماڵی و ژنی ناوی ببرێت."

کاتێک شەکوورە لەبری وەڵامێکی گونجاو منداڵەکانی لە ئامێز گرت و بەتەواوی هێزی خۆیەوە دەستی بەگریان کرد، جارێکی تریش بەپەژیوانیی حاڵی بووم ئەم ژنە چ دڵپیس و حسێبخوازە. دەنگێک لە ناخەوە دەیویست گشت شتێک جێ بهێڵم و بڕۆم، بەڵام ئیدی منیش نەمدەتوانی خۆم لە دەرگا نزیک بکەمەوە، چونکە وا لێی دەدرا خەریک بوو دەشکا. ئەوەشم بەخەیاڵدا هات قەرە متمانەی بە منە و لە گەورەبوونەوەی کارەکە دەترسێت، دەتوانێت هەر ساتێک پیاوەکانی بکێشێتەوە و ئەمەش زاتی دەکردەوە بەبەر خەزووردا. کاتێک بەباشی لە شەکوورە نزیک بوومەوە، تێ گەیشتم بەدرۆ دەگری، بەڵام لەوەش خراپتر، بەشێوەیەک دەلەرزی مەحاڵە وەسپ بکرێت.



لە دەرگا نزیک کەوتمەوە و بەهەموو هێزی خۆمەوە هاوارم کرد: "ڕاوەستن، بەسە ئیدی."

جووڵەی دەرەوە و گریانی ماڵەوە بەجارێک ڕاوەستان.

بە ئیلهامێکی لەناکاو و وەک ئەوەی لەگەڵ منداڵێکدا بدوێم، بە دەنگێکی شیرین گوتم: "با ئۆرهان دەرگا بۆ دایکی بکاتەوە. ئەو دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی و کەس لێی زویر نابێت."

من هێشتا قسەکەم تەواو نەکردبوو، ئۆرهان لە بن قۆڵە شل کردووەکانی دایکی دەرچوو و وەک کەسێک ساڵانێکی درێژ لەم ماڵەدا ژیابێت، لە پێشدا شمشێرە، پاشان تەختە و دواتریش نێرەوانەی دەرگای کردەوە و دوو هەنگاو بەرەو پاش گەڕایەوە. دەرگا لە خۆیەوە کرایەوە و سەرمای دەرەوەی پێدا هاتە ژوورێ. بێدەنگییەکی وا هاتە ئاراوە، کە هەموومان لە دوور گوێمان لە سەگێکی خوێڕی بوو هەر بۆ ئەوەی شتێک بکات، دەوەڕی. ئۆرهان گەڕایەوە باوەشی دایکی و شەکوورە ماچی کرد. لەو دەمەدا شەوکەت گوتی: "بە مامە حەسەنم دەڵێم."

بە بینینی ئەوەی شەکوورە هەستا سەربەگی بەدەستەوە گرت و بوخچەی ئامادە کرد، هێندە ئاسوودە بووم ترسی ئەوەم هەبوو پێکەنین بمگرێت. دانیشتم و دوو کەوچکم لە شۆربای نیسکێنەکە خوارد.

قەرە، بەوەی هیچ لە دەرگا نزیک نەکەوتەوە، ئاقڵییەکی تری نواند. ماوەیەک شەوکەت چووە ژوورەکەی باوکیی خوا لێخۆشبووی و لەناوەوە شمشێرەی دەرگاکەی داخست و خۆی زیندانی کرد. سەرباری ئەوەی بانگی قەرەمان کرد بێت و بۆ کردنەوەی دەرگاکە هاوکاریمان بکات، بەڵام هەنگاوی نەنایە ماڵەوە و مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی پیاوەکانیشی نەدا. لەبەرئەوەی دایکی مۆڵەتی دایێ خەنجەرە دەسک یاقووتەکەی مامە حەسەنی هەڵبگرێت، شەوکەتیش ڕازی بوو لە ماڵ دەربچێت.

خەزوور گوتی: "ترسی شمشێرە سوورەکەی حەسەنتان هەبێت." قسەکەی کەمتر بۆنی دۆڕان و تۆڵەسەندنەوەی لێ دەهات و زیاتر نیگەرانیی پێوە دیار بوو. دەستی بە قژی هەردوو کوڕەزاکانیدا هێنا و ماچی کردن. شتێکیشی چرپاند بە گوێی شەکوورەدا.

کاتێک بینیم بۆ دواجار بەپەلە سەیرێکی دەرگای ماڵ و دیوار و ئاگردانەکەی کرد، دیسان بیرم کەوتەوە شەکووره کامەرانترین ساڵەکانی ژیانی لەگەڵ مێردی پێشوویدا لێرە ڕابواردووە. ئایا شەکووره دەیبینی ئێستا هەمان ئەو ماڵە بووە بە پەنا و ئارامگەی دوو پیاوی بەدبەخت و بۆنی مردنی لێ دێت؟ لەبەرئەوەی دڵی شکاندبووم، لە گەڕانەوەدا لێی نزیک نەکەوتمەوە.

ئەوەی دوو منداڵی هەتیو و سێ ژنی کەنیزەک و جوولەکە و بێوەژنی لەسەر ڕێگای گەڕانەوە لەیەک نزیک دەخستەوە، ساردی و تاریکیی شەو نەبوو، بگرە گەڕەکە نامۆکان و تەنگەبەریی ئەو کۆڵانانەی دەمانبڕی و ترسی حەسەن بوو. کاروانی ئاپۆڕەی ئێمە لەلایەن پیاوەکانی قەرەوە دەپارێزرا و کتومت وەک کاروانی بگوێزەوەی گەنجینە بە ڕێی چەپ و بە کۆڵانەکانی پشتەوە و دوورە گەڕەکی وادا تێ دەپەڕی کە نە باڵندەی بەسەردا دەفڕی و نە کاروانی لێوە دەرباز دەبوو. ئامانجیش ئەوە بووە نەکەوینە داوی ئێشکگران و یەنیچەرە و لات و لەواری فزوولیی گەڕەکەکان و چەتەگەل و بۆسەی حەسەنەوە. لەبەر تاریکی، چاو چاوی نەدەبینی و جاروبار خۆمان بەیەکتر و بەدیواردا دەکێشا و ڕێمان دەدۆزییەوە. واماندەزانی خێو و جنۆکە و ئیبلیس لەژێر زەوییەوە دەردەچن و لە تاریکیدا پڕمان پێدا دەکەن و دەمانفڕێنن، بۆیە بەتوندی باوەشمان بەیەکدا کردبوو. لەودیوی ئەو دیوار و دەریوانە داخراوانەی دەستمان بەریان دەکەوت و هەستمان پێ دەکردن، گوێمان لە خەڵکانی نووستبوو بوو لەتاو سەرمای شەو پرخەیان دەهات و دەکۆکین و ناڵەی ئاژەڵی ناو گەورەکانیشمان دەبیست.

من، ئەم ئەستەرە، گەڕەکە هەرە هەژار و دەسکورتەکان نەبێت، واتا گەڕەکەکانی شوێنی نیشتەجێی کۆچبەران و میللەتی بەدبەختی جۆراوجۆری لێ دەربچێت، سەرانسەری ئەم کۆڵانانەی ئەستەنبوڵم دابووە ژێر پێوە و وەک بەری دەستم شارەزایان بووم. هەرچەندە جاروبار پێم وابوو بەم تاریکییە بە کۆڵانی بێ بندا دەڕۆین و دەخوولێینەوە، بەڵام سەرباری ئەوەش دەمتوانی هەندێک لەو گۆشانە بناسمەوە کە بەڕۆژ بەبوخچەی دەستمەوە لەسەرەخۆ پیایاندا دەڕۆم: لەبەرئەوەی دیوارەکانی کۆڵانی تەرزیباشی؛ پشتیرەکەی تەنیشت باخچەی مەلا "نوراللە"، نازانم



بۆچی ڕیخەکەی وەک دارچین بۆنێکی توندی لێ دەهات؛ شوێنی سووتاوی گەڕەکی تەنافبازان؛ دەروازەی بازەوانان و کانیی کوێرە حاجیم ناسییەوە کە مرۆڤ لەو دەروازەیەوە دەچووەوە سەری، حاڵی بووم ڕوومان لە ماڵی باوکی خوا لێخۆشبووی شەکووره نییە، بگرە بەرەو ماڵێکی تری بە من نامۆ دەڕۆیشتین.

یەکسەر تێ گەیشتم قەرە شوێنێکی تری دۆزیوەتەوە بۆ شاردنەوەی خێزانەکەی لە حەسەن –و ئەو ئیبلیسە پیاوکوژە–، ئەو حەسەنەی ئەگەر تووڕە بێت، نازانرێت چیی لێ دەوەشێتەوە. ئەگەر بەو شوێنەم بزانیبا، هەر ئێستا لێرە بە ئێوەم دەگوت و بەیانیی ڕۆژی دواتریش بە حەسەنم دەگوت. نەک لەبەر خراپی و دڵپیسیی خۆم، بگرە بەهۆی دڵنیابوونم لەوەی شەکووره دەیویست دیسان حەسەن بایەخی پێ بداتەوە. بەڵام قەرەی ئاوەزیاو ئیدی بەهیچ جۆرێک متمانەی بە من نەمابوو. مافی خۆیشی بوو.

تازە گەیشتبووینە کۆڵانێکی تاریکی پشت بازاڕی دیلفرۆشان، لەوسەری تری کۆڵانەکەوە گوێمان لە هاوار و بانگکردن و قیڕە بوو. دەنگی بێنە و بگرە و پاڵ پێوەنانێک کەوتە بەرگوێمان. بەترسەوە دەنگی هەراوزەنای کاتی پێک هەڵپژانی تەور و شمشێر و تێلاو و دەست پێکردنی شەڕ و ئەو هاوارانەم ناسییەوە کە لەتاو ئازار لە مرۆڤ بەرز دەبێتەوە.

قەرە شمشێرە گەورەکەی خۆی دا بە یەکێک لەو پیاوانەی متمانەی پێیان بوو، بەزۆر خەنجەرەکەی لە دەستی شەوکەت دەرهێنا و خستییە گریان، خەیرییە و شەکووره و منداڵەکانی لەگەڵ شاگردی سەرتاشەکە و دوو پیاوی تردا دوور خستەوە. گوتی کوڕە قوتابییەکە بە قەدبڕدا دەتگەیەنێتەوە ماڵ؛ نەیهێشت لەگەڵ ئەواندا بمێنمەوە. ئایا ئەمە ڕێکەوتێک بوو، یاخۆ بۆ ئەوە بوو فێڵبازانە شوێنی خۆشاردنەوەیان لە من بشارێتەوە؟

لەوپەڕی ئەو کۆڵانە تەنگەی ناچار بووین پێیدا تێ پەڕین، دووکانێکی لێ بوو و بۆم ڕوون بووەوە قاوەخانەیە. وابزانم شەڕە شمشێر پێش دەست پێکردن کۆتاییی پێ هاتبوو. ئاپۆڕەیەک بەدەم هاوارکردن و قیژاندنەوە دەچوونە ژوورێ و دەهاتنە دەرێ و قاوەخانەکەیان –لە پێشدا وام زانی تاڵانی دەکەن– بەسەریەکدا دەشێواند. لە

پێشدا فنجان و قاوەجۆش و پەرداخ و کورسییان بەوریایی دەهێنایە دەرێ بۆ ئەوەی ئێمەی فزوولی لەبەر ڕووناکیی بڵێسە سەیر بکەین و پەندی لێ وەربگرین، دوایش بەبەرچاوی هەموومانەوە دەیانشکاندن. کەسێک هەوڵی دا ڕایان بگرێت، کەمێک دارکارییان کرد، بەڵام دواجار توانی خۆی ڕزگار بکات. دەسپێک، بەگوێرەی ئەوەی دەگوترا، وام زانی دەردی ئەوان تەنیا بە قاوەوە پەیوەستە. باسی زیانەکانی قاوەیان دەکرد؛ چۆن چاو و گەدە خراپ دەکات، مێشکی مرۆڤ تێک دەدات و لە ئاین دەری دەکات. دەیانگوت ژەهرێکی فەڕەنگییە و باسی ئەوەیان دەکرد چۆن ئیبلیس چووەتە بەرگی ژنێکی شۆخەوە، قاوەی ناوەتە بەردەم حەزرەتی محەمەد و ئەویش ڕەتی کردووەتەوە. دەتگوت شەوە ئاهەنگێکی پەروەردە و فێرکردنە و بیرم لەوە دەکردەوە لە گەڕانەوەمدا بۆ ماڵ خۆم لە نەسیم تووڕە بکەم و بڵێم: "زۆر لەو قوزەڵقورتە مەخۆوە."

لەبەرئەوەی ئەو دەوروبەرە ژووری زۆری کەسانی سەڵت و خانی هەرزانی زۆر بوو، بەماوەیەکی کورت ئاپۆڕەیەک لە کەسانی بێکار و لەوانەی بە قاچاخ هاتبوونە شار و لە هیچ شوێنێکدا ناویان تۆمار نەکرابوو و دەستە و تاقمی لە یاسا هەڵهاتوو بۆ سەیرکردن کۆبوونەوە و ئەمەش زاتی زیاتری خستە بەر ئەم دوژمنانەی قاوە. ئەو کاتە حاڵی بووم ئەمانە پیاوەکانی مەلا نوسرەتی مەلای بەناوبانگی ئەرزەڕوومین. دەگوترا ئەمانە ئەستەنبوڵ لە ناوەندەکانی شەراب و گوناهکاری و قاوەخانە پاک دەکەنەوە و سزای ئەوانە دەدەن کە لە ڕێی حەزرەتی محەمەد لایان داوە و لەژێر پەردەی خواپەرستیدا لە تەکیە بەدەم مووزیکەوە سەما دەکەن و قوون بادەدەن. جنێویان بە دوژمنانی ئاین، هاوکارانی ئیبلیس، بتپەرستان، زەندیق و نیگارکێشان دەدا. ئێستا بیرم کەوتەوە، ئەمە ئەو قاوەخانەیەیە کە نیگار بە دیوارەکانیدا هەڵدەواسرێت و لەوێ زماندرێژی دەکرێتە سەر ئاین و مەلای ئەرزەڕوومی و بەدڕەوشتیی تێدا دەکرێت.

شاگرد قاوەچییەک بە دەموچاوی خوێناوییەوە هاتە دەرەوە، من وام زانی دەکەوێتە سەر زەوی، بەڵام ئەو بە چمکی کراسەکەی خوێنی تەوێڵ و سەر گۆنای خۆی سڕی و هاتە ناومانەوە و لەگەڵ ئێمەدا کەوتە سەیرکردنی پەلامارەکە. ئاپۆڕەکە ترسابوون و کەمێک کشابوونەوە دواوە. قەرە کەسێکی لەناو ئاپۆڕەکەدا بینی، بینیم تاوێک



دوودڵ بوو. بەخۆ گورجکردنەوەی ئەرزەڕوومییەکاندا حاڵی بووم یەنیچەرە، یان ئاپۆڕەیەکی تری تێلا بەدەست بەرەو ئێرە دێن. مەشخەڵەکان کوژانەوە و ئاپۆڕە بەیەکدا چوو.

قەرە دەستی منی گرت و خستمییە دوای کوڕە قوتابییەکە و گوتی: "بە لاکۆڵانەکاندا بڕۆن. ئەم کوڕە دەتباتەوە بۆ ماڵ." کوڕەی قوتابیش دەیویست هەرچی زووترە هەڵبێت، وەک ئەوەی ڕابکەین، لەوێ دوور کەوتینەوە. هۆشم لای قەرە بوو، بەڵام ئاخر ئەگەر ئەم ئەستەرە لە دەرەوەی ڕووداوەکاندا بمێنێتەوە، ناتوانێت پاشماوەی ئەم بەسەرهاتەتان بۆ بگێڕێتەوە.

# 54

## من ژنم

چیرۆکبێژی بەڕێز، دەڵێن تۆ دەتوانیت لاسایی گشت شتێک بکەیتەوە، بەڵام ناتوانی ببیت بە ژن. لاف لێدانی من تەواو پێچەوانەی ئەمەیە. بەڵێ، بەهۆی ئەوەی ئێمە شار بەشار دەگەڕێین و تا نیوەشەو لە شایی و ئاهەنگ و قاوەخانەکان تا دەنگمان دەنووسێت لاسایی هەموو شتێک دەکەینەوە و چیرۆک دەگێڕینەوە، زەماوەند و ژنهێنان نەبوو بە بەشمان. بەڵام ئەمە بەهیچ جۆرێک بەو واتایە نایەت ئێمە ڕەگەزی ژن نەناسین.

من ژنان زۆر باش دەناسم؛ بگرە بۆخۆم ڕێکەوتی چواریانم کردووە، ڕوویانم بینیوە و لەگەڵیاندا دواوم. ئەوانە:

١- دایکی خوا لێخۆشبووم. ٢- پووری خۆشەویستم. ٣- ژنی برای گەورەم، کە هەمیشە لێی دەدام و هەر چاوی پێم دەکەوت، دەیگوت: "لە ژوورەکە بڕۆ دەرێ." (یەکەمجار عاشقی ئەو بووم.) ٤- ئەو ژنەی لە نێوان گەشت و گەڕانەکانمدا تاوێک لەبەر پەنجەرەیەکی کراوە لە قۆنیا بینیم. سەرباری ئەوەی هیچ قسەشم لەگەڵیدا نەکردبوو، ساڵانێکی درێژ و ئێستاش لە بەرامبەریدا هەستم بەوروژاندنی حەز کردووە و دەکەم. لەوانەشە ئێستا مردبێت.

لەبەرئەوەی سەیرکردنی ژنێکی ڕوو دانەپۆشراو، قسەکردن لەگەڵیدا و دیتنی ڕەهەندە مرۆییەکانی، لەکن ئێمەی پیاوگەل ڕێ بۆ هەستانی چێژ و ئازاری قووڵی مانەوی خۆش دەکات، وەک ئاینمان فەرمانی پێ داوین، باشترین شت ئەوەیە پیاو



پێش مارەبڕین بەهیچ جۆرێک ژن، بەتایبەتیش ژنی جوان نەبینێت. مرۆڤ ناچارە بۆ دامرکاندنەوەی حەز منەی دۆستایەتیی کوڕانی جوان بکات، ئەو کوڕانەی هیچیان لە ژنان کەمتر نییە و ئەمەش دواجار دەبێت بە خوویەکی شیرین. لە شارەکانی فەڕەنگ ژنان نەک تەنیا ڕوویان ناشارنەوە، بگرە قژی درەوشاوەیان، پاشان ملیان، مەچەکیان و گەردنی جوانیان، کە بەسەرنجڕاکێشترین بەشی لەش و لاریان دادنرێت و تەنانەت ئەگەر ئەوەی دەگوترێت ڕاست بێت، تا نیوەی ڕانیشیان ڕووت دەکەن و ئەوسا دەگەڕێن. بۆیە پیاوانیان بەردەوام لە پێشەوە بستێکیان ڕەق دەبێت و بەدەم شەرم و ئازارەوە ڕێ دەکەن و هەڵبەتە ئەمەش کۆمەڵی گۆج کردووە. هەر لە ڕووەشەوەیە گاوری فەڕەنگ هەر ڕۆژەی لە بەرامبەر سوپای عوسمانیدا قەڵایەک لە دەست دەدات.

هێشتا دەسپێکی ساڵانی گەنجیم بوو تێ گەیشتم باشترین ڕێگا بۆ ئاسوودەیی و کامەرانیی ڕۆح ئەوەیە مرۆڤ دوور لە ژنانی جوان بژی، بەڵام دوای ئەوە زیاتر خولیام لە ژن دا. لەبەرئەوەی ئەو سەردەمە جگە لە دایکم و پوورم، ژنی ترم نەدیبوو، پەرۆشیم بۆ ژن ڕەهەندێکی ڕازداری وەرگرت، مێشکم شەش و بێشی دەکرد و پێم وابوو تەنیا بەئەنجامدانی کردەوەکانی ئەوان، بە خواردنی ئەو شتانەی ئەوان دەیخۆن، بە دووبارەکردنەوەی قسەکانیان و بە لاساییکردنەوەی حاڵیان و پۆشینی جلوبەرگیان دەتوانم بزانم ئەوان چۆن هەست دەکەن. بەمجۆرە، ڕۆژێکی هەینی، دایکم، باوکم، کاکم و پوورم هەموویان چوون بۆ باخی گوڵی باپیرم لە قەراغ ئاوی فاهرەنگ. من گوتم فرە نەخۆشم و لە ماڵ مامەوە.

دایکی خوا لێخۆشبووم گوتی: "وەرە لە چۆڵەوانی سەیری سەگ و دار و ئەسپ بکە، لاساییان بکەوە و بمانهێنە پێکەنین. بەتەنیا چی دەکەیت لە ماڵ؟"

نەمتوانی بڵێم: "دایکە گیان، جلەکانی تۆ لەبەر دەکەم و لاسایی ژن دەکەمەوە." گوتم: "سکم زۆر دێشێت."

باوکم گوتی: "خۆتمان لێ مەکە بە نەخۆش. وەرە، زۆران دەگرین."

پاش ئەوەی ئەوان ڕۆیشتن، من یەک بەیەک جلوبەرگی ژێرەوە و پۆشاکی دایکی خوا لێخۆشبوو و پوورم پۆشی. ئێستا هەستی خۆم و باسی ئەو ڕازانەی بوون بە

ژن، کە ئەو ڕۆژە پەیم پێ بردن، بۆ ئێوەی برایانی نیگارکێش و خۆشنووسانم دەگێڕمەوە. دەسپێک دەتوانم یەکسەر ئەمە بڵێم: بەپێچەوانەی ئەوەی زۆر جاران لە کتێبدا خوێندوومانەتەوە و لە مەلایانەوە گوێمان لێ بووە، کاتێک مرۆڤ دەبێت بە ژن، لە ڕاستیدا هەست ناکات ئیبلیس بێت.

تەواو بەپێچەوانەوە: دوای ئەوەی دەرپێ خورییە گوڵ لەسەر چنراوەکەی دایکی خوا لێخۆشبووم لە پێ کرد، هەستێکی شیرینی چاکە سەرتاپای هەناومی داگرت و هەستم بەخۆم کرد منیش وەک ئەو هەستیارم. کاتێک کراسە سەوزە ڕەنگ فستقییەکەی پوورم، کە خۆی دەستی تێ نەدەچوو لەبەری بکات، گەیشتە سەر پێستی ڕووتم، لە ناخمدا شەپۆلێکی خۆشەویستی بەرامبەر بەسەرجەم منداڵان، تەنانەت بەرامبەر بەخۆیشم بەرز بووەوە. ئارزووم بوو چێشت بۆ سەرانسەری دنیا لێ بنێم و گشت کەسێکم شیر بدابایە. ئەگەر مەمکم هەبوایە چۆن هەستم دەکرد؟ بەمجۆرە دوای تۆزێک تێگەیشتن، ئەو شتە بنەڕەتییەی خەیاڵم لێ دابوو، ئەوە بوو بزانم هەستێکی چۆنە ئەگەر مرۆڤ ژنێکی مەمک گەورە بێت. بۆیە زۆر شتم – گۆرەوی، پەشتەماڵ – خزاندە سنگمەوە و کاتێک ئەو دەرپۆقینە زەبەلاحەم بینی، بەڵێ، باشە، وەک ئیبلیس هەستم بە لەخۆ باییبوون کرد. لەبەرئەوەی یەکسەر حاڵی بووم ئەگەر پیاوان تەنانەت بەتەنیا سێبەرەکەشی ببینن، بەهەڵەداوان دوای دەکەون و دەپاڕێنەوە و خۆیان دەگەوزێنن بۆ ئەوەی بینێنە دەمیان، هەستم کرد زۆر بەهێزم، بەڵام ئایا خۆم دەمویست بەهێز بم؟ ئەقڵم شێوابوو بەسەریەکدا: بەڵام دەمویست بەهێز بم، هەم دڵیان پێم بسووتێت؛ هەم دەمویست پیاوێکی دەوڵەمەند و بەهێز و ئاقڵی نائاشنا وەک شێت منی خۆش بوێت، هەم لێشی دەترسام. دایکم بازنە زێڕەکانی لە گۆرەویی تەنیشت سەرپۆشی بە گەڵا نەخشێندراوی بنی باوڵی بووکێنیدا شاردبووەوە، دەرم هێنان و لە دەستم کردن؛ ئەو سووراوەی دایکم لە کاتی گەڕانەوەی لە گەرماو بۆ ئەوەی گۆناکانی سوورتر بنوێنێت لە ڕووی خۆی دەدا، دەرم هێنا و لە ڕووی خۆمم دا؛ سەربەرگە سەوزەکەی ڕەنگ وەک داری پینووسی پوورم لەبەر کرد؛ قژی خۆم تۆپەڵ کرد و پەچەی تەنکی لە هەمان ڕەنگم پۆشی و کاتێک لە ئاوێنەی چوارچێوە گەوهەریندا خۆمم بینی، مچوڕکم پێدا هات.



سەرەڕای ئەوەی هیچ دەستیشم پێوە نەدابوون، کەچی ئێستا چاو و برژانگم بووبوون بە چاو و برژانگی ژن. تەنیا چاو و گۆناکانم بەدەرەوە بوون، بەڵام ژنێکی زۆر شۆخ بووم و ئەمەش شادمانیی زۆری پێم دەدا. حەزی پیاوەتیشم پێش خۆم هەستی بەمە کردبوو و هەستابوو. ئەمەش ناشادی کردم.

لە ئاوێنەکەی دەستمدا سەیری دڵۆپێک فرمێسکم کرد لە چاوی جوانمەوە سەری کرد و ئەو ساتە شیعرێک بەئازارەوە لە هەناومەوە هات و هەرگیز لەبیرم نەچوو، چونکە بە ئیلهامێک، کە خوای مەزن هەر ئەو دەمە پێی دام، شیعرەکەم بە ئاوازەوە وەک گۆرانی خوێندەوە و هەوڵم دا خەمی خۆم بدەمە دەم باوە:

دڵەی ڕاڕام دەڵێت لە ڕۆژهەڵات بم، گەرەکمە لە ڕۆژئاوا و
لە ڕۆژئاواش بم، دەمەوێت لە ڕۆژهەڵات بم.
ئەندامەکانی تری لەشم دەڵێن ئەگەر پیاو بم، خوازیارم ببم بە ژن و
ئەگەر ژنیش بم، ئارەزوومە ببم بە پیاو.
چەند دژوارە مرۆڤ بیت، لەویش دژوارتر ژیانێکی مرۆڤانە.
دەخوازم هەم بە پێش و هەم بە پاش، هەم بە ڕۆژهەڵات و
هەم بە ڕۆژئاوا چێژ وەربگرم.

دەمەوێت بڵێم بۆ خاتری خوا با ئەو گۆرانییەی لە دڵمەوە هەڵقوڵابوو و گوتبووم، نەگاتەوە بەرگوێی برایانی ئەرزەڕوومی، چونکە زۆر تووڕە دەبن. ئەرێ من بۆچی دەترسم؟ لەوانەشە تووڕە نەبن، چونکە سەرنج بدەن من مەبەستم زەمکردن نییە، بەڵام ئەو حەزرەتی ئەفەندییە مەلا بەناوبانگە، ئەو ناخوسرەتە، ژن بڵێی، هێناویەتی، بەڵام وەک بۆ منیان گێڕاوەتەوە ئەویش کتومت چەشنی ئێوەی نیگارکێشانی هەستیار، کوڕی جوانی لە ئێمەی ژنان زیاتر خۆش دەوێت. بەڵام من خۆم لەبەرئەوەی بەخراپی دەزانم، هیچ گوێی پێ نادەم، زۆر پیرە. ددانەکانی کەوتوون و بەقسەی ئەو کوڕە جوانانەی لێی نزیک کەوتوونەتەوە، بۆنێکی پیس لە دەمی دێت، بمبوورن توخوا، ڕێک وەک بۆنی قوونی.

باشە. چەنەی خۆم دەگرم و دەگەڕێمەوە سەر بەسەرهاتی خۆم: هەر ئەوەندەی حاڵی بووم زۆر جوانم، ئیدی نەمویست وەک کەنیزەک جلوبەرگ و قاپ و قاچاخ

بشۆم و بچمە بازاڕ. هەژاری و فرمێسک و بەدبەختی، سەیرکردنی بەردەوامی ئاوێنە و خەیاڵشکان و گریان و خەفەت، کاری ژنانی دزێوە. پێویستە مێردێک بدۆزمەوە من بخاتە سەر دەستی خۆی، بەڵام ئەو مێردە کێیە؟

بەمجۆرە لە درزی دیوارەوە کەوتمە سەیرکردنی ئەو کوڕی پاشا و بەگزادانەی کە باوکی خوا لێخۆشبووم بەبیانوو و بێ بیانوو بۆ ماڵەوە بانگی دەکردن. دەمویست ڕەوشی من لە حاڵی ئەو ژنە بچێت کە دوو منداڵی هەیە و دەم بچووکە و جوانییەکەی ئاشکرایە و سەرجەم نیگارکێشان عاشقی بوون. باشتر وایە بەسەرهاتی شەکوورەی کلۆڵتان بۆ بگێڕمەوە. بەڵام ڕاوەستن، من بەڵێنم دابوو ڕۆژی چوارشەم ئەمەتان بۆ بگێڕمەوە:

ئەو چیرۆکی ئەڤینەی کە ئیبلیس بە ژنێک بە گێڕانەوەی داوە

ڕاستییەکەی، زۆر سادەیە. ئەم ڕووداوە لە یەکێک لە گەڕەکە کەمێک هەژارەکانی ئەستەنبوڵمان، لە کەمەرئویستوو قەوماوە. چەلەبی ئەحمەد یەکێک دەبێت لە پیاوانی ناسراوی گەڕەک و کاری نووسیاری بۆ واسیف پاشا دەکات، کەسێکە بەڕێی خۆیەوە، ژنی هێناوە، دوو منداڵی هەیە و مرۆڤێکی بەڕێزە. ڕۆژێک لە پەنجەرەیەکی کراوەوە بۆشناقێکی بەژن زراڤ، قژ ڕەش، چاو قەترانی، باڵابەرز و پێست زیوین دەبینێت و دڵی تێ دەچێت. بەڵام ژنە بەشووە، هیچ دڵی بە چەلەبییەوە نییە و مێردی تۆلازی خۆی خۆش دەوێت. بەمشێوەیە چەلەبیی داماو ناتوانێت دەردی دڵی خۆی بۆ کەس هەڵڕێژێت، لەتاو ئەڤین دەبێت بە داری ژەقنەبووت، شەراب لە کابرای ڕۆمی دەکڕێت و دەیخواتەوە، بەڵام دواجار وای لێ دێت ناتوانێت ئەڤینی خۆی لە خەڵکی گەڕەک بشارێتەوە. ئەوانیش بەهۆی ئەوەی خۆشیان شەیدای چیرۆکی ئەڤینداری دەبن و چەلەبییان زۆر خۆش دەوێت و ڕێزی لێ دەگرن، دەسپێک ڕێز لە عەشقەکەشی دەگرن، یەک دوو گاڵتە دەکەن و چاوپۆشی لە شتەکە دەکەن. بەڵام کاتێک چەلەبی ئێش و ئازاری بێچارەی خۆی بۆ ڕاو ناکرێت و هەموو ئێوارانێک سەرخۆش دەبێت و لەبەر دەرگای ئەو ماڵەی، کە شۆخی پێست زیوین لەگەڵ پیاوەکەیدا بە کامەرانی دەژین، دادەنیشێت و وەک منداڵ دەست بەگریان دەکات، ئەوسا سەرجەم خەڵکی گەڕەک ترسیان لێ دەنیشێت. گشت ئێوارانێک کاتێک دڵدار



بەدەم ئازارەوە دەگری، ئەوان نە دەتوانن لێی بدەن و دەری بکەن، نە دەتوانن دڵی بدەنەوە. چەلەبیش، بێ ئەوەی قسە بەکەس بڵێت و زماندرێژی بکات، لە ناخەوە دەگری. هێدی هێدی خەفەتی بێچارەی لە سەرانسەری گەڕەکدا تەشەنە دەکات و دەبێت بە خەفەت و بەدبەختیی هەمووان؛ خۆشییان لەدەست دەچێت، ئەویش، وەک کانییەکەی مەیدان، کە بێ وچان ئاوی لێ هەڵدەقوڵێت و بەخەمەوە لەبەری دەڕوات، دەبێت بە سەرچاوەی خەم. بەمجۆرە، لە پێشدا وشەی خەم و دواتر قسەی شووم و نەگبەتی و پاشان بیرۆکەی بێ فەڕی لە گەڕەکدا بڵاو دەبێتەوە و پەسەند دەکرێت. هەندێکیان بار دەکەن و دەگوازنەوە بۆ شوێنانی تر، کاروباری بڕێکیان خراپ دەڕوات و بەشێکیشیان لەبەرئەوەی چێژ لە دەست دەدەن، ئیدی دەسەڵاتیان بەسەر پیشەی خۆیاندا ناشکێت. دوای چۆڵبوونی گەڕەک، ڕۆژێک چەلەبیی ئەڤینداریش ژن و منداڵەکانی هەڵدەگرێت و دەگوازێتەوە بۆ شوێنێکی تر. ژنەی پێست زیوینی شۆخ و مێردەکەی بەتاک و تەنیا لە گەڕەک دەمێننەوە. ئەو کارەساتەی ئەوان هۆکاری هەڵگیرسانی بوون، ئەڤینیان سارد دەکاتەوە و نێوانیان تێک دەدات. تا کۆتاییی تەمەن پێکەوە دەژین، بەڵام هەرگیز بەختەوەر نابن.

لەوەدا بووم بڵێم زۆر حەزم لەم چیرۆکەیە، چونکە باسی ئەوە دەکات ئەڤین و ژنان چەند مەترسیدارن. ئەرێ کورە خۆ لەبیرم چوو، جا ئاوەز لە سەرمدا ماوە؟ بەو پێیەی ئێستا من خۆم ژنم، دەبوو شتێکی تر بڵێم. باشە، شتێکی لەم بابەتە:

ئاخ، ئەڤین چەند خۆشە.

بەڵام ئەو کەسە نامۆیانە کێن لە دەرگاوە دێنە ژووری؟

# 55

## پێم دەڵێن پەپوولە

بە بینینی ئاپۆڕەکە حاڵی بووم پیاوانی ئەرزەڕوومی نیگارکێشانی قۆشمە و گاڵتەچیمان دەکوژن.

قەرەش لەو ئاپۆڕەیەدا بوو و سەیری پەلامارەکەی دەکرد. خەنجەرێکم بەدەستییەوە بینی و لە هاوشانیشی، چەند پیاوێکی سەرنجڕاکێش، بوخچەگێڕی ناسراو ئەستەر و چەند ژنێکی تری بوخچە بەدەستم دی. دوای ئەوەی بینیم ئەوانەی لە قاوەخانەکە دەرچوون، بێبەزەییانە دارکاری دەکرێن و قاوەخانەکەش بەسەریەکدا شێوێندراوە، ڕاکردنم بەخەیاڵدا هات. دواترێ ئاپۆڕەیەکی تر، لەوە دەچوو یەنیچەرە بن، نزیک دەکەوتەوە. پیاوانی ئەرزەڕوومی مەشخەڵەکانیان کوژاندەوە و هەڵهاتن.

کەس لەبەر دەرگای تاریکی قاوەخانەکە نەبوو، کەسیش تەماشای نەدەکرد. چوومە ژوورێ: هەموو لایەک تژە بوو لە شتومەکی شکاو؛ پێم لە پارچەی فنجان، قاپ، پەرداخ، مەنجەڵ و جام ناو ڕێم کرد. چرایەکی هەڵواسراو بە بزمارێکی بەرزاییی دیوارەکەوە بەدرێژاییی ئەم هەرا و زەنایە نەکوژابووەوە، بەڵام زەویی نوقمی پارچەی شتومەکی شکاوی ناو قاوەخانەکە و کورسییە شکێندراو و لەتلەتکراوەکان و پارچە تەختەی پاشماوەی مێزەکەی ڕووناک نەدەکردەوە، بگرە پەڵە هیسی بنمیچەکەی ڕووناک دەکردەوە.

نیمەدەرکانم خستە سەریەک، چوومە سەریان و خۆم بۆ چراکە درێژ کرد و دام گرت. لەبەر ڕووناکییەکەی، جەستە ڕاکشاوەکانی سەر زەویم بینی. ئەوانەی دەمدین



سەروچاویان خەڵتانی خوێنە، نەمدەتوانی بۆیان بڕوانم و لە یەکێکی تر نزیک دەبوومەوە. جەستەی دووەم دەینالاند؛ کاتێک چرای دەستمی بینی، وەک منداڵ دەنگێک لە دەمیەوە دەرهات، گەڕامە دواوە.

کەسێکی تریش هاتبووە ژوورەوە. سەرەتا ترسام، بەڵام هەستم کرد قەرەیە. پێکەوە لە جەستەی سێیەمی ڕاکشاوی سەر زەوییەکە نزیک کەوتینەوە. گاڤێک چراکەی دەستم لە ڕووی نزیک کردەوە، ئەو شتەمان بینی کە لەمێژبوو هەریەکەمان بە گۆشەیەکی ئەقڵی خۆی هەستی پێ کردبوو: چیرۆکبێژیان کوشتبوو.

دەموچاوی بە بۆیاخ وەک ژن چوێندرابوو و خوێنی پێوە نەبوو، بەڵام چەناگە و چاو و دەمی بە بۆیاخ سوورکراوی، پلیشێندرابوونەوە، ملی شین و مۆر هەڵگەڕابوو و گوشرابوو. دەستەکانی لە هەردوو لاوە بۆ پشتەوە درێژ بووبوون. هیچ دژوار نەبوو مرۆڤ پێشبینیی ئەوە بکات یەکێک هەردوو دەستی کابرای پیری جلوبەرگی ژن پۆشیوی لە پشتەوە گرتووە و ئەوانی تریش بە مستەکۆڵە دەموچاویان داگرتووەتەوە و دواتر خنکاندوویانە. تۆ بڵێی گوتبێتیان "ئەو زمانەی ببڕن کە بۆ حەزرەتی مەلا ئەفەندیی درێژی کردووە" و دەستیان بەم کارە کردبێت؟

قەرە گوتی: "ئا چراکەت بێنە ئێرە." لە تەنیشت ئاگردانەکەوە تیشکی چراکەی دەستم دای لە قاوەهاڕەکانی ناو قوڕاوی قاوەی ڕژاوی سەر زەوی، هێڵەک، تەرازوو و پارچەی فنجانی شکاو. لەو گۆشەیەی هەموو ئێوارانێک چیرۆکبێژ نیگاری لێ هەڵدەواسی، قەرە لەبەر ڕووناکیی چراکە ئامێرەکانی کار، پشتوێن، پشتگیر و داری شەقەشەقکەرەکەی کابرای مردووی دەپشکنی. چراکەی لە دەستم وەرگرت، ڕووی ڕووناکییەکەی لە دەموچاوم کرد و گوتی نیگارەکانی لە خەیاڵدایە: بەڵێ، بەقسەی ئەو، من دوو دانەیانم لەبەر خاتری هاوڕێیەتی کێشابوو. تەنیا کڵاوی خوالێخۆشبوومان دۆزییەوە، دەستکاری عەجەم بوو و لە سەری ڕووت و قووتی خۆی دەکرد.

بێ ئەوەی تووشی کەس بین، لە دەرگای پشتەوە، کە دەچووەوە سەر کۆڵانێکی تەسک، دەرچووین بۆ ناو تاریکاییی شەو. نیگارکێشانی ناو قاوەخانە دەبوایە کاتی پەلامارەکە لەم دەرگایەوە دەربچوونایە و هەڵهاتبان، بەڵام گوڵدانە لارەوەکراوەکان و

فەردە قاوە گلۆرەوەبووەکان پێشانیان دەدا لێرەش شەڕ و پێک هەڵپژان ڕووی داوە.

پەلاماردانی قاوەخانە و کوشتنی بێبەزەییانەی وەستای چیرۆکبێژ و تاریکاییی سامداری شەو، من و قەرەی لە یەکتر نزیک کردەوە. پێم وابێت بێدەنگیی نێوانیشمان لەبەر هەمان هۆ بوو. دوو کۆڵانمان بڕی، قەرە چراکەی دەستی خۆی دایە من بۆ ئەوەی هەڵی بگرم، پاشان خەنجەری دەرهێنا و نایە سەر ملم.

گوتی: "دەچین بۆ ماڵی تۆ. دەمەوێت ئەوێ بپشکنم، بۆ ئەوەی ویژدانم ئاسوودە بێت."

گوتم: "ئێ خۆ پشکنییان". ئەمەم گوت و بێدەنگ بووم.

تەنیا هەستم بە خۆ بچووکبینینێک کرد، تووڕە نەبووم. ئایا باوەڕهێنانی قەرە بەو قسە و قسەڵۆکە ڕیسوایانەی لە پاشملە لە بارەی منەوە دەکرا، بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئەویش ئیرەیی پێ بەرێکی سادە و ساکاری چەشنی کەسانی تر بێ؟ خەنجەرەکەشی بەشێوەیەک گرتبوو وەک ئەوەی نەتوانێت زۆر متمانە بەخۆی بکات.

ماڵەکەم، ڕێک پێچەوانەی ئەو کۆڵانە بوو کە لە دەرگای پشتەوەی قاوەخانەکەوە بۆی دەرچووبووین و پیایدا دەڕۆیشتین. بۆیە بۆ ئەوەی تووشی ئاپۆڕەکە نەبین، بەناو کۆڵان و لە گەڕەکەکان جارێک بەلای ڕاست و جارێک بەلای چەپدا بامان دەدایەوە، بە چەند باخچەیەکدا تێ پەڕین، کە بۆنی داری تەڕ و تاقانەی خەمگینیان لێ دەهات و بە ڕێ و ڕۆیشتنمان کەوانەیەکی فراوانمان کێشا. بەدەوری قاوەخانەکەدا سووڕاینەوە و ئەو هەرا و هوریایەی لەوێوە دەهات، بڕانەوەی نەبوو. لە کۆڵانەکانیشدا گوێمان لە پیاوانی ئەرزەڕوومی و یەنیچەرە و پاسەوانی گەڕەک و لاوان بوو دوای ئەرزەڕوومییەکان کەوتبوون. نیوەی ڕێگامان بڕیبوو و گەیشتبوونە شوێنێک، قەرە گوتی:

"ماوەی دوو ڕۆژ بوو لەگەڵ مامۆستا عوسماندا لە ژووری گەنجینە سەیری شاکاری مامۆستایانی دێرینمان دەکرد."

ماوەیەکی درێژ بێدەنگ بووم. زۆر دواتر قیڕاندم: "دوای بەسەربردنی تەمەنێک، نیگارکێش ئەگەر تەنانەت لەگەڵ بەهزادیشدا لەسەر هەمان کورسیش دانیشێت، ئەو شتانەی دەیانبینێت، تەنیا خۆشیی بەچاوی و ئاسوودەیی و خرۆش بە ڕۆحی دەدەن،



بەڵام هونەرەکەی دەوڵەمەند ناکەن، چونکە نەخش کارێکە بە چاو نا، بەدەست دەکرێت. مرۆڤ نەک لە تەمەنی مامۆستا عوسماندا، بگرە ئیدی لە تەمەنی منیشدا زۆر بەئاستەم فێر دەبێت."

بە دەنگی بەرز قسەم دەکرد، بەڵام نەک لەبەرئەوەی ئەم گەمژە داماو و خەنجەر بەدەست و لەخۆباییەم بەهەند وەرگرتبێت، بگرە بۆ ئەوەم بوو ژنە جوانەکەم، کە دڵنیا بووم لە ماڵەوە چاوەڕێی دەکردم، تێ بگات من بەتەنیا نیم و نەدەمویست ڕووی بتەقێت بەڕووی قەرەدا.

کاتێک لە دەرگای حەوشە چووین بەودیودا، هەستم کرد تیشکی پرتەپرتکەری چراکەم لە ماڵەوە بینی، بەڵام ئێستا لە خوا بەزیاد بێ گشت کون و قوژبنی ماڵەوە تاریک بوو. ماڵی بەهەشت ئاسام جێیەک بوو تەواوی کاتی خۆم بەدەم گەڕان لە دووی بیرەوەرییەکانی خوا و نیگارکێشانەوە تێدا بەسەر دەبرد و کاتێکیش چاوانم ماندوو دەبوون، لەگەڵ گیانانی جوانی گشت دنیام دەچووینە نوێنەوە و یەکترمان دەگەوزاند. ئێستاش هاتنە ژوورەم بۆ ماڵەوە لەژێر زەبری خەنجەری ئاژەڵێکدا، بۆ من دەستدرێژییەکی بێبەزەییانە بوو بۆ سەر ژیانی تایبەتیم و سوێندم خوارد تۆڵەی ئەمە لە قەرە بکەمەوە.

چراکەی دەستی لە کاغەزەکانم، لە پەڕەیەکی نیوە تەواوبوو –ئەو سزادراوانەی بۆ ڕزگاربوون لە زنجیری قەرزداری لە سوڵتان دەپاڕانەوە و خێریان لێ وەردەگرت–، لە بۆیەکانم، لە مێز و کورسییەکانم، لە چەقۆکانم، لە پارچەکانم، لە فڵچەکانم، لە گشت شتەکانی سەر لێواری تەختەی نووسینەکەم، دیسان لە کاغەزەکانم، لە مۆرەکانم، لە قەڵەمتاشەکانم، لە نێوان قوتووی قەڵەم و کاغەزەکانم، لە دۆڵابەکەی سەر زەوی، لەژێر نیمدەرە سوور و نەرمەکە و دوایش ژێر ڕایەخەکە نزیک کردەوە و سەیری کردن و پاشان سەرلەنوێ سووڕایەوە و لە نووکەوە سەیری سەرجەم شتەکانی کردەوە. ئەو کاتەی خەنجەری لێ هەڵکێشام، گوتی ماڵەکەت دەگەڕێم، بەڵام ئێستا ژووری نیگارکێشانەکەمی دەپشکنی. جا ئەگەر مەبەستم شاردنەوەی شتێک بوایە، بۆ نەمدەتوانی لەو ژوورەی بشارمەوە کە ئێستا ژنەکەمی لێیە و لە کونی دیوارەوە سەیرمان دەکات؟

گوتی: "دەگوترێت نیگارێکی کۆتاییی ئەو کتێبەی زاوام بەئامادەکردنی دەدا، هەیە. ئەو کەسەی کوشتوویەتی، نیگارەکەی دزیوە."

یەکسەر گوتم: "لەوانی تر جیاوازتر بوو. زاوای خوا لێخۆشبووت لە گۆشەیەکیدا نیگاری دارێکی بەدەستی من بەکێشان دابوو. لە شوێنێکی پشتەوە... دەبوو نیگاری کەسێک بخرێتە ناوەڕاست و پێشەوە؛ پێم وابوو شێوەی سوڵتانمان دەبوو. شوێنە زۆر گەورەکەی ئامادە بوو، بەڵام نیگاری نەکێشرابوو. وەک ئەوەی فەرەنگ دەیکەن، لەبەرئەوەی شتەکانی پشتەوەی ناو ئەم نیگارە بچووک بوون، داوای لێم کردبوو نیگاری دارەکەی بەبچووکی بۆ بکێشم. نیگارەکە تا زیاتر دەچووە پێش، هەستێکی وای لەکن مرۆڤدا دەورووژاند وەک ئەوەی سەیری نیگار نا، بگرە لە پەنجەرەیەکەوە سەیری دنیا بکات. ئەو کاتە حاڵی بووم لە نیگارێکدا لەسەر شێوازی ڕوانگەی فەرەنگی کێشرابێت، هێڵکاری و زەڕکاری جێی چوارچێوەی پەنجەرەکە دەگرنەوە."

"زەریف ئەفەندی زەڕکاریی چوارچێوەکەی دەکرد."

"ئەگەر ئەمە دەپرسیت، پێتم گوت من نەمکوشتووە."

بەپەلە گوتی: "مرۆڤ ئەگەر بشکوژێت، ناڵێت کوشتوومە." لێی پرسیم لە کاتی پەلاماردانی قاوەخانەکەدا کارم چی بووە لەوێ.

چراکەی کەمێک لەولای ئەو نیمدەرەی لەسەری دانیشتبوو، لە نێوان کاغەزەکانم و ئەو پەڕانەی نەخشاندبوومن، بەشێوەیەک دانابوو ڕووم ڕووناک بکاتەوە. بۆخۆیشی بە تاریکاییی ژوورەکەدا وەک سێبەر دەهات و دەچوو.

جگە لەو شتانەی بە ئێوەم گوتبوو، کە بەڕاستی کەم دەچمە قاوەخانە و بەڕێکەوت لەوێوە تێ پەڕیوم، پێم گوت دوان لەو نیگارانەی بە دیواردا هەڵدەواسران، من کێشابوومن، بەڵام ڕووداوەکانی قاوەخانەکەم هیچ پێ خۆش نەبوو. گوتم: "چونکە ئەگەر نیگارکێش هێزی لە هونەری نیگارکێش و ئەڤینی نەخش و ویستی گەیشتن بە خوا وەرنەگرێت و لە ویستی بچووککردنەوەی خراپەکارییەکانی ژیان و سزادانەوە وەری بگرێت، واتای وایە دواجار هەلی خۆ بچووککردنەوە و سزادانی خۆی ڕەخساندووە، جا ئەوەی بچووکی دەکاتەوە، چ مەلای ئەرزەڕوومی بێت یاخۆ ئیبلیس خۆی. شتێکی تریش هەیە، ئەگەر ئەو قاوەخانەیە قولی پیاوانی ئەرزەڕوومیی بە



دەمدا نەبردایە، لەوانە بوو ئەمشەو پەلامار نەدرایە."

ئەو نامەردە گوتی: "بەڵام سەرباری ئەوەش، هاتوچۆی ئەوێت دەکرد."

دەچووم، چونکە لەوێ چێژم لە بەزمگێڕان وەردەگرت." ئایا حاڵی بووبوو چەند دروست دەدوام؟ لێم زیاد کرد و گوتم: "ئێمەی نەوەی ئادەمیزاد، سەرباری ئەوەی بە ویژدان و بە ئەقڵیش دەزانین فلان شت چەپەڵ و هەڵەیە، کەچی دەتوانین بیکەین و چێژیشی لێ وەربگرین. شەرمیشم دەکرد لە چێژ وەرگرتن لە نیگارە هەرزان بەهاکان و لاساییکردنەوە و چیرۆکی ئیبلیس و پارە و سەگ و ئەو چیرۆکانەی بێ کێش و بێ سەروا و بەزبری دەگێڕدرانەوە."

"ئێ کەوابوو بۆچی دەچوویتە قاوەخانەی ئەو بێ ئاینانە؟"

بەگوێڕایەڵیکردن لە دەنگێکی هەڵقوولاو لە ناخمەوە گوتم: "باشە، جاروبار منیش گومانێکم هەیە وەک گورگ لە ناوەوە هەناوم دەخوات، با بیڵێم: لەو کاتەوەی نەک تەنیا مامۆستا عوسمان، بگرە سوڵتانیشمان دیویەتی من هونەربازترین و لێهاتووترین مامۆستای نیگارخانەم، هێندە لە ئیرەییی نیگارکێشانی تر ترساوم، دەڵێم نەبادا لە کەوچکێک ئاودا بمخنکێنن، ئەگەر کەمێکیش بێت، دەچمە ئەو شوێنانەی ئەوان بۆی دەچن، لەگەڵ ئەواندا هەڵدەستم و ڕادەبم و هەوڵ دەدەم لەوان بچم. تێ دەگەیت؟ لەو کاتەوەی دەست کراوە بە گوتنی ئەوەی گوایە من سەر بە تاقمی مەلای ئەرزەڕوومیم، دەمگوت بۆ ئەوەی کەس بڕوا بەم بوختانە دەکات، دەچوومە ئەو قاوەخانە ڕیسوایەی بێ ئاینان."

"مامۆستا عوسمان گوتی زۆر شتی کردووە بۆ لێبووردین خواستن لە هونەر و توانای تۆ."

"چی تری گوت لە بارەی منەوە؟"

"دەیگوت تۆ بەمەبەستی ئەوەی خەڵک بڕوا بکەن بۆ نەخش ژیانت وەلا ناوە، لەسەر دەنکی برنج و نینۆک نیگاری بچووک و تورەهات دەکێشیت. دەیگوت لەبەرئەوەی شەرم دەکەیت لەو توانایەی خوا پێی داویت، هەرگاڤ لە هەوڵی ئەوەدایت لەکن کەسانی تر خۆت شیرین بکەیت."

لە ناخەوە گوتم: "مامۆستا عوسمان لە پلە و پایەی بەهزاددایە. چی تر؟"

ئەو نامەردە گوتی: "بێ سڵەمینەوە کەموکوتییەکانیشتی گوت."

"کەموکورتییەکانم بڵێ."

"گوتی سەرباری هونەرەکەت، لە سۆنگەی ئەڤینی نەخشەوە نیگار ناکێشیت، بۆ ئەوە دەیکێشیت تا خۆت لە کەسانی تر ببەیتە پێش. ئەو شتەی کاتی نیگارکێشان تۆ لە گشت شتێکی تر دڵخۆشتر دەکات، پێشبینیکردنی ئەو چێژ و تامەیە کە بینەران لە نیگاری دەستکردی تۆ وەری دەگرن. بەبۆچوونی ئەو، تۆ دەبوایە بتوانیت بۆ چێژی نیگارکێشان خۆی، نیگار بکێشیت."

لەبەرئەوەی مامۆستا عوسمان وا بێباکانە بۆچوونی خۆی لەبارەی منەوە بۆ یارۆیەکی بێ تامی ژیان لەبری نیگار، بۆ نووسیاری و نامەبەری و مامەحەمەییکردن تەرخانکردوو گێڕاوەتەوە، دڵی بریندار کردم. قەرە شتی تریشی گوت:

"دەیگوت گەورە مامۆستایانی دێرین هەرگیز سەریان بۆ هێزی پادشایەکی نوێ و بەزمی شازادەیەکی تازە، یاخۆ چێژی چاخێکی تر دانەنواندووە و دەستبەرداری ئەو شێواز و ڕێبازانە نەبوون کە سەرتاپای ژیانیان بۆ بەدەستهێنانی بەخت کردووە و بۆ ئەوەی ناچار نەکرێن ڕێباز و شێوازی خۆیان بگۆڕن، قارەمانانە خۆیان کوێر کردووە. بەڵام ئێوە بەبیانووی ئەوەی سوڵتانمان وای ویستووە، بۆ کتێبەکەی زاوام بە چێژەوە و بێ ئابڕووانە لاساییی مامۆستایانی فەڕەنگتان کردووەتەوە."

گوتم: "عوسمانی مامۆستای گەورە و سەرۆکی نیگارکێشان مەبەستی شتێکی خراپ نەبووە. کوا با چای ئیخلاموور بۆ میوانی خۆم لێ بنێم."

چوومە ژوورەکەی تەنیشت. ڕۆحی ڕەوانم کراسی خەوی لە ئاوریشمی چینی بڕاوی لە ئەستەری بوخچەگێڕ کڕیوو لەبەر کرد و بەدەم لاساییکردنمەوە دەستی برد بۆ کێرم و گوتی: "با چای ئیخلاموور بۆ میوانی خۆم لێ بنێم."

لە بنی نزیکترین دۆڵاب لە پێخەوە ڕاخراوەکەمانەوە و لەژێر ئەو سەرچەفانەی بۆنی گەڵای گوڵیان لێ دەهات، شمشێرە دەسک ئەقیقەکەم هەڵگرت و لە کێلان دەرم هێنا. ئەم شمشێرە قەراغەکانی هێندە تیژن ئەگەر دەسماڵی ئاوریشمی بهاوێژیتە سەر، دەیکات بە دوولەتەوە. ئەگەر پەڕەی زێڕینی بخەیتە سەر، پارچەکان وا ڕێک دەردەچن وەک ئەوەی بە ڕاستە کێشرابن.



شمشێرەکەم شاردەوە و گەڕامەوە ژووری نیگارکێشان. قەرە ئەفەندی هێندە بە لێپرسینەوەی من ڕازی بوو، هێشتا خەنجەرەکەی بەدەستەوە بوو و بەدەوری نیمدەرە سوورەکەدا دەسووڕایەوە. پەڕەیەکی نیوە نەخشێندراوم خستە سەر نیمدەرەکە و گوتم: "سەیری ئەمە بکە." بەپەرۆشەوە چۆکی دادا و هەوڵی دا تێ بگات.

چوومە پشتیەوە، شمشێرم هەڵکێشا، بە هەڵمەتێک خۆم دا بەسەریدا و خستم. خەنجەرەکەی کەوت. سەریم گرت و نامە سەر زەوی، لەژێریشەوە شمشێرم نایە سەر ملی. دەمەوڕوو دابووم بە زەویدا و جەستەی قورسی خۆم خستبووە سەر جەستەی باریک و زراڤی و بە چەناگە و دەستم پاڵەپەستۆم دەخستە سەر سەری تا ڕادەی ئەوەی ملی بەر قەراغی تیژی شمشێرەکە بکەوێت. بەدەستێکم قژە چڵکنەکەیم گرتبوو، دەستەکەی تریشم شمشێری نابووە سەر پێستی ناسکی ملی. ئاقڵیی کرد و جووڵەی لێوە نەهات، چونکە یەکسەر خوێنیم دەڕشت. نزیکبوونم لە قژی لوولی و گوێیە دزێوەکانی و گرێملی، دەمارەکانی مێشکمی گرژتر کردەوە. گرێملی ئاشکرا هاواری دەکرد و دەیگوت پێمدا بکێشە و ئەگەر کاتێکی تر بوایە بێ ئەدەبانە زللەیەکم تێ دەسرەواند. وەک ئەوەی ڕازێک بە گوێیدا بچرپێنم، گوتم: "بەزۆر خۆم ڕاگرتووە بۆ ئەوەی هەر لەم شوێنە نەتکوژم."

خۆشحاڵ بووم بەوەی فزەی لێوە نەهات و وەک منداڵی گوێڕایەڵ گوێی بۆ قسەکانم ڕاگرت. بەچرپە گوتم: "لە شانامەی ئەفسانەییەوە دەیزانیت، شا فەرەیدوونی باوک کارێکی هەڵە دەکات و کاتێک وڵاتەکەی بۆ سێ پارچە دابەش دەکات، دوو لە خراپترین وڵاتان بە دوو کوڕە گەورەکانی و باشترین وڵاتیش بە ئیرەجی کوڕە بچووکی دەدا. تووری هەڵوەدای تۆڵەسەندنەوەی ئیرەیی بەر بە ئیرەجی برا بچووک، ڕۆژێک لە خشتەی دەبات و پێش ئەوەی سەری ببڕێت، وەک چۆن ئێستا من قژی تۆم گرتووە، ئەویش قژی ئیرەج ڕادەکێشێت و چەشنی ئێستای من بەتەواوی جەستەی خۆیەوە خۆی دەدات بەسەر براکەیدا. هەست بە گرانیی لەشم دەکەیت بەسەر خۆتەوە؟"

وەڵامی نەدایەوە، بەڵام چاوانی وەک چاوانی بەرخی قوربانی بۆمیان دەڕوانی و لەمەوە تێ گەیشتم حاڵی بووە و لە هەمان کاتدا ئیلهامێکم بۆ هات: "بەتەنیا لە

نیگارکێشاندا نا، لە شمشێر خستنە سەر مل و سەربڕینی وردەکارانەشدا پابەندی شێواز و ڕێبازی عەجەمم. ئەم جڤاتە زۆر حەزی لێ دەکرێت و من جۆرێکی تریم لە نیگارەکانی پێشاندەری چۆنیەتیی کوشتنی شا سیاوشدا دیوە."

قەرە بە بێدەنگی گوێی بۆ ڕاگرتبووم، منیش بەدوور و درێژی بۆم باس کرد سیاوش چۆن خۆی بۆ تۆڵەی براکانی ئامادە کرد، سەرجەم کۆشک و ماڵ و موڵکی خۆی سووتاند، گەردنئازادیی لە ژنەکەی کرد و سواری ئەسپ بوو و چوو بۆ شەڕ. چۆن شەڕی دۆڕاند، بە قژ ڕاکێشان لە تۆز و خۆڵی شەڕگەی بە لاشەی کوژراوان داپۆشراودا ڕاکێشرا، وەک ئەوەی ئێستا من لەگەڵ ئەودا دەیکەم، دەمەوڕوو تەخت کرا و دواجار خەنجەر لە ملی نرا. کاتێک پادشای ئەفسانەیی لەم دۆخەدا دەبێت، چۆن دۆست و دوژمنانی دەست دەکەن بە گفتوگۆ و دەڵێن گەلۆ بیکوژین یان لێی خۆش بین و چۆن پادشای دۆڕاو ڕووی بە زەوییەوە نراوە و گوێی لە سەرجەم ئەم گفتوگۆیانەیە. لە قۆچی قوربانیی خۆم پرسی: "حەزت لەو نیگارە هەیە؟ گێرووی بکوژ لە پشتەوە نزیک کەوتبووە و خۆی هەڵدابووە سەر پشتی سیاوشی لەسەر زەوی ڕاکێشراو و شمشێری نابووە سەر ملی، ئا ئاوا قژی گرتبوو و سەری بڕیبوو. خوێنی ڕژاو لە پێشدا دووکەڵێکی ڕەشی لە زەویی دێم بەرز کردووەتەوە و پاشان لەوێدا گوڵێک ڕواوە."

کەمێک بێدەنگ بووم و گوێمان لە پیاوانی ئەرزەڕوومی بوو لە دوور، بەنێو کۆڵانەکاندا ڕایان دەکرد و هات و هاواریان بوو. کارەسات و ترسی دەرەوە ئێمەی لەسەر زەوی بەسەریەکەوە ڕاکشاوی زیاتر لەیەکدی نزیک خستەوە.

قژی قەرەم لە دەستی خۆمدا زیاتر ڕاکێشا و گوتم: "بەڵام لە سەرجەم ئەو نیگارانەدا هەست بەدژواریی بەزەرافەت کێشانی نیگاری دوو کەس دەکرێت ئەوانیش وەک ئێمە هەم جەستەیان چووە بەیەکدا و هەم نەفرەتیش لەیەکتر دەکەن. لەوە دەچێت ناپاکی و ئیرەیی و ئاڵۆزیی شەڕی پێش ئەو ساتە ئەفسووناوی و دانسقەیەی سەربڕین تۆزێک بە پێوەنانەوە خزێندرابێتە نیگارەکەوە. بگرە گەورەترین مامۆستایانی قەزوینیش لە کێشانی نیگاری دوو پیاوی بەسەریەکەوەدا دژواری دەبینن؛ گشت شت تێکەڵ بەیەکتر دەبن. بەڵام بڕوانە، من و تۆ پێکەوە ڕێکوپێکتر و زەریفترین."



نووزەیەکی کرد و گوتی: "شمشێرەکەت دەمبڕێت."

"سوپاست دەکەم لەپای قسەکردنت گیانی خۆم، بەڵام ناتبڕێت. ئاگادارم، هیچ شتێک ناکەم ببێتە هۆی تێکدانی زەرافەتی ئەم ڕاوەستانە جوانەمان. گەورە مامۆستایانی دێرین لە کێشانی سەرجەم جڤاتەکانی ئەڤین و مردن و شەڕدا نیگاری جەستە بەیەکداچووەکانیان وەک جەستەی تاکە کەسێک کێشاوە و تەنیا بەمجۆرەش توانیویانە فرمێسک لە چاوانی ئێمە بێنن. بڕوانە: سەرم وەک ئەوەی بەشێک بێت لە جەستەی تۆ، لە گەردنت نزیک بووەتەوە. هەست بە بۆنی قژ و گەردنت دەکەم. هەردوو ڕانم هێندە بەجوانی بە ئەملا و ئەولای ڕانەکانی تۆدا ڕاکشاون، ئەوەی بۆمان بڕوانێت، وا دەزانێت ئاژەڵێکی چوارپێی زەریفین. ئایا لەسەر پشت و قوونت هەست بە هاوسەنگیی گرانیی من دەکەیت؟" بێدەنگییەک هاتە کایەوە، بەڵام پاڵەپەستۆم نەخستە سەر شمشێرەکەم، چونکە بۆی هەبوو برینداری بکات. بەئەسپایی چرپاندم بەبن گوێیدا: "ئەگەر قسە نەکەیت، ئەم گوێیەت دەگەزم."

کاتێک لە چاوانیدا بینیم ئامادەیە بۆ قسەکردن، جارێکی تر هەمان پرسیارم کردەوە: "هەست بە هاوسەنگیی گرانیم دەکەیت لەسەر جەستەت؟"

"بەڵێ."

گوتم: "خۆشە؟" پرسیم: " ئایا ئێمە جوانین؟ ئایا ئێمە بەئەندازەی ئەو قارەمانە ئەفسانەییانەی لە شاکارەکانی مامۆستایانی کۆندا بەزەرافەتەوە یەکدی دەکوژن، جوانین؟"

قەرە گوتی: "نازانم. لە ئاوێنەدا خۆمان نابینم."

کاتێک بەخەیاڵ ئەوەم هێنایە پێش چاوم ژنەکەم لە ژوورەکەی تەنیشتمانەوە سەیرمان دەکات و ئێمە لەبەر ڕووناکیی چرای قاوەخانەکە چۆن دەبینێت، تاوم سەند و لەوە ترسام بەڕاستی گوێی قەرە بگەزم.

گوتم: "ئەی ئەو قەرە ئەفەندییەی بە خەنجەرەوە هاتوویتە ناو ماڵ و ژیانی تایبەتم و خوازیاری لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا بکەیت، ئایا ئێستا هەست بەهێزی من دەکەیت بەسەر خۆتەوە؟"

"هەستیش دەکەم لەسەر مافیت."

"چ پرسیارێکت دەوێت، ئێستا دیسان بپرسە."

"بۆم بگێڕەوە مامۆستا عوسمان چۆن دەستی پێدا دەهێنایت؟"

"لە سەردەمی شاگردیمدا، کاتێک لە ئێستا زراڤتر و نازدارتر و جوانتر بووم، من چۆن ئێستا خۆم بەسەر تۆدا کێشاوە، ئەویش بەهەمان شێوە لەسەر من درێژ دەبوو. دەستی بە مەچەکمدا دەهێنا، جاروبار ئازاریشی پێ دەگەیاندم، بەڵام لەبەرئەوەی شەیدای زانیاری و هونەر و هێزی وی بووم، ئەم ڕەفتارانەم پێ خۆش بوو و بیرم بۆ شتی خراپ نەدەچوو، چونکە ئەوم خۆش دەویست. خۆشویستنی مامۆستا عوسمان بۆ من ڕێگای خۆشویستنی نیگارکێشی، ڕەنگ، کاغەز، قەڵەم، جوانیی نیگار، هەر شتێک نیگاری بکێشرێت و بەمجۆرەش خۆشویستنی دنیا و خوا بوو. مامۆستا عوسمان بۆ من لە باوک زیاترە."

پرسی: "ئایا زۆری لێ دەدایت؟"

"وەک باوکێک پێویست بکات لە منداڵی خۆی بدات، لە جێی خۆی و بە هەستی دادپەروەرانەوە لێی دەدام و وەک وەستایەکیش ئازار و سزای دەدام و بەمەبەستی فێربوون دارکاریی دەکردم. ئەمڕۆ هەست دەکەم لە ڕووی ئێش و ترسی ئەو ڕاستانەی بە نینۆکەکانمیدا دەکێشا زۆر شت فرە باشتر و خێراتر فێر بووم. لە سەردەمی شاگردیمدا، بۆ ئەوەی کاکۆڵم نەگرێت و سەرم نەکێشێت بە دیواردا، دەستم بۆ بۆیاخ نەدەبرد، ئاوی زێڕم سەرف نەدەکرد، پێچی لاقی ئەسپم لە سەری خۆمدا دەکێشا، هەڵەی هێڵکێشانم دەشاردەوە، فڵچەکانم لە کاتی خۆیدا پاکژ دەکردەوە و فێر بووم تەواوی سەرنج و ڕۆحی خۆم بخەمە سەر کاغەز. لەبەرئەوەی لە بەرامبەر هونەر و وەستاییی خۆم قەرزداری ئەو تێ هەڵدانانەم، ئێستا بەوپەڕی ئاسوودەییی دڵ لە شاگردەکانی خۆم دەدەم. تەنانەت دارکاریکردنی نارەواش، ئەگەر شکۆی شاگرد بریندار نەکات، دەزانم دواجار سوودی بۆ منداڵەکە دەبێت."

"بەڵام دیسانیش کاتێک شاگردێکی ڕوو جوان و نیگا شیرین و فریشتەخوو دارکاری دەکەیت و بۆ چێژی خۆت جارناجارێک جڵەوی خۆت لە دەست دەدەیت، تێ دەگەیت مامۆستا عوسمانیش هەمان شتی بەسەر تۆدا هێناوە، وا نییە؟"

"جاری وا هەبووە بە مۆری مەرمەڕ هێندە قایم لە پشتی گوێمی داوە، چەندین ڕۆژ



گوێم زرنگاوەتەوە و گێژ بووم. هەندێک جار زللەی وای پێدا کێشاوم، گۆنام چەندین هەفتە فرمێسکی چاومیان پێدا ڕژاوە و سووتاونەتەوە. ئەمانەم بیر دەکەوێتەوە، بەڵام مامۆستای خۆیشم خۆش دەوێت."

قەرە گوتی: "نەخێر، لێی زیز دەبوویت. کتێبی زاوام بەلاساییکردنەوەی فەرەنگ ئامادە دەکرا و تۆش نیگارت بۆی دەکێشا. بەمجۆرە، تۆڵەی ڕقی لە ناخی خۆتدا کەڵەکەکردووی بەرامبەر بە مامۆستا عوسمان دەکردەوە."

"تۆ بەهیچ جۆرێک نیگارکێشان ناناسیت. تەواو پێچەوانەی ئەمە ڕاستە. ئەو تێ هەڵدانەی منداڵ لەسەر دەستی وەستای خۆیدا دەیخوات، تا مردن نیگارکێش بە ئەڤینێکی قوڵ بە وەستاوە گرێ دەدات."

"قایمکردنی شمشێر لەسەر ملی ئیرەج و سیاوش لە پشتەوە، وەک ئەوەی ئێستا تۆ بە منی دەکەیت و سەربڕینی زۆردارانە و ناپاکانەی ئەوان لە ڕووی ئیرەییی برایانەوەیە. ئیرەییی برایانەش لە شانامەدا هەردەم لەلایەن باوکی نادادپەروەرەوە ئامادە دەکرێت..."

"ڕاستە."

بێ ئابڕووانە گوتی: "ئەو باوکە نادادپەروەرەی ئێوەی بەرداوەتە گیانی یەکدی، ئێستاش خەریکی ناپاکی ئامادەکردنە لەدژتان." نالاندی و گوتی: "ئاخ، مەکە، دەیبڕیت." بەدەم ئازارەوە کەمێکی تریش هاواری کرد. گوتی: "بەڵێ، بڕینی ملم و ڕژاندنی خوێنم کاری چرکەیەکە، بەڵام ئەگەر پێش گوێگرتن لە قسەکانم ئەمە بکەیت –هەرچەندە باوەڕیش ناکەم تۆ کاری وا بکەیت، ئاخ، بەسە– بە سالان ئەقڵت بەو شتەوە دەجەڕێت کە ئێستا بۆت باس دەکەم. کەمێک شمشێرەکە شل بکەوە." شلم کردەوە. "ئەو مامۆستا عوسمانەی لە منداڵیی ئێوەوە چاودێریی هەموو هەنگاوێک و گشت هەناسەدانێکتان دەکات و بە شادمانی دەبینێت بەهرە و لێهاتوویی خواپێداوی ئێوە بە چاودێریی ئەو چەشنی چرۆی بەهار دەپشکوێت و دەبێت بە هونەر، ئێستا لە پێناوی پاراستنی ئەو نیگارخانەیەی لەگەڵ ئێوەدا سەرتاپای ژیانی خۆی پێ داوە و بۆ پاراستنی شێوازی نیگارخانە، پشت لە ئێوە دەکات."

"بۆ ئەوەی بزانی ئەو شتەی شێوازی پێ دەڵێن شتێکی چەند درێوە، ئەو ڕۆژەی

زەریف ئەفەندیمان ناشت، من سێ چیرۆکم بۆت گێڕایەوە."

قەرە بەوریایی گوتی: "ئەوانە لەبارەی شێوازی نیگارکێشەوە بوون، بەڵام هەوڵی مامۆستا عوسمان بۆ پاراستنی شێوازی نیگارخانەیە."

بە دوور و درێژی باسی کرد و گێڕایەوە چۆن سوڵتان بایەخی بە دۆزینەوەی نامەردی بکوژی زەریف ئەفەندی و زاوای داوە، بۆ ئەم مەبەستە تەنانەت دەرگای گەنجینەی ئەندەروونی بۆ خستوونەتە سەرپشت و چۆن مامۆستا عوسمان ئەم هەلە بەکار دەهێنێت بۆ خراپکردنی کتێبەکەی زاوای و سزادانی ئەوانەی ناپاکییان لێ کردووە و دەستیان کردووە بە لاساییکردنەوەی مامۆستایانی فەڕەنگ. گوتیشی بۆ ئەسپە لووت بڕاوەکە، لە ڕووی شێوازەوە لە زەیتوون بەگومانە، بەڵام وەک گەورەی نیگارکێشان لەقلەق ڕادەستی جەلادەکان دەکات، چونکە بەقسەی خۆی، لە تاوانباریی ئەو دڵنیایە. لەبەرئەوەی هەستم دەکرد لەژێر زەبری شمشێرەکەمدا ڕاستی دەڵێت و وەک منداڵ نوقمی گێڕانەوەی بەسەرهات بووە، دەمویست ماچی بکەم. هیچ نەترسام لەو شتانەی بیستم: چونکە دوورکەوتنەوەی لەقلەق بەواتای ئەوە دەهات لە دوای مردنی مامۆستا عوسمان –خوا بە درەنگی بخات–، من دەبم بە گەورەی نیگارکێشان.

ئەو شتەی ئۆقرەی لە من بڕیبوو، شیمانەی بەدینەهاتنی هیچ کامێک لەم شتانە بوو کە ئەو دەیگێڕانەوە، نەک بەدیهاتنی. ئەو بۆشاییەی لە نێوان وشەکانی بەسەرهاتەکەدا هەستم پێ کرد، بەواتای ئەوە دەهات مامۆستا عوسمان، نەک هەر لەقلەق، بگرە دەیتوانی منیش بە فەتارەت بدات. بیرکردنەوە لەم شیمانە لە ئەقڵ بەدەرە هەر ئەوە نەبوو زراوی دەتۆقاندم، بگرە وەک کەسێکی لەپڕ باوک لە دەستچوو بەرەو ترسی بێ جێ و ڕێیی پاڵی پێوە دەنام. هەر جارێک ئەم شتەم دەکەوتەوە خەیاڵ، بە دڵمدا دەهات شمشێرەکەم لە قوڕگی قەرە بچەقێنم، بەڵام ددانم بەخۆمدا گرت و ئەم بابەتەم بەهیچ جۆرێک نە لەگەڵ قەرە و نە لەگەڵ خۆمدا تاوتوێ نەکرد: باشە بۆچی لەپای ئەوەی بە ئیلهام وەرگرتن لە مامۆستایانی فەڕەنگ چەند دانەیەک نیگاری پڕووپووچمان بۆ کتێبی زاوا کێشاوە، بخرێینە خانەی ناپاکانەوە؟ جارێکی تریش بیرم کردەوە لەوانەیە لە پشت کوژرانی زەریف ئەفەندییەوە تەپکە و داوێکی



لەقلەق و زەیتوون لەدژی من هەبێت. شمشێرم لەسەر ملی قەرە هەڵگرت.

گوتم: "با پێکەوە بچین بۆ ماڵی زەیتوون و کون و قوژبنی ماڵەکەی بگەڕێین."

"ئەگەر دوایین نیگار لای ئەو بێت، هەر هیچ نەبێت حاڵی دەبین پێویستە ئیدی لە کێ بترسین. ئەگەر نا، ئەویش وەک هێز دەخەینە پاڵ خۆمان و دەدەین بەسەر ماڵی لەقلەقدا."

پێم گوت متمانەت بە من و خەنجەرەکەتمان بەسە. لەپای ئەوەی تەنانەت نەمتوانیبیوو لێوانێک چای ئیخلامووری بدەمێ، داوای بووردنم لە قەرە کرد. چرای قاوەخانەکەمان لە زەوی هەڵگرت و پێکەوە بە نیگای واتادارەوە سەیری ئەو نیمدەرەمان کرد کە من ئەوم لەسەری ڕاکێشابوو. بە چرای دەستمەوە لێی نزیک بوومەوە و پێم گوت ئەو بڕاوییە بەئاستەم دیارەی سەر ملت دەبێت بە نیشانەی دۆستایەتیمان. تۆزێک خوێنیشی لێ هاتبوو.

هێشتا لە کۆڵانەکان دەنگی هەرا و زەنای ئەرزەڕوومییان و ئەوانەی ئەوانیان ڕاودەنا، دەهات، بەڵام کەس خۆی لە ئێمە نەدەگەیاند. بەزوویی گەیشتینە ماڵی زەیتوون. لە دەرگای حەوشەمان دا، دەرگای ماڵەوەمان کووتا و بەپەلەپرووزێ لە دەریوانەی پەنجەرەکانمان دا: کەس لە ماڵ نەبوو، هێندە تەق و هوڕمان کردبوو، دڵنیا بووین لەوەی لە ژوورەوە نەنووستووە. قەرە ئەو شتەی گوت کە هەردووکمان بیرمان لێ دەکردەوە: بچینە ژوورێ؟

بەلای کولی خەنجەرەکەی قەرە زۆرم بۆ ئاسنی قفڵی دەرگای حەوشە هێنا و شل کردەوە، پاشان خەنجەرەکەم کرد بە نێوان دەرگاکەدا و سوارم کرد و لەقاندم و قفڵەکەم شکاند. لە ژوورەوە بۆنی شێ و پیسی و تەنیاییی چەندین ساڵە دەهات. لەبەر تیشکی چراکە، پێخەوێکی پەرش و بڵاومان بینی، پشتوێنی بە نارێکی لەسەر نیمدەرەکان فڕێدراو، هێڵەک، دوو مێزەر، کورتەک، فەرهەنگی فارسی–تورکیی "نعمةالله نقشبندي"، کڵاودان، قوماسی چۆغە و داو و دەرزی بۆ دروومان، قاپێکی مسی پڕ لە توێکڵە سێو، ژمارەیەکی زۆر نیمدەر، سەرچەفێکی قەدیفە، بۆیاخ و فڵچە و سەرجەم کەرەسەکانی نەخشکاریی نیگارکێشمان بینی. هیچی وای نەمابوو بکەومە ناو کاغەزەکانی نووسینی سەر سندووقێکی بچووک و چین چین کاغەزی

هندیی بەسەرنجەوە بڕاو و پەڕە نەخشێندراوەکان، بەڵام خۆم ڕاگرت، چونکە هەم قەرە لە من بەچێژتر بوو و هەم بەهۆی ئەوەی دەمزانی هیچ خێری پێوە نابێت ئەگەر مامۆستایەکی نیگارکێش دەست بخاتە کەرەسەی نیگارکێشێکی کەم هونەرتر لە خۆیەوە. زەیتوون بەپێچەوانەی ئەوەی لێوەی دەزانرا، لێهاتوو نەبوو؛ تەنیا تامەزرۆ بوو. تێ دەکۆشێت بە شەیدابوونی مامۆستایانی کۆن کێماسیی هونەری خۆی پەردەپۆش بکات. بەڵام ئاشکرایە داستانی کۆن تەنیا خەیاڵی نیگارکێش تاو دەدات؛ ئەوەی نیگار دەکێشێت: دەستە.

کاتێک قەرە سەرجەم سندووق و ناو قوتووەکان تا دەگاتە بنی سەبەتی جلی چڵکن، گشت شتێکی بەوردی پشکنی، من بێ ئەوەی دەست بەهیچ شتێکەوە بدەم، چاوم بڕیبووە پەشتەماڵە بورساییەکانی زەیتوون، شانەی لە داری عەبەنووس، پەشتەماڵی چڵکنی گەرماو، شووشەی ئاوی گوڵ، پەشتەماڵێکی سەمەرەی دەستکاری هندستان، سەربەرگی پینەدار و گران و چڵکن، سینییەکی مسی قووپاو، ڕایەخە قڕێژەکانی و شتومەکی هەرزان و خراپی. دیار بوو بەگوێرەی ئەو پارەیەی دەستی دەکەوت، ئەم شتانەی دەکڕی. زەیتوون یان زۆر ڕژد و دەستقایم بوو و پارەکانی خۆی دەشاردەوە، یان لە شوێنێکی دیدا خەرجی دەکردن...

دواتر بە ئیلهامێکەوە گوتم: "ڕێک ماڵی بکوژێکە، بگرە بەرماڵێکی نوێژکردنیشی نییە."بەڵام ئەمە شتەکەی ناو ئەقڵم نەبوو. بیرم کردەوە. گوتم: "شتومەکی کەسێک کە نازانێت کامەران بێت..." بەڵام بە گۆشەیەکی تری ئەقڵم بە دڵتەنگی دەرکم دەکرد بەدبەختی و نزیکبوون لە ئیبلیسەوە سوود بە نیگارکێش دەگەیەنێت.

قەرە گوتی: "سەرباری ئەوەی مرۆڤ دەزانێت چۆن بەختەوەر بێت، بەڵام لەوانەیە نەتوانێت ببێت."

بڕێک نیگاری لە بنی سندووقێک دەرهێنا و نایە بەردەمم. نیگارەکان لەسەر کاغەزی زبری سەمەرقەندی کێشرابوون و لە پشتەوە کاغەزی ئەستووریان لێ درابوو. ئیبلیسێکی خوێن شیرینمان بینی لە زەوی هەڵقووڵابوو و لە خۆراسانەوە گەیشتبووە ئێرە، نیگاری دارێک، ژنێکی جوان، سەگێک و ئەو نیگارەی مردنمان بینی کە من کێشابووم: ئەمانە ئەو نیگارانە بوون کاتێک چیرۆکبێژی کوژراو هەر



ئێوارەیەک چیرۆکێکی پڕوپووچی دەگێڕایەوە، بە دیواردا هەڵی دەواسین. لە وەڵامی پرسیاری قەرەدا، نیگاری مردنی دەستکردی خۆم پێشانی دا.

گوتی: "لە کتێبەکەی زاواشمدا هەمان ئەم نیگارانە هەن."

"چ چیرۆکبێژ و چ خاوەن قاوەخانە حاڵی بووبوون ئاقڵترین کار ئەوەیە نیگارکێشان ڕابسپێردرێن بۆ کێشانی ئەو نیگارانەی هەموو ئێوارانێک بە دیواردا هەڵدەواسران. بەپەلە نیگارێکی بە ئێمەی نیگارکێش لەسەر کاغەزێکی زبر بەکێشان دەدا و چەند شتێکی لەبارەی بەسەرهاتی نیگارەکە و گاڵتە و جەفەنگی نیگارکێشەوە لێمان دەپرسی و خۆیشی شتێکی دەهۆنییەوە و یەکسەر دەستی بە چیرۆک گێڕانەوە دەکرد."

"ئەم نیگارەی مردنت بۆ کتێبی زاوام کێشاوە. بۆچی بۆ ئەویشت کێشا؟"

"ئەمە، وەک ئەوەی چیرۆکبێژ دەیویست، لە نیگارێک بترازێت، شتێکی تر نەبوو. بەڵام نەک بەخۆ ماندووکردنەوە وەک بۆ ئەوەی بۆ کتێبی زاوات دەمکرد، زۆر بەخێرایی و چەشنی ئەوەی دەستم دەیخواست، کێشام. ئەوانی تریش بەهەمان شێوە، لەوانەیە ئەو نیگارانەی بۆ کتێبی نهێنیی زاوات کێشابوویان، هەر بۆ گاڵتە و ڕابواردن قەبەتر و سادەتر بۆ چیرۆکبێژیان کێشابێت."

پرسی: "کێ ئەسپەکەی کێشاوە؟ ئەوەی کونی لووتی بڕاوە."

چراکەم نزیک خستەوە و بەسەرسامی سەیری نیگاری ئەسپەکەمان کرد. وەک ئەو نیگاری ئەسپە دەچوو کە بۆ کتێبی زاوای کێشرابوو، بەڵام خێراتر و بێ بایەختر و بۆ چێژێکی بێ نرختر کێشرابوو. دەتگوت کەسێک هەر بەوەندەوە نەگیرساوەتەوە پارەیەکی کەم بدات بە نیگارکێش و هەردوو پێی لێ بکات بە کەوشێکدا، بگرە زۆری بۆ هێنابوو نیگاری ئەسپێکی قەبەتر و دیار بوو هەر ڕێک لەم سۆنگەیەشەوە ناچاری کردبوو نیگاری ئەسپێکی زیندوو بکێشێت.

گوتم: "لەقلەق لە هەموو کەسێک باشتر دەزانێت کێ نیگاری ئەم ئەسپەی کێشاوە. ئەو بوودەڵەی لەخۆبایییە، لەبەرئەوەی بێ گوێگرتن لە قسە و قسەلۆکی نیگارکێشان ناتوانێت بژی، هەموو ئێوارانێک دەچێتە قاوەخانە. دڵنیام لەوەی لەقلەق ئەم نیگاری ئەسپەی کێشاوە."

# 56

## پێم دەڵێن لەقلەق

پەپوولە و قەرە لە نیوەی شەودا هاتن، یەک بەیەکی نیگارەکانیان لەسەر زەوی بڵاو کردەوە و داوایان لێ کردم پێیان بڵێم کام نیگارم بۆ کێ کێشاوە. بە منداڵی گەمەی "کڵاو هی کێیە"مان دەکرد؛ ئەمەش لەوە دەچوو: لەسەر کاغەز نیگاری کڵاوی مەلا، ئەفسەر، ژن، جەلاد، دەفتەردار و نووسیار دەکێشرا و داوا دەکرا ئەوانە و کۆمەڵێک ناوی نەبیندراوی سەر کاغەزێکی هەڵگەڕاوە یەک بخرێت.

گوتم خۆم نیگاری سەگەکەم کێشاوە. گشتمان چیرۆکیمان بۆ چیرۆکبێژی نامەردانە کوژراو گێڕاوەتەوە. ڕوونم کردەوە ئەو نیگاری مردنەی وا ئێستا تیشکی چراکە بەسەریەوە دەلەرێتەوە، دەستکردی ئەم پەپوولە خۆشەویستەیە کە ئێستا خەنجەری لە ملم قایم کردووە. بیریشم دێت زەیتوون بەزەوقێکی زۆرەوە نیگاری ئیبلیسەکەی کێشابوو؛ لەوانەشە خوا لێخۆشبوو خۆی چیرۆکی بۆ داڕشتبێت. نیگاری دارەکە من دەستم پێ کرد، گشت ئەو نیگارکێشانەی دەچوونە قاوەخانە، گەڵاکانیان کێشاوە. هەر ئێمەش چیرۆکمان بۆ داڕشت. ڕەنگە سوورەکەش هەر وا بوو؛ دڵۆپەیەکی سوور کەوتبووە سەر کاغەزێک؛ چیرۆکبێژی ڕژد دەیگوت جا ئەمە تابلۆی لێ پەیدا دەبێت؟ سووری زیاترمان بەسەردا چۆڕاند، دواتر سەرجەم نیگارکێشان هەر بەکێشانی شتی سوورەوە لە گۆشەیەکی نیگاردا ڕانەوەستان، بگرە دەستیان کرد بە گێڕانەوەی چیرۆکی ئەو شتانەی کێشابوویان تا چیرۆکبێژ دایبڕێژێتەوە و بۆ ئێمەی بگێڕێتەوە. ئەم ئەسپە جوانە، دەستەکانی خۆش بن،





زەیتوون کێشای. بیریشم کەوتەوە پەپوولە نیگاری ژنە خەمگینەکەی کێشابوو. لەو ساتەدا پەپوولە خەنجەرەکەی لەسەر قوڕگم هەڵگرت و بە قەرەی گوت بەڵێ ئێستا بیری کەوتەوە خۆی نیگاری ژنە جوانەکەی کێشاوە. پارەکەی بازاڕ هەموومان و دوو عەوداڵەکەش، بێگومان زەیتوونی بەڕەچەڵەک عەوداڵی قەلەندەر کێشاویەتی. مەزەبی ئەمانە پشت بەدەرۆزەکردن و گاینی کوڕی جوان دەبەستێ و "أوحدالدین کرمانی"ی شێخی ئەمانە دووسەد و پەنجا ساڵ لەمەوبەر کتێبی ئەم کارەی نووسیوە و بە شیعر گوتوویەتی جوانیی خوای لە ڕووی جواناندا بینیوە.

ئەوان هەر لە سەبەتەوە تا سندووقیان کردبووەوە و بەچێژەوە قوماشی چۆغە، پەڕۆی بەنەخوێن، پشتوێنی هاوینەی لە ئاوریشمی هندستانی و لە خام چندراو و جاوی عەجەمی و کراسی بنیان دەپشکنی. ژێر ڕایەخ و نیمدەرەکان و نێوان پەڕەی نەخشێندراوی ئامادەکردووم بۆ کتێبی جۆراوجۆر و ناو پەڕەی کتێبە دەستنووسەکان دەگەڕان. منیش لەبەرئەوەی نەبادا ئەو شتەیان بۆ نەدۆزرێتەوە کە بۆی دەگەڕێن و بۆ ئەوەی لەپڕ نەچنە ژوورەکەی تر و ناچار نەبم دەستم بچێتە خوێنیان، دەمگوت: مامۆستایانی نیگارکێشی برام، زۆر بمبوورن لەبەر پەرش و بڵاویی ناو ماڵەکەم، خافڵگیر کراین. نە توانیمان قاوەیەکی عەنبەرینتان بدەینێ و نە بۆمان کرا نارنجی شیرینتان بۆ دەربێنین، چونکە ژنەکەم لە ژوورەکەی تر نووستووە.

سەرباری ئەوەش ددانی پێدا دەنێم چێژم وەرگرت لەوەی وەک ئەوەی لێیان بترسم، هەڵسوکەوتم دەکرد: هونەری نیگارکێش پشت بەوە دەبەستێ نیگارکێش هەم فرە بەوردی سەرنج لە جوانیی ئەم دەمەساتە بدات و سەرجەم شتەکان بەتەواوی وردەکارییەوە بەهەند وەربگرێت و هەم وەک ئەوەی هەنگاوێک بۆ دواوە بهاوێژێت و سەیری ئاوێنە بکات، مەودا و ماریفەتی گاڵتەیەک بخاتە نێوان ئەم دەمەساتە و دنیای زۆر بەهەندگرتووی خۆیەوە.

بەمجۆرە لە وەڵامی پرسیاری ئەواندا گوتم: بەڵێ، لە کاتی پەلامارەکەی پیاوانی مەلای ئەرزەڕوومیدا ئاپۆڕەیەک لە قاوەخانە بوو. لە ژوورەوە، بە من و زەیتوون، ناسری هێڵکێش، جەمالی خۆشنووس، دوو گەورە شاگردی نیگارکێشی لاو، ئەو

نیگارکێشە لاوانەی ئێستا لەگەڵ ئەواندا هەڵدەستن و دادەنیشن، ڕەحمیی شاگردی جوانی جوانان، چەند شاگردێکی تری شۆخ، شاعیر، سەرخۆش، ئەفیۆنکێش، شەش حەوت کەسی دەستەی عەودالآن و بەو کەسانەی ترەوە کە توانیبوویان قاوەچی ڕازی بکەن و تێکەڵی ئەم ئاپۆڕە کامەران و نوکتەبازە بن، نزیکەی چل کەسێک دەبووین. گێڕامەوە و گوتم گاڤێک پەلامار دەستی پێ کرد، شپرزەیییەک پەیدا بوو، ئەو ئاپۆڕە بێتامەی شەیدای بێ ئەدەبی کە قاوەچی کۆی کردبوونەوە، بەشپرزەیی و بەخۆ بەتاوانبارزانینەوە لە دەرگاکانی پێشەوە و پاشەوەی قاوەخانەوە هەڵهاتن و کەس ئەقڵی نەچوو بۆ ئەوەی مەردانە بەرگری لە چیرۆکبێژی پیر و داماوی لەبەرکەری جلوبەرگی ژن بکات. ئایا بەمە خەمگین دەبووم؟ بەڵێ. چاوم بڕیە ناو چاوی پەپوولەی کوشتەی دەستی ئیرەیی و چاو بەفرمێسک و حاڵ وەک حاڵی کوڕانی خرپن و مێشک بچووکی چەشنی مێشکی باڵندە و گوتم من، شێوەساز مستەفا، کە سەرتاپای ژیانی خۆم لە ناخەوە بە نەخش داوە و ناوەکەی ترم لەقلەقە، بەپێویستی دەزانم هەموو ئێوارانێک لەگەڵ برایانی نیگارکێشمدا لە شوێنێک دابنیشم و دەمەتەقێ و گاڵتەوگەپ بکەم و وشەی جوان و شیعر و وتەی توێکڵدار بڵێم. ئەم پەپوولەیەی ئێوە، کە چاوانی هێشتا وەک چاوی منداڵ جوانن، لە سەردەمی شاگردیدا جوانێکی هەست ناسک و پێست نەرم بوو.

بەمجۆرە، دیسان لە وەڵامی ئەواندا گێڕامەوە و گوتم: چیرۆکبێژی بەساڵاچوو شار بەشار و گەڕەک بەگەڕەک دەگەڕا و کاری پەیدا دەکرد. لە ڕۆژی دووەمی چیرۆک گێڕانەوەی ئەمدا لەو قاوەخانەیەی کە نیگارکێشان ڕوویان تێ دەکرد، نیگارکێشێک، لەوانەیە سەرخۆشی قاوەش بووبێت، بۆ گاڵتە نیگارێکی بە دیواردا هەڵواسی. چیرۆکبێژی چەنەباز لە بەرامبەر ئەمە و هەر بۆ خۆشی، وەک ئەوەی خۆی سەگی ناو نیگارەکە بێت، دەستی بە قسان کرد. دوای ئەوەی ئامادەبووان ئەمەیان زۆر پێ خۆش بوو، ئیدی هەر ئێوارەیەک نیگارکێشێک نیگارێکی دەکێشا و شتێکی بەگوێی چیرۆکبێژدا دەچرپاند و بەمجۆرە درێژە بە گاڵتەوگەپ درا. دەرزی ئاژنکردنی مەلای ئەرزەڕوومی لەلایەن چیرۆکبێژەوە، هەم ئەو نیگارکێشانەی دڵخۆش دەکرد کە لە تووڕەیی و هەڵچوونی مەلا دەترسان و هەم بڕێکی زۆر کڕیاری نوێی بۆ قاوەخانە ڕادەکێشا، بۆیە قاوەچیی ئەدرنەییش هانی دەدا.

قەرە و پەپوولە گوتیان لە پەلاماردانی ماڵی خاڵیی زەیتوونی براماندا دەستیان بەسەر ئەم نیگارانەی بەردەستماندا، کە چیرۆکبێژ هەموو ئێوارانێک لە پشت خۆیەوە هەڵی دەواسین، گرتووە و لە ڕا و لێکدانەوەی منیان پرسی. گوتم پێویست بە لێکدانەوە ناکات، قاوەچیش وەک زەیتوون عەودالێکی قەلەندەر و نامەردێکی سواڵکەر و دز و نامۆ بوو. گوتم زەریف ئەفەندیی سادە و ساویلکە لە بەرامبەر قسەکانی مەلا ئەفەندیدا مووی لەشی دەبوو بە نەشتەر و بەتایبەتیش زراوی لە وتارەکانی هەینی تۆقیبوو، چووە لە کن ئەرزەڕوومییەکان گازندەی لەوانەی قاوەخانە کردووە. گوتم یاخۆ بەئەگەری زۆر، کاتێک زەریف ئەفەندی هوشیاری کردوونەتەوە و پێی گوتن کاری وا مەکەن، زەیتوونی سەر هەمان ڕێبازی قاوەچی، بێبەزەییانە زەڕکاری داماوی کوشتووە. پیاوانی ئەرزەڕوومیش بەم کارە تووشی هەڵچوون دەبن، پێ دەچێت زەریف ئەفەندی باسی کتێبەکەی زاوای بۆیان کردبێت و لەوانەیە ئەوانیش زاوایان بە لێپرسراوی کوژرانی زەریف ئەفەندی زانیبێت و لەو سۆنگەیەوە کوشتوویانە. ئەمڕۆش –تۆڵەسەندنەوەی دووەم– هەڵیان کوتایە سەر قاوەخانەکە.

پەپوولەی خڕیلە و قەرەی بەدەربەست (ئەو لە خێو دەچوو) گشت قەباغێکیان کردەوە و هەرچی بەردێک هەبوو هەڵیاندایەوە و بەچێژەوە شتومەکەکانی منیان بەسەریەکدا شێواند، بەڵام داخۆ تا چ ڕادەیەک بایەخیان بە گێڕانەوەکانی من دەدا؟ کاتێک دەستیان بە جزمە و زرێ و کەرەسەی شەڕی ناو سندووقە دار گوێزەکەدا گێڕا، ئیرەیی پێبردنێکم لە ڕووی منداڵانەی پەپوولەدا بەدی کرد و دیسان بە شانازییەوە هەمان شتم ڕاگەیاند هەمووان زۆر باش دەیزانن: من یەکەم نیگارکێشی موسڵمانم لەگەڵ سوپا چوومەتە شەڕ و بەوردی سەرنجم داوە لە ئاگری تۆپ، کەلووی قەڵاکانی دوژمنان، ڕەنگی جلوبەرگی سەربازانی گاور، ڕاکشانی تەرمی کوژراوان و کەڵەکەکردنی کەللەی سەر بەدرێژاییی ڕووباران و ڕیزبەستنی سوارەی زرێپۆش و هێرشبردنیان و ئەوەی بینیوومە، لە زەفەرنامەکاندا کێشاومە.

پاش ئەوەی پەپوولە داوای لێ کردم پێشانی بدەم چۆن زرێیەکەم لەبەر دەکەم، بێ دواکەوتن کورتەکی بە کەوڵی کەروێشکی ڕەش بەر تێگیراو، کراس و شەرواڵ و

دەرپێم داکەند. پێم خۆش بوو لەبەر ڕووناکیی ئاگردانەکە سەریان دەکردم. ئەو دەرپێ درێژ و پاکەی کە لەژێر زرێوە دەمپۆشی و، کراسی ئەستووری لە چۆخە چندراو کە ڕۆژانی سارد لەژێر زرێوە لەبەرم دەکرد، لەبەر کرد و پاشان گۆرەویی لە خووری چندراو و چەکمەی لە پێستی زەرد دروستکراوم لە پێ کرد و پووزەوانەم بەست. زرێم لە زرێدان دەرهێنا و بەچێژەوە لە سنگم بەست، پشتم لە پەپوولە کرد و وەک ئەوەی فەرمانم بە لاوانی خزمەتکار دابێت، زرێیەکەم لە پشتەوە توند پێ گرێ دا و وەک ئەوەی فەرمانی پێ بدەم، دوام لێ کرد قۆڵەکانیشم بۆ ببەستێ. دوای ئەوەی بازووبەندەکانم لە قۆڵ کرد، دەستەوانەم لە دەست کرد، شمشێربەندی لە تووکی حوشتر دروستکراوم لە ناوقەدی خۆم بەست و دواجاریش ئەو کڵاوزرێ شین تێرەم پۆشی کە تەنیا لە بۆنەکاندا لەسەرم دەکرد. بە لە خۆباییبوونەوە گوتم لەمەودوا جڤاتەکانی شەڕ هەرگیز وەک ئەوەی لە ڕابردوودا هەبووە، ناکێشرێن. گوتم ئیدی ئەوە نابێت نیگارکێش جارێک بە ڕووی پشتەوە و جارێک بە ڕووی پێشەوەی هەمان قاڵب نیگاری سوارەی دوو لەشکری ڕێکوپێک لە بەرامبەر یەکتردا بکێشێت. لەمەودوا لە نیگارخانەکانی ئالی عوسمان نیگاری جڤاتەکانی شەڕ، وەک ئەو لەشکرانەی من دیومن و نیگاریانم کێشاوە، بەتێکەڵکردنی ئەسپ و زرێ و تەرمی خەڵتانی خوێنەوە دەکێشرێن.

پەپوولە بەئیرەیی پێبردنەوە گوتی: "نیگارکێش ئەو شتەی خۆی دەیبینێت نا، ئەو شتە دەکێشێت کە خوا دەیبینێت."

گوتم: "بەڵێ، بەڵام ئاشکرایە خوای گەورە شتە بینراوەکانی ئێمە دەبینێت."

پەپوولە وەک ئەوەی گلەم لێ بکات، گوتی: "هەڵبەتە خوا شتە بینراوەکانی ئێمەش دەبینێت، بەڵام ئەو شتەکان وەک ئێمە نابینێت. ئەو شەڕەی ئێمە لەبەر سەرسام بوون بە تێکەڵی و پێک هەڵپڕژاو دەیبینین، ئەو زۆر لە نزیکەوە و وەک دوو لەشکری ڕێک ڕیزبووی بەرامبەر یەکدی دەیانبینێت."

بێگومان وەڵامم هەبوو. ویستم بڵێم: "با باوەڕ بە خوا بهێنین و تەنیا نیگاری ئەو شتانە بکێشین کە پێشانمان دەدات، نەک ئەوانەی پێشانمان نادات." بەڵام بێدەنگ بووم، وەلێ نەک لەبەرئەوەی ترسم هەبێت پەپوولە من بەلاساییکردنەوەی فەرەنگ



تاوانبار بکات، یاخۆ بەهۆی ئەوەی بەبیانووی تاقیکردنەوەی زرێیەکەمەوە دڵڕەقانە خەنجەری بە خوودەکەم و پشتمدا دەکێشا. وام لێک دەدایەوە تەنیا بەخۆڕاگرتن و قازانجکردنی ئەم گەمژە چاو جوانە و قەرە دەتوانم لە تەپکە و داوی زەیتوون ڕزگارم بێت.

هەر هێندەی حاڵی بوون ئەو شتەی بۆی دەگەڕێن، لێرە بۆیان نادۆزرێتەوە، ئاشکرایان کرد بۆچی دەگەڕێن. گوتیان نیگارێک هەیە بکوژی نامەرد دزیویەتی... گوتم ئێ خۆ پێشتر بۆ ئەم مەبەستە ماڵ پشکنرا و لەوە بەدواشەوە بکوژی ئاوەزیاو نیگارەکە لە شوێنێکی هیچ کەس دەست پێنەگەیشتوو دەشارێتەوە (زەیتوونم لە خەیاڵدا بوو)، بەڵام ئایا تا چ ڕادەیەک سەرنجیان لە قسەکانم دا؟ قەرە دوور و درێژ باسی نیگاری ئەسپە لووت بڕاوەکە و لەبەرەوە بەسەرچوونی ئەو سێ ڕۆژە مۆڵەتەی کرد کە سوڵتانمان داویەتی بە مامۆستا عوسمان. کاتێک من پێم داگرت لەسەر ئەو شتەی ئاماژە بۆ ئەسپە کونە لووت بڕاوەکان دەکات، قەرە چاوی بڕییە ناو چاوم و گوتی: "مامۆستا عوسمان سەرەداوێکی دۆزیوەتەوە و کێشانی نیگارەکەی بە زەیتوونەوە گرێ داوە، بەڵام لە چاوچنۆکیی تۆ دڵنیایە و هەرە زیاد گومان لە تۆ دەکات."

لە یەکەم نیگادا وا دەهاتە بەرچاو هاتبنە ئێرە بۆ ئەوەی باوەڕ بێنن من بکوژم و بیانەوێت ئەمە بسەلمێنن، بەڵام بەبڕوای من ئەمە هۆی تەواوی هاتنیان نەبوو. لەبەر تەنیایی و بێچارەییشیان بوو کە لە دەرگای منیان دابوو. کاتێک دەرگام کردەوە، ئەو خەنجەرەی پەپوولە لە منی بەرز کردبووەوە، دەلەرزی. هەم زراویان لەوە چووبوو ئەو بکوژە نامەردەی، کە چەندی دەیانکرد بۆیان نەدەدۆزرایەوە، بەدەم زەردەخەنەی دۆستێکی کۆنەوە بیانخزێنێتە گۆشەیەکەوە و سەریان بڕێت، هەم لە ترسی ئەوەی سوڵتانمان و گەورەی خەزنەداران ڕێک کەوتبن و ئەمان ڕادەستی ئەشکەنجەدەران بکات خەویان زڕابوو و ئاپۆڕەی ئەرزەڕوومییەکانی دەرەوەش ورەی ڕووخاندبوون. لەم شپرزەییەدا دەیانویست من دۆستی ئەوان بم. بەڵام مامۆستا عوسمان تەواو پێچەوانەی ئەمەی پێ گوتبوون. ئێستا، وەک ئەوەی ئەوان لە دڵ و گیانەوە خۆزگەیان دەخواست، پێویست بوو بە نازکییەوە پێشانی ئەوانی بدەم کە پێچەوانەی قسەکانی

مامۆستا عوسمان ڕاستە.

ئەگەر بگوترایە مامۆستا عوسمان هەڵەیە و خەڵەفاوە، بەواتای ئەوە بوو یەکسەر پەپوولەم دەخستە خانەی دژبەری خۆمەوە، چونکە هەستم دەکرد هێشتا لە چاوانی تەماوی و برژانگجوانیی پەپوولەدا، کە بە خەنجەری دەستی دەیکێشا بە زرێی بەرمدا، گڕی خامۆشبووی ئەڤینی ئەوم بۆ مامۆستا عوسمان دەبینی و ئەم وەک هەمیشە نازداری مامۆستا بوو. لە ساڵانی گەنجیمدا نزیکیی نێوان ئەم دووانە، وەستا و شاگرد، لەناو نیگارکێشانی تردا بە ئیرەیی پێبردنەوە دەرزی ئاژن دەکرا، بەڵام ئەمان بێ باک بوون، بە بەرچاوی هەمووانەوە تا هێزیان تێدا دەما، چاویان دەبڕییە ناو چاوی یەکتر، بۆنی یەکیان دەکرد و دەواتر مامۆستا عوسمان دڵڕەقانە ڕای گەیاند قەڵەم ڕەوانترین و فڵچەی ڕەنگ ساغڵەمترین کەس پەپوولەیە. ئەم بڕیاردانە زۆربەی کات ڕاست بوو و ڕێی خۆش دەکرد بۆ ئەوەی نیگارکێشانی بەرچاوتەنگ قەڵەم، فڵچە، قوتووی مەرەکەب و قەڵەمدان بە پێش و پاشخستنی وشەی لەبن نەهاتوو، بۆ کینایەی بێ ئابڕوو و هێمای ئیبلیسانە و ئاماژەی ڕووت و ئاشکرا بەکار بهێنن. بۆیە من تاکە کەسێک نەبووم ئەم ڕۆژانە بانگەشەی ئەوەم بڵاو کردبێتەوە کە مامۆستا عوسمان خوازیارە لە دوای خۆی، پەپوولە بکرێت بە سەرۆکی نیگارخانە. ئەو کاتانەی پەپوولە باسی شەڕانگێزی و سەرکێشی کەللەڕەقیی منی بۆ کەسانی ترد دەکرد، ماوەیەکی درێژ بوو تێ گەیشتبووم ڕاستییەکەی ئەم شتانە لەژێر سەری مامۆستا عوسماندایە. لە بۆچوونیدا سەبارەت بەوەی من لە زەیتوون و پەپوولە زیاتر مەیلم لە شێوازەکانی فەرەنگە و ناڵێم "مامۆستایانی کۆن هەرگیز نیگاری لەمجۆرەیان نەدەکێشا" و پشت لە داخوازیی نوێی سوڵتانمان ناکەم، مافدار بوو.

دەزانم دەتوانم لەم خاڵەدا هاوکارییەکی پتەو لەگەڵ قەرەدا بکەم: چونکە زاوای نوێ و بەجۆشمان، تەواوکردنی کتێبەکەی زاوای تەنیا بەمەبەستی بەدەستهێنانی دڵی شەکوورەی شۆخ و بۆ پێشاندانی توانای جێگرتنەوەی باوکی نییە، بگرە دەبێت بۆ ئەوەشی بێت بەقەدبڕ خۆی بگەیەنێتە سوڵتانمان و خۆی لەبەرچاوی ئەواندا شیرین بکات.



بەمشێوەیە، من سەری پەتەکەم لە شوێنێکەوە بەدەستەوە گرت کە ئەوان هەرگیز چاوەڕێی نەبوون: بە گوتنی: کتێبەکەی زاوا پەرجووێکی کامەرانیی بێ هاوتا و بێ وێنەیە، سەری بابەتم کردەوە. ئەم شاکارە، ئەگەر وەک بەوجۆرەی سوڵتانمان فەرمانی فەرمووە و بەپێی ویستی زاوا ئەفەندیی خوا لێخۆشبوو تەواو بکرێت، ئەوا سەرانسەری دنیا پەنجە بۆ هێز و دەوڵەمەندیی سوڵتانی عوسمانی و بۆ ماریفەت و زەرافەت و هونەری ئێمەی هونەرمەندانی عوسمانی دەگەزێت. ئەوان هەم لە ئێمە و هێز و دڵڕەقیمان دەترسن، هەم سەیری خەم و دەرد و ئەو شتانەی لە شێوازەکانی فەرەنگ وەرمان گرتووە و ڕەنگە شۆخ و شەپاڵەکانمان و تێڕوانینمان بۆ سادەترین وردەکاریی دەگمەن دەکەن و بەترسەوە هەست بەو شتە دەکەن کە ژیرترین سوڵتانیش بەئاستەم پەی پێ دەبات: ئێمە هەم لە شوێنێکی ئەو دنیایەی ناو نیگارەکەی دەستکردی خۆمان و هەم زۆر دوور، لە جێیەکی نێوان مامۆستایانی کۆندا ڕاوەستاوین.

پەپوولە، سەرەتا بۆ ئەوەی بزانێت زرێیەکەم ڕاستەقینەیە یان نا، وەک منداڵ پیایدا دەکێشا، پاشان چەشنی برادەرێک کەوتە لێدانی بۆ تاقیکردنەوەی پتەوییەکەی، دواتریش وەک داخ لە دڵێک، کە نەیتوانی بە دوو بیانووەکەی تر بەجۆرێک زرێیەکەم کون بکات و ئازارم پێ بگەیەنێت، کەوتە لێدانم. ڕاستییەکەی، تێ دەگەیشت من لەو هونەرمەندترم و لەوەش زیاتر، دەبوو بەئازارەوە هەستی بکردایە مامۆستا عوسمانیش ئەم ڕاستییە دەزانێت. پەپوولە لەبەرئەوەی لەپای ئەو لێهاتووییەی خوا پێی دابوو وەستایەکی بێ وێنە بوو، ئیرەیی پێبردنەکەی، هێندەی دی مایەی شانازی بوو بۆ من: لەبەرئەوەی من وەک ئەو بە گرتنی قامیشی وەستام نا، بگرە بەهێزی قامیشی خۆم بووبووم بە وەستا، هەستم دەکرد دەتوانم پێی بسەلمێنم من مامۆستای ئەوم.

دەنگم بەرز کردەوە و گوتم چ جێی داخە کەسانێک هەن دەخوازن ئەم کتێبە پەرجووەی سوڵتانمان و زاوا تێک بدەن. مامۆستا عوسمان باوک و مامۆستای هەموومان بوو؛ گشت شتێک لە ئەوەوە فێر بووین، بەڵام لە گەنجینەی سوڵتانمان سەرەداوی دۆزیوەتەوە و دوای حاڵیبوون لەوەی کە بکوژی نامەرد زەیتوونە، لە

سۆنگەی هۆیەکی نەزانراوەوە هەوڵی شاردنەوەی داوە. گوتم دڵنیام زەیتوون مادام لە ماڵی خۆی پەیدا نەکراوە، کەواتە لە تەکیەی قەلەندەرانی چۆڵکراوی نزیک فەنەرقاپی خۆی حەشار داوە. بیرم خستنەوە ئەم تەکیەیە شوێنێک بووە بۆ ڕیسوایی و بێ ڕەوشتی، بەڵام نەک لەبەر ئەم هۆیە، بگرە لە سەردەمی باپیری سوڵتانماندا بەهۆی شەرە نەبڕاوەکانی عەجەمەوە داخراوە و زەیتوونیش سەردەمانێک شانازیی بە "ئێشکگرتن" بەدیار ئەو تەکیە داخراوەوە دەکرد. ئەگەر متمانەیان پێم نەبووایە و بیریان بچووایە بۆ ئەوەی تەڵە و داو لە پشت قسەکانمەوە بێت، ئەوا خەنجەر بەدەستی ئەوانەوە بوو و دەیانتوانی هەر لەوێدا بە سزای خۆم بگەیەنن.

پەپوولە دوو گورزی تری گرانی خەنجەری تێ سرەواندم، لەو گورزانەی کەم زرێ هەیە بەرگەیان بگرێت. قەرە پشتیوانیی لە قسەکانی من دەکرد، پەپوولە ڕووی تێ کرد و وەک منداڵ بەسەریدا قیڕاند. لە پشتەوە لێی نزیک بوومەوە و قۆڵی ناو زرێیەکەم لە ملی ئاڵاند و بەرەو لای خۆم بەکێشم کرد. بەدەستەکەی ترم قۆڵیم بادا و خەنجەری لە دەست کەوتە خوارەوە. ڕاستییەکەی، نە بەتەواوی شەڕمان دەکرد و نە گەمە. چیرۆکی جڤاتێکی شانامەم گێڕایەوە. ئەم جڤاتە کەم دەزانرێت:

بەمجۆرە دەستم بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە کرد: "لە ڕۆژی سێیەمی ڕووبەڕووبوونەوەی هەردوو لەشکری ئێران و توووران بە سەرجەم زرێ و کەرەسەی شەڕەوە لە دامێنی چیای هاماراندا، توورانەکان شەنگیلی لێهاتوو دەنێرنە مەیدان بۆ ئەوەی بزانن ئەو شەڕوانە ڕازدارەی ئێرانی کێیە کە هەر ڕۆژەی شەڕوانێکی گەورەی توورانی دەکوژێت. شەنگیل، شەڕوانی ڕازدار بۆ مەیدان بانگ دەکات و ئەویش پەسەندی دەکات: زرێی سەربازانی سوپای هەردوولا لەبەر تیشکی خۆری نیوەڕۆ بریسک و باسکیانە و خۆیشیان هەناسە لە خۆیان دەبڕن و سەیر دەکەن. هەردوو ئەسپی زرێ لەبەری دوو شەڕوانەکە هێندە بەخێرایی بەیەکدا دەچن، تیشکی هەڵقولاوی زرێیەکان پێستی ئەسپەکان دەسووتێنێت. شەڕ ماوەیەکی درێژی خایاند. شەڕوانی توورانی تیری هاویشت، شەڕوانی ڕازداری ئێرانی شمشێر و ئەسپەکەی زۆر باش بەکار هێنا و دواجار، دەسپێک کلکی ئەسپی شەڕوانی توورانیی گرت و ئەوی بەردایە خوارەوە. ئەو هەڵهات و ئەمیش خۆی گەیاندێ و لە پشتەوە بە زرێی



بەرییەوە باوەشی پێدا کرد و ملی گرت. شەڕوانی توورانی خولیای بوو بزانێت شەڕوانی ڕازدار کێیە، دۆڕانی خۆی قەبووڵ کرد و بە بێچارەیی ئەو شتەی پرسی کە چەندین ڕۆژ بوو بەپەرۆشەوە پرسیار دەکرا: –تۆ کێیت؟– شەڕوانی ڕازدار گوتی: بۆ تۆ ناوم مردنە.– ئەوە کێیە؟"

پەپوولە وەک منداڵ بەخۆشییەوە گوتی: "ڕۆستەمی داستانە."

لاملیم ماچ کرد. گوتم: "هەموومان ناپاکیمان لە مامۆستا عوسمان کردووە. ئێستا پێش ئەوەی ئەو سزامان بدات، پێویستە ئێمە زەیتوون بدۆزینەوە و ئەو ژەهرەی ناو خۆمان توورِ هەڵبدەین و بەباشی لە نێوان خۆماندا ڕێک بکەوین بۆ ئەوەی لە بەرامبەر دوژمنانی بەردەوامی نیگار و ئەوانەی خوازیارن بە چەقەنەیەک ڕادەستی ئەشکەنجەدانمان بکەن، پتەو ڕاوەستین. لەوانەشە بەگەیشتنمان بۆ تەکیەی چۆڵکراوی زەیتوون بۆمان ڕوون بێتەوە ئەو بکوژە بێ ویژدانە کەسێک نەبێت لە ئێمە."

پەپوولەی داماو ورتەی لە دەم نەهاتە دەر: چەند هونەرباز و دەمهەراش و پشت ئەستووریش بێت، ئەمیش چەشنی سەرجەم نیگارکێشانی تر و ئەوانەی سەرباری ئێرەیی بەیەکتربردن ناتوانن لەیەک دابڕێن، ڕاستییەکەی، لە چوونە دۆزەخ و بەتەنیاییمانەوە لەم دنیایەدا زراوی تۆقیبوو.

لە ڕێگای فەنەرقاپی، ڕەنگێکی زەردی سەوزباو و سەیر بە ئاسمانەوە بوو، بەڵام تریفەی مانگ نەبوو. دیمەنی شەوانی ئەستەنبوڵی پێکهاتوو لە داری سەروو، گوومەز، دیواری بەردین، خانووی تەختە و شوێنی سووتاوی، تەنیا لە ڕووی ئەم تیشکەوە بوو شوێنی خۆی بۆ هەستێکی نامۆیی چۆڵ کردبوو کە قەڵایەکی دوژمن لە کن مرۆڤ دەیورووژێنێت. دوای ئەوەی گەیشتینە بەرزایی، زۆر لە دواوە، لە شوێنێکی نزمی پشت مزگەوتی بایەزیدەوە ئاگرێکمان بینی.

لە تاریکاییی ئەنگوستەچاودا تووشمان بوو بە تووشی گالیسکەیەکی دوای گاوە تا نیوەی پڕ بوو لە فەردەی ئارد و ئەویش وەک ئێمە بەرەو شووراکان دەچوو. دوو ئاکچەمان دا و سوار بووین. قەرە نیگارەکانی پێ بوو، بەهوشیاری دانیشت. کاتێک درێژ بووم و سەیری ئەو پەڵە هەورە نزمانەم کرد، کە گڕی ئاگرەکە ڕووناکی

دەکردنەوە، یەکەم دڵۆپی باران کەوتە سەر خوودەکەم.

دوای ڕێبڕینێکی درێژ، لەو گەڕەکەی خۆی شەوان وەک چۆڵکراو دەهاتە بەرچاو، لە گەڕانماندا بۆ دۆزینەوەی تەکیەی چۆڵکراو هەرچی سەگی گەڕەک هەبوو، هەڵمان ساندنە سەرپێ. هەرچەندە لەناو چەند ماڵێکی بەردینەوە تیشکی چرای لەبەر ئێمە هەڵکراویشمان بینی، بەڵام دوای لێدانی چوار دەرگا، ئەوسا دەرگای چوارەم بە ڕووماندا کرایەوە. مامەیەکی پیری کڵاو لەسەر، کە لەبەر تیشکی چراکەی دەستیدا وەک ئەوەی خێوی بینیبێت سەیری ئێمەی دەکرد، بێ ئەوەی لووتی بداتە بەر بارانی لەو کاتەدا تاو سەندوو، ناوونیشانی تەکیەی چۆڵکراوی بۆ هەڵداین. بەچێژیشەوە لێی زیاد کرد و گوتی بەڵام ئازاری دەستی جنۆکەی خراپ و دێو و درنج و خێویش دەچێژن.

لە باخچەی تەکیە، بۆنی گەڵای ڕزیو و کپیی دار سەرووە لەخۆباییەکانی بێباک لە باران پێشوازییان لێ کردین: دەسپێک چاوم خستە سەر دیواری بەتەختە داپۆشراوی تەکیە و دواتریش لە درزی دەریوانەی پەنجەرەیەکەوە ڕوانیم و لەبەر تیشکی چرایەک سێبەری ترسناکی کەسێکم بینی نوێژی دەکرد، یان لاسایی نوێژ خوێندنی بۆ ئێمە دەکردەوە.



# 57

## پێم دەڵێن زەیتوون

ئایا ڕاست ئەوە بوو نوێژەکەم و ببڕم و دەستبەجێ هەستمە سەرپێ و دەرگایان لێ بکەمەوە، یاخۆ لەبەر تەواوکردنی نزا و پاڕانەوەکانم، ئەوانم لەبەر باران ڕابگرتایە؟ کاتێک حاڵی بووم بەدزییەوە تەماشام دەکەن، هیچ گوێم نەدایێ و تا کۆتایی نوێژی خۆمم خوێند. دەمێکیش دەرگام کردەوە و لەبەردەم خۆم پەپوولە و لەقلەق و قەرەی لەمەڕ خۆمانم بینی، هاوارێکی خۆشی لە قوڕگم هاتە دەر. بەو جۆش و خرۆشەوە ئامێزم بە پەپوولەدا کرد.

سەرم نا بە شانییەوە و بەدەم ناڵینەوە گوتم: "چیمان بەسەرهات، چی؟ چییان لێمان دەوێت؟ بۆچی دەمانکوژن؟"

جۆرێک لەو شپرزەییی دابڕانە بە ڕوویانەوە بوو کە بەدرێژاییی ژیانی نیگارکێشیم ناوبەناو بەڕووی وەستایانی نیگارکێشەوە دیبووم. تەنانەت لەناو تەکیەکەش لەیەکدی جیا نەدەبوونەوە.

گوتم: "مەترسن، دەتوانین چەندین ڕۆژ لێرە خۆمان بشارینەوە."

قەرە گوتی: "ترسی ئەوەمان هەیە ئەو کەسەی پێویستە لێی بترسین، لە نێوان خۆماندا بێت."

گوتم: "منیش چەندی بیر لەم بابەتە دەکەمەوە، ترس دام دەگرێت، لەبەرئەوەی منیش ئەو قسە و قسەڵۆکانەم بیستووە."

قسەی پاشملە لە پیاوانی سەرگەورەی پاسەوانەوە گەیشتووەتەوە دەستەی

نیگارکێشان گوایە پەردە لەسەر نهێنیی کوشتنی زەریف ئەفەندی و زاوای خوا لێخۆشبووت هەڵدراوەتەوە و دەگوترێت بکوژ یەکێکە لە ئێمە و وەک ئاشکراشە، ئێمە ڕووناکیی چاومان لەپێناو ئەو کتێبە دانا.

قەرە پرسیاری ئەوەی کرد داخۆ چەند نیگارم بۆ کتێبەکەی زاوای کێشاوە.

"یەکەمیان نیگاری ئیبلیس بوو. نیگاری ئیبلیسێکی ژێر زەویم بۆم کێشا لەوانەی مامۆستایانی دێرینی نیگارخانەکانی ئاکقۆیونلو بەزۆری دەیانکێشا. چیرۆکبێژ خۆی هاویشتە سەر ڕێگام؛ بۆ ئەویش نیگاری دوو عەودالّم کێشا. من پێشنیازم کرد ئەم نیگارە بخرێتە کتێبەکەی زاواتەوە، کارێکم کرد بڕوا بکات ئەم دەروێشانەش لە وڵاتی عوسمانی خاوەن پێگەی خۆیانن."

قەرە پرسی: "هەر هەمووی ئەوەندە بوو؟"

دوای ئەوەی گوتم گشتی هەر ئەوەندە بوو، قەرە چەشنی ئەوەی شاگردێکی بەسەر دزیکردنەوە گرتبێت، فێڵبازانە ڕووی لە دەرگا کرد، لە دەرەوە تۆمارێکی کاغەزی تەڕبووی بەر بارانی هێنا و وەک دایکە پشیلەیەک مەلی بریندار بۆ بێچووەکانی بهێنێت، خستییە بەردەستی هەر سێ ئێمەی نیگارکێش.

هێشتا هەر بەژێر باڵییەوە بوون، من ناسیمنەوە: ئەو نیگارانە بوون کەوا کاتی پەلامارەکەی ئەمشەو لە قاوەخانە دەستم دابوونێ و لەگەڵ خۆمدا هێنابوومن. هیچ نەمپرسی چۆن چوونەتە ماڵم و ئەمانەیان هێناوە. سەرباری ئەوەش، بەڕێزەوە دانە بەدانەی ئەو نیگارانەمان پێشان دا کە من و پەپوولە و لەقلەق پێکەوە بۆ چیرۆکبێژ کێشابوومان. بەمجۆرە ئەسپێک، ئەسپێکی زۆر جوان بە ملی خوارەوە لە تەنیشت نیگارەکانی تر مایەوە. باوەڕتان هەبێت بەهیچ جۆرێک لە کێشانی نیگارێکی ئەسپ ئاگادار نەبووم.

قەرە وەک مامۆستایەکی دار بەدەست گوتی: "تۆ ئەم نیگاری ئەسپەت کێشاوە؟"

گوتم: "من نەمکێشاوە."

"ئەدی ئەوەی ناو کتێبەکەی زاوام؟"

"ئەو ئەسپەش من نەمکێشاوە."



گوتی: "بە شێوازتدا ئاشکرا دەبێت تۆ کێشاوتە. بگرە مامۆستا عوسمانیش لەمە حاڵی بووە."

گوتم: "جا خۆ من شێوازم نییە. ئەمە بەشانازییەوە لە بەرامبەر بای هەڵکردووی ئەم ڕۆژانەدا نالّێم. بۆ سەلماندنی بێتاوانیی خۆیشم نییە، لەبەرئەوەی ئەگەر من خاوەنی شێوازی تایبەت بەخۆم بم، ئەمە بۆ من لە مرۆڤ کوشتنیش خراپترە."

قەرە گوتی: "تۆ جیاوازییەکەت هەیە لە مۆستایانی کۆن و کەسانی ترت جیا دەکاتەوە."

بزەیەکم بۆ کرد. دەستی کرد بە گێڕانەوەی ئەو شتانەی کە من پێم وابوو ئێوەمانان هەمووتان دەیزانن. فرە بەوردی گوێم ڕاگرت بۆ باسی: گەڕانی دووبەدووی سوڵتانمان و گەورەی خەزنەداران لە چارەیەک بۆ ڕاوەستاندنی تاوانەکان؛ دانی سێ ڕۆژ مۆڵەت بە مامۆستا عوسمان؛ شێوازی یاوەر؛ کونە لووتی ئەسپەکان؛ پەرجووی گەورەی چوونە ژوورەوەیان بۆ گەنجینەی ئەندەروون و بەڕاستی تەماشاکردنی کتێبە دەست پێ ڕانەگەیشتووەکان. لە ژیانی هەمووماندا کاتی وا هەیە هەر لەو ساتەی تێیدا دەژین تێ دەگەین لەمەودوا شتێکمان بەسەر دێت و تا ماوەیەکی درێژ لە بیری ناکەین: بارانێکی خەمگین دەباری. پەپوولە وەک ئەوەی داوای لێبووردن لە بارانەکە بکات، خەمگین دەهاتە بەرچاو و چنگی لە خەنجەر قایم کردبوو. پشتی زرێیەکەی لەقلەق لە ئاردا سپی بووبوو، چرایەکی بەدەستەوە بوو و چاوقایمانە بەرەو ناوەوەی تەکیە دەچوو. ئەم وەستا نیگارکێشانەی، کە سێبەرەکانیان چەشنی خێو بەسەر دیوارەکانی تەکیەوە دەگەڕان، برایانی من بوون و جا چەندیش خۆشم دەمویستن. هەستم بە شادمانی دەکرد لەپای ئەوەی نیگارکێشم.

لە قەرەم پرسی: "دەزانی دانیشتن لە هاوشانی مامۆستا عوسمان و چەندین ڕۆژ تەماشاکردنی شاکارەکانی مامۆستایانی کۆندا چ بەختەوەرییەکە؟ ئایا ماچی کردیت؟ دەستی بە ڕووی جوانتدا هێنا؟ دەستی گرتیت؟ شەیدا و سەوداسەری هونەر و زانیاریی وی بوویت؟"

قەرە گوتی: "مامۆستا عوسمان لەناو شاکاری مۆماستایانی کۆندا ئەوەی پێشان

دام کە تۆ شێوازێکی تایبەت بەخۆت هەیە. فێری کردم شێواز شتێک نییە نیگارکێش بە ئارەزووی خۆی هەڵی بژێرێت، بگرە ڕابردووی نیگارکێش و بیرەوەرییە لەبیرکراوەکانی ئەم کێماسییە شاراوەیە دەخاتە ڕوو. ئەوەشی پێشانم دا لەبەرئەوەی ڕێبازی کاری مامۆستایانی فەرەنگ ئیدی لە سەرانسەری دنیادا تەشەنەی کردووە، ئەو کێماسی و لاوازی و خەوشە نهێنییانەی سەردەمانێک شەرممان لێ دەکردن و دەمانشاردنەوە بۆ ئەوەی ئێمە لە مامۆستایانی کۆن دانەبڕێت، لەمەودوا بە -تایبەتمەندیی کەس- و -شێواز- ناودەبرێت و دێتە ئاراوە. بەهۆی ئەو گەمژانەی بەخۆیان دەنازن، دنیا لە ئێستا بەدواوە ڕەنگینتر، بەڵام فرە گەمژەتر و بێگومان لەوەش زیاتر چەوت دەبێت."

بە لەخۆ باییبوونەوە باوەڕهێنان بە قسەکانی خۆی، پێشاندەری ئەوە بوو قەرە خۆیشی یەکێک بێت لەو گەمژە و دەبەنگە نوێیانە.

پرسیم: "ئایا مامۆستا عوسمان توانی ڕوونی بکاتەوە بەدرێژاییی چەندین ساڵ نیگاری سەدان ئەسپی کونە لووت ڕاست و ڕەوانم بۆ کتێبەکانی سوڵتانمان کێشاوە؟"

"لەبەرئەوەی لەپای ئەو ئەڤینەی هەر لە سەردەمی منداڵیتانەوە پێتانی داوە و لەڕووی دارکاریکردنتانەوە هەم بووە بە باوکتان و هەم بە خۆشەویستتان، ئەویش ناتوانێت تێ بگات کە هەمووتانی بەخۆی و ئێوەشی لەناو خۆتاندا بەیەکدی چوواندووە. ئەو خوازیار بوو نیگارخانەی عوسمانی ببێت بە خاوەن شێوازی خۆی، نەک ئێوە. ئێوەش لە سایەی شەیدابوونتان بەو، کێماسییەکانی هەڵقولاوی هەناوی خۆتان و شتەکانی دەرەوەی قاڵب و جیاوازییەکانتان لەبیر دەکرد. تۆ ئەو کاتەی نیگارت بۆ کتێب و پەڕەی تری لای مامۆستا عوسمان ناپەسەند کێشا، هەر ئەو کاتەش ئەو نیگاری ئەسپەت کێشا کە ساڵانێکی درێژبوو لە هەناوتدا نووستبوو."

گوتم: "دایکی خوا لێخۆشبووم ژنێکی زۆر لە باوکم ئاوەزیاوتر بوو. ئێوارانێک لە ماڵ، نەک بەتەنیا لەبەر لێدانی مامۆستا عوسمان، بگرە لەتاو تێ هەڵدانی مامۆستایانی وشک و تووڕەی تر و ژانی ئەو ڕاستانەی چاودێر بۆ چاو ترساندمان لێمانی دابوو، دەگریام و دەمگوت ناتوانم جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ نیگارخانە. ئەو



دەمە دایکم گوتی لە دنیادا دوو جۆر مرۆڤ هەن: ئەوانەی بە منداڵانی لەژێر دارکاریکردندا چاوترسێن دەکرێن. دایکی خوا لێخۆشبووم دەیگوت ئەوانە هەمیشە بە چاوترساوی و چەوساوەیی دەمێننەوە، چونکە لێدان وەک ئەوەی ئارەزوو دەکرێت، ئیبلیسی هەناویان دەکوژێت. برێکی تری مرۆڤی بەختەوەر هەن دارکاریکردن ئیبلیسی هەناویان ناکوژێت، بگرە دەیترسێنێت و دەستەمۆی دەکات. ئەوانیش هەرگیز ئەم بیرەوەرییە تاڵەی سەردەمی منداڵیی خۆیان لەبیر ناکەن، بەڵام -دایکی خوا لێخۆشبووم دەیگوت ئەمە بەکەس نەڵێی- لەبەرئەوەی ڕادێن لەگەڵ ئیبلیس هەڵبکەن، لە گشت کەسێک باشتر دەتوانن فێڵباز بن، شتی نەزانراو بزانن، دۆست پەیدا بکەن، دوژمن بناسن، لە کاتی پێویستدا هەست بە فێڵ و تەڵەکەی دژ بەخۆیان بکەن و منیش ئەمەی لێ زیاد دەکەم و دەڵێم لە هەموو کەسێک باشتر دەسەڵاتیان بەسەر نیگارکێشیدا دەشکێت. بەبیانووی ئەوەی نەمدەتوانی نیگاری لک و چڵەکانی دارێک بەشێوەیەکی پێکەوە گونجاو بکێشم، مامۆستا عوسمان زللەی وای بەبن گوێمدا دەکێشا فرمێسکی ئازار لە چاوانم دەچۆڕان و دارستانێک دەهاتە بەرچاوم. بەتووڕەیی دەیکێشا بەسەرمدا و دەیگوت مەگەر کێماسییەکانی کۆتاییی پەڕەکە نابینیت؟ پاشان بە ئەڤینەوە ئاوێنەی بەدەستەوە دەگرت و بۆ ئەوەی لە خووگرتن بە چاوەوە ڕزگارم بێت، دەیخستە سەر پەڕەکە، گۆنای دەنا بە گۆنامەوە و لە نیگاری ناو ئاوێنەکەدا بەپێچەوانەوە دەبینرا و کەموکورتییەکان لەپڕ ئاشکرا دەبوون. ئەویش بە ئەڤینێکی وەها بەهێزەوە دانە بەدانەی کێماسییەکانی پێشان دەدام کە من هەرگیز نە ئەو ئەڤینەم لەبیر کرد و نە ئەو بەژن و باڵایەی. سەرلەبەیانیی ئەو شەوەی، کە لەبەرئەوەی بە بەرچاوی هەمووانەوە لێم زویر بووبوو و بە ڕاستە لە شانی دابووم و منیش بە شکۆی شکاومەوە لە نوێنی شەودا گریابووم، بەحەزەوە شانەکانی ماچ کردم و من بە ئەڤینەوە باوەڕم دەکرد ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبم بە نیگارکێشێکی ئەفسانەیی. ئەو نیگاری ئەسپە من نەمکێشاوە."

"ئێمە -مەبەستی لەقلەق بوو- لە تەکیە بۆ ئەو دوایین نیگارە دەگەڕێین کە ئەو بەنەفرەتبووەی بکوژی زاوام دزیویەتی. تۆ ئەو دوایین نیگارەت بینیبوو؟"

گوتم: "شتێک بوو نە سوڵتانمان و نە ئێمەی نیگارکێشانی پابەندی مامۆستایانی

کۆن و نە هیچ موسڵمانێکی پەیوەست بە ئاینی خۆیەوە پێی قووت دەچوو." ئەمەم گوت و بێدەنگ بووم.

ئەم قسەیەم لیکی زیاتری بە دەمیدا هێنایە خوارێ. لەگەڵ لەقلەق دەستیان بە گەڕان کرد و ناو تەکیەیان ژێر و ژوور کرد. یەک دوو جار تەنیا بۆ ئەوەی کارئاسانییان بۆ بکەم، چوومە کنیان. لە یەکێک لە ژووری دەروێشان، کە بنمیچەکەی دڵۆپەی دەکرد، ئاماژەم بۆ چاڵێک کرد و مەبەستم ئەوە بوو هەم تێی نەکەون و هەم ئەگەر بشخوازن، بیپشکنن. خۆم گەیاندنێ و کلیلی ژوورێکی بچووکم دانێ. ئەم ژوورە، سی ساڵ لەمەوبەر و پێش ئەوەی هاتوچۆکەرانی تەکیە تێکەڵ بە بەکتاشییەکان بن، ژووری بابۆ بوو. بەچێژەوە چوونە ژوورەوە، بەڵام کاتێک بینییان یەکێک لە دیوارەکان لایەکی نەماوە و باران ڕاستەوخۆ دێتە ژوورێ، بگرە هەر نەشیان پشکنی.

خۆشحاڵ بووم بەوەی پەپوولە نەیدابووە پاڵ ئەوان، بەڵام هەستم دەکرد ئەگەر بەڵگەیەک بۆ تاوانبارکردنم بدۆزرێتەوە، ئەویش دەچێتە ڕیزی ئەوانەوە. قەرە و لەقلەق ترسی ئەوەیان هەبوو مامۆستا عوسمان ڕادەستی ئەشکەنجەدەرانمان بکات و دەیانگوت پێویستە لە بەرامبەر ئەو پشتیوانی لەیەکتر بکەین و بەهێزەوە بەرەنگاری گەورەی خەزنەداران ببینەوە و ئەم هەڵوێستەش ئەوانی بەباشی لەیەکدی نزیک کردبووەوە. تێ گەیشتبووم ئەو شتەی پاڵی بە قەرەوە دەنا، بەتەنیا دۆزینەوەی بکوژی زاوای نەبوو تا وەک دیاریی ڕاستەقینەی زەماوەند پێشکێش بە شەکوورەی شۆخی بکات، بگرە خوازیار بوو نیگارکێشانی عوسمانی بخاتە سەر ڕێی مامۆستایانی فەڕەنگ و بەمجۆرەش دەیویست بەو چەردە پارە نوێیانەی لە سوڵتانمانەوە دێت و بەلاساییکردنەوەی مامۆستایانی فەڕەنگ (ئەمە شتێک بوو لە سووکایەتی پێکردن زیاتر، مایەی پێکەنین بوو) کتێبەکەی زاوای تەواو بکات. بێگومان حاڵیش دەبووم ئەو لەقلەقەی کەڵکەڵەی پۆستی گەورەی نیگارکێشان کەوتبووە سەری (چونکە هەموو کەسێک پێشبینیی دەکرد مامۆستا عوسمان خوازیاری پەپوولە بێت) و ئامادە بوو لە پێناوی بەخت گشت شتێک تاقی بکاتەوە، دەیەوێت لە ئاکامی ئەم تەپکە و داوەدا لە ئێمە و تەنانەت لە مامۆستا عوسمانیش ڕزگاری بێت.





تاوێک سەرم لێ شێوا. بەدەم گوێگرتنەوە لە باران، ماوەیەکی درێژ بیرم کردەوە. پاشان وەک ئەو کەسەی خوازیارە لە ئاپۆڕە بێتە دەرێ و سکاڵانامەی خۆی بداتە دەست فەرمانڕەوا یان گەورەی وەزیران کە لەو کاتەدا بەسەر ئەسپەوە بەوێدا تێ دەپەڕێت، بە ئیلهامێکی قووڵەوە لە لەقلەق و قەرە نزیک کەوتمەوە. لە هەیوانێکی تاریک و دەرگایەکی فراوانەوە بردمنە شوێنێکی ترسناک. ئەم شوێنە سەردەمانێک وەک چێشتخانە سوودی لێ وەردەگیرا. لێم پرسین داخۆ لە کەلاوەکەدا شتێکیان دۆزیوەتەوە یاخۆ نا؛ هەڵبەت بۆیان نەدۆزرابووەوە. هیچ پاشماوەیەکی ئەو دەفر و ئامان و تەندوورانەی سەردەمانێک بۆ چێشت لێنان بۆ کەسانی نامۆ و هەژار و دەسکورت بەکار دەهێنران، بەدی نەدەکرا. هیچ کاتێکیش هەوڵم نەدابوو ئەم شوێنە بەسامەی بە تەونی جاڵجاڵۆکە و تۆز و پاشەڕۆی سەگ و پشیلە و دار و پەردوو داپۆشراوە پاک بکەمەوە. لە ژوورێ، بایەکی وەک هەمووجار سەرچاوە نادیار، بەڵام بەگوڕ لە هەر چوار لاوە گڤەی دەهات، تیشکی چراکەی کز دەکرد و سێبەری ئێمەی جاروبار کاڵ دەکردەوە و ناوبەناویش تاریکی دەکرد.

گوتم: "گەڕان، بەڵام گەنجینەی نهێنیی منتان بۆ نەدۆزرایەوە."

بە لێڕاهاتنەوە تەنیشتی دەستی خۆم وەک گسک بەکارهێنا، خۆڵەمێشی ناو ئەو وێرانەیەی سی ساڵ لەمەوبەر وەک ئاگردان کەڵکی لێ وەرگیرابوو، لادایە لاوە، دەمەوانەی ئاسنی تەندوورەکە دەرکەوت، دەسکیم گرت و جیڕەم لێ هەستاند و کردمەوە. چراکەم لە پێش دەمی بچووکی تەندوورەکەدا ڕاگرت. هەرگیز ئەوەم لەبیر ناچێت لەقلەق پێش قەرە شاڵاوی برد و پڕی دایە کیسە چەرمەکانی ناو تەندوورەکە. خەریک بوو هەر لەوێ بیانکاتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی من گەڕامەوە ژوورە گەورەکە و قەرەش لە بەتەنیا مانەوە لەوێ ترسا و بەدوامدا هات، لەقلەقیش بە لنگە باریک و درێژەکانییەوە دوامان کەوت.

دوای ئەوەی بینییان گۆرەویی خووریی پاک و خاوێنم، شەرواڵەکەم، دەرپێی سوورم، نایابترین کورتەکم، کراسی ئاوریشمم، گوێزانەکانم، شانە و شتومەکەکانی ترم لە کیسە هاتنە دەرێ، ماوەیەک دوودڵی باڵی بەسەریاندا کێشا. قەرەش کیسەیەکی تری گرانی کردەوە و پەنجا و سێ زێڕی ڤینیسیایی، ئەو پەڕە زێڕانەی

ئەم ساڵانەی دوایی لە نیگارخانە دزیبووم، دەفتەری قاڵبی لە گشت کەس شاراوەم و پەڕە زێڕینە دزراوەکانی نێوان پەڕەکانی، کۆمەڵێک نیگاری بێ ئابڕوو کە بەشێکیان خۆم کێشابووم و بڕێکیشیانم لێرە و لەوێ کۆکردبووەوە، ئەنگوستیلەیەکی ئەقیقی یادگاری دایکی خۆشەویستم و چەپکێک لە قژی سپیی وی، باشترین قەڵەم و فڵچەکانمی لێ هاتە دەرێ.

بە لەخۆ باییبوونێکی گەمژانەوە گوتم: "ئەگەر من بکوژ بام وەک ئەوەی ئێوە بۆی دەچن، ئەوا ئەو دوایین نیگارە لە گەنجینەی شاراوەم دەهاتە دەرێ، نەک ئەم شتومەکانە."

لەقلەق پرسی: "بۆچی ئەم شتانەی لێ هاتە دەرێ؟"

"کاتێک پیاوانی سەرگەورەی پاسەوانان ماڵی منیان پشکنی –کتومت وەک ئەوەی ماڵی تۆشیان پشکنی–، بێ ئابڕووانە دووان لەم زێڕانەی، کە بەدرێژاییی تەمەن کۆم کردوونەتەوە، لە گیرفانی خۆیان نابوو. بیرم کردەوە لە ڕووی ئەو بکوژە نامەردەوە جاری تریش دەمانپشکنن و لەمەشدا مافدار بووم. ئەگەر ئەو دوایین نیگارە لەکن من بووایە، لێرە دەبوو."

گوتنی ئەم ڕستەیەی دواییم هەڵە بوو، بەڵام هەستم دەکرد داساکاون و ئیدی ترسی ئەوەیان لێم نییە لە سووچێکی تاریکی تەکیەدا دەست بنێمە بیناقاقایان. ئایا ئێوەش باوەڕتان پێم کردووە؟

بەڵام ئەمجارە بێ ئۆقرەییەک هەناوی داگرتبووم: ئەم هاوڕێ نیگارکێشانەی ناسیاوی سەردەمی منداڵیم، ئێستا بۆیان ئاشکرا بووبوو من ماوەیەکی درێژە ڕژدانە پارەم پاشەکەوت کردووە و زێڕم دزیوە و لەوەش خراپتر نیگارە بێ ئابڕووەکان و دەفتەرەکانی منیان دیبوو. بەڵام ئەمە هۆکاری ئەو شتە نەبوو کە لە ناوەوە هەناومی دەکرۆشت، بگرە بەڕاستی لەوە پەشیمان بووم سەرجەم ئەم شتانەم لە ساتێکی پەرۆشیدا پێشانی دۆستانی نیگارکێشم دابوو. دەشێت تەنیا ڕازی کەسێک، کە زۆر بێ سەروبەرانە و بەڕێکەوت ژیان بەسەرببات، بەو ئاسانییە هەڵبڕێژرێت.

زۆر دواتر قەرە گوتی: "سەرباری ئەوەش، ئەگەر مامۆستا عوسمان بێ ئەوەی هیچ



شتێک بڵێت و بێ ئەوەی کەسمان دەستنیشان بکات و بێ بایەخانە ڕادەستی سەرگەورەی پاسەوانانمان بکات، با بڕیار بدەین لەژێر ئەشکەنجەدا چ بڵێین."

هەستم دەکرد دۆشداماوی و بێزارییەکمان پێوە دیار بوو. لەقلەق و پەپوولە لەبەر تیشکی لاوازی چراکەدا سەیری نیگارە بێ پەردەکانی ناو دەفتەرەکەمیان دەکرد. لە دۆخێکدا بوون بێباک لە هەموو شتێک؛ تەنانەت تا ئەندازەیەکی ترسناک کامەران بوون. لەبەرئەوەی زۆر باش پێشبینیم دەکرد سەیری کام پەڕە دەکەن، هەستێکی بەتینی تەماشاکردنم لە کن پەیدا بوو و لە شوێنی خۆم هەستام، لە پشت هەردووکیانەوە ڕاوەستام و وەک ئەوەی سەرلەنوێ بیر لە یادگارییەکی فرە کۆنم بکەمەوە، بەخرۆشەوە و بێدەنگ سەیری نیگاری بێ ئابڕووی دەستکردی خۆم کرد. قەرەش هاتبووە نێوانمانەوە. لەبەرچی بوو، نازانم، بەڵام تەماشاکردنی ئەو نیگارە لەلایەن هەر چوارمانەوە لە قووڵاییی ناخدا ئاسوودەیی پێ دەدام.

دوای ساتێکی زۆر درێژ لەقلەق گوتی: "ئایا کوێر و چاوساغ هەرگیز دەبن بەیەک؟" ئایا سەرباری بێڕەوشتیی ئەو نیگارانەی سەیرمان دەکردن، مەبەستی ئاماژەکردن بوو بۆ چەژی بینینی خوا پێداومان؟ بەڵام لەقلەق هیچ کاتێک سەری لەم شتانە دەرنەدەکرد و هەرگیز قورئانی پیرۆزی نەدەخوێندەوە. دەمزانی کەوا مامۆستایانی کۆنی هەرات پەیتاپەیتا ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزیان دەهێنایەوە بیری خۆیان. مامۆستایانی گەورە ئەم گوتەیەیان لەدژی دوژمنانی نیگار بەکار دەهێنا، لەبەرئەوەی دەیانگوت بەپێی ئاینی ئێمە نیگارکێشان قەدەغەیە و نیگارکێشان لە ڕۆژی قیامەتدا ڕەوانەی دۆزەخ دەکرێن. بەڵام تا ئەو ساتە ئەفسووناوییە من هەرگیز ئەو گوتەیەم نەبیستبوو کە وەک بڵێی لە خۆوە لە دەمی پەپوولە هاتبێتە دەرێ:

"ئارەزووم بوو نیگارێک بکێشم ئەوە بخاتە ڕوو کە کوێر و بینا نابن بەیەک."

قەرە بە ساویلکەیی گوتی: "کوێر و بینا کێن؟"

پەپوولە گوتی: «کوێر و بینا نابن بەیەک "وما یستوي الأعمی والبصیر".» درێژەی دایێ و گوتی:

"تاریکی و ڕووناکی نابن بەیەک.

سێبەر و جێی گەرمیش نابن بەیەک

و زیندووان و مردووانیش نابن بەیەک."

بیرم لە چارەنووسی زەریف ئەفەندی و زاوا و برای چیرۆکبێژمان، کە ئەم ئێوارەیە کوژرابوو، کردەوە و مچورکم پێدا هات. ئایا ئەوانی تریش بەئەندازەی من ترسابوون؟ ماوەیەک هیچ کەسێک لە شوێنی خۆی جووڵەی نەکرد. لەقلەق هێشتا دەفتەرەکەی منی بەکراوەیی بەدەستەوە بوو، بەڵام سەرباری ئەوەی هێشتا سەیری ئەو نیگارە بێ ڕەوشتەی دەستکردی منمان دەکرد، کەچی وا پێ دەچوو ئەو نەیبینێ.

لەقلەق گوتی: "منیش خوازیار بووم نیگاری ڕۆژی قیامەت بکێشم، زیندووبوونەوەی مردووان، جوێکردنەوەی تاوانباران و بێتاوانان لەیەکتر. بەڵام بۆچی بۆمان نییە نیگاری قورئانی پیرۆزمان بکێشین؟"

کاتێک لە ساڵانی لاویماندا لە هەمان ژووری نیگارخانە کارمان دەکرد، کتومت وەک ئەوەی وەستایانی بەساڵاچوو بۆ حەسانەوەی چاو دەیانکرد، جاروبار سەرمان لەسەر مێز و تەختەی کار هەڵدەگرت و ئا بەمجۆرە لەبارەی بابەتێکی تری تەواو جیاوازەوە، کە ئەو ساتە بە خەیاڵماندا دەهات، سەری قسەمان دادەمەزراند. ڕێک وەک ئەوەی ئێستا سەیری دەفتەرە کراوەکەی بەردەستمان دەکەین، ئەو سەردەمانەش کاتی قسەکردن لەبارەی ئەو شتانەوە دڵمان دەیخواست، سەیری یەکترمان نەدەکرد، چونکە بەمەبەستی حەساندنەوە، لە پەنجەرەی کراوەوە چاومان لە دەرەوە دەبڕی. نازانم ئایا لەبەر خرۆشی بیرکەوتنەوەی جوانییەکی ڕۆژانی کامەرانی شاگردی بوو، یاخۆ بەهۆی لە ناخەوە هەستکردنم بە پەشیمانی بوو لەپای ئەوەی ماوەیەکی درێژ بوو قورئانی پیرۆزم لێک نەکردبووەوە و نەمخوێندبووەوە، یان لەبەر ترسی ئەو تاوانە بوو کە ئەم ئێوارەیە لە قاوەخانە بینیم، کاتێک نۆرە هاتە سەر من، سەرم لێ شێوا و دڵم وەک ئەوەی ڕووبەڕووی مەترسییەک بووبێتەوە، لێدانی زیادی کرد و لەبەرئەوەی هیچ شتێکی ترم بەخەیاڵدا نەهات، گوتم:

"ئەها لە کۆتایی سوورەتی "البقرة"دا چەند ئایەتێکی بەم واتایانە هەیە، من زۆر ئاواتەخواز بووم نیگاریان بکێشم: ئەی پەروەردگار، لەپای لە بیرکردن و هەڵەکانمان ڕاپێچی لێ پرسینەوەمان مەکە. وەک ئەوانەی پێش ئێمە بارێکمان لێ مەنێ توانای هەڵگرتنیمان نەبێت. بمانبوورە و نەرم و دڵۆڤان بە لەگەڵماندا. تۆ سەروەری ئێمەیت،



بەسەر گاوراندا سەرمان بخە." لەناکاو دەنگم شکا و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لەتاو فرمێسکی سەرکردووم شەرمم بەخۆمدا هاتەوە. لەوانەیە بەهۆی ترسانمەوە بووبێت لەو گاڵتەجاڕییەی لە ساڵانی شاگردیماندا بۆ پاراستنمان و پێشاننەدانی هەستیاریی خۆمان بەردەوام بە دەستمانەوە ئامادە بوو.

وام دەزانی فرمێسکەکانم یەکسەر ڕادەوەستن، بەڵام خۆم پێ ڕانەگیرا و کەوتمە هەنسکدان و دەستم بەگریان کرد. هەستم دەکرد تا من زیاتر بگریم، هەستی برایەتی و کارەسات و خەم باڵ بەسەر ئەوانی تردا دەکێشێت. هەستمان وا بوو ئیدی لە نیگارخانەی سوڵتانمان لەسەر ڕێبازی فەرەنگ نیگار دەکێشرێت، ئەو شێواز و کتێبانەی سەرلەبەری ژیانی خۆمان پێیان داوە، لەبەرەوە لە بیر دەکرێن، ڕاستییەکەی، کۆتایی بەگشت شتێک دێت و ئەگەر ئەرزەڕوومییەکانیش تەنگاومان نەکەن و دەستمان لێ نەوەشێنن، ئەوا ئەشکەنجەدەرانی سوڵتان بە سەقەتکراوی بەرەڵامان دەکەن... بەڵام بەدەم گریانەوە هەروەک چۆن لە نێوان هەنسک و ناڵینی خۆمەوە هێشتا بەردەوام بووم لە بیستنی ترپەی دڵۆپەی خەمگینی باران، ئاواش بە گۆشەیەکی تری ئەقڵم هەستم دەکرد ئەمانە هۆکاری ڕاستەقینەی گریانی من نین. تۆ بڵێی ئەوانی تر تا چ ڕادەیەک هەستیان بەمە کردبێت؟ هەم بەهۆی ئەوەی لە ناخەوە دەگریام و هەم بەدرۆ دەگریام، تۆزێک خۆم بەتاوانبار دەزانی.

پەپوولە خۆی لێم نزیک خستەوە، دەستی نایە سەر شانم، دەستی بە قژمدا هێنا، گۆنامی ماچ کرد و وشەی شیرینی لە دەم هاتنە دەر. ئەم دۆستایەتییە منی زیاتر لە ناخەوەوە و بەدەم هەستکردن بەتاوانەوە گریاند. نەمدەتوانی سەیری ڕووی بکەم، بەڵام نازانم لە چییەوە بوو بڕوایەکی هەڵەم لە کن دروست بوو وەک ئەوەی ئەویش دەستی بەگریان کردبێت. پێکەوە دانیشتین.

ئا لەو کەشەدا چۆنیەتی دانانی هەردووکمان لە هەمان ساڵدا بە نیگارخانە بۆ شاگردی، خەمگینیی نامۆیی دابڕان لە دایکانمان و دەست پێکردنی لە پڕی ژیانێکی تر، ئازاری ئەو تێ هەڵدانەی هەر ڕۆژی یەکەم خواردمان، خۆشی و شادیی دوو دیاریی نێردراو لەلایەن گەورەی خەزنەدارانەوە و بەهەڵەداوان ڕۆیشتنەوەمان بۆ ماڵ هێنایەوە بیری خۆمان. دەسپێک، تەنیا ئەو دەیگێڕایەوە و من بە دڵی پڕ لە خەمەوە

گوێم ڕادەگرت، بەڵام دواتر کاتێک لەقلەق و دوای ئەویش قەرە، کە لە سەرەتای ساڵانی شاگردیماندا جاروبار هاتوچۆی نیگارخانەی دەکرد، تێکەڵ بە گفتوگۆی دۆستانەی نێوانمان بوون، منیش گریانەکەی کەمێک لەمەوبەرم لەبیر کرد و بە دەمیانەوە پێ کەنیم و دەستم بەگێڕانەوە کرد.

ئەو بەیانییانەی زستانمان هێنایەوە بیری خۆمان کاتێک شاگردەکان زووتر لە خەو هەڵدەستان، ئاگردانی گەورەترین ژووری نیگارخانەیان دادەگیرساند و بە ئاوی گەرم زەویی نیگارخانەیان پاک دەکردەوە. یادی "وەستا"یەکی کۆنی خوا لێخۆشبوومان کردەوە، کە هێندە بێ ئیلهام و خۆپارێز بوو ڕۆژ تا ئێوارە تەنیا نیگاری گەڵایەکی داری بۆ دەکێشرا و گاڤێک دەیبینی وا ئێمە دیسان لە پەنجەرەوە سەیری گەڵای سەوزی دارەکانی بەهار دەکەین، بێ ئەوەی لێمان بدات، بۆ جاری سەدەم لێمان تووڕە دەبوو و دەیگوت: "سەیری ئەوێ نا، ئێرە بکەن." شاگردێکی ڕیوەڵەمان بیر کەوتەوە کە بەهۆی کاری زۆرەوە چاوی خێل بوو و بڕیار درابوو ڕەوانەی ماڵەوە بکرێت و ئەویش بە بوخچەی دەستییەوە بەرەو دەرگا هەنگاوی دەنا و دەنگی گریانی لە سەرانسەری نیگارخانەدا دەبیسترا. دواتر ئەوەمان هاتەوە بەرچاو چۆن قوتوویەکی مسی زەردی مەرەکەبمان دزی و هێدی هێدی کردمان بەسەر نیگارێکدا (کاتێک لەشکری عوسمانی لە ڕێی شیروان و لە لێوار ڕووباری کنک دووچاری برسیبوون دەبێت، ئەرەش داگیر دەکات و سکی خۆی پڕ دەکات) کە ماوەی شەش مانگ بوو سێ نیگارکێش کاریان تێدا دەکرد و بەچێژەوە تەماشامان دەکرد (چونکە ئەم شەڕە تاوانی ئێمە نەبوو.) بەنازکی و ڕێزەوە باسی چەرکەز خاتوونی جوانترین ژنی پاشای حەفتا ساڵیمان کرد کە هەرسێکمان عاشقی بووبووین و بەخەیاڵ لەگەڵیدا دەنووستین. پاشای مێردیشی سەیری داگیرکاری و هێز و دەوڵەمەندیی خۆی دەکرد و نەخش و نیگاری وەک ئەوەی بنمیچی کۆشکی ڕاوی سوڵتانمانی بۆ ماڵەکەی خۆی دەخواست. بەتاسەوە باسی لەزەتی ئەو شۆربای نیسکەمان کرد کە بەیانیانی زستان لەناو شیپانەی دەرگادا دەمانخوارد بۆ ئەوەی هەڵمەکەی کاغەزەکانمان نەرم نەکاتەوە. یادی ئەو خەم و دڵتەنگییانەشمان کردەوە کاتێک بە پاڵەپەستۆی مامۆستامان بۆ شاگردی ڕەوانەی شوێنێکی دوور



دەکراین و لە دۆستان و وەستایانی نیگارخانە دادەبڕاین. تاوێک بەژن و باڵای شازدە ساڵەی پەپوولەی شیرینم هاتەوە بەرچاو: کاتێک لە ڕۆژێکی گەرمی هاویندا تیشکی ڕۆژ لە پەنجەرەی کراوەوە دەهاتە ژووری و بەر شانی ڕووتی ڕەنگ هەنگوینیی دەکەوت، مۆرەی لە گوێچەکەماسی دروستکراوی دەستی بەخێرایی دەجووڵاند و کاغەزی سفت دەکرد. لە نیوەی ئەم کارەدا، کە بەدەم خەیاڵ لێدانەوە دەیکرد، ڕادەوەستا و چاوی لە کێماسییەکی بچووکی سەر کاغەزەکە نزیک دەخستەوە و بەسەرنجەوە لێی ورد دەبووەوە، بە دوو سێ جووڵەی جیاواز چەقۆکەی بەسەر ئەو خاڵەدا دەهێنا و دواتر سەرلەنوێ ڕەوتی پێشووتری وەردەگرتەوە. لە کاتێکدا دەستی بەخێرایی ژێر و ژووری دەکرد، ئەو نوقمی خەیاڵ دەبوو و لە پەنجەرەکەوە سەیری دووری دەکرد. ناتوانم هەرگیز لەبیری بکەم، دواتر ئەو، وەک ئەوەی منیش لەگەڵ کەسانی تردا دەمکرد، تاوێکی کورت لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی نەدەکرد و چاوی دەبڕییە ناو چاوی من. ئەم سەرنجە هەمیشە و تەنیا یەک واتای هەبوو و سەرجەم شاگردەکان پێیان دەزانی: ئەگەر خەیاڵ نەکەیتەوە، کات هیچ تێ ناپەڕێت.

# 58

## دواجار پێم دەڵێن بکوژ

منتان لەبیر چوو، وا نییە؟ دە با هەر هیچ نەبێت بوونی خۆم لێرە لە ئێوە نەشارمەوە، چونکە قسەکردن لەگەڵ ئەو دەنگەی، کە بە تێپەڕبوونی کات لە هەناومدا گەورەتر دەبێتەوە، پێداویستییەکی خۆ لەبەردا ڕانەگیراوە بۆ من. جاروبار زۆر گوشار بۆ خۆم دێنم و پێم وایە لەم ڕووەوە هەست بە شکانەوەی ناو دەنگم دەکرێت. جاری واش هەیە دەیدەمە بەر و ئەو کاتەش وشەی هێماکەر بۆ کەسایەتییەکەی ترم و پەیڤی وا، کە لەوانەیە ئێوەش هەستی پێ بکەن، لە دەمم دێنە دەرێ. دەستەکانم دەلەرزن، تەوێلم لە ئارەقە دەنیشێت و دەمودەستیش حاڵی دەبم ئەمانە هێمای شتی نوێن.

بەڵام هەتا بڵێی بەختەوەرم لێرە. لەگەڵ برایانی نیگارکێشماندا دانیشتووین و دڵی یەکتر دەدەینەوە. بەدەم بیرهێنانەوەی بیرەوەرییەکانی بیست و پێنج ساڵی ڕابردوومانەوە، دوژمنایەتی نا، جوانی و خۆشییەکانی نەخش و نیگارکێشانمان بیر دەکەوێتەوە. بە هەستێکەوە، وەک ئەوەی کۆتایی دنیا هاتبێت، دانیشتووین، بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە دەست بە سەری یەکدیدا دەهێنین، یادی ڕۆژانی خۆشی ڕابردوومان دەکەینەوە و ئەم ڕەفتارەشمان ڕەهەندێکی تایبەت بە ژنانی حەرەمسەرای تێدایە.

ئەم وێکچوونەم لە ئەبو سەعیدی کرمانییەوە وەرگرت، ئەو مێژوونووسەی کاتێک مێژووی کوڕانی تەیمووری لەنگ دەنووسێتەوە، بەسەرهاتی مامۆستایانی کۆنی



شیراز و هەراتیش دەگوازێتەوە. سەد و پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا، جیهان شای فەرمانڕەوای قەرەقۆیونلو سوپا بچووکەکانی خان و پادشاکانی نەوەی تەیمووری لەنگ، کە لەدژی یەکتر لە شەڕدا بوون، تێک دەشکێنێت و وڵاتیان خاپوور دەکات، لەگەڵ لەشکری سەرفرازی تورکمان بەسەرانسەری وڵاتی عەجەماندا تێ دەپەڕێت و دەگاتە ڕۆژهەڵات. دواجار لە ئەستەرئاباد ئیبراهیمی نەوەی ڕوحی کوڕی تەیمووری لەنگ تێک دەشکێنێت و بە لەشکرەکانییەوە ڕوو لە قەڵای هەرات دەکات. نەوەکانی تەیمووری لەنگ ماوەی نیو سەدە بوو نەک تەنیا وڵاتی عەجەم، بگرە لە هندستانانەوە بۆ بیزانس فەرمانڕەوایی نیوەی جیهانیان دەکرد و بەقسەی کرمانیی مێژوونووس، ئەم دەستوەشاندنە گورچووبڕە لە هێزی لە بەزین نەهاتووی ئەوان بایەکی توندی کارەسات و ڕووخانی لەگەڵ خۆیدا هێناوە و لە قەڵای گەمارۆدراوی هەرات بووە بەڕۆژی مەحشەر. ئەبو سەعید بەچێژێکی سەیرەوە بیری خوێنەرانی دەخاتەوە کەوا جیهان شای قەرەقۆیونلو هەرکەسێکی لە نەوەی تەیمووری لەنگ لە قەڵاکاندا بەردەست کەوتبێت، دڵڕەقانە کوشتوویەتی؛ کەوتووەتە ناو حەرەمسەرای پادشا و شازادەکان و ژنانی هەڵبژاردووە و خستوونیەتییە حەرەمسەرای خۆیەوە؛ نیگارکێشانی لەیەکدی دابڕیوە و بێبەزەییانە زۆربەیانی کردووە بە شاگردی وەستاکانی خۆی. مێژوونووس لەم خاڵەوە بەسەرهاتەکان لە پادشا و سەربازەکانی ناو قوڵلەی قەڵاکانەوە، کە لە هەوڵی بەرپەرچدانەوەی دوژمندان، دەباتەوە سەر نیگارکێشان، کە لەناو قەڵەم و بۆیاخدا لە نیگارخانە چاوەڕێی ئەنجامی ترسناکی لە زووەوە زانراوی گەمارۆ دەکەن و یەک بەیەک ناویان دەهێنێت و دەڵێت سەرانسەری دنیا دەیانناسێت و هەرگیز لەبیر ناچنەوە. ئەو نیگارکێشانەی ئێستا هەموویان لەبیر چوونەتەوە، ئەوانیش لە کاتی گەمارۆدا کتومت چەشنی ژنانی حەرەمسەرا باوەش بەیەکدا دەکەن، دەگرین و جگە لە یادکردنەوەی ڕۆژانی خۆشی ڕابردوو، هیچ شتێکی تریان لە دەست نایەت.

ئێمەش وەک ژنانی خەمگینی حەرەمسەرا، یادی ئەوەمان کردەوە سوڵتان لە ڕابردوودا ئێمەی زیاتر خۆش دەویست و پاش ئەوەی ئێمە لە جەژنەکاندا قوتووی نەخشێندراوی ڕەنگاوڕەنگ، ئاوێنە و قاپ و دەوری، هێلکەی نەخشێندراوی

وشترمڵ، ئەو شتانەی لە کاغەز دروستمان دەکردن، نیگاری یەک پەڕەیی، دەفتەری نیگاری گاڵتە و گەپ و سەفابەخش، کاغەزی یاری و کتێبمان پێشکێش دەکرد، ئەویش سەڵتەی بەکەوڵ و لە ئان و ساتیشدا کیسەی پڕ لە پارەی دەداینێ. ئەرێ نیگارکێشانی بەسالاچووی چالاک و ڕەنجدەر و بەرچاوتێر و بەکەم قایلبووی ئەو ڕۆژگارانە چییان بەسەرهات؟ ئەوانە بۆ ئەوەی کەسانی تر نەبینن چۆن کاریان کردووە و لەبەر شپرزەییی ئەوەی نەبادا کارکردنیان بۆ دەرەوەی کۆشک ئاشکرابێت، خۆیان لە کونجی مالانی خۆیان قایم نەدەکرد، بگرە هەموو ڕۆژێک دەهاتنە نیگارخانە. ئەو نیگارکێشە بەتەمەنانەی بێ فیزانە سەرتاپای ژیانی خۆیان دابوو بە نەخشاندنی دیواری کۆشک و سەراکانی ناو نیگارەکان، بەکێشانی نیگاری گیای حەوتپەڕ لە بۆشاییی پەڕەکاندا و بەو گەڵای دار سەرووانەی کە مرۆڤ دوای ماوەیەکی درێژ لە سەیرکردینان ئینجا بۆی دەردەکەوت هیچ کامیان لەوانی تر ناچن، کوان لە کوێن؟ ئەدی کوان ئەو مامۆستا مامنێوەندییانەی باوەڕیان وابوو خوا تەنیا هونەر و لێهاتوویی بەهەندێک کەس داوە و پشوودرێژی و پشت بەخۆبەستنیشی بە بڕێکی تر داوە و قایل بوون بەوەی جۆرێک لە حیکمەت و دادپەروەری لەم دابەشکردنەدا هەیە و هەرگیز ئیرەییان بەکەس نەدەبرد؟ ئەو مامۆستا پیرانە هەندێکیان پشت کۆماوە و هەمیشە لێو بەزەردەخەنە بوون، بڕێکیان خەیاڵپەرست و مەست بوون و بەشێکیشیان دەیانویست کچە قەیرەکانی خۆیان لە گەردنمان بئاڵێنن و ئێمە هەوڵمان دا بەیادکردنەوەیان وردەکارییە لەبیرکراوەکانی سالانی شاگردی و سەرەتای وەستاییمان بهێنینەوە پێش چاوی خۆمان.

ئەها هێڵکێشێکی چاو کەمێک خێل هەبوو کاتێک هێڵی دەکێشا، زمانی دەرهێنا و دەیخستە سەر گۆنای. ئەگەر هێڵەکە لەلای ڕاستی پەڕەکە نزیک بووایەتەوە، ئەم زمانی دەخستە سەر گۆنای چەپی و ئەگەر لەلای چەپ نزیک بووایەتەوە، ئەم لەسەر گۆنای ڕاستیی دادەنا. نیگارکێشێکی بچکووک و باریکەلانە هەبوو گاڤێک بۆیاخی لە دەست دەرچوو، دەیگوت: "پشوودرێژی، پشوودرێژی، پشوودرێژی" و بە نەرمە قاقا بەخۆی پێ دەکەنی. وەستایەکی حەفتاساڵەی زەڕکاری هەبوو چەندین سەعات لەگەڵ شاگردەکانی بەرگ تێگری نهۆمی خوارێدا قسەی دەکرد و لافی ئەوەی لێ



دەدا ئەگەر مرۆڤ بۆیاخی سوور لە تەوێڵی خۆی بدات، ئەوا پیربوون ڕادەگرێت. مامۆستایەکی تووڕە و تۆسن هەبوو بۆ تاقیکردنەوەی پێکهاتەی بۆیاخ، دەسپێک نینۆنەکانی خۆی بۆیاخ دەکرد و پاشان یەکێک لە شاگردەکانی، سار هەر کامێکیان بووایە، ڕادەگرت و بۆیاخی لە نینۆکی ئەویش دەدا. نیگارکێشێکی قەڵەو هەبوو بە لاقی تووکنی کەروێشکی بەکارهێنراوە بۆ کۆکردنەوەی تۆزی زێڕی لە زەڕکاریی کەوتوو ڕیشی خۆی دەخوراند و ئێمەی دەهێنایە پێکەنین. کوان، ئەوانە لەکوێن؟

کوان ئەو تەختی مۆرانەی بەهۆی بەکارهێنانی زۆریانەوە بووبوون بە بەشێک لە جەستەی شاگرد و دواتر تووڕ هەڵدرابوونە لاوە؟ کوان مقەستە درێژەکانی کاغەز بڕین کاتێک شاگردەکان گەمەی شەڕە شمشێریان پێ دەکردن، زیانیان پێ دەگەیشت؟ لە کوێن ئەو تەختەی نووسینانەی بۆ ئەوەی تێکەڵ نەبن، ناوی مامۆستایانی گەورەیان لەسەر نووسرابوو؟ کوا بۆنی مسک ئاسای مەرەکەبی چینی؟ کوا ئەو زڕەی فنجانی قاوەیەی لە بێدەنگیدا دەکەوتە بەرگوێ؟ کوا پشیلە بۆرەکەمان، ئەو نازدارەی هەموو هاوینێک لە تووکی ناو گوێی بێچووەکانی و تووکی گرێملیان فڵچەی جۆراوجۆرمان دروست دەکرد؟ کوا ئەو تۆپە کاغەزانەی هندستانی کاتێک بەزیادەوە وەرمان دەگرت بۆ ئەوەی بەدەستی خاڵی دانەنیشین و وەک خۆشنووسان هێڵیان لەسەر بکێشین؟ قەڵەمتاشێکی دەسک پۆلای پەندیاری هەبوو لە کاتی کردنی هەڵەی گەورەدا بە دەستووری سەرگەورەی نیگارکێشان بۆ دارکاریکردن بەکار دەهێنرا. ئەو قەڵەمتاشە و تەدارەکی ئەو تێ هەڵدانانە ئێستا لە کوێن؟

باسی ئەوەمان کرد هەڵەیەکی تریش ئەوە بوو سوڵتانمان نیگارکێشانی ڕاسپاردبوو لە ماڵی خۆیان کار بکەن. باسی ئەو حەلوا گەرم و نایابەمان کرد کاتێک زستانان زوو ئێوارە دادەهات و دوای ئەوەی ئێمە بەدەم ئازاری چاوەوە لەبەر تیشکی قووتیلکە و مۆمدا کارمان دەکرد، لە چێشتخانەی کۆشکەوە دەهات. بەچاوی پڕ لە فرمێسک و بەدەم پێکەنینەوە یادی ئەو وەستا پیر و خەڵەفاوەی زەڕکاریمان کردەوە کە تووشی نەخۆشیی لەرزین بووبوو و چیدی نەیدەتوانی کاغەز بەدەستەوە بگرێت و مانگی جارێک دەهاتە نیگارخانە و لوقمە قازیی دەستکردی کچەکەی، کە بۆ ئێمەی

شاگردان سووری دەکردەوە، لەگەڵ خۆیدا دەهێنا. دوای مردنی مامۆستای گەورە قەرە مەمیی پێش مامۆستا عوسمان، چەندین ڕۆژ ژوورەکەی خاڵی مایەوە. پاش پشکنینی، لەژێر ئەو دۆشەکەیدا کە مامۆستا قەرە مەمی نیوەڕۆیان لەسەری ڕادەکشا و سەرخەوێکی دەشکاند، چەند پەڕەیەکی شاهانەی مامۆستا دۆزرانەوە و ئێمە باسی ئەوانەشمان کرد.

ئێمەش کتومت وەک مامۆستا قەرە مەمی شانازیمان بە پەڕە و نیگارەکانی خۆمانەوە کرد و ئەگەرچی لەبەرگرتنەوەش بوون، جاروبار دەرمان دەهێنان و دەمانویست تەماشایان بکەین و پاشان ژماردمانن. گێڕایانەوە و گوتیان: بۆیاخکردنی ئاسمانی بەشی سەرەوەی نیگاری کۆشکی بۆ هونەرنامە کێشراو بە ئاوی زێڕ، بەهۆی زێڕەکە خۆیەوە نا، بەڵام وەک ئەوەی لە نیگارێکی دانسقە چاوەڕێ دەکرا، لە ڕەنگ و قوللە و لە نێوان دار سەرووەکاندا دیمەنێک پێک هاتبوو کۆتاییی دنیای دەخستەوە بیری مرۆڤ.

ئەوان گێڕایانەوە گوتیان: نیگاری حەزرەتی پێغەمبەرمان کاتێک دوو فریشتە خۆیان خستووەتە بن باڵی و لەسەر منارەوە بۆ ئاسمان بەرز دەبێتەوە و پێغەمبەرمان پێی خۆش نییە فریشتە چوونەتە بن باڵی و ختووکەی پێ دێت، بە ڕەنگی زۆر بەدەربەست کێشراوە و تەنانەت منداڵانی بچووکیش گاڤێک ئەم دیمەنە پیرۆزە دەبینن، دەسپێک بە باوەڕەوە دەترسن و دواتریش وەک ئەوەی ختووکەی خۆیشیان درابێت، بەڕێزەوە پێ دەکەنن. من گێڕامەوە و گوتم: پاشای سەرۆک وەزیری پێشوومان گشت ئەو یاخیبووانەی دابوویانە شاخ، سەربڕیبوو و منیش کەللەسەرە بڕاوەکانم بەزەرافەت و ڕێزەوە لە کەناری نیگاری دەستکاری خۆمدا ڕیز کردبوو. برۆی بۆ مردن دەچەقاوی ئەو کەللەسەرانەی من گرێملیانم بە ڕەنگی سوور بۆیاخ کردبوو، لێوی بەباری هەریەکەیان کە پرسیاری واتای ژیانی دەکرد، لووتیان کە لە ناچاریدا دوا هەناسەی هەڵمژیبوو و چاوانی داخراویانم بەسەر ژیاندا یەک بەیەک و بە بایەخەوە و وەک ئەوەی وەستایەکی پۆرترێتی فەڕەنگ دەیکات، بەچێژەوە کێشا. هەر کەللەسەرێکم وەک سەری مردوویەکی ئاسایی نا، بگرە چەشنی ڕووێکی جیاواز لەوانی تر کێشاوە.



ئا لەم ڕێیەوە خۆشەویسترین جڤاتەکانی ئەڤین و شەڕ و شاهانەترین جوانکاری و ئەو جوانکارییانەی ئاو لە چاوان دەهێنن، هێنایەوە بیری خۆمان و بەتامەزرۆیی وەک بیرەوەرییە نەمر و دەست پێ ڕانەگیشتووەکانی خۆمان قسەمان لەبارەیانەوە کرد. ئەو باخچە چۆڵ و ڕازدارانەی لە شەوانی پڕ لە ئەستێرەدا دەبن بە جێژووانی دڵداران، داری بەهار، مەلی ئەفسانەیی و زەمانی دەقبەستوومان هاتە بەرچاو... ئەو شەڕە خوێناوییانەی بەئەندازەی دێوەزمەی خۆمان ترسناک و لێمانەوە نزیک بوو. شەڕوانانی دوولەتکراو، ئەسپی زرێ خەڵتانی خوێن، مرۆڤی جوانی ڕابردوو کاتێک یەکتر بەر خەنجەر دەدەن، ئەو ژنە دەم بچووک و دەست خنجیلانە و چاوماسی و ملخوارانەی لە پەنجەرەوە سەیری ڕووداوەکان دەکەن، هێنایە بەرچاوی خۆمان... یادی لاوانی شۆخی بەخۆناز و دڵگەش و پادشا و خانانی قۆز و دەوڵەت و کۆشکی لەمێژەوە ڕووخاو و لەگەڵ خۆیاندا ڕۆیشتوویانمان کردەوە. ڕێک وەک ئەو ژنانەی لە حەرەمسەرای ئەو پادشایانەدا دەگریان، ئێمەش دەمانزانی ئیدی ژیانی خۆیشمان تێکەڵ بە یادگاری بووە، بەڵام ئایا وەک ئەوان لە دیرۆکەوە دەپەڕینەوە بۆ داستان؟ بەمەبەستی ئەوەی سێبەری ترسی لەبیرچوونەوەی خراپتر لە ترسی مردن ڕاپێچمان نەکات، پرسیاری خۆشەویستترین جڤاتی مردنمان لەیەکتر دەکرد.

یەکسەر بیرمان کەوتەوە زووحاک فریوی ئیبلیسی خواردبوو و باوکی خۆی کوشتبوو. لە سەردەمی ئەو داستانەدا، کە لە سەرەتای شانامەدا باسی کراوە، لەبەرئەوەی گەردوون تازە هاتبووە ئافراندن، شتەکان زۆر سادە بوون و هیچ شتێک پێویستی بە ڕوونکردنەوە نەبوو. شیرت بویستبایە، بزنت دەدۆشی و دەتخواردەوە؛ ئەسپت بگوتبایە، سواری دەبووی و دەڕۆیشتیت؛ خراپەت بگوتبایە، ئیبلیس دەهات و تۆی بە جوانی و باشییەکانی کوشتنی باوکت قایل دەکرد. تاوانی کوشتنی مەرداسی بەڕەچەڵەک عەرەب لەسەر دەستی زووحاکی کوڕی بۆیە جوان بوو، چونکە هەم بێ هۆ بوو و هەم لەبەرئەوەی بەنیوە شەو لە باخچەی کۆشکێکی شاهانەدا و کاتێک ئەستێرە و دار سنەوبەری زێڕین بەئاستەم دەوروبەر ڕۆن دەکەنەوە، ئەنجام درابوو.

دوایی ئەوەمان هێنایەوە بیری خۆمان کاتێک ڕۆستەمی داستان، پاش سێ ڕۆژ

زۆرانبازی و هێنان و بردن لەگەڵ زۆرابی کوڕی خۆیدا، کە سەرکردەی سوپای دوژمنە، نازانێت کوڕی خۆیەتی و دەیکوژێت. ڕۆستەم بە زەبری شمشێر سنگی زۆراب ئەنجن ئەنجن دەکات و دواتر بەو بازووبەندەدا، کە چەندین ساڵ لەوەوبەر بە دایکی داوە، بۆی دەردەکەوێت کوڕی خۆیەتی و بەدەم هەڵڕشتنی فرمێسکەوە دەست بەگریان و شین و شەپۆڕ دەکات. لەو شین و گریانەی ڕۆستەمدا شتێک هەبوو کاری لە هەرسێکمان دەکرد.

ئەو شتە چی بوو؟

کاتێک هێشتا باران بە خەمگینی ترپەی لە سەربانی تەکیە هەڵدەستاند، ئەمسەر و ئەوسەرم دەکرد و بەمجۆرە هاتمە گۆ:

"یان مامۆستا عوسمانی باوکمان بەناپاکی بە کوشتمان دەدات، یان ئێمە بەناپاکی ئەو دەکوژین."

نەک بەهۆی ئەوەی قسەکەم هەڵە بێت، بگرە لەبەرئەوەی ڕاست بوو، تووشی سەرسامی بووین و بێدەنگ بووین. ئەمسەر و ئەوسەرم دەکرد و بەشپرزەیی گەڕاندنەوەی هەموو شتێک بۆ دۆخی جاران، ئەمەم بەخۆم دەگوت: ئەگەر باسی چۆنیەتی کوشتنی سیاوش بە دەستی ئەفراسیاو بکەم، بابەت دەگۆڕێت. بەڵام ئەم بەسەرهاتە ناپاکییەکی گەورەی تێدابوو و من لێی نەدەترسام. چۆنیەتیی کوشتنی خەسرەو بگێڕمەوە. باشە، بەڵام ئایا وەک ئەوەی فیردەوسی لە شانامەدا گێڕاویەتیەوە، یان چەشنی ئەوەی نیزامی لە شیرین و خەسرەودا باسی کردووە؟ شتی خەمهێنەر لە شانامەدا ئەوەیە کاتێک بکوژ دێتە ژوورێ، خەسرەو بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە دەزانێت کێیە. وەک دوایین چارە بە خولامەکەی کن خۆی دەڵێت: "دەمەوێت دوو ڕکات نوێژ دابەستم، بڕۆ ئاو و سابوون و جلی پاک و بەرماڵم بۆ بێنە" و بەڕێی دەکات. بەڵام ئەو خولامە ساویلکەیە لەوە حاڵی نابێت سەرداری ئەوی بۆ خواستنی کۆمەگ ناردووە و بەڕاستی دەڕوات بۆ هێنانی ئەو شتانەی لێی داوا کرابوو. گاڤێک بکوژ تەنیا لەگەڵ خەسرەو لە ژوورەکەدا دەمێنێتەوە، یەکەم کاری ئەوە دەبێت دەرگا لەدیوی ژوورەوە کڵۆم دەدات. فیردەوسی لەم جڤاتەی کۆتاییی شانامەدادا، بەبێزەوە و بەمجۆرە وەسپی بکوژی داردەستی پلانگێڕان دەکات:



بۆگەنە، تووکنە، ورگ زلە.

سەر و خوارم دەکرد و سەرم پڕ بوو لە وشە، بەڵام وەک ئەوەی لە خەوندا بم، بەهیچ جۆرێک نووزەم لێوە نەدەهات.

هەروەک خەون ببینم، ئەو کاتە هەستم کرد ئەوانی دی لە نێوان خۆیاندا فسکەفسکیانە و دوژمنانە باسی من دەکەن.

لەپڕ هەرسێکیان پێکەوە شاڵاویان بۆ هێنام. کاتێک خۆیان کێشا بەسەرمدا، لنگەکانم هێندە بەخێرایی لە زەوی دابڕان، هەرچوارمان پێکەوە بەربووینەوە. لەسەر زەوی یەکترمان گەوزراند و لەیەکدیمان دا، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند. من لەسەر پشت کەوتمە ژێرەوە، ئەوانیش چوونە سەرم.

یەکێکیان لەسەر ئەژنۆکانم دانیشت. یەکێکی تریشیان لەسەر باڵی ڕاستم.

قەرە هەردوو ئەژنۆی خۆی خستە سەر شوێنی پێکگەیشتنی قۆڵ و شانەکانم، بەهێزەوە قوونی نایە سەر مەودای نێوان گەدە و سنگم و دانیشت. لەم دۆخەدا بەهیچ جۆرێک جووڵەم بۆ نەدەکرا. هەموومان سەرمان سوورمابوو و کەوتبووینە هەناسەبڕکێوە. ئەمەم بیر خستنەوە:

مامی خوا لێخۆشبووم کوڕێکی ناقۆڵای دوو ساڵ لە من بەتەمەنتری هەبوو، هیوادارم لە کاروانبڕیندا دەستگیر کرابێت و لەمێژ بێت کەللەی سەری لە جەستەی جیا کرابێتەوە. ئەم شتە نالەبارە، چەندی هەستی دەکرد من لەو زۆرزانتر و ئاوەزیاوتر و پیاوترم، بەهەر بیانوویێک بووایە شەڕێکی دەنایەوە؛ ئەگەر شەڕیشی بۆ مەیسەر نەبووایە، دەیگوت با زۆران بگرین، بەماوەیەکی کورت دەینامە ژێر و بەهەمان شێوە ئەژنۆکانی لە شانم قایم دەکرد، وەک ئێستای قەرە، چاوی دەبڕییە ناو چاوانم، تفی نێوان لێوانی دەهێنا و دەبرد، ئەم تفە تا دەهات گەورە دەبووەوە و دواتر بەکاوەخۆ بەرەو چاوم دەیڕژاند و منیش لە ترسی ئەوەی دەمگوت ئێستا دەڕژێتە سەر چاوم، هەوڵم دەدا بەنەفرەتەوە سەرم بەڕاست و چەپدا ببەم و ئەویش زۆر کەیفی پێ دەهات.

قەرە گوتی دەبێت هیچ شتێک نەشاریتەوە. دوایین نیگار لە کوێیە؟ دانی پێدا بنێ.

لەبەر دوو هۆ هەستم بە ڕقێکی خنکێنەر و دڵتەنگی دەکرد: پێشتر هەستم

بەڕێککەوتنی نێوانیان نەکردبوو و بەختوخۆڕایی ئەو هەموو قسەیەم بۆ کردبوون. هیچ بیرم نەچووبوو بۆ ئەوەی دەغەڵی بکاتە ئەم ڕادەیە و من پێشتر لێرە هەڵنەهاتبووم.

قەرە گوتی ئەگەر دوایین نیگار دەرنەهێنی و نەماندەیتێ، قوڕگت هەڵدەدڕم.

شتێکی سەیر بوو. دەتگوت ئەگەر دەم بکەمەوە، ڕاستیی لێ دێتە دەرێ، بۆیە هەردوو لێوانم بەتوندی نابووە سەریەک. لەلایەکی تریشەوە بیرم دەکردەوە هیچم لە دەست نایەت. ئەگەر لە نێوان خۆیاندا ڕێک بکەوتنایە و منیان وەک بکوژ بە گەورەی خەزنەداران ڕابگەیاندایە، ئەوا لەم بەڵایە ڕزگاریان دەبوو. تاکە ئومێدم ئەوە بوو مامۆستا عوسمان ئاماژە بۆ کەسێکی تر، بۆ خاڵێکی تر بکات، بەڵام با بزانین ئەو شتانەی قەرە لەبارەی ئەوەوە گوتنی، ڕاستن؟ ئایا لە دەستیان دەهات لێرە بمکوژن و دواتریش تاوانەکە بخەنە ئەستۆی من؟

خەنجەریان لە قوڕگم قایم کرد. دەستبەجێ بینیم قەرە چێژ لەم دۆخە وەردەگرێت و شادمانیی خۆی پێ ناشارێتەوە. زللەیەکیان لە دەموچاوم سرەواند. ئایا خەنجەرەکە قوڕگمی دەبڕی؟ زللەیەکی تریشیان وەشاند.

بەڵام توانیم پەیڕەوی لەم لۆجیکەش بکەم: ئەگەر هیچ نەڵێم، هیچ شتێک ڕوو نادات. ئەمە هێزێکی دامێ. من بەدرێژاییی ژیانم زۆر بەئاشکرا باشترین بۆیاخم کردبوو، جوانترین هێڵ و نایابترین نیگارم کێشابوو و ئیدی ئەوان نەیاندەتوانی بیشارنەوە کە هەر لە منداڵییەوە لەم ڕووەوە ئیرەییان بە من بردووە. لەپای ئەو هەموو ئیرەیی پێبردنەیان بەمن، خۆشم دەویستن. بەدەم برا خۆشەویستەکانمەوە پێ کەنیم.

یەکێکیان، نامەوێت ئێوە بزانن کێ ئەم کارە چەپەڵەی کرد، وەک ئەوەی ماوەیەکی درێژ بێت تاسەی یارەکەی کردبێت و ئێستا ماچی بکات، بەگەرمی ماچی کردم. ئەوانی تریش چراکەیان نزیک خستبووەوە و لەبەر تیشکەکەی، تەماشایان دەکرد. منیش وەڵامی ئەم ڕاموسانەی هاوڕێ خۆشەویستەکەم دایەوە. ئەگەر هەموو شتێک ڕوو لە کۆتایی دەڕوات، با بزانن باشترین نیگار لە کێشانی من بووە. پەڕەکانم بدۆزنەوە و بڕوانن.

وەک ئەوەی وەڵامدانەوەی ماچ بە ماچ، ئەوی فرە تووڕە کردبێت، بەهەڵچوونەوە



دەستی بە لێدانم کرد، بەڵام ئەوانی تر دەستیان گرت. تاوێک دوودڵی دای گرتن. پەلاماردان و دەستگیرکردنیان لە یەخەی یەکتر، قەرەی تووڕە کرد. دەتگوت لە من نا، لەو ئاراستەیەی ژیانیان ڕووی تێ کردووە، تووڕەن و لەم سۆنگەیەشەوە دەیانویست تۆڵە لە سەرانسەری دنیا و لە گشت کەسێک بکەنەوە.

قەرە شتێکی لە پشتوێنەکەی دەرهێنا؛ دەرزییەکی درێژی نووک تیژ. تاوێک لە چاوم نزیکی کردەوە؛ جووڵەیەکی کرد وەک ئەوەی بۆم بسەلمێنێت کە دەتوانێت بیکات بە چاومدا.

گوتی: "پێش هەشتا ساڵ کاتێک هەرات کەوتە دەستی دوژمن، بەهزادی گەورەی مامۆستای مامۆستایان حاڵی بوو کۆتایی بەهەموو شتێک هاتووە و بۆ ئەوەی کەس ناچاری نەکات بەشێوازێکی تر نیگار بکێشێت، بەسەربەرزی خۆی کوێر کرد. هێدی هێدی ئەم دەرزییی پەڕەمووچەی لە چاوی خۆی چەقاند و ماوەیەک دوای دەرهێنانەوەی، بەکاوەخۆ تاریکاییی شاهانەی خوا بەسەر چاوی ئەو نیگارکێشە دەست بەپەرجووەی بەندەی خۆیدا هات. ئەم دەرزییە، کە لەگەڵ بەهزادی ئیدی کوێر و مەست لە هەراتەوە دەچێتە تەورێز، شا تەهماسپ وێرای شانامەی ئەفسانەیی بەدیاری بۆ باپیری سوڵتانمانی دەنێرێت. مامۆستا عوسمان سەرەتا بۆی نەبرایەوە سەریەک بۆچی شا تەهماسپ ئەمەی ناردووە. بەڵام ئەمڕۆ لۆجیکی ڕەوا و ئاواتی خراپەخواستنی پشت ئەم دیارییە زۆردارەی بینی. پاش ئەوەی بۆی ئاشکرا بوو سوڵتانیشمان ئیدی خوازیارە بەشێوازی فەرەنگ نیگاری بکێشرێت و ئێوەی کوڕانیشی ناپاکیتان لێ کردووە، دوێنێ شەو مامۆستا عوسمانیش لە ژووری گەنجینە کتومت وەک بەهزاد ئەم دەرزییەی لە گلێنەی چاوانی خۆی چەقاند. ئێستا ئەگەر چاوی تۆی هۆکاری وێرانبوونی ئەو نیگارخانەیەی ئەو سەراپای ژیانی خۆی پێ داوە، کوێر بکەم، بە کەڵکی چ دێت؟"

گوتم: "ئەگەر کوێرم بکەیت و نەکەیت، ئیدی دواجار ناتوانین لێرە جێگەیەک بۆ خۆمان بدۆزینەوە. ئەگەر مامۆستا عوسمان بەڕاستی کوێریش بێت و یان بمرێت و ئێمەش بە کاریگەریی فەرەنگ لە ناخەوە و بەتەواوی کێماسی و کەسایەتیی خۆمانەوە نیگار بکێشین و ببین بە خاوەنی شێواز، ئەوا وەک خۆمان دەچین، بەڵام

نابین بەخۆمان. ئەگەر بڵێین نەخێر با وەک مامۆستایانی کۆن نیگار بکێشین و تەنیا ئەگەر چەشنی ئەوان نیگار بکێشین دەبین بەخۆمان، سوڵتانمان، کە تەنانەت پشتی لە مامۆستا عوسمانیش کردووە، لە جێی ئێمە کەسانی تر دەدۆزێتەوە. بگرە ئیدی کەس سەیری چارەشمان ناکات، تەنیا بەزەییان پێماندا دێتەوە و دڵیان پێمان دەسووتێ. شالاوی سەر قاوەخانەکەش هێندەی تر خوێ بەم برینانەوە دەکات: چونکە بێگومان نیوەی ئەو ڕووداوە دەخرێتە ئەستۆی ئێمەی نیگارکێشان بەهۆی زماندرێژیکردنمانەوە لەدژی مەلا ئەفەندی."

زۆریان لێ پاڕامەوە و هەوڵم دا حاڵییان بکەم کەوا دەستخستنە یەخەی یەکتر بەکەڵکی ئێمە نایەت، بەڵام بێ سوود بوو. نیازیان نەبوو گوێم لێ بگرن: شپرزەییان پێوە دیار بوو، باوەڕیان وابوو ئەگەر تا دەمەوبەیانی و بەپەلە و بێ ئەوەی گوێ بە ڕاست و چەوت بدەن، بڕیاری تاوانباربوونی کەسێکی ناو خۆیان بدەن، ئەوا دەتوانن لەم بەڵایە ڕزگاریان بێت و ئەشکەنجە نادرێن و لە نیگارخانەش گشت شتێک وەک چەندین ساڵی ڕابردوو بەڕێوە دەچێت."

سەرباری ئەوەش، ئەو شتەی قەرە هەڕەشەی ئەنجامدانی کردبوو، مایەی ڕەزامەندیی دووەکەی تر نەبوو. باشە ئەگەر ئاشکرا بووایە تاوانبار کەسێکی ترە و هەواڵی بەختوخۆڕایی کوێرکردنی من بگەیشتباوە گوێی سوڵتانمان؟ نزیکیی قەرە لە مامۆستا عوسمان و قسەکردنی بێ ئابڕووانەی لە بارەیەوە، ئەوانی ترساندبوو. خوێن بەرچاوی قەرەی گرتبوو و تەواوی کات دەرزییەکەی بە هەڵچوونەوە لە بەرامبەر چاومدا ڕاگرتبوو. ئەوان هەوڵیان دا قەرەم لێ دوور بخەنەوە.

قەرە، وەک ئەوەی ئێمە لە نێوان خۆماندا ڕێک کەوتبین و دەرزییە پەڕەمووچەکەی لە دەست دەربهێندرێت، شپرزەیی دای گرت. بێنە و بەردە و هێنان و بردنێک ڕووی دا. بۆ خۆپاراستن لە شەڕی دەرزیی پێش چاوانم، تەنیا دەمتوانی چەناگەم بەرز بکەمەوە و سەرم بۆ دواوە ببەم.

دواتر شتەکان زۆر بەخێرایی قەومان و سەرەتا بۆم نەبرایەوە سەر یەک چ قەوماوە: لە چاوی ڕاستمدا هەستم بە ئازارێکی تاڵ و دژوار، بەڵام کورت کرد؛ لەپڕ ناوچەوانم تەزی. دواتر گشت شتێک گەڕایەوە دۆخی کۆن، بەڵام ترسێکی گەورە



کەوتبووە هەناومەوە. چراکە دوور خرابووەوە، وەلێ سەرباری ئەوەش، بەتەواوی بینیم ئەوی تریان ئەمجار لە تاریکییەکەدا دەرزییەکەی لە چاوی چەپم چەقاند. ئەو پێش کەمێک دەرزییەکەی لە دەستی قەرە دەرهێنابوو؛ ئەمجار هوشیارتر و وردبینتر بوو. کاتێک هەستم کرد دەرزییەکە لە ناکاو بە چاومدا کرا، هیچ نەجووڵام، هەستم بەهەمان سووتانەوە کرد. وەک بڵێی ڕچیویی تەوێڵم بەهەموو سەرمدا تەشەنەی دەکرد، دوای دەرهێنانەوەی دەرزییەکە، ئازار ڕاوەستا. ئێستا، وەک بڵێی لە کاری خۆیان دڵنیا نەبن، تاوێک سەیری چاوانی من و ساتێک تەماشای نووکی دەرزییەکەیان دەکرد. پاش تێگەیشتن لەو بەڵا ترسناکەی بەسەر منیان هێنابوو، پاڵنان و چەپۆکبازی ڕاوەستا و باری سەر باڵەکانم سووک بوون.

چەشنی ئەوەی بلوورێنم، دەگریام. لەتاو ئازار نا، بگرە لەبەر هەستکردنم بەو بەڵایەی بەسەرم هاتبوو.

نازانم چەند هاوارم کردبوو. دەسپێک هەستم کرد هاوارەکانم، نەک تەنیا هەر من، بگرە ئەوانیشی ئاسوودە کردووە. دەنگم، ئێمەی لەیەکدی نزیک دەکردەوە.

دەمبینی بەدرێژتربوونەوەی هاوارەکانی من، ئەوان شپرزە دەبوون. هێشتا هیچ ئازاری نەبوو، بەڵام لە هۆشم دەرنەچوو کە دەرزی کراوە بەهەردوو چاوانمدا.

هێشتا کوێر نەبووبووم. لە خوا بەزیاد بێت جارێ دەمتوانی ببینم بەترس و خەمەوە سەیری من دەکەن و سێبەرەکانیان بەبێ ئۆقرەیی لە بنمیچی تەکیەدا دەجووڵێتەوە. ئەمە، هەم خۆشحاڵی کردم و هەم منی ڕادەستی شپرزەییەکی قووڵ کرد. هاوارم کرد: "وازم لێ بێنن، دەستم دامێنتان وازم لێ بێنن با جارێکی تریش گشت شتەکان ببینم."

قەرە گوتی: "زوو بە، بیگێڕەوە. ئەو ئێوارەیە چۆن لەگەڵ زەریف ئەفەندیدا یەکدیتان گرت؟ دوایی وازت لێ دێنین."

"لە قاوەخانەوە بۆ ماڵ دەگەڕامەوە، زەریف ئەفەندیی داماوم لێ پەیدا بوو. شپرزە بوو، حاڵێکی فرە پەرێشانی هەبوو. دەسپێک دڵم پێی سووتا. بەڵام ئێستا دەستم لێ هەڵبگرن، دوایی هەمووییتان بۆ دەگێڕمەوە. خەریکە بەرچاوم ڕەش دەبێت."

قەرە وەک کەسێکی خاوەن ئەزموون گوتی: "یەکسەر ڕەش نابیت. باوەڕت هەبێت

مامۆست عوسمان بەچاوی کونکراوەوە ئەسپە لووت براوەکەی دەستنیشان کرد."

"زەریف ئەفەندیی بەلەنگاز گوتی دەمەوێت قسەت لەگەڵدا بکەم و تەنیا متمانەم بەتۆ هەیە."

بەڵام ئێستا دڵم بەخۆم دەسووتا، نەک بەئەو.

قەرە گوتی: "ئەگەر پێش ئەوەی خوێن لە چاوانت بنیشێت، قسەمان بۆ بکەیت، ئەوا بەیانی دەتوانیت بۆ دواجار پڕ بەدڵی خۆت سەیری دنیا بکەیت. بڕوانە، باران وا خۆشی دەکاتەوە."

"بە زەریف ئەفەندیم گوت با بگەڕێینەوە بۆ قاوەخانە، بەڵام حاڵی بووم حەزی لەوێ نییە و تەنانەت لێشی دەترسێت. یەکەمجارم بوو هەستم کرد ئەو زەریف ئەفەندییەی لە سەردەمی سالانی شاگردیمانەوە ماوەی بیست و پێنج ساڵ بوو پێکەوە نیگارمان دەکێشا، ئا بەوجۆرە دابڕاوە و بەتەواوی لێمان دوورکەوتووەتەوە. هەشت نۆ ساڵی ڕابردوو، لەدوای ژن هێنانییەوە لە نیگارخانە دەمبینی، بەڵام نەمدەزانی چ دەکات... پێمی گوت دوایین نیگاری بینیوە. بەقسەی ئەو تاوان و گوناهێکی گەورەی تێدابوو. گوتی ئەوە بارێکی گرانە و کەسمان ناتوانین خۆمانی بدەینە بەر. دەیگوت هەر لەبەرئەوەش هەموومان لە دۆزەخ دەسووتێنرێین. شپرزە بوو، ترسی لێ نیشتبوو؛ وەک کەسێک بێ ئاگاداریی خۆی گوناهێکی گەورەی کردبێت، هەستی بەڕووخان دەکرد."

"گوناهی گەورە چی بوو؟"

"کاتێک ئەمەم لێ پرسی، وەک ئەوەی بخوازێت بڵێ مەگەر نایزانیت، بەسەرسامی چاوانی داچەقاند. ئەو ساتە بیرم کردەوە برادەرەکەی سەردەمی شاگردیمان وەک ئێمە پیر بووە. گوتی لە نیگارەکەی زاوای بەستەزماندا بێباکانە کەڵک لە ڕوانگەی فەڕەنگ وەرگیراوە. دەیگوت لەو نیگارەدا وەک ئەوەی فەڕەنگەکان دەیکەن، نیگاری شتەکان بەپێی گرینگییان لە ئەقڵی خوادا نا، بگرە وا کێشراوە وەک ئەوەی کەوتووەتە بەرچاومان. ئەمەش گوناهێکی گەورە بووە. گوناهی دووەمیش کێشانی نیگاری سوڵتانی خەلیفەی موسڵمان بووە بەهەمان قەوارەی نیگاری سەگێک. گوناهی سێهەم، کێشانی نیگاری ئیبلیس بووە بەهەمان گەورەیی و پێشاندانی بووە



بە خوێنشیرینی. بەڵام لە هەمووی کفرتر ئەوە بوو کاتێک ئەم ڕوانگەی فەڕەنگە دەخرایە نیگارەکەوە، شێوەی سوڵتانمان بە گەورەیی و بەتەواوی وردەکارییەکانی ڕوویەوە لە نیگارەکەدا دەکێشرا. کتومت چەشنی ئەوەی بتپەرستان دەیکەن... یاخۆ وەک ئەو پۆرترێتانەی کە کرستیانە ڕزگارنەبووەکانی دەستی بتپەرستی لەسەر دیواری کلێساکاندا دەیکێشن و کڕنۆشیان بۆ دەبەن. زەریف ئەفەندی ئەم وشەیە لە زاواتەوە فێر بووبوو و فرە باشی لێ دەزانی و بەڕاستی باوەڕی هێنابوو پۆترێت گەورەترین گوناهە و کۆتایی بە نیگاری موسڵمان دەهێنێت. لەبەرئەوەی نەچووینە قاوەخانە، لەبەرئەوەی دەیگوت لەوێ زماندرێژی دەرهەق بە حەزرەتی مەلا ئەفەندی و ئاینمان دەکرێت، گشت ئەم شتانەی بەدەم پیاسەکردنەوە لە کۆڵانەکان بۆم گێڕایەوە. تاوناتاوێک ڕادەوەستا و وەک ئەوەی داوای هاوکاری بکات، لێی دەپرسیم ئایا گشت ئەمانە ڕاستن، چارە نییە و لە دۆزەخ دەسووتێین؟ هەستی بە تەنگژەی پەشیمانی دەکرد، زۆری پێ گران بوو و شینی دەگێڕا، بەڵام تاوێک هەستم کرد بەهیچ جۆرێک باوەڕی پێ ناکەم. سەختەکارێک بوو بەدرۆ شینی دەگێڕا."

"چۆن ئەمە تێ گەیشتیت؟"

"ئێمە هەر لە منداڵییەوە زەریف ئەفەندیمان دەناسی. زۆر سەرڕاست، بەڵام بێدەنگ و خامۆش و بێرەنگ بوو، ڕێک چەشنی زەرکارییەکانی. دەتگوت ئەوەی بەرامبەرم کەسێکی لەو گەمژەتر و ساویلکەتر و باوەڕمەندتر، بەڵام ڕووکەشتر بوو."

قەرە گوتی: "دەگوترێت ئەویش سەر و سەکووتی لەگەڵ ئەرزەڕوومییەکاندا هەبووە."

گوتم: "هیچ موسڵمانێک لە سۆنگەی ئەوەی بێ ویستی خۆی گوناهی کردووە، هێندە شین ناگێڕێت. موسڵمانی باش دەزانێت خوا دادپەروەر و خاوەن لۆجیکە و حسێب بۆ نیازی بەندەش دەکات. تەنیا کەسانێکی مێشک بچووکی وەک مێشکی مەل باوەڕیان وایە ئەگەر کەسێک بەنەزانی گۆشتی بەرازی خوارد، ئیدی دەبێت بچێتە دۆزەخ. موسڵمانی ڕاستەقینە ئەوەش دەزانێت ترسی دۆزەخ بەکەڵکی ترساندنی کەسانی تر دێت، نەک خۆی. ئەرێ، زەریف ئەفەندی ئەمەی دەکرد؛ دەیویست من بترسێنێت. ئەو کاتە ئەوەش حاڵی بووم زاوات فێری کردووە بەوجۆرە ڕەفتار بکات. برایانی نیگارکێشی خۆشەویستم، ئێستا بەڕاستی پێم بڵێن، ئایا خوێن چاوانم

دادەپۆشێت، ئایا گلێنەکانم ڕەنگ لەدەست دەدەن؟"

چراکەیان هێنا و لە دەموچاوم نزیکیان خستەوە، بەوردبینیی تیمارکەر و دلۆڤانانە سەیری چاوانیان کردم.

"هەر دەڵێی هیچ نەبووە."

ئایا ئەم سێیانەی چاوانیان لە چاوانم بڕیبوو، دوا شت بوو لەم دنیایەدا دەمبینی؟ لە سۆنگەی ئەوەی حاڵی دەبووم تا کۆتاییی ژیان ئەم شتانە لەبیر ناکەم و ئومێدیشم لەکن پەیدا بووبوو، قسەم دەکرد:

"زاوات بە زەریف ئەفەندیی ڕاگەیاند کەوا کارێکی قەدەغە دەکات. دوایین نیگاری داپۆشیبوو، هەر گۆشەیەکی بۆ یەکێکمان هەڵدایەوە و لەوێدا نیگارێکی پێمان کێشا و تەواوی نیگارەکەی شاردەوە... دۆخێکی نهێنی و شاراوەی بە نیگارەکە دا و بۆنی گوناهێک بڵاو بووەوەوە. ئەو یەکەم کەس بوو دوودڵیی کرد و گوناهەکەی بە ئێمە گەیاند، نەک پیاوانی ئەرزەڕوومیی کە لە ژیانیاندا کتێبی بەنەخش و نیگاریان نەبینیوە. بەڵام داخۆ چ شتێک هەیە نیگارکێشی ویژدان پاک بترسێنێت؟"

قەرە لەوچەبازانە گوتی: "ئیدی زۆر شت هەیە نیگارکێشی ویژدان پاک بترسێنێت. بەڵێ، کەس هیچی لەدژی نەخش نییە، بەڵام بەپێی ئاینی ئێمە نیگار قەدەغەیە. لەبەرئەوەی نیگارەکانی وەستایانی عەجەم و تەنانەت شاکارەکانی گەورەترین مامۆستایانی هەراتیش دواجار وەک بەشێک لە ڕازاندنەوەی قەراغ و چوارچێوە تەماشا دەکرا و جوانیی نووسین و شاکاری خۆشنووسیی دەخستە ڕوو، کەس هەقی بەسەریانەوە نەبوو. جا بۆچی چەند کەس نیگارەکانی ئێمە دەبینن؟ بەڵام چەندی زیاتر سوود لە شێوازی مامۆستایانی فەرەنگ وەربگرین، نەخش یان ئەو وردەیەی ئێمە دروستی دەکەین، لە نەخش دەردەچێت و لەبەرەوە ڕێک و ڕەوان دەبێت بە نیگار. ئەمەش ئەو شتێکە قورئانی پیرۆز قەدەغەی کردووە و پێغەمبەریشمان هیچ حەزی پێ نەکردووە. سوڵتانیشمان و زاواشم ئەمەیان زۆر باش دەزانی. زاوام لەم سۆنگەیەوە کوژرا."

گوتم: "زاوات لەبەرئەوەی ترسابوو، کوژرا. ئەویش کتومت وەک تۆ دەیگوت نەخش پێچەوانەی ئاین و کتێب نییە... پیاوانی ئەرزەڕوومی منەی شتێکی دژ بە ئاینیان



دەکرد و ئەمەش ڕێک ئەو شتە بوو. زەریف ئەفەندی و زاوات بۆ یەکتر تەواو گونجاو بوون."

قەرە گوتی: "جا هەردووکیان تۆ کوشتنت، وا نییە؟"

وامزانی لەپڕ لێم دەدات و هەر ئەو ساتەش حاڵی بووم مێردی شەکوورەی شۆخ هیچ لە کوژرانی زاوای بەگازندە نییە. لێی نەدەدام، ئەگەر لێشی بدامایە، ئیدی باکم نەبوو.

بەکەللەڕەقی گوتم: "ڕاستییەکەی، زاوات هێندەی هەوڵی دەدا بەپێی داخوازیی سوڵتانمان کتێبێک لەژێر کاریگەریی نیگارکێشانی فەرەنگدا ئامادە بکات، ئەوەندەش خوازیار بوو کتێبێک ئامادە بکات کە شەڕ بە هەمووان بفرۆشێت و گوناهەکە بڵاو بکاتەوە. ئەمەش بۆ ئەوەی لووتبەرزانە خۆی مەزن بکات. چەشنی کۆیلە، شەیدای نیگاری ئەو نیگارکێشە فەرەنگانە بووبوو کە لە کاتی گەشتەکانیدا دیبوونی. تا ئەوپەڕی سنوور باوەڕی بەو شتانە هێنابوو کە بەدرێژاییی رۆژگار بۆ گشتمانی دەگێڕایەوە. باسی ئەو شتە پڕوپووچانەی ڕوانگە و پۆرترێتی بۆ تۆش گێڕاوەتەوە. بەبۆچوونی من، ئەو کتێبەی ئامادەمان دەکرد، نە ڕەهەندێکی زیانبەخشی هەبوو و نە شتێکی دژ بە ئاینیشی تێدا بوو... ئەویش لەبەرئەوەی بەمەی دەزانی، خۆی وا پێشان دەدا وەک ئەوەی کتێبێکی ترسناک ئامادە بکات و ئەمەشی زۆر پێ خۆش بوو... ئەنجامدانی کارێکی ترسناک بە دەستووری سوڵتان، لەکن وی بەئەندازەی شەیدابوون بە نیگارەکانی مامۆستایانی فەرەنگ گرینگ بوو. بەڵێ، ئەگەر نیگار بۆ بە دیواردا هەڵواسین بکێشین، دەبێت بە گوناهە. بەڵام من لە هیچ یەکێک لەو نیگارانەی بۆ ئەو کتێبە کێشابوومان، هەستم بە شتێکی پێچەوانەی ئاین، خوانەناسی، زەندیقی و تەنانەت ترسی قەدەغەیەکی نادیاریش نەکرد. ئایا ئێوە هەستتان پێ کردووە؟"

چاوانم کەمێک لە هێزی خۆیان لەدەست دابوو، بەڵام لە خوا بەزیاد بێت دەمتوانی ببینیم و تێ بگەم پرسیارەکەم ئەوانی دوودڵ کردووە.

بەچێژەوە گوتم: "بڕیارتان بۆ نادرێت، وا نییە؟ تەنانەت ئەگەر بەدزیشەوە بیر بکەنەوە لەوە بکەنەوە بەئاستەم بیرۆکەی گوناه و سێبەری بێ ئاینی بە نیگارەکانی

دەستکردی خۆتانەوە هەیبێت، هەرگیز پێتان قەبووڵ ناکرێت و ددانی پێدا نانێن، چونکە ئەمە بەواتای ڕەوابیبەخشینە بە ئەرزەڕوومییانی دوژمنتان و ئەو سۆفییانەی تاوانتان وەپاڵ دەخەن. لەلایەکی تر، ناتوانن بە باوەڕەوە بڵێن لە پاکیدا سەرتوێژی سپیی شیرن، لەبەرئەوەی ئەمە بەواتای دەستبەردانتان دەبێت لە فێڵبازیی خۆ بەزلزانین و لەو لووتبەرزییەی لە ئاکامی ئەنجامدانی کاری شاراوە و ڕازدار و قەدەغەوە دەستگیرتان بووە. ئایا دەزانن منیش چۆن ئاوا تەڵەکەبازیم دەکرد؟ بەهێنانی زەریف ئەفەندیی بێچارە لە نیوەی شەودا بۆ ئەم تەکیەیە. گوایە بەهۆی زۆر گەڕانمانەوە بە کۆڵاناندا، سەرسام بووە و بەو بیانووەوە بۆ ئێرە بەکێشم کرد. ڕاستییەکەی، پێم خۆش بوو کاتێک دەیبینی من پاشماوەی قەلەندەرێکی زەندیق و لەوەش خراپتر، کەسێکی سەوداسەر و تامەزرۆی قەلەندەری بووم. پێم وابوو ئەگەر زەریف ئەفەندی ببینێت من دووا ڕێبواری ڕێبازێکی هەڵوەشاوەم، ڕێبازێک کە ئەندامەکانی نێربازی و ئەفیۆنکێشی و سەرسەریەتی و هەموو کارێکی چەپەڵیان لێ دەوەشایەوە، ئەوا زیاتر لێم دەترسێت و فرەتر ڕێزم لێ دەگرێت و لەوانەشە لە ترساندا چەنەی دابخات. بێگومان تەواو پێچەوانەی ئەمە ڕووی دا. برادەری مێشک بچووکی سەردەمی منداڵیمان هەم دڵی بە ئێرە نەکرایەوە و هەم یەکسەر بڕیاری دا ئەو تاوانی کفرانەی لە زاواتەوە بیستبوونی، ڕاستن. بەمجۆرە، هاوڕێی خۆشەویستی سالانی شاگردیمان سەرەتا گوتی "هاوکاریم بکە، قایلم بکە ناچینە دۆزەخ تا بتوانین ئەمشەو بەئاسوودەیی بنووین"، پاشان بۆنی هەڕەشە لە قسەکانی هات و گوتی "ئاکامی ئەمە خراپ دەبێت." دەیگوت دوایین نیگار زۆر لە فەرمانەکانی سوڵتانمان دوور کەوتووەتەوە و سوڵتانمان هەرگیز لەمە خۆش نابێت و قسە و قسەڵۆک دەگەنەوە مەلای ئەرزەڕوومی. تازە مەحاڵ بوو قایلی بکەم بەوەی دنیا شامی شەریفە و هەرچوار دەورمان گوڵ و گوڵستانە. حاڵی بووم قسە تووڕەهاتەکانی زاوات و نیگەرانییەکانی خۆی سەبارەت بە سووکایەتیکردن بە ئاین و پێشاندانی ئیبلیس بە خوێنشیرینی، بە پێوەنانەوە بۆ گشت دۆستانی بێ ئەقڵ و شەیدای مەلای ئەرزەڕوومی دەگێڕێتەوە و ئەوانیش بڕوا بە بوختانەکان دەکەن. ئێوە دەزانن لەبەرئەوەی گەیشتینە ئاستێک کە سوڵتانمان لە نزیکەوە بایەخمان پێ بدات، نەک تەنیا دەستەی هونەرمەندان، بگرە چۆن سەرجەم پیشەکاران ئیرەییان پێمان



دەبرد. لەوانە بوو سەرجەم پێکەوە و بەچێژەوە بیانگوتایە: *نیگارکێشان* کفر دەکەن. ڕێی تێ دەچوو بەهۆی هاوکاریی نێوان زاوا و زەریف ئەفەندییەوە ئەم بوختانە بەڕاست بگەڕابایە. بۆیە دەڵێم بوختان، چونکە هیچ بڕوام بەو قسانە نەبوو کە زەریفی برامان لەبارەی کتێبەکەوە و دوایین نیگارەوە دەیکردن. ئەو کاتە من هیچ ڕێم بەخۆم نەدەدا بهێڵم پەڵە بە زاوای خوا لێخۆشبووتەوە بلکێت. بگرە پێم وابوو کارێکی باش بوو سوڵتانمان لە مامۆستا عوسمان زیاتر، حەزی لەو بوو. هێندەی ئەو نا، بەڵام منیش بڕوام بەو شتانە هەبوو کە بەدرێژی لەبارەی وەستایانی فەرەنگ و نیگارەکانیانەوە بۆمی گێڕابووەوە. لە ناخەوە بیرم دەکردەوە ئێمەی نیگارکێشانی عوسمانی بێ ئەوەی هیچ دانوستانێکمان لەگەڵ ئیبلیسدا هەبێت، دەتوانین بە ئارەزووی دڵ و بە جوانی شتگەلێک لە شێوازی فەرەنگ و لەو شتانەی لە گەشتەکانماندا دیبوومانن، هەڵبژێرین و ئەمەش هیچ کاتێک دەردی سەری بۆ نەدەخوڵقاندین. ژیان سادە بوو، زاوای خوا لێخۆشبووت لە دوای مامۆستا عوسمان، بۆ من باوکی نوێی ئەو ژیانە نوێیە بوو."

قەرە گوتی: "جارێ مەیە سەر ئەو بابەتە. لە پێشدا باسی ئەوە بکە زەریفت چۆن کوشت."

گوتم: "من ئەم کارەم"، حاڵی بووم نەمدەتوانی وشەی "کوشتن" بەکار بهێنم. درێژەم دایێ و گوتم: "تەنیا بۆ خۆمان و بۆ ڕزگارکردنی خۆمان نا، بگرە بۆ سەلامەتیی سەرجەم نیگارخانە کرد. زەریف ئەفەندی وا تێ گەیشتبوو چەکێکی هەڕەشەی کەوتووەتە دەست. لە خوای گەورە پاڕامەوە پێشانم بدات ئەم نامەردە چەند چەپەڵە. خوا پاڕانەوە و نزامی قەبووڵ کرد و پێشانی دام ئەو نامەردە چەندە چەپەڵە: تەماحی پارەم خستە بەری. ئەم زێڕانەم بیر کەوتەوە، بەڵام بە ئیلهامێک لە خواوە درۆیەکم هەڵبەست. گوتم زێڕەکان لێرە لە تەکیە نین، لە شوێنێکی تر شاردوومنەتەوە. دەرچووینە دەرێ. بێ ئەوەی بزانم بۆ کوێ دەچین، بێ ئامانج بە کۆڵان و گەڕەکە دوورەکاندا ڕۆیشتین. بەهیچ جۆرێک نەمدەزانی دەبوو چ بکەم و زۆریش دەترسام. لە کۆتاییی ڕێ و ڕۆیشتنی بێ ئامانج و بێ ئاراستەمان چووینە کۆڵانێکەوە پێشتر پیایدا ڕۆیشتبووین و ئەمەش زەریفی زەڕکاری برامان کە

سەرتاپای ژیانی بە دووبارەبوونەوە و شێوە بەخشیبوو، خستە گومانەوە. بەڵام خوا شوێن سووتاوییەک و کوێرەبیرێکی نزیک لەوێشی هێنایە بەردەممان."

لەم خاڵەدا حاڵی بووم ناتوانم پاشماوەی ڕووداوەکە بگێڕمەوە و ئەمەم بە ئەوانیش گوت. بوێرانە گوتم: "ئەگەر ئێوەش بوونایە لە جێی من، هەمان شتتان دەکرد."

کاتێک گوێم لێ بوو وا بە مافدارم دەزانن، لە ناخەوە ئارەزووم دەکرد بگریم: دەمویست بڵێم "لەبەرئەوەی ئەو بەزەیی پێداهاتنەوەیەی شایەنی نەبووم، دڵی نەرم کردبووم"، بەڵام وا نەبوو. دەمویست بڵێم "پاش ئەوەی کوشتم و فڕێم دایە بیرەوەکەوە و کاتێک جەستەی بەر بنی بیرەکە کەوت، دەنگێکی لێ بەرز بووەوە و لەبەرئەوەی ئێستا جارێکی تر ئەو دەنگە دەبیستمەوە"، بەڵام وا نەبوو. دەمویست بڵێم "لەبەرئەوەی بیرم کەوتەوە پێش ئەوەی ببم بە بکوژ، زۆر کامەران بووم و وەک هەر کەسێکی تر بووم"، بەڵام واش نەبوو. کوێرێک هاتبووە بەرچاوم لە کاتی منداڵیمدا بە گەڕەکی هەژاری ئێمەدا تێ دەپەڕی و ئێمەی منداڵان لە دووریی کانیی گەڕەک ڕاوەدەستاین و سەیرمان دەکرد: لە جلوبەرگە چڵکنەکانی، جامێکی مسی چڵکنتری دەردەهێنا و بە ئێمەی دەگوت: کوڕەکانم، کێتان جامی ئەم مامە کوێرەی خۆتان لە ئاوی کانی پڕ دەکات کاتێک هیچ کەسێک نەدەچوو، وای دەگوت: خێرە، کوڕم خێرە. لەبەرئەوەی ڕەنگی گلێنەی چاوی کاڵ بووبووەوە و نەمابوو، لەگەڵ سپێنەی چاوی هەمان ڕەنگیان هەبوو.

شپرزەی ئەوە بووم منیش وەک ئەو مامە کوێرەم لێ بەسەر بێت، بۆیە بەپەلە و بێ ئەوەی چێژی لێ وەربگرم، باسی چۆنیەتیی کوشتنی زاوا ئەفەندیم گێڕایەوە. نە زیاد لە پێویست ڕاستم و گوت و نە زۆریش درۆم کرد: لەبەرئەوەی لە نێوان ڕاستی و درۆدا دۆخێکم بەخۆم دابوو کە دڵی نەدەگوشیم، هەستم کرد تێ گەیشتن من بەمەبەستی کوشتنی زاوا ئەفەندی نەچوومەتە ئەوێ: وەک ئەوەی من دەمویست ئەوان وا حاڵی بوون من پێشتر نیازی کوشتنی زاوام نەبووە و کاتێکیش گوتم ئەگەر مرۆڤ نیازی خراپ نەبێت هەرگیز ناچێتە دۆزەخ، ئەوان وا تێ گەیشتن من بیانوو دێنمەوە و لە داوای لێبووردن دەگەڕێم.

بەدەم بیرکردنەوەوە گوتم: "دوای ئەوەی زەریف ئەفەندیم ڕادەستی فریشتەکانی خوا



کرد، ئەو قسانەی زاوای لێخۆشبوو بەم دواییانە بۆی دەکردم بووبوونە کرم و سەریان لە جگەرم نابوو. من بەهۆی دوایین نیگارەوە بووبووم بە بکوژ و ئەمەش ئەو نیگارەی لە چاوی مندا گەورە کردبووەوە. زاوا ئیدی بەمەبەستی کتێبەکە کەسمانی بۆ ماڵی خۆی بانگ نەدەکرد و من بۆیە چوومە کنی تا ئەو دوایین نیگارەم پێشان بدات. نیگارەکەی پێشان نەدام و ڕەفتاری لەگەڵ مندا بەشێوەیەک بوو وەک ئەوەی دنیا شامی شەریف بێت و دەوروبەر گوڵ و گوڵزار بێت. گوتی هیچ نیگار و شتێکی تری ئەوتۆ لە گۆڕێدا نییە شایەنی ئەوە بێت مرۆڤی لە پێناودا بکوژرێت. بۆ ئەوەی هێندە بەچاوی سووک بۆم نەڕوانێت و بایەخم پێ بدات، ددانم پێدا نا زەریف ئەفەندیم کوشتووە و فڕێم داتەوە بیرەوە. بایەخی پێ دام، بەڵام بەردەوام بوو لەسەر بەچاوی سووکەوە تێڕوانینم. هیچ باوکێک بۆی نییە بەچاوی سووک بۆ کوڕی خۆی بڕوانێت. مامۆستا عوسمانی گەورە زۆر لێمان تووڕە دەبوو، فرەی لێ دەداین؛ بەڵام هیچ بە چاوی سووک تەماشامانی نەدەکرد. برایانم، بەناپاکیکردنمان لە مامۆستا عوسمان، هەڵەمان کردووە."

براکانم وەک ئەوەی لە نوێنی مردندا گوێ بۆ دوایین وتەکانم ڕابگرن، چاویان لە چاوم بڕیبوو و منیش بە دەمیانەوە پێ کەنیم. وەک ئەوەی برایەکیان لە سەرەمەرگدا بێت، دەیانڕوانی و منیش دەمبینی تا دێت تەمومژ دایان دەگرێت و لێم دوور دەکەونەوە.

"لەبەر دوو شت زاواتم کوشت. لەبەرئەوەی مامۆستا عوسمانی ناچار کردبوو وەک مەیموون لاسایی سەبستیانۆی نیگارکێشی فەڕەنگ بکاتەوە. هەروەها لەبەرئەوەی لاوازیم نواندبوو و لێم پرسیبوو داخۆ من شێوازی تایبەت بەخۆم هەیە؟"

"چی گوت؟"

"گوتی هەتە. بەڵام ئەمە بەلای ئەوەوە سووکایەتی نەبوو، بگرە مایەی شانازی بوو. دێتەوە بیرم منیش بەشەرمەوە بیرم کردەوە داخۆ بۆ منیش مایەی شانازییە: من شێواز هەم وەک جۆرێک لە ناڕەسەنی و بێ شەرەفی دەبینم و هەم کرمیشی بەرداوەتە هەناوم. دەمەوێت شێوازم نەبێت، بەڵام ئیبلیس دنەم دەدات و حەزیشم لێیە."

قەرە لەوچەبازانە گوتی: "هەموو کەسێک خوازیارە بەدزییەوە شێوازێکی هەبێت. گشت کەسێک دەیەوێت وەک ئەوەی سوڵتانمان خوازیارە، پۆرترێتی بکێشرێت."

گوتم: "جا ئایا ئەمە نەخۆشییەکی وایە مرۆڤ نەتوانێت بەرەنگاری ببێتەوە؟ تا ئەم نەخۆشییە زیاتر تەشەنە بکات، هیچ کاممان ناتوانین خۆمان لە بەرامبەر شێوازی مامۆستایانی فەرەنگدا ڕابگرین."

بەڵام کەس گوێی لێ نەدەگرتم: قەرە، بەسەرهاتی ئەو بەگە بەدبەختەی تورکمانی دەگێڕایەوە کە لەبەرئەوەی زوو ئەڤینی خۆی بۆ کچی پادشا ئاشکرا کردبوو، ماوەی دوازدە ساڵی لە تاراوگەی وڵاتی چیندا بەسەر بردووە. بەدرێژاییی دوازدە ساڵ خەیاڵی لە یارەکەی دابوو و لەبەرئەوەی پۆترێتێکی دڵدارەکەی پێ نەبووە، لەناو شۆخانی چینیدا ڕووی ئەڤینداری خۆی لەبیر دەچێتەوە و ئازاری ئەڤین دەبێت بە خەمێکی قووڵ و خوا دەرخواردی دەدات. بەڵام هەموومان دەمانزانی ئەوەی دەیگێڕێتەوە، بەسەرهاتی خۆیەتی.

گوتم: "لە سایەی زاواتەوە ئیدی گشتمان فێری ئەم وشەی پۆرترێتە بووین. خوا یار بێت ڕۆژێک لە ڕۆژان فێر دەبین بێ ترس باسی ژیانی خۆیشمان بکەین هەر وەک ئەوەی هی خۆمان بێت."

قەرە گوتی: "تەواوی بەسەرهاتەکان، بەسەرهاتی هەمووانن، هی مرۆڤ خۆی نین."

منیش بەیتەکەی هاتفیی شاعیری هەراتیم تەواو کرد و گوتم: "سەرجەم نەخشەکانیش نەخشی خوان. بەڵام ئەگەر شێوازی مامۆستایانی فەرەنگ تەشەنە بکات، هەرکەسێک پێی وا دەبێت گێڕانەوەی بەسەرهاتی کەسانی تر وەک ئەوەی بەسەرهاتی خۆی بێت، ماریفەتە."

"ئەمەش ڕێک ئەو شتەیە کە ئیبلیس دەیخوازێت."

تا هێزم تێدا بوو هاوارم کرد: "ئیدی دەستم لێ هەڵگرن، با بۆ دواجار سەیری دنیا بکەم."

کاتێک بینیم وا زراویان تۆقی، لە ناخەوە متمانەیەکم لەکن پەیدا بوو.

سەرەتا قەرە خۆی کۆ کردەوە: "ئایا دوایین نیگار دەردێنیت؟"



بەجۆرێک بۆ قەرەم ڕوانی ئەو یەکسەر وا تێ گەیشت من دەردی دێنم. وازی لێ هێنام. لێدانی دڵم زیادی کرد.

وا دیارە ئێوە لە زووەوە ئەو ناسنامەیەی من حاڵی بوون گوایە من هەوڵی شاردنەوەیم دەدا. سەرباری ئەوەش، پێتان سەیر نەبێت وەک مامۆستایانی کۆن هەرات ڕەفتار دەکەم: ئەوان لە سۆنگەی ڕێزگرتنەوە لە وەستا و داوونەریتەکان واژۆی خۆیان دەشاردەوە، نەک لەبەرئەوەی نەبادا واژۆکانیان کەسایەتییان ئاشکرا بکات. چراکەم بەدەستەوە بوو و ڕێم بۆ سێبەری کاڵەوەبووی خۆم کردەوە و بەخرۆشەوە بە ژوورەکانی تەکیەی تاریک و ئەنگوستەچاودا ڕێم کرد. ئایا خەریک بوو کوێراییی چاوم دادەهات، یاخۆ ژوورەکان و هەیوانەکان هێندە تاریک بوون؟ چەند کات و ڕۆژ و هەفتەم هەبوو بەر لە کوێربوونم؟ خۆم و سێبەرەکەم ڕاوەستاین، دەستم دایە کاغەزی گۆشەی پاکی دۆڵابە تۆزاوییەکەی ناو خێو و تارماییی ئاشپەزخانە و بەپەلە گەڕاینەوە. قەرە، بۆ دڵنیابوون دوام کەوتبوو، بەڵام خەنجەرەکەی لەگەڵ خۆیدا نەهێنابوو. ئایا دەمویست بەر لەوەی کوێر بم، خەنجەرەکەی هەڵبگرم و ئەویش کوێر بکەم؟

بەشانازییەوە گوتم: "خۆشحاڵم بەوەی بەر لە کوێربوونم جارێکی تریش ئەمەم بینی. دەمەوێت ئێوەش بیبینن. سەیری بکەن."

بەمجۆرە، ئەو دوایین نیگارەی لە ڕۆژی کوشتنی زاوادا لە ماڵی ئەوان هێنابووم، لەبەر ڕووناکیی چراکە پێشانی ئەوانم دا. سەرەتا سەرنجم لەو نیگایانەیان دا کە بەحەز و ترسەوە لە نیگاری دووپەڕەییيان بڕیبوو. کاتێک وەرگەڕام و لەگەڵ ئەواندا کەوتمە تەماشاکردنی نیگارەکە، هێدی هێدی دەلەرزیم. نازانم بەهۆی ئەوەی دەرزیی پەڕەمووچ بە چاومدا کرابوو، یاخۆ بەهۆی حاڵ لێهاتنمەوە بوو، جەستەم گڕی گرتبوو.

ئەو نیگاری دار و ئەسپ و ئیبلیس و مردن و سەگ و ژنانەی هەموومان لە ماوەی ساڵی ڕابردوودا بۆ گۆشەکانی ئەم نیگارە دووپەڕەییيە کێشابوومان، زاوا ئەفەندی نەزانانە بەشێوازی نوێ ڕیزی کردبوون و گەورەیی و بچووکیی نیگارەکانی بەشێوەیەک دانابوو کە زەڕکاری و چوارچێوەکانی زەریف ئەفەندیی خوا لێخۆشبوو

ئیدی هەستێکی وای لەکن دروست دەکردین وەک ئەوەی لە پەنجەرەیەکەوە سەیری سەرانسەری دنیا بکەین، نەک هەر بەتەنیا سەیری پەڕەی کتێبێک. لە چەقی ئەو دنیایە و لە جێیەی پێویست بوو پۆتریێتی سوڵتانمان هەبێت، پۆرتریێتی من هەبوو و تاوێکیش بەشانازییەوە تەماشام کرد. لەبەرئەوەی چەندین ڕۆژ سڕیبوومەوە و شێواندبووم و زۆر سەیری ئاوێنەم کردبوو و لە دۆخێکی خراپدا کارم کردبوو و نەمتوانیبوو زۆر بەخۆمی بشوبهێنم، کەمێک بێزار بووم؛ ئەمەم بەڵام لەبەرئەوە نەبوو بڵێی نیگار و پەڕەکە تەنیا منیان لە چەقی دنیایەکدا جێگیر کردبێت، بگرە لەبەر هۆیەکی ئیبلیسانەی دەرەوەی سنووری هێزی ئەقڵم، هەستم بەخرۆشێکی جڵەو لەدەست دەرچووش دەکرد. ئەمە خرۆشێک بوو منی لە خۆم زیاتر قوڵتر و تێکەڵ و پێکەڵتر و ڕازاویتر دەکرد. دەمویست برایانی نیگارکێشم ئەم خرۆشە ببینن و لێی حاڵی بن و لەگەڵیاندا دابەشی بکەم. هەم وەک سوڵتان یان پادشایەک لە چەقی هەموو شتێکدا بووم و هەم خۆم خوێشم بووم. ئەم ڕەوشە هەمان کات شانازی و شەرمی پێ دەدا. لەبەرئەوەی ئەم دوو هەستە هاوسەنگیی یەکتریان ڕادەگرت و منیان ئاسوودە دەکرد، حەزێکی سەرسوڕهێنم لەو دۆخە نوێیەم لە نیگارەکەدا وەردەگرت. بەڵام بۆ ئەوەی ئەم حەزە کامڵ بێت، پێویست بوو سەرجەم چرچ و لۆچی ڕووم و جلەکانم، سێبەر و قنچکە و دوومەڵ، هەر لە ڕیشمەوە تا بە هۆنینەوەی قوماش دەگات، بە هونەری نیگارکێشانی فەڕەنگ تەواو و بێ کێماسی بێت.

دۆستانی دێرینم سەیری نیگارەکەیان دەکرد و منیش ترس و سەرسامی و هەستێکم بە ڕوویانەوە دەبینی سەری هەموومانی خواردبوو و فەوتاندبوومانی، ئیرەییم دەبینی. سەرباری ئەو نەفرەتە تووندەی لە کەسێکی تا بیناقاقا لە گوناهدا نقومبوویان دەکرد، خۆزگەشیان پێ دەخواست.

گوتم: "شەوانە کاتێک لێرە لەبەر ڕووناکیی قوتیلکەدا سەیری ئەم نیگارەم دەکرد، سەرەتا هەستم کرد خوا دەستی لە من هەڵگرتووە و تەنیا ئیبلیس دەتوانێت لە تەنیابوونمدا دۆستایەتیم بکات. ئەگەر بەڕاستی لە چەقی دنیادا بوومایە – هەرجارێک سەیری نیگارەکەم دەکرد، زۆر خوازیاری ئەمە بووم–، سەباری ئەم شتە خۆشەویستانەی دەوروبەرم، تەنانەت ئەو ژنەی لە شەکوورەی شۆخ دەچێت و



عەبداڵەکانی دۆستم و جوانیی ڕەنگی سووری بالادەستی ناو نیگارەکە، زیاتر هەستم بەتەنیایی دەکرد. ترسی ئەوەم نییە کەسایەتی و تایبەتمەندیی خۆم هەبێت و کەسانی تر کڕنۆشم بۆ ببەن، تەواو بە پێچەوانەوە، من ئەوەم دەوێت."

لەقلەق بەنووواندنی کەسێکەوە تازە لە نوێژی هەینی هاتبێتە دەرێ، گوتی: "واتا پەشیمان نیت؟"

"نەک لەبەرئەوەی دوو کەسم کوشتووە، بگرە بەهۆی نیگارێکی لەو جۆرەم کێشراوە، خۆم وەک ئیبلیس دێتە بەرچاو. پێم وایە ئەو کەسەم بۆیە کوشتووە بۆ ئەوەی بتوانم ئەم نیگارە بکێشم. بەڵام تەنیایی دۆخی تازەشم دەمترسێنێت. لاساییکردنەوەی مامۆستایانی فەڕەنگ بەرلەوەی دەستی نیگارکێش بە هونەریان بگات، نیگارکێش زیاتر دەکات بە کۆیلە. دەمەوێت لەم دۆخە هەڵبێم. ڕاستییەکەی، ئێوەش حاڵی بوون هەردووکیانم بۆ ئەوە کوشت تا هەموو شتێک لە نیگارخانە وەک ئەوەی لە ڕابردوودا هەبووە، بەردەوام بێت. لەوانەیە خواش حاڵی بووبێت."

پەپوولەی نازدارم گوتی: "بەڵام ئەمە بەڵای زیاتر بەسەر هەموومان دێنێت."

قەرەی بوودەڵە هێشتا سەیری نیگارەکەی دەکرد کاتێک من لەپڕ توند باسکیم گرت. تا هێزم تێدابوو نینۆکەکانم لە گۆشتی بازووی چەقاند و باسکیم بادا. خەنجەرەکەی نائاگادارانە بەدەستەوە گرتبوو و کەوتە خوارەوە. دەستم دایێ و لە زەوی هەڵم گرتەوە.

گوتم: "ئیدی بەڕادەستکردنیشم بە ئەشکەنجەدەران ناتوانن لە بەڵای خۆتان ڕزگارتان بێت. نووکی تیژی خەنجەرەکەم بەشێوەیەک نزیک خستبووەوە وەک ئەوەی بمەوێت بیکەم بە چاویدا: "دەرزیی پەڕەمووچەکەم بدەرێ."

بەدەستە ساغەکەی دەری هێنا و دایمێ، خستمە پشتوێنەکەمەوە. نیگام بڕییە ناو چاوانی و چاوەکانی وەک بەرخ بۆمیان دەڕوانی.

گوتم: "زۆر دڵم بە شەکوورەی شۆخ دەسووتێ، چونکە دواجار هیچ چارەیەکی بۆ نەمایەوە شووکردن بەتۆ نەبێت. ئەگەر ناچار نەبوومایە بۆ ڕزگارکردنی ئێوە لە بەڵا زەریف ئەفەندی بکوژم، ئەوا شووی بە من دەکرد و بەختەوەریش دەبوو. من لە هەمووتان زیاتر لەو بەسەرهات و ماریفەتانەی مامۆستایانی فەڕەنگ تێ گەیشتبووم

که باوکی بۆ گشتمانی دەگێڕایەوە. لەبەرئەوە زۆر باش گوێ بۆ ئەم دووا قسانەم ڕابگرن: حاڵی بووم ئیدی لێرە جێ بۆ ئێمە، بۆ ئەو نیگارکێشانەی خوازیارن بە هونەر و سەربەرزیی خۆیانەوە بژین، نەماوە. ئەگەر بەپێی ئەوەی زاوای خوا لێخۆشبوو و سوڵتان دەیانویست، لاسایی مامۆستایانی فەرەنگ بکەینەوە، ئەگەر پیاوانی ئەرزەڕوومیش زەفەرمان پێ نەبەن، ترسنۆکانی ڕاستەقینەی ناو خۆمان لە شێوەی زەریف ئەفەندی دەمانگرن و ناتوانین بگەینە ئەنجام. خۆ ئەگەر گوێڕایەڵی ئیبلیس بین و تا کۆتایی برۆین و ناپاکی لە سەرتاپای ڕابردوومان بکەین و هەوڵ بدەین بۆ بەدەستهێنانی شێواز و کەسایەتیی لەسەر ڕێبازی فەرەنگ، وەک چۆن ئەوەی هونەر و زانستی من بەشی کێشانی ئەم نیگارەی خۆمی نەکرد، بەهیچ جۆرێک لەم ڕووەوە سەرکەوتوو نابین. بە تورەهاتیی ئەو نیگارەی کێشاومە و لەوەوە کە نەمتوانیبوو ڕێکوپێک وەک خۆمی بچوێنم، حاڵی بووم هونەری مامۆستایانی فەرەنگ شتێکە –ئاشکرایە ئێمە ئەم شتە بێ ئەوەی بایەخی پێ بدەین، لە زووەوە دەزانین– سەدان ساڵ پێویستە بۆ فێربوونی. ئەگەر کتێبەکەی زاوا ئەفەندی تەواویش بکرایە و بۆ ئەوان بنێردرایە، ئەوا مامۆستایانی نیگارکێشی ڤینیسیایی پێمان پێ دەکەنن و پێکەنینی ئەوان دۆقیشی دەگرتەوە، هەر ئەوەندە و هیچی تر. ئەو کاتە دەیانگوت عوسمانیگەل دەست لە عوسمانیبوونی خۆیان هەڵدەگرن و ئیدی لێمان نەدەترسان. ئای چەند باش دەبێت ئەگەر بە ڕێبازی مامۆستایانی کۆندا برۆین. بەڵام نە سوڵتانمان و نە قەرە ئەفەندیش کە بەهۆی نەبوونی پۆرترێتی شەکوورە گیانەوە دڵتەنگ بووە و نە هیچ کەسێکی تر خوازیاری گرتنەبەری ڕێبازی مامۆستایانی کۆن نییە. کەواتە لێرە دانیشن و سەدان ساڵ لاساییی شێوازەکانی فەرەنگ بکەنەوە. لووتبەرزانە واژۆ بخەنە سەر نیگارە لاساییکراوەکان. مامۆستایانی کۆنی هەراتی کاتێک لە ڕوانگەی خواوە نیگاری دنیایان دەکێشا، بۆ شاردنەوەی هەبوونی کەسایەتییان، واژۆیان نەدەکرد. بەڵام ئێوە بۆ شاردنەوەی نەبوونی کەسایەتیتان واژۆ دەکەن. هێشتا ڕێگایەکی ڕزگاربوون هەیە، لەوانەیە یەک بەیەک لە دەرگای ئێوەش درابێت و ئێستا لە منی دەشارنەوە: ئەکبەر خانی سوڵتانی هندستان زێڕ و خۆشەویستیی هەڵڕشتووە و هونەربازترین نیگارکێشانی دنیا لە





دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە. ئیدی ئاشکرا بووە ئەو کتێبەی بۆ هەزار ساڵەی ئیسلام ئامادە دەکرێت، لێرە لە ئەستەنبوڵ نا، لە نیگارخانەی ئاگرا فریای دەخەین."

لەقلەق پرسی: "جا نیگارکێش بۆ ئەوەی وەک تۆ زۆرزان بێت، پێویستە لە پێشدا ببێت بە بکوژ؟"

بێ ئەوەی بایەخی بدەمێ، گوتم: "ئەوەندە بەسە لێهاتووترین و هونەرباترین بێت."

کەڵەشێرێکی لەخۆبایی لە دوورەوە دووجار قووقاندی. بوخچە و زێڕەکانم کۆکردەوە، دەفتەری قاڵب و نیگارەکانم خستە پێستەبەندەکەوە. نووکی تیژی خەنجەرەکەم لە گرێملی قەرە قایم کردبوو و وام بەخەیاڵدا هات دەتوانم دانە بەدانە بەم خەنجەرە بیانکوژم، بەڵام ئێستا برادەرانی منداڵیم، ئەوانەی لە سەردەمی شاگردیمانەوە پێکەوە بووین، بە لەقلەقیشەوە، سەرباری ئەوەی دەرزیی پەڕەمووچی بە چاومدا کردبوو، زۆر خۆش دەویست.

پەپوولەی نازدار هەستابووە سەرپێ، قیڕاندم و ترساندم و لە شوێنی خۆی دامنیشاندەوە. ئەم ڕووداوە متمانەی دامێ دەتوانم سپوساغ لە تەکیە دەربچم و دەستوبردم کرد. ڕێک لەو کاتەدا لە دەرگا دەردەچووم، بە پشووکورتی ڕستەیەکی قەبەی دەستهۆنی خۆم گوت:

"دەرچوونم لە ئەستەمبوڵ، وەک دەرچوونی "إبن شاکر" دەچێت لە بەغدای ژێر داگیرکاریی مەگۆلدا."

لەقلەقی بەرچاوتەنگ گوتی: "کەواتە پێویستە ڕوو لە ڕۆژئاوا بکەیت، نەک ڕۆژهەڵات."

وەک زاوا ئەفەندی بە عەرەبی گوتم: "ولله المشرق والمغرب – ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هی خوایە."

قەرە گوتی: "بەڵام ڕۆژهەڵات ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواش ڕۆژئاوایە."

پەپوولە گوتی: "نیگارکێش پێویستە لووتبەرزی نەنوێنێت. لەبری ئەوەی سەری خۆی بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە بیەشێنێت، دەبێت تەنیا بەپێی ئەوەی لە هەناوییەوە هەڵدەقوڵێت، نیگار بکێشێت."

بە پەپوولەی خۆشەویستم گوت: "ئەمە قسەیەکی هێندە ڕاستە کە لە ناخەوە خوازیارم ماچت بکەم."

بەڵام هێشتا دوو هەنگاوم بەرەو لای ئەو نەنابوو قەرە کارزانانە پڕی پێدا کردم. بوخچەی تژە جل و زێڕم بەدەستەوە بوو، پێستەبەندەکەی پڕ لە نیگارکیش بە بن هەنگڵمەوە بوو. کاتێک هەوڵم دا شتەکانم بپارێزم، ئەمجار سەیرم کرد بەرگریم لە خۆم پێ ناکرێت. ئەو دەستەم، کە خەنجەرەکەم پێ گرتبوو، لە دەستی ئەو ڕاپسکاند. بەڵام ئەویش بەخت یاری نەبوو، پێی لە مێزەکە هەڵکەوت و لەپڕ هاوسەنگیی خۆی لە دەست دا . لەبری ئەوەی قۆڵم بگرێت، کەوتە دۆخێکەوە وەک ئەوەی خۆی بە قۆڵمدا هەڵواسیبێت. لەلایەک، بە پاشماوەی هێزی خۆمەوە پێلەقەم تێ سرەواند و لەلایەکی ترەوە، بەگەستنی نووکی پەنجەکانی، ئاگرم لە جەرگی بەردا . لەتاو پەلەقاژەی گیان دەربردن لووراندی. ئەمجار هەمان دەستیم گوشی و ئازارم گەیاندە دڵی و ڕووی خەنجەرم لە دووانەکەی تر کرد و هاوارم کرد:

"لە جێی خۆتان دانیشن."

دانیشتن. بەنەریتی کەیکاوسی داستان، نووکی تیژی خەنجەرم خستە کونی لووتی قەرەوە. کاتێک خوێنی لێ هات، فرمێسکی ئازار لە چاوانی پڕ لە پاڕانەوەی هاتە خوارێ.

گوتم: "ئێستا بڵێ بزانم، ئایا کوێر دەبم؟"

"بەگوێرەی داستانەکان، خوێن لە چاوی هەندێک کەس دەنیشێت و لە چاوی کەسانێکی تر نانیشێت. ئەگەر خوا لە نیگارت ڕازی بێت، بۆ ئەوەی بۆ کن خۆی بتباتەوە، تاریکاییی شاهانەی خۆیت پێ دەدا . ئەو کاتە، لەبری ئەم دنیا چەپەڵە، دیمەنە شاهانەکانی بەر چاوی ئەو دەبینیت. خۆ ئەگەر لە نیگاریشت ڕازی نەبێت، وەک ئێستا لەسەر بینین بەردەوام دەبیت."

گوتم: "من نیگاری ڕەسەن لە وڵاتی هندستان دەکێشم. هێشتا ئەو نیگارەم نەکێشاوە بۆ ئەوە بشێت خوا منی پێ هەڵبەسنگێنێت."

قەرە گوتی: "زۆر خەیاڵی ڕاکردن لە شێوازەکانی فەرەنگ لێ مەدە. ئایا دەزانی ئەکبەر خان هانی سەرجەم نیگارکێشان دەدات واژۆ بخەنە سەر نیگارەکانیان؟ زۆر



لەمێژە قەشە یەسوعییەکانی پورتوگال شێوازەکانی فەرەنگیان گەیاندووەتە ئەوێ. ئەوان ئیدی لە گشت شوێنێکن."

گوتم: "هەرگاڤ شوێنێک هەیە مرۆڤ بۆی ڕا بکات و شتێکی تێدا بکات بۆ ئەوەی بەسادەیی بمێنێتەوە."

لەقلەق گوتی: "بەڵێ، کوێربوون و هەڵهاتن بەرەو وڵاتانی نەبوو."

قەرە گوتی: "بۆچی دەتەوێت بەسادەیی بمێنیتەوە؟ وەک ئێمە بمێننەوە و تێکەڵ بەئێرە ببە."

من گوتم: "بەدرێژاییی ژیانیان لاساییی شێوازەکانی فەرەنگ دەکەنەوە بۆ ئەوەی شێوازی تایبەت بەخۆیان هەبێت. لەبەرئەوەی لاساییی فەرەنگەکانیش دەکەنەوە، هەرگیز نابن بەخاوەنی شێوازی تایبەت بەخۆیان."

قەرە بێ ئابڕووانە گوتی: "شتێکی تر بۆ کردن نییە."

هەڵبەتە تاکە کامەرانیی ئەو، شەکوورەی شۆخ بوو، نەک نیگار. خەنجەری نووک خوێناویم لە لووتی خوێنبەربووی دەرهێنا و وەک شمشێری جەلادێک خۆی بۆ سەر پەڕاندن ئامادە بکات، بەسەر سەرییەوە ڕام گرت.

من شتی پێشتر زانراوم ئاشکرا کرد و گوتم: "ئەگەر بمەوێت، ئێستا دەتوانم سەرت لە جەستەت جیا بکەمەوە، بەڵام دەتوانم لە پێناوی بەختەوەریی شەکوورە و منداڵەکانی، لێت خۆش بم. ڕەفتارت لەگەڵیدا باش بێت، کاری ئاژەڵی و نەزانیی لەگەڵدا نەکەیت. بەڵێنم پێ بدە."

گوتی: "بەڵێنت دەدەمێ."

گوتم: "ئەوا پێشکێشم کردی بە شەکوورە."

بەڵام باسکم ڕەفتارێکی پێچەوانەی قسەی دەرپەڕیو لە زارمی کرد. بەوپەڕی هێزەوە خەنجەرم بۆی داهێنایەوە.

دواسات، هەم لەبەرئەوەی لە جێی خۆی جووڵابوو و هەم بەهۆی ئەوەی من ئاراستەی دەستوەشانەکەم گۆڕیبوو، خەنجەر لە ملی نا، لە شانی چەقی. منیش بەترسەوە سەیری ئەو شتەم کرد کە باسکم خۆبەخۆی خۆی کردبووی. ئەو شوێنەی خەنجەری

لە گۆشت چەقیوم لێ دەرهێنا، سوورێکی تۆخ دەینواند. هەم ترسام و هەم شەرمم لەم ڕەفتارەی خۆم کرد. بەڵام دەشمزانی ئەگەر دواڕۆژێکی نزیک، ڕەنگە لە دەریاکانی عەرەب، کوێر ببم، هیچ کام لە نیگارکێشانی دۆستم لە تەنیشتەوە نابێت تا تۆڵەی لێ بسێنمەوە.

لەقلەق ترسی لێ نیشتبوو نۆرە هاتبێتە سەر ئەو و لەمەشدا مافی خۆی بوو، بۆیە ڕای کرد بۆ ژووره تاریکەکانی ناوەوە. بە چرای دەستمەوە، خۆم و سێبەرم کەوتینە شوێنی، بەڵام ترسام و گەڕامەوە. دوایین شت کە کردم، ماچ و مووچ بوو لەگەڵ پەپوولە و خواحافیزیکردن بوو لێی. لەبەرئەوەی خوێن ڕژابووە نێوانمانەوە، نەماتوانی وەک ئەوەی لە دڵەوە ئارەزووم بوو ماچی بکەم. بینی فرمێسک لە چاوانم هاتە خوارێ.

لە جۆرێک بێدەنگیی مردندا، کە ناڵەی قەرە نەبێت هیچی تر نەیدەشەڵەقاند، لە تەکیە دەرچووم. بە باخچەی تەڕ و قوڕاوی و بە کۆڵاندا ڕام کرد و لەو ناوە دوورکەوتمەوە. ئەو کەشتییەی من دەگەیەنێتە نیگارخانەی ئەکبەر خان، سبەینێ دوای نوێژی بەیانی دەکەوێتە ڕێ. ئەو کاتە دوایین بەلەم لە بەندەری قادرگاوە بەرەو کەشتییەکە بەڕێ دەکەوێت. بەدەم ڕاکردنەوە فرمێسک لە چاوانم دەهات.

کاتێک وەک دز بەبێدەنگی بە ئاکسەرایدا تێ دەپەڕیم، لە ئاسۆ بەئاستەم یەکەم تیریژی ڕۆژم بینی. لە بەرامبەر کانیی یەکەم گەڕەکدا، کە لە نێوان کۆڵانەکانی پشتەوە و ڕێڕەوە تەنگەبەرەکان و دیوارەکاندا لە پێشم هەڵتۆقی، هەمان خانووی بەردین هەڵکەوتبوو کەوا ئەو دەمەی بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر لە یەکەم هاتنمدا بۆ ئەستەنبوڵ شەوم تێدا بەسەر بردبوو. ئەم خزمە دوورەم پێش بیست و پێنج ساڵ جێی بۆ ڕاخستبووم و جوامێرانە و زۆر باش میوانداریی کردبووم. من ئەو کاتە یازدە ساڵان بووم، نیوەی شەو لە سەر دۆشەک میزم بەخۆمدا کرد و ویستم بەهەستی خۆ بەتاوانبارزانینەوە خۆم بهاوێژمە بیری حەوشەوە. ئێستا لە درزی دەرگای کراوەی حەوشەوە دیسان هەمان بیرم بینییەوە. تا گەیشتمە بایەزید، ئەو دووکانی سەعاتچییەی چەندین جار بۆ چاککردنەوەی چەرخی سەعاتە شکاوەکەم ڕووم تێ کردبوو، ئەو چرا بلوورییە خاڵییانەی نەخشم لەسەر دەکێشان و بەدزییەوە



بە کەسانی نەجیبزادەم دەفرۆشتنەوە، ئەو دووکانی شووشەفرۆشەی جامی شەربەت و شووشەم لێ دەکڕی بۆ ئەوەی بە گوڵ بیانەخشێنم و ئەو گەرماوەی سەردەمانێک لەبەر هەرزانی و چۆڵییەکەی پێیەکانم لە بەسەرکردنەوەی ڕاهاتبوون، سڵاویان لە خۆم و لە فرمێسکی چاوانم کرد.

نە دەوروبەری قاوەخانەی وێرانکراو و سووتێنراو کەسی لێ بوو و نە دەوروبەری ئەو ماڵەی لە دڵەوە ئاواتم دەخواست شەکوورەی شۆخ و مێردی نوێی، کە ڕەنگە ئێستا لە سەرەمەرگدا بێت، تیایدا بەختەوەر بێت. ڕۆژانی دوای سووربوونی دەستم بە خوێن، کاتێک بە کۆڵانەکاندا دەڕۆیشتم، سەرجەم سەگەلی ئەستەنبوڵ بە چاوی دوژمن بۆ منیان دەڕوانی. ئێستا لەو ساتەوە بڕیارم دابوو پێ لە تاوانی خۆم بنێم و شاری ژیانم چۆڵ بکەم و سەر هەڵبگرم، ئەو سەگانە، دارەکانی تاریکی، پەنجەرە کوێرەکان، دووکەڵکێشە ڕەشەکان، ئەو کەسە چالاک و بەدبەختانەی بە هەڵەداوان بۆ نوێژی بەیانی دەچن، خۆیان و تارماییيان ئیدی دۆستانە بۆم دەڕوانن.

دوای تێپەڕبوونم لە مزگەوتی بایەزید، لەسەر تەپۆلکەیەکەوە سەیری کەنداوی زێڕینم کرد: ئاسۆ ڕوون دەبووەوە، بەڵام هێشتا ئاوەکە تاریک بوو. دوو بەلەمی ماسیگران، کەشتیی باربەری چارۆکە پێچراوە و دوو کەشتیی شەڕی لەبیرکراو هێدی هێدی بە شەپۆلی هیچ نەبیندراو دەلەرینەوە و پێیان گوتم: "مەڕۆ، مەڕۆ." ئایا لەبەرئەوەی دەرزییان پێدا کرابوو، فرمێسک لە چاوانم دەهات؟ بەخۆم گوت: ئەو ژیانە شاهانەیەی بە شاکارەکانی هونەری خۆتەوە لە هندستان بەسەری دەبەیت، بێنە بەرچاوی خۆت."

لە ڕێ لام دا، بە ڕاکردن بە دوو باخچەی قوڕاویدا تێ پەڕیم و لە خانوویەکی بەردین و کۆنی ناو سەوزەڵانێک نزیک کەوتمەوە. ئێرە ئەو ماڵە بوو کە گشت ڕۆژانێکی سێشەمی ساڵانی شاگردیم دەهاتمە بەر دەرگای، چاوەڕێی مامۆستا عوسمانم دەکرد و پاشان هەگبە، پێستەبەند، قوتووی قەڵەم و تەختەی نووسینەکەیم هەڵدەگرت و دوو هەنگاو لە پشتییەوە دەڕۆیشتم. هیچ شتێکی ئێرە گۆڕانی بەسەردا نەهاتبوو، بەڵام دار چنارەکانی ناو حەوشە و کۆڵان هەڵیان دابوو و زۆر گەورە بووبوون و هەستێکی ورشەداری و دەسەڵات و دەوڵەمەندیی پاشماوەی سەردەمی سوڵتان

سلێمانیان بە ماڵ و گەڕەک دەدا.

لەبەرئەوەی لە نزیک ڕێگای بەندەر هەڵکەوتبوو، تەفرەی ئیبلیسم خوارد و کەڵکەڵەی بۆ دوایین جار بینینی تاقەکانی نیگارخانەی شوێنی بەسەربردنی بیست و پێنج ساڵی ژیانم کەوتە سەرم. بەمجۆرە، بەو ڕێیەدا، کە ڕۆژانی سێشەمی سەردەمی شاگردیم لە پشت مامۆستا عوسمانەوە پیایدا دەڕۆیشتم؛ بەکۆڵانی تیرهاوێژاندا کە بەهاران بۆنێکی مەستکەری ئیخلامووری لێ دەهات، بە پێش ئەو تەندوورەدا وا وەستام چۆرەکی قیمەداری لێ دەکڕی، بە هەورازی پڕ لە داری بەهێ و شابەڕوو و شوێنی بەڕیز ڕاوەستانی سواڵکەراندا، بەبەردەم دەریوانە داخراوەکانی بازاڕی نوێدا، بەپێش ئەو سەرتاشەی مامۆستام هەموو بەیانیانێک سڵاوی لەگەڵ دەگۆڕییەوە، بەلێواری ئەو چۆڵەوانییەی هاوینان تەنافباز و پاڵەوانان چادریان لێ هەڵدەدا و خۆیان دەنواند، بەژێر ژووری بۆن گەنیوی سەڵتەکاران و تاقی بیزانسیی بۆنی کەڕوو لێهاتوودا، بەتەنیشت کۆشکی برایم پاشا و ئەو ستوونە بە مارەی سەدان جار نیگاریم کێشابوو و ئەو دار چنارەی هەر جارەی بەجۆرێک نیگاریمان دەکێشا، چوومە مەیدانی ئەسپ و بەبن ئەو شابەڕوو و دار توواناەدا تێ پەڕیم کە چۆلەکە و قەلەباچکەی سەریان بەیانیان بەیەکدا دەچوون و جریوە جریویان دەکرد.

دەرگای گرانی نیگارخانە داخرابوو. بەر دەرگا و دالانە هەیوانییەکەی سەرەوەش کەسیان لێ نەبوو. ئەو دەمەی تازە بەشپرزەیی توانیبووم سەیری دەریوانەی داخراوی ئەو پەنجەرە بچووکانە بکەم کە ساڵانی شاگردیمان کاتێک بێزار دەبووین، لەوێوە سەیری دارەکانی دەرێمان دەکرد، کەسێک ڕای گرتم.

دەنگێکی زیقن و باریک و ناخۆش بەگوێی هەبوو. گوتی: "خەنجەرە دەسک یاقووتی و بەخوێنەکەی دەستت هی منە و شەوکەتی برازام و دایکی یەکیان گرتووە و لە ماڵی من دزیویانە." بەبۆچوونی ئەو، ئەمەش بەڵگە بوو بۆ ئەوەی من یەکێک بووم لەو پیاوانەی قەرە کە شەو دابوویان بەسەر ماڵی ویدا و شەکوورەیان ڕەڤاندبوو. ئەم زۆرزانە دەنگ زیقن و هەڵچووە نیگارکێشانی دۆستی قەرەی دەناسی و دەیزانی دێنە نیگارخانە. شمشێرێکی درێژ و سووری لە سوورایيدا بریقاوەی پێ بوو. نازانم لەبەرچی بوو، بەڵام زۆر حسێبی هەبوو دەبوو لە منی وەربگرێت و هێندەی ئەوەش



بەسەرهاتی بۆ گێڕانەوە هەبوو. لەوانە بوو بڵێم هەڵەیەک لەم کارەدا هەیە، بەڵام ڕق و هەڵچوونی باوەڕ پێنەکراوی ڕوویم بینی. لە ڕوویدا بینیم دەیەوێت بەنەفرەتەوە پەلامارم بدات و بمکوژێت. دەمویست بتوانم بڵێم: "دەستم بەدامێن، ڕاوەستە."

بەڵام بگرە ئەو دەستی خۆی وەشاندبوو.

منیش تەنانەت فریا نەکەوتم ڕووی خەنجەری تێ بکەم و تەنیا ئەو دەستەی بوخچەکەم پێ هەڵگرتبوو، پێ بەرز کرایەوە.

بوخچەکەم بە هەوادا فڕی. شمشێری سوور بێ خاوبوونەوە، سەرەتا دەستی بڕیم، پاشان ملمی لە دەمارەوە بۆ دەمار بڕی و سەرمی لە جەستەم جیا کردەوە.

کاتێک بینیم جەستەی داماوم منی جێ هێشت و گێژ و وێژانە دوو هەنگاوی سەیری هاویشت، بێ هۆشانە خەنجەری ڕادەوەشاند، وەک فیشقە خوێن لە گەردنم دەڕۆیی و سەرم لە زەوی کەوتبوو، ئەوسا حاڵی بووم سەرم پەڕێندراوە. پێیە داماوەکانم لە خۆیانەوە دەڕۆیشتن و کتومت وەک پەلەقاژێی بەر لە تۆپینی ئەسپ، لە ختوخۆڕایی پەلەقاژێیان بوو.

سەرم کەوتبووە قوڕاوێکەوە و لەوێوە نە دەمتوانی بکوژەکەم ببینم و نە بوخچەی زێڕ و نیگارەکان کە هێشتا دەمویست توند بەدەست بیگرم. شتەکان لە پشت سەرمەوە کەوتبوونە قەراغ ئەو هەورازەی بۆ دەریا و بەندەری قادرگا شۆڕ دەبووەوە و ئیدی من هەرگیز پێیان نەدەگەیشتم. سەرم نەیدەتوانی وەرگەڕێت و جارێکی تر تەماشای ئەوان و بەشی پاشماوەی دنیا بکات. شتەکانم لەبیر کرد و بیرم لەو شتە کردەوە کە سەرم دەیخواست.

ئەو شتەی بەرلەوەی شمشێرەکە سەرم ببڕێت، بیرم لێ دەکردەوە: کەشتی لە قادرگاوە دەردەچێت؛ ئەمە لە ئەقڵمدا لەگەڵ فەرمانێک کە دەیگوت "پەلە بکە"، یەکیان گرتبوو؛ ئەو قسەیەی دایکیشم، کە لە کاتی منداڵیمدا دەیگوت: "پەلە بکە"، دەبوو بە تەواوکەری. دایە، ملم دێشێت و هیچ شتێک ناجووڵێتەوە.

کەواتە ئەمە ئەو شتەیە وا مردنی پێ دەڵێن.

بەڵام دەمزانی هێشتا نەمردووم. گلێنە کونکراوەکانی چاوانم نەدەجووڵان، بەڵام دەمتوانی بەچاوانی کراوەم زۆر باش ببینم.

ئەو شتەی لە تەختاییی زەوی دەمبینی، سەرلەبەری بیری منی داگرتبوو. ڕێگا کەمێک سەربەرەوژوور هەڵدەکشا. دیوار و هەیوان و سەربانی نیگارخانە، ئاسمان. ئاوەها دەڕۆیشتن.

وەک بڵێی ئەم ساتی تەماشاکردنەم درێژ بووەوە و حاڵی بووم ئێستا بینین بووە بەشێوەیەک لە بیرهێنانەوە. جاران، کاتێک چەندین سەعات سەیری نیگارێکم دەکرد، هەستم بە شتێک دەکرد و ئێستا ئەو شتەم بیر کەوتبووەوە: ئەگەر زۆر بڕوانیت، ئەقڵت دەچێتە زەمانی نیگارەکەوە.

ئێستا سەرجەم کاتەکان بووبوون بەو زەمانە.

دەتگوت ئیدی کەس نامبینێت و دوای ساردبوونەوەی بیرۆکەکانم، سەری نقوومی ناو قوڕ و لیتەم چەندین ساڵ سەیری ئەم هەورازە خەمگینە و ئەم دیواری بەردە و شابەڕوو و دارتووە هەرگیز دەست پێنەگەیشتووەکانی کەمێک ئەولاترەوەم دەکات.

لەپڕێک ئەم چاوەڕێکردنە لە بڕانەوە نەهاتووەم فرە پێ بەئازار و بێزارکەر بوو و ویستم لەم زەمانە دەربچم.



# 59

## من شەکوورەم

لە ماڵی ئەو خزمە دوورەی قەرە، کە بۆ شاردنەوەمان ئێمەی ڕەوانەی ئەوێ کردبوو، خەو نەچووە چاوم و شەوم بەخەوزڕاوی بەسەر برد. پێکەوە لەگەڵ خەیرییە و منداڵان لە نوێنێکدا ڕاکشابووین، تاوناتاوێک بەدەم دەنگی پرخە و کۆخەی ئەوانەوە خاو دەبوومەوە و چاوم دەچووە خەو، بەڵام ئەو ژن و بوونەوەرە سەیرانەی قۆڵ و ڕانیان بڕابوو و تێکەڵ بەیەکدی کرابوون و لەیەک درابوون و من لە خەونە نائاسوودەکانمدا دەمبینین، هیچ لە کۆڵم نەدەبوونەوە و بەئاگایان دەهێنامەوە. بەرەبەری بەیانی، لەتاو سەرما هۆشیار بوومەوە، شەوکەت و ئۆرهانم بەباشی داپۆشی، باوەشم پێدا کردن و قژی سەریانم ماچ کرد و وەک ئەو سەردەمە خۆشانەی کاتێک بەئاسوودەیی لە ماڵی باوکە گیانی خوا لێخۆشبوومدا دەنووستم، لە خوا پاڕامەوە خەونێکی کامەران بکات بەبەشم.

بەڵام نەمتوانی بخەوم. کاتێک دوای خوێندنی نوێژی بەیانی لە درزی دەریوانەی پەنجەرەی ژووری تەنگ و تاریکەوە سەیری کۆڵانم کرد، ئەو شتەم دی کە بەردەوام لە خەونە شادەکانمدا دەمبینی: پیاوێکی چەشنی خێوی لەتاو شەڕکردن و برینداربوون بڕست لێ بڕابوو، دارێکی بەشێوەی شمشێر بەدەستەوە گرتبوو و بە هەنگاوی ئاشنا بە من و بەتاسەوە لێم نزیک دەکەوتەوە. هەر جارێک دەمویست لە خەونمدا ئەم پیاوە لە ئامێز بگرم، بە فرمێسکی چاو هۆشیار دەبوومەوە. کاتێک حاڵی بووم ئەو پیاوەی خەڵتانی خوێن لە کۆڵان قەرەیە، ئەو قیژەیەی لە خەونەکانمدا لە قوڕگم

گیر مابوو، لە دەمم دەرچوو.

ڕام کرد و دەرگام کردەوە.

دەموچاوی لەبەر لێدان ئاوسا بوو و شین و مۆر بووبووەوە. لووتی هەڵدڕابوو و خەڵتانی خوێن بوو. برینێکی گەورەی پێوە بوو لە شانییەوە تا ملی. کراسەکەی و سەرتاپای جەستەی لەبەر خوێن سووری دەنوواند. لەبەرئەوەی وەک مێردی ناو خەونەکانم دواجار بۆماڵەوە گەڕابووەوە، بەئاستەم بزەیەکی بۆ کردم.

گوتم: "وەرە ژوورێ."

گوتی: "بانگی منداڵان بکە، بۆ ماڵێ دەگەڕێینەوە."

"تۆ حاڵی بۆ ماڵەوە گەڕانەوەت پێوە نییە."

گوتی: "ئیدی لێی مەترسە، وەلی جان ئەفەندیی عەجەم بوو."

گوتم: "زەیتوون... ئایا ئەو داماوەت کوشت؟"

گوتی: "بەو کەشتییەی لە قادرگاوە دەردەچێت، بەرەو هندستان تێی تەقاند." لەبەرئەوەی دەیزانی کارەکەی بە نیوەچڵ کردووە، تاوێک ڕووی وەرگێڕا.

گوتم: "ئایا دەتوانیت بۆ ماڵ بڕۆیتەوە؟ با ئەسپێکت بۆ دەربێنن."

پێم وابوو بگەڕێینەوە ماڵێ، دەمرێت. دڵم پێی سووتا. نەک بەتەنیا لەبەرئەوەی دەمرێت، بگرە لە سۆنگەی ئەوەشەوە کە بەدرێژاییی ژیان ڕووی شادی نەدیبوو. لە خەم و ڕەوشی بڕیاردەرانەی چاویدا دەمبینی ناخوازێت لەم ماڵە بێگانەیە بمرێت. ڕاستییەکەی، دەیویست ون بێت و کەس بەم حاڵە ترسناکەیەوە نەیبینێت. بەدژواری سواری ئەسپێکیان کرد.

ئەو دەمەی بە بوخچەکانی دەستمانەوە بە لاکۆڵانەکاندا تێ دەپەڕین و بۆ ماڵەوە دەگەڕاینەوە، دەسپێک، منداڵەکان لە ترساندا نەیاندەتوانی بەسەر ئەسپەکەوە سەیری ڕووی قەرە بکەن. بەڵام سەرباری ئەوەش ئەو توانی هێدی هێدی بەسەر ئەسپە ڕەوت نەرمەکەوە بۆیان بگێڕێتەوە چۆن نەخشەکانی ئەو نامەردەی بکوژی باپیریانی لەبەریەک هەڵوەشاندووە و چۆن شەڕە شمشێری لەگەڵدا کردووە. بینیم وا لەبەرەوە دڵیان بۆی گەرم دەبێت و منیش لە خوا پاڕامەوە و لالامەوە بۆ ئەوەی قەرە نەمرێت.



کاتێک گەیشتینەوە ماڵ، ئۆرهان هێندە بەشادمانی هاواری کرد "هاتینەوە بۆ ماڵ"، من هەر ئەو کاتە لە دڵم نیشت ئیزرائیل دڵی پێمان دەسووتێ و خوا کاتی زیاترمان پێ دەدا. بەڵام بەهۆی ئەوەی بە ئەزموون دەمزانی ئاشکرا نییە خوای مەزن گیانی کێ و کەی و لەبەرچی دەسێنێتەوە، هێندە خۆم ئومێدەوار نەکرد.

قەرەمان بەدژواری لە ئەسپ هێنایە خوارێ، هەموومان پیکەوە چووینە سەرێ، بردمانە ژوورە دەرگا شینەکەی باوکم و ڕامان کێشا. خەیرییە ئاوی گەرم کرد و هێنای. بەجووتە لەگەڵ ئەودا، هەر لە کراسی بە گۆشتەوە لکاوی، تا پشتوێنەکەی، پێڵاوەکانی، جلەکانی ژێرەوەی و گشت شتەکانی بەریمان دڕی و بە مقەست بڕیمان و لێمان کردەوە. بە کردنەوەی دەریوانەکان، تیشکی خۆشی خۆری زستان، کە لەسەر چڵی دارەکانی ناو باخچە گەمەی دەکرد، ژوورەکەی پڕ کرد و لەسەر مەسینە و مەنجەڵ و قوتووی کەتیرە و مەرەکەب و پارچەی شووشە و قەڵەمتاشەکان شکایەوە و پێستی ڕەنگی مردوو لێنیشتووی قەرە و برینە ڕەنگ گێلاسی و گۆشتینەکانی ڕووناک کردەوە.

بە پارچە قوماشی سەرچەفی سابووناوی و بە ئاوی گەرم تەڕ کردووم، چەشنی ئەوەی فەرشێکی کۆن و گرانبەها پاک بکەمەوە، بەوردی و وەک ئەوەی خزمەتی یەکێک لە کوڕەکانم بکەم، بە دلۆڤانی و حەزەوە لەشی قەرەم سڕی. بێ ئەوەی دەست بە پەڵە مۆرەکانی ڕوویدا بنێم و برینی کونی لووتی بکولێنمەوە، وەک پزیشک برینە بەسامەکەی شانیم پاک کردەوە. لەلایەکیش، وەک ئەو کاتانەی منداڵەکانم هێشتا بچووک بوون و پاکم دەکردنەوە، بە ئاوازەوە قسەی توڕەهاتم پێ دەگوت. سنگ و باڵیشی برینیان پێوە بوو. پەنجەکانی دەستی چەپی بەهۆی گەستنەوە شین و مۆر هەڵگەڕابوون. تا زیاتر پارچە پەڕۆکانی دەستم بەسەر جەستەیدا دەگەڕاند، لە خوێندا نقوم دەبوو. دەستم لە سنگی دا؛ بەدەست هەستم بە نەرمیی سکی کرد؛ ماوەیەکی درێژ سەیری دەعباکەیم کرد: لە خوارەوە، لە حەوشەوە دەنگی منداڵەکان دەهات. بۆچی بڕێک لە شاعیران ئەمەیان بە قەڵەمی قامیش ناو بردووە؟

کاتێک گوێم لێ بوو ئەستەر بەو دەنگە گاڵتەئامێز و ڕازدارەیەوە، کە لە کاتی هێنانی هەواڵی نوێدا پێوەی دیار بوو، چووە ئاشپەزخانە، منیش چوومە خوارێ.

ئەستەر زۆر بەجۆش بوو و بەرلەوەی باوەشم پێدا بکات و ماچم بکات، دەستی بەگێڕانەوە کرد: کەللەی سەری زەیتوون و نیگارەکانی بەڵگەی تاوانەکانی پێشووی و بوخچەکەی لەبەر دەرگای نیگارخانە دۆزراوەتەوە. نیازی بووە بۆ هندستان هەڵبێت، بەڵام گوتوویەتی با بۆ دواجار سەرێک لە نیگارخانە بدەم.

دەگوترێت بینەر هەن: حەسەن لەوێ زەیتوونی بینیوە، شمشێری سووری هەڵکێشاوە و بەیەک دەستوەشاندن سەری پەڕاندووە.

ئەو قسەیەی دەگێڕایەوە و من بیرم لە شوێنی باوکە گیانی بەستەزمانم دەکردەوە. هەواڵی دەستوەشاندن لە بکوژەکەی، سەرەتا منی لە ترسێک ڕزگار کرد. هەستیشم کرد تۆڵەسەندنەوە، ئاسوودەیی و هەستی دادپەروەری بە ناخی مرۆڤ دەدا. ئەو ساتە حەزم دەکرد بزانم باوکم لەو جێیەی لێیەتی چۆن بەپیر ئەم هەستەوە دێت و لەپڕ سەرانسەری دنیا وا هاتە بەرچاوم چەشنی ئەوەی کۆشکێکی خاوەن ژووری لە ژماردن نەهاتوو بێت و ژوورەکان دەرگایان بەسەریەکدا بکرێتەوە. تەنیا بەبیرکردنەوە و خەیاڵ دەمانتوانی لە ژوورێکەوە بچینە ژوورێکی تر، بەڵام زۆربەمان لەبەر تەمەڵی ئەمەمان بەکەمی دەکرد و هەمیشە لە هەمان ژوور چاوەڕێمان دەکرد.

ئەستەر گوتی: "مەگری گیانەکەم. بڕوانە، دواجار هەموو شتێک بەباشە وەرگەڕا."

چوار زێڕم دایێ. دانە بەدانە و بەتامەزرۆیی زێڕەکانی نایە دەمی و بەتەما و حەزەوە، بەڵام نەزانانە گەستنی.

بەدەم زەردەخەنەوە گوتی: "زێڕی دەسکاری ئەم ڤینیسیاییە گاورانە گشت شوێنێکی تەنیوە."

هەر ئەو ڕۆیشت و نەڕۆیشت، بە خەیرییەم گوت نەهێڵێت منداڵان بێنە سەرێ. سەرکەوتمە سەرەوە، دەرگام قفڵ دا. بەحەزەوە لە لەش و لاری ڕووتی قەرە نزیک بوومەوە و ئەو شتەم بۆ کرد کە شەوی کوژرانی باوکی داماوم لە ماڵی جوولەکەی هەڵواسراو داوای لێ کردم. بەڵام لە ویست زیاتر لەبەر حەز و بەترسیشەوە نا، بەهۆشیاری کردم.

شاعیرانی عەجەم هەروەک چۆن ئەو ئامێرەیان بە قەڵەمی قامیش چوواندووە، بۆچی دەمی ئێمەی ژنانیان بە قوتووی مەرەکەب شوبهاندووە؟ ئەم بەراوردکردنە



لەبەر زۆریی لەبەر دووبارەکردنەوە مەبەستی ڕاستەقینەی لەبیر کراوە و من ناتوانم بەتەواوی بڵێم چ هۆکارێکی لە پشتەوەیە؛ بچووکیی دەم؟ بێدەنگیی ڕازداری قوتووی مەرەکەب؟ یاخۆ نیگارکێش بوونی خوا؟ بەڵام ئەڤین دەبێت شتێک بێت بە لۆجیکی کەسێکی وەک من نا، کە بەردەوام ئەقڵی بۆ پاراستنی خۆی خستووەتە کار، بگرە لەنێوانی نالۆجیکبوونی کەسەکەوە ڕوون ببێتەوە.

کەوابوو با ڕازێکتان بۆ بدرکێنم: لەوێ، لەو ژوورەی بۆنی مردنی لێ دەهات، شتەکەی ناو دەمم نەیدەورووژاندم: ئەو شتەی وەجۆشی خستبووم، ئەوە بوو کاتێک من لەو دۆخەدا لەوێ مابوومەوە و هەستم دەکرد سەرانسەری دنیا لە دەممدا دەزرنگێتەوە، جریوەی منداڵەکانم دەبیست لە حەوشە جنێویان بەیەک دەدا و پاڵیان بەیەکەوە دەنا.

ئەو کاتە، سەرباری سەرقاڵبوونی دەمم تا ئەو ڕادەیە، چاوانم توانیان ببینن قەرە بە نیگایەکی تەواو جیاوازەوە بۆ ڕووم دەڕوانێت. دەیگوت لەمەودوا هەرگیز دەم و سەروچاومی لەبیر ناچێتەوە. وەک هەندێک لە کتێبە کۆنە کەڕووگرتووەکانی باوکم، بۆنی کەڕوو لە جەستەی دەهات؛ هەرچی تۆز و بۆنی قوماشی ژووری گەنجینە هەیە لە قژی نیشتبوو. تا دەهات هۆشم لای خۆم نەدەما و دەستم لە برین و دوومەڵ و جێ شکاوییەکانی دەدا و ئەویش وەک منداڵ دەیناڵاند و بە تێپەڕبوونی کات لە مردن دوور دەکەوتەوە. ئەو کاتە منیش حاڵی دەبووم زیاتر هۆگری دەبم. وەک کەشتییەکی چارۆکە چۆن چارۆکەکانی هێدی هێدی بە با ئاوس دەبێت، سەرجێییکردن و پێکەوەنووستنی ئێمەش لەسەرخۆ خێراتر بوو و چەشنی کەشتیی چارۆکەداری بەویقار بوێرانە بەرەو دەریا نەزانراوەکان بەڕێ کەوت.

قەرە تەنانەت لەسەر دۆشەکی مردنیش سەوڵی لە دەست دەرنەدەچوو و لەمەوە حاڵی دەبووم مەگەر خوا بزانێت لە ڕابردوودا لەگەڵ چەند ژنی بەدڕەوشتدا خۆی لەم ئاوانە داوە. ئەو کاتەی ئیدی سەرم لێ شێوابوو و نەمدەزانی ئەو قۆڵەی ماچی دەکەم قۆڵی خۆمە یان ئەو، ئەو پەنجەیەی دەینێمە دەمم، پەنجەی خۆمە یاخۆ سەرتاپای ژیانم، ئەو لەتاو برین و حەز نیوە مەست بووبوو و بەچاوی نیوە هەڵهێنراوەوە سەیری دەکرد بزانێت دنیا بەرەو کوێ مل دەنێت. جاروبار ڕووی دەخستمە نێو لەپی

دەستەکانی و وەک ئەوەی بۆ نیگارێک بڕوانێت، سەیری دەکرد و یەکسەر دوای ئەوەش دەیتوانی بەجۆرێک سەیری بکات چەشنی ئەوەی سەروچاوی ژنە لەشفرۆشێکی مینگەری بێت.

قەرە، وەک قیژەی ئەو پاڵەوانانەی بە شمشێر دەبن بە دوولەتەوە و لە نیگارە ئەفسانەییەکانی پێشاندەری پێک هەڵپژانی سوپاکانی ئێران و تووراندا دەبینرێت، لە کاتی چێژدا هاوارێکی لێ بەرز بووەوە و لە سەرانسەری گەڕەکدا بیسترا و ئەمەش منی ترساند. بەڵام وەک مامۆستایەکی ڕاستەقینەی نیگارکێش قەڵەمی قامیشی بەدەستەوە گرتبوو و بەدەستووری ڕاستەوخۆی خوا ڕەفتاری دەکرد و تەنانەت لە بەرزترین ساتی ئیلهام بۆهاتنیشدا دەیتوانی قەوارە و ڕیزبەندیی سەرجەم پەڕەی بەردەستی حسێب بکات و بەگۆشەیەکی تری ئەقڵیشی ڕەچاوی جێی ئێمەی لە دنیادا دەکرد.

بەدەم هەناسەبڕکێوە گوتی: "بڵێ مەڵحەمم لە برینەکانی باوکتان دەدا."

ئەم قسەیە بەتەنیا ئەوە نەبوو ڕەنگی ئەڤینی ئێمە پێک بێنێت، ئەو ئەڤینەی کەوتبووە نێوان تەنگەبەری ژیان و مردن، قەدەغە و بەهەشت و بێچارەیی و شەرمەوە؛ بگرە بوو بەبیانووش بۆی. بەدرێژاییی بیست و شەشی ساڵی دوای ئەوە، واتا تا ئەو بەیانییەی لە تەنیشت بیرەکە کەوتە سەرزەوی و بەهۆی نەخۆشیی دڵەوە مرد، من و قەرەی مێردی خۆشەویستم هەمیشە کاتی نیوەڕۆیان، ئەو دەمەی تیشکی ڕۆژ لە درزی دەریوانەکانەوە دەهاتە ژوورێ، ساڵانی سەرەتاش بەدەم بیستنی جریوە جریوی شەوکەت و ئۆرهانەوە، سەرجێییمان کرد و هەردەم ئەمەمان بە "مەڵحەم لە برین دان" ناو برد. بەمجۆرە، لەبەرئەوەی نەمویست کوڕە چاوچنۆکەکانم بەهۆی داخواز و ئیرەیییەکانی باوکێکی زبر و دڵتەنگەوە ئازار بچێژن، توانییان چەندین ساڵ لەگەڵ خۆم لە هەمان پێخەودا بخەون. هەر ژنێک ئەقڵی لەدەست نەدابێت، دەزانێت لە ئامێزگرتنی منداڵان و نووستن لەپەنایاندا، زۆر جوانترە لەوەی باوەش بە مێردێکی دڵشکاو و ئازارچێشتووی دەستی ژیاندا بکەیت و لەگەڵیدا بنوویت.

ئێمە، خۆم و منداڵەکانم بەختەوەر بووین، بەڵام قەرە نەیتوانی کامەران بێت. یەکەم هۆکاری بەچاو بیندراوی ئەمەش ئەوە بوو برینی شان و ملی هیچ کاتێک بەتەواوی



خۆش نەبووەوە و مێردی خۆشەویستم، وەک ئەوەی خۆیشم هەندێک جار لە کەسانی ترەوە گوێم لێ دەبوو، "سەقەت" بووبوو. بەڵام شێواندنی دیمەنی جەستەی لێ دەربچێت، ئیدی ئەم سەقەتییە شتێک نەبوو ژیانی دژوار بکات. بگرە جاری وا هەبووە بەرگوێم کەوتووە ئەو ژنانەی لە دوورەوە مێردەکەیان بینیوم، گوتوویانە پیاوێکی قۆزە. بەڵام شانی ڕاستی قەرە هەردەم بە داکەوتوویی و ملیشی بەشێوەیەکی سەیر بەخواری مایەوە. جاروبار قسە و قسەڵۆک دەگەیشتەوە گوێم و دەگوترا ژنێکی وەک من تەنیا دەتوانێت شوو بە پیاوێکی خوار خۆی بکات و گوایە سەقەتیی قەرە چەندە مایەی بەدبەختی و ناشادمانیی ئەوە، هێندەش هۆکاریی نهێنیی کامەرانیی ئێمەیە.

لەوانەیە وەک گشت قسە و قسەڵۆکێکی تر، لەمەشیاندا شتێک لە ڕاستی هەبێت. بەڵام من، بەوجۆرەی ئەستەر بەشایەنی منی دەزانی، نەمدەتوانی سواری ئەسپێکی هەڵبژاردەی ناو ئەسپان بم و بەیاوەریی کۆیلە و کەنیزەک و خولامان بە کۆڵانەکانی ئەستەنبوڵدا بگەڕێم و ئەمەش هەستی کێماسی و هەژاریی لەلادا دەورووژاندم. بەهەمان شێوە، جاری وا بووە تاسەی مێردێکی وەک شێرم کردووە، مێردێک سەری بەرز ڕابگرێت و بە سەرفرازی بۆ دنیا بڕوانێت.

سا ئیتر هۆکارەکەی هەرچییەک بووبێت، قەرە هەمیشە بە خەمگینی مایەوە. لەبەرئەوەی بۆم دەرکەوتبوو زۆربەی کات خەمەکەی پێوەندیی بە شانییەوە نییە، باوەڕم کرد لە شوێنێکی نهێنیی ڕۆحیدا جنۆکەی خەم خۆی حەشارداوە و تەنانەت لە کامەرانترین ساتەکانی سەرجێییکردن و چێژ لە یەکدی وەرگرتنیشماندا دڵتەنگیی دەکرد. بۆ هێورکردنەوەی ئەو جنۆکەیە، جاروبار شەرابی دەنۆشی، ناوبەناو سەیری نیگاری ناو کتێبەکانی دەکرد و خۆی بە نەخشەوە سەرقاڵ دەکرد، جاری واش هەبوو لەگەڵ دەستەی نیگارکێشاندا هاوڕێیەتی نیگارکێشانی دەکرد و لەگەڵ ئەواندا دوای کوڕانی جوان دەکەوت. هەروەک چۆن کاتی وای هەبوو لەناو نیگارکێش و خۆشنووس و شاعیراندا بە قسەی ڕەوانبێژی، وشەی جووتواتایی، هێما، مەجاز و کوڕانی جوان و گەمەی گاڵتەجاڕی ڕای دەبوارد، کاتی واشی هەبوو تیایدا لە گەیشتن بە سوڵتان پاشای خوار سەرکەوتنی بەدەست هێنا و بە

خۆخەریکردن بە کاری نووسیاریی ئەو و نووسیاریی دیوانەوە گشت شتێکی تری لەبیر دەکرد. کاتێک دوای ئەوەی سوڵتانمان مرد و سوڵتان محەمەدی جێگرەوەی پشتی لەو کارانە کرد، حەزی قەرە بۆ نەخش و نیگار لە چێژێکی ئاشکراوە وەرگەڕایە سەر ڕازێکی بەتەنیایی بەردەوامبوو لە پشت دەرگا داخراوەکانەوە. جاروبار یەکێک لە کتێبەکانی پاشماوەی باوکی خوا لێخۆشبوومی هەڵدەدایەوە، سەیری نیگارێکی لە هەرات کێشراوی سەردەمی کوڕی تەیمووری لەنگی دەکرد. بەڵێ، تەماشای ئەو ساتەی دەکرد کاتێک شیرین لە بینینی نیگارییەوە دڵی دەچێتە خەسرەو، بەڵام نەک وەک بەشێک لە گەمەی هونەری هێشتا زیندووی دەورووبەری کۆشک، بگرە چەشنی ئەوەی دەست بە ڕازێکی شیرینی ناو بیرەوەرییەکانیدا بهێنێت، بە دڵتەنگی و هەستی خۆ بەتاوانبارزانینەوە سەیری دەکرد.

سالی سێیەمی چوونە سەر تەختی سوڵتانمان، پادشای ئینگلیز سەعاتێکی پەرجوویی نارد و سەعاتەکە ئامێرێکی مووزیکی هەواکێشی تێدا بوو. پارچە و چەرخ و نیگار و پەیکەری ئەم سەعاتە زەبەلاحە و شاندی یاوەری لە کەشتیی لە بەریتانیاوە هاتوو داگیران و دوای چەندین هەفتە کارکردن، لە قەدپاڵێکی بەرامبەر بە کەنداوی زێڕین لە باخی تایبەت جێگیر کرا. ئەو ئاپۆڕەیەی بە بەلەم بۆ تەماشاکردن هاتبوون و لە بەرپاڵەکانی کەنداوی زێڕین مۆڵیان خواردبوو، کاتێک بەشادی و سەرسامییەوە دەیانبینی سەعاتی دێوئاسا بە مووزیکێکی دەنگ ترسناکەوە کار دەکات و پەیکەر و نیگاری بە قەوارەی گەورەیی مرۆڤ بە جووڵەی واتادارەوە بەدەوری یەکتردا دەخوولێنەوە، مرۆڤ وا هەستی دەکرد کاری خوا بێت، نەک دەستکردی بەندەکانی. ئامێرەکان خۆبەخۆ بە هەماهەنگی دەخوولانەوە و سەعاتەکەش بەزرمەی زەنگئاسای خۆی، ئەستەنبوڵییەکانی لە کات ئاگادار دەکردەوە.

قەرە و ئەستەر هەریەکەیان بەشێوەیەک هەواڵیان پێم گەیاند و گوتیان خەڵکی ئەستەنبوڵ لەگەڵ تاقمی پێ خاوسان و ئاپۆڕەی گێژ و دەبەنگان لە سەرسام بوونیان بە سەعاتەکە گشت سنوورێکیان بەزاندبوو و ئەمەش بۆ سوڵتانمان و بۆ توندڕەوانی هەڵوەدای ئاین بووبوو بە سەرچاوەی پەشێوییەکی ناڕەوا و پێشاندەری





هێزی گاوران. لە سەردەمێکدا ئەم قسە و قسەڵۆکانە لە تەشەنەکردندا بوون، بیستمان سوڵتانی دواتر، سوڵتان ئەحمەد بە ئیلهامێکی لە خواوە هاتوو لە خەو هەستاوە، دەستی داوەتە گورز، لە حەرەمسەراوە چووەتە باخی تایبەت و سەعات و پەیکەرەکانی ورد و هەڕا کردووە. ئەوانەی ئەم هەواڵ و قسانەیان بڵاو دەکردەوە، دەیانگوت سوڵتانمان لە خەونی خۆیدا ڕووی پیرۆزی حەزرەتی پێغەمبەرمانی لە تیشکدا بینیوە، نێردراوی خوا هوشیاری کردووەتەوە و پێی گوتووە ئەگەر مۆڵەت بدات میللەتەکەی شەیدای نیگار و بەتایبەتیش ئەو بوونەوەرانە بێت، کە وەک مرۆڤ دەچن و پێشبڕکێ لەگەڵ ئەفراوەکانی خوادا دەکەن، ئەوا لە فەرمانی خوا دەردەچێت. سوڵتانیشمان بەدەم خەوەوە دەست دەداتە گورزەکەی و ڕووداوەکەشی هەر بەمجۆرە بە مێژوونووسی ڕاستەقینەی خۆی بە نووسینەوە دا. بە کیسە زێڕی بە خۆشنووسان دا و کتێبی "زبدة التواريخ"ی پێ بە ئامادەکردن دان، بەڵام بەدەستی نیگارکێشان نیگاری بە کێشان نەدا بۆی.

گوڵی سووری خرۆشی نەخش و نیگار، کە سەد ساڵ بوو بە ئیلهامی عەجەم لە ئەستەنبوڵ پشکوتووبوو، ئاو بەوجۆرە سیس بوو. شەڕی نێوان مامۆستایانی کۆنی هەرات و شێوازەکانی مامۆستایانی فەڕەنگ لە نێوان نیگارکێشاندا زەوینەی بۆ ئاژاوە و کێشەی لە بڕانەوە خۆش کردبوو و هیچ کاتێک نەبڕایەوە و بەئەنجام نەگەیشت، چونکە دەست لە نیگار هەڵگیرا؛ نە بەنەریتی ڕۆژهەڵاتییان نیگار کێشرا و نە بەنەریتی ڕۆژئاواییان: نیگارکێشان هەڵنەچوون و یاخی نەبوون؛ وەک چۆن بەساڵاچووان بەبێدەنگی نەخۆشییەک قەبووڵ دەکەن، ئەمانیش هێدی هێدی و بێ خۆنووواندن بە لێ ڕاهاتن و خەمەوە ڕەوشەکەیان پەسەند کرد. تەنانەت حەزیان نەبوو و خەیاڵیشیان نەدەکردەوە بزانن مامۆستایانی گەورەی هەراتی و تەورێزی، کە ئەمان سەردەمانێک سەوداسەرانە ڕێچکەی ئەوانیان گرتبوو، چییان کردووە. خەمی ئەوەشیان نەبوو بزانن مامۆستایانی فەڕەنگ، کە ئەمان لە نێوان ئیرەیی پێبردن و نەفرەت لێکردنیاندا دوودڵ مابوونەوە و دڵیان لە شێوازە نوێیەکانیان چووبوو، بەکوێ گەیشتوون. وەک بڵێی چۆن شەوان دەرگای ماڵان دادەخرێت و شار ڕادەستی تاریکی دەکرێت، نیگارکیش بەوجۆرە بۆ بێکەسی جێ هێڵرابوو. زۆر

بێبەزەییانە ئەوە فەرامۆش کرا کە سەردەمانێک دنیا بەشێوەیەکی تەواو جیاواز دەبینرا.

بەداخەوە کتێبەکەی باوکم تەواو نەکرا. پەڕە تەواوکراوەکان لەو شوێنەوەی لە حەسەن کەوتبوون، برابوونە گەنجینە و لەوێش کتێبپارێزێکی کارزان و وردبین دەستووری دا لەگەڵ نیگاری تری جیاوازی نیگارخانەدا بەرگیان تێ گیرا و بەسەر دەفتەری نیگاری جۆربەجۆردا دابەش کران. حەسەن لە ئەستەنبوڵ هەڵهات و بێ سەروشوێن بوو، بڕای ببڕ هەواڵی نەبیسترایەوە. بەڵام شەوکەت و ئۆرهان هەرگیز لەبیریان نەچوو ئەم مامەی ئەوان بکوژی باوکمی کوشتووە، نەک قەرە.

مامۆستا عوسمان دوو ساڵ پاش کوێربوونی مرد و لەقلەق لە جێی ئەو بوو بە گەورەی نیگارکێشان. پەپوولە، کە باوکی خوا لێخۆشبووشم زۆر شەیدای توانا و لێهاتوویی بوو، پاشماوەی ژیانی تەرخان کرد بۆ کێشانی نەخش لەسەر ڕایەخ و قوماش و چادر. گەورە شاگردانی لاوی نیگارخانەش هەمان ڕێبازیان گرتەبەر. کەس وا ڕەفتاری نەنوواند وەک ئەوەی دەست هەڵگرتن لە نیگار زیانێکی گەورە بێت. ڕەنگە لەو سۆنگەیەوە بووبێت کە هیچ کەسێک بەڕاستی نیگاری ڕووی خۆی نەدیبوو.

من بەدرێژاییی تەمەنم بەدزییەوە زۆر ئارەزووم دەکرد دوو نیگار بکێشرێت و نەدەمتوانی ئەم حەزەم لەکن کەس دەرببڕم.

١– خۆزگەم دەخواست نیگاری خۆم بکێشرێت. بەڵام دەمزانی چەندیش هەوڵ بدەن ئەمەیان بۆ ناکرێت، چونکە تەنانەت ئەگەر جوانیشم وەک خۆی ببینن، هیچ نیگارکێشێکی سوڵتان تا نیگاری چاو و لێوی ژن وەک ژنانی چینی نەکێشێت، مخابن باوەڕ بەجوانیی ڕووی ژن ناکات. ئەگەر بەنەریتی مامۆستایانی کۆنی هەراتی نیگاری منیان وەک شۆخێکی چینی بکێشابایە، ئەوانەی دەیانبینیم و دەیانناسیم، لەوانە بوو بتوانن ڕووی شاراوەم لە پشت ئەو شۆخە چینییەوە بناسنەوە. بەڵام ئەوانەی دوای ئێمە تەنانەت بۆشیان ڕوون بووایەتەوە کە من لە ڕاستیدا چاوماسی نەبووم، بەهیچ جۆرێک بۆیان نەدەبرایەوە سەریەک ڕووم لە چی چووە. ئەم ڕۆژگارە و لەم دەمی پیرییەمدا، کە بەدەم دڵدانەوەی کوڕەکانمەوە



بەسەری دەبەم، چ بەختەوەر دەبووم ئەگەر نیگارێکم هەبووایە ئەو دەمە بکێشرابایە کاتێک هێشتا ڕووم گەنج بوو.

٢– ئەو شتەی ساری نازمی شاعیری ڕانی لە مەسنەوییەکدا گرِی لێ داوە: دەمویست نیگاری کامەرانی بکێشرێت. زۆر باش دەزانم ئەمە چۆن ئەنجام دەرێت. خوازیار بووم نیگاری دایکێک بکێشرێت، با دوو منداڵی هەبووایە؛ دەمویست کاتێک بە ڕووی خۆشەوە ساواکەی لە باوەش گرتووە و شیری دەداتێ و ئەویش بەدەم زەردەخەنەوە گۆی مەمکی گەورەی دایکی گرتووە و دەیمژێت، چاوی کاکی کەمێک چاوچنۆک و دایکی یەک بگرنەوە. خوازیار بووم دایکی ناو ئەو نیگارە خۆم بم و دەمویست بەشێوازی مامۆستایانی کۆنی هەراتی بکێشرابایە، ئەو مامۆستایانەی کەوا باڵندەی ئاسمان هەم وەک ئەوەی بفڕێت و هەم چەشنی ئەوەی تا هەتایە بەکامەرانی و بەهەڵواسراوی بە ئاسمانەوە بمێنێتەوە، پێشان دەدەن و کات ڕادەگرن. دەزانم، ئاسان نییە.

ئۆرهانی کوڕم، کە تا ڕادەی خۆ هەڵقورتاندن لە هەموو شتێک بێ ئەقڵە، بیری خستمەوە و گوتی مامۆستایانی زەمانڕاگری هەراتی هەرگیز نەیاندەتوانی نیگاری منیان وەک خۆم بکێشایە و مامۆستایانی فەڕەنگیش گاڤێک بێ ڕاوەستان نیگاری دایکی جوانی منداڵ لە ئامێز دەکێشن، هیچ کاتێک کاتیان بۆ ڕاناگیرێت و چەندین ساڵیش بوو پێی گوتبووم ئەستەمە هیچ سەردەمێک نیگاری بەختەوەریی من بکێشرێت.

لەوانەیە مافدار بێت. ڕاستییەکەی، مرۆڤ بەدوای زەردەخەنەی ناو نیگاری بەختەوەریدا ناگەڕێت، بگرە منەی بەختەوەریی ژیان دەکات. نیگارکێشان ئەمە دەزانن، بەڵام ئەوەشی ناتوانن نیگاری بکێشن، هەر ئەمەیە. بۆیە بەختەوەریی بینین دەخەنە جێی بەختەوەریی ژیانەوە.

ئەم بەسەرهاتە نیگار لە کێشان نەهاتووەم بۆ ئۆرهانی کوڕم گێڕایەوە بەمەبەستی ئەوەی بەڵکو بینووسێتەوە. بێ دوودڵینواندن، نامەکانی قەرە و حەسەن و ئەو نیگاری ئەسپانەی مەرەکەبیان بڵاو بووبووەوە و لەکن زەریف ئەفەندیی بەستەزمان دۆزرابووەوە، ڕادەستی کرد. هەمیشە دەمارگرژ و شەڕانگێز و ناشادە و سڵ

ناکاتەوە لە نارەواییکردن بەرامبەر بەو کەسانەی خۆشیی بە چارەیاندا نایەت. بۆیە ئەگەر ئۆرهان، باسی قەرەی لە ڕاستیی خۆی داماوتر و ژیانمان لەوەی هەیە دژواتر و شەوکەتی بە خراپتر و منی لە ڕاستیی خۆم جوانتر و بێ ئەدەبتر بۆ ئێوە گێڕابێتەوە، ئەوا دەستم دامێننتان بڕوای پێ مەکەن، چونکە بەمەبەستی ئەوەی چیرۆکەکەی جوان و دڵگیر بێت و ئێمە باوەڕی پێ بکەین، درۆ نییە نەیهۆنێتەوە.

١٩٩٠-٩٢، ١٩٩٤-٩٨



## بەفر:

(کا)ی شاعیر دوای بەسەربردنی دوازدە ساڵ ژیان لە تاراوگەی ئەڵمانیا، بۆ ئەستەنبوڵ دەگەڕێتەوە. چوار ڕۆژ دوای گەڕانەوەی، ڕۆژنامەیەکی ئەستەنبوڵی بۆ ئەنجامدانی ریپۆرتاژێک دەربارەی دیاردەی خۆکوشتنی ژنان و هەڵبژاردنەکانی شارەوانی، کە چاوەڕێ دەکرێت ئیسلامییەکان سەرکەوتنی تێدا بەدەست بهێنن، ڕەوانەی شاری قارسی دەکات. ئەمیش بەژێر بەفرێکدا، کە هێدی هێدی و بێ وچان دەبارێت، کۆڵان بەکۆڵان و دووکان بەدووکان دەگەڕێت و دەکۆشێت ئاشنای ئەو شارە خەمگین و جوانە و دانیشتووانی بێت. لە گەڕانەکانیدا دەچێتە چایخانەکانی سیحناخ لە بێکارانی کورد و سەر لە خێزانی کچان و ژنانی خۆکوشتوو دەدات و لە هۆکارەکانی خۆکوشتنیان دەکۆڵێتەوە. لە ئاکامی هاتوچۆی زۆر و تاوسەندنی خولیای لێکۆڵینەوەدا، دەکەوێتە ناو قەیرانی سیاسی و ئاینی و ڕاپێچی تۆڕێکی تەمومژاویی پەیوەندی و شەڕی دەسەڵات و پیلانگێڕان دەکرێت. بێ پەروا بە کوچە و کۆڵانەکانی شارێکی نەگبەتدا، کە خواش فەرامۆشی کردووە، بەدوای ئەڤینی کۆنی سەردەمی زانکۆ و ڕاستی و لێکدانەوەی شیعرەکانیدا دەگەڕێت. لەپڕ کودەتایەک دەقەومێت. بەفر ڕێگا و بانەکان دەگرێت و کەس ناتوانێت شار بەجێ بهێڵێت.

***

– ڕۆمانەکانی ئۆرهان پاموک ئەوە دەسەلمێنن ئەو شایەنی خەڵاتی نۆبڵ بوو.

گۆڤاری ئایندە – کوردستان

– ئۆرهان پاموک نە ئیدۆلۆگ و نە سیاسەتمەدار و نە ڕۆژنامەنووسە، ئەو ڕۆماننووسێکی گەورەیە.

ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز – وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا

– ڕۆماننووسی تورک ئۆرهان پاموک چۆنێتیی ڕۆمان نووسین پێشانی ئەوروپا دەدات.

ڕۆژنامەی فرانکفورتەر ئالگەماینە – ئەڵمانیا

## قەڵای سپی:

لە سەدەی حەڤدەیەمدا، ڤینیسیاییەک لەلایەن چەتە دەریاوانەکانی تورکەوە دەستگیر دەکرێت و دەهێندرێتە ئەستەنبوڵ. ئەم کۆیلەیە، کە پێی وایە سەری لە گەردووناسی و فیزیا و نیگارکێشی دەردەچێت، لەلایەن تورکێکی خاوەن هەمان ئەو خولیایانەوە دەکڕدرێت. لێکچوونێکی سەیر لەو دوو مرۆڤەدا هەیە. سەرداری خاوەن کۆیلە دەیەوێت لە کۆیلەکەیەوە ئاشنای ڤینیسیا و زانستی ڕۆژئاوا بێت. ئەم دوو کەسە، سەردار و کۆیلە، بەمەبەستی یەکترناسین و تێگەیشتن و گێڕانەوەی باسی یەکدی، لە ماڵێکی تاریک و چۆڵی سەر کەناری کەنداوی زێڕین، لە ئەمسەر و ئەوسەری هەمان مێز دادەنیشن و قسە دەکەن. چیرۆک و بەسەرهات و بیرەوەرییەکانیان، ئەوان بەرەو کوچە و کۆڵانەکانی ئەستەنبوڵی تووشبووی پەتا، باخچە خەیاڵییەکان و ئاژەڵەکانی سوڵتانی منداڵ، دروستکردنی چەکێکی لە ئەقڵ بەدەر و پرسیاری "من بۆچی منم" بەکێش دەکات. بەدەم بەردەوامبوونی چیرۆکەکانیانەوە لە گزنگی بەیانەوە تا تاریکایی شەو، سێبەرەکانیان هێدی هێدی جێگۆڕکێ دەکەن.

***

– کامڵترین بەرهەمی خەیاڵە تا ئێستا گەیشتبێتە کتێبخانەکان و فرۆشرابێت.

ABC Cultura, Ispanya

-چیرۆکێکی پۆست مۆدێرنی بەچێژ و خەیاڵ بزوێنە، وەستایانە بنیادنراوە و بە داوی پارادۆکس هۆنراوەتەوە.

Publishers Weekly, New York